


# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبدالعزیز

بەرگی نۆیەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی نۆیەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

﴿ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾

لەپێشەوە فەرمووی بڕیار لەلایەن خواوە دەرچوو بۆ بڕینەوەی ئاژاوەی نێوان چاکان و خراپەکاران بۆکاتی دیاریی کراو کە ڕۆژی دوایی یە. جا بەو بۆنەیەوە باسی زانینی ئەو ڕۆژە تایبەتی یە دەکات بەخواوە، ئینجا بەو بۆنەیەوە زانینی چەند شتێکی تر دەهێنێ و تایبەتی دەکات بەخواوە فەرمووی: ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە زانینی هاتنی ڕۆژی دوایی، واتە خوا تایبەتی کردووە بەخۆیەوە، هێندێ لەو تایبەتی یانە ئەمەیە کە فەرمووی: ﴿وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ﴾ هیچ بەرو میوەیەك دەرناچێ لەپێست وقەباخەکانی، هیچ مێینەیەك بێچووهەڵناگرێ،واتەئاوس نابێ،هیچ بەرێك دانانێ و فڕێی نادات مەگەر بە زانینی ئەو، بەڵێ هەموو موسڵمانی دەبێ باوەڕی هەبێ بەوە.

ئینجاهێندێك سەرشۆڕی وداماوی ئەوڕۆژە دەخاتە بەرچاوو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى﴾باسی ئەوڕۆژەبکەکەخوادەفەرموێ بەوسەرکێشەبت پەرستانە:ئایا هاوبەشەکانی من لەکوێن؟ ﴿قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ﴾ دەڵێن هەواڵت دەدەینێ و جاڕ دەدەین لەخۆمان کەهیچ لەئێمە نی یە بڵێ و شایەتی بدات کە هاوبەشت هەیە و تۆ هیچ هاوبەشێکت نی یە ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ﴾ون بوولێیان ئەوەی لەوەوپێش لەدنیادا هاواریان لێدەکردن، ﴿وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ دەزانن هیچ پەنایەك نی یە بۆ ئەوان و شوێنێ نی یە ببێ بە پەناگایان خوا پەنامان بدات آمین.

لَا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾

---

**ئادەمی زۆر سوورو داخوازە بۆ خۆشی و بەدوای دا دەگەڕێ، زۆر بێزارە لەناخۆشی و مەترسی لێ دەکات و کاتێ کە دووچاری ببێ نائومێد ئەبێ و دنیای لێ دێتەیەك، ئینجا کاتێ خوا دەرووی لێ بکاتەوە بە میهرەبانی خۆی، خۆی لێ دەگۆڕێ و بەمافی خۆی دایدەنێ و بێ باوەڕ بەهاتنی ڕۆژی دوایی و لای وایە ئەگەر ڕۆژی دواییش بێت ئەو هەر کاری لە پێشەوەیە ماتوڵ لەدنیادا وابووەو قیاسی ڕۆژی دوایی یەکەی دەکاتە سەر دنیاکەی، ئەمە زۆرجار بیستراوە لە نەفامان کە دەڵێ فلان ماتوڵ لەدنیادا وا لەخۆشی و ناخۆشی نە نیشانەی چاکین و نە نیشانەی خراپین بەڵکو نیشانەی چاکی بریتی یە لەخواپەرستی و شوێن کەوتنی بەرنامەی خوا، نیشانەی خراپێتی و بەخت شەڕی هەر بریتی یە لەیاخی بوون و لادان لەبەرنامەی خوا، جا با باوەڕدار کێشانەو پێوانە هەر بەوە بکات کە گوتمان. جا ئەوا قورئان تەمێمان ئەکات و ڕێگە ڕاستەکەی خۆیمان نیشان دەدات و هەڕەشە دەکات لەو کەسەی کە بەم جۆرە نەبێ کە باس کراوە وەك لەم ئایەتەدا بۆمان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:** ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾ **ئادەمی ماندوو نابێ و هەمیشە داخوازو سوورە بۆ خێروخۆشی، ئەگەر شەڕو ناخۆشی دووچاری ببێ زۆر نائومێدو داماوە.** ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ﴾ **ئەگەر ئێمە خۆشی پێ ببەخشین بە میهرەبانی خۆمان لەپاش ناخۆشی یەك کە دووچاری بووە،** ﴿لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى﴾ **دەڵێ ئەمە هینی خۆمەو مافی خۆمە،** ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ

﴿لَلۡحُسۡنَىٰ﴾ من لام وا نی یە رۆژی دوایی بەدیٚ دیٚت، ئەگەر راست بوو گەڕیٚنرامەوە بۆلای پەروەردگارم بیٚگومان حالٚو باری چاکم دەست کەوت دەبیٚ لای.

ئینجا با بزانین بەرامبەر ئەو ئادەمی یە چی دەفەرمویٚ: ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ سویٚند بەخوا ئەوانەی کە کافرو بیٚ باوەڕن، واتە ئەو کەسەی بۆچونی بەو جۆرە بیٚت کافرە. سویٚند بەخوا هەوالٚ دەدەین بەو کەسە بەهەر کردەوەیەك کە لەدنیادا کردبیٚتی، سویٚند بەخوا پیٚ ی دەچەژین و دووچاری دەکەین بە سزایەکی ئەستوور، واتە زۆر سەخت، بەلاٚم بەو شیٚوە دەفەرمویٚ کە زۆر سامناکە، چونکە ئەیکات بەشتیٚکی گەورەی خاوەن قەبارەکە سزای پیٚ ئەچەژین، ئەم ئادەمی یە ئەوە بۆچوون و حالٚو باریەتی.

ئینجا هەمیتر لەسەری دەڕواو سیفەتە ناپەسەندەکانی روون ئەکاتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ﴾ کاتیٚ نیعمەتی خۆمان بڕیٚژین بەسەر ئادەمی دا رووی لیٚ وەردەگیٚڕیٚ بە تەکەبورەوە خۆی با ئەدات و لاملی تیٚ دەکات، کاتیٚ ناخۆشی لیٚ کەوت بەرگە ناگریٚ و دەبیٚ بە خاوەنی لالاٚنەوەیەکی بۆپویان، واتە پاڕانەوەیەکی زۆرو فراوان، بەلاٚم وەك لە ئایەتی پیٚشوودا فەرموی: ﴿مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ لیٚرەش دا مەبەست زۆرو فراوانی لالاٚنەوەکەیەتی، بەلاٚم بیٚگومان ئەم تەعبیرە زۆر بەکارەو مەبەستە گرنگ ترەکە نیشان ئەدات. ئەم سیفەتە بەدانە لەناو ئادەمی دا هەیەو بەباشی دەزانریٚ و دەبینریٚن. ئادەمی هەرچۆنیٚ ئەم سیفەتە بەدانە لەناویاندا هەیە، هەروەها سیفەتی جوانو شیرینشیان هەیە. مەبەست لەهەردوو تەمیٚ و ئامۆژگاری یە بە دوورکەوتنەوە لە بەدەکان و خۆڕازاندنەوە بە کردەوەو سیفەتە چاکەکان، ئینجا مەبەست تاکە تاکەو یەکە یەکە نی یە، بەلٚکو مەبەست وجودو بوونی ئەم کردەوە سیفەتانەیە لەناو تیرەی ئادەمیدا، ئیسپاتی سیفەتو کردەوەیەك بۆ جنسو تیرەیەك داخوازی یە بۆ بوونی لە فەردیٚك دا.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ پێ یان بڵێ: ئایا چۆن دەبینن و چ دەڵێن ئەگەر ئەو کتێبە لەلایەن خواوە بێ و پاشان باوەڕی پێ نەهێنن و کافر بن پێ ی، چ کەسێ لاڕێ ترە لەو کەسەی ڕێگای جیاو دوور لەڕاستی گرتبێتە بەر.

خوای میهرەبان ئەم ئایینو قورئانەی نارد کە موعجیزەی ئەم ئوممەتە تا ڕۆژی دوایی و بۆ هەموو گەلو تاقمێك بەڵگەو دەلیل و نیشانە ئاشکراکانی تێدایە. جا هەرکەس خاوەن فام و تێگەیشتن بێت بەهرەمەند دەبێ و هەرکەسیش نەفام و نەزان و عاقیبەت شەڕ بێت ئەوا بێ بەشەو هیچ بیانوویەکی نی یە وەك دەست نیشان ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ بێگومان لەمەوپاش ئایەتەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین ئایەتو بەڵگە ڕونەکان کە لە نەفسی خۆیان دا هەیە، ئایەت و دەلیلەکان ئاشکران لەهەموو ناوچەکانی زەوی و ئاسمانەکان دا، ئایەتەکان لە نەفسی خۆیان دا ئەوەندە زۆرە نایەتە ژمارەو تا بێت نایابی یەکە زیاتر دەردەکەوێ هەر لە پێك هاتنی ئەم ئادەمی یە گرنگە کە تەمسیلی ئەم بوونەوەرە ئەکات لەو نوختە ئاوە کە بەچاوی ئاشکرا نابینرێ لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی نیشانە و سیفەتی هەستیارەکانی و پارێزەری تیرەکەی تێدا کۆبووەتەوە!! چاو بەخۆی و پێڵوو برژانگ و گلێنەکانی و هێزی بینین. گوێچکە بەهەر سێ تەبەقەکەیەوە کە بە پێ ی زانیاری تازە سەدو سێ ملیۆن خەلیەی تێدایەو بە تێك چوونی هەر خەلییەك باری بیستنەکەی خەلەلی تێ دەکەوێ، نازانین لە چ بارێکی یەوە بدوێین چەندەها کتێبی گرنگ دانراوە لەم بارەیەوە کە هێشتا زانین تازە پێ ی ناوەتە قاپی یەوە.

لێرە هەر دەست نیشانێك پێویستە بۆ روون کردەنەوەی هێندێ لەوەی قورئان رێنموونی دەکات بۆی.

ئینجا با بیرێك بکەینەوە لەم زەوی یەی کە دایکی هەموو گیاندارانە بەخۆیان و هەموو شت و مەك و خۆراکەکانیانەوە و ئینجا بیرکردنەوە لە خولانەوەی بەدەوری خۆی دا و بەدەوری خۆردا بەو نیزامەی دامەزراوو نەگۆڕاوەو بەو ئاوی کانیاوو دەریاو دەریا لوشەدا کە لەگەڵ ئەو چیاو شاخە گەورانە کە کانن بۆ ئاوو هەڵی دەگرن و دابەشی دەکەن بەپێ ی ئیرادەی خوا لە کانیاوو سەرچەشمەکاندا، زەوی دەپارێزن لە تاسەو لەنگەرە کردن وەك لە ئایەت دا دەفەرموێ: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ ئەم ئاوە کە هۆی ژیانی گیانداران و بێ گیان و دارو درەختەکانە. بۆ نموونە شتی نایابی تازە لەم چەرخی دوایی یەدا دۆزرایەوە، خوا ئەفەرموێ: ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾ لەژێر دەریای کاریبیدا دوو چەشمەیان بینی کە هەڵدەقوڵێن و تێکەڵ نابن کابرای ئەجنەبی زۆر سەری سوڕما لەوە! لەگەڵ ئەو ئەجنەبی یەدا موسڵمانێکی پاکستانی هەبوو گوتی ئەمە لە قورئانی ئێمەدا باس کراو و ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە ئەویش گوتی ئەوا ئیمانم هێنا بەو قورئانە.

ئینجا ئەگەر سەرێك بەرز بکەینەوە بۆلای ئاسمان و ئەو هەموو خۆرو مانگ و ئەستێرانە هەق وایە لە سەرسوڕماندا شێت‌و شەیدا ببین. الحمد لله الذي انزل علينا و على الدنيا هذا القرآن و هذا النور المبين.

خوای پەروەردگار لە ئایەتەکەدا فەرموی ﴿سَنُرِيهِمْ﴾ ئەو راناوە لە یەکەمجارەوە بۆ بێ باوەڕەکان دەگەڕێتەوە، چونکە باوەڕدارەکان بە بێ نیشاندانی ئەو بەڵگەیانە باوەڕی هەیە بە خوایەتی خوا. هەم زۆربەی ئەو بەڵگەو نیشانانە لەرێگای زانیاری تازەوە دەست کەوت بوون بەهۆی هۆکانی زانیاری تازە کە دەست کەوتنی ئەوان بوو. ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ سوپاس بۆخوای میهرەبان لەگەڵ ئەو شەپۆلی بێ باوەڕی و ئەو هەموو پیلانی جوولەکە بۆ لادان لەرێگەی ئیسلام.

﴿أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾﴾

لەگەڵ هەموو ئەوانەدا ئەم وریا بوونەوە صحوە عالەمی یە بەرە بەرە پەرە دەستێنێ و ئەو بەڵێنی خوا بەدی دێت کە ئاگایە بە هەموو شتێك وەك دەست نیشان ئەکات کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ ئایا بەس نی یە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر کە خوای تۆ ئاگادارو زانایە بە هەموو شتێك؟

ئینجا ئاگاداری دەکات لە گومان و بێ باوەڕیی نەفامان بە هاتنی ڕۆژی دوایی و گەیشتنی هەمووان بە حوزوری و ئینجا هەڕەشەی خوا لێ یان، دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌۢ﴾ با بزانرێ ئەو نەفامانە لە گوماندان لە گەیشتن بە حوزوری خوا، با بزانرێ خوا ئاگادارەو بە عیلم و بە قودرەت دەوری هەموو شتێکی داوە، کەواتە بۆ کوێ دەڕۆن و چۆن لەدەستی خوا دەرئەچن.

آمنا بكتابه العزيز و بجميع ما جاء به رسوله الكريم(ﷺ) وعلى آله و أصحابه و أزواجه أمهات المؤمنين و على كل من دعا بدعوته إلى يوم الدين.

١٤١٨/٤/١٢ لە هەڵەبجە لێ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە بۆ جاری دووەم، چونکە ئەوەی جاری یەکەم ون بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾

## سورەتی (الشوری)

## مەککەیی یەو (لەمەککەش هاتووەتە خوارەوە) ٥٣ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتەش وەکو سورەتە مەککەیی یەکانی تر مەبەستی جێگیرکردن و دامەزراندنی عەقیدە و بڕوایە لەدڵ و دەروون دا، بە تایبەتی وەحی و پەیامی خوا تا رادەیەك ئەو عەقیدەو بڕوایە مەرکەزێکی سەرەکەی یەو هەموو باس و ئایەتەکانی سورەتەکە ئەگەڕێتەوەو پەیوەستە پێ یەوە وەك لەمەوپاش رون ئەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەدا زۆر بە فراوانی و گرنگی تاك و تەنیایی خوا نیشان ئەدات کە ئەوە بنەڕەتە بۆ هەموو کاروکردەوەیەك و هەر کارو کردەوەیەك لەسەر ئەو بنەڕەتە نەبێ بەتاڵ و بێ نرخە.

لەپاش ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئینجا پێنج پیت لەو چواردە پیتە ئەهێنێ کە لە ١٩ سورەتی قورئان دا هاتوون وەك چەند جار باس کرا. ﴿حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ﴾ لەبارەی مەبەست بەو پیتانە ٢٠ را هەیە هەرکام ئەگونجێ، بەڵام لەڕاستیدا چاك وایە حەواڵەی خواو پێغەمبەرەکەی بکرێ(ﷺ). بەهەرحاڵ هێنانی ئەو پیتانە بەر لێ بڕینەوەیان لێ وەردەگیرێ بە نەزەر هەموو ئادەمی یەوە، بە تایبەت عەرەب کە یەکەمجار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا، بەمەی ئەم قورئانە پێك هاتووە لە وێنەی ئەم پیتانە کە قسەو گفت و گۆی خۆیانی لێ پێك دێنن لەگەڵ ئەوەدا نەیانتوانی بە ئەندازەی کەمترین سورەتی بڵێن، کەواتە ئەبوو هەموو ئیمانیان بهێنایە بەوەی کە قورئان فەرمودەی خوایە. ئینجا باسی یەکێکی سەرچاوەی وەحی و پەیامەکانی خوا دەکات بۆ هەموو پێغەمبەرەکانی، دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ هەر بەو جۆرو شێوە، واتە ئەی پێغەمبەر کە ئاشنای پێ ی و زانراوە لات خوا وەحی کردووە بۆلای تۆو هەموو ئەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ، وەحی کردووە و دەیکات ئەو خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یەو زاڵ و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك داو لێزان و کاردروستە لە هەموو کارو بڕیارو کردەوەکانیدا.

لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ۚ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ

**ئینجا نموونەی زاڵی و کاردروستی یەکەی ئەمەیە کە دەفەرمویٚ:** ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ **هەر بۆ ئەوەو موڵکی ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا. ئەمەش شتێکی ئاشکرایە لای هەموو ژیریٚ کە خوا دروست کەرو داهێنەرە** ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ﴾ **هەر ئەو بەرزو بڵندو گەورەیە. ئاشکرایەکە تەنها خوا ئەم هەموو شتەی لە نەبوون هێناوەتە کایە دەی ئەبیٚ هەر ئەو کەسە بەرزو بڵندو گەورە بێت بە پیٚ ی تێگەیشتن و زانینی ئێمە ئەم شتانەی کە لەم بوونەرەدا هەن بە تایبەتی بیٚ گیان و بیٚ زمانەکان بیٚ ئاگان لە ناسین و بەندەیی خوا، بەڵام چەندەها ئایەتو حەدیس تێمان ئەگەیەنن کە هەموو دروست کراوەکان بە گیانلەبەرو بیٚ گیانەکانەوە هەموو خوای خۆیان دەناسن وەك لە چەند شوێنێك لەم تەفسیرەدا باسمان کردووە بە پیٚ ی دیمەنو رواڵەتی ئەو ئایەتو حەدیسانە کە بەبیٚ بەڵگە نابیٚ لیٚ یان لادەین و تەئویلیان بکەین. جا یەکیٚ لەو ئایەتانە ئەمەیە کە لێرەدا دەفەرمویٚ:** ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ﴾ **نزیکە ئاسمانەکان پارە پارە ببن لای سەروویانەوە کە وێران بوون و پارە پارە بوونی ئاوا ئەوپەری وێران بوونە. کەواتە ئاسمانەکان کە بەلای ئێمەوە بیٚ گیانن ئەوا بۆمان روون دەکاتەوە کە خوای خۆیان دەناسنو سام و بیمیان لیٚ ی هەیە تا ئەو رادەیە خەریکن پارە پارە ببن – نەك وەك ئێمەی بیٚ شەرم – لەبەر تاوان و گوناهی ئێمەی تاوانبار بەشێوەی گشتی یان بە تایبەتی کە نەفامەکان ئەولادی بۆ رەوا دەدەن، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویٚ:** ﴿أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا﴾ **ئینجا ئاسمانەکان خەریکن پارە پارە ئەبن لەوەی ئەولاد بڕیار بدریٚ بۆخوا، کەواتە دەبیٚ چۆن ببن بەهۆی تاوانی گەورەترەوە کە هێندیٚ لە نەفامان وەك تادار وڕێنەی پیٚ دەکەن و دەڵێن پەروەردگار نی یە؟!!** ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ﴾ **مەلائیکەکان بە سوپاس و سەناوە پەروەردگاریان بە پاكو خاوێن راگیر دەکەن لەهەموو لەکەو عەیبێك، یان لە رەوا دانی هاوبەش بۆی یان لە بڕیاردانی ئەولاد بۆی، بەهەرکام لەم سیٚ شتە ناشایستە ئایەتو بەڵگەیە، بەڵام بەشێوەی پێشوو گشتی یە بۆ هەموو جۆرە بەدەکان کە باس کران.**

وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا

---

**﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ داوای لێ بوردن دەكەن بۆ گوناهبارانی سەر زەوی لە لوتف و میهرەبانی یەكەی بەزیادبێت كە ئیزنی مەلائیكەكان ئەدات و داوا ئەكەن بۆ ئەو تاوانبارانە. ئەگەر مەبەست هەموو دانیشتوانی سەر زەوی بێت داوای لێ بوردنەكەیان بریتی یە لە تكاكردن بۆ هیدایەت و گەڕانەوەیان لە خراپە، یان بریتی یە لە تێكۆشان لە هاندانی تاوانبار بۆ رێگەی خوا، ئەگەر مەبەست داوای لێبوردن بۆ ئیمانداران بێت وەك لە ئایەتێكی تردا هاتووە ﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەگەر ئەوە مەبەست بێت ئەوە مەبەست تكاو شەفاعەتە. بەهەرحاڵ ئەوانە بەرهەمی ئەوە، بەرهەمی ئەم دوو سیفەتە شیرینەیە كە بەم شێوە گرنگە جاری پێ ئەدات،﴿أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئاگاداربن كە تەنها خوا لێ بوردەی میهرەبانە لە گوناهو تاوان تەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ) بۆی نی یە ببورێ لە گوناه.**

**ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەكات و لەهەمان كاتدا هەڕەشە ئەكات لە بێ باوەڕەكان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾ ئەوانە كە تێپەڕ ئەكەن لە پەرستنی خواو بێجگە لەو چەند خاوەن و هاوبەش بڕیار ئەدەن، خوا ئاگادارەو چاودێرە بەسەریانەوە، تۆ ئەی پێغەمبەر كار بەدەست نیت بەسەریانداو كاری ئەوانە حەواڵەی تۆ نەكراوەو ناتوانی باوەڕیان پێ بێنی، ئەم ئایەتە لەلایەكی ترەوە جۆرە عیتابێكە لە پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی كە ئەوەندە غەمبار دەبێ لەسەر بڕوا نەهێنانی ئەوانە، ئەو غەم خواردنە هەرچەندە لەبەرخوایە، بەڵام باری باش تر ئەوەیە بەبێ چەند و چۆن بوەستێ بەدیار كاری خواوە. لەپاش ئەو گەردشەی كە كردی بەدڵ و دەروون، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ دڵنیا كردن لەبارەی وەحی و چۆنیەتی وەحی، دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا﴾ هەر بەو جۆرە شێوەی كە ناسراوە لات وەحیمان كردە لات قورئانێك بەزمانی عەرەبی**

لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾

---

﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ بۆ ئەوەی بترسێنی مەککەو دەوروبەری لەهەموو جیهان کە ئەم پەیامە بۆ هەموو جیهان و جیهانی یانەو لەپاش خۆی بەهۆی یارەکانی و موسڵمانان تا دنیا دنیایە. یان لێرەدا مەبەست هەموو عەرەبەکانە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) خۆی لە ژیانی خۆی دا ئەو ترساندنەی کرد. ﴿وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ بترسێنی لەرۆژی کۆبوونەوەو کۆکردنەوەی هەمووان چ چاکان و خراپان کە هیچ جۆرە گومانێك نی یە لەوەدا لای هەموو ژیرێك و ئەوانەی کە گومانیان هەیە گومانەکەیان بە نەبوون سەیر ئەکرێ، چونکە بەڵگەو رابەری بەهێز هەیە لەسەربوونی راستی یەکەی. ئینجا لەو رۆژەدا هەموو زیندوو کراوەکان ئەبن بە دوو تاقم ﴿فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ﴾ تاقمێك لە بەهەشت دا دەبن و تاقمێك لە ئاگری بڵێسەداردا خوا پەنامان بدات لێ ی ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ ئەگەر بیویستایە دەیگێڕان بەیەك ئوممەت هەموو هەر باوەڕدار یان هەمووی بێ باوەڕ بە وێنەی مەلائیکە کە هەر باوەڕدارن یان شەیاتین کە هەر بێ باوەڕن.

واتە ئەگەر مەیلی ببوایە لەسەر یەك بۆچوون و سروشت دروستی دەکردن و هەر بۆیەك بار دەستیان دەدا، بەڵام بەو جۆرەی نەکرد، بەڵکو وای دروست کردن ئیختیاری پێدان و دەست دەدەن بۆ هەردووبار، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ بەڵام مەیلی هەرکەسی کرد ئەیخاتە ناو رەحمەتەکەی، واتە بەهەشت. ستەمکارەکان هیچ خاوەن و دۆستێکیان نی یە و هیچ یارمەتی دەرێك لەرۆژی دوایی دا، با بزانرێ خستنە بەهەشت و ئاگرەکە بەپێی کردەوەی بەندەکانە کە بە ئیختیارو هەڵبژاردنی خۆیانە، کەواتە هیچ زۆر پێ هێنان نی یە. ئادەمی کرد بە خەلیفە ئەوەش داخوازە بۆ ئەوە کە دروست کراوێکی وابێ.

أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا

---

**لەپاش ئەوە فەرمووی بەبێ باوەڕەكان هیچ دۆست و خاوەن و كاربەدەستیان نی یە. ئینجا ئەگوێزێتەوە بۆ مەبەستێكی تر كە مەبەستی پێشوو بەهێز دەكات و بەشێوەی پرسیارێك بێزاری دەردەبڕێ لە باوەڕە پووچەكەی ئەوان و دەفەرمووێ: ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾ ئایا ئەوانە لەخوا تێپەڕ دەكەن بێجگە لەو چەند دۆست و كاربەدەست بۆخۆیان بڕیار دەدەن؟ واتە كارێكی زۆر بەد بڕیار دەدەن و باوەڕێكی پووچ و بۆگەنیان هەیە، ئەگەر ئەوە دەكەن و بەدوای خاوەنی راستەقینەدا دەگەڕێن ﴿فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ با بزانن كە تەنها خوا خاوەن و كاربەدەستە بۆ هەمووان، تەنها ئەو مردوو زیندوو ئەكاتەوەو هەر ئەو توانا و دەسەلآتدارە بەسەر هەموو شتێكدا.**

**جارێكی تر ئاگاداری دەكاتەوە بۆ مەبەستە سەرەكی یەكەی سورەتەكە كە بریتی یە لە پابەندبوون بەم وەحیە كە بریتی یە لەوەی پێغەمبەر هێنای، دەفەرمووێ: ﴿وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ لەهەر شتێك دا ئیختیلاف و دووبەرەكیتان بوو بڕیاری ئەوە هەر لای خوایە و دەبێ بگەڕێتەوە بۆ بڕیاری ئەو نەك بۆ هەوای نەفس كە ناوەستێ و هەر رۆژێ بە بارێك دایەو خەڵكی گومڕاو سەرگەردان دەكات. بەرامبەر ئەو حەقیقەتە راستە تەمێ ی پێغەمبەر(ﷺ) دەكات كە بڵێ بەهەمووان ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ ئەو كەسەی كە ئەبێ هەر شوێنی بڕیاری ئەو بكەوین ﴿الله﴾ یە كە پەروەردگاری منەو پشتم هەر بەو بەستووەو هەموو كاروباری خۆم هەر حەواڵەی ئەو دەكەم و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە.**

**﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ داهێنەری ئاسمانەكان و زەوی یە ﴿جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا﴾ گێڕاویەتی بۆیان هەر لەخۆتان – واتە ئادەمی – هاوسەران كە ئەوە نیعمەتێكی زۆر گەورەیە نەبوونی ئەوە دژ و پێچەوانەی جێنشینی یەكەیەتی، چونكە ئادەمی كە كراوە بە جێنشین بنەڕەتەكەی ئەبێ لەسەر خێزان بێت، لەخێزان گەل پێك دێت، پەرەسەندن و زۆربوون بەوە ئەبێ نێرو مێ بكەونە یەك و زاوزێ بكەن.**

وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗاۖ يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٢﴾ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِ

---

**جا بۆ ئەو پەرەسەندن و زۆربوونە بەو شێوەیە بۆ هەموو گیانلەبەرانە وەك دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗاۖ﴾ واتە لەم چوار جۆرە گیانلەبەرەدا: حوشترو مەڕو بزن و ڕەشەوڵاخ بڕیاری داوە لەو ڕێگەی نێرو مێ و گەیشتنیان بەیەك پەرە بستێنن. لەناو هەموو گیانلەبەران دا ئەم چوارەی باس کرد کە بەکەڵك ترینن بۆ ئادەمی ﴿يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ﴾ لەوەی کە باس کراوە بەو تەگبیرە ئێوە زۆردەکات و پەرەتان پێ دەستێنێ ئەو خوایەی کە ئەبێ هەر بڕیاری ئەو هەق و ڕاستەو لەهەموو ئاژاوەو دوبەرەکی یەك دا گەڕانەوە بۆلای ئەو خوایەیە کە داهێنەری هەموانەو ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾ وێنەی هیچ شتێك نی یەو تاك و تەنیا و جیاوازە لەهەموو شتێك پەیوەندی هەیە لەگەڵ هەموو دروست کراوەکانی بەزانین و بینین و بیستن و لەڕاستی دا هەر ئەو بیسەرو بینەرە وەك دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ هەر بستن و بینینێ کە هەیە دروست کراوی ئەوەو بەرهەمی ئەو بینین و بیستنەی ئەوە، کەواتە هەموو حوکم و بڕیارەکانی بەزانین و بینین و بیستنە و هەر ئەو ڕاستە ﴿لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەر بۆ ئەوەو موڵکایەتی و کلیلی خەزنەکانی ئاسمانەکان و زەوی، رزق و ڕۆزی هەمووان هەر بەدەست ئەوەو بەپێی لێزانی و کاردروستی خۆی ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ﴾ بە فراوانی ڕۆزی ئەدات بەهەرکەس خوا خۆی ئیرادە بکات و کەم و کوڕی ئەکات و ئەیگرێتەوە لەهەرکەس خوا خۆی مەیلی ببێ ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ خوا ئەم کارانە دەکات، چونکە بەڕاستی ئەوپەڕی رادە ئاگاو زانایە بەهەموو شتێك، کەواتە هەر ئەبێ حوکم و بڕیار هەر بەدەست ئەو بێت و هیچ حوکم و بڕیارێکی تر ڕاست و ڕەوا نی یە.**

**ئینجاجارێکی تریش دەگەڕێتەوەبۆمەبەستی سەرەکی سورەتەکەومیحوەرەکە، دەفەرمێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ﴾ دایناوە**

بۆتان لە ئایین دا کە فەرمانی پێداوەو وەسێتی پێ کردووە بە نوح کە یەکەم ﴿رسول﴾ ە لە ﴿اولوا العزم﴾ ەکان، ئەوەی کە ئەی محمد وەحیمان پێ کردووە بۆلای تۆ، ئەوەی کە فەرمانمان پێداوە بە ئیبراهیم و موساو عیسا. ئەم پێنجە پێ یان ئەوترێ ﴿اولوا العزم﴾ لەبەرئەوەی هەرکام خاوەنی شەریعەتێکی سەربەخۆ بووە نەك وەك پێغەمبەرەکانی تر تابیعی یەکی لەم شەریعەتە گەورەو سەربەخۆبوو، بۆ روون کردنەوە موسا(علیه السلام) کە یەکێکە لەو ﴿اولوا العزم﴾ انە لەپاش ئەو تا عیسا هەر پێغەمبەرێك هاتبێ تابیعی شەریعەتی تەورات بووە، لەپاش عیسا تا هاتنی خاتەمی هەموان(ﷺ) هەر پێغەمبەرێك هاتبێ تابیعی شەریعەتی ئینجیل بووە تا هاتنی خاتەم(ص) و علیهم اجمعین. ئەم فەرمودەیە ئاراستەی ئەم ئوممەتە کراوە تا رۆژی دوایی. خولاسەو کورتەی ئایینی هەموان ئەمەیە کە دەفەرموێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ ئەو ئایینەی کە بۆتان هاتووە بەرێك و پێکی راگیری بکەن و دووبەرەکی مەبن تێیدا. ئەو ئایینەش بریتی یە لە باوەڕی رێك و راست بەخواو تاك و تەنیایی خواو باوەڕ بە مەلائیکەو نامەکانی خواو پێغەمبەرەکانی و باوەڕ بە زیندوو بوونەوەو هاتنی رۆژی دوایی.

کاتێ ئیماندار بیر بکاتەوە لەم ئایەتە بۆی دەردەکەوێ خۆی یەکێکە لەو کۆمەڵە بەرزە کە بەدرێژایی چەرخ و زەمان هاتووە لەسەر یەك بیروباوەڕی پاك و خاوێن کە کۆتایی هاتووە بە کۆمەڵی هەتا هەتایی تا رۆژی دوایی. کۆمەڵێ شوێن کەوتووی گەورەترین و خاتەمی هەموو فروستادەو نێرراوەکانی خوا، کاتێ بەو باوەڕو بۆچوونە بیر بکاتەوە دەبێ هەست و دڵی پڕ بێ لە شادمانی و شانازی، لەو رێگەدا هەر ناخۆشی و ئازارێکی دووچار ببێ، دەبێ نەپسێ و نائومێد نەبێ، چونکە بەهۆی بوونی لەو کۆمەڵە پیرۆزە دڵنارامە کە دوا رۆژو سەرکەوتن مسۆگەرە بۆی. دەبێ ئیمانداری راستەقینە هەست و هۆشی بەو جۆرە بێت، غەم و پەژارەو ترسی لەوە بێت لەو کۆمەڵە بپرێ و خوانەخواستە لابدات لێ یان. ئەگەر ئەم حەقیقەتە لەدڵی شوێن کەوتووەکانی موساو عیسادا جێگیرو دامەزراو بووایە بێگومان ناڕێکی و شەڕو ئاژاوە هەرگیز پەیدا نەدەبوو هەموو ئەهاتن بە سۆزو پەرۆشەوە دەستە مل دەبوون لەگەڵ موسڵمانان دا، موسڵمانان لەژێر قیادەی پێغەمبەراندا(ﷺ) هەر لە سەرەتاوە بەو بۆچوون و هەستە پاکەوە هەوڵیان دا لەگەڵ یەهود و نەسارادا، بەڵام زۆربەی ئەوان لەبەر لاری و حەسادەتیان نەهاتن بەدەم بانگ و بانگەوازەکەی ئیسلامەوەو ئەو هەموو جەنگ و ستەمەیان بەکارهێنا لەگەڵ ئێمەی موسڵمانان و ئایینەکەمان.

**هێشتا سەرباقی ئەوە موسڵمانەکان بەرامبەر خراپەکانی ئەوان هەر چاکەیان کرد. بەڵگەی قەتعی لەسەر ئەوە ئەمەیە گاورو جولەکە بەخۆشی و کامەرانی دەژین لەولاتی ئیسلام دا. دەبوو موشریکەکانیش کە خۆیان بەشوێن کەوتووی ئیبراهیم و ئیسماعیل دادەنا ئەوانیش بهاتنایەو دەستی برایەتی و ئاشتیان راکێشایە، بەلاّم بەداخەوە زۆر سەخت و ناڕەحەت بوو ئەم رێگە راستە بدەنە بەر وەك دەفەرموێ: ﴿كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾ زۆر سەخت و گران بوو لەسەر ئەو موشریکانە ئەی پێغەمبەر ئەوەی تۆ بانگیان دەکەیت بۆی کە بریتی یە لە پەرستنی خوا بەتاك و تەنیا و ئەو رێگە راستە بدەنە بەر کە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمدی پێ هات. سەخت و گران بوو لەسەریان کە وەحی و پەیام بێتە سەر محمد کە لەوەو پێش دەسەلاّت و سەڵتەنەت لە دەستی ئەوان دا بوو، سەخت بوو لایان کە پێ یان بگوترێ: باوك و باپیرتان بە گومڕایی رۆیشتوون. زۆر سەخت بوو لەسەریان وازهێنان لەو بۆچوون و باوەڕەی کە چەند ساڵە دەقیان پێوە گرتبوو مەسەلەکەیان بەپێ ی بۆچوونی خۆیان کێشانە دەکردو نەیان ئەزانی کە ئەمان شایستەی ئەوە نین، بەڵکو ﴿ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ خوا کەسێك ئیختیار دەکات بۆلای خۆی کە دەگەڕێتەوە بۆلای خوا، واتە هەر خوا دەزانێ کێ شایستەو شیاوە بۆ ئەو کارە گەورەیە، خۆی دەزانێ کە محمد(ﷺ) لایەقە بۆ ئەوە نەك ئەوانەی کە ئەمان بۆی هەڵدەبژێرن.**

**ئینجا هەڵوێستی بەدی ئەوانە روون دەکاتەوە و هۆکەشی باس دەکات کە حەسەدەو ئەمانە دەردەدارن بە دەردی کوشندەی حەسادەتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيَۢا بَيْنَهُمْ﴾ ئەوانە خۆیان جوێ نەکردەوە و لایان نەدا لە رێگەی پێغەمبەرەکان مەگەر لەپاش ئەوەی زانینیان بۆهات و دەزانن خۆیان بەدن و لایانداوە، کەواتە هۆی لادانەکەیان نەزانین نەبووە، بەڵکو هەر لەبەر سەرکێشی و حەسادەت لایانداوە،**

وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ

**﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ لەگەڵ ئەو هەموو تاوانە گەورەدا خوا مۆڵەتی دان و یەکسەر لەڕیشەی نەهێنان لەبەر ئەوەی بڕیار لەلایەن خواوە دەرچووە بەهێشتنەوەی ئەو تاوانبارانە تا ماوەی ناوبراوو دیاریی کراوە بۆ نەهێشتن و سزادانیان. ئەوانەی یەکەم چین کە بە زانینەوە ڕێگە ڕاستەکەیان نەدایە بەر لەبەر حەسادەت و زوڵم کردن لە هەق و لەخۆیان، حاڵ و باریان بەو جۆرە بوو کە باس کراوە و چینەکانی پاش ئەوان کوێرانە کەوتنە شوێنی ئەوانە بەبێ زانین و بەڵکو گوماندارو دوو دڵ بوون لە عەقیدەکەیان دا وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ﴾ ئەوانەی پاش یەکەم چین کە نامەیان پێ درابوو لە گومان و دوو دڵی یەکدا بوون کە بێ ئارامی کردبوون، چونکە لە لایەکەوە باوەڕیان نەبوو بەڕاستی ئەو بیروباوەڕەی کە پێ یان گەیشتبوو، لەبارێکی ترەوە نەیان ئەتوانی وازبێنن لەو ئایینەی کە لە باوك و باپیریانەوە بۆیان هاتبوو، جا لەبەر ئەوە ڕێگەی ڕاستی خواو قیادەی ئادەمی بە سەرگەردانی مایەوەو پەیوەندی نەما بە ئایینەکەی خواوە. لەبەر ئەوە خوا محمدی ڕەوانە کرد(ﷺ) کە ڕێگە ڕاستەکەی خوا ئاشکرا بکاتەوەو بانگی هەمووانی بۆ بکات وەك لەم چەند بەندەدا ئاماژەی بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ﴾ بانگی هەمووان بکە بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خوا کە هەموو پێغەمبەران هێنایان، بە تایبەتی نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و لەپاش ئەوان ئەی محمد کە تۆ هێنات ﴿وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ﴾ بەرێك و پێکی و دامەزراوبە هەرچۆنێ فەرمانت پێدراوە بێگومان کارو فرمانەکەی زۆر گەورەیە لە توانای هیچ کەس دا نی یە یارمەتی خوا نەبێ و فەرمانی پێدراوە کە بانگی هەموو جیهان و جیهانی یان بکات و جاڕی گومڕایی بدات لەهەمووان و پووچەڵی هەموو بیرو باوەڕو ئایینێك بێجگە لەم ئایینەی کە ئەم هێناویەتی﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ﴾ شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە کە هەر دەستەو تاقمێك ئامانج و مەبەستێکی جیاوازی هەیە، گوێ بە هیچ کەس و بە هیچ شتێك مەدە،**

وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ۖ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ۖ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ۗ

---

**﴿وَقُلْ﴾ و بڵێ: ﴿ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ﴾ باوەڕم هێنا بەهەر نامەیەك كە خوا هێناویەتە خوارەوە. ﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ فەرمانم پێ دراوە كە بە عەدل ڕەفتار بكەم لەنێوانتان دا، كەواتە ئاینەكەی خاوەن دەسەڵاتە و جاڕی دادو دادپەروەریی ئەدات لەگەڵ هەمووان دا ئەم ئایەتە هاتەخوار لە مەككەدا لەكاتێك دا كە بانگ و بانگەوازەكەی چوار دەور درابوو لەنێوان دیوارەكانی مەككەدا، هەروەها هەموو ئایەتەكانی تر لە مەككەدا هاتنە خوارەوە و جاڕی جیهانی یەتی ئەم ئاینەیان دا. ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە لە كاتێك دا كە موسڵمانان لەژێر ئەشكەنجەو ئازاردابوون و مەگەر كوڕی زۆر بەجەرگ زاتی ببوایە موسڵمانێتی خۆی دەربڕێ، ﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ﴾ بڵێ خوا كە ناوی ﴿الله﴾ یە پەروەردگار و كاربەدەستی ئێمەو ئێوەیە، كەواتە تەنها كاربەدەستێك هەیە بۆ هەمووان ﴿لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ كردەوەی ئێمە هەر بۆ ئێمەیە و كردەوەی ئێوەش هەر بۆ خۆتانە، كەواتە هەركام ئیختیاری هەیە و خۆی بەرپرسیارە لە كردەوەی ئێوەش هەر بۆ خۆتانە، كەواتە هەركام ئیختیاری هەیە و خۆی بەرپرسیارە لە كردەوەی خۆی ﴿لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾ هیچ جۆرە ئاژاوەو دووبەرەكی نی یە لەنێوانماندا، چونكە هەق و ڕاستی ئاشكرابوو، كەواتە هۆی بەربەرەكانێ و سەرپێچی نەما مەگەر ئێوە هەر بتانەوێ دان نەنێن بەهەق دا ﴿ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا﴾ خوا لەڕۆژی دوایی دا كۆمان ئەكاتەوە ﴿وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ گەڕانەوەو دوا ڕۆژ هەر بۆلای ئەوە، كەواتە حاڵ و باری ئێوە لەوێ دەردەكەوێ و حاڵ و باری ئێمەش ڕوون دەبێتەوە. مەبەست ئەوە نی یە هەركام لەماڵی خۆمان دا دانیشتین و هەقمان نەبێ بەسەر یەكەوە. ئەوە**

مەبەست نی یە تا بڵێین نەسخ کراوەتەوە بە سورەتی ﴿الکافرون﴾ ئەم تەنیا ئایەتە حەقیقەتی ئەم پەیامە روون ئەکاتەوە لەم چەند وتەو یاسادا، روونی دەکاتەوە بەو عەزم و ئیرادە بەهێزە کە پەیامێکی وایە ئەوەندە پشت ئەستوورە بە راستی یەکەی خۆی، هاتووە بۆ ئەوەی بە بێ باك رێگای خۆی بداتە بەر هەواو ئارەزووی هیچ کەس نایوەستێنێ و لایئادات، هاتووە بۆ ئەوەی حەکەم و چاودێر بێت بەسەر هەموو ئاین و بیرو بۆچوونێکەوەو عەدل و دادپەروەریی بەکاربێنێ لەزەوی دا. هاتووە بۆ ئەوەی تەنیا رێگە بۆلای خوا بکات بە تەنیا رێگەیەك وەك لە راستی دا تەنیا رێگەیەکە بە درێژایی چەرخ و زەمان.

ئینجا لەپاش روون کردنەوەی ئەم حەقیقەتەو لەپاش گوێ رایەڵی کۆمەڵێکی پاك و بەختەوەر، ئاشکرایە دەمە دەمێ و مجادلە کردنی نەفامان بێ نرخەو شایستەی ئەوەی نی یە گوێ ی بۆ بگیرێ و هیچ نرخێکی نی یە، کەواتە با لێ یان گەڕێین بۆ تۆڵە و عەزابی خوا وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٌ وَلَهُمۡ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانە دەمە دەمێ و موجادەلە ئەکەن لەبارەی خواو ئایینی خوا هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نی یە و ئەوەی بە بەڵگەی دادەنێن بەتاڵ و بێ بنچ و بنەوانە لای خوای پەروەردگاریان، خەشم و رقی خوا دەبارێ بەسەریان دا، سزاو عەزابێکی سەخت و بەتین هەیە بۆیان، هەرکەس لای خوا بەو جۆرە بێت چارەنووسی لەهەردوو جیهان دا زیانباری و خەسارەتمەندیی یە خوا پەنامان بدات.

ئینجا گەردشێکی تر دەکات بەدڵ و دەروون لەبارەی یەکەم مەبەست و حەقیقەتی یەکەمجارەوە کە لەسەر میحوەری سورەتەکەیە. دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَـٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ ئەو خوای کەناوی ﴿الله﴾ یە نامەی هێناوەتە خوارەوە کە حەق و راستی پێ یە لە هەموو فەرمان و بڕیارەکانی دا، شەریعەتێکی هێناوەتە خوارەوە کە میزان و تەرازووە بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو ناهەقیێ، واتە هەر بەو شەریعەتە دەردەکەوێ کام بۆچوون و بیرو باوەڕو کردەوەیەك کە ناهەق و ناڕەوایە، واتە تەنیا نامەو شەریعەتەکەی خوا حەکەم و جیاکەرەوەی هەق و ناهەقە،

وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾

---

﴿وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ﴾ **تۆ چووزانی کەی دێت ئەو رۆژی دوایی یەی کە هەواڵی داوە بە هاتنی و لەو رۆژەدا جەزاو پاداشتی هەق و ناهەقەکان ئەنجام ئەدرێن. تۆ نازانی ئەو رۆژە کەی دێت، بەڵام چاوەڕوانی بکەو هاتنی شتێکی نزیکە، بێگومان نزیکە چونکە هەرچی کە بێگومان دێت نزیکە وەك دەڵێن: ﴿کل آت قریب﴾ لەبارێکی ترەوە هەر نزیکە چونکە ئەوەی ماوە لە تەمەنی دنیاو ئەم بوونەوەرە زۆر کەم و کورت و نزیکە لەچاو ئەوەی تێپەڕی کردووەو بێجگە لەخوا هیچ کەس نازانێ و نەیزانیوە ئەندازەی چەندێکە. ئەو رۆژی دوایی یە بێگومان دێت**﴿يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ﴾ **ئەوانەی کە باوەڕیان پێ ی نی یە پەلەی پێ ئەنێنەوەو بە لاقرتی یەوە دەڵێن کوا بۆ نەهات؟ ئەگەر راستە با بێت ئەو هەق و ناهەقەی کە ئێوە دەڵێن با دەرکەوێ!! ئەوانەی کە نەزان و نەفامن لاقرتی دەکەن و پەلەی پێ دەنێنەوە، بەڵام** ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّ﴾ **ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو هەیە دەترسن لێ ی، چونکە دەزانن دێت و رۆژێکی سامناکە و پێغەمبەرانیش – سەلامی خوایان لێ بێت – لەکاتی پرسیارو موحاسەبەی خوا لەگەڵیان گۆیان دەبەسترێ و دەڵێن هیچ نازانین.**

**بەراستی هەر کەسێك بێ بەش نەبێ لە هەموو فام و تێگەیشتنێك نابێ گومانی هەبێ لە هاتنی ئەو رۆژە، چونکە ئەو کەسەی کە لە یەکەمجارەوە دروستی کردین، هەروەها دووبارە کردنەوە هیچی تێ ناچێ. جا لەبەر ئەوە دەربارەی ئەو بێ باوەڕانە فەرموی:** ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ﴾ **بێدار بن بەڕاستی ئەوانەی کە گومانیان هەیە لەرۆژی دوایی و هاتنی دا لە گومڕایی یەکی زۆر دووردان، زۆر دوورن لەبۆچوون و تێگەیشتن دا، چونکە ئەوەندە بەڵگەی روون و ئاشکرا هەیە لەسەر راستی هاتنی ئەو رۆژە هەرکەس ئەوپەڕی رادە نەفام و نەزان نەبێ گومان رووناکاتە دڵی، خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ لەو کوێریی و نەفامی یە آمین.**

﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ١٩ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ٢٠﴾

**ئینجاسەرنجی دڵ ڕائەکێشێ بۆلای ئەورزق ورۆزی یەی کەخوادەیبەخشێ بە بەندەکانی دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ﴾ خوا خاوەن لوتف و میهرەبانی یە لەگەڵ بەندەکانی ﴿يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ﴾ رۆزی دەدات بەهەرکەسێك کەخوا خۆی مەیلی هەبێ ولەکاتێکدا کە هەرئەوبەهێزوتواناوزاڵەبەسەرهەموو شتێك دا و هیچ کەس ناتوانێ سەرپێچی بکات لێی.**

**بەڕواڵەت مەسەلەی ئەم رۆزی یە پەیوەندی نی یە بە ئایەتی پێشووەوە کە باسی رۆژی دوایی دەکات، بەڵام مەسەلەی رۆزی یەکە سەرەتایە بۆ ئایەتی داهاتوو کە دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ هەرکەس نیازی هەیە و کشتوکاڵی رۆژی دوایی فەراهەم بێنێ، واتە لەم دنیادا کردەوە چاکەکان دەکات کە پاداشت و بەرهەمەکانی لەرۆژی دوایی دا دەست کەوت دەبێ، فەرموی هەرکەس ئەوەی مەبەست بێت زیاد دەکەین بۆی لە کشتوکاڵەکەیدا، واتە ئەجرو پاداشتی دەدەینەوە بەچەند چەندانە کە لای خواروەکەی دە قاتە. هەرکەس مەبەستی لە کردەوەکانی هەر کشتوکاڵی ئەم دنیایە، واتە هەوڵ و تێکۆشانی هەر بۆ ئەم دنیایە و گوێ ی نی یە لە ژیانی رۆژی دوایی لەخۆشی و کامەرانی ئەم دنیایەی پێ دەدەین، بەڵام هیچ بەشێکی نی یە لەخۆشی و کامەرانی ئەو دونیاو بەشی لەوێ هەر سزاو ئاگرە خوا پەنامان بدات. لە ئایەتی پێشوودا گوتمان کە بە رواڵەت مەسەلەی رۆزی پەیوەندی نی یە بە ئایەتی پێشووەوە کە باسی رۆژی دوایی دەکات، بەڵام بەم ئایەتە کە ئێستا خەریکین بە تەفسیری یەوە پەیوەندی یەکە روون و ئاشکرا دەبێ، هەر بە قورئان ئەکەوێ قسە بکات. – جلا جلا منزلە – لەکۆتایی دا کارەکە دەگەڕێتەوە و پەیوەستە بەو حەق و شەریعەتەوە کە هاتووە لەلایەن خواوە، حەق و عەدل لە بڕیاری رۆزی بۆ هەمووان. هەروەها لە زیادەی ئەجرو پاداشت لەرۆژی دوایی دا و بەش بڕاوی هێندێکی تر.**

أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ

ئینجا گەردشێکی تر دەکات بەدڵ و دەروون لە میحوەرو مەرکەزی سورەتەکە کە بریتی یە لەوەی ئەو شەریعەتەی کە خوا بەخشی بەم دواترین ئوممەتە هەر ئەوەیە کە بەخشی بە نوح و ئیبراهیم و موساو عیسا، جا لێرەدا بە بێزاری دەربڕینەوە پرسیارێك ئاراستە دەکات سەبارەت بەوەی بت پەرستەکان ئاین و شەریعەتێك بڕیار دەدەن بەناوی بتەکانیانەوە، دەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ﴾ ئایا ئەم بت پەرست و لادەرانە لە ئایینەکەی خوا کە هەموو پێغەمبەرانی پێ هاتووە هاوبەش ڕەوا ئەدەن بۆ خوا کە ئاین و شەریعەتێکیان بۆ دابنێ و بڕیار بدات کە خوای تاك و تەنیا ئیزنی نەداوە و ڕازی نی یە پێی!!!؟ بەڵێ بەڕاستی هۆی سەرسوڕمانە بێ باوەڕو نەفامەکان بە نەفامی و نەزانی شتێ بڕیار ئەدەن و ڕەوای دەدەن!! بەڵێ بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە، خوای میهرەبان بەزەیی هات بە بەندەکانی هەر لە سەرەتاوە تا دواترین شەریعەتێکی بۆ ناردن کە ڕێك و گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی خۆیان و ئەو بوونەوەرەی کە تێیدا دەژین. لەهەموو بارو ڕوویەکی ژیان و جیهانیانەوە یاساو ئەساسێکی بۆ ناردن کە بتوانن لەژێر ڕووناکی ئەوەدا بەپێی پێویست و بەرژەوەندی بڕیار وەردەگرن بۆ هەموو ڕوداوێکی تازە، هەر خیلافێك ڕووبدات بگەڕێنەوە بۆلای خواو بڕیاری ئەو بکەن بە حاکم و حەکەم. لەگەڵ ئەوەدا بەندەی نەزان و نەفام لەو ڕێگە ڕاستە لابدەن و شوێنی بیرو بۆچوونی ناڕاستی خۆیان بکەون و بەجارێ لادەن لەوەی خوا بۆی ناردن لەسەر دەستی پێغەمبەرەکاندا!!

تاوان و گوناهەکەیان ئەوەندە گەورەیە شایستەی ئەوەیە هەر لە دنیادا مۆڵەت نەدرێن و سزای شیاوی خۆیان بدرێتەوە بەڵام خوای لێزان و کاردروست بڕیاری داوە کە ڕۆژی دوایی کاتێ تۆڵەی تاوانی تاوانباران و پاداشتی چاکەکاران بێت وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ﴾ ئەگەر وتەو بڕیارێ نەبوایە و ئیرادەی دواخستنی سزای ئەو بێ باوەڕانە نەبوایە و بەڵێن نەدرایە بە تۆڵە سەندن لەرۆژی دوایی دا ئەگەر ئەوە نەبوایە هەر لە دنیادا سزاو تۆڵەیان لێ دەسێنرا،

وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾ ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ

---

بەڵام لەبەرئەوە دواخران بۆ ئەو رۆژە ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بەراستی زاڵمەکان سزایەکی سەختی ئازار دەریان هەیە، نەیفەرمو ﴿و إن لهم عذاب اليما﴾ کە شوێنەکە شوێنی راناوە لەبەر تاوانبارکردنیان و ناوبردنیان بە سیفەتی زاڵم، ئینجا شێوەی سام و بیمی سزاکەیان دەخاتە بەرچاو کە دەفەرموێ: ﴿تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ﴾ دەبینی ئەی هەرکەسێك کە دیتنت هەبێ، واتە ئەوەندە شێوەکەیان ئاشکرایە هەرکەس دیتنی هەیە ئەو شێوە بەدو ناهەموارە دەبینێ، یان ببینی لەکاتێك دا سام و ترس و بیمیان هەیە لەوەی کە کردوویانە. واتە سام و ترس لە سزاو تۆڵەکەی. یان لە دیتنی کردەوەکانیان کە هەموو کەس چاك و خراپ کردەوەکانیان نیشان دەدرێ ﴿وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ﴾ لەکاتێکدا ئەو سزاو عەزابە دووچاریان دەبێ. ئەم تاوانبارانە بەو جۆرە دەبینرێن، بەڵام ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە وان لەناو باخ و باخچەکانی بەهەشتەکاندا لەکاتێك دا بۆیان هەیە هەرچی ئارەزوو بکەن و بیانەوێ. هەر ئەوە بە فەزڵ و بەخششی گەورە، ﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ﴾ ئا ئەوەیە کە خوا مژدەی پێ ئەدا بەو بەندەیانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە خوا بەشدارمان بکات لەوەدا.

﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةٗ نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ٢٣ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗاۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٢٤﴾

لەپاش ئەو هەڕەشەو موژدەیە کە ئاراستەی کردن ئینجا فەرمودەیەك ئاراستەی پێغەمبەری ئازیز دەکات(ﷺ) کە ئاراستەی بێ باوەڕەکانی بکات کە پاڵپشتێ نەرم بێت بۆ باوەڕهێنان دەفەرموێ: ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ﴾ ئەم فەرمودەیە ئەگونجێ متصل بێت یان منقطع بێت لەسەر هەردوو بارەکە بەدوو جۆر تەفسیر کراوەتەوە و بەهەرکام تەفسیر کراوەتەوە وەك روونی دەکەینەوە. بڵێ بە بێ باوەڕەکان لەسەر ئەم ئایینەی کە رای ئەگەیەنم پێتان داوای هیچ پول و پارەو هیچ شتێکتان لێ ناکەم مەگەر خۆش ویستنی ئەو خزمایەتی یەی کە هەمە لەگەڵتان. واتە داوایان لێ دەکەم کە بەپێی ئەوە رەفتارم لەگەڵ بکەن تا بەهۆی ئەوە گوێ رایەڵ بن و ئەوەی پێتان دەڵێم لێم وەرگرن. یان داوای هەر ئەو خۆش ویستنی خزمایەتی یەی کە هەیە لەنێوانماندا کە بەپێی ئەو دەبێ قسەکەم وەربگرن. یان من داوای هیچ پارەو پولێکتان لێ ناکەم تا بەهۆی ئەوەوە بکەونە گومان لێم و ببم بە بار بەسەرتانەوە و بەهۆی ئەوەوە لەگوێم نەکەن. بەڵام داواتان لێ دەکەم کە بەپێی ئەو خۆشەویستی و خزمایەتی یەی کە من هەمە لەگەڵتان ئێوە رەفتارم لەگەڵ بکەون و بە دوژمن و ناحەز سەیرم نەکەن. یا داواتان لێ دەکەم بەپێی خۆشویستن و خزمایەتی یەك کە هەتانە لەگەڵم رەفتارم لەگەڵ بکەن. واتە بێگومان ئێوە، خزمی منن و کەس و کارو بنەماڵەی یەکین دەی بەو جۆرە بن و قسەکەم وەرگرن، ئەمە هەر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

بەڕاستی داوا نەکردنی ئەجرو پول و پارە فەرمودەی هەموو پێغەمبەرەکانە کە ئاراستەی گەل و ئوممەتەکانیان کردووە، ئینجا هەمووشیان خزمایەتی خۆیانیان باس کردووە لەگەڵ گەل و قەومەکانیاندا تا بەهۆی ئەوەوە دڵیان نەرم ببێ، جا بەم پێ یە ئەوەی لەدڵدا بەهێزتر بێت ئەمەیە کە ئیستیسناکە مونقەتیع بێت و خواو پێغەمبەرەکەی(ص) باش دەزانن. بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار لەم کاتەدا کە شێوەی باخات و باخچە و لەم کاتەدا فەزڵ و میهرەبانی و چاوپۆشی دەخاتە بەرچاو لە کردەوەکانی بەندەکانیدا دەفەرموێ: ﴿وَمَن

﴿وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا﴾ هەرکەس هەر چاکەیەك بکات کە یەکێ لەو چاکانە خۆشویستنی خزمایەتی یەکەیە. هەرکەس هەر چاکەیەك بکات ئێمە لەو چاکەدا چاکەی بۆ زیاد دەکەین بەچەند چەندانە لەگەڵ لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهی وەك دەست نیشان ئەکات کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بەڕاستی خوا لێ بوردەیەکی سوپاس گوزارە. واتە ئەبورێ لە گوناهی و چاکەی وەردەگرێ. بەڵام بە شێوەیەك دەیفەرموێ دڵی ئیماندار پڕ دەکات لە شەرم و شکۆ، بە ڕواڵەت فەرمودەکە ئەوە نیشان ئەدات سوپاس گوزاری بەندەکەیەتی!! سبحان الله لەو تەعبیرە! خۆی بەندەکەی روو کردووەتە چاکەو ڕێنموونی کردووە بۆی لەگەڵ ئەوەدا بە چەند چەندانە ئەجرو پاداشتی بەزیادەوە دەداتەوەو سوپاسی بەندەکەشی دەکات. ئەو خەڵکە لە چەرخی نەفامی کۆندا بە بیرکردنەوەو تێگەیشتن لەم وتە پیرۆزانە وازیان هێنا لە بیرو باوەڕی باوك و باپیریان و هاتنە ژێر سایەی ئیسلام و ئەم قورئانە. هەرکاتێ ئەم قورئانە بەو جۆرە بیرەوە وەرگیرێ کاری خۆی دەکات.

ئینجا جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حەقیقەتەی کە لەم سورەتەدا گێڕای بە مەرکەزو مەبەستی پێشوەوە ئەگوێزێتەوە بە وتەی ﴿أَمْ﴾ کە لێرەدا بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستی پێشوو بۆ مەبەستێکی تر دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئایا ئەو نەفامە بێ باوەڕانە دەڵێن محمد درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە؟ واتە ئەم قورئانەی لەلایەن خواوە بۆ نەهاتووەو دەست هەڵبەستی خۆیەتی؟ لێرەدا خوا جل جلالە بەرپەرچی ئەو قسە بۆگەنەی ئەوان ئەداتەوەو بەدرۆیان ئەخاتەوە بەمەی رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەم فەرمودەیە: ﴿فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ ئینجا ئەگەر خوا بیەوێ و مەیلی ببێ مۆر ئەنێ بەسەر دڵت دا، واتە نابێ و ناگونجێ تۆ درۆ بەدەم خواوە بکەیت، چونکە خوا واز ناهێنێ لەکەسێك کاری وا بەد بکات، کەواتە وازهێنانی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ شتی وات نەکردووەو بەدڵت دا نەهاتووە نیازی کردنی، ﴿وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ﴾ خیلاف ئەم قورئانە ناهەق و بەتاڵە و خوا مەحفی ئەکاتەوەو نایهێڵێ﴿وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ﴾ هەق بەدی ئەهێنێ و دامەزراوی ئەکات بە بڕیار و فەرمودەکانی خۆی، هەر شتێك بەدڵی پێغەمبەردا بێت و هەر نیازێك بکات خوا ئاگادارو زانایە پێی و هۆی ئەوەش ئەمەیە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوابەوپەڕی زانین وئاگاو زانایە بەهەر نیازو خەتەرەیەك کە لە دڵەکاندایە. کەواتەئەوگومانە بەدەی کە ئەو بێ باوەڕانە دەمبازی پێ ئەکەن زۆر بەجێ و بێ بنەوانەو درۆو زوڵم و ناهەقە.

وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾

ئینجالێرەداکۆتایی ئەمێنێ بەقسەو باس سەبارەت بە وەحی خواو باس و مەبەستێکی تر ئەمێنێتە پێشەوەو لەپاش دادێتەوەسەرباسی وەحی کەمەرکەزو میحوەرە لەم سورەتەدا. بەشی یەکەمی سورەتەکەمان ناسی کە ئەخولایەوە بە دەوری وەحی و پەیامی خوادا، لێرەدا وازئەمێنێ ولەپاشان لەدوا دوایی سورەتەکەوە ئەگەڕێتەوە بۆسەر مەبەستە سەرەکی یەکە. لەپاش نیشاندانی شێوەی سەخت و سامناکی بێ باوەڕە ستەمکارەکان و شێوەی بەختەوەری چاکان و پاکان لەپاش ئەوە لێرەدا میهرەبانی خۆی دەرئەخاتەوە بەمە قاپی تۆبە ئەکاتەوە بۆ تاوانباران بە پەنا هێنانیان بە خواو گەڕانەوەیان لە بێ باوەڕیی و کردەوە بەدەکانی تاوانباران و دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هەر ئەو کەسێکە کە تۆبەو گەڕانەوە وەردەگرێ لە بەندەکانی و ئەبورێ لە کردەوە بەدەکانیان، کەواتە با نائومێد نەبن و فریای خۆیان بکەون تا نەك لەناکاودا بمرن و ئیتر هیچیان بۆ نەکرێ. خوای میهرەبان کە ئەم لوتفە دەکات زاناو ئاگایە بە کردەوەکانیان وەك دەفەرموێ: ﴿وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ رووی فەرمودە ئەکاتە هەمووان و دەفەرموێ: دەزانن ئاگایە بە هەموو کردەوەکانتان ﴿وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوەو ئامادەن بۆ باوەڕهێنان و کردەوە چاکەکان. ئەوانە گوێ رایەڵی دەکەن و خوایش بە میهرەبانی خۆی ئەجرو پاداشتیان زیاد دەکات و بە چەند چەندانە وەك چەند جار باس کرا. ئەم دەستەیە بەو جۆرە دەبن، بەڵام ﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ بێ باوەڕەکان هەر بۆ ئەوان هەیە سزای بەتین. ئەو سزایەی کە بۆ بێ باوەڕەکان

هەیە قورس و بەتین ترە لەسزای گوناهبارانی باوەڕداران. فەزڵ و میهرەبانی خوا لەڕۆژی دوایی دا بێ حەد و حیسابە، بەڵام بۆ ئەم دنیایە سنووری تایبەتی خۆی هەیە و هەر شتێ بەپێی لێزانی و کاردروستی لەرادەیەك دایە نابێ تێپەڕبكات لەوە. بۆ نموونە رزق و رۆزی ئەگەر بە لێشاو بیدا ژیان پەكی ئەكەوێ و ئەوەستێ وەك دەست نیشان دەكات و دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ﴾ ئەگەر خوا بە زۆری و بەلێشاو رۆزی بدات بە بەندەكانی تۆغیانیان دەكرد لە وڵات دا و ئاژاوەو خراپەكارییان دەكرد و هەركەس لەخۆی دەگۆڕاو دەچوون بەگژی یەكدا ﴿وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَاءُ﴾ ئەیهێنێتە خوارەوە بە ئەندازەیەك كە خۆی بەپێی حیكمەت و بەرژەوەندی خۆی بەچاكی دەزانێ، ﴿إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا خۆی بە خەبەرو بینایە بە بەندەكانی و دەزانێ حیكمەت لە چیدایە، كەواتە هەر دابەش كردنەكەی ئەو راست و بەجێیە. لە بارێكی ترەوە ئەگەر هەموو بەلێشاو دەوڵەمەند و ساماندار بێت ژیان تێك دەچێ و كاروباری ناڕوا، چونكە ئەو كاتە هیچ كەس رازی نابێ بە كاروكردەوەی پەست، هیچ كەس نانەوایی و كرێكاریو ئاسنگەری و... هتد ناكات وهەمووی بەدوای بەرزترین كاردادەگەڕێ و رازی نابێ بەوەنەبێ.

ئینجا دەست كاریی یەكی دڵ دەكات لەبارەی فەراهەم هێنان و بارداني باران كە ژیان بەستراوە پێ یەوەو زۆر جاران خەڵكی ئەكەونە هیلاكەت و نائومێدی و لەو كاتەدا باران دەبارێنێ و شت ئەژییەتەوە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ﴾ خوا ئەو زاتەیە كە باران دەبارێنێ لەپاش ئەوەی خەڵكی نائومێد دەبن و ترس و بیم داگیریان دەكات، رەحمەتەكەی بڵاو دەكاتەوە و هەر ئەو خوایە كاربەدەست و خاوەن و یارمەتی دەرێكی سوپاس كراوە. وتەو وشەكانی قورئان جێ و شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە و هەركام لەگەڵ ئەو شوێنەدا رێكە بۆ وێنە باران لە زمانی عەرەب دا چەند ناوێكی هەیە لێرەدا وتەی ﴿غیث﴾ رێك ترە كە بە هاوارەوە چوونی لێ وەردەگیرێ، سبحان منزل هذا الكتاب العزیز.

ئینجا چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا دەخاتە بەرچاو کە دڵ و دەروون پڕ دەکەن لە ئیمان و باوەڕی یەکی لەوانە ئەمەیە کە دەفەرمویٚ ئەمەیە: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ﴾ هێندێ لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا دروست کردن و داهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو هەموو گیانلەبەرانەیە کە فەراهەمی هێناوە لە ئاسمانەکان و زەوی دا، بە دواهێنانی گیانلەبەران بەدوای باسی باران دا زۆر شیرین و رێکە، چونکە گیانیان بەستراوە بەئاوی بارانەوە. ئینجا ئایا لە ئاسمانەکان دا گیان هەیە، ئیتر مەلائیکە و غەیری مەلائیکە بە دابە ناوناںرێن چونکە لە زمانی عەرەب دا دەڵێن ﴿ما یدب علی الأرض﴾ کەواتە چۆن ئەوانەی لە ئاسمانەکانن ناودەبرێن بە دابە؟ لە وەڵامدا دەڵێن مەبەست لە وتەی دابە لێرەدا گیانلەبەرە بەپێی عیلمی رەوانبێژیی کە لازم لە جێگەی ملزوم دائەنێن ، یان دەڵێن دوو شت کە پێکەوە باس بکرێن بوونی هەرشتێك لەهەرکامیان دا بەسە بۆ ئەوەی بڵێن لەو دووانەدا ئەمە هەیە، ئایەتەکە دەفەرموێ لە ئاسمانەکان و زەوی دا دابە هەیە هەرچەند لە زەوی دا هەبێ.

ئینجا با بیرێك بکەینەوە لەو هەموو گیانلەبەرانەی کە خوای پەروەردگار دروستی کردوون هەر لە مێشووله و مێرووله هەتا گەورەترین گیانلەبەر کە بێجگە لەخوا لە توانای هیچ کەس دا نی یە ژمارەی هەربەشێکیان بکات کە هەر جۆریان شێوەو وێنەیەکی تایبەتی هەیەو شێوەو هۆی ژیان و خۆراکی تایبەتی هەیە. هیچ ناتوانی ژمارەی ماڵی یەکانیان چ جای ئەوانەی کە ماڵی نین و چ جای ئەوانەی هەر ناسراو نین سبحان الخلاق العلیم!! لە فەراهەم هێنان و بەڕێوەبردنی هۆی ژیانیان هەموو کەس سەرگەردانە و ئەو هەموو کارو کردەوە هیچی ناوێ بێجگە لە رووکردنی ئیرادەو مەیلی خوای پەروەردگار.

وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٣١﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلۡجَوَارِ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴿٣٢﴾

---

**لەپاش نیشاندانی ئەو دوو شێوەیە: شێوەی چاکان و پاکان و شێوەی سەختی بەدان و بێ باوەڕان ئینجا ئاگادارمان دەکات کە هەرچی نارەحەتی و سزای ئەم دنیایە کە دووچارمان ئەبێ هەمووی بەهۆی کردەوەی خۆمانەو ئەوەش دووچارمان دەبێ بەشێکە لە تۆڵەی خراپەکانمان و لە زۆر شتمان دەبووڕێ. دەفەرموێ:** ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ﴾ **هەر سزاو موسیبەتێکیان تووش دێت هەمووی کردەوە بەدەکانی خۆتانە کە بەدەست و ئارەزووی خۆتان دەیکەن و لە زۆر لە کردەوە بەدەکانتان دەبووڕێ ئەگینا نەك هەر خۆتان بەڵکو هەموو گیانلەبەرانی ئەم زەوی یە نەئەما وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ما ترك علی ظهرها من دابة﴾ لە ئایەتی یەکەم دا دادو میهرەبانی خۆیمان نیشان دەدا، ئینجا لاوازی و بێ دەسەڵاتی ئێمە دەخاتە بەرچاومان کە دەفەرموێ:** ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ **ئێوە نین بە سەرپێچی کەر لەهەر شتێ کە خوا مەیلی کردبێ و مەیل بکات لەوەی کە دووچارتان بکات و ناتوانن خۆتانی لێ لابدەن و خۆتان قوتار بکەن لێ ی، هیچ دۆست و کاربەدەست و یاریدەدەرتان نی یە کە بتانپارێزێ لەوەی خوا ئیرادەی کردبێ لێتان. یەکێکی تر لە نیعمەت و چاکەکانی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە ئەمەیە کە لە کەشتی و پاپۆڕەکان دا هەڵیان دەگرێ لە دەریا و دەریا لووشەکاندا، هەڵیان دەگرێ لە کەشتی یە گەورەکاندا کە لە دوورەوە وەك شاخ و کەژەکان دەرئەکەون. بێگومان بوونی دەریاکان پێویستە لەژیاندا، ئینجا ئەگەر هۆی گەڕان و هات و چۆی فەراهەم نەهێنایە زۆر لە کاروباری بەندەکانی نەوەستا، ئینجا پێش داهاتنی ئەم هۆی گەڕانی تازەیە ئەو کەشتی و پاپۆڕە گەورانە بە با ئەگەڕان، جا ئەگەر با بوەستایە ئەوا دەمانەوە بەسەر پشتی دەریاکانەوە بە داماوی. خوای میهرەبان ئەم بەهرە چاکە گەورەیە ئەخاتە پێش چاومان تا بیر بکەینەوە هەر ئەو بپەرستین. دەفەرموێ:** ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلۡجَوَارِ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ﴾ **هێندێ لە بەڵگەو نیشانەکانی خوایەتی خوا ئەو کەشتی یانەن کە دەگەڕێن لەدەریاداو وەك شاخە بەرزەکان وان،**

إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا

---

﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ﴾ ئەگەر خوا بیەوێ و مەیلی ببێ باکە ئەخەفێنێ بەهۆی ئەوەوە کەشتی یەکان ئەگەڕێن بە وەستاو بەسەر پشتی ئاوەکەوە، ئەیانترسێنێ بەوە بەپێی ئەو کاتە کە کەشتی بە با ئەگەڕا، ئێستاش ئەگەر مەیلی ببێ نەوت و بەنزین و زەڕەش لەکار ئەخات، چونکە هەموو کارەکان هەر بەدەست ئەوە جل جلالە. ئایا کێ ئاوی دروست کردووە بەجۆرێك کە کەشتی هەڵگرێ؟ ئایا کێ ئەم هەموو بارە دەکات؟ ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بەڕاستی لەوەی کە باس کرا لە گەڕان و وەستان و کاروباری کەشتی یەوە چەند بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ هەموو لەسەر ئارام گرێك لەسەر بەڵاو نارەحەتی و سوپاس گوزارێك لەسەر چاکە. بەڵێ بەڵگەو نیشانەکان بۆ هەمووانە بەڵام خۆگرو سوپاس گوزارەکان شایانترن بە ڕێزگرتنی چاکەو نیعمەتەکانی خوا.ئەیانترسێنێ بەمەی خوا ئەتوانێ باکە بخەفێنێ تا ئەوانەی وان لە کەشتی یەکان دا بەو جۆرەیان بەسەر بێت ﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ یان بەهیلاکیان ببات و نوقمیان بکات بەهۆی کردەوەی بەدی خۆیانەوە. واتە ئەوەیان بەسەردێنێ بەبێ هۆ نی یە و خۆیان هۆی ئەو سزایەن. ﴿وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ﴾ ئەبووری لە زۆرکەس و بەهۆی کردەوەی بەدیان سزایان نادات ﴿وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ بۆ ئەوەی ئەوانەی کە بێ باوەڕن و دەمبازی ئەکەن لە ئایەتەکانی ئێمەدا هیچ پەناگەیەکیان نی یە کە ڕزگاریان بکات لەهەر سزایەك کە ئێمە ئیرادەمان کردبێ. کەواتە ئەوانەی کە فامدارن با ئەوە بزانن و ئەوەش کە نەفامە با هیچ بیانووی نەمێنێ. ئیجا دەست کاری یەکی تری دڵیان ئەکات و سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ ئەوەی کە هەرچییان پێ دراوە لە دنیادا شتێکی کەمی کاتی یەو ئەوەی کە نەبڕاوەیە ئەوەیە کە لەڕۆژی دوایی دا خوای میهرەبان دەیبەخشێ بە چاکان و خوا پێداوان. دەفەرموێ: ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوەی کە پێتان بەخشراوە هەمووی خۆشی و نیعمەتی ئەم ژیانی دنیایەو دەڕواو نامێنێتەوە،

وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾

---

﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ ئەوەی كە لای خوایە و لەرۆژی دوایی دا دەیبەخشیٚ ئەوە چاكە و دەمێنێتەوە ئەوەش بۆ ئەم كەسانەیە كە سیفەت و نیشانەكانی دیاریی دەكات كە دەفەرمویٚ: ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ بۆ ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوەو هەر پشتیان بە پەروەردگاریان بەستووە ﴿وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ﴾ ئەوانەی كە خۆیان دوور ئەكەنەوەو خۆیان دەپارێزن لە گوناهە گەورەكان و ئەو گوناهانەی كە زۆربەیان خراپی یەكەیان ناسراوە، ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ كاتیٚ كە رق و قینیان هەڵساو چاو پۆشی ئەكەن و لیٚ ئەبوورن. واتە قین و رقەكەیان بەكاری بیٚ شەرعی سارێژ ناكەن، بەڵكو لەبەر خوا بیٚ دەنگ دەبن، ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ﴾ ئەوانەی كە گوێڕایەڵی دەكەن بۆ پەروەردگاریان و ئامادەن بۆ هەركاریٚ كە رەزامەندی خوای تێدا بێت بەشێوەی گشتی و بەتایبەتی پەیوەندی خۆیان لەگەڵ خوا بەهێز دەكەن، بەم رەنگە ﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژیان بە رێك و راستی بەجیٚ هێناوە بەم رەنگە بە خشوع و خزوعەوە بەجێیان هێناوە ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ كاروباریان بەپرس و مەشوەرەتە لەنێوان خۆیاندا كە ئەوە ئەساسێكی زۆر بەهێزە بۆ برایەتی و یەكێتی موسڵمانان. ئەم سیفەتە چاكە زۆر بە كارە با دەوڵەتیش ئیسلامی نەبیٚ. ئەم سیفەتە شرینە ئەوەندە گرنگە ئایەتەكە دەیهێنیٚ بە دوای نوێژدا كە هۆی پەیوەندی بەندەیە بە خوای خۆیەوە و لەپاش ئەوە دەفەرمویٚ: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ لەوەی كە پێمان بەخشیون و كردوومانە بە رزقیان بەكاری ئەهێنن وبەختی ئەكەن لە رێی خوادا كە ئەم سیفەتە مایەی برایەتی و خۆشەویستی یە لە نێوان موسڵمانان دا. قورئان لەم شوێنەدا و شوێنەكانی تردا دەفەرمویٚ ئەوەی كە پێمان داون تا بەندە بیر بكاتەوە ئەوەی كە دەیدا هینی خۆی نی یەو نابیٚ بە ماڵی خۆیانی دابنێن لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو ئەجرە گەورەیان دەداتیٚ.

وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ

---

**ئینجا هەرچەند موسڵمانان باویان ئەبیٚ وابیٚ چاوپۆشی بکەن لە خراپە بەڵام لە هەمان کاتدا ڕێگەیان هەیە تۆڵە بسێنن لە دەست درێژیی کەران بە وێنەی خراپەکەی ئەوان لەبەرئەوە ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾ ئەوانەی کە کاتیٚ دەست درێژیی و زوڵمیان دەربارە کرا خۆیان تۆڵە دەسێنن و سەر داناخەن بۆ زوڵم و ناحەقی یەك کە لیٚ یان کراوە ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا﴾ تۆڵەی خراپە خراپەیەکە وێنەی خۆی واتە نابیٚ زیادە ڕەوی بکات بۆ وێنە دوو جوێن لەباتی جوێنێك دا زوڵمە و موسڵمان ئەبیٚ خۆی بپاریٚزیٚ و هەروەها تۆڵەی دەست درێژیی یەکانی تر. ناوبردنی تۆڵەی ڕێك گوناهو خراپە نی یە و ناوبردنی بە گوناهو خراپە لە بابی ڕەوانبێژیی دا پیٚی دەگوتریٚ مشاکلە.**

**ئینجا لەگەڵ ئەوەدا موسڵمانان بۆی هەیە تۆڵە بسێنیٚ هێشتا لەکاتی دەسەڵات دا هەر چاوپۆشی چاکترە وەك دەفەرمویٚ: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ هەرکەس لیٚ ببوریٚ و تۆڵە نەسێنیٚ ئەو کەسە ئەجرو پاداشتی لەسەر خوایەو خوا پێویستی کردووە لەسەر زاتی پاکی خۆی ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی خوا زاڵمانی خۆش ناویٚ، واتە هاندانی مەزڵوم لەسەر لیٚ بوردن لەبەر ئەوە نی یە لایەنگیری زاڵمان بێت، چونکە خوا زاڵمانی خۆش ناویٚ، ئینجا هەمیتر دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوەی تۆڵە سەندنی ڕاست هیچ ڕێگە نی یە بۆ ڕەخنە لیٚ گرتنی و دەفەرمویٚ: ﴿وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ﴾ بێگومان هەرکەس تۆڵە بسێنیٚ لەپاش ئەوەی زوڵمی لیٚ کرابیٚ ئەوانە هیچ ڕێگەیەك بۆ تاوانبار کردنیان نی یەو**

هیچ ئەرەجێکیان لەسەر نی یە ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِى ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ ڕێگەی تاوانبار کردن هەر لەسەر ئەو کەسانەیە کە زوڵم دەکەن لە خەڵکی و نیازی خراپەکاری ئەکەن و بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن بە ناهەق ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەوانە بۆیان هەیە سزایەکی ئێش و ئازار دەر، ئینجا جارێکی تر هانی ئەدات لەسەر خۆگری و چاوپۆشی دەفەرموێ: ﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾ بەڕاستی هەرکەس خۆگر بێ و لێ بوردە بێ و چاوپۆشی بکات، بەڕاستی ئەو کردەوەو سیفەتە لەو کارو سیفەتانەیە کە هەوڵی بۆ بدرێ و نیازی بکرێ.

لەم کۆمەڵە ئایەتانەی رابوردووەدا دەردەکەوێ کە ئەو گەل و کۆمەڵەی کە خاوەنی ئەو سیفەت و کردەوە پاکانە بوون، هەر ئەوانە شیاوی ئەوەبوون کە سەرکردایەتی و قیادە بگرنە دەست و ببن بە مامۆستای ئادەمی و ژیان و جیهان، لە یەکەمجارەوە ئەوە دەردەکەوێ، ئینجا ئەم ئایینە پاکە لەهەموو کارو بڕیارەکانی دا ناوەڕاستی گرتووە، کەواتە دەست نادات بۆ گۆڕانکاری و بژارە کردن بۆ نموونە لەم ئایەتانەی دوادوایی دا سەبارەت بە تۆڵە سەندن ناوەڕاستی گرتووە، فسبحان منزل هذا القرآن العظيم.

ئەم قورئانە گەورە لەگەڵ ئەو هەموو ڕێك و ڕاستی و ڕوونی یە زۆربەی خەڵکی دوور دەکەوێتەوە لێ ی و باوەڕی هێ ناهێنێ، هۆی ئەوەش سروشتی بەدی هەیە و بە هەڵبژاردنی خۆی بە پێچەوانە دەجوڵێتەوە و ڕەفتار دەکات دیارە هەرکەسیش وابێ خوا گومڕای ئەکات، کەواتە هیچ کەسێك نی یە چارەسەری دەردی بکات وەك دەفەرموێ ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيّٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ هەرکەس خوا گومڕای بکات هیچ دۆستێك و کاربەدەستێك نی یە ڕزگاری بکات، لە دنیادا بەو جۆرە بەسەرگەردانی دەژی و لە ڕۆژی دواییش دا پەشیمان دەبێتەوەوئاواتەخوازەبۆگەڕانەوە بۆدنیا تا چارەسەری خۆی بکات و ڕێگەی خوا بداتە بەر،

وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ

**وەك دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ﴾ دەبینی کاتێ زاڵمەکان سزاکەی خوا دەبینن دەڵێن ئایا رێگە هەیە بۆ گەڕانەوە بۆ دنیا، واتە ئاواتی ئەوە دەخوازن لە کاتێك دا سیخی سەختی نائومێدی دەدرێ لە بەنووکەی دڵیان وەك لە چەند ئایەتی تردا هاتووە هەرجارێ بە جۆرێکی جیاواز ﴿وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ﴾ دەیان بینی دەبرێنە سەر ئاگری دۆزەخ بە مل کەچی و زەلیلی و داماوییەك کە دووچاریان دەبێ و دەڕوانن بۆ ئەو ئاگرە و زاتیان نی یە بە رێکی سەرنجی بدەن، بەڵکو بە سەرنج دانێکی شاراوە بە پێڵوو سیلە چاو. ئەم شێوەیان ئەوەندە ئاشکرایە هەرکەس بڕوانێ دەیبینێ خوا پەنامان بدات ئەوانە زاڵم و خۆ بەزل زان بوون بێ باك لە خواو بێ باوەڕبوون بە سزای خوا لەبەر ئەوە خوای کاردروست ئەوەیان بەسەر دێنێ! الەو رۆژەدا باوەڕدارەکان قسە رەواو بڕیار دەرن لەو کاتانەدا وەك دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە لە دنیادا باوەڕیان هەیە دەڵێن بەڕاستی زیانبارەکان ئەوانەن کە زیانبارن بە زیاتی لەدەست چوونی خۆیان و کەس و کارو ئەهل و عەیالیان لە رۆژی دواییدا. بەڵێ زیانباری تەواوهەرئەو زیانەیە کە دووچاری ئەوانە دەبێ و لەڕاستیدا هەر ئەوە زیانباری یە.**

**ئینجا بەدوای ئەوەدا قورئان ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ دەربارەی ئەوانەی کە دەبرێنە بەر ئاگری دۆزەخ ﴿ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ * وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ﴾ بێدار بن و با هەموو کەس بزانێ زاڵمەکان وان لە سزایەکی نیشتەجێدا، واتە رزگار بوون نی یە لێ ی، بەهیچ جۆرێ نابێ بۆ ئەوانە هیچ دۆست و کاربەدەستێك کە یارمەتی یان بدات و رزگاریان بکات لەسزای خوا.**

وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴿٤٧﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ

---

**﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ﴾ هەرکەس خوا گومڕای بکات هیچ ڕێگەیەکی تری دەست ناکەوێ بۆ ڕزگار بوون. هەق وایە بە بیر لێ کردنەوەی ئەم ئایەتانە دڵ بکەوێتە لەرزەو تیکە لە گەرووودا بگیرێ! لەخوا ترسەکان بەم جۆرو شێوە بیریان کردەوە لە ئایەتەکانی قورئان بەهۆی ئەوەوە بوون بە ڕێ نیشاندەرو مامۆستای ئادەمی خوا پاداشتیان بداتەوە.**

**ئینجا خوای میهرەبان بە میهرەبانی خۆی بانگی بەندەکانی دەکات کە فریای خۆیان بکەون پێش مردن چارەسەری خۆیان بکەن. دەفەرموێ: ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ﴾ گوێ ڕایەڵی پەروەردگارتان بکەن لەم ژیانی دنیادا پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە گەڕانەوەی بۆ نی یە لە لایەن خواوە لەپاش ئەوەی بڕیاری دا یان پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە گەڕانەوەی نابێ، ﴿مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ﴾هیچ پەنایەك نابێ بۆتان و لەو ڕۆژەدا هیچ ئینکاری یەکتان پێ ناکرێ و دان دەنێن بە تاوانەکانتاندا.**

**ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ﴾ ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە گوێ ڕایەڵی ناکەن و ڕوو وەردەگێڕن ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە بە پارێزەرو کاربەدەست بەسەریانەوە تا بە زۆر باوەڕیان پێ بێنی ﴿إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ﴾ تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو تۆ هەڵسە بە فەرمانی خۆت ئیتر تۆ گوناهێکت نابێ و هەر ئەوان تاوانبارن. لە زۆر شوێن دا خوا جل جلالە ئەم تەوجیهەی ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات تا بێ ئارام نەبێ لە باوەڕ نەهێنانی ئەوانە وغەم و پەژارە نەخوات لەسەریان. ئینجا سروشت و تەبیعەتی ئادەمی ڕوون دەکاتەوە بەمەی نە لە خۆشیدا خۆیان بۆ دەگیرێ و لەکاتی تەنگیش دا نائومێد دەبن. واتە بەرگەی خۆشی دەگرن تا یاخی نەبن و لەکاتی ناخۆشیش دا ئومێدەوار دەبن و بزانن هەروا هاتووە جێگای خۆشی و ناخۆشی یە، کەواتە با تەوازنی خۆیان ڕاگرن.**

وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴿٥٠﴾

**ئەم جۆرە سیفەتانە بۆ جنس و تیرەی ئادەمی یە، واتە ئادەمی ئەم دوو جۆرەیان هەیە نەك هەموو فەردێکی ئاوایە. جا دەربارەی ئەو جۆرە ئادەمی یە دەفەرموێ:** ﴿وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ﴾ **کاتێ ئێمە بچەژێن بە ئادەمی لەلایەن خۆمانەوە بە بەزەیی خۆمان چاکە و نیعمەتێکی پێ ببەخشین خۆش نوود و فەرەحناك دەبێ و کەشخەی پێوە دەکات، ئەگەر نارەحەتی و کاری ناخۆشی دووچار ببێ بەهۆی کردەوەی خۆیەوە کە ئەبوو لەخۆی رق هەڵگرێ کەچی ئەو ئادەمی یە زۆر سپڵەو ناسوپاسێکی روون و ئاشکرایە و رەخنە لەخوا دەگرێ، بەڵێ ئەم جۆرە ئادەمی یە بە هەردوو جۆرەکەیەوە زۆر هەن.**

**ئینجا بەدوای ئەم شتە راستەدا ئەمە ئەهێنێ کە خۆشی و ناخۆشی و بەش فراوانی و بەش براوی هەمووی بەدەست خوایە، کەواتە با هەموو کەس لەهەر حاڵێکدا هەر دڵی پەیوەندی بە خواوە بێت و هەر چاوەڕوانی دەستی خوا بێت. نموونە ئەهێنێتەوە بە بوونی ئەولادی زۆرو نەبوونی ئەولاد، دەفەرموێ:** ﴿لِّلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ **هەر بۆ خوایەو موڵکی خوایە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەویداو خاوەنی و پادشایەتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ خوایە** ﴿يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ **هەرچی بیەوێ دروستی ئەکات** ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ * أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا﴾ **دەبەخشێ بە هەرکەسێك کە مەیلی هەبێ مێینە و دەبەخشێ بەهەرکەس کە مەیلی ببێ نێرینە یان بە جووت نێرینە و مێینە و هەرکەسیش ئەگێڕێ بە نەزۆك و هیچ کامی پێ نابەخشێ ئەوەش لەبەر ئەوەیە خوا خۆی ئەوپەڕی رادە زانای دەسەڵات دارە. مێینەشی پێش خست کە نەفامەکان بێزاربوون لێ ی، ئینجا نێرینە کە پەسەندە بە لایانەوە و نەزۆکی دواخست کە بێزراوە لای هەمووان، هەمووبارەکان مل کەچەبۆنێرادەومەیلی خواوهیچ کەس رێگەی نییەودەسەڵاتی نییە بەسەر هیچ کامداو خۆی بەپێی زانینی خۆی ئەوانە دەکات و بە دەسەڵاتی خۆی بەجێیان دەهێنێ وەك دەفەرموێ:** ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ﴾.

﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

---

**ئینجا لەدوا دوایی سورەتەکە دەگەڕێتەوە بۆلای میحور کە چەند جار باسی فەرموو لێرەدا باسی وەحی دەکات کە بریتی یە لە پەیوەندی نێوان خواو ئەو بەندەیانەی کە خوا هەڵی بژاردوون کە بە چ شێوەیەك ئەو پەیوەندی یە فەراهەم دێت؟ دڵنیایی ئەکات لەسەر بەدی هاتنی لەنێوان خواو ئەم پێغەمبەرە(ص) دەفەرموێ:** ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ﴾ **هەرگیز نەبووەو نەگونجاوە بۆ هیچ کەسێك خوا قسەی لەگەڵ بکات مەگەر بە یەکێ لەم سێ بارە:**

١- ﴿وَحْيًا﴾ **بەم رەنگە خستوویەتیە دڵی یەوەو پێغەمبەرەکە زانیویەتی و ناسیویەتی کە لای خواوە بۆی هاتووە.**

٢- ﴿أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ﴾ **یان لە پەنای پەردەدا وەك روویدا بۆ مووسا دەنگێکی بیست کە فەرموودەکەی خوای دەگەیاند، ئەو دەنگەی بیست لە هەموو لایەکەوە بە هەموو لەشی.**

٣- ﴿أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ﴾ **یان فریشتەیەکی ناردووە لە وێنەو شێوەی کەسێك دا ئیتر وێنەو شێوەکەی جوبرەئیل کە لە حەدیس دا دەفەرموێ جوبرەئیلم بینی ٦٠٠ باڵی هەبوو یان لە شێوەی پیاوێك دا وەك لە حەدیسە سەحیحەکەدا کە عمری فاروق دەفەرموێ جارێك لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین لە ناکاودا پیاوێك پۆشاکێکی زۆر سپی لەبەردا بوو مووی زۆر رەش بوو هیچکام لە ئێمە**

نەیدەناسی و هیچ شێوەی غەریب و سەفەریشی پێوە دیار نەبوو ئەو چەند پرسیارەی کرد کە لە حەدیسەکەدا باس کراوەو بەناوبانگە. یان جاریٚ لە وێنە و شێوەی دحیەی کەلەبیدا هات. ئەم سیٚ شێوەی باس فەرموو کورتەکەی ئەمەیە بۆ هیچ کەس لە دنیادا رووی نەداوە خوا روو بە روو قسەی لەگەڵ دا بکات تەنانەت لەشەوی میعراجدا سەحیح لەسەر ئەوەیە کە بە چاوی دڵ دیتوویەتی نەك بەچاوی ئاشکرا لەم بارەیەوە حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیم هەیە کە دایکمان عائشە – خوا لیٚ رازی بێت– ئەگێڕێتەوە دەفەرمویٚ: ﴿من زعم ان محمدا رای ربه فقد اعظم الفرية على الله﴾ بینینی چاو هەر لە رۆژی دوایی دا دەبێت خوا بیٚ بەشمان نەکات لیٚ ی آمین.

شاعیر و زانای کورد مەولەوی رحمه الله خۆش دەفەرمویٚ – بەچاوی فانی ناوینە باقی باقی دەوینی باقی و تاقی – ئەوەبوو شێوەی پەیوەندی لەنێوان خواو فرستادەکانی ﴿إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ بەڕاستی هەر ئەو خوایە لێزانی کاردروستی زانایە بە ئەوپەڕی رادەی زانین. هەر ئەوە دەزانیٚ کیٚ شایستەو شیاوی ئەوەیە هەر ئەو دەزانیٚ بە چ شێوەیەك ئەو بەهرەیە بگەیەنیٚ بە هەرکەس کە شیاوی ئەوەیە. بەڕاستی لوتفو میهرەبانی یەکەی ئێجگار گەورەیە زاتی گەورەیی یەکەی لە سنووری زەمان و شوێن و مەکان لەگەڵ ئەوە پەیوەندی بکات لەگەڵ دروست کراوەکانی خۆی کە لە سنووری کات وشوێن و مەکاندان. هەر لەدەست بەحری بیٚ سنوور و بیٚ پەیی ئەو دێت ئەو لوتف و بەخشینە!!

شێوەی پەیوەندی یەکەی باس فەرموو کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئاشنایە پیٚی و ئینجا دەفەرمویٚ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾ هەر بەوجۆرە شێوە وەحیمان کردە لات ئەی پێغەمبەر روحێك کە لە عالەمی ئەمرە لای ئێمە و بە لوتفی ئێمەیە بە کۆششی تۆ نی یەو تۆ چاوەڕوانی نەبوویت رۆحێك واتەقورئان کە گیان ئەخاتە دڵ و زیندووی ئەکاتەوە لە کاتێکدا ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾ تۆ نەت ئەزانی و ئاگادار نەبوویت بەو کتابەو بەو ئیمانە

که پێت بەخشرا چی یەو چۆنە؟ بەڵێ پێغەمبەری ئازیز زانیویەتی ئەم ئادەمی یەو داهێنەرێکی هەیە بەڵام ئەو زانینە جیاوازە لەگەڵ ئەم زانینەی کە نوورو رووناکی یەکە دەیبەخشێ بەو بەندەیانەی کە خوا خۆی ئیرادەی کردووە وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ بەڵام ئەوەی کە وەحیمان کردە لای تۆ گێڕامان بە نوورێك کە رێنموونی پێ دەکەین هەرکەسێك ویستبێتمان لە بەندەکانمان.

ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بەڕاستی تۆ ئەی پێغەمبەر رێنموونی دەکەیت بۆ رێگەی راست ﴿صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ رێگەی خوایەك کەهەر بۆ ئەوەو موڵکی ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لەزەویدا ﴿أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ﴾ با بزانرێ کە هەموو کاروبارێك هەر بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە، چونکە هەر ئەو خاوەن و مالیکە بۆ هەموو شتێك و هەر بە دەست ئەوە هەموو شتێك لە دنیا و لە رۆژی دوایی دا.

ئا بەم جۆرو شێوە کەس نەدیوە ئەم سورەتە بەفەڕەی دوایی پێ هێنا و الحمد لله أولا وأخيرا و صلى الله على رسوله و حبيبه محمد و على اله و اصحابه و أزواجه و أولاده و كل من سلك طريقه المستقيم.

لە رۆژی ١ ربيع الثانى ١٤١٨ بۆ جاری دووەم ئەم سورەتەم تەفسیر کردەوە کە جاری یەکەمی دەست نووسەکەی خۆم ون بوو بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّسۡرِفِينَ ﴿٥﴾

---

## سورەتی(الزخرف)
## مەککەیی یەو ٨٩ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە هەندێ لەو ناڕەحەتی و گرێ و لاری و دەمبازی و ڕەخنانە نیشان ئەدات کە لەلایەن بت پەرستەکانەوە رووی ئەکردە بانگەوازەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ چارەسەرکردنی قورئان بۆ ئەو هەموو نالەباری ئەوانە، چەسپاندنی بیرو باوەڕە راستەکەی خۆی لە شوێنی ئەو هەموو شتە پڕووپووچە کۆنەپەرستی یەی کە بە درێژایی چەند چەرخ تەپەی دابوو لە مێشك و دڵ و دەماغیاندا پشت بە خوای گەورە. ئەوانە هەموو یەك بە یەك کە پێی گەیشتین بە روونی تەفسیریان ئەکەینەوە، خوای گەورە لە یەکەم جاری سورەتەکەوە سوێند ئەخوات بە قورئان لەسەر دووشت: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * حمٓ * وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ * إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ سوێند بەو کتێبەی کە روون و ڕەوانە چ وتەی، چ مەعناو مەبەستی سوێند بەوە: بەڕاستی ئەو کتێبەمان گێڕاوە بە خوێنراوە بە زمانی عەرەبی، واتە شێوەی وێنەکەی عەرەبی یە و بە عەرەبی هێنامانە خوارەوە بۆ ئەمەی وەری گرن و تێ بگەن لە مانا و مەبەستەکەی. لە سورەتی ﴿الشورى﴾ دا چەند هۆیەکمان باس کرد بۆ هاتنە خوارەوەی ئەم ئایینە عالەمی یە لە یەکەم جارەوە بۆ سەر گەلی عەرەب، گێڕانی مەککەو دەوروبەری بە مەرکەزو نیشتەجێ بۆی. دەی کاتێ ئەو گەلە عەرەب بوو ئەبێ سروشەکەی خوا لەشێوەی زمانی عەرەبی دا پێ یان بگەیەنرێ، چونکە خوای خاوەن ڕەحم باوی هەروا بووە لەگەڵ بەندەکانی دا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ بۆ سەر هەر گەلێ بە زمانی ئەو گەلە ناردوویەتی بۆ ئەمەی سروشتەکەیان بۆ روون بکاتەوە بە ئاسانی، وەکو لە

سورەتی ﴿إبراهیم﴾ دا ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴾[1] ئینجا پاش ئەوە ئایینەکە چەسپاوو جێگیر بوو ئاسان بوو گۆڕینی بە زمانی تر جگە لەو زمانەی کە سروشتی پێغەمبەرەکەی پێ هاتبوو. سوێند لەسەر خوراوی دووەم ئەمەیە لەم ئایەتەدا: ﴿ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾ سوێند بەو کتێبە روون و ئاشکرایە ئەو کتێبە – کە قورئانە – بەرزو پایە بڵندە لە – لوح المحفوظ – یان لە عیلمی ئێمەدا لە کاتێك دا پارێزراوە لای ئێمە لە گۆڕان، خاوەن حیکمەتە. واتە هەموو کاروبریاری پڕ سوود و بەجێ یە.

ئەم دوو سیفەتەی بۆ بەکار هێنا کەوا نیشان ئەدەن قورئان زیندووەو مەبەست و کردەوەی هەیە، هەروەکو وایش بێ وایە، چونکە زۆر پەیوەندی تایبەتی هەیە لەگەڵ ئەوانەی کە خۆیانی بۆ تایبەتی ئەکەن، ئەیکەن بە پێشەوا بۆ خۆیان. فێری هەموو وێڵ و ئوسوڵێکیان ئەکات، ئەیانکات بە ئادەمیزادێکی دیاریی و جیاواز لە هەمووانی تر. سوێند خواردنی خوای گەورە لەسەر پایە و رادە بەرزی قورئان ئێگجار بە نرخی قورئان روون ئەکاتەوە، ئێجگار گەورەیی ئەم نیعمەت و خەڵاتە گەورەیە دەرئەخات کە خوای گەورەو بە رەحم سەری ئادەمیزادی پێ بەرز کردەوە، بە تایبەتی گەلی عەرەب کە بە زمانی ئەوان ناردی، کەواتە لەوەوە ئەندازەی گەورەیی تاوانی ئەوان روون ئەبێتەوە کە پشت ئەکەنە ئەم نیعمەت و خەڵاتە گەورەیە لەبەرئەوە ئەوا تاوان و بێ نرخی یان نیشان ئەدات و هەڕەشەیان لێ ئەکات ئەفەرموێ: ﴿ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمًا مُّسۡرِفِينَ ﴾ ئایا لەبەرئەوەی ئێوە کۆمەڵ و گەلێکن لە تاوان و خراپەکاری دا رۆچوونەتە خوارەوەو زیادە رەوی ئەکەن، لەبەر خاتری ئەوە ئێمە وازتان لێ بهێنین و ئەم قورئانەتان لێ بەرگری بکەین و لێتان دوور بخەینەوە؟ واتە نەخێر شتی وا ناکەین.[2]

---

[1] واتە هەموو پێغەمبەرێکمان رەوانە کردووە بە زمانی گەلەکەی خۆی.

[2] بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: ١.لە ئیبن و عەباسەوە – خوایان لێ رازی بێت –: ئایا وا گومان ئەبەن ئێمە چاوپۆشیتان لێ ئەکەین لەگەڵ ئەمەدانەوەی پێتان سپێرراوەبەجێتان نەهێناوە. ٢.لە(قتادە)وە–خوای لێ رازیبێت–: ئێمە واز ناهێنین لە بانگ کردن بۆلای ئەم قورئانە با ئەمانە گەل و کۆمەڵێك بن کە زیادە رەوی ئەکەن لە تاوان و خراپەدا بەڵکو چەند جار تیکراری ئەکەینەوە بۆ ئەمەی ئەوەی شایانی هیدایەت بێت پێی بکەوێتە سەری و ئەوەی گومرایی ئەداتە بەر هیچ بەهانەی نەمێنێ.

وَكَمۡ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠﴾

---

**بەراستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە کە خوای گەورە بەم هەموو دەسەڵاتە بێ سنوورەوە، بەو هەموو بێ پێویستی یەوە ئا بەو جۆرە لوتف بفەرموێ لەگەڵ کۆمەڵێکی ئاوا لە ئادەمیزاد. گەورەترین بەرنامەو کتێبی خۆی بنێرێ بۆیان، بە زمانی خۆیان ڕێگای هیدایەت و خۆش بەختی هەردوو جیهانیان نیشان بدات، هەواڵ و بەسەرهاتی گەلە پێشووەکانیان بۆ بگێڕێتەوە، بیانترسێنێ بە وێنەی سزای تاوانبارەکانیان، لەگەڵ ئەم هەموو شتەدا ئەو کۆمەڵە بەد بەختە سەر لێ تێك چووە، گوێ نەگرن و پشتی تێ بکەن، لە تۆڵەی ئەو گوێ پێ نەدان و پشت تێ کردنەدا ئەوا خوای گەورە بێ لوتفی خۆی نیشان ئەدات دەربارەیان لەگەڵ بێ نرخی وریسوایی لای خۆی وهەڕەشەیان لێ ئەکات بەم فەرمودە:** ﴿وَكَمۡ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ * وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ * فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ **پێغەمبەری زۆرمان ڕەوانە کردووە لە ئوممەت و گەلە پێشووەکان، هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووەو گاڵتەیان پێ نەکردبێ، هەر پێغەمبەرێکیان بۆ هاتبێ بە درۆزنیان داوەتە قەڵەم، گاڵتەیان پێ کردووە، ئینجا ئێمەش بەربادمان کرد لەو گەلە پێشووانە کەسانێ کە لەمان هێزو دەسەڵاتیان بەتین تر بوو، سەر گوزەشتەی نایابی ئەو گەلە پێشوانە تێپەڕی و باسکرا لەمەو پێش لە قورئان دا. کەواتە ئەم بێ بڕوایانە ئەبێ چاوەڕوانی چی بکەن کاتێ کە بەهێزتر لەوان ئەوەیان بەسەرهات کە بەسەریان دا هات؟ ئەم ئایەتە وەکو هەڕەشەیە بۆ بێ بڕواکان دڵ خۆشی دانەوەو دڵ نەوایی پێغەمبەرو موسڵمانە بەمەی کە خوا هەر ئەوان و ئایینەکەی خۆی سەر ئەخات، دوژمنەکانی خۆی و ئەوان بەرباد ئەکات. ئەو گەلە بت پەرستە بیرو باوەڕێکی سەیریان هەبوو: لە بارێکەوە باوەڕیان بوو کە خوا هەیەو ئەو ئەم هەموو ئاسمان و زەوی و گیانلەبەرانەی دروست کردووە بە تەنیا، بە گوێرەی ئەم باوەڕە ئەبوایە تەنیا خوایان بپەرستایە کەچی لەسەر ئەو ڕێگە راستە نەبوون کە هەموو ژیریی و سروشتێکی ڕێك و ساغ باوەڕی پێی هەیە، بەڵکو چەند شەریك و هاوبەشێکیان بۆ بڕیار**

ئەدا، هەندێ لەو ماڵات و حوشترانەی کە خوا دروستی کردبوو بۆیان دیاریی و تایبەتی یان ئەکردن بەو بتانەوە، وەکو چەند باوەڕی پڕو پووچی تریان هەبوو پێچەوانەی خوایەتی خوایە کە دانیان پێدا ئەنا، هەروەها هەندێ تر لەو شتە پڕوپووچانەی لەم سورەتەدا باسی ئەکەین – إن شاء الله –. جا لێرەدا خوای گەورە ئەو باوەڕو دان پێدا نانەیان نیشان ئەدا لەگەڵ سەرەنجام و بەرهەمەکەی دا لەپاش ئەوە تەمێ یان ئەکات بەمەی کە بە گوێرەی سروشتی رێك وراست بجوڵێنەوە، رەوشتێکی راست و رەوایان هەبێ بەرامبەر نازو نیعمەتی خوا بەسەریانەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار بکەیت لەوانە: ئایا کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ بێگومان ئەڵێن خوا دروستی کردووە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و ئاگادارە بە هەموو شتێك، وا دەرئەکەوێ لە وەڵام دا ئەیانگوت ﴿الله﴾ وەکو لە شوێنی تردا بەو جۆرە ئەفەرموێ، چونکە ئەوان جگە لە ﴿الله﴾ ئەو ناوو سیفەتانەی کە ئیسلام هێنانی ئەوان نەیان ئەزانین، بەو جۆرە خوایان نە ئەناسی بیرو باوەڕێکیان هەبوو تێکەڵ لە راست و پڕوپووچی زۆرو زەبەندە. ئەوەی کە راست بوو وا دەرئەکەوێ لە ئایینی پاکی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە بۆیان مابووەوە، بەرە بەرە شتی تورەهات و پڕو پووچیان لێ زیاد کردبوو.

ئەوەی کەوا هەموو سروشتێکی پاك باوەڕی پێ‌ی هەیە مابووەوە کە بریتی یە لە باوەڕ بە بوونی خوایە بۆ ئەم بوونەوەرە، چونکە هیچ ماوە نی یە بۆ دان نەنان بەوەدا، بەڵام ئەم باوەڕەیشیان وەك قسەی رووت وابوو، چونکە باوەڕیان بەو سیفەتانە نەبوو کە پێویستە بوونیان بۆ خوایەتی، باوەڕیان بە چەند شتێ بوو کە دژی خوایەتی یە، ئەوا قورئان فێریان ئەکات، خوایان بە جۆرێ کە شایانی خوایەتی یە نیشان ئەدات و پێ یان ئەناسێنێ و ئەو شتانەی کە شایانی خوا نین دووریان ئەخاتەوەو پاکی و بێگەردی خوایان لێ روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ ئەو کەسە کە زاڵەو توانای بێ سنووری هەیە و ئاگادارەو هەموو شتێ ئەزانێ کەسێکی ئەوتۆیە کە زەوی گێڕاوە بۆ ئێوە بە جێگای ئارام و ژیانتان وەکو بێشکە. فەراهەمی هێناوە بۆ ئێوە لەو زەوی یەدا چەند رێگەیەك بۆ هاتوچۆیان، یان چەند رێگای گوزەران و رزق و رۆزی فەراهەم هێناوە بۆتان لەو زەوی یەدا بەڵکو بەهۆی بیر کردنەوە لەم شتانەدا رێگەی راستی خوا وەرگرن و هیدایەت و رێنموونی خوا بدەنە بەر. ئەمە کە خوای گەورە زەوی ئامادەکرد. بە جۆرێ ئادەمیزادی تیا بحەوێتەوە شتێکی زۆر روون و ئاشکرایە لای هەموو ژیرێك لە

هەموو چەرخ و چینێك زانراوە هەریەكە بە شێوەیەك ئەوەی بۆ روون و ئاشكرایە. ئەوانەی كە یەكەم جار ئەم قورئانەیان هاتەسەر بە ئاشكرا بە پێش چاویانەوە كە زەوی وەكو فەرش راخراوە بەسەریەوە ئەخۆن و ئەخۆنەوەو پێیدا ئەگەڕێن، ئامادە كراوە بۆ خانوو ماڵ و كشتوكاڵ كردن. بە كورتی: بە جۆرێكە كە بە رێكی ژیانی تیا ئەبرێتە سەر. زانایانی ئەم چەرخە بە شێوەو جۆرێكی قوڵتر وەری ئەگرن، رەنگە بۆ لەمەو پاش بە جۆرێكی جیاواز ئەو مەبەستە وەرگرن و تێ ی بگەن. زانایانی ئەم چەرخە ئەڵێن: ئەم زەوی یە ی كە ئێمەی لەسەر ئەژین چەد بارو گۆڕانی بەسەردا هاتووە بەم جۆرە: لە پێشەوە ئەم توێژەی سەری بەردێكی رەقی وشك و برنگ بوو تا گەیشتە ئەم خۆڵەی كە دەست ئەدات بۆ كشتوكاڵ، ئاو پەیدا بوو بەسەریەوە لە یەككگرتنی هایدرۆجین و ئۆكسجین لە جووڵانەوەو خولانەوەی دا بە دەوری خۆی دا بە رادەیەكی میانەو بە جۆرێك رادەی گەرمایی لە رۆژدا ئەگونجێ لەگەڵ ژیان دا، ئەوەندە چەسپان نی یە كە ئەو گیانلەبەرو شتانەی وا بەسەرپشتی یەوە ئارام نەگرێ و بپەڕێ و پرژو بڵاو ببێتەوە بە بۆشایی فەزادا. هەروەها هێزێكی راكێشەری تێدا دروست كردووە بەهۆی ئەوەوە تەبەقێ لە هەوای راگیر كردووە بە چوار دەوری دا، چونكە بێ هەوا ژیان ناگونجێ لە زەوی دا، ئەو هێزە راكێشەرەی لە رادەیەك دایە كە یەك ئەكەوێ لەگەڵ هێزی پاڵ پێوەنەردا كە پەیدا ئەبێ لە جوڵان و خولانەوەی زەوی، بە جۆرێك پارێزگاری گیانلەبەرو شتەكان ئەكات لە پەڕین و پرژو بڵاو بوونەوە، گیانلەبەرەكان ئەتوانن بگەڕێن و ئیشوكاری خۆیان بكەن، ئەگەر هێزە راكێشەرەكە رادەی زیاتر بووایە هەموو گیانلەبەرو شتەكان ئەنووسان بە زەوی یەوەو جوڵان و هاتوچۆیان بۆ نەئەكرا مەگەر بە زۆر زەحمەت. لە بارێكی ترەوە ئەگەر زەختی هەوا بەهێزتر ئەبوو ئەو كاتە هەموو شتەكانی ئەنووساند بە زەوی یەوە تا پان و پلیشی ئەكردەوە، ئەگەر رادەی پاڵەپەستۆ سووك تر بووایە لەوەی ئێستا سنگ و دەمارەكانی لاشەمان ئەتەقی یەوە. هەروەها یەكێ تر لەو شتانەی كە خوای گەورە لەم زەوی یەدا فەراهەمی هێناوە بۆ ژیانی ئادەم ئەم ئەندازە ئاوەیە كە دروستی كردووە ئەندازەو قەبارەی لە رادەیەك دایە بەسە بۆ هەڵمژینی ئەو هەموو هەڵم و غازە ژاراو یانە كە پەیدا ئەبن لەسەرو ناو سك و لای ژووروی زەوی دا، هۆیەكی تر بریتی یە لەم هەموو گیاو درەخت و سەوزە، واتە بۆ هاوتایی كردن لەنێوان ئەو ئۆكسجینەی كە دەری ئەدەن لەگەڵ ئەوەی كە گیانلەبەر هەڵی ئەمژێ، ئەگەر ئەم سەوزەواتە نەبووایە پاش ماوەیەك گیانلەبەرەكان ئەخنكان.

وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا۟ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾

**ئەمانەی کە گوتراو زۆری تریش هەیە نەگوتراوەو نەگونجێ زۆر زۆر شتی تریش ببێ کە لەمەو پاش دەرکەوێ ئەمانە هەموو لەگەڵ ئەوەی کە یەکەم چێن زانیویەتی لە مەبەست بەم ئایەتە، ئەمانە هەموو شایەتی ئەدەن لەسەر تواناو دەسەلآت و زانینی تێرو تەواوی ئەو خوایەی کە ئاسمان و زەوی دروست کردووە، بەهۆی ئەوەوە دڵ و دەروون هەست ئەکات بە حیکمەت و دەسەلآتی ئەو کەسەی کە ئەم هەموو شتەی دروست کردووەو رێکی و کۆمەکی خستۆتە نێوانیان، بەمەی کە ئەم جیهانەی لە خۆڕایی دروست نەکردووە، وازی لێ ناهێنرێ بێ لێ پرسینەوە، بێگومان بیرکردنەوە بەم جۆرە رێنموونی دڵ ئەکات بۆلای خوای ئەم بوونەوەرە، پاش ئەوەی خستیە پێش چاو ئامادەکردنی زەوی بۆ ژیانی ئادەمی و فەراهەم هێنانی رێگای ژیان تێیدا ئەمجار هۆی پەیدا بوونی گیان و گیان لەبەران نیشان ئەدات، ئەفەرموێ:** ﴿وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ﴾ **ئەو خوایە کەسێکی ئەوتۆیە کە لەلای ئاسمانەوە ئاوێکی هێناوەتە خوارەوە بە ئەندازەیەکی دیاریی کراوو بەجۆرێ بە شێوەی گشتی بەس بێت بۆ کشتوکاڵ و باغ و میوەهات و خواردنەوەی ئادەمی و ئاژەڵ و گیانلەبەرانی تر، بەڵێ لە هەندێ جاردا لە هەندێ وڵات دا بێ بارانی روو ئەدات یان لافاو وێرانی ئەکات ئەوەیش هەر ئەندازە دیاریی کراوەکەیە لای خوا بە گوێرەی زانین و حیکمەتی خۆی ئەم ئاوە جوانە کە یەتە خوارەوە هەموو کەس ئەیناسێ و ئەیبینێ، بەلآم زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نایابە ئەبینێ بێ بێداری و بیرکردنەوە لێ ی، لەبەر ئەوە ئولفەتی لەگەڵ دا گیراوە. بەلآم ئەو دڵەی کەوا زیندووەو لەگەڵ خوادایە هەرچەند جار ببینێ هەر لە پێش چاوی تەڕو تازەیە و کۆن نابێ. هەموو جارێك بیری لێ ئەکاتەوە، سەری لە کرداری خوا سوڕ ئەمێنێ، ئەو گەرم و گوڕیی یەی کە هەیەتی دەربارەی ئەو شتە نایابە هیچ کەم نابێتەوە بەمەی کە ئەو بارانە هەر ئاوەکەی زەوی یە بەهۆی تیشکی خۆرەوە ئەبێت بە تەم و هەڵم و بەرز ئەبێتەوە و کۆ**

ئەبێتەوەو تەپە ئەدات ئەم جارە بەو جۆرە ئەیکاتە خوارەوە، بەڵکو بە بیرکردنەوە لەوە ئێجگاری لە پێش چاوی نایاب تر ئەبێت، زیاتر سەری سوڕ ئەمێنێ لە کرداری خوا، چونکە بیر ئەکاتەوە لە دەسەڵاتی ئەو خوایەی کە زەوی دروست کردووەو ئاوی تێدا فەراهەم هێنا، ئەم جار گەرمی بەسەردا زاڵ کرد تا بیکات بە تەم و هەڵم. ئاوی بە جۆرێك دروست کردووە کە دەست ئەدات ببێت بە تەم و هەڵم، ئەویشی وا دروست کردووە کە بەرز ببێتەوە بەهۆی باوە یەك بگرێت و تەپە بدا لەو رادەدا بمێنێتەوە، ئەم جار کارەبای دروست کرد و تێکەڵی ئەو تەم و هەڵمە ئەبێ و ئەبێتە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو بارانە لەگەڵ چەند هۆیەکی تردا هەمووی هیچ دەسەڵاتی کەسی تێدا نی یە جگە لەخوای گەورە، کەواتە هەر دڵێ زیندوو بێت بە زانیاری باوەڕو ئیمانی هەتا بێت بەهێزتر ئەبێت، ئەو دڵانەی کە بە زانیاری دوور ئەکەونەوە لەخوا ئەو دڵانە مردوون و زیندوو نین، لەراستی دا ئەوانە زانا نین بەڵکو کۆکەرەوەی زانراوانی زانایانن، ئا بەو جۆرە ئەو بەرهەمە نایابەی قودرەتی خۆی نیشان داین ئەمجار ئەیکات بە دەلیل و نیشانەیەکی روون لەسەر زیندوو بوونەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًاۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ بەهۆی ئەو ئاوەوە وڵاتی مردووی وشکمان زیندوو کردووەتەوە، هەروەها وێنەی ئەو زیندوو کردنەوە، ئێوەش زیندوو ئەکەینەوە لەو گۆڕەکانتان دەرئەهێنرێن، چونکە ئەو کەسەی یەکەم جار زیندووی دەرهێنا لەزەوی ئەتوانێ دووبارەی بکاتەوە لەرۆژی دوایی دا بە ئاسانی.

یەکێ تر لەو بیرو باوەڕە پووچانەی کە بت پەرستەکان دایان هێنا بوو بریتی بوو لەوە: ئەو حوشترو حەیواناتەی کە خوا دروستی کردووە بۆ ئادەمی، ژێر باری کردووە بۆیان، ئەو نەفامانە بەشێکیان دائەنا بۆ خوا، بەشێکیان دائەنا بۆ ئەو شتانەی کە کردبوویان بە شەریك و هاوبەشی خوا، ئەوا خوایش هۆی دروست کردنیان باس ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ * لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ * وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە زاتێکی ئەوتۆیە کە هەموو جۆرە شتەکانی دروست کردووە لە هەموو گیانلەبەران، تەنانەت هەموو ئەو خەلیانەیش کە گیانلەبەرەکانی لێ پەیدا ئەبن، چونکە ئەوانیش هەڵگری ئەو شتانەن کە تایبەتین بە نێرو مێوە، بەڵکو نێرو مێی بنەڕەتی هەموو بوونەوەرە نەك تەنها گیانلەبەران بە گوێرەی ئەوە کە بوونەوەر هەموو لە زەرە پێك هاتووەو زەرەیش لە ئەلیکترۆن و نیوترۆن پێك هاتووە، هەرچۆن ببێ بۆ گیانلەبەر ئاشکرایە، ئەو

خوایەی کە هەموو ئەو جۆرە شتانەی دروست کردووە، گێڕاویەتی بۆ ئێوەو ژێر باری کردووە بۆتان شتێ کە سواری پێ بکەن ئیتر چ وڵاخی سواری یان پاپۆڕو کەشتی، ئەمانەی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە بۆ ئەمەی ئارام بگرن و بەسەر پشتیانەوە دامەزرێن بە خۆشی و کامەرانی، ئینجا لەو کاتەدا کە ئارام ئەگرن و دائەمەزرێن بیری نیعمەتی پەروەردگارتان بکەنەوە بە دڵ و بە دەمیش دانی پێدا بنێن و سوپاسی بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە گەورەو بڵێن: پاکی و بێگەردی و بێ لەکەیی لەهەر عەیبێ بۆ کەسێکە کە ئەمانەی ژێر بار کردووە بۆ ئێمە، ئێمە توانامان نەبوو ئەمانە ئاوا سەرشۆڕو ژێر بار بکەین، بێگومان ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگارمان لەرۆژی دوایی دا.

خوای گەورە لێرەو لە چەند شوێنێکی تردا ئادەمیزاد بێدار ئەکاتەوە بەمەی کە هەڵبژێرراون لەناو هەموو بوونەوەردا، کراون بە جێنشین لە زەوی دا، کاروباری جیهان و ژیانیان خراوەتە ژێر دەست لەبەر ئەوە ئەم بوونەوەرە بە ئاسمان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە هەمووی زەلیل و سەرشۆڕ کردووە بۆ ئادەمیزاد، ئینجا وەکو ئاوا بێداریان ئەکاتەوە، ئەو هەموو نیعمەتەیان ئەخاتە پێش چاو هەروەها تەمێ و ئامۆژگاریشیان ئەکات کە هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو لوتف و ئەو هەموو چاکەی خوا بەم جۆرە بێ، سەری شەرم و حەیا بۆ پەروەردگاریان دابخەن و سوپاسی بکەن. بە بینینی هەموو نیعمەتی خوایان بیر بکەوێتەوە، بیربکەنەوە کە ئەم هەموو لوتف و نیعمەتە سەرانسەر رەحم و بەزەیی یە، ئەمان توانای ئەوەیان نی یە کە بە سوپاس کردنیش بەرامبەریی بکەن، ئەو کاتە هەموو نیعمەتەکانی خوا بەکار ئەهێنن لە رەزامەندی خوادا، شەرم ئەکەن لە بەکارهێنانیان لە گوناهو نارەزایی خوادا، هەموو کاتێ مەترسی رۆژی دوایی لە دڵیان دا ئەبێت. بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە کە ئەبینین هەر کەسێ چاوەڕوان و موچەخۆری یەکێ بێت بە هەموو جۆر هەوڵ ئەدات بۆ راگیر کردنی دڵی ئەو کاربەدەستەی، زۆر مەترسی هەیە لەوەی رۆژێ لە رۆژان شتێ بکات دڵی برەنجێ و نانەکەی ببڕێ، بەڵام بەرامبەر بە خوا هەر هیچی بە خەیاڵدا نایەت، یان ئەگەر بێت شتێکی وا نی یە، ئەوە چ هۆیەکی هەیە جگە لەوەی کە ئیمانی هەر نی یە، یان ئەگەر بێ زۆر بێ هێزو لاوازە، خوا پەنامان بدات.

وَجَعَلُوا لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَـٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ ۚ

**یەکێ ترلەویرو باوەڕە پووچەی لەناو بت پەرستەکان دا هەبوو ئەوە بوو کە مەلائیکەیان ئەپەرست، لایان وابوو کە کچی خوان!! ئەوا قورئان باسی ئەکات و روونی ئەکاتەوە کە شتێکی پڕو پووچ و بێ جێیە بە جۆرێ بەریان لێ ئەبڕێتەوە بەرەنگاری ئەو باوەڕە بێ جێ یەیان ئەکات لە هەموو بارو رووەیەکەوە، بە گوێرەی تێگەیشتن و باوەڕی خۆیان لەگەڵیان ئەدوێ، ئەیشیان ترسێنێ بە پاشەڕۆژی سەختی ئەوانەی کە باوەڕیان وەکو ئەمان وابووە لە گەلە پێشووەکاندا.لە یەکەم جارەوە دەست پێ دەکات کە باسی بێ جێی و ناڕەوایی ئەو باوەڕە پووچە، بەمەی کە کوفرێکی ئاشکرایە، هیچ پێچ و پەنایەکی تیادا نی یە، ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا﴾ بت پەرستەکان هەندێ لە بەندەکانی خوایان بڕیار داوە بە بەش و پارچەیە لەخوا، باوەڕیان بەوە هەیە، واتە باوەڕیان واتە کە مەلائیکە کچی خوان، ئاشکرایە رۆڵەی هەموو کەسێ پارچەیەکە لێ ی، کەواتە رێکە ناوبردنی رۆڵە بە پارچە. بە پارچە ناوی برد، چونکە ئەو وشەیە روون ترە بۆ گەیاندنی نەگونجاوی باوەڕەکەیان، لەبەر ئەوە هەرچی پارچەی هەبێ ئەبێ دروست کراوبێت، هەرچی دروست کراوبێت نابێ خوابێ، ئەوانیش باوەڕیان بوو بە بوون و خوایەتی خوا. کەواتە ئەو وشە نەفامیان روون تر ئەکاتەوە وەك وشەی ﴿عبادە﴾ یش هەر روونی ئەکاتەوە، چونکە مەلائیکە بەندەیەکن وەکو ئەو هەموو بەندەیانەی ترە، کەواتە بە چی ئەوانە جوێ ئەکەنەوە لە هەموو بەندەکانی ترو ئەم پایە و پلە بەرزەیان ئەدەنێ جگە لەوەیش بەندەیەتی و رۆڵەیەتی کۆ نابنەوە پێکەوە، چونکە بەندە ئەبێ دروست کراو بێت، رۆڵە چونکە بەش و پارچەیەکە نابێ دروست کراوی باوکی بێت، کەواتە کوفرەکەیان زۆر روون و ئاشکرایە وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾بەراستی ئادەمی-واتەئەوانەیان کەباوەڕیان هەیە-کافرێکی زۆرروون و ئاشکرایەیان زۆربەدنمەکەودان بەراستیدانانێ،حەق دائەپۆشێ وچاولەبەری چاکەی خوانییە.**

ئەو بت پەرستانە زۆر بێزار بوون لەمەی کچیان ببێ، بە عارێکی زۆر گەورەیان دائەنا، لەگەڵ ئەوەدا ئەمەی کە بە عاریان دائەنا بۆ خوایان ڕەوا ئەبینی، جا بە گوێرەی ئەو باو و تێگەیشتنی خۆیانە قورئان لەگەڵیان ئەکۆڵێتەوەو ئەیانباتەوە بە خۆیان دا، بەشێوەی بێزاری و لاقرتی کردن بە پڕوپووچی داواکەیان پرسیار ئەکات ئەفەرموێ: ﴿أَمِ اتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَاكُم بِالْبَنِينَ﴾ [1] ئایا خوا لەناو دروست کراوەکانی خۆیدا کچ بۆخۆی بڕیار ئەدات و هەڵی ئەبژێرێ، کوڕ تایبەتی ئەکات بە ئێوەوەو هەر بە ئێوەی ئەدات؟ نەخێر شتی وا ناکرێ و نەگونجاوە، ئایا چۆن ئەوانە تا ئەو رادەیە بێ شەرم و بێ ئەدەبن شتێ بۆ خوا بڕیار ئەدەن کە خۆیان زۆر لێ ی بێزارن تا ئەو رادەیەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ یەکێ لەوان کاتێ هەواڵی بدرێتێ بە پەیدا بوونی ئەوەی کە بۆ خوای خاوەن ڕەحم و بەزەیی بڕیار ئەدات - کە شتێکە زۆر سەر سوڕهێنەریشە -- کاتێ ئەو هەواڵەی بدرێتێ، واتە پێ ی بڵێن کچتان بووە، لە بێزاری و ناخۆشی ئەو هەواڵە رووی ڕەش دائەگیرسێ و سەری خەجاڵەتی دائەخات و دڵی پڕ ئەبێ لە داخ و خەفەت و پیش ئەخواتەوەو ناوی نابا، کەواتە هیچ نەبێ شتێکیان بڕیار بدایە ئەوەندە خۆیان لێ ی بێزار نەبن. واتە ئەو باوەڕەو داوای ئەوانە زۆر جێگای بێزاری یە، جێگەی سەرسوڕمانە، ئایا چۆن باوەڕی وا نەفامانەیان هەیە؟!!

١- پارچەو بەش بۆ خوا بڕیار ئەدەن.
٢- ئەو پارچانەیش بەندەو دروست کراوی خوان.
٣- لەناو دروست کراوەکانی دا تیرەیە ئەکەن بە پارچەی کە رادەی پەست ترە لایان لەوەی بۆخۆیان ڕەوا ئەبینن.
٤- خۆیان لەو تیرە ئەوەندە بێزارن بە بوونی خەجاڵەت و سەرشۆڕ ئەبوون، روویان نایەت خۆیان دەرخەن وەکو لە سورەتی ﴿النحل﴾ دا ئەفەرموێ: ﴿يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ﴾[2].

---

[1] وشەی (أم) مونقەتیعەیە وەکو چەند جار گوترا ئەو کاتە بە مەعنا (بل) (أ) پرسیارەو (بل) بۆ دەست پێکردنە بە کەلامێکی سەربەخۆ.

[2] واتە خۆی دائەشارێ لەو کۆمەڵەی تێیدایە لەبەر خراپی ئەو هەواڵەی پێ ی دراوە، لەدڵی خۆیدا ئەڵێ ئاخۆ چی لێ بکات، ئایا نەیکوژێ بە ریسوایی بیهێڵێتەوە، یان زیندە بەچاڵی بکات.

ئەو بت پەرستانە ئەولادی مێینەیان نەئەویست لە چەند ڕوویەکەوە:

ا- مەترسی یان ئەکرد کە دووچاری بێ ناموسی بێن و بەهۆی ئەوەوە خۆیشیان بێ ئابڕوو سەرشۆڕ بن.

ب- غەمی ئەرکی بەخێو کردنیان.

ت- زۆر کەشخەو شانازی ئەکرا بە دووشت:

١- ئازایی و چالاکی لە شەڕو شۆڕدا.

٢- قسە زانی و خوتبە دان لە کۆبوونەوە و موناسەبات دا.

بۆ ئەم دوو شتە نێرینە بەکاریەت، زۆر بە نایاب هەڵئەکەوێ لەناو ئافرەت دا یەکێ دەست بدات بۆ ئەو دوو مەبەستە، جا لێرەدا بێ شەرمی و بێ ئەدەبی یان ڕوون ئەکاتەوە کە لەم بارەیشەوە بە گوێرەی باوو تێگەیشتنی خۆیان شتە بێ نرخەکە کە خۆیان نایانەوێ بۆ خوای بڕیار ئەدەن، ئەفەرموێ: ﴿أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ﴾ ئایا کەسێ بڕیار ئەدەن بۆ خوا کە پەروەردە ئەکرێت و پێ ئەگەیەنرێ لەناو خشڵ و زێڕو نازو نیعمەتدا، لەکاتی ئاژاوەو موجادەلەدا ناتوانێ داواو مەبەستی خۆی ڕوون بکاتەوە، واتە لێ نەهاتوو نەزان و نەفامە و بێ نرخە؟ یاخود ئایا بۆ خۆی شتی وا دائەنێ کە حاڵی بەو جۆرەیە؟ ئا بەم جۆرە قورئان لەگەڵ ئەو بت پەرستانەدا ئەکۆڵێتەوە، بەجۆرێ بەرودوای لێ گرتن. بردنیەوە بە خۆیان دا، ڕێگەی قسەیان نەما، چونکە بە گوێرەی باوەڕو تێگەیشتنی خۆیان لەگەڵیان دا دواوە، لە کاتی تەمێ و ئامۆژگاری و موجادەلەدا ئەو ڕێگایە بەکارترین و سەرکەوتوو ترین ڕێگایە. چونکە هەر بە باوەڕو قسەی خۆی پەکی ئەخەیت. ﴿وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ﴾ ئەم جار لەبارێ ترەوە لەگەڵیان ئەکۆڵێتەوە کە لە خۆیانەوە دەم ئەکوتن ئایا بە چییدا ئەزانن و باوەڕیان وایە کە مەلائیکە مێینەن، ئەفەرموێ: ئایا ئەوانە بە دیارەوە بوون کە خوا مەلائیکەی دروست کرد تا بزانن مەلائیکە بەو جۆرەن کە ئەوان ئەیڵێن؟ چونکە شتی وا بە بینین ئەزانرێ، خۆ ئاشکرایە و خۆیشیان شتی وا ناتوانن بڵێن، کەواتە زۆر نەفامن، بۆ ئەوە چاکن بەو جۆرە نەفامییان دەربڕدرێ و بە لاقرتیەوە ئەو پرسیارەیان دەربارە بکرێ، ئەمانە لە خۆیانەوە بی بینین و بەڵگە ئەو داوایان ئەکردو شایەتیان لەسەر ئەدا،

سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُمۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ﴿٢١﴾

---

**لەبەر ئەوە قورئان ئەو هەڕەشە سەختەیان لیٚ ئەکات ﴿سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ﴾ بیٚگومان ئەو شایەتیەیان لەسەر ئەنووسریٚ و پرسیاریشیان لیٚ ئەکریٚ لە رۆژی دوایی دا.**

**دوای ئەوە بەو جۆرە دواو بەریان لیٚ گیرا، پڕوپووچی باوەڕەکەیان روون کرایەوە، هیچیان بەدەستەوە نەما، ئینجا ئەیانویست بەم عوزرو بەهانەیە خۆیان رزگار بکەن: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُمۗ﴾ ئەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە ئێمە ئەم مەلائیکەتانەمان نەئەپەرست، واتە خوا خۆی ئەزانیٚ و دەسەلاٚتی هەیە، ماتولٚ بەرگری یان ناکات ئەڵبەتە بەوە رازی یە... ئەوا ئەم بەهانەیشیان بەتالٚ ئەکاتەوە، ئەفەرمویٚ: ﴿مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ ئەمانە لە خۆیانەوە ئەو قسەیە ئەکەن هیچ نازانن و ئاگایان لەوە نی یە کە خوا ئیرادەی ئەوەی کردبیٚ، ئایا لە چی یەوەو لە کوێوە ئەو قسە ئەکەن بە گۆترەکاری، درۆ ئەکەن، شوێنی گومان و خەیالاٚتی خۆیان کەوتوون، بەڵیٚ ئەمە راستە هیچ شتێك پەیدا نابێت و روو نادات لە هەردوو جیهان دا بە ئیرادەو خواهیشی خوا نەبیٚ چاك بیٚ، یان خراپ. بەلاٚم یەکیٚ لەو شتانەی کە خوا ئیرادەی کردووە ئەمەیە کە ئادەمی وا دروست کرد کە دەست ئەدا بۆ هیدایەت و گومڕایی، بۆ ئیمان و کوفر، دەسەلاٚتی داوەتیٚ بەسەر ئەمەدا: کام رێگەیان بداتە بەر، داوای لیٚ کردووە کە رێگەی هیدایەت و ئیمان بگریٚ و رای نی یە لە کوفرو گومڕایی یەکەی، ئادەمی ئاگای نی یە لە خواهیشەکەی خوا، بەلاٚم ئاگای هەیە لەوانەی رای لیٚ یەتی، یان قەدەغەی کردوون، ئەوانەی بەم روون کردنەوەیە کوٚلٚ نادەن هەق وایە دەست بکریٚ بە لێدان و سزایان ئەگەر قسەیان کرد پێیان بلێت من دەسەلاٚتم چی یە، خوای وای کردووە. ﴿ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ﴾ ئایا پێش ئەم قورئانە ئێمە کتێبێکمان پێداون تا ئەوان دەستی پێوە بگرن و بیکەن بە پالٚ پشت بۆ خۆیان بۆ ئەو عەقیدە و باوەڕەی کە وان لەسەری. دیارە شتی وا نی یە، کەواتە بیٚ هیچ مانەوە،**

بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾

---

**جا لێرەدا کە هیچ ئەما لاسایی و شوێن کەوتنی کوێرانەی باووباپیر ئەگرن بە دەستەوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾ بت پەرستەکان ئەیان گوت: ئێمە باوباپیری خۆمانمان دەست کەوتووە لەسەر رێگەو ئایینێ ، بێگومان ئێمە لەسەر رێبازو رچەی ئەوان ئەڕۆین و رێنموونی لەوانەوە وەرئەگرین. ئەم قسە جگە لەوەی کە بێ پاڵپشت و بێ نرخە جێگای گاڵتە و لاقرتی پێ کردنیشە، چونکە شێوەی شوێن کەوتنیان بە کوێرانە بێ ئەمەی بزانن خەریکی چین و بۆ کوێ ئەچن؟ وەکو پارچە مێگەل و ئاژەڵێ وان بدرێنە بەرو بۆ کوێ ببرێن مل بنێن بێ ئامانج و بێ مەبەست برۆن.**

**ئیسلام کە ئایینی ئازادی و بیر و هەست و هۆشە بە شتی وا رازی نی یە، تۆڵەی سەخت ئەسێنێ لەوانەی کە رێگای کوێرانەی وەها ئەدەنە بەر تەنانەت رەوا نادا کوێرانە شوێن ئایینی پاکی ئیسلامیش بکەویت، بەڵکو ئەبێ بە دەلیل و بەڵگە بەهێزەکانی دڵنیایی تەواوت ببێ. ئینجا دڵخۆشی و دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات بەمەی کە لە ئوممەت و گەلە پێشووەکانیش دا شتی وەها گوتراوە، ئەمانیش ئەترسێنێ بە وێنەی پاشەڕۆژی سەختی پێشووەکان کە کوێرانە شوێن ئایینی بەتاڵی باوباپیریان کەوتن، ئەفەرموێ:** ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ * ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم

بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ * فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾

**هەروەها لە پێش تۆ هەر پێغەمبەرێك و ترسێنەرێکمان رەوانە کردبێ لە هەر شارو ولأتێك دا، ئەوانەی کە خاوەنی نازو نیعمەت بوون لە دانیشتوان، زۆر چووبوونە خوارەوە لە ئارەزووی خۆیان دا، ئەوانە ئەیانگوت: بێگومان ئێمە باوباپیری خۆمانمان دەست کەوتووە لەسەر رێگەو ئایینێك، ئێمە پەیرەویان ئەکەین لەسەر ئەو رێگەو ئایینەیان، ترسێنەرەکە پێی گوتوون: ئایا ئێوە هەر شوێنی ئەوان ئەکەون؟ لەگەڵ ئەمەدا ئەگەر من رێگاو ئایینێکی راست ترم بۆ هێنابن لەوەی کە باووباپیرتانی لەسەر بووە!! لەوەلأمدا ئەیانگوت: بە تحقیق ئێمە باوەرمان نی یە، کافرین بەو ئایینەی ئێوەی پێ رەوانە کراون، واتە باراست تر بێت لەوەی باوباپیرمانی لەسەرە، ئینجا بەهۆی ئەوەوە تۆڵەمان لێ سەندن بە بەرباد کردنیان هەریەکە بە جۆرە سزاو ئازارێك، وەکو قورئان باسیان ئەفەرموێ لە سەرگوزەشتەکانیان دا، ئینجا تۆیش سەرنج بدە، ئایا چۆن بوو پاشەرۆژی سەختی بێ ئیمان و بێ باوەرەکان؟!**

**قورەیش ئەیانگوت ئێمە لە نەوەی(ئیبراهیم) ین – ئەمە راستە بێگومان – چونکە ئیبراهیم(علیه السلام) زۆر بە روونی بێگەردو غوبار باوەری تاك و تەنیایی خوای روون کردەوە، هەر لە پێناوی ئەو باوەرە پیرۆزەدا دەستی نا بە هەموو شتێکەوە کە لەم جیهانەدا خۆشەویستە و هەوڵی بۆ ئەدرێ: تەرکی باوك و کەس و کارو قەوم و خوێش و ماڵ و خاك و وەتەنی کرد دوای ئەوە دووچاری سزاو ئازارو ئەشکەنجە بوو لە لایەن ئەو بت پەرستانەوە تا ئەو رادە مەنجەنیقیان بۆ چنی بەلأم خوا یارمەتی دا وەکو لە چەند شوێنێ لە قورئان دا باسی ئەفەرموێ: جا لێرەدا ئەوا خوای گەورە بە کورتی ئایینی پاکی ئیبراهیم نیشان ئەدات و بەوە روون ئەبێتەوە کە ئەوانە نین لەسەر ئایینی پاکی ئیبراهیم(علیه السلام)،**

وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلۡ مَتَّعۡتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ وَرَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ * إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ﴾ ئەی محمد باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم وتی بە باوکی و گەلەکەی: بە تحقیق من بەریم لەوەی ئێوە ئەیپەرستن جگە لەو کەسەی کە منی دروست کردوون لە نەبوون، تەنها ئەو ئەپەرستم[1] ئینجا ئەویش من بەردەوام و دامەزراو ئەکات لەسەر ڕێگەی ڕاست یان بۆ زیاد لەوەی کە ڕێنموونی کردووم بۆ لای، واتە باسی(ئیبراهیم) یان بۆ بکە با بیر بکەنەوە کە مادەم لە نەوەی(ئیبراهیم) ن و هەموو شەرەفێکیان بەوەیە، کەواتە شوێنی ئەو باوکە گەورە بەشەرەفەیان بکەون، شوێنی باوباپیرەکانی تریان نەکەون.**

**ئیبراهیم(علیه السلام) ئەو وشەی پیرۆزەی فەرموو: وشەی پەرستنی خوا بە تاك و تەنیایی: ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ گێڕای بە وشەیەکی ماوەی نەمری هەموو کاتێ لەناو نەوەو ئەو چین و تاقمانەی پاش خۆی، بۆ ئەمەی هەرکام لای دا لەو ڕێگە ڕاستە بەهۆی ئەوانەی کە لەسەر ئەو ئایین و ڕێگا ڕاستەن بگەڕێنەوە بۆلای ئەو کەسەی کە لە نەبوونەوە دروستی کردوون، وەکو باوکی هەمووان(ئیبراهیم) کە تەنیا بۆلای ئەو پەروەردگارە ئەگەڕاوە لە هەموو کارو بەسەرهاتێکی دا.**

**خوای گەورە ئەو وشەی(ئیبراهیم) ەی هێشتەوە پاش خۆی هەتا دنیا دنیایە بەهۆی ڕاستی ئیبراهیم و فیداکاری ئیبراهیم و نزای ئیبراهیم و وەسیەت کردنی ئیبراهیم لەناو ڕۆڵە و نەوەکانی دا بە ڕاگیرکردنی و هەڵسان بە ئەرکی ئەو وشەیە، خوای گەورە کارێکی وای کرد لە پاش ئیبراهیم ئەو هەموو پێغەمبەرەی لە ڕۆڵەو نەوەی ئەو دروست کرد تەنانەت سێ کەس لە گەورەترین کۆمەڵی پێغەمبەران – سەلامی خوا لەسەر هەموان – لەنەوەی(ئیبراهیم) ن: موساو عیسا و دواترین و گەورەترینی هەمووان پێغەمبەرمان(ﷺ) و ئەو وشەی ئیبراهیم**

---

[1] بەشێوەی(الأستثناء المتصل) تەفسیرم کردۆتەوە، چونکە وا دەرئەکەوێ هەموو بت پەرستێ خوایشی پەرستووەو وشەی ﴿ما﴾ یش زۆر بەکار ئەهێنرێ بۆ خاوەن عیلم و دروستە منقگیش بێت، مەبەستەکە هەریەکە.

و فیداکاری و نزاو وەسیەتی ئیبراهیمەی لە گەورەترین پەڕاوی دا کە قورئانە ناردە خوارەوە، کەواتە هەتا هەتایە هەر ماوەو بەردەوامەو تا بێت حەقی و راستی ئەو وشە پیرۆزە روون تر ئەبێتەوە. بەڵێ ئەو وشە پیرۆزە: وشەی باوەڕو پەرستنی خوا بە تاك و تەنها لە پێش ئیبراهیمەوە هەر بووە، چونکە بوونەوەر لەسەر ئەو وشە دامەزراوەو راگیرە. لەپێش پەیدا بوونی ئادەمیزاددا هەر بووەو لەپاش پەیدا بوونی ئادەمیزاد لە یەکەم کەسەوە کە ئادەمە هەر بووە لەپاش ئادەم(علیه السلام) لەناو رۆڵەو نەوەکانی دا بووە وەك قورئان هەندێکمان بۆ باس ئەفەرموێ: نوح و هود و صاڵح و غەیری ئەوان لە پێغەمبەران، بەلاَم ئەوانە پاش خۆیان بە هەمیشەیی بێ پچڕان ئەو وشە نەماوەتەوە وەکو باس کرا.

بەلاَم وەنەبێ لەناو هەموو نەوەکانی(ئیبراهیم) یش دا ئەو وشە پیرۆزە مابێتەوە بەڵکو لە نەوەی ئیسحاق دا مایەوە: لە نەوەی(ئیسماعیل) دا نەمایەوە بە هەمیشەیی وەکو لەم فەرمودەیشەوە روون ئەبێتەوە: ﴿ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾[1]. ئەم بت پەرستانە و باوباپیریان لەپێش ئەمانەوە هۆی ژیانم بۆ فەراهەم هێناون و ماوەم دان بە تەمەنی درێژو گوزەرانی خۆش هەتا ئایینی حەق و راستیان بۆ هات لە قورئان دا، پێغەمبەرێ کە ئاشکرایە پێغەمبەرێتی یەکەی بەهۆی ئەم موعجیزە گەورەیەی کە لەگەڵیدایە، جنۆکەو ئادەمیزاد تیایدا سەرسامن، بەڕوونی و راستی و ئاشکرایی رێگا راستەکەی نیشان دان: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ کاتێ ئەو حەقەیان بۆهات کە قورئانە، وتیان: ئەمە سیحرەو بێگومان ئێمە باوەڕمان پێی نی یەو کافرین پێی، لەچەند شوێنێك دا باسمان کرد کە گەورەو سەرۆکەکان بە باشی ئەیانزانی کە قورئان حەقو راستە، بەلاَم بەو جۆرە پروپاگەندە ئەیانویست کۆڕو جەماوەری لێ دوور بخەنەوە، وەکو هەموو سەرۆکەکانی گەلەکانی پێشوو، ئەمانیش حەقیان بۆ روون بوو بەلاَم ئەوان و ئەمانیش ئەیانویست پارێزگاری کەشخەو تەن تەنەکەیان بکەن، با هەر سەرۆك بن و بە ئارەزووی خۆیان دەست درێژیی بکەن، کەس دەستیان نەگرێت. چونکە باش ئەیانزانی کە هەق هاتوو روون بووەوە ئەبێ ئەمان برۆن، چونکە باوەڕ بە تاك و تەنهایی خوا هەرکات بە رێکی جێگیر ببێ ئیتر هیچ کەسێکی تر باك و سامی لێ ناکرێ، جگە لەو خوایە کە هەموو شت هەر بە دەست ئەوە.

---

[1] وشەی ﴿بل﴾ بۆ کۆتایی هێنانە لە وتەی لەمەو پێش و دەست کردن بە مەبەستی تر وەکو بفەرموێ واز بێنە لە باسی ئیبراهیم ئەمانە پەیوەندیان پێوە نی یە، با تەماشای حاڵی ئەمانە بکەین.

﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ

**ئەو بەدبەختانە بە هاتنی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) ئێجگاری کوفرەکەیان بڵێسەی سەند لەگەڵ بت پەرستی یەکەیاندا عینادو دوژمنایەتی حەقیان زیاد کرد، بەچاوی سووکی و ریسوایی تەماشایان ئەکرد، دەربارەی قورئان ئەیانگوت سیحرە، دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) رەخنەیان ئەگرت وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ ئەیانگوت دەی با ئەم قورئانە بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەر پیاوێکی دنیایی گەورە لەم دوو شارەدا: مەککە یان تائیف، واتە پێغەمبەرێتی مەنسەب و روتبەو پلەیەکی بەرزە ئەبێ بە پیاوێك بدرێ کە سامان دار بێ و لەناو گەل دا سەرۆك و کاربەدەست بێت، بەڵێ هۆی ئیمان نەهێنانیان ئەوەبوو بە هۆی نەفامی و نەزانیانەوە ئەم رەخنەیان ئەگرت و نەیاندەزانی کە پێغەمبەرێتی روتبەو پلەی هەرەبەرزی رۆحیە بە کەسێ ئەدرێ کە خاوەنی سروشتێکی پاك و بێگەردی بێ، لە لایەن خواوە ئارایش کرابێ و رازابێتەوە بە خو رەوشتی پاك و هەموو کەمالاتی نەفسی و دەروونی. نادری بە کەسێ کە رازابێتەوەبە زێوەرو دیمەنی بەرزو جوانی دنیایی. بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) رادەی نەسەبو نەژادی لە بەرزترین پلەبوو، وەکو نەفسی خۆیشی ناسراو بوو پێش رەوانە کردنی بە خووڕەوشتێکی بەرزو کردەوەی شیرین، بە رادەیەك ناوبانگی پەیدا کرد بەناوی ﴿الأمین﴾ بەلأم سەرۆك هۆز نەبوو لەبەر ئەوە بەلایانەوە رێك نەبوو کە ئەو پێغەمبەر بێت، بەلأم خوا باش ئەزانێ: ﴿الله اعلم حیث یجعل رسالته﴾. [1] یەکێکی بۆ دیاریی کرد کە ئەیزانی لە هەموو کەس ئەهل ترو شایان ترە بۆ ئەو روتبە بەرزە. وەکو لە پاشان روون بووەوە، واقیع دەری خست کە شتەکە وایە، کەسێکی بۆ هەڵبژارد کە جیاوازی هەبوو لە هەمووان بە خووڕەوشتی شیرین کە بەشێك بوو لە سروشتی پەیامەکەی، نیشانەی ئاشکرای خۆ رووت کردن بوو لە هەموو نرخێکی ئەرزی، کە ئەوەیش بنەڕەتی بانگەوازەکەیتی، کەواتە پشتیوان و هێزی پەیامەکەی لە ناوەڕۆکی خۆیەوە هەڵقولأوە. ئەو روتبەی نەدا بە کەسێ کە سەرۆك بێت، یان خاوەن ماڵ و سامان و قەدەرو**

---

[1] واتە: خوا باش ئەزانێ فروستادەی خۆی لە کوێدا دائەنێ.

رێزی دنیایی بێت بۆ ئەمەی تێکەڵ و پێکەڵی پەیدا نەبێ و نرخێ لە نرخەکانی زەوی نەشێوێ لەگەڵ ئەو پەیامەی لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە، بۆ ئەمەی ئەو پەیامە ئاسمانیە ئارایش نەکرێ بە زەڕو زێوەری ئەرزی، بۆ ئەمەی ئەو کەسانەی هەر بە شوێنی ئامانجێکی ئەرزی دا ئەگەڕێن، بە گورجی نەیەنە ژێر ئالآکەی و تێکەڵی پاکان نەبن، تا پاکان جوێ بکرێنەوە لە ناپاکان، یان ئەو کەسەی کە مەبەستێکی پاك و خاوێنی هەیە، دوورە پەرێزە لە ئامانجی ئەرزی خۆی دوور نەخاتەوە لێ ی بەهۆی ئەو تێکەڵی یەوە. بەلآم ئەو کۆمەڵە بت پەرستە تێ نەگەیشتبوون لە سروشتی ئەم بانگەوازە ئاسمانییە، چاویان هەر بڕیبووە ئامانجە ئەرزی یەکان لەبەر ئەوە ئەو رەخنەیان ئەگرت، ئەوا قورئانیش دەم کوتی دانەوە بە بێزاری یەوە ئەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ﴾ ئایا ئەوان رەحمەتی پەروەردگاری تۆ – واتە پێغەمبەرێتی – دابەش ئەکەن بەسەر خەڵك دا بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان؟ واتە رەوانەکردنی پێغەمبەران و گێڕانی هەرکەس بە پێغەمبەر کارێکە تایبەتی یە تەنها بە خواوە، رێگەی داواو قسەی هیچ تێدا نی یە، تەنها خۆی ئەزانێ کێ شایانی ئەوەیە، بە هەوڵ دان دەست نەکەوتووە، هیچ پێغەمبەرێك نەیزانیوە ئەبێ بە پێغەمبەر پێش ئەمەی ئەو رەحمەتەی خوای بۆ هاتبێ. کەواتە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە، ئەوپەڕی نەفامیان دەرئەبڕن کە دەم ئەکوتن لەکاری وا گرنگ و گەورە، ئەمانە دەستە پاچەو پەك کەوتوون، لە راوێژو پێك هێنانی رزق و رۆزی بۆ خۆیان لەم دنیادا کە شتێکی بێ نرخە بەلای خواوە، هۆی پێك هێنانیشی بۆ فەراهەم هێناون، ئیتر چۆن دەمبازی ئەکەن لە شتی تردا؟! وەکو ئەفەرموێ: ﴿ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ ﴾ ئێمە دابەشمان کردووە لە نێوانیاندا رزق و رۆزی و هۆی گوزەرانیان لە ژیانی ئەم جیهانەدا، هەندێکمان بەرز کردووەتەوە بەسەر هەندێکی تردا بە چەند رادەو پلەیەك، واتە کاتێ لەم شتە تایبەتی خۆیانەدا ئارەزووکارییان بۆ ناکرێ، ئیتر چۆن لە رەوانە کردنی پێغەمبەردا کە تایبەتی یە بە خواوە ئارەزوو کاری ئەکەن. رزق و رۆزی و گوزەرانی ژیانی ئەم جیهانە زۆرتر بە گوێرەی تێکۆشان و لێزانین و لێ هاتنە، رادەی دابەش کردنی رزق و رۆزی لە نێوان گەل و ئەندامەکانی گەل دا جیاوازی هەیە، بە گوێرەی ئەو شتانەی کە هۆی جیاوازی چەرخ و رۆژو گەل و رژێمەکانی گەل. بە هیچ جۆر لە هیچ کاتێك دا رووی نەداوەو نەگونجاوەو نایشگونجێ یەکسانی تەنانەت لە رژێمە دەست کردەکانیش دا بە تایبەتی هەوڵ

تێکۆشانیان کرد، نەیانتوانی یەکسانی بخەنە نێوان هەمووانەوە، ئەبێ جیاوازی هەبێ، هۆی ئەو جیاوازی یەش ئەمەیە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾ بۆ ئەمەی هەندێکیان هەندێکی تریان بەکار بێنن لە بەجێ هێنانی پێویستی ئەوی تردا، واتە هەمووتان پێویستیتان هەیە بە یەکتر، هەریەکە پێویستی ئەوی تر بەجێ بهێنێ، کەواتە هەرکەس لە بارێکەوە ژێر بارە بۆ ئەوی تر. یان داماوی هەیە بە شتێ ئەوی تر بۆی جێ بەجێ ئەکات. بۆ وێنە: نانەوا پێویستی و ناچاری هەیە بۆ ئەوانەی لێ ی ئەکڕن، بکڕەکان ناچارییان هەیە بە نانەوا نانیان پێ بفرۆشێ. کرێکار ناچاری هەیە بە ئەندازیار و خاوەن کارگە، ئەوانیش پێویستی و ناچارییان هەیە بە کشتوکاڵ کەر کە خۆراکی بۆ فەراهەم بێنێ، ئەویش پێویستی هەیە بە ئاسنگەر شتومەکی خۆراکی بۆ فەراهەم بێنێ، هەروەها بەوجۆرە هەموو وایە.

پەندی پێشینانی کوردی کە ئەڵێ:(شایش ئەیکەوێتە گەدا) نموونەیەکی راستە بۆ ئەم بابەتە، زۆر لە دوژمنەکانی ئیسلام ویستیان لەم ئایەتەوە کون و کەلەبەرێ بدۆزنەوە بۆ لەکەدار کردن و تانەو تەشەر دان لە یاسای کۆمەڵایەتی و ئابووری ئیسلام بۆ گەیشتن بە ئامانجی پیسی خۆیان کە بریتی یە لە لاوازکردنی بیرو باوەڕی رۆڵە نەشارەزاکانی ئیسلام، تا رادەیەك کاریشیان تێ کردن و وایان بردە مێشکیانەوە کە ئیسلام رژێمی چینایەتی بەکار ئەهێنێ لەناو گەل داو ئەیەوێ دەست بگرێ بە سەردەمی بەش خوراوەکان دا، با بۆ خۆیان سەر کز بکەن، هیچ چارەیەك نی یەو کارەکە کاری خوایە، لە ئەنجامدا هەندێك لە بڕوادارو دڵسۆزی ئیسلام دامابوون و ئەیانویست بە هەرجۆرێ بێ ئیسلام رزگار بکەن لەو لەکەو ئەو تاوانە گەورەیەی لێ دوور بخەنەوە. چەند زانای بەرز هاتنە پێشەوە بە هەموو دڵنیایی و سەربەرزی یەوە خوا پاداشتی گەورەیان بداتەوە، ئەو تانەو تەشەرەیان لە رەگ و ریشە هێنا، سەری خەجاڵەتی یان بە تانە دەرەکان داخست، بە تایبەتی مامۆستای بەنرخ محمد قطب لە کتێبی شبهات حول الإسلام دا. بەڵام ئێستا باشتر حەقیقەتەکە روون بۆتەوە هیچ ئەو زەحمەتەی ناوێ، چونکە تا دنیا بەرەو زانیاری و تێگەیشتن بڕوا، گەورەیی و راستی ئیسلام ئاشکرا تر ئەبێ، ئەمڕۆ رۆڵەکانی ئیسلام ئەتوانن بێ باك بە ئیسلامەوە بوەستن بەرامبەر هەموو دنیا، بێ پێچ و پەنا بخوێن بە ملی هەموو جیهان دا: بەمەی کە هەموو بیرو باوەڕو رێگایەك پڕە لە هەڵەو لاری جگە لە ئیسلام، پێویستە بۆ ئادەمیزاد هەموو بێنە ژێر

ئالآکەی، چونکە هەرچی بڕیارەکانی هەیە هیچی دەست نادات بۆ دەست تێخستن و سەر لێ کردنەوەو هەمووی دامەزراوە بە وێنەی دامەزران و نەگۆڕانی ڕژێمی ئەم بوونەوەرە گەورەیە.

تەبیعەت و سروشتی ژیانی ئادەمی، لەم جیهان و زەوی یەدا دامەزراوە لەسەر بنەڕەتی جیاوازی ئەندامەکانی گەلی ئادەمی، لە لێ هاتن و لێ زانین و ئامادەیی هەر تاقمێ بۆ کارو فرمانێ، تاقمێ بۆ پیشەسازی، تاقمێ بۆ کشتوکاڵ، تاقمێ بۆ بازرگانی، تاقمێ بۆ حوکمڕانی و رامیاری... هەروەها تا ئەوپەڕی ئەو کارو فەرمانانەی کە پێویستە بۆ ژیان بەسەر بردن لەم جیهانەدا.

ئەگەر ئەم جیاوازی یە نەبوایە و هەموو یەك بابەت بوایە هەموو کارو فەرمانەکانی تر ئەوەستان، کەواتە ئاشکرایە بەبێ ئەو جیاوازی یە ژیان ناڕوات، بەسەر نابرێت، بێگومان لەو جیاوازیی یەوە جیاوازی لە رزق و رۆزیش دا پەیدا ئەبێت، ئەسڵی ئەم جیاوازی یە یاسایەکی دامەزراوە بە ناچاری. بەڵێ رادەی جیاوازیی یەکە لە رزق و رۆزیدا ئەوە زۆرتر بە گوێرەی جیاوازی گەل و رژێمەکانی گەلە، بەڵام ئەسڵی جیاوازیی یەکە یاساو بنەڕەتێکی دامەزراوە، سروشتی ئەم ژیانە بێ ئەوە ناگونجێ، لەبەر ئەوە خاوەنی مەزهەبە دەست کردەکان کە بە هەموو هێز هەوڵ و تێکۆشانیان کرد نەیان توانی رۆژانەی کرێکارو ئەندازیار یان سەربازو سەرۆك یەکسان بکەن، هەروەها باقی تر، لەگەڵ ئەوەدا ئەو یەکسانی یە بە قسەی خۆیان بنەڕەتی بیرو باوەڕو مەزهەبەکەیانە، تا گەڕانەوە و بە ناچاری و چوونەوە بە خۆیان دا، سەریان شۆڕ کرد لە بەردەمی یاسا نەگۆڕاوەکەی خوادا، ئەوەی ئەیان ویست نەگونجا. بێجگە لەمانە هەموو ئەو یەکسانی یە کە خاوەن رژێمە دەست کردەکان ئەیان ویست بە جێ ی بێنن ئەوپەڕی زوڵم و ناڕەوایی یە، چونکە پیاوی وا هەیە رۆژێکی هەزار رۆژی یەکێکی تر ئەهێنێ.. دەی چۆن ئەم دووانە یەکسان بکرێن؟ کەواتە با ئیمان بێنین کە هەر بڕیاری خوا رێك و راستە کە فەرموی: ﴿وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾ بێ ئەوە ژیان ناگونجێ و بە بێ یاسای خوا ژیان بە رێکی ناڕواو رۆزی و سامانی ئەم جیهانە بەو جۆرەیە کە گوترا، پەیوەندی نی یە بە چاکی و خراپی و موسڵمانێتی و کافری یەوە، چونکە نرخی نی یە بەلای خواوە،

وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا

﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ – لێرەدا واتە پێغەمبەرێتی و ئەو شتانەی کە تایبەتین پێ یەوە – چاکترە لە هەرچی ئەو ڕۆزی و سامانەی کە ئەوانە کۆیان کردۆتەوە، کەواتە گەورە ئەو کەسەیە ئەو بەشەی پێ درابێ، نەك ئەوانەی کە هەر کەلەپووریان پێ دراوە، خوای گەورە خۆی هەموو شت ئەزانێ هەرکەس شایانی ئەو ڕەحمەتە بووبێ ئەو کەسەی بۆ بڕیار داوە، پەیوەندی ئەو ڕەحمەتە نی یە بە ماڵ و سامان و شتومەکێ کە هەر لەم زەوی یەدا نرخیان هەیە و لای خوا بێ نرخیان لە ڕادەیەك دایە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئادەمیزاد با یەکسەر هەموو نەکەونە کوفر خوای گەورە بە لێشاو ئەیڕشت بەسەر کافرەکان دا، وەکو لەم فەرمودەیەوە ڕوون ئەبێتەوە: ﴿وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ * وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ * وَزُخْرُفًا﴾ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خەڵکی یەکسەر ئەبوون بە یەك میللەت و کۆ ئەبوونەوە لەسەر کوفر فەراهەممان ئەهێنا بۆ کافرەکان: سەربانی زیو و ئاڵتوون بۆ خانوو، کۆشکەکانیان و پلەکانیان کە پیا سەرکەون، دەروازەی زیوو ئاڵتوون بۆ هۆدەکانیان، چەندان تەخت و کورسی کە بەسەریانەوە پاڵ ئەدەنەوە، ئەمانیش هەر لە زیوو ئاڵتوون.[1]

دنیا ئەوەندە بێ نرخە بەلای خواوە، ئاڵتوون و زیوە کە بەنرخترینی هەموویەتی بە لێشاو ئەیدا بە کافر، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە بە جارێ هەموو خەڵکی کافر ئەبوون: چونکە لەبەر نەفامییان وایان ئەزانی کە ڕشتنی ئەو ماڵ و سامانە بەسەریان دا بە لێشاو بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو کافرانە خۆشەویستن لای خوا، ئەو کاتە لەبەر ئەوەو ماڵ و سامانەکە هەموو کۆ ئەبوونەوە لەسەر کوفر. کەواتە دنیا هیچ قیمەت و نرخی نی یە لای خوا بۆیە بەو جۆرە ئەیدا بە دوژمنەکانی، ئەگەر لەبەر ئەو هۆیە نەبوایە کە باس کرا وەکو ئەم حەدیسەش بێ نرخی ڕوون ئەکاتەوە: ﴿لوان الدنيا تزن عندالله جناح بعوضةماسقى منهاكافراشربةماء﴾

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە مەبەست بە وشەی ﴿زخرف﴾ ئاڵتوونە، عەتفە بۆ سەر ﴿فضة﴾. بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە کە عەتف بێ بۆ سەر ﴿سقفا﴾ و مەبەست پێی نەقش و نیگارو زیرو زیوەر بێت.

﴿وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ﴾ [1] ئەو هەموو زیوو ئاڵتوون و زەڕو زێوەرە هیچ نی یە جگە لە هۆی خۆشی و لەزەت و رابواردنێکی ئەم ژیانی دنیایە، لەوە تێ ناپەڕێت و ژیانی دنیایش ئەو ماوە کەمە بێ نرخەیە کە هیچ خۆشی یەکی نی یە تا سەربێ، خۆشی یەکانیش تێکەڵی داخ و دەردە، ﴿وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ رۆژی دوایی کە لای پەروەردگارتە تایبەتی یە بەو کەسانەی کە لە خواترسن و خۆیان لە دنیادا ئەپارێزن لە کوفرو تاوان، ئەوانە بەهۆی ترس و خۆپاراستنیانەوە رێز گیراون لای خوا، لەبەر ئەوە ئەو شتەی کە بە نرخەو ئەمێنێتەوە بێ بڕانەوە بۆی ئامادە کردوون، تایبەتی کردووە پێ یانەوە.

ماڵ و سامان و خۆشی دنیایی دڵی زۆر کەس ئەگۆڕێ، دووچاری هەڵەی ئەکا، بە تایبەتی کە ببینن بە زۆری و بە لێشاو بکەوێتە ژێر دەستی کافران و تاوانباران، چاکان لێ ی بێ بەشن، یان ببینن کە ئەوان لە هێزو دەسەڵات و سەڵتەنەتان، ئەمان لە تەنگی و سزاو مەینەت دان.

خوای گەورە خۆی ئەزانێ کە شتی وا زۆر قورس و بەتینە لەسەر دڵ، وەکو ئەو بارە گرانە ئەدا بەسەر دڵ دا، لەم لایشەوە ئا بەم جۆرانە بێ نرخی و ریسوایی شتومەکی دنیا بەلای خۆیەوە روون ئەکاتەوە، دڵخۆش و دڵ نەوایی لەخوا ترسەکانیش ئەکات بە بەخشش کردنی ئەو شتانەی کە لای خۆی بەنرخەو نەبڕاوەن، دڵێ کە ئیمانداری راستەقینە بێت ئارامی هەیەو رازی یە بەوەی خوای گەورە دایناوە بۆ ئەو دوو کۆمەڵە، چاوی ئومێدی ئەبڕێتە ئەوەی لای خوایە بە خۆشی و کامەرانی یەوە، ئەزانێ گەورە ئەو کەسەیە کە لەرۆژی دوایی دا گەورەیە، ئیتر لەم دنیادا هەرچۆن ببێ.

ئا ئەوانەی کە رەخنەیان ئەگرت لەوەی کە خوا یەکێکی کردوە بە پێغەمبەر کە بێ بەشی کردووە لە ماڵ و سامانی زۆرو ئاڵتوون و زیوی نەداوەتێ، پیاوەتی و گەورەییان لەسەرۆکایەتی و ماڵ و سامان دا ئەبینی.

[1] وشەی ﴿لما﴾ بێ شەدە خوێنراوەتەوە، ئەوکاتە ﴿إن﴾ ی – مشبە بالفعل – ە، واتە بێگومان هەموو ئەو شتانەی کە باس کران هۆی خۆشی و رابواردنێکی ژیانی ئەم دنیایە، هەر یەك مەبەستە.

ئەوانە با باش گوێ بگرن لەم ئایەتانە تا تێ بگەن کە ئەو شتانە تا چ رادەیەك بێ نرخ و بێ رێزن بەلای خواوە، ئەوەتا لەبەر بێ نرخیان بە لێشاو ئەیاندات بە خراپترینی هەموو گیانلەبەران و نەفرین لێ کراوانی خۆی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە ئەبوو بەهۆی گومڕایی هەمووان، کەواتە ئەو شتە بێ نرخانە نیشانەی خۆشەویستی و رەزامەندی خوا نین.

ئا بەم جۆرە قورئان هەموو شتێك لە سنووری خۆیدا دائەنێت، رەوشت و باوی خوا روون ئەکاتەوە لە دابەش کردنی رۆزی و سامان لە هەردوو جیهان دا، حەقیقەتی نرخ و قیمەت بەلای خواوە باس ئەفەرموێ و ئەمانەی هەموو تێ گەیاندن، لە کاتێك دا کە بێ جێ یی رەخنەی رەخنەگرەکانی دەرخست، ئەوانەی کە رەخنەیان ئەگرت لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها نیشانمان ئەدات کە هەندێ شت دامەزراوە لە بنەڕەتەوە، گۆڕانی نی یە، بە گۆڕانی بارو رووی ژیان و جیاوازی رژێم و جۆر جۆری باوەڕو مەزهەبەکان، ئەو هەر ناگۆڕێ.

ئەوەی کە ئەگۆڕێ و پەرە ئەسێنێ شێوەو بارو دیمەنەو بەس، بە پێچەوانەی هەندێ لە ئادەمیزاد کە هەر تەماشای دیوی دەرو دیمەن ئەکەن – کە ئەگۆڕێ و ناوەستێ لەسەر بارێك– بەهۆی ئەوەوە وا گومان ئەبەن کە گۆڕان و پەرەسەندن روو ئەکاتە هەموو شتێ لە حەقیقەت و بنەڕەتی یەوە تا شێوەو شکڵی، کەواتە یاساو بنەڕەتێکی دامەزراو نی یە بۆ هیچ شتێ، بەڵام ئێمەی موسڵمان کە خاوەنی عەقیدەی رێك و راستی ئیسلامین، لەڕووداوی ژیانمان دا ئەبینین کە دامەزراوی و گۆڕان(الثبات و التطور) پێکەوە هەن، جوێ نابنەوە لە یەکتر لە هەموو بوونەوەردا، لە هەموو ناوچەیە لە ناوچەکانی ژیان دا.

نزیکترین وێنە ئەمەیە کە لەم ئایەتەدا پێیەوە خەریکین: وێنە بۆ دامەزراوی، ئەسڵی جیاوازییە لە رۆزیدا، وێنە بۆ گۆڕان: رادەی جیاوازی و هۆکانیەتی.

پاش ئەمەی باسی بێ نرخی شت و مەکی دنیایی کرد بەلای خواوە، ئەوەی کە ئەیدا بە کافران و تاوانباران لەم جیهانەدا نابێتە بەڵگەو نیشانە لەسەر رزگارییان، لەسەر ئەوەی کە رێزیان هەیە لە خوا ترسەکان، پاشە رۆژی کامەرانی و بەختەوەری هەر بۆ ئەوانە هەیە لە رۆژی دوایی دا، دوای ئەوە پاشە رۆژی سەختی ئەوانە باس ئەکات، کە لەم جیهانەدا بەشی پێداون بەڵام خۆیان کوێر کردووە لە یادی خواو لایان داوە لە گوێڕایەڵی بۆ خوا.

وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴾ هەركەس چاوی دڵی خۆی کوێرو بێ ئاگا بکات لەیادی خوای خاوەن رەحم و بەزەیی، لە هەست کردن بە ئاگاداری و چاودێری خوا لە هەموو کات دا. هەرکەس ئاوا خۆی بەدبەخت بکات ئێمەیش شەیتانێکی بۆ فەراهەم ئەمێنین کە هەمیشە ببێتە هاوڕێ و هاوسەری و شتی خراپە بخاتە دڵی و رێگای شەڕو کوفری پیشان بدات: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ بێگومان ئەو شەیتانانە کە هاوڕێیانن سەریان لێ ئەشێوێنن و لە رێگا ئەیاتترازێنن، بەرگریان ئەکەین لە کەوتنە سەر رێگەی راست.**

**ئەو سەر لێ شێواوانە بە خۆیشیان نازانن و وەها گومان ئەبەن کە لەسەر رێگەی راستن، ئەوە خراپ ترین کردەوەیە کە هاوڕێ لەگەڵ هاوڕێ و هاوسەردا بیکات. سەری لێ تێك بدات و لەسەر رێگای لای بدات لەگەڵ ئەوەدا وازی لێ نەمێنێ، هۆشی بکاتەوە، بەڵکو وای حاڵی بکات کە رێگاو بارێکی باشی داوەتە ئەو سەر لێ تێك چووە بەو جۆرە ئەمێنێتەوە بە بێ ئاگایی و خۆی نازانێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا﴾ هەتا کاتێ کە ئەمرێ و دێت بۆلای ئێمە، ئەو کاتە هۆش ئەکاتەوە و تێ ئەگات کە هاوڕێی شەیتانەکەی چی بەسەر هێنا. چۆن ئەوەندە نەفام بوو کەوتە شوێنی، ئەویش جڵەوی راکێشا، تا سەری لە ئاگری دۆزەخەوە دەرکرد دووچاری خەشمی نەبڕاوەی خوای کرد؟ ئەو بە دڵێکی پڕ لە داخ و مەراق و غەزەبەوەو پێی ئەڵێ: ﴿قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ﴾ ئای کاشکێ بەینی من و تۆ دوور بوایە لە یەك، بە وێنەی دووری رۆژهەڵات لە رۆژئاوا، واتە: هەرگیز یەکترمان نەدیبایە: ﴿فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ﴾ ئای چ عەجەب هاوسەرێکی خراپ بووی.[1]**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون ئەم رستەیە قسەی سەر لێ تێك چووەکە نی یە، بەڵکو ئەوە تەعقیبی قورئانە لەسەر قسەکەی ئەو هەرچۆن بێ هەر یەك ئەگرێتەوە.

وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ أَوۡ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذۡهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنۡهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوۡ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي وَعَدۡنَٰهُمۡ فَإِنَّا عَلَيۡهِم مُّقۡتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾

---

**ئینجا ئەگوترێ بە هەردوو تاقم: سەر لێ تێك چوو شەیتانەکان: ﴿ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ﴾ هاوبەشی و کۆبوونەوەی هەموتان لەئاگرو سزادا هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ ئەمڕۆ، کاتێ کە ئێوە لە دنیادا زوڵمتان کرد لە نەفسی خۆتان لە رێگەی خوا لاتان دا، واتە ئەم سزا سەختەی کە ئێوەی تێدایە وەکو کاروفەرمانێکی قورس و گران نی یە کە بە کۆمەکی و یارمەتی دان سووك ببێ، گرانی و قورسیەکەی بەش بەش ببێ بەسەر هەمووان دا، بەڵکو هەموو یەکێ لە ئێوە سزای سەختی خۆی ئەچەژێ، بەهیچ کەسێکی تر رادەو پلەی نزم و سووکتر ناکرێتەوە، خوا پەنامان بدات بە رەحم و بەزەیی خۆی. آمین، آمین.**

**ئینجا لێرەدا کۆتایی ئەهێنێ لەباسی ئەو دوو کۆمەڵە چارە ڕەشە بەد بەختانە، با لەناو ئاگردا بکەون و شەڕە جوێن بکەن بە دەم ناڵەو نکەی سزاوە، باسی ئەوانە لێرەدا ئەبڕێتەوەو کۆتایی پێ ئەهێنێ، رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆشی ئەداتەوەو دڵنەوایی ئەکات لەسەر پشت تێ کردنی ئەو کۆمەڵە لەو ئایینە حەقە راستەی کە هێناویەتی، ئیمان نەهێنانیان پێی، فەرمان ئەدات بەمەی کە بەردەوام بێت لەسەر دامەزراوی خۆی لەسەر ئەو حەقەی کە سروشی کراوەتە لا، ئەفەرموێ: ﴿أَفَأَنتَ تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ أَوۡ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ ئایا کەسێ کە کەڕ بێت و هیچ نەبیستێ، تۆ شتی پێ ئەبیستی؟! یان ئەو کەسەی کە کوێربێت و هیچ نەبینێ تۆ شتی پێ ئەبینی؟!!**

**ئەو کەسەی وا لەناو گومڕایی یەکی روون و ئاشکرادا، تۆ ئەو کەسە ئەخەیتە سەر رێگای راست؟! واتە ئەمانە وەکو کەڕو کوێر وان بانگ کردنی تۆ بۆ رێگای حەق نابیستن و**

بەڵگەو نیشانە روونەکان کە نیشانیان ئەدەیت نایبینن، ئەو جۆرە شتانە وەزیفەو فرمانی تۆ نی یەو داوا لە تۆ ناکرێ، چونکە لە توانای تۆدا نین. ئەم مەبەستە زۆرجار لە قورئان دا ئەگوترێتەوە بۆ دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ روون کردنەوەی ئەوە کە پێك هێنانی ئەو جۆرە شتانە تەنها بە دەست خوایەو داوا لە پێغەمبەر(ﷺ) ناکرێ. هەروەها بۆ دیاریی کردنی سنوور بۆ دەسەڵاتی ئادەمیزاد بۆ ئەمەی باوەڕی هیچ کەس لەو سنوورە تێ نەپەڕێ: دەسەڵاتی کەسێکی تر بەرزبکاتەوە بۆ سنووری دەسەڵات و توانای خوا، ئەو کاتە باوەڕ بە تاك وتەنیایی خوا نامێنێ، خاوەنی ئەوباوەڕەئەبێ بەبت پەرست و هاوبەش رەوا دەر بۆخوا.

زۆر پێویستە بیر لەمە بکرێتەوە لە جێیە پێغەمبەرمان(ﷺ) کە بەرزترین دروست کراوی خوایە ناتوانێ هیچ کەس بخاتە سەر رێگە کە هەر بۆ ئەوەیش رەوانە کراوە لەو بابەتەوە هەوڵ تەقالا بدات، کەچی هیچی پێ نەکرێ و هیچی بەدەست نەبێ، جگە لە بانگ کردن و رێگە پیشاندان، ئیتر ئەبێ باسی کێ ی تر بکرێت؟! وەزیفەو فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بریتی بووە لە راگەیاندنی ئەوەی سروش کراوەتە لای وەکو لە چەند شوێنێك دا قورئان ئەیفەرموێتەوە، ئیتردوای ئەوەهەمووکاروبارێك بە دەست خوایەو هیچی بە دەست ئەو نییە.

لەم ئایەتە پێشووەدا روون بووەوە کە کۆمەڵێ لە بێ بڕواکان لەسەر گومڕایی خۆیان ئەمێننەوە، ئەوا دڵخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) ئەداتەوە، ئەوانیش ئەترسێنێ بەم فەرمودە: ﴿فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ * أَوْ نُرِيَنَّكَ الَّذِي وَعَدْنَاهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ﴾ ئەبێ تۆڵە لەوانە بسێنن و رزگار بوونیان نی یە، ئیتر لەپاش مردنی تۆ ئەی پێغەمبەر، یاخود لە کاتی ژیانت دا، ئینجا ئەگەر تۆمان مراند پێش ئەوەی تۆڵەیان لێ بسێنین، ئەوە بێگومان پاش تۆ تۆڵەیان لێ ئەسێنین، یا ئەگەر تۆمان هێشتەوە تا ئەو هەڕەشەی لێمان کردوون بەدی ئەهێنین و پیشانت ئەدەین، ئەوەیش هەرئەگونجێ، چونکەبێگومان ئێمە دەسەڵاتمان هەیە بەسەریاندا.

خوای گەورە یەکێ لەم دوو بارەی دیاری نەکرد لە بەڵێنەکەی دا، بەڵام باری دووەمی بەجێ هێنا، ئەو کۆمەڵە بەدبەختەی بە ریسوایی بەرباد کرد، بت و بت پەرستی لەو دەورو بەرەدا نەما و ئایینی خوا جێگیربوو لە شوێنی دا لە ماوەی ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ)،

فَٱسۡتَمۡسِكۡ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ إِلَيۡكَۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ﴿٤٥﴾

**ئینجا پاش دڵخۆشی دانەوەو دڵنیا کردنی ئەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَمۡسِكۡ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ إِلَيۡكَۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ ئینجا بەردەوام بە لەسەر دەست گرتن بەو قورئانەی هێنراوەتە خوارەوەو سروش کراوە بۆلای تۆ، چونکە بێگومان تۆ لەسەر ڕێگەیەکی راستی، واتە ئەو قورئانە حەق و ڕێنموونی بۆ هەرچی ئەکات هەر ئەوە حەقەو خەڵك ئەبا بە ڕێگایەکی راست دا تا ئەیبا بۆ ناو بەهەشتانی نازو نیعمەت و خێری هەموو کاتی نەبڕاوە، ئەم عەقیدەو شەریعەتەی کە ئەم قورئانە هێنای بەستراوە بە حەقیقەتی بوونەوەری گەورەوە، بە گوێرەی ئەو ئیرادەو خواهیشەیە کە کاروباری هەموو بوونەوەر ئەبا بەڕێوە، کەواتە ئەم عەقیدە خاوەنەکەی ئەبات بۆلای پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەبەرێکی بە جۆرێ مەترسی ناکرێ لە لادان و لە ون بوون.**

**خوای گەورە بەم فەرمودەیە پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیا و پڕ لە ئارام ئەکات، هەروەها ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون و پاش ئەو بانگەوازەکەی ئەویان بڵاو کردووەتەوەو بڵاوی ئەکەنەوە بە گوێرەی ئەو بەرنامەی ئەو بەجێی هێشتووە بۆ هەموو هەتا هەتایە. ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ﴾ بێگومان ئەوەی سروش کراوە بۆ لای تۆ هۆی شەرەف و ناوبانگی بەرزە بۆ تۆیش و بۆ قەومەکەیشت لەمەو پاش – واتە ڕۆژی دوایی – پرسیارتان لێ ئەکرێ دەربارەی ئەوەی کەچۆن هەڵسان بەومافەگەورەی قورئانەبەسەرتانەوە،لەبەجێ هێنانی مەبەستەکانی[1].**

**ئەمەی ئەم قورئانە هۆی شەرەف و ناوبانگی بەرزە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەتا تا ئێستا کە ماوەی زیاد لە هەزارو چوارسەد ساڵە بە سۆزی دڵەوە باس ئەکرێ و سەڵات و سەلامی لەسەر ئەدرێ و شایەتی بەشانی ئەهێنرێ، ئێستایش و لەمەو پاشیش هەتا دنیا دنیایە بە**

---

[1] ئەمەی کە گوترا رای کۆڕی زانایانی تەفسیرە، لە ئیبن و عەباسەوەو لە گەلێ تابعینەوە وەرگیراوە تەنانەت(ئیبن و جەریر) ئەفەرموێ: جگە لەمە وەرنەگیراوە لە هەندێ تەفسیردا هەیە کە مەبەست بە وشەی ﴿ذکر﴾ ئامۆژگاری و بیرخستنەوەیە، بەلام لەسەر ئەم رایە تایبەتی نی یە بە پێغەمبەرو نەتەوەکەیەوە، بەڵکو بۆ هەموو جیهانە وەکو لە چەند ئایەت دا فەرمویەتی.

چەند سەدەها ملیۆن ئادەمیزاد شەووڕۆژ لە یادی ئەودا ئەژی، بەڵام قەومەکەی ئەوە شتێکە ناشارێتەوە کاتێ کە ئەم قورئانە هاتە سەریان هیچ دەنگ و باسێکیان نەبوو لە جیهان دا، هەست نەئەکرا کە هەن، ئەگەر هەستیش بکرایە بە بوونیان هیچ وەزن و نرخێکیان نەبوو لە جیهان و لە ژیان دا.

لەپێش هاتنی ئەم قورئانەدا ئا بەو جۆرە بوون، دوای هاتنی ئەم قورئانەو جێگیر بوونی لەناویان دا، بەم قورئانە و بەرەنگاری دنیا وەستانی، هەموو دنیا ناسینی، بوون بە مامۆستای هەموو، هەموو دنیا گەردنی بۆ کەچ کردن تا دەستیان گرت بەو قورئانەوە. بەڵام کاتێ دەستیان لێ بەردا ناوبانگیان نەما، بە چاوی ریسوایی تەماشا کران، پێشێل کران، پێشێل و ژێر پێ کران، مافیان داگیر کرا، بە جۆرێ جوولەکە کە ژێر دەستەی هەموو جیهان بوو لە ناوجەرگەی خاکیان دا دەوڵەتی دروست کرد، ئێستا بە دوو سەد ملیۆنەوە داماون بە دەستیەوە...!! بۆ دنیا ئەوەیان بەسەرهات، بۆ رۆژی دواییش ئەوە خوای گەورە بڕیاری داوە کە پرسیاریان لێ ئەکات دەربارەی، ئیتر بۆ ئەوە ئەکەونە خۆیان و بازاڕی خوا، ئینجا ئەیخاتە پێش چاو کە ئەوەی ئەم قورئانە هێناویەتی شتێکی تازەکێ نی یە، بەڵکو هەر بۆ ئەم مەبەستە بنەڕەتی یەی قورئانە رەوانە کراون – کە بریتی یە لە پەرستن و گوێ رایەڵی خوا بە تاك و تەنیا – ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ﴾ پرسیار بکە لەو پێغەمبەرانەمان کە رەوانەمان کردوون لە پێش تۆوە ئایا جگە لە خوای خاوەن رەحم و بەزەیی هیچ خواو پەرستراوانی ترمان بڕیار داوە. واتە رێگەمان داوە کە جگە لە خوا هیچ شتی تر بپەرسترێ؟ ئاشکرایە وەڵامی ئەم پرسیارە یەك وەڵامە لە لایەن هەمووەوە کە: نەخێر جگە لەخوای تاك و تەنیا بە هیچ جۆر رێگەی نەداوە بە پەرستنی هیچ کەس و هیچ شتێکی تر.

ئەو بت پەرستانە رەخنەی بەهێزیان ئەوە بوو کە ئەمەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی ئایینێکی تازەیە تەنها ئەم ئەیڵێ، ئەوا خوای گەورەیش روونی ئەکاتەوە کە هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – سەرجەم بڕیاریان لەسەریەتی، ئەمەی محمد ئەیڵێت هەر لە یەکەم جارەوە وا هاتووەو خوا هەر ئەوەیشی ئەوێ.

هەندێ ئەفەرمون مەبەست پرسیار نی یە لە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – بەڵکو مەبەست پرسیارە لە زاناکانی ئوممەتەکان، بەڵام پێویست نی یە لەم دیمەن و زاهیرە لادەن، بە تایبەتی کە جگە لە یەهودو نەسارا هیچ ئوممەتێ تر لەو کاتەدا دەست نەکەوتووە تا پرس بکرێ لە زاناکانیان بۆ ئەو مەبەستە. ئەگەر دەستیش کەوتبێ کۆمەڵێکە خۆی بە ئوممەتی یەکێ لە پێغەمبەرانی پێشوو دانابێ پەڕاوێکیان بە دەستەوە نەبوو، هەموو بوو بوون بە بت پەرست وەکو قورەیش کە خۆیان بە شوێن کەوتووی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل دائەنا، کەواتە هەر بە گوێرەی زاهیرەکە بێ چاکەو پرسیار کردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو برا پێغەمبەرەکانی – سەلامی خوایان لێ بێت – جێگەی سەر سوڕمان نی یە، هەرچەند بە گوێرەی باوو ئولفەتی ئێمە ناگونجێ، لەبەر دووری و جیاوازی چەرخ و شوێن و وڵاتیان، هەروەها کۆچ کردنی ئەوان لەم جیهانەدا، بەڵام بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و براکانی – سەلامی خوایان لێ بێت – لەگەڵ خۆیان دا کاری جۆرێکی ترە جگە لەوەی کە ئێمە ئەیزانین، چونکە لای خوا دواو بەرو رۆیشتوو و رابردوو، پەیدا بوو، دوورو نزیك نی یە. بەڵکو هەموو شت پێکەوە لای خوا بێ پەردەو بەرگری کات و شوێن، جا بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە ئەو حەقیقەتە پیشانی پێغەمبەران بدات – سەلامی خوایان لێ بێت – جا لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) پرسیار ئەکات و وەڵامیش ئەدرێتەوە وەکو لە شەوی میعراج دا رووی داو فەراهەم هات بۆی، ئەوە بوو یەکی گرت لەگەڵ هەمووان داو گەیشت پێ یان.

لەم کاتەدا دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات لەسەر ئەو رەخنە ناڕەواو بێ جێگەی کە سەرۆکەکانی قورەیش ئەیانگرت لە پێغەمبەرێتی یەکەی، بەو جۆرەی کە باس کراو بەرپەرچ درایەوە، لەم کاتەدا زنجیرەیەك لەسەر گوزەشتەی حەزرەتی موسا(ﷺ) ئەگێڕێتەوە، کە وێنەی ئەو رەخنە لەویش گیراوە، فیرعەون و کۆمەڵەکەی کەشخەو شانازییان ئەکرد بەو ماڵ و سامانی زۆرەوەو فیزیان ئەکرد بەسەر حەزرەتی موسادا، بە وێنەی سەرۆکەکانی قورەیش، ئینجا لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزە بەهێزە زۆرەدا کوڕو جەماوەر شوێنی فیرعەون کەوتن،لەگێڕانەوەی ئەم زنجیرەیەدادەرئەکەوێ کەپێغەمبەرایەتی هەریەك مەبەستەوبەرنامەی هەموو پێغەمبەرانیش هەریەکەو هەر رێگایەکە، وەکو روون ئەبێتەوە کە تەبیعەتی سەرۆك وسەرکێشەکان یەکەوبەیەك رەوشت و وێنە بەربەرەکانێی پێغەمبەران و ئایینی خوا کراوە.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ * فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ﴾ **بە تحقیق موسامان رەوانە کرد بۆلای فیرعەون و کۆمەڵەکەی بە چەند موعجیزەیەکی خۆمانەوە. ئینجا موسایش وتی پێ یان بێگومان من پێغەمبەری خوایەکم کە پەروەردگاری هەموو عالەمە، ئینجا کاتێ موعجیزەکانی ئێمەی بۆ بردن و نیشانی دان – لەبەر نەفامیان – کتوپڕ بێ بیر لێ کردنەوە پێ ئەکەنین بەو موعجیزەو رابەرە روونانە وەکو هەموو سەرکێشە لوت بەرزەکانی تر.** ﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا﴾ **هەر موعجیزەیەکمان پیشان ئەدان گەورەتر بوو لەوەی تر واتە هەموو یەکێ لەو موعجیزانە رادەی هێزی ئەوەندە بەرز بوو هەرکام ببینرایە بە گەورەتر سەیر ئەکراو تەماشا ئەکرا، کەواتە مەبەست ئەوەیە کە هەموو گەورە بوون وەکو شاعیر ئەڵێ:**

**من تلق منهم فقل لاقيت سيدهم      مثل النجوم التي يسري بها الساري**

**یان مەبەست ئەوەیە هەریەکێکیان لە بارێکەوە نایاب تر بوو، زیادەی هەبوو لەو رووەوە بەسەر ئەوانی تردا،** ﴿وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ **فەرمان لێ گرتن بە غەزاب و سزادان، وەکو قاتی، گرانی، لافاو، چەند شتی تر.. کە لە سورەتی ﴿الأعراف﴾ دا باسی فەرمووە.. بەڵکو بگەڕێنەوە، لەگەڵ ئەوەدا نەگەڕانەوە، هەر سزاو عەزابێکیان بهاتایەتە سەر هاواریان لێ هەڵئەسا** ﴿وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ﴾ **ئەیان وت بە حەزرەتی موسا: ئەی جادوباز داوا بکە لە پەروەردگارت بەڵکو ئەم عەزابەمان لەسەر لابدات، چونکە بێگومان ئێمە ئیمان ئەهێنین و ئەکەوینە سەر رێگەی خوا.**

فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ

---

**ئەوانە وەکو بیٚ بار بوون، نەفام و نەزان و دوو روو بوون، چونکە لە لایەکەوە بەڵیٚنی ئیمانیان ئەدا، دانیان ئەنا بەوەی کە خوا پەیامی پیٚ سپاردووە، لەو تەنگاوەدا ئومیٚدیان تەنها ئەو بوو، کەچی ئەیانگوت: ئەی سیحرباز، ئیتر با سیحربازیان بە زانا دانابیٚ هەر ناڕیٚکە، ئەیانگوت پەروەردگارت وەکو تایبەتی بیٚ تەنها بە ئەوەوە، ئا بەو جۆرە پەنایان ئەهیٚناو پەیمانی ئیمانیان ئەدا کەچی** ﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ﴾ **کاتیٚ کە سزاکەمان لەسەر لائەبردن کتوپڕ پەیمانەکەیان هەڵئەوەشاندەوەو پەشیمان ئەبوونەوە. بیٚگومان کۆڕو جەماوەر بە موعجیزەو خەواریق ئەگیرێن. بەهۆی ئەوەوە فیرعەون مەترسی پەیدا کرد کە ئیمان بهیٚنن، لەبەر ئەوە کەوتە هەوڵ دان بۆ بەرگری یان بەمەی کە زۆرو سەڵتەنەتی خۆی بخاتە پیٚش چاویان، دڵیان خەریك بکات بەوەوە، بیم و ترسیٚ کە بوویان لیٚ ی یان لەدڵیان دەرنەچیٚ، هەروەها بە رەخنە گرتن لە حەزرەتی موسا(علیه السلام) وەکو ئەفەرمویٚ:** ﴿وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾ **فیرعەون جاڕی دا لەناو گەلەکەیداو وتی: گەلەکەم، ئایا پادشایەتی و سەڵتەنەتی میسر هینی من نی یە، هەروەها ئەم هەموو رووبارانە کەوان لەژیٚر فەرمانی من داو بە ئارەزووی من ئەگەڕیٚن؟ ئایا نابینن. واتە بەڵیٚ ئەزانن، کەواتە من شایانم بە گویٚ رایەڵی نەك موسا.** ﴿أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ﴾ **لەو قسەیە گەڕیٚ ئایا من باشترم لە ئەمەی کە سووك و ریسواو بیٚ دەسەڵاتە؟ واتە پادشاو سەرۆك نی یە، ماڵ و سامانی نی یە، یان لە تائیفەی بەنی ئیسرائیلە کە زەلیل و بەندە بوون بۆ فیرعەون.**

وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ

**﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ لەوانە نی یە بتوانێ قسە بە باشی بکات، مەبەستی خۆی روون بکاتەوە، واتە بۆ پێغەمبەرێتی دەست نادات، چونکە بەو جۆرە عەیب دارە، لە بابەت ئەم دووەمەوە ئەیویست هەر لەکەداری بکات لەناو خەڵك دا، بەو وەستان و گیرو گرفتەی کە هەبوو لە زمانیدا پێش ئەوەی بکرێ بە پێغەمبەرو ئەیویست پرووپاگەندەی لێ بکات. ئەگەر نا دوای ئەوەی کرا بە پێغەمبەر، ئەو ناتەواوی یە لە زمانیدا نەما، چونکە وەکو لە سورەتی ﴿طه﴾ دا باسی فەرموو حەزرەتی موسا(علیه السلام) نزای کردەوە لای خوا بۆ چەند شتێك، یەکێ لەو شتانە ئەو وەستان و گیروگرفتە بوو لە زمانیدا، خوایش نزاکەی وەرگرت و هەمووی بۆ جێ بەجێ کرد.**

**لەو چەرخەدا باو بووە هەرکەس بکرایە بە گەورە بازن و بازو بەندی ئاڵتوون ئەکرایە دەستی و قۆڵی ئەڕازێنرایەوە بە خشڵ و زێوەر ئەوە نیشانەی گەورەیی بوو، جا لەم بارەیشەوە رەخنەی ئەگرت، ئەیگوت: ﴿فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ﴾ ئەگەر موسا راست ئەکات دەی با نیشانەی گەورەیی و سەڵتەنەتی ببوایە، بەم جۆرە بازن و بازوبەندی ئاڵتوونی بکرایەتە دەست و قۆڵی، تەوق ئاڵتوون بکرایەتە مل و گەردنی، واتە کە ئەم نیشانەیە نی یە ئەبێ راست نەکات. رەخنەیەکی تری ئەمە بوو ئەیگوت ﴿أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ یان ئەگەر راست ئەکات با کۆمەڵێ مەلائیکەی لەگەڵ دا بهاتایە بە هاوڕێ و هاوسەری کۆمەکی و یارمەتییان بدایە، تەسدیقیان بکردایە، شایەتییان بۆ بدایە کە لە لایەن خواوە کراوە بە پێغەمبەر. ئەم رەخنەیە لە پێغەمبەری تریش گیراوە، بە دیمەن رەخنەیەکی بەهێزە، دڵی خەڵکی پێ داگیر ئەکرێ، ئەوانەی کە نەزانن.**

**ئا بە جۆرە فیرعەون هەوڵی دا بۆ بەرگری کردنی گەلەکەی لە ئیمان هێنان بە حەزرەتی موسا(علیه السلام) وشوێن کەوتنی ئەوئایینەحەقەی کە هێنای بۆیان، هەوڵی خەڵەتاندنیدان ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ﴾ ئینجا گەلەکەی خۆی دەست کەوت بە کەم سەلیقەو سووك و کەم عەقڵی،**

فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴿٥٦﴾

---

لەبەر ئەوە بە قسەکانی هەڵخەڵەتان ﴿فَأَطَاعُوهُ﴾ بە هۆی ئەوەوە گوێ رایەڵی بوون و ئیمانیان ئەهێنا بە حەزرەتی موسا(علیه السلام).

فریودان و خەڵەتاندنی کۆڕو جەماوەر لە لایەن سەرکێشانەوە هیچ شتێکی عەجایب نی یە، چونکە باویان وایە ژێر دەستەو داگیر کراوەکانیان دوور ئەخەنەوە لە زانین و خوێندەواری، ئەیکەن بە چاوبڕاوێکی وا لێیان کە تێفکرانیان نەمێنێ بۆ ئەمەی کە هەر ژێر دەستە بن، بەڵام وەنەبێ هەموو کەسێکیان پێ بخەڵەتێ، ئەو کەسانەی کە ئیماندارن هەر وا بە ئاسانی فریو نادرێن، ئەوەی کە بە ئاسانی ئەخەڵەتێ، بە چ بارێك دا زۆردارەکە بیەوێ با ئەخوات وەکو پەڕە مریشك بەدەم باوە، ئەمانە ئەو بێ ئیمانانەن کە لە سنوور دەرچوون بۆیە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ﴾ گەلەکەی فیرعەون گوێ رایەڵی فیرعەونیان کرد چونکە بێگومان گەلێك بوون، کافرو بێ ئیمان بوون، لە سنووری خوا دەرچوو بوون، واتە فاسق بوون، بۆیە شوێن ئەو فاسقە کەوتن.

پاش ئەمەی رێنموونی کران و چەند بەڵایان درا بەسەردا لەگەڵ ئەوەدا سوودی نەبوو، هەر شوێن فیرعەون کەوتن، ئیتر نۆبەی سزادان و تۆڵە لێ سەندنە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ * فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ﴾ ئینجا کاتێ کە رق و قینی بەتینیان هەڵساندین بە زیادە رەوی کردنیان لە سەرکێشی و عینادددا، ئێمەش تۆڵەمان لێ سەندن، بەم جۆرە هەموویانمان خنکاند لە دەریادا، کردمانن بە پێشەواو بە پێشڕەو بۆ هەموو کافرێ کە پەیڕەوی ئەوانن، کردمانن بە دەنگ و باس و سەرگوزەشتەی ناياب بۆ گەلەکانی دوای خۆیان، یان بە عیبرەت و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای خۆیان، ئا بەم جۆرە ئەم زنجیرەیە لە بەسەرهاتی حەزرەتی موسا دوایی هات، ئەم زنجیرەی کە زۆر وێنەیەکی رێکە بۆ قسەو باسی قورەیش، هەڵوێستیان بەرامبەری پێغەمبەرو ئایینەکەی(ص) کەواتە پێغەمبەرو یارەکانی دڵنیاو دڵ ئارام ئەکات، وەکو بت پەرستە رەخنەگرەکانیش ئەترسێنێ بە سزاو پاشەڕۆژێکی سەخت، وێنەی ئەو سزاو پاشەڕۆژەی کە بۆ پێشەوا فیرعەونیان بوو لەگەڵ گەلەکەیدا.

ئینجا ئەگوازێتەوە بۆ زنجیرەیەك لە باس و هەواڵی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) بە بۆنەی موجادەلەو دەمبازی بت پەرستەكان لە بابەت پەرستنیان بۆ مەلائیكەو پەرستنی ئەهلی كیتاب بۆ حەزرەتی عیسا(علیه السلام).

لەم باسەدا حەقیقەتی حەزرەتی عیسا و ئەو ئایینەی كە هێنای باس ئەفەرموێ، هەڕەشە ئەكات لەوانەی كە لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە، بە هاتنی ڕۆژی دوایی، بەو بۆنەوە بە درێژیی شێوەیەك لە شێوە سەختەكانی ڕۆژی دوایی باس ئەكات. ئینجا بە بۆنەی خراپانەوە باسی نازو نیعمەتی چاكان ئەكات.

ئیبن و ئیسحاق ئەڵێ: جارێ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ وەلیدی كوڕی موغیرەدا دائەنیشێ لە مزگەوتی حەرام دا، ئینجا نەضری كوڕی حارث دێت لایان دائەنیشێ، چەند پیاوێكی تر لە قورەیش حازر ئەبن، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەست ئەكات بە ئامۆژگاری و بانگ كردنیان بۆ ئیسلام، نەضر دەست ئەكات بە چەلان بەرچەلانی لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) پەكی ئەخات و بێ دەنگی ئەكات، ئەم ئایەتەی بەسەردا ئەخوێنێتەوە: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾ (الأنبياء /٩٨). ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لەو مەجلیسە هەڵئەسێ لەپاش ئەو عبدالله ی كوڕی زەبەعرا دێت، وەلید پێی ئەڵێ: وەللاهی نەضری كوڕی حارث هیچ خۆی پێ نەگیرا لە ئاستی محمد و محمد وتی بە ئێمەو هەموو پەرستراوەكانمان كە هەموو ئەبین بە چڵۆسكی دۆزەخ، ئینجا كوڕی زەبەعرا ئەڵێ: وەللاهی ئەگەر من محمدم دەست كەوێ پەكی ئەخەم، ئیلزامی ئەكەم، چونكە ئێمە مەلائیكە ئەپەرستین. جوولەكە عوزەیر ئەپەرستن، نەسارا عیسا ئەپەرستن، ئەگەر ئەوانە لە ئاگردا بن ئەوا ئێمەیش ڕازین بە خۆمان و بتەكانمانەوە لەگەڵ ئەوان بین. كاتێ ئەمەی گوت وەلید و دانیشتووەكان زۆر كەیف خۆش بوو، زۆر بە ڕەخنەیەكی بەهێزیان دائەنا، ئینجا ئەم دەنگ و باسەیان باس كرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ئەفەرموێ: ﴿كل من احب ان یعبد من دون الله فهو مع من عبده، فإنهم إنما یعبدون الشیطان و من امرهم بعبادته﴾ [1] ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾ دەربارەی ئەو ڕەخنەی زەبەعراو كەیف خۆشی و پێكەنینی وەلید و ئەو كۆمەڵە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

---

[1] هەركەس پێی خۆش بێت بپەرسترێ بێجگە لە خوا، ئەو كەسە لەگەڵ ئەو كەسەیە كە ئەیپەرستێ، واتە وان لە ئاگردا، چونكە ئەوانە لە ڕاستی دا شەیتان ئەپەرستن.

﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾﴾

---

**﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ﴾ وێنەی ئەم ریوایەتی ئیبن و ئیسحاق و زەمەخشەریش لە پەڕاوی ﴿کشاف﴾ دا باسی کردووە، بیێ ئەمەی وتبێتی لە کێوە وەریگرتبێ، کەواتە با بە گوێرەی ئەم دوو ریوایەتە ئایەتەکە بێنین و تەفسیری بکەین، ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ * وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ گوتت بە گەلەکەت: ئێوەو هەموو پەرستراوەکانتان جگە لەخوا ئەبن بە چڵۆسکی دۆزەخ، ئینجا گوترا هەندێ لە نەسارا عیسا ئەپەرستن، کەواتە ئەویش لە ئاگردایە، جا لە کاتێك دا عیسای کوڕی مەریەم باس کراو هێنرایەوە بە مەتەڵ بۆ رەخنە گرتن لەو قسەی تۆ، دەست بەجێ گەلەکەی تۆ لەخۆشیدا دەستیان کرد بە هۆسەو پێکەنین و سەیحە پێکان. چونکە لایان وابوو کە رەخنەیەکی بەهێزە، ئەیانگوت ئایا لای تۆ پەرستراوەکانی ئێمە باشە یان عیسا، بێگومان بەلاتەوە عیسا باشە، واتە بە قسەی تۆ عیسا کە باشترە بە لاتەوە لە ئاگردایە، کەواتە با ئێمەو بتەکانیشمان لەگەڵ ئەودا بین، ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا﴾ ئەمانە هەر لە یەکەم جارەوە ئەیانزانی مەبەستی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) ئەوان و بتەکانیانە، هەروەها هەرکەسێکی ترەو وەکو ئەوان، نەك مەبەست هەموو پەرستراوێکە بە گشتی تا عیساو وێنەی بگرێتەوە، کەواتە مەبەستیان روون کردنەوەی هەق و بەتاڵ نەبوو، بەڵکو مەبەستیان هەر لاری و عینادو بەربەرەکانێ‌ی رووت بوو وەکو ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ﴾ ئەوانە گەل و خەڵکێکن ئاژاوەچی و زۆر بەتین لەدەم بازییداو ئەیانەوێ هەر لاری و لارە جڵەوی بەکار بێنن، ئینجا حەقیقەتی حەزرەتی عیسا روون ئەکاتەوە،**

إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ عیسا هیچ نی یە جگە لەوەی بەندەیەکە لە بەندەکانمان، بەهرەو چاکەی خۆمانمان رشتووە بەسەری دا، بەمەی کردوومانە بە پێغەمبەرو گێراومانە بە شتێکی نایاب بۆ ئەوەی بەنی ئیسرائیلی بیکەن بە پێشەوا بۆ خۆیان، پەیرەوی بکەن و گوێ رایەڵی بن، واتە نە خوایەو نە کوڕی خوایە، نە پەرستراوێکی بە حەق، پەرستنی ئەو بەندەیە لە لایەن تاقمێ لە بەنی ئیسرائیلی نابێتە بەڵگە چونکە ئەوانە لە خواپەرستی بە تاك و تەنها لایان داوە، بەوێنەی قورەیش کە لە بنەڕەتەوە لەسەر ئایینی پاکی ئیبراهیم بوون لە پاشان لایاندا لەو رێگە راستە، ئەم بت پەرستانەیان لێ دەرچوو.**

**ئینجا وەکو وەڵامی رەخنەو بەڵگەکەی دانەوە بەو بۆنەوە قسە لە باوەڕە پڕوو پووچە ئەفسانەکەیان ئەکات، دەربارەی مەلائیکە، پیشانی ئەدات کە مەلائیکە هەندێکن لە دروست کراوەکانی خوا، وەکو خۆیان و ئەم هەموو دروست کراوەکانی ترە، هیچ کەسێك لە دروست کراوەکانی خوا هیچ پەیوەندی یەکیان بە خواوە نی یە، جگە لە پەیوەندی مەخلوق بە خالیقەوە، پەیوەندی بەندە بە پەروەردگاری یەوە، پەیوەندی عابید بە پەرستراوی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾ ئەگەر بمانویستایەو بمانەوێ لە ئێوە مەلائیکەمان فەراهەم ئەهێنا، یان هەندێ لە ئێوەمان ئەگۆڕی و ئەمان کردن بە مەلائیکە، یان ئێوەمان نەئەهێشت و لە باتی ئێوەدا مەلائیکەمان ئەهێنا جێنشینی ئێوەی بکردایە لە زەوی دا، واتە هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆ ئیرادەو خواهیشی خوا، چۆنی بوێ هەر ئەوە ئەبێ، خواهیشی خوا وابوو کە مەلائیکە دروست بکات بێ باوك و بێ زاووزێ، ئەگەر بیویستایە بە جۆرێکی تر دروستی ئەکردن، ئەوەتا کە ویستی عیسای دروست کرد بێ باوك، کەواتە مەلائیکە شایانی پەرستن نین هەروەکو دروست کراوەکانی تری خوا.**

وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾

---

ئینجا به بۆنەی حەزرەتی عیساوە ڕۆژی دوایی یان بیر ئەخاتەوە، چونکە بەهۆی عیساوە(علیه السلام) ئەزانرێ و باوەڕ بەهێز ئەبێ بە هاتنی ئەو ڕۆژە، کاتێ هاتە خوارەوە هەواڵ ئەدات و خەڵکی ئاگادار ئەکاتەوە بەمەی نزیکە هاتنی ئەو ڕۆژە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ بێگومان عیسا هۆی زانینی هاتنی ڕۆژی دوایی یە، چونکە دروست بوونی بێ باوك، بەڵگەیە لەسەر دەسەڵاتی خوا بەسەر هێنانی ئەو ڕۆژەدا، یان یەکێ لە موعجیزەکانی عیسا زیندوو کردنەوەی مردوو بووە، کەواتە خوای عیسا مردوو زیندوو ئەکاتەوەو ئەو ڕۆژە ئەهێنێ، یان کاتێ لە ئاسمان هاتە خوارەوە خەڵکی ئەزانن کە هاتنی نزیکە، چونکە پێغەمبەرمان(ﷺ) هەواڵی داوە کە هاتنە خوارەوەی یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، کە هاتە خوارەوە هەواڵ ئەدات و خەڵکی ئاگادار ئەکاتەوە بەمەی نزیکە هاتنی.

لەبابەت هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) حەدیسی زۆر هەیە لە پەڕاوە سەحیحە باوەڕ پێکراوەکاندا، یەکێ لەو حەدیسانە ئەم حەدیسەیە کە ئیمامی مالیك و بوخاری و موسلیم و ئەبو داود ریوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿والذي نفسي بيده ليو شكن ان ينزل فيكم ابن مريم حكما مقسطا فيكسر الصليب، و يقتل الخنزير، و يضع الجزية، و يفيض المال حتى لا يقبله أحد، حتى تكون السجدة الواحدة خيرا من الدنيا و ما فيها﴾[1] کەواتە پێویستە لەسەرمان باوەڕمان ببێ بەم هاتنە خوارەوە، هیچ ڕێگەی کەس نی یە لەخۆیەوە قسەی تیا بکات ، چونکە شتێکی غەیبی یە، وەکو ئەو هەموو شتە غەیبی یانە، هەواڵ دەری ڕاستگۆ کە پێغەمبەرە(ﷺ) هەواڵی پێداوین، ئایەتەکەیش ئەیگەیەنێ، ئیتر چۆن خاوەن ئیمان سەری لێ ئەکاتەوە؟ئەو بت پەرستانە دوو دڵ بوون و گومانیان بوو لە هاتنی ڕۆژی دوایی دا، لەبەر ئەوە قورئان

---

[1] واتە سوێند بە کەسێ گیانی منی بەدەستە نزیکە عیسای کوڕی مەریەم بێتە خوارەوە بۆ ناوتان بە حەکەمێکی دادپەروەر، ئەو کاتە خاچ ئەشکێنێ و بەراز ئەکوژێ، نایەڵێ گۆشتی بخۆن، بڕیاری جزیە ئەسڕێتەوە، سامان و دارایی ئەوەندە زۆر ئەبێ کەس نایەوێ، تا وای لێ دێ تەنها سوجدەیەك بۆ خوا چاکتر دەبێ لای مەردومەکان لە جیهان و هەرچی لە جیهان دا هەیە.

بانگیان ئەکات لە لایەن خواوە یان لە زمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆ ئەمەی باوەڕی بەهێزیان ببێ بە هاتنی ئەو ڕۆژە بە بێگومان، ئەوانەی ئەتاران و فێریان ئەکرد لە ڕێنموونی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) قورئان بانگیان ئەکات بۆ گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) چونکە ئەو گوێ ڕایەڵیَ یە ئەیانبات بە ڕێگەیەکی ڕاست دا کە هەرکەسێ پێیدا بڕوات ئەیگەیەنێت بە ئامانج، ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَاتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ کەواتە هیچ گومانتان نەبێ لە ڕۆژی دوایی داو شوێنی ڕێنموونی من بکەون، ئەمەی کە من بانگی ئێوەی بۆ ئەکەم ڕێگەی ڕاستەو ئەوەی پێیدا بڕوات ون نابێ، ئەگات بە مەبەست و ئامانج.

قورئان ئامۆژگارییان ئەکات کە هۆی لادان و فێرارکردنیان شوێن کەوتنی شەیتانە، شوێن کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاست و بەجێ یە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ الشَّيْطَانُ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ با شەیتان بەرگریتان نەکات لە شوێن کەوتنی ڕێنموونی و هیدایەتی خوا، هەرگیز لە گوێی مەکەن، چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە. قورئان کۆتایی ناهێنێ، هەموو جارێ ئادەمی ئامۆژگاری ئەکات و ئاگاداری ئەکاتەوەو بەو دوژمنایەتی و ئەو ئاژاوەی کە ڕوویدا لە نێوان شەیتان و ئادەم دا لە سەرەتای پەیدابوونی ئادەمی یەوە هەتا دنیا دنیایە، جا لە هەموو نەفامێ نەفام تر ئەو کەسەیە کە بزانێ دوژمنێکی هەیە بە تایبەتی کەمەری دوژمنایەتی بۆ بەستووە هەموو کاتێ وا لە کەمین دا بۆی، جاڕی دوژمنایەتی یەکەیشی داوە لەگەڵ ئەمەدا ئەم هیچ خۆی تێ نەگەیەنێ، خۆی ئامادە نەکات هەر هیچ نەبێ بۆ بەرگری و خۆپاراستن لە شەڕو خراپەی ئەو دوژمنەی، ئەم جار زیاد لەوە بکەوێتە شوێنی و بە ڕێبازی ئەودا بڕوات، بێگومان لەم کەسە نەفام تر و بێ سەلیقە تر نی یە لە هیچ وڵاتێك دا.

ئیسلام ئادەمیزادی خەبەردار کردو ڕاگیری کرد لەم شەڕو بەربەرەکانێ نەبڕاوەی نێوانی ئەوو شەیتان دا، بەڵێنی دا پێی بە دەستکەوتێکی نەبڕاوەی کەس نەدیو کاتێ کە زاڵ ببێ بەسەر ئەو دوژمنەیداو هەڕەشەیشی لێ کرد بە نائومێدی و بێ بەشی و سزایەکی سەختی کەس نەدیو کاتێ ژێر کەوێ و سەرشۆڕ ببێ و شوێن ئەو دوژمنەی بکەوێ. کەواتە گەورەترین ئامانج بۆ ئادەمی لەسەر زەوی دا زاڵ بوونیەتی بەسەر ئەو دوژمنەی دا، چونکە زاڵ بوون بەسەر ئەودا زاڵ بوونە بەسەر هەموو شەڕو خراپەو ناڕەوایی یەك دا، ئەو کاتە پایەی خێرو چاکە و پاکی و ڕاستی جێگیر ئەبێ لە زەوی دا، کەواتە لەم جیهانەدا ئەحەوێتەوەو لە ڕۆژی دواییش دا دەستکەوتە کەس نەدیوە نەبڕاوەکەی هەیە.

ئینجا لێرەدا حەقیقەتی عیساو ئەوەی کە هێنای و پێی رەوانە کرا روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾ کاتێ عیسا هات بۆلای گەلەکەی بەو رابەرو موعجیزە ئاشکرایانەوە کە خوای گەورە پێی دابوو، یان بەو شەریعەتە روون و رەوانەوە وتی بە گەلەکەی: بێگومان من هاتووم بۆ سەر ئێوە بە شەریعەت و بەرنامەیەکی راستەوە کە ئێوە رەفتاری پێ بکەن، هەم بۆ ئەمەی روونی بکەمەوە بۆتان هەندێ لەو شتانەی کە ئێوە لەناو خۆتان دا راتان جیاوازو دووبەرەو ئاژاوەتان تێیدا هەیە. ئەوەیش کە بریتی یە لە کاروباری ئایینتان، نەك لە کاروباری دنیایی رووت کە بۆ ئەوە رەوانە کرابوو، لەبەر ئەوە حەدیس ئەفەرموێ: ﴿انتم اعلم بأمور دنياكم﴾[1].

ئەو گەلە بوو بوون بە چەند کۆمەڵ و حیزبێ بە گوێرەی حەدیس لەپاش موسا(علیه السلام) بوو بوون بە ٧١ بەش گرنگ ترین لەو کاتەدا ٤ تائیفە بوون: سەدوقی، فەریسی، سامیری، ئاسی یان ئاسینی.

یەکەمیان: سەدوقی زۆر توندو تیژبوون لە کاروباری عیبادەت دا لەزەت و خۆشی دنیایشیان رەوا ئەدا، بەڵام باوەڕیان بە رۆژی دوایی نەبووە، ئەم تاقمە ئەڵێن لە نەژاددا ئەچنەوە سەر حەزرەتی هارون(علیه السلام).

دووەمیان: فەریسی باوەڕیان بوو بە رۆژی دوایی، بەڵام رەوایی رابواردنیان نەئەدا، بەخۆشی و لەزەتی دنیا، شانازییان ئەکرد، خۆیان بە گەورە دائەنا، لەبەر خوێندەواری و زانینێ کە بوویان.

سێ یەمیان: سامیری تێکەڵ بوون لە جوولەکەو ئاشووری، باوەڕیان تەنها بە ٥ پەڕاوی چەرخی پێشوو بوو، ئیتر باوەڕیان نەبوو بە پەڕاوە رێز گیراوەکانی چەرخی تازە.

چوارەمیان: ئاسینی هەندێ لە ئاداب و فەلسەفە یۆنانی یەکانیان وەرگرتبوو، کەنارگیربوون لە تائیفەکانی تر، زۆر توندییان بەکار ئەهێنا لەسەر خۆیان لە بابەت خۆراك و پۆشاکەوە، لە هۆنینەوەی ئەندامەکانیاندا، لەبەر ئەوە خوای گەورە حەزرەتی عیسای رەوانە کردە سەریان، ئەویش هۆی رەوانە کردنەکەی خۆی بۆ باس کردن.

---

[1] واتە ئێوە زاناو ئاگادارترن بە کاروفرمانی دونیاتان لەمن: ئەویش وەك: کشتوکاڵ و پیشەسازی.... هتد.

﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾

---

**ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە خەشمی، گوێ رایەڵی بکەن لەوەی کە من پێتان رائەگەیەنم لە لایەن خواوە، کە بریتی یە لە ئیمان و باوەڕ بە تاك و تەنیایی خواو پەرستن و گوێ رایەڵی و فەرمان بەرداری تەنها شەریعەت و ئایینی ئەو، وەك لەم فەرمودەیەدا دەری خست: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ﴾ بەراستی و بێگومان خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە تەنها ئەو پەروەردگاری منەو پەروەردگاری ئێوەشە، کەواتە بیپەرستن و گوێ رایەڵی بکەن ﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ چونکە ئەمەیە رێگەی راست. ﴿فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ ئەمەی کە حەزرەتی عیسا فەرموی خولاسەو ناوەڕۆکی هەموو ئەو ئایین و شەریعەتانەیە کە خوای گەورە ناردوویەتیە سەر زەوی، هەر بۆ ئەم مەبەستە هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – رەوانە کراون و هۆی خۆش بەختی و سەعادەتی هەردوو جیهان تەنها پێك هێنانی ئەو مەبەستەیە، هەر شەڕو خراپەو بێ ئارامی یەك لە زەوی دا رووی داوەو روو ئەدا هەمووی بەهۆی لادانە لەو مەبەستە.**

**حەزرەتی عیسا(علیه السلام) بەو جۆرە هات تاك و تەنهایی خوای روون کردەوە، لە نێوان خۆی و خوادا هیچ پەیوەندی یەکی باس نەکرد جگە لە پەیوەندی بەندەیی و پێغەمبەرێتی، بەڵام ئەو گەلە لە پاش خۆی بوون بە چەند حیزب و کۆمەڵێ، لە حەدیس دا هەیە کە بوون بە ٧٢ فیرقە یەکێکیان لەسەر ئایینە پاك و خاوێنەکەی حەزرەتی عیسا مایەوە ئەوانی تر لایانداو ئەو ئایینە پاکەیان شێواندو خۆیان خستە بەر سزای خوا، ئەفەرموێ: ﴿فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ﴾ لە پاشان لەنێوان ئەو گەلەدا چەند حیزب و کۆمەڵێ پەیدا بوو**

لایان دا لەو ئایینە پاکەی عیسا پێغەمبەر بۆی هێناون، جیا بوونەوە لەوانەی لەسەر ڕێگەی ڕاست بوون، هەر حیزبێ بیروباوەڕێکی بۆ خۆی داهێنا، خوای گەورەیش دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمٍ أَلِيمٍ﴾ بەهۆی ئەو دووبەرەکی و لادانەیان بە هیلاك دا چوون بۆ ئەوە حیزبانە کە زوڵمیان لە خۆیان کرد، لە ڕێگەی خوا لایاندا، مردن بۆ ئەوانە لەبەر سزای سەختی ڕۆژێ ئێش و ئازار دارە یان سزای بەتین لە سزای ئەو ڕۆژە بۆ ئەو حیزبانە کە لایانداوە لەڕێگەی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەیان نەگرت. بت پەرستەکانی عەرەب دەمە دەمەیان ئەکرد و ڕەخنەیان ئەگرت لە پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێرەی باوەڕو عەقیدەی ئەو حیزبانە کە لایان دابوو لە ئایینی خوا، خوایش بەم جۆرە هەڕەشەی لێ کردن، کەواتە ڕەخنە و دەم بازیی یەکەیان لەبەر نەفامی و نەزانی بوو، هیچ نرخی نەبوو.

ئینجا ئەو زاڵمانەی پاش حەزرەتی عیسا(علیه السلام) لەگەڵ زاڵمەکانی چەرخی پێغەمبەر(ﷺ) تێکەڵ ئەکات، ئینجا تۆزێ بە درێژیی شێوەو حاڵەت و بەسەرهاتێکی سەختی ڕۆژی دوایی یان پیشان ئەدات، لەگەڵ هەندێ لە نازو ڕێزو نیعمەتی لە خواترسەکان یەکەم جار باسی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەکات کە دێت لەناکاودا بە کتوپڕی، ئەفەرموێ: ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ ئایا ئەو زاڵمانە چاوەڕوانی ئەکەن و بە تەمای هیچی تر هەن، جگە لەوەی کە ڕۆژی دوایی بێت بەسەریان دا لە ناکاوو بە کتوپڕی، بێ دروشم و نیشانەی هۆی پەیدا بوونی، کە لە کاتێك دا ئەیشیەت ئەوان هیچ هەستێ ناکەن بە هاتنەکەی، هاتنی ئەو ڕۆژە کردنەوەی قاپی سزای کەس نەدیوی نەبڕاوەی ئەوانە، واتە ئەمانە هەر ئەبێ بە تەمای ئەوە بن و چاوەڕوانی ئەوە بکەن، زۆر نەفامییە بە تەمای جگە لەوە بن.

ئەوانەو وێنەیان هەرچەندە باوەڕو ئیمانیان بەو ڕۆژە نەبووەو نی یە بەڵام لەبەر ئەوەی هەموویان هۆی ئەو سزایەیان تیادا هەیە، بە تەواوی شایان و موستەحەقی ئەوەن، ئەو سزایەش دێتەجێ، کەواتە وەکو چاوەڕوان بن وایە. هاتنی ئەو ڕۆژە گۆڕان و ئینقلابێکە بەسەر هەموو شتێك دا کە ئولفەتی پێوە گیراوە لەم ژیانی دنیادا،

ﭐلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴿٧٠﴾

**تەنانەت ئەو خۆشەویستی یەی کە لەم دنیادا بووە لە نێوان خەڵك دا – جگە لە خواترسەکان – ئەگۆڕێ بە دوژمنایەتی وەکو ئەفەرموێ: ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ لەم رۆژەدا هەموو دۆست و خۆشەویستەکان ئەبن بە دوژمنی یەکتر، جگە لە خوا ترسەکان کە لە دنیادا یەکتریان خۆش ویستووە، ئەمان خۆشەویستی یەکەیان بەهێزتر ئەبێ، چونکە ئەو دۆستایەتی و خۆشەویستی یەی دنیایان لەبەر خوار بووە، لەبەر ئەو ئاین و عەقیدە بوو کە لەو رۆژەدا هۆی رزگاریانە لە سزای سەختی ئەو رۆژەو شاد بوونیان بە نازو نیعمەتی کەس نەدیوی نەبڕاوە، بەڵام جگە لەم کۆمەڵە بەختیارە هەر خۆشەویستی یەکیان بووبێ لەبەر ئەو بیرو باوەڕو کردەوە بوو کە سەری لەو رۆژە سەختەو سزایەو غەزەبی نەبڕاوەی خواوە دەرکردن، کەواتە ئەبن بە دوژمنی یەکتر، یەکتر تاوانبار ئەکەن و تانەو تەشەر لە یەکتری ئەدەن و دەمە دەمێ و شەڕە جنێو ئەکەن.**

**لەم کاتەدا کە زاڵمەکان بەو جۆرە وان لە سزادا، لە خوا ترسەکان لە خوای خاوەن رەحم و بەزەیی یەوە ئەم مژدانە وەرئەگرن: ﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ * ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴾ خوا ئەفەرموێ: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ هیچ مەترسی یەکتان لەسەر نی یە، دڵ غەمگین نابن، ئەو مژدە پێدراوانە کەسانێکی ئەوتۆن کە ئیمانیان هێناوە بە ئایەتەکانی ئێمە، لە کاتێك دا کە ئایینەکەیان پاك و خاوێن کردەوە بۆ ئێمە، گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە دوای ئەو مژە موژدەی بەرزترو خۆشتر ئەمەیە: ئەفەرموێ: ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴾ خۆتان و حەڵاڵ و هاوسەرانتان بچنە بەهەشتەوە بە جۆرێك کەیف خۆش ئەکرێن، تا رادەیەك بەناوچاوان و ئەندامتانەوە دەرئەکەوێ، بە وێنەی ئەوە کە ئەڵێن: فلان وەکو گوڵ گەش بووەتەوە، ناوچاوی لە خۆشیدا بریقە ئەداتەوە، یان لە خۆشی دا هەموو لەشی پێ ئەکەنێ.**

يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنۡهُمۡ وَهُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾

---

﴿يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ﴾ **چەرخە ئەكرێت بەسەریان دا بە چەند تەبەق و سینی لە ئاڵتوون و پیاڵەو پەرداخی پڕ لە خواردنەوەو خواردەمەنی، کە نازانرێ کام لە کام جوانترو خۆشترو بۆن خۆشترە، زیاد لەوە لەو بەهەشتەدا هەیە ئەوەی نەفس و دەروون ئارەزووی بکات و چاوخۆشی و لەزەتی پێ بکات بە بینینی، دوای ئەو هەمووە نیعمەت و خۆشی یە، لە هەموو شت گەورەتر ئەمەیە کە پێیان ئەفەرموێ:** ﴿وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ **ئێوە لەو بەهەشتەدا ئەمێننەوە بێ برانەوە هەرگیز لێ ی دەرناچن، چونکە هەر نیعمەت و خۆشی یەك کە مەترسی نەمانی لێ بکرێ زۆر ناتەواوە، بەڵکو ئینسانی عاقڵ خۆشی لێ وەرناگرێ، ئەگەر بیری لێ بکاتەوە هۆی داخ و خەفەتە، وەکو شاعیر ئەڵێ:**

**اشد الغم عندي في سرور تيقن عنه صاحبه انتقالا** [1]

**لوتفێکی گەورەی تر ئەمەیە: ئەم هەموو نیعمەت و خۆشیانە، وا پیشان ئەدات کە ماڵی خۆیانە، وەکو بفەرموێ: هیچ منەتێکی تیادا نی یە، ئەفەرموێ پێیان:** ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ **ئەوە بەهەشتێکی ئەوتۆیە کە دراوە بە ئێوە بەهۆی کردەوەکانتان کەلەپێشەوەکردووتانەلەدنیادا،** ﴿لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾ **بۆ ئێوە هەیە لەو بەهەشتەدا**

---

[1] بەتین ترین غەم بەلامەوە لە کەیف و خۆشی یەکدایە کە خاوەنەکەی بۆی روون بێ کە ئەو خۆشی یە نامێنێ و لە دەستی دەرئەچێ.

میوەجاتی زۆر کە لێ ی ئەخۆن، واتە لەبەر زۆری و نەبڕاوەیی هەندێکیتان بۆ ئەخورێ. لە قورئان دا لە زۆر شوێن دا باسی رابواردن بە خۆراك و پۆشاکی بەهەشت ئەفەرموێ لەگەڵ ئەمەدا ئەوە نرخێکی وای نی یە لەچاو ئەو هەمووە نیعمەتەی کە خوای گەورە ئامادەی فەرمووە بۆ بەندەکانی، بەڵام زۆرترین خۆشی دنیا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم دووانە، بێ ئەمانە ژیان نرخی نی یە، بە تایبەتی یەکەم چینێ کە ئەم قورئانەی هاتە سەر، زۆر بێ ئەوا بوون، ئێجگار پێویستیان هەبوو بەم دوو نیعمەتە، کەواتە ئەم دووانە بە شێوەی گشتی لە پێش هەموو شتێکەوە سەرنج رائەکێشن.

لە پێشەوە هەندێ دوا لە سزای زاڵمانی تاوانباران ئیتر هاتە سەر پاشەڕۆژو پاداشتی گرنگ و بە نرخی لە خوا ترسەکان، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر تاوانبارەکان، ئەندازەیە بە درێژیی باسی عەزابی سەختیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ بێگومان تاوانبارەکان – واتە ئەوانەی کە تاوانی هەرە گەورەیان هەیە – کە کوفرە بێ بڕانەوە ئەمێننەوە لە سزای دۆزەخ دا، ﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ ئەو سزایەیان لەسەر سووك ناکرێ، ئەوان کەوان لەناو ئەو سزایەدا نائومێدن و چاوەڕوانی رزگارییان نی یە، کە ئەم نائومێدی یە لە هەموو شت سەخت ترە. ئەمانە کە ئەو سزا سەختە نەبڕاوەیان هەیە مافی خۆیانە، خۆیان بەدەستی خۆیان ئەوەیان بەسەر خۆیان هێنا، چونکە خوای گەورە لە دنیادا هەموو پەڵپ و بەهانەی بڕین: عەقڵ و فامی پێدان، پێغەمبەرو ئایینی خۆی بۆ ناردن، بە جوانی هەموو پێویستی یەکی بۆ روون کردنەوە، دەسەڵات و توانای پێدان بۆ هەر رێگەیەك کە بیدەنە بەر، ئەوانیش رێبازی پێغەمبەرانیان نەگرت، رێگای شەیتانیان گرت تا سەریان لەو بەد بەختی یەوە دەرچوو، لەبەر ئەوە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئێمە هیچ زوڵممان لێ نەکردوون، بەڵکو هەر خۆیان زوڵمیان لەخۆیان کردو لە دنیادا بەو جۆرە بە ئارەزووی خۆیان کردەوەیەکیان کرد کە ئەبێ تۆڵەی وایان لێ بسێنرێ.

﴿وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّـٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَـٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَـٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾﴾

**ئەو سزا سەختەی کە هەیانە – خوا پەنامان بدات – لەگەڵ هیچ شتێکی تردا بەراوردو هاوتایی ناکرێ، بە جۆرێ مردن کە ناخۆش ترین شتە لە دنیادا ئەوان ئاواتی بۆ ئەخوازن و تکا ئەکەن کە بۆیان ببێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ﴾ لەناو دۆزەخ دا هاوار ئەکەن، ئەلاّلێنەوە لە سەرۆکی ئەو مەلائیکەتانەی کە کاروباری دۆزەخیان بەدەستە ئەڵێن: ئەی مالیك هاوار، داوا بکە لە خوای خۆت کە بە گورجی بمانمرێنێ و یەکسەر بمانکوژێ. ئەو سیاچارانە بە هاوار و فوغان و گریەو زاری و زەلیلی یەوە لەناو تەبەقەکانی ئاگردا ئەو لاڵە ئەکەن، بەلاّم هیچ سوودێکیشی نی یە، بەڵکو ئێجگاری مالیك سیخی نائومێدی ئەکات بەدڵ و جگەریان دا: ﴿قَالَ إِنَّكُم مَّـٰكِثُونَ﴾ ئەڵێ: بێگومان ئێوە ئەمێننەوە لەو سزایەدا، واتە نە دوایی هاتنی هەیە و نە رزگاری و نە چاوەڕوانی و نە مردن – خوا پەنامان بدات – مالیك بەو جۆرە وەلاّمیان ئەداتەوە، خوایش ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جِئْنَـٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَـٰرِهُونَ﴾ بێگومان حەقمان بۆ هێنان بەهۆی پێغەمبەرانەوە، بۆمان روون کردنەوە، بەلاّم زۆربەی ئێوە حەقی پێ ناخۆش بوو، قینی لێی بوو، لەبەر ئەوە حەق جڵەوی ناڕەوایی ئارەزوویانی نەگرتەوە ئەوانیش لە ئاستی ئەو ئارەزووە ناڕەوا دەستەپاچەو پەك کەوتوو بوون، بە پێچەوانەی رەفتاریان نەئەکرد، بەلاّم دەربارەی حەق و حەق خوازان بێ شەرم و بێ حەیا بوون، بە هەموو هێزو بە هەموو جۆر بەربەرەکانی و بەرگری یان ئەکردن، کەواتە هەر لۆمەی نەفسی خۆیان بکەن.**

**لەهەموو چەرخێك دا زۆربەی ئەوانەی کە بەرگری رێگای راست و حەقیان کردووەو ئەیکەن، لەبەر نەناسین و نەزانین نەبووەو نی یە، بەڵکو هەر لەبەر ئەوەیە کە حەق ئەدا لە مەسڵەحەتێکی بێ نرخییان ، بەرگرییان ئەکات لەو ناڕەوایی و ناحەقی یە کە ئەوانە ئەیانویست.**

أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾

---

**ئینجا دێتەوە سەر ئەو زاڵمانەو هەڕەشەیان لێ ئەکات لەسەر ئەوەی کە پیلان گێڕییان ئەکردو موئامەرەیان ئەچنی دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ﴾ ئایا ئەوانە ئەیانەوێ شەڕو خراپە فەراهەم بێنن دەربارەی پێغەمبەر بۆ بەرگری کردن و لەناوبردنی؟ واتە خەریکی تاوانێکی زۆر گەورەن، ئەوانە بە ئامانجی خۆیان ناگەن، چونکە بێگومان ئێمە بڕیاری**

**شەڕو سزایان ئەدەین، بەرگرییان ئەکەین لە پێك هێنانی ئەو مەبەستە ناڕەوایانە ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ ئایا ئەوانە کە خەریکی حیلەو فێڵ و پیلانن دەربارەی پێغەمبەر، وا گومان ئەبەن کە ئێمە قسە نهێنی یەکانی ئەوان، ئەوەی بە چپە لەناویەکدا ئەیلێن و بڕیاری ئەدەن لەو بابەتەوە، ئایا ئەوانە گومان وا ئەبەن کە ئێمە ئەو قسەو باسانە نابیستین؟ بەڵێ ئێمە ئەوانە ئەبیستین، مەلائیکەتەکانیشمان هەموو کات حازرن لایان و ئەو پیلان و قسەو باسانەیان هەموو ئەنووسن.**

**ئەو زاڵمانە باوەڕێکی ناڕەوای پڕوپووچیان هەبووە وەکو چەند جار باس کرا کە مەلائیکە کچی خوایە، لەبەر ئەوە ئەوان ئەو بتانە ئەپەرستن کە دایان نابوون بە وێنەو هەیکەل بۆ مەلائیکەتەکان، ئەوا خوای گەورەیش لێرەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەرپەرچی ئەو باوەڕە ناڕەوایەیان بداتەوە بەم فەرموده: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە ئەگەر لە فەرزێك دا خوای خاوەن رەحم و بەزەیی رۆڵەی ببوایە، من یەکەم کەسێ ئەبووم لەناو ئێوەدا بۆ پەرستن و من لە پێش هەمووتانەوە ئەمپەرست، چونکە من لە هەمووتان ئامادەترو چەسپان ترم بۆ گوێ رایەڵی و پەرستنی خواو رەفتارکردن بە گوێرەی رەزامەندی خوا، دەی ئەگەر ئەو باوەڕەی ئێوە راست بوایە، ئەبوایە من لە پێش ئێوە بمکوتایەو بمپەرستایە، چونکە رێزگرتنی ئەولاد رێزگرتنە بۆ باوکەکەی، کەواتە ئەوەی ئەوان ئەیلێن درۆی رووتە: هیچ بنەڕەت و پاڵپشت و دەلیل و بەڵگەیەکی نی یە، خوا پاك و بێگەردە لەو باوەڕو قسەی ئەوانە،**

سُبۡحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٞ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَٰهٞۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمۡلِكُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾

---

**وەكو ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی عەرش پاك و خاوێن و بێگەردە لەوەی كە ئەوان ئەیڵێن.هەركاتێ هەر فامدارێ چاوێكی دڵ بهاوێژێ بۆ ئەو ئاسمانانەو زەوی، بیرێ بكاتەوە لەو گەورەیی و بەرزی و دەسەڵات بڵندیی یە بەسەر ئەم بوونەوەرە گەورەدا، هەركات ئاوا بیر بكاتەوە هەر بە سروشتی خۆی ئەزانێ كە خاوەنی ئەم هەمووە ئەبێ دوور بێ لەمەی كە وێنەی دروست كراوەكانی بێت، وای بەلاوە نەگونجاوە، ئەو جۆرە باوەڕە پڕوپووچانە بە گاڵتەو شتێكی بێ نرخی وا دائەنێ كە شایانی ئەوە نەبێ لێ ی بكۆڵرێتەوە، بەڵكو بۆ ئەوە چاكە یان هەرگوێ ی پێ نەدرێ، یان مەترسی یە بخرێتە بەردەم ئەو نەفامەی كە ئەو باوەڕەی هەیە، بەڵكو بە ترساندن وازبێنێ، وەكو ئەم فەرمودەیە پیشانمان ئەدات: ﴿فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ﴾ كەواتە ئەی پێغەمبەر لێ یان گەڕێ، وازیان لێ بێنە، با رۆ بچنە خوارەوە لە بەتاڵ و پڕوپووچی خۆیان دا، با گاڵتەو لاقرتی نەفامانەی خۆیان بكەن لەم دنیادا، هەتا دوچاری رۆژی خۆیان ئەكرێن، ئەو رۆژەی كە هەڕەشەیان لێ كراوە پێ ی كە رۆژی دوایی یە، ئەو رۆژە سەختە كە چەند ئایەتێ لەمەوپێش هەندێ لە سزای سەختی خستە پێش چاو كە حەق وایە بە تەنها بیر لێ كردنەوەی هەناسە سوار ببێ، گەروو پێ ی بێتە یەك – خوا پەنامان بدات لێی – آمین.**

ئینجا دەست ئەکات بە باسی گەورەیی پەروەردگاری ئاسمانان و زەوی، تاك و تەنهایی، ناسینی بە چەند سیفەتیّ تر کە شایانی خوایەتی یە ئەفەرمویّ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ * وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ تەنها خوا کەسێکی ئەوتۆیە کە موستەحەق و شایانی پەرستنە لە ئاسمان و لە زەوی دا، تەنها ئەو لێزان و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا، زانینی تەواوی بیّ لەکەی هەیە، خێرو پیتی فراوانە و پاك و بیّ گەردە لە هەموو عەیب و لەکەیەك، کەسێکی ئەوتۆیە کە تەنها بۆ ئەوە موڵکایەتی راستەقینەی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیان دا هەیەو تەنها لای ئەو هەیە زانینی کاتی هاتنی رۆژی دوایی، هەر بۆ لای ئەو ئەگێرِێنرێنەوە لە رۆژی دوایی دا بۆ پرسیارو موحاسەبە، پاداشت و تۆڵە لیّ سەندن، بە گوێرەی بیرو باوەرِو کردەوەکانتان. ﴿وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ هەموو ئەو پەرستراوانەی کە ئەمان هاواریان لیّ ئەکەن و ئەیانپەرستن و پەرستنی خوا واز لیّ ئەهێنن و ئەچن بۆ پەرستنی ئەوان، بە ئومێدی ئەوە کە تکاو لاڵەیان بۆ بکەن لای خوا، هیچیّ لەو پەرستراوانە توانای هیچ تکاو لاڵەیەکیان نی یە، جگە لەوانەیان کە شایەتیان داوە بە حەق، کە تاك و تەنهایی بۆ خوایە لە کاتێك دا کە بە زانین و ئاگاداری دڵەوە ئەو شایەتیە ئەدەن. وەکو عیساو عوزەیر، ئەمانە توانای تکاو لاڵەیان هەیە، بەڵام لاڵە ناکەن بۆ ئەوانەی کە باوەرِیان نی یەو دوژمنی ئەو حەقەن کە ئەمان باوەرِیان پیّی هەیەو شایەتی پیّ ئەدەن. جگە لەوەیش هیچ کەسێك ناتوانێت تکا بکات لای خوا بە ئیزن و رای خوا نەبیّ، خوایش ئیزن و رای لەسەر لاڵە نی یە بۆ دوژمنەکانی خۆی.

وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾

---

**ئینجا بەرەنگاریان ئەکات و بەریان لیٚ ئەبڕێتەوە بە شتیٚ کە باوەڕیان پیٚی هەیەو هیچ گومانیان تێدا نی یە، لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە سەر لیٚ تێك چوون باوەڕی تریان هەیە پێچەوانەی ئەم باوەڕەیان، کە بە سروشت راستی یەکەی ئاشکرایە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار بکەیت: ئایا کیٚ ئەوانی دروست کردووە؟ بێگومان ئەڵێن خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە. چونکە هیچ چارە نی یە، هیچ کەس ملەجەڕیٚی پیٚ ناکریٚ، مەگەر شێتیٚ بیٚ کە هیچ فام و هۆشی نەمێنیٚ، ئەگەر نا، ناچارە ئەبیٚ هەر بڵیٚ: خوا دروستی کردووین، چونکە خۆیان دروست نەکردووە، بە رێکەوت ناگونجیٚ ئەم شتە نایابەو ئەم رژێمە ببیٚ، کەواتە ئەبیٚ یەکیٚ تر دروستی کردبن کە ئەویش ناوی ﴿الله﴾ یە، کەواتە زۆر شوێنی خۆیەتی کە بە شێوەی سەرسوڕهێنەری ئەم پرسیارە بکرێت: ﴿فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ کەواتە ئایا چۆن ئەوان لادراون لەم رێگە راستە حەقە کە باوەڕە بە تاکو تەنهایی خواو پەرستنیەتی بە تەنها؟**

**ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنیٚ بە پیشان دانی قەدرو رێزی پێغەمبەر(ﷺ) لای خوا، تەمیٚ کردنی بەمەی چاوپۆشی بکات و گویٚ نەدا بە نەفامی و سەرکێشە بیٚ بڕواکان، بە بیٚ نرخ و بیٚ قیمەتیان سەیر بکات و بیانترسێنیٚ بەو سزایەی کە لەمەوپاش پیٚی ئەگەن و ئەیزانن، ئەفەرمویٚ: ﴿وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ سوێند بەو وتەی پێغەمبەر کە نزا ئەکاتە لای پەروەردگاری ئەڵیٚ: ﴿يَٰرَبِّ﴾ بێگومان ئا ئەوانە، واتە ئەو کۆمەڵە سەرکێشە بیٚ بڕوایانە گەل و کۆمەڵێکن ئیمانیان نی یەو ئیمان ناهێنن[1]. ﴿فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾**

---

[1] ئەم وشەیە ﴿و قیله﴾ بەسەر و بە ژێر ئەخوێنرێتەوە، بە ژێر ئێستا باوە، لەسەر هەردوو بار چەند روویەکی بۆ باس کراوە، بە پیٚی رێزمانی عەرەبی، بە گوێرەی ئەو بارو روانە تەفسیر کراوەتەوە، ئەمەی لە تەفسیرەکەدا گوترا چەند

کەواتە ئیعرازیان لێ بنێ و پشتیان تێ بکەو گوێ یان مەدەرێ و پێیانەوە خەریك مەبە، لێ یان گەڕێ بۆ ڕۆژی خۆیان، چونکە لەمەو پاش ئەزانن چی یان بەسەر دێت.

خوای خاوەن دەسەلآت ئەو هەڕەشە سەختەی کرد لەو کۆمەڵە بەدبەختە، زۆری پێ نەچوو ئەو هەڕەشەی هێنایەجێ و بەدی هێنا.

ئەوانە بە ریسوایی لە(بەدر) دا بەربادبوون، بە کوێرایی چاوی ئەوان ئالآی ئایینەکەی پێغەمبەری(ﷺ) بەرزکردەوە، هەموو نیشانەو دروشمی باوەڕە پووچەکەی ئەوان نەما. لە دنیادا وایان بەسەرهات بەریسوایی ئەوەبەرەو سزای ئاگرڕۆیشتن، بێ گەڕانەوەوبێ بڕانەوە، بێگومان ئەم هەڕەشە بۆ هەموو جێنشینەکانی یەکەم چینە لە هەموو کات و چەرخێك دا – خوا پەنامان بدات لە عەزابی خۆی – آمین، آمین.

---

کەسێکی باوەڕ پێکراو لەسەرییەتی، دڵیش بۆ ئەوە زیاتر ئەڕوا، لەبەر ئەوە هەڵمان بژارد، زانینی راست لای خوای گەورەیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾

## سورەتی(الدخان)
## مەککەیی یەو ٥٩ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە سەرجەم بە توندو تیژیی پەلامار ئەدات و هێرش ئەباتە سەر دڵی ئادەمیزاد، هەمووی وەکو کوتەك و تۆپز ئەدات بە نوکەی دڵیدا بێداری ئەکاتەوە، چەرخەی پێ ئەکاتو ئەیگێڕێ بە ئاسمان و زەوی و دنیاو ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و مردن و ژیان و جیهانی ئاشکراو نادیاردا. لە نێوان ئەم گەردش و گێڕانەدا عەقیدەو باوەڕ بە بنەڕەتی ئایینی خوا دائەڕێژێ لە هەر دڵێك دا ئامادەیی تێدا بێت و دەست بدات بۆ دروست کردنی کۆشکی بەرزی ئیسلام تێیدا، لەوانە بێ درەختی سایەداری ئیسلامی تێدا بڕوێت.

لەمەو پێش گوتمان کە دەروازەی ئەم حەوت سورەتەو یەکەم مەبەستیان لە یەکەمین جارەوە بریتی یە لە باسی قورئان، چونکە یەکەم سەرچاوەی ئەم ئایینە جیهانی یە هەتا هەتایی یە قورئانە، هۆی مانەوەی ئایینی خوا لەم جیهانەدا ئەم قورئانەیە، کەواتە ماقی خۆیەتی کە هەموو جارێ دڵ بێدار بکرێتەوە، بە بەرزی ڕێزو هۆی هێنانە خوارەوەی باس ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *حمٓ * وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ * إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ سوێند بەو کتێبە ڕوون و ئاشکرایە، بەڕاستی ئێمە ئەو کتێبەمان هێنایە خوارەوە، واتە دەستمان کرد بە هێنانە خوارەوەی، لە شەوێك دا کە فەڕو پیت و بەرەکەتی تێ خراوە کە شەوی ﴿ليلة القدر﴾ ە، ئەو شەوەی کە بەناوبانگە بەو ناوەو یەکێکە لە شەوەکانی ڕەمەزانی پیرۆز، لە دە ڕۆژەکانی دوایی دا. [1]

---

[1] هەندێ ئەڵێن ئەو شەوە بەراتە ١٥ ی شەعبان، لەو بابەتەوە حەدیسێ هەیە بەلآم ئەم رایە جێگەی بڕوا نی یە، چونکە لە دەقی قورئانەوە وەرئەگیرێ کە ئەو شەوە لە رەمەزان دایە، چونکە خوا ئەفەرموێ لە سورەتی ﴿البقرە﴾ دا ئەفەرموێ: چەند حەدیسی سەحیحی زۆرو زەبەندەش هەیە لەو بارەیەوە

به ڕاستی شەوێکی بەفەڕە، چونکە گەورەترین نیعمەتی خواو بەرزترین منەتی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە ئەو قورئانەیە کە لەو شەوەدا دەست کرا بە هێنانە خوارەوەی ئەو قورئانەی کە هۆی سەعادەت و کامەرانی هەردوو جیهانە، ئەم قورئانەی کەوا ئادەمیزاد لەسەر سروشت و تەبیعەتی خۆی ڕاگیر ئەکات، دای ئەمەزرێنێ بە ڕێك و پێکی لەگەڵ ئەو بوونەوەرەی تێیدا ئەژی، بە پاك و خاوێنی. لەم زەوی یەدا ئەژی لەگەڵ پەیوەندی تەواو لەگەڵ ئاسمان دا و ئادەمی لە سایەی قورئان دا خۆی ئەناسێ و ئەزانێ لە کوێوە هاتووەو بۆ کوێ ئەڕوات، بۆچی هاتووەتە دنیا؟ ئەو قورئانەی کە بۆ هەموو چەرخ و چینێ لە یەکەم جارو ئێستاو لەمەولایش، هەتا دنیا دنیایە، تەڕو تازەیەو بەرنامەیەکی ڕوون و ڕەوانە، بێ کەم و کوڕی، هەموو کات ئامادەیە بۆ پێك هێنانی ژیانێکی نموونەیی کە ناگونجێ بە هیچ جۆرو دەست ناکەوێ لە سایەی ئەم قورئانەدا نەبێ، کەواتە ئادەمیزاد لەسەریەتی کە ئەو شەوە پیرۆزە بکات بە جەژنی خۆی.

خوای خاوەنی ڕەحم لەم شەوە موفەڕکەدا دەستی کرد بە هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە، هۆی هێنانە خوارەوەییشی ڕوون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ هۆی هێنانە خوارەوەی قورئان ئەمەیە کە بێگومان ئێمە ترسێنەری بەندەکانمانین بە هۆی ئەو قورئانەوە، واتە پێیان ڕائەگەیەنین ئەوەی زیانیان پێ ئەگەیەنێ، ئەوەی سوودی هەیە بۆیان، چونکە خۆی بەندەکانی ئەناسێ، ئەزانێ شتیان لە بیر ئەچێ، پێویستیان بە ترساندن و ئاگادار کردنەوە هەیە، با هیچ کەس بەهانەیەکی نەمێنێ. ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ لەو شەوە پیرۆزەدا جیا ئەکرێتەوەو ڕوون ئەکرێتەوە هەموو کاروبارێکی بەجێی خاوەن حیکمەت و مەسڵەحەت، بەهۆی ئەوەوە کە قورئانی تیادا هاتووەتە خوارەوە، کە قورئانیش هەموو حەق و بەتاڵ و ڕاست و چەوتێ جیا ئەکاتەوە، سنووری هەموو شتێکی دیاریی کردووەو نیشانەکانی ڕێگای ڕاستی ژیانی ئادەمی لەم جیهانەدا داناوەو ڕوونی کردووەتەوە، یان مەبەست ئەوەیە: لەو شەوەدا هەموو ساڵێ هەموو بەسەرهات و ڕزق و ڕۆزی و مردن و ژیان و هەموو شتێکی ساڵەکە کە هەمووی بەجێیەو پڕ لە بەرژەوەندی یە لەلایەن پەروەردگارەوە ئەدرێ بەو مەلائیکەتانەی کە نووسەری ئەو شتانەن، ئەو کارو فەرمانەیان پێ سپێرراوە.

---

لەوانەیە بڵێین: ﴿متواتر معنوى﴾ یە، بۆ ئەم ڕایە تەنها حەدیسێ هەیە ئەویش ﴿مرسل﴾ ە، کەواتە هەر گوێی پێ نادرێ، لەگەڵ ئەم ئایەت و حەدیسانەدا.

أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾

---

﴿أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ﴾ مەبەست بەوانەی کە لەو شەوەدا جیا ئەکرێنەوە کارو بارێکە لە لایەن ئێمەوە، بە گوێرەی راو زانین و خواهیش و فەرمانی ئێمەیە، لە پێشەوە کە فەرموی: ئێمە ترسێنەرین، لێرەدا لە باتی ئەوەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ﴾ بێگومان باومان وابووە کە پێغەمبەرانمان رەوانە کردووە بەو پەڕاوە بۆ سەر ئادەمی، واتە تۆش رەوانە ئەکەین بۆ سەر ئادەمی لەبەر ئەوە قورئانێ کە پەڕاوی تۆیە هێنامانە خوارەوە. ﴿رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ﴾ لەبەر رەحم و بەزەیی لەلایەن پەروەردگارتەوە بە بەندەکان، بەڵکو بە هەموو جیهان.

بەڕاستی رەحم و لوتفی خوا لە هیچ شتێکی تر روون و ئاشکرا نی یە بەو ئەندازەو رادەی کە روون ئەبێتەوە لە هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانەدا کە هاتووە رێك و روون و راست و رەوان، بێ پێچ و قۆرت و لاری و گرێ یەك، هەرچی پێویستی ئادەمی هەیە بۆ هەردوو جیهان رونی کردۆتەوەو ئەوەی داوای ئەکات باش ئەچێتە دڵ و بە گوێرەی سروشتی ئادەمی یە. ئادەمییەتی تەنها لە سایەی ئەم قورئانەدا بە تێرو تەواوی بەدی هاتووەو بەدی دێت، بۆ وەرگرتن و چەسپاندنی ئەم مەبەستانە هەوڵ و کۆشش ئەکات بە هەموو جۆرو بە هەموو شێوازو رەوشتێك کە بەکار بێت: توندو تیژیی و ترساندن، نەرم و نیانی و مژدە دان، دەلیل و بەڵگەو نیشانەی زۆرو زەبەند، کە بەکاردێت بۆ هەموو چین و تاقمێ، لەگەڵ رادەی هەموو جۆرە ژیریی یەکی جیاوازدا. ئەمانە هەموو ئەکات بێ ئەمەی هیچ جۆرە پێویستی یەکی هەبێ بە هیچ شتێك و هیچ هۆیەك نی یە جگە لە رەحم و بەزەیی بێ سنووری، لە لوتف و کەرەمی بە زیاد بێت. ئەو خوایەی کە خاوەنی رەحمەو پەروەردگارە ئەم لوتفە گەورەی کرد لەگەڵ بەندەکانیدا چونکە قسەو گفتوگۆیان ئەبیستێ و ئاگادارە لە هەموو شتیان ئەزانێ، چ شتێ بۆیان باشەو بە چی باش ئەبن،﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بێگومان تەنها خوا بیستن و ئاگاداری و زانینی راستەقینەی هەیە، چونکە پەروەردگارەو ئەویش بێ ئەو دوو سیفەتە نابێ. ﴿رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئەو زاتە پەروەردگاری هەموو ئاسمانەکان و زەویی یەو هەرچی لەنێوانیان دا هەیە، ئەگەر ئێوە زانین و باوەڕی راستەقینەتان هەیە دەی بزانن کە خوا زاتێکی وایە،

لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾

---

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ **هیچ خوایەك نی یەو هیچ كەس شایانی پەرستن و گوێ رایەڵی نی یە، جگە لەوەی كە پەروەردگاری ئاسمانان و زەوییە، گیان ئەكات بە بەری گیانداران دا، ئەیانمرێنێ، واتە گیان ئەدات و گیان ئەسێنێ لە گیانداران، پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوباپیرە پێشووەكانیشتانە.**

**گیان بە بەردا كردن و مراندن، دوو شتی ئاشكران و وان بە پێش چاوەوە، ئاشكرایشە كە لە توانای هیچ كەس دا نین جگە لە خوا، ژیان و مردن دڵ ئەهێنێتە جۆش، ئامادەی ئەكەن بۆ گوێ رایەڵی و وەرگرتنی تەمێ و ئامۆژگاری، لەبەر ئەوە ئەم دوو شتە لە قورئان دا زۆر جار باس ئەفەرموێ و ئەیلێتەوە.**

**لەپاش ئەم هەموو تەمێ و ترساندن و ئاگادار كردنەوەو پیشان دانو پێناسینی ئەو سیفەتە گرنگانەی خوا، پاش ئەمانە ئەم جار لەوە كۆتایی ئەهێنێ و دێتە سەر باسی ناحەق و ناڕەوایی ئەو بت پەرستانە، ئەفەرموێ:** ﴿بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾ **ئەوانە لە دوو دڵی و گوماندان دەربارەی ئەم ئایەتە راستە دامەزراوانە، گاڵتە ئەكەن و گاڵتەیان لێ دێت لەم حەقە راستەی كە بۆیان هاتووە.** ﴿فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ **كەواتە لێ یان گەڕێ، چاوەڕوانی رۆژێ بكە كە ئاسمان دووكەڵێكی ئاشكرا ئەهێنێ** ﴿يَغْشَى ٱلنَّاسَ﴾ **كەوا ئادەمیزاد دائەگرێ،ئەو كاتە بە تەشەرەوە پێیان ئەگوترێ:** ﴿هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ **ئەمە سزایەكی ئێش و ئازارداری سەختە یان خۆیان لەناو خۆیان دا ئەڵێن و هاواریان لێ هەڵئەستێ، ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن:** ﴿رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ﴾ **ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئەم سزایەمان لەسەر لابە، بە راستی بەڵێن ئەدەین كە باوەڕ ئەهێنین، واتە كاتێ ئەو هەموو تەمێ و رێنموونی یە سوودی نەبووە كاری لێ نەكردن، ئیتر خۆتیان پێوە خەریك مەكەو**

هەڕەشەیان لێ بکە بە سزای ئەو ڕۆژە تەنگە، ئەو کاتە بە ناچاری باوەڕ ئەهێنن، با ئەو باوەڕەیش سوودی نەبێ، چونکە لە ڕاستی یەوە نایەت، یان لەبەر ئەوە کاتی وەرگرتنی باوەڕو گەڕانەوە نامێنێ.

ڕای پێشەواکان جیاوازە لە مەبەست بەو دووکەڵەو کاتەکەی، هەندێ فەرموویانە: مەبەست بەو دووکەڵە قاتی و گرانی یەکی سەخت بوو کە دووچاری بت پەرستەکان بوو بەهۆی نزای پێغەمبەر(ﷺ) لێ یان، ئەوەبوو گرانی یەکی ئەوەندە سەخت ڕووی تێ کردن ناچاربوون ئێسکی سەگ و مردارە بوویان ئەخوارد. لەو تەماشای ئاسمانیان ئەکرد لەپێش چاویان هەر تەم و دووکەڵ بوو لەبەر ئەوە برسێتی چاوی بێ هێز کردبوون، هەم لەو کاتە بێ بارانی یەدا تەم و غوبار وەکو دووکەڵ لاسەری ئەگرتن. کەواتە بە پێ ی ئەم ڕایە، ئەو هەڕەشەیە خوای گەورە هێنایە جێ، شتێکە تێپەربوو.

هەندێ تر ئەفەرمون: تێ نەپەڕیوە لەمەو پاش پەیدا ئەبێت، مەبەست ئەو دووکەڵە، دووکەڵێکە کە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دا پەیدا ئەبێت، ئەبێتە هۆی سزا بۆ خراپان، بۆ چاکان وەکو هەڵامەت وایە.

(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ ڕازی بێت – لەسەر ئەم ڕای دووەمەیە، لەبەر چەند هۆیەك باوەڕمان بەم ڕایە بەهێزترە:

١- وێنەی ئەم هەڕەشەیە لە قورئان دا زۆرەو هەموو ئەوانی تر بۆ ڕۆژی دواین، کەواتە ئەمەیش وەکو ئەوان بێت ڕێك ترە.

٢- خوا ئەفەرموێت: ﴿ودخان مبین﴾ واتە دووکەڵێکی ئاشکرا کە هەموو کەس ئەیبینێ و ئەیناسێ، دەی ئەوەی کاتی گرانیەکە دووکەڵێکی وەها ئاشکرا نەبوو، بەڵکو شتێکی خەیاڵیی ڕووت بوو، یان تۆزو غوبارێ بوو وەك دووکەڵ وابووە.

٣- خوا ئەفەرموێ: ﴿یغشی الناس﴾ زاهیر مەبەست گشتی یە دەی بە گوێرەی ڕای پێشوو، ئەبێ مەبەست بەووشە بت پەرستەکانی مەککەبێت،ئەویش پێچەوانەی دیمەن وزاهیرە، لەبەرئەوەلە تەفسیرەکەدا بە گوێرەی ڕای دووەم ڕۆیشتین. لەو ڕۆژە سەختەدا بەو جۆرە پەنا ئەبەن و بەڵێنی ئیمان ئەدەن ئەگەر خوا ئەو سزایەیان لەسەر لابات،

أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْاْ عَنْهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾

---

ئەوا خوای گەورەش ئەیانخاتەوە بە درۆوە ئەفەرموێ: ﴿أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ لە کوێوە بیر ئەکەنەوەو بەوە چۆن تەمێ خوار ئەبن و ئامۆژگاری وەرئەگرن؟ ﴿وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ﴾ لە کاتێك دا کە هۆی گەورەتریان بینی، بەڵگەی بەهێزتریان پیشان درا، ئەوەیش ئەوەبوو کە پێغەمبەرێکیان بۆ هات کە پێغەمبەرێتی یەکەی روون و ئاشکرا بوو، رێگەی پیشان دان، هەوڵ و تەقالای لەگەڵ دان: ﴿ثُمَّ تَوَلَّوْاْ عَنْهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ﴾ کەچی دوای ئەوە باوەڕیان پێ نەهێناو پشتیان تێ کرد، هەندێکیان ئەیانگوت: ئەمەی کە ئەیڵێت هینی خۆی نی یە، فێر کراوە لە لایەن بەندەیەکی غەیری عەرەبەوە!

هەندێ تر ئەیانگوت: شێتە، پاش ئەمەی شێوەی پێ گیرانیان لەو رۆژە سەختەدا ئەخاتە پێش چاو، لەگەڵ پاڕانەوەو لاڵەیان و بەڵێن دانیان بە ئیمان هێنان، ئەگەر خوا رەحمیان پێ بکات و ئەو سزایەیان لەسەر لابات، پاش ئەوە ئێستا لەم دنیا پێش ئەمەی بگەنە ئەو رۆژە تەنگە، کە ئیتر ئەم هەلەیان لە دەست ئەچێ ئێستا کە هەلیان بۆ هەڵکەوتووە پێیان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًاۚ﴾ ئێمە ئێستا ئەو سزایەمان لێ لاداون، دوامان خستووە – لەگەڵ ئەمەدا هۆی ئەو سزایەش هەیە، کە کوفرو سەرکێشی یەکەتانە – کەواتە ئیمان بێنن، هەل لەدەست خۆتان دەرمەکەن، ئەم ئارامی و بێ سزاییە هەروا نامێنێ: ﴿إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ﴾ چونکە بێگومان ئێوە لەپاش مردن زیندوو ئەکرێنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆلای ئێمە: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾ ئەو رۆژە کە بە توندو بەتین دەست وەشاندنی هەرە گەورە بەکار ئەهێنین، ئەو رۆژە کە ئەو دووکەڵە ئاشکراو پەیدا ئەبێت و خەڵکی دائەگرێ، واتە فریای خۆتان بکەون، پێش ئەمەی بگەنە ئەو رۆژە کە ئیتر هیچتان بۆ ناکرێ ﴿إِنَّا مُنتَقِمُونَ﴾ چونکە بەراستی ئێمە لەو رۆژەدا تۆڵە سێنەرین لێتان[1].

---

[1] ئەمەی کە لە تەفسیرەکەدایە رای هەندێ لە زانایانە، زۆر بە رێکی چووەتە دڵمەوە، لەبەر ئەوە هەڵم بژارد ئەم ئایەتانە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراون بە جوانی ئەزانم باسیان بکەم:

ئینجا به کورتی هەندێ لە بەسەرهاتی حەزرەتی موسا(علیه السلام) باس ئەفەرموێ و دوایی ئەهێنێ بە قار و غەزەبی بەتینی خوا دەربارەی فیرعەون و کۆمەڵەکەی، کە وەکو ئەمان بەرهەڵستی پێغەمبەرو ئایینی خوا راوەستان و بەرگریی یان ئەکرد. لەم کورتە هەواڵەدا دڵ بێدار ئەکاتەوە بەمەی کە ناردنی پێغەمبەران بۆ سەر گەل و قەومەکانیان تاقی کردنەوەیە، هەروەها مۆڵەت دانی بێ بڕواکان لەگەڵ ئەو هەموو تاوان و زوڵم و ناڕەوایی یەدا ئەویش هەر تاقی کردنەوەیە، پاشەرۆژی ئەو تاوان بارانە هەر قار و غەزەبی بەتینەو بەرباد کردنیانە،

---

أ- بە گوێرەی ئەوە کە رۆژی ئەو دووکەڵە کاتی گرانی و قاتی بێ کە باس کرا، بت پەرستەکان کە بێ شەرمییان لە سنور تێپەڕی، پێغەمبەر(ﷺ) نزای لێ کردن، کە خوا گرانی یەك بدات بەسەریان دا وەکو گرانی ساڵەکانی یوسف، خوایش نزاکەی وەرگرت. فەرموی چاوەڕوانی بکە بۆ رۆژێ کە ئاسمان دووکەڵێ ئەهێنێ ئەوانە داگیر ئەکات، ئیتر ئەو دووکەڵە لە تاریکی و برسێتی بێ کە هات بەسەروچاویان دا، یان تەم و غوباری بێ بارانییەکەیش بێت. ئینجا کەوتنە پاڕەو لاڵە بۆ لابردنی ئەو سزایەو پەنایان هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ) و بەڵێنی ئیمانیان دا، پێغەمبەر(ﷺ) نزای کرد و خوایش نزاکەی وەرگرت و گرانییەکەی لابرد، فەرمووی بە بت پەرستەکان: ئێمە کەمێ ئەو سزایەتان لەسەر لائەبەین، بەڵام ئێوە ئەگەڕێنەوە سەر کوفرو بێ باوەڕییەکەتان، ئینجا هەرەشەیان لێ ئەکات بە رۆژی بەدر یان رۆژی دوایی،

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ عِبَادَ اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾ وَأَنْ لَا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ إِنِّي آتِيكُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَنْ تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِنْ لَمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ مُجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُمْ مُتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾ سوێند بەخوا بێگومان لەپێش ئەوانەوە قەوم و گەلی(فیرعەون) مان تاقی کردەوە بە نیعمەت و سامان زۆرو بەرزی و سەرکەوتن لە ولأتداو بە ماوەو مۆڵەت دان. ﴿وَجَاءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ﴾ پێغەمبەرێکی بەرێزو قەدر داریان بۆ هات، هاتنی ئەو پێغەمبەرەیش بەشێ بوو لە تاقی کردنەوەیان، با دەرکەوێ کە پێشوازی ئەم پێغەمبەرەیان چۆنە؟**

**ئەو پێغەمبەرەی کە هیچ داوایەکی لێ یان نی یە لە لایەن خۆیەوە، بەڵکو تەنها بانگیان ئەکات بۆلای خوا، کە هەر داواو فەرمانێکی خوا هەیە بەجێی بێنن وەکو ئەفەرموێ: ﴿أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ عِبَادَ اللَّهِ﴾ [1] پێیان گوتن: ئەی بەندەکانی خوا، ئەو مافی خوا کە بەسەرتانەوە هەیە بۆم جێ بەجێ بکەن، ئەوەیش کە بریتی یە لە ئیمان هێنان پێی و وەرگرتنی و بەپیرەوە چوونی بانگەوازەکەی من لە لایەن خواوە، گوێ رایەڵی فەرمانەکانی، واتە ئەوەی من پێتان ئەڵێم لە گوێم بکەن، چونکە ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بێگومان من رەوانە کراوێکی ئەمینم، درۆ و ناپاکیم لا نی یە. ﴿وَأَنْ لَا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ﴾ سەرکەشی و تەکەبور مەکەن بەسەر خوادا، بەم جۆرە بە بێ نرخ و قیمەت تەماشای ئاین و سروشەکەی بکەن و دانی پیا نەنێن. واتە ئەوەی من پێتان رائەگەیەنم فەرمانی خوایە، من لە خۆمەوە بە دەم بڕ ئەمە ناڵێم. ﴿إِنِّي آتِيكُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾**

چونکە رابەری بەهێزی ئاشکرام بۆ هێناون وەکو ئەو هەموو موعجیزە کە خوا دابووی پێ ی کە یەکێ لەوانە داردەستەکەی بوو، کە بە پێش چاویانەوە فڕێ ی ئەدا ئەبوو بە ئەژیدیها لە پاشان دەستی بۆ ئەبرد ئەبوەوە بەدار دەستەکەی ﴿وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ﴾ من پەنا ئەبەم بە کەسێ کە خوای منیش و خوای ئێوەیشە لەمەی بەردبارانم بکەن، یان قسەی خراپم پێ بڵێن، یان بم کوژن. واتە بیم و ترسم نی یە لە ئێوە پشتم بە خوا بەستووە: ﴿وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ﴾ ئەگەر ئێوە ئیمانم پێ ناهێنن، وازم لێ بێنن و خراپەم دەربارە مەکەن و کەنارگیریم لێ بکەن، وەکو پەندی کوردی دەڵێ: ئەگەر گوڵ نیت درکیش مەبە.

حەزرەتی موسا(علیە السلام) بەم ڕێك و پێکی یەو نەرم و نیانی یە فەرمانی خوای پێ ڕاگەیاندن، ئەوپەڕی ئینسافی لەگەڵ دا بەکارهێنان، بەڵام ستەم کاران و سەرکێشان ئینساف و پیاوەتی یان لا نی یە، هەرگیز ماوەی عەقڵ و عەدالەت نادەن لە وڵات دا بگەڕێ، چونکە ئەو کاتە ماوەی ستەم کاری و زوڵم و ناڕەوایی یەکەی ئەوان نامێنێ، ئەوانیش بێ ئەوە ژیانیان نابێ لەبەر ئەوە بە هەموو جۆرە فیرعەون و کۆمەڵەکەی دەستیان کرد بە بەرگریی، هەرچیەکەیان لە دەست دا بوو بەکاریان هێنا، بەڵام کەسێ خوا یارمەتی دەری بێ ئیتر کێ ئەتوانێ هیچی دەربارە بکات؟ هەر ئەبێ دوژمنەکەی سەری تیا بچێ!

فیرعەون و کۆمەڵەکەی کۆتاییان نەهێنا لە تاوان و خراپە، بە هیچ جۆر سەریان شۆڕ نەکرد بۆ فەرمانی خوای خۆیان، حەزرەتی موسا(علیە السلام) بە تەواوی نائومێد بوو لێ یان: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە نزای کردە لای پەروەردگاری خۆی کە ئەوانە گەل و کۆمەڵێکن تاوانبارن، بە شێوەی ئەدەب داوای سزایان ئەکات، خوای گەورەیش نزاکەی وەرگرت لەبەر ئەوە فەرمووی: ﴿فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾ کەواتە شەو ڕەوی بکە بە بەندەکانم، واتە بەشەو بەنی ئیسرائیلی دەربکە لە میسرەوە با فیرعەون و کۆمەڵەکەی پێتان نەزانن، چونکەهەرکات پێیان زانین ئەکەونە شوێنتان بۆ بەرگری و گێڕانەوەو سزاتان.

وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًاۖ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴿٢٦﴾ وَنَعۡمَةٖ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدۡ نَجَّيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرۡعَوۡنَۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيٗا مِّنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾

---

**ئەم بەسەرهاتە لێرەدا کورت ئەکاتەوە، چونکە لێرەدا مەبەست باسی قارو غەزەبی خوایە لەو کۆمەڵە زاڵمەو بەرباد کردنیانە، لە شوێنی تردا بە درێژیی باسی فەرمووە، لەبەر ئەوە بە کورتی ئەگاتە سەر مەبەستەکە ئەفەرموێ: ﴿وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًاۖ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ﴾ کە ئێوە لە دەریاکە پەڕینەوە بەهۆی ئەوەوە کە داردەستەکەت دا لێ ی و ١٢ شەقامی تێکەوت، ئیتر دوای پەڕینەوە واز لە دەریاکە بێنە باوەکو خۆی بمێنێتەوە بەو شەقامانەوە، با کۆمەڵی فیرعەون کەهاتن هەرنەگەڕێنەوەلێتان تادێنە ناودەریاکە، چونکە بێگومان ئەوانە لەشکرێکن بڕیاری خنکانیان دراوەو ئەخنکێنرێن لەو دەریادا، لە پاشان چوون و هەموویان خنکان.**

**ئینجا شێوەیەك نیشان ئەدات لەو نازو نیعمەتەی کە تیایدا ئەژیان و ئەیان نۆشی و رایان ئەبوارد، بە داخەوە بەجێیان هێشت بۆ تاقمێ ترو خۆیان بەسەرو ماڵەوە تیا چوون، بێ ئەمەی هیچ نرخێکیان بۆ دانرێ، ئەفەرموێ: ﴿كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ * وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ * وَنَعۡمَةٖ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ * كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ﴾ چەندەها باخ و باخچەو کانی و سەرچەشمەی شیرین و کشتوکاڵ و جێ و ماوای بەنرخ و کۆشکی نایابیان بەجێ هێشت، هەروەها چەندە خۆشی و لەزەت و نازو رێزێ کە بە خۆشی و کامەرانی تیایدا ئەژیان و رایان ئەبوارد، ئەوانەیان هەموو بەجێ هێشت بێ خاوەن، بە کەلەپوورەیی دامان بە گەلێکی تری جیاواز کە**

پەیوەندی بەوانەوە نەبوو[1]، ئەو ستەم کارانە بەو جۆرەیان بەسەرهات: ﴿فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ﴾ئینجائاسمان و زەوی هیچ گریان وشیوەنیان بەسەردانەکردن، هیچ مۆڵەتیش نەدران،واتەئەوەندەنرخیان نەبووهیچ کەس داخ وەراقێکیان بۆبخوات، بەڵکو ئەوانە وێنەیان لەناو بوونەوەردا غەریب و بێکەس و بێ دەرن، نەویستەو تووڕ دراون، چونکە جیا بوونەتەوە لەو بوونەوەرەی کە ئیمانی هەیە و گەردن کەچە بۆ پەروەردگاری[2].

ئینجا بەرامبەری ئەو تاوانبارانە شێوەی رزگاری و رێزی ئیمان داران نیشان ئەدات. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ نَجَّيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ﴾ بەراستی نەوەی ئیسرائیلمان رزگار کرد لەو سزا ریسوا کەرە، کە دووچاری ئەبوون لە لایەن فیرعەونەوە، وەکو روونی ئەکاتەوە کە لەپاتی دا ئەفەرموێ: ﴿مِن فِرۡعَوۡنَ﴾ ئەو سزایەی کە بریتی بوو لە فیرعەون، یان ئەو سزایەی کە لایەن ئەوەوە هات: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيٗا مِّنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ بێگومان فیرعەون کەسێ بوو خۆ بە زل زان و تەکەبور دارو لەو کەسانە بوو کە زیادە رەوی کەرن لە خراپەو تاوان دا، یان لەناو کۆمەڵی زۆر ستەمکاران و تاوان باران دا، فیرعەون لە تاقمێ بوو لە ژوری هەموانەوە لە تاوانو خراپەکاری دا، کەواتە عەزاب و سزای بەنی ئیسرائیل زۆر سەخت و ناهەموار بووە بە گوێرەی سزا دەرەکەیان، هەروەها بەرباد بوونی فیرعەون، بەخۆی و ستەمکارییەکەی لە سنوور دەرچوو بوو، ماوەی نەهێشتبووەوە بۆ هیچ جۆرە مۆڵەت دانێك، چونکە زوڵم کاتێ ئەپچڕێ بگاتە قایمی و هێزی تەواو، وەکو پەندی کوردیش ئەڵێ:(هەموو شت لە باریکی ئەپچڕێ، جگە لە زوڵم ئەو لە ئەستووری ئەپچڕێ).

---

[1] خیلاف هەیە ئایا ئەو گەلە بەنی ئیسرائیل بوون، وەکو لە زاهیری ئەم ئایەتەوە وەرئەگیرێ، لە شوێنێکی تردا: ﴿و أورثناها بني إسرائيل﴾ یان قەومی ترە، بەپێی ئەمە کە ئاشکرایە ئەمان نەچوونە میسر، ئەبێ قەومێ تر بێت، کەواتە مەبەست لەو ئایەتە وێنەی ئەوەی بەجێ ما درا بە بەنی ئیسرائیلی نەك نەفسی بەجێ ماوەکەی فیرعەون و گەلەکەی.

[2] ئەم رستەیە بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی بێ نرخی ئەوەی بۆی بەکار ئەهێنرێ، وەکو پێچەوانەی بەکار ئەهێنرێ

وَلَقَدِ ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُم مِّنَ ٱلۡأٓيَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌاْ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾
إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنۡ هِيَ إِلَّا مَوۡتَتُنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾

---

**ئینجا بەرامبەر تاوان و خراپەی فیرعەون، باسی ڕێزو هەڵبژاردنی نەوەکانی ئیسرائیل ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدِ ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ * وَءَاتَيۡنَٰهُم مِّنَ ٱلۡأٓيَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌاْ مُّبِينٌ﴾ بەراستی نەوەی ئیسرائیلمان هەڵبژارد بەسەر گەلەکانی چەرخی خۆیان دا، بۆیە ئەوەمان کرد، یان لەگەڵ ئەوەدا زانیومانە کە لە هەندێ کات دا لائەدەن لە ڕێگەی خوا، بەڵام لەکات و چەرخی خۆیان دا لە هەموو باشتر بوون، کەواتە ئەوان شایانی ئەوە بوون ئاڵای ئایینی خوا بەرز بکەنەوە، هەڵسن بە ئەرکی جێنشینی لە زەوی دا، لە موعجیزەو دەلیلە ڕوونەکان ئەندازێکمان پێدان کە نیعمەتی ئاشکرای خۆی تێدا ڕوون ئەبێتەوە، یان تاقی کردنەوەیەکی ئاشکرای تیادایە.**

**نەوەکانی ئیسرائیل بەو جۆرە خوا ڕزگاری کردن و پایەی پێدان هەتا لایان دا لە ڕێگەی خوا، ئەو کاتە قاری لێ گرتن و زەلیل و سەرشۆڕی کردن، هەڕەشەی لێ کردن بەوەی عەزاب و سزایان بدات هەرکات سەرکێش و یاخی بوون وکردەوەی خراپ وئاژاوەیان ناوە لە وڵاتدا.**

**مێژووی ژیانیان هەروەها هاتووەو هەروایش ئەبێ ئیتر هەرچەندی پێ بچێت شتەکە وایە، وەکو هیچ گەل و کۆمەڵێ تر نین.**

**پێش هاتنی قورئان لە چەرخەکانی خۆیان دا وەکو قورئان ئەفەرموێ لە سورەتی ﴿الإسراء﴾ دا دووجار خوا دەستی پێدان و بەرزی کردنەوە، لە هەردوو جارەکەدا خراپە و ناڕەوایی زۆریان کردووە، خوایش تۆڵەی لێ سەندن، وایان لێ هات خەریك بوون لە ڕەگ و ڕیشە بێن.**

**خوای گەورە لە قورئان دا ئەو دوو بەسەرهاتەی دا بە ناوچاویان دا، ئینجا فەرموی: ﴿و ان تعودوا نعد﴾ [1] ئەمانیش لەپاش کۆچ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی، جێگیر بوونی**

---

[1] واتە ئەگەر ئێوە بگەڕێنەوە سەر خراپەو تاوان ئێمەیش ئەگەڕێینەوە سەر سزا دانتان.

ئایینی خوا له مەدینەدا دەستیان کردەوه پیشه پیسەکەی خۆیان تا خوا پێغەمبەری بەسەردا زاڵ کردن، بەو جۆرەیان بەسەرهات. ئینجا له چەرخی حەزرەتی عومەردا دەستیان پێ کردەوه تا ریسواو زەلیلی کردنەوه لەسەر دەستی ئەو جێنشینه مەزنەدا. هەم له ئەورووپا بڵێسەیان سەندەوه تا نەسارایان بەسەردا زاڵ بوو خەریك بوو بەرباد بکرێن، تا جەنگی جیهانی دووەم ئەمجار هیتلەری بەسەردا زاڵ کردن ئەوەی لێ کردن که پێی کردن.

ئینجا له فەلەستین دا دەستیان کردۆتەوه به جەورو ئاژاوەو تاوانبارییەکەی خۆیان، ئەوا ئێستا جارێ ماونەتەوه، هەرچەند ژیانێکی زۆر سەختیان هەیه، هەموو کات هیچ جۆره ئارامی یەکیان نی یه، به ترس و بیمی تەواوەوه ئەژین، بەڵام ئەوه هیچ نی یه، چاوەڕوانی ئەکرێ، که ئیسلام ئەمجاریش لێ یان دا، به تەواوی دەستی زوڵم و ناڕەواییان ببڕێ، بێگومان ئەو کاته دێت، ماوەی ماوه تا جەنگەکه ئەکەوێته نێوان ئەوان و ئیسلام، ئێستا له نێوان ئەوان و نەتەوایەتی دایه، هەرکات بوو به جەنگی ئیسلام و ئەوان، هیچ ناوێکی تر نەما، ئەو کاته بێگومان دوا دواییانه، ئەو کاتەیش به یارمەتی خوا نزیکه.

لەپاش ئەو گەردشەی که پێی کردین، بەرباد بوونی فیرعەون و رزگاری حەزرەتی موساو گەلەکەی خسته پێش چاو، ئینجا ئەگەڕێتەوه بۆ سەر هەڵوێستی بت پەرستەکانی قورەیش بەرامبەر زیندوو بوونەوه، ئەگەڕێتەوه بۆ ئەمەی که بێداریان بکاتەوه، که ئەو بارو رژێمه راستەی بوونەوەری لەسەر داڕێژراوه داوای زیندوو بوونەوه دەکا، هەموو دڵێکی فامدار ناچار ئەکات به ئیمانی بەهێز به زیندوو بوونەوه، ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ * إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ﴾ بەراستی ئا ئەوانه – واته بت پەرستەکانی قورەیش – ئەڵێن به تۆ: پاشه رۆژی ژیانی دنیاو کۆتایی هاتنی هیچ شتێ تر نی یه، جگه لەم یەکەم مردنی دنیایه، واته پاش ئەمەی که لەم دنیا مردین، ئیتر زیندوو بوونەوه نی یەو ژیان کۆتایی دێت، ئێمه ئیتر زیندوو ناکرێینەوه.

فَأۡتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمۡ خَيۡرٌ أَمۡ قَوۡمُ تُبَّعٖ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٣٧﴾

---

**ئینجا بەڵگە ئەهێننەوە لەسەر قسەکانیان ئەڵێن: ﴿فَأۡتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ڕاست ئەکەن ئەڵێن پاش ئەم مردنە زیندوو بوونەوە هەیە،دەی ئەو باوباپیری ئێمە کە لەمەو پێش مردوون و ڕۆیشتوون بیانهێننەوەو زیندوویان بکەنەوە.**

**ئەوانە نازانن و بێ ئاگان لە حیکمەت و مەبەست لە زیندوو بوونەوەی پاش مردن، نازانن کە مەبەست و حیکمەت لە زیندوو بوونەوەی ڕەستاخیز پاداشت دانەوەی چاکانەو تۆڵە سەندن لە خراپان و تاوانبارانە. ئەوەیش لەم جیهانەدا ناگونجێ، چونکە ئەم جیهانە تەنها جێگای تاقی کردنەوەو کردەوەیە، ئەبێ ئەم بڕوات و جیهانێکی تر بێت، کە هەر جێگای پاداشت و تۆڵە سەندن بێت. زیندوو بوونەوە هیچ جێگای سەرسوڕمان نی یە، چونکە لە یەکەم جارەوە چۆن پەیدا بوو؟ کێ فەراهەمی هێنا؟ هەر بەو جۆرە ئەبێتەوەو ئەو کەسە فەراهەمی ئەمێنێتەوە، وەکو خوا ئەفەرموێ: ﴿کما بداکم تعودون﴾.** [1]

**ئینجا ئەیانترسێنێ: بە هیلاك دا چوون و بەرباد بوونی وێنەی ئەوان لە تاوان و بێ باوەڕی دا لە گەلەکانی پێشوو ئەفەرموێ: ﴿أَهُمۡ خَيۡرٌ أَمۡ قَوۡمُ تُبَّعٖ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ﴾ ئایا ئەوانە چاکترو هێزو دەسەڵاتیان زیاترە یان گەلەکەی(توبەع) ی حیمیەری، ئەو قەوم و گەلانە کە لە پێشیانەوە بوون؟ ئەوانەمان هەموو بە هیلاك دا برد، هۆی بەرباد کردنیان و فەوتانیان ئەوەبوو کە بێگومان ئەوانە هەموو تاوانبار بوون، واتە ئەو شتەی کە هۆی سزاو بە هیلاك بردنی ئەوانە لەمانیش دا هەیە، کەواتە بترسن لەوەی وەکو ئەوانیان لێ بکرێ و وێنەی بەسەرهاتی ئەوانیان بەسەر بێت.**

---

[1] واتە هەرچۆن لە یەکەم جارەوە فەراهەمی هێنان هەروا دووبارە ئەبنەوەو ئەگەڕێنەوە.

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾

---

**ئینجا لەم کاتەدا کە بیم و ترس ئەخاتە دڵیان و وریایان ئەکاتەوە، بۆ روانین و بیر کردنەوە لە داڕشتنی ئەم بوونەوەرە گرنگە لەسەر بارو جۆرێ کە هەموو عاقڵێ تیایدا سەرسامە، بەڵکو بەم بیر کردنەوە تێ بگەن کە ئەم کارە گرنگە لە خۆڕایی نەکراوە، بۆ مەبەستێکی زۆر بەجێ و راست و حەق فەراهەم هێنراوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی وا لە نێوانیان دا دروستمان نەکردووە بە جۆرێ گاڵتەمان کردبێ، بێ ئامانج و مەبەست ، هەروا بەتاڵ و خۆڕایی ﴿مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانەمان دروست نەکردووە بەهۆی شتێکی حەق و راست نەبێ، کە دەلیل و بەڵگە هەیە لەسەری کە بریتی یە لە ئیمان و گوێ رایەڵی، یان زیندوو بوونەوەو لێ پرسینەوە لە کردەوەکان، بەڵام زۆرتری ئەوانە نەزانن، چونکە تێڕوانین و تێفکرانیان کەمەو بێ هێزە، پەیوەندی و موناسەبەتی دروست کردنی ئاسمانان و زەوی و زیندوو وردەو نادیاریی، بەڵام سروشتی ئادەمی ئاسان تێ ی ئەگات کاتێ بەم جۆرە قورئانی یە تەمێ بکرێ، چونکە بیر کردنەوە لە عەجایەبی ئەم دەست کردەی خوا کە هەموو بە جۆرێکە کۆمەکی و پەیوەندی هەیە لەنێوانیان دا، دەست نادەن بۆ کەم کردنەوەو زیاد کردن، هەموو پارچەیەك پێك هاتووە لە چەند شتێك بە رادەیەکی دیاریی کراو، دووری و نزیکی ئەم هەموو رژێمە رێکە دامەزراوە نەگۆڕاوە، وەکو لە چەند شوێنی تردا بە درێژتر ئەم باسە کرا، بیر کردنەوە بەم جۆرە دڵ پڕ ئەکات لە ئیمان بەمەی کە دروست کردنی ئەم بوونەوەرە لە خۆڕایی نی یە، بۆ مەبەستێك و ئامانجێکی بەنرخ دروست کراوە، بە باشی ئیمان پەیدا ئەبێ کە پێویستە هاتنی رۆژی دوایی، پێویستە بەرهەم و پاداشت و تۆڵەی و**

پاشەرۆژێکی دیاریی بۆ ئەم هەموو چاکەو خراپەی کە لەم زەوی یەدا کراوە، نەهاتنی ئەو ڕۆژە زۆرپێچەوانەی دادو عەدالەتی خوایە، لەبەر ئەوە لە پاش تەمیٚ کردن بە بیر کردنەوە لە حیکمەتی ئەم بوونەوەرە ئەم فەرمودەیە دێت: ﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَـٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ * يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ * إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ﴾ بێگومان ڕۆژی دوایی کە ڕۆژی جیاکردنەوەی حەق وخاوەن حەقە لەبەتاڵ وخاوەن بەتاڵ، جیاکردنەوەی مەردومە لە خۆشەویست و خزم و خوێش، ئەو ڕۆژە کاتی دیاریی کراوی بەڵێنی ئەوانەیە هەموو پێکەوە بە کۆمەڵ، ئەو ڕۆژەی کە هیچ دۆست و خزمێك هیچ سوودێك ناگەیەنیٚ بە هیچ دۆست و خزمێکی خۆی و یارمەتی نادرێن لە هیچ لایەکی ترەوە جگە لەو کەسەی کە خوا ڕەحمی پیٚ کردبیٚ بە لیٚ بوردن و بە وەرگرتنی شەفاعەت و نزایەك بۆی ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ چونکە بێگومان تەنیا خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، کەس ناتوانیٚ دەست بخاتە هیچ کارێکی، کەواتە ویستی عەزابی هەرکەسێك بدات هیچ کەسی تر ناتوانیٚ سوودی پیٚ بگەیەنیٚ ویارمەتی بدات، تەنهاخوا خاوەنی ڕەحم وبەزەیی ڕاستەقینەیە،کەواتەهەرکەس شایانی ڕەحم بێت ڕەحمی پیٚ ئەکات.

دوای ئەوە کە بەڵێنی دا بە هاتنی ڕۆژێکی وا کە هەموو حەق و ناحەقێکی تێدا جویٚ ئەکرێتەوە، ئەبیٚ ڕێزو پاداشتی چاکەو چاکەکان بدرێتەوە، خراپی تاوان ڕوون بکرێتەوەو تۆڵە بسێنریٚ لە تاوانباران، پاش ئەوە ئینجا دوو نموونە باس ئەفەرمویٚ لە سزاو عەزابی سەختی تاوانباران و نازو ڕێزی پیاوچاکان، بۆ نموونە سزای سەختی تاوانباران ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ * طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ * كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ * كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ﴾ بەڕاستی درەختی زەقوم خۆراکی تاوانبارو گوناهکاری هەرە گەورەیە – کە بریتی یە لە کافر – ئەو زەقومە کە ئەیخۆن لە سکیان دا وەکو زەیتی زۆر گەرم کە لە گەرمی دا گەیشتبێتە ئەوپەڕی پلە – خوا پەنامان بدات – لەم درەختە پیسە لە سورەتی ﴿الصافات﴾ دا بە درێژیی باسمان کرد، بە کورتی خوا دروستی کردووە لەناو ئاگرداو لە ئاگرە، دەرخواردی تاوانباران ئەدریٚ، ئەوانەی کە لە دنیادا سەرکێشی ئەکەن، لائەدەن لە ئایین و بەرنامەی خوا، ئەو خواردنەیان دەرخوارد ئەدریٚ،

خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٥٢﴾ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾

ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێ بەو مەلائیکەتانەی کە کاروباری دۆزەخی داونەتە دەست: ﴿خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ بیگرن و رایکێشن بە رووودا بە لێدان تا ئەیبەنە ناوەڕاستی دۆزەخ. ﴿ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ﴾ ئینجا پاش ئەوە لەو ئاوەی کە بە دۆزەخ گەرم کراوە بکەن بەسەر تەوقی سەریان دا – خوا پەنامان بدات، آمین –، ئینجا سەرباقی ئەم هەموو سزاو ریسوا کردنە فەرمان ئەدات کە لاقرتی یان پێ بکەن و تەشەریان لێ بدەن بۆ سزادانی دەروونیشیان ئەفەرموێ: ﴿ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ﴾ بڵێن پێی: بیچەژە، چونکە تۆ کەسێکی زۆر دەسەڵات دارو خاوەن رێز بوویت، واتە لە دنیادا خۆت وات ئەزانی و وات پیشان ئەدا لەبەر ئەوە سەری بەندەییت بۆ خوای خۆت شۆڕ نەکرد بخۆ ئەوە دەردت بێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ﴾ بێگومان ئەم سزاو عەزابە ئەوەبوو کە گومانتان بوو تێیدا لە دنیاداو دەمبازی و موجادەلەتان تیادا ئەکرد، ئینجا دێتە سەر باسی نموونەیەك لە رێزو نازو نیعمەتی چاکان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ * فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ * يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ بێگومان لە خوا ترسەکان: ئەوانەی کە لە دنیادا گوێ رایەڵی خوای خۆیان بوون و ترسی رۆژی دواییان لە دڵ دا، ئەوانە لە رۆژی دواییدا وان لە شوێن و ماوایەك دا، نیشتەجێن لە جێگایەك دا کە مەترسی تێدا نی یە لە هیچ ناخۆشی و نەبوونی و کەم و کوڕی و بڕانەوەو هیچ شتی تر کە دڵ گەرد بگرێ پێی، وان لە بەهەشتان و باغ و باخچەو کانیاوان دا، لە ئاورێشمی تەنك و ئەستوور جل و بەرگ ئەپۆشن، واتە پۆشاکیان لەو دوو جۆرەیە، لە دانیشتن و کۆبوونەوەیان دا روو بە رووی یەکتر دائەنیشن کە جوانترین شێوەی دانیشتنە.

كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾

---

﴿كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾ شتی ئاوایان ئەدەینێ، لەگەڵ ئەوەدا ئافرەتی جوانی سپی و چاوڕەشی چاوقەوی ئەکەین بە حەلاَڵ و هاوسەریان ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ﴾ لەو بەهەشتانەدا داوای هەموو جۆرە میوەیەك ئەکەن بێ مەترسی لە نەبوون و پێ نەدان و دوایی هاتنی و هیچ زیانێك. ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾ جگە لە یەکەم مردن ئیتر مردنی تیادا ناچەژن، ﴿وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەیانپارێزێ لە سزای دۆزەخ و ئاگری بەتین، واتە لەگەڵ ئەو هەموو نازو نیعمەتە گەورانەدا لە هەموو بابەتەوە شتێ گەورەترو بەنرخترە ئەمەیە ئەیانپارێزێ و رزگاریان ئەکات لەسزای ئاگری دۆزەخ – خوا پەنامان بدات – آمین.

﴿فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ﴾ ئەو هەموو بەخشایش و نیعمەتە کە پێ یان ئەدرێ هەمووی بە لوتف و فەزڵ و رەحمێکە لە لایەن پەروەردگارتەوە وەکو لە حەدیسی سەحیح دا ئەفەرموێ: ﴿اعملوا وسددوا وقاربوا و اعلموا أن أحدا لن يدخله عمله الجنة، قالوا: ولا انت يا رسول الله؟ قال: ولا انا إلا ان يتغمدني الله برحمة منه و فضل﴾ ئەمە شتێکی ئاشکرایە، چونکە خوای گەورە هیچ جۆرە پێویستی یەکی نی یە نە بە ئێمەو نە بە هیچ کردەوەیەکمان، زیاد لەوە ئەگەر خوا بکەوێتە حەق‌و حیساب و مامەڵە لەگەڵ ئێمەدا، هەرچی کردەوەمان هەیە، نیعمەتێ لە نیعمەتەکانی خوا ناژێ، کەواتە ئاشکرایە ئەوە هەموو فەزڵ و بەزەیی رووتە، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ ئەوەی کە خوای گەورە ئەیدا بە بەهەشتیان، هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورە، بەڕاستی هیچ شتێکی تر ناگونجێ هاوتایی ئەوە بکات، چونکە ئەو لوتفەی کە ئەیکات لەگەڵ ئەوانەدا کە بریتی یە لە رزگارکردن لەهەموو ناخۆشی یەك، گەیاندنە بە هەموو ئامانجێکی تر ئیتر نەبێ چ شتێ تر بگاتە ئەوە؟

ئینجا سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە بیرخستنەوەی نیعمەتی پێغەمبەرێتی، ترساندن لە تۆڵەو پاشە ڕۆژی باوەڕ نەهێنان و دوایی هێنان بەوە وەکو خولاسەو کورتەیەك بۆ مەبەستی سورەتەکە، زۆر ڕێکە لەگەڵ یەکەم جارو سەرەتادا، لەگەڵ ڕێگا و ڕچەی دا، چونکە ئەوە بوو سورەتەکە دەستی پێ کرد بە باسی هێنانە خوارەوەی قورئان، بۆ ترساندن و ئامۆژگاری لەپاش ئەوە لە ناوەڕاستی دا هەڕەشەی کرد بەو سزای کە بێ باوەڕەکان دووچاری ئەبن، ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ ئەم قورئانەمان سووك و ڕوون و ئاسان کردووە بەمەی کە هێناومانەتە خوارەوە بە زمانی تۆ ئەی پێغەمبەر، ئەمەیشمان هەر لەبەر ئەوە کردووە کە ئەوانە تێ بگەن و بە هۆی ئەوەوە بیر بکەنەوەو وەری گرن و ئینجا ڕەفتاری پێ بکەن، کەواتە هیچ بەهانەیەکیان نی یە، ئەوەی کە ئیمان ناهێنێ موستەحەقە بۆ سزای خواو دووچاری ئەبێ ﴿فَارْتَقِبْ﴾ کەواتە چاوەڕوانی بکە بۆ ئەوەی کە بەسەریان دێت ﴿إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ﴾ بێگومان ئەوانیش چاوەڕوانن و بەتەمای ئەوەن کە تۆ دووچار ببی، واتە ڕاوەستە لەمەوپاش ئەزانن چییان بەسەر دێت، ئەو هەڕەشەی خوا هاتە جێ پاش ماوەیەکی کەم ئەو هەموو سەرۆکانی کوفرە، لە دنیادا بە ڕیسوایی بەرباد بوون و چوون بەرەو سزای سەختی نەبڕاوەی دۆزەخ، پێغەمبەر(ﷺ) بە تەشەرەوە دای بە ناوچاویان دا وەکو پەڕاوی سیرەت و حەدیسە سەحیحەکان باسی ئەفەرمون: کاتی لە غەزای بەدر بوونەوە، ئەوانە هەموو کوژران پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا کە لەشی ئەوانە بشارنەوەو بیانخەنە ژێر خاك، ئەم جار یەکە بە یەکە بە سەرۆکەکانی فەرموو: ﴿یا فلان بن فلان انا قد وجدنا ما وعدنا ربنا حقا، فهل وجدتم ما وعدکم ربکم حقا؟﴾ خوا بە لوتف و بەزەیی خۆی پەنامان بدات لە غەزەب و سزای خۆی و ڕێنموونیمان بکات هەموو کات بۆ ئەوەی کە ڕەزامەندی لەسەرە.

# سورەتی (الجاثیة)
## مەککەیی یەو ٣٧ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە باسی بەشێ لە کردەوەو ڕەفتاری بت پەرستەکان ئەکات بەرامبەر بانگ کردن و بانگەوازەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ڕێگەو ئایینی خوا، ڕێگەو ڕەوشتیان پیشان ئەدا لە بەرەنگاری کردن و بەربەرەکانێی دەلیل و بەڵگە ئاشکراکانی خوادا. هەروەها کەللە ڕەقی و سەرکێشی و بێ دەماغییان لەئاستی ئەو بیرو باوەڕەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندن، لەگەڵ ئەوەدا روونی ئەکاتەوە چۆنیەتی هەوڵ دانی قورئان و تێکۆشانی بۆ چارەسەرکردنی ئەو دڵە سەرکێشانە کە بە وێڵی و سەرگەردانی کەوتبوونە شوێن ئارەزووی نەفسیان، بەجۆرێ لە حەق و هیدایەت و ڕێگا راستەکەی خوا لایان دابوو.

ئەم سورەتە مەبەستەکانی خۆی پیشان ئەدات بە ئارام و نەرم و نیانی و لەسەر، پێچەوانەی سورەتی ﴿الدخان﴾ کە بە توندو تیژیی و هەڕەشەیە.

خوای گەورە کە ئەم دڵانەی دروست کردووە، بە جۆرێ قورئانی بۆ هێناونەتە خوارەوەو لەگەڵیان ئەدوێ بەسە بۆ چارەسەرکردنی هەر دڵێ کە دەست بدات بۆ تیمارو چارەسەر کردنی، کەواتە هەر دڵێ بەم قورئانە چارەسەر نەکرا ئەو دڵە نەحس و نەگبەت و چارە ڕەشەو بێ بەشە لەهەموو خێرو چاکەیە.

ئەم قورئانە هەموو فەرمان و مەبەستەکانی ڕێکە لەگەڵ سروشتی هەموو ژیریی یەك دا، ئەو فەرمان و مەبەستانەی ڕائەگەیەنێ هەندێ جار بە داچڵەکاندن و توندو تیژیی، هەندێ جار بە کورتی و لەسەر خۆو نەرم و نیانی، هەندێ جار بە کورتی دەلیل ئەهێنێتەوە، هەندێ جار بە درێژیی، ئەمانیش، هەموو بەو شێوە نایابە قورئانی یە کە لە هیچ زمانێك دا وێنەی نەبووەو نایشبێ و هەرگیز نەگونجاوەو نایشگونجێ، لە تواناداا نی یە لاسایی کردنەوەی، پاش ئەوەی بە کورتی مەبەستەکانی ئەم سورەتەمان باس کرد،

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٣﴾

---

ئینجابابەدرێژیی دەست پێ بکەین: بە یارمەتی خوا: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *حمٓ* تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەو کتێبە کە قورئانە لە لایەن خوایەکەوەیە کە ناوی ﴿الله﴾ یە، زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، هیچ شتێ لە دەستی قودرەت و توانای دەرناچێ، هەموو کردەوەو کاروبڕیاری بەجێیە، هەمووی پڕ لە حیکمەت و(بەرژەوەندی یە).

ئەم دوو سیفەتە پیشانمان ئەدەن کە قورئان لە توانای هیچ کەسێك دا نی یەو نیە وێنەی بێنێ، هەر ڕێگایەکی تر بدرێتە بەر هەمووی لارەو لەکەدارەو ئەوەی پێیدا بڕوا وێڵ و سەرگەردان ئەبێ لەهەردوو جیهان دا، وەکو لە دوو پیتەکەیشتەوە وەرئەگیرێ: ﴿حمٓ﴾ کە ئەم قورئانە لە لایەن خواوە هاتووە، ئەویش بە گوێرەی فەرمودەی زۆر لە زانایان مەبەست بەم پیتانە دڵ بێدار کردنەوەیەو جاڕدانە بەو مەبەستە گرنگە، وەکو فەرموێتی: ئاگادار بن کە ئەم قورئانە لە لایەن خواوە هاتووە چوون ئەوەتە پێك هاتووە لەم پیتانەو وێنەیان کە ئێوە قسەو گفتوگۆی خۆتانی لێ پێك ئەهێنن لەگەڵ ئەمەدا ناتوانن لاسایی بکەنەوەو وێنەی کەمترین سورەتیش بڵێن چ جای هەموو یان چەند سورەتێکی، ئەوە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نی یە، چونکە لە هەموو شتێك دا کردەوەی خوا هەروایە، بۆ وێنە: خوا لەخاك ئادەمی و ئەم هەموو گیانلەبەرانە دروست ئەکات، بەڵام ئادەمی خشت و کاشی و ئەو جۆرە شتانەی لێ دروست ئەکات، بەڕاستی گەیاندنی ئەو مەبەستە گرنگە بکرێ بە هۆیەك لەهۆی هێنانی ئەم پیتانە زۆر جێگای باوەڕە، چونکە بێ ئەرك و گرێ ئەچێتە دڵ و بەڵگەش هەیە لەسەری، ئەوەتا ئەو بیست و نۆ سورەتە کە ئەم پیتانەیان لە پێشەوە هەیە بیست و هەشتیان لە پاش پیتەکانەوە باسی قورئان و هاتنە خوارەوەی قورئان ئەفەرموێ.

ئینجا پێش هەموو شتێك چەند دەلیل و نیشانەیەکی روون و ئاشکرا پیشان ئەدات لەم بوونەوەرەدا، دڵ بێدار ئەکاتەوە پێ یان، ئەو دەلیل و نیشانانەی کە بەس بۆ روو کردنی دڵ

له ئیمان و هەست کردن بەو خوایەی کە ئەم قورئانە هێنایە خوارەوە، ئەم بوونەوەرەی دروست کرد، بە بیر کردنەوە لەم دەلیل و نیشانەدا دڵ بێدار ئەبێتەوە، قوفڵ و قاپی ئەکرێتەوە مەگەر دڵێ کە زیندوو نەبێ، بێ بەش بێ لە هەموو فام و تێگەیشتنێك، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان چەندەها دەلیل و نیشانەی ئاشکرا هەیە لە ئاسمانەکان و زەوی دا بۆ ئیمان و باوەڕدارەکان، ئیمان و باوەڕ لوتف و بەخششێکە لە لایەن خواوە قاپی دڵ ئەکاتەوە بۆ بیستنی بانگ کردن و بینینی رووناکی و وەرگرتنی نم و تەڕی یەك کە ئەبێتە هۆی زیندوو بوونەوەو لابردنی وشك و مردوویی، واتە بەهۆی ئیمان و باوەڕەوە دڵ زیندوو ئەبێتەوەو بەهۆی ئەوەوە ئەبیستێ و ئەبینێ، هەست پەیدا ئەکات بەو هەموو دەلیل و نیشانانەی کە بە زۆری پرژو بڵاو بوونەتەوە لە ئاسمان و زەوی دا، تێ ئەگات لەو شایەتیانەی کە ئەو هەموو دەلیل و نیشانانە ئەیدەن و ئەو هەموو دان پێدانانەی کە لە لایەن هەموو پارچەو ئەندامێکی ئەم بوونەوەرە ئەدرێ لەسەر ئەو خوایەی کە ئەم ئاسمانانە و زەوی یەی دروست کردووە، ئەو دەلیل و نیشانانەی کە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەن بریتی نین لە هەندێ شت و نەك هەندێ تر یان لە بارو روویەك و نەك لە بارو روویەکی تر، بەڵکو دڵی زیندوو چاو هەڵئەخات بۆ هەر لایەك چەندەها دەلیل و نیشانەی تر ئەبینێ، دێن بە پیریەوە لەم بوونەرە نایابەدا، ئایا چ شتێ هەیە نیشانەو بەڵگەیەکی روون نەبێ لەسەر ئەو کەسەی کە دروستی کردووە؟

ئەم ئاسمانانە بەم هەموو مانگ و خۆر و ئەستێرەی زۆرو گەورە گەورانە کە لەگەڵ زۆر گەورەیی یەکەیان دا پرژو بڵاو بوونەتەوە لە فەزاو بۆشایی یە زۆر گرنگەدا، وەکو گوڵ و گۆی رووناك جوان و شیرین و رازاوەیان کردووە. چەرخەو گەردش و خولانەوەی ئەم هەمووە بە وردی و رێکی و نەگۆڕان و نەوەستان نە چاو تێر ئەخوات لە تەماشا کردنیان و نە دڵ بێ تاقەت و یاس ئەبێ لە بیر لێ کردنەوەیان.

ئەم زەوی یە زۆر گەورە فراوانە کە هەموو ئادەمی و هەموو دانیشتوانی سەری نموونێکیان نی یە لە ئاستی، ئەم زەوی یە گەورە وەکو هەڵماتێ وایە لەچاو ئەستێرە

گەورەکان دا، لەچاو ئەو بۆشایی و فەزایەی کە تێیدایە، بە جۆرێك ئەگەر دەستی قودرەتی خوا راگیری نەکات و نەیهۆنێتەوە، لەگەڵ ئەستێرەکانی تر وا بێ سەرو شوێن ئەڕواو ون ئەبێ، لە هیچ شوێنێکەوە هەر دیاریش نابێ.

دروست کردنی ئەم زەوی یە بە جۆرێك کە گونجاوە بۆ پەیدا بوون و مانەوەو پەرەسەندنی بوون و ژیان بەسەر پشتی یەوە بەهۆی فەراهەم هێنانی چەند شتێکی تایبەتی تێیدا کە بە یەك گرتنی هەموو، کۆمەکی هەموو ژیان بەسەر ئەچێ، ئەگەر یەکێ لەو شتانە نەبێ یان باری بگۆڕێ ژیانی ناگونجێ، وەکو رادەی دووری لەخۆرو مانگ و رادەی ئەو گەڕان و خولانەوەی کە شەوو رۆژو چوار وەرزی پێ فەراهەم دێت، هەروەها پەیدا بوونی ئاوو هەواو ئەندازەی قەبارەیان و پێك هێنانیان لەو چەند کەرەسەی کە لێ ی پێك هاتوون بەو رادە تایبەتی یە، هەروەها چەندەها شتی تر کە هەندێکی ناسراوەو باس کراوەو زۆربەیشی کە هەیە هێشتا نەزانراوە.

هەموو زیندوویەك لەم زەوی یەدا بەڵکو شتێکی نیشانەو دەلیلێکی روونە، هەموو پارچەو ئەندامێك لە هەموو زیندوویەك، بەڵکو لە هەموو شتێك نیشانەو دەلیلێکی روونە، بچووکی ورد وەکو قەڵەوی گەورە، نیشانەیەکی روونە، گەڵایەکی بچکۆلە لە درەختێکی گەورەدا یان پەلە گیایەکی باریکی لاواز، نیشانەیەکی روونە، شێوەو شکڵەکەیان و رەنگ و قەبارەو ئەندازەکەیان، هەموو نیشانەیەکی روون و ئاشکران، هەروەها هەرچی بگری بەدەستەوە لەهەموو بارو روویەکەوە دەلیل و نیشانەیەکی روون و ئاشکران، بەڵام بۆ ئیمان و باوەڕ دارەکان، هەروەها ئەوانەی دڵیان ئامادەیە بۆ باوەڕ هێنان، ئەو دڵانە وەك چرایەکی رێك و پێك وانە کە تەنها داگیرسانی مابێ، ئەو دڵانەیش کە تەنها بیریان کردەوە لەم هەموو دەلیل و نیشانانە هیچیان ناوێ، هەر بەو خوای خۆیان ئەناسن، ئەوانەیش کە ئیمانی رێك و پێکیان هەیە بە بیر کردنەوە لەم هەموو دەلیل و نیشانانەدا یەکجاری ئیمانەکەیان بەهێزتر ئەبێت، هەتا بێت پلەیان بەرزتر ئەبێتەوە لە ناسینی خوادا.

ئینجا لە ناوچەکانی بوونەوەرەوە ئەمان هێنێتەوە بۆ تەماشا کردن و بیرکردنەوە لەو دەلیل و نیشانە روونانە کە هەن لە نەفسی خۆمان و هەموو گیانلەبەرانی تردا ئەفەرموێ: ﴿وَفِي خَلۡقِكُمۡ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٞ﴾ چەندان دەلیل و نیشانەی روون و ئاشکرا هەن لە دروست کردن و فەراهەم هێنانی خۆتان، ئەو هەموو گیانلەبەرەی کە بە زۆری دروستی کردووەو پرژو بڵاوی کردووەتەوە لە زەوی دا، بێگومان تەماشا کردنی ئادەمی و بیر کردنەوە لە دروست کردنی بەم شێوەو شکڵە رێکە، بەم هەموو هەست و هێزو وزەو زانین و ئامادەیی و لێ هاتنی بۆ ئەو هەموو فەرمان و ئیش و کارە گرنگە، بەم هەموو جیاوازی دەنگ و رەنگ و سورەتەوە، تەماشاکردن و بیرکردنەوە لە ئادەمی هەر بەم دیمەن و شێوە ئاشکرایش بەسە بۆ هەر کەسێ کەمێ فام و هەست و تێگەیشتنی هەبێت، بەسە بۆ ئەمەی دڵی پڕ ببێ لە ئیمان و بڕوا بەو خوایەی کە ئەو شتە نایابانەی دروست کردووە. بەسە بۆ هەست و باوەڕ بە دەسەڵات و تواناو حیکمەتی بێ سنووری، بیرکردنەوە بەم جۆرە سادە لەم دیمەن و شێوە ئاشکرادا بەسە و هیچی تری ناوێ چ جای بە وردی لە تەنها خەلیەیەکەوە بیهێنێ و بەو هەموو قۆناغانەی کە بەسەری دا دێت، ئینجا دواترین قۆناغێ کە ئەم ئادەمی یەی لێ پێك هاتبێ، بەو هەموو جیهازو کۆئەندامی جیاوازی سەر سوڕهێنەرەوە، ئەگەر بەم وردی یە بیری لێ بکرێتەوە هەر پێك هاتنی تەنها پارچەیەك لە ئەندامێکی بەسە بۆ ئەمەی لە ئاستی بوەستێ، لە سەرسامی لەو شتە نایابانەدا بەسەر گەردانی یەوە هەر سەرت بگێڕی و چەرخەی پێ بکەی.

ئەم جۆرە شتانە هەرچەندە ئاشکران، بەڵام بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە لەپێش چاو گرنگی و نایابییان نامێنێ لەبەر ئەوە قورئان ناو بەناو ئاوا سەرنج رائەکێشێ، دڵ بێدار ئەکاتەوە، بەجۆرێ تەڕو تازەیان ئەکاتەوە لە هەندێ جاردا وا ئەکات وەکو ئەمەیە یەکەم جار بێت بیان بینی.

لەهەموو شت نایابترو گرنگتر گیانە. کە شتێکی نهێنی وایە هەموو تێیدا سەرسامەو هیچی لێ نازانێ، گیان لە ئەمیبادا کە خاوەنی تەنیا(خلیە) یەکە کە موعجیزەیەکی وایە هەموو سەرسامە تێیدا چ جای گیان لەبەرانی تر بە تایبەتی ئادەمی کە گیانەکەی جیاوازە لە هەمووان.

ئینجا لە ئادەمی یەوە بێن بۆ گیانلەبەرانی تر بەو هەموو تیرەو جۆرەوە کە جگە لە خوا کەس ژمارەیان نازانێ، هەریەکە بەشێوەو شکڵێکی تایبەتی و قەبارەو لەشێکی تایبەتی، بچووکی وەکو گەورەی موعجیزەیەکی تایبەتی یە، ئینجا رۆزی و خۆراك دانی ئەم هەمووە بە جۆرێك کە رێك بێت لەگەڵ ژیان و مانەوەو هێشتنەوەی ئەم هەموو تیرەو جۆرانەدا لە سنوورێکی دیاریی کراودا نەك بەجۆرێ بەهێزو زۆردارەکانی ئەوەندە پەرە بسێنن بێ زۆرو بێ هێزەکان بەرباد بکەن، بۆ وێنە: لەناو باڵندەدا نەسرو هەڵۆو واشە کە زیان ئەگەیەنن تەمەنیان درێژە، بەڵام هێلکەکانیان زۆر کەمە چونکە ئەگەر وەك چۆلەکە پاساری هێلکەو بەچکەیان زۆر بوایە هەموو باڵندە بێ دەسەڵاتەکانی تر نەئەمان بەو تەمەن درێژیی یەی تیرەکە ئەمێڵێتەوەو یەکەم بەچکەی باڵندە لاوازو بێ دەسەڵاتەکان ئەپارێزێ لە بەرباد بوونیان. هەروەها گیانلەبەرە درندەکان وەك شێرو پڵنگ. تەنها مێشێك لە یەك نۆبەدا هەزارەها گەراو بەچکە فڕێ ئەدات لە لایەکی ترەوە بەرگری ئەو زۆری یەی کردووە بەمەی کە هەموو چین و تاقمێ ماوەی دوو هەفتە ئەژین، ئا بەم جۆرە دەستی قودرەت جڵەوی کارەکەی گرتووە لە هەموو شتێ لەمانەی باس کران بە وێنەو نموونە بۆ ئەوەی کە نەگوتراوەو نایەتە ژمارە، لە هەموو ئەوانەدا لە گوتراو نەگوتراو چەند دەلیل و بەڵگەی روون هەیە لەسەر خوایەتی خواو تواناو دەسەڵات و زانین و حیکمەتی بێ وێنەو بێ سنووری بەڵام ئەو هەموو دەلیلە روونانە بۆ هەموو کەس نین، بەڵکو ﴿لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بۆ کەلێکە کە تێگەیشتن و زانینی راستەقینە و تەواویان هەیە بەهۆی ئەوەوە شتی راست وەرئەگرن بە ئارامەوەو لەسەرخۆ و ئاسانی و رەحمەتی بێ دڵەچرکێ و دوو دڵی. ئینجا بیر کردنەوە لەخۆمان و هەموو گیانلەبەرانەوە ئەمانگوێزێتەوە بۆ بیرکردنەوە لە شەوو رۆژو باران و باو گێران و گۆڕاندنی هەردەمە بە بارێك دا و بەلایەکدا،

وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزۡقٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٥﴾

---

**ئەفەرموێ:** ﴿وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزۡقٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ **چەند دەلیل و بەڵگەی روون هەیە لە گۆڕانی شەوو رۆژو هاتنیان بەدوای یەك دا، لەو شتەی کە هۆی رۆزیو خۆراکە و خوا لای ئاسمانەوە هێناویەو ئەیهێنێتە خوارەوە، ئینجا بەوە زەوی زیندوو ئەکاتەوە لە پاش مردنی و هەروەها لە گۆڕاندنی بایەکان هەردەمە لە لایەکەوە، لەمانەدا هەموو چەند دەلیل و نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ قەوم و کۆمەڵەی کە فام و ژیرییان هەیە، بێگومان ئەمانە زۆر زۆر گرنگن و وان لە پێش چاویشەوەو هەرکەسێ عەقڵ و فامی هەبێ ئەبێ هەست بکات بە شایەتی دانی ئەمان لەسەر گەورەیی و توانای بێ سنووری خوای پەروەردگاری هەموو، هەرچەند شتەکە زۆر روونە، بەڵام بۆ بێدار کردنەوەی دڵی خەوتووو بێ ئاگا چاك وایە هەندێ بە درێژ تر لێ یان بکۆڵینەوە وەکو ئەو دوو کۆمەڵە دەلیلەکەی پێش ئەم سێ یەمە کە گۆڕانی شەوو رۆژە، گۆڕانی شەووڕۆژ هەرچەندە بەهۆی زۆر روودانیانەوە دەقیان پێوە ئەگیرێ و سەر سوڕمانیان تێدا نامێنێ، بەڵام کاتێ بیر بکرێتەوە لە یەکەمجاری هاتنیان کە رووناکی ئەڕوات و تاریکی دێت، لەو باریشەوە تاریکی ئەڕوات و رووناکی دێتە جێ‌ی، هەرکات دڵی تێگەیشتوو خاوەن هەستەکە بیر بکاتەوە لەو گۆڕانە، یان نایابیەکەیان لە پێش چاوی تازە ئەبێتەوە وەکو ئەوە یەکەم جار بێ بیان بینێ، بە تایبەتی بە گوێرەی زانیاری تازە بیری لێ بکرێتەوە هێجگار جێگای سەر سوڕمانە، چونکە ئەم زەوی یە بەم قەبارە گەورەو بەم هەموو دەریا و شاخ و بەرزی و چیاو ئەم هەموو شتەی وا بەسەر پشتەوە بەم هەمووەو لە بۆشایی دا ئەخولێتەوە لەبەردەمی خۆردا بەم هەموو رژێمە تەواوە نەگۆڕاوە، رادەی چەسپانی گەردش و خولانەوەکەی لە رادەیەکی دیاریی کراودا لە هەموو ٢٤ سەعاتێك دا یەك جار ئەسوڕێتەوە بە دەوری خۆی دا بەهۆی ئەوەوە شەوو رۆژ پەیدا ئەبێ لە شوێنی یەکتر لە پارچەو ناوچەکانیدا بە جۆرێك کە رێکە**

لەگەڵ ژیان بەسەریەوە، بیر کردنەوە لە پەیدا بوون و گۆڕانی شەوو ڕۆژ بەم جۆرەی کە هەیە هەموو کات جێگای سەرسوڕمانە، هیچ کاتێ لای دڵی فامداری بێدار نایابیەکەیان کەم نابێ و هەر جێگای سەرنج دان و سەرسوڕمانن، لە کاتی ئەو بیر کردنەوەدا چاوی دڵ ئەو دەستە قودرەتە ئەبینێ کە ئەم شەوو ڕۆژە فەراهەم ئەهێنێ، ئەیانهێنێ بەدواو شوێنی یەك دا.

ئینجا دێتە سەر باسی ئەو ڕزق و ڕۆزی یەی کە خوا ئەیهێنێتە خوارەوە، ئیتر مەبەست پێی تەنها باران بێت یان لەگەڵ ئەوەدا مەبەست ڕووناکی خۆرو گەرمیەکەیشی بێت، بەهەر جۆر بیگری دەلیلێکی زۆر ڕوونە.

خوای گەورە ئەم هەموو دەریای دروست کردووەو ئاوی بە جۆرێك دروست کردووە ئەگونجێ ببێ بە تەم و هەڵم، تیشکی خۆری زاڵ کردووە تا ئەیکات بە هەڵم و بوخار، بای دروست کردووە کە ئەو هەڵم و بوخارە هەڵگرێ و بەرزی ئەکاتەوە لەو ڕادە تایبەتی یەدا ڕاگیری ئەکات، بەهۆی ساردی یەوە ئەم هەموو تەمو بوخارە لەسەر یەك تەپە ئەکات، ئینجا بەهۆی کارەبا یان هەر شتێکی تر ئەیبارێنێ بەسەر وڵاتان داو پێی زیندوو ئەکاتەوە، ئەوەی ئەچێتە ناو سکی زەوی بە کانی و ڕووبار دەری ئەهێنێ و بەم جۆرە هاتوچۆی پێ ئەکات، هەرکەس بیر بکاتەوە لەم شتە گرنگەو پڕی دڵی ئەبێ لە ئیمان بەو پەروەردگارە کە ئەم شتانە فەراهەم ئەهێنێ، بەڵام ئەو کەسەی بیر ناکاتەوە ئەوا ئەو کەسە بێگومان چاوی دڵی کوێرەو زۆر دوورە لە فام و تێگەیشتنەوە.

ئینجا با هەندێ بیر بکەینەوە لە گێڕاندن و گۆڕاندنی(با) کان تەماشا ئەکەین لە ژوورو خوارو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە ئەگۆڕێ هەردەم لە لایەك بە بارو ڕوویەك دا، هەندێ جار بە ڕێکی هەندێ جار بە قۆرت و لاری، لە کاتێك دا گەرم لە کاتێکی تردا سارد بە ڕژێمێکی وردی ڕێك لەگەڵ پێویستی ژیان و خاوەن ژیان لەسەر ئەم زەوی یەدا، بێگومان ئەو کەسەی عەقڵ و ژیریی نەخۆش نەبێ ئەزانێ ئەم ڕژێمە ڕێکە لە خۆوە نابێ، ئەبێ کەسێ دەسەڵات و زانینی بێ سنووری هەبێ ئەم شتانە بەجێ یە ئەهێنێ.

تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٧﴾ يَسۡمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٨﴾

---

ئەمانە هەندێ بوون لە دەلیل و نیشانە روونەکانی ئەم بوونەوەرە خوای گەورەی بە رەحم خستیە پێش چاو بەم شێوە شیرینە قورئانیە کە دڵی بێ ئاگا دائەچڵەکێنێ، خەوتوو بێدار ئەکاتەوە، لەگەڵ عەقڵ و ژیریی دا بە جۆرێك ئەدوێ کە تێ بگات و وەری گرێ، کەواتە هەرکەس بەمانە ئیمان و باوەڕ نەهێنێ جێگای ئومێد نی یەو چاوەڕوانی ناکرێ بە هیچی تر بهێنرێتە سەر رێگای راست، ئەگەر ئەمانە کاری لێ نەکات ئیتر ئەبێ بە چ شتێك ئیمان و باوەڕی پەیدا ئەبێ؟ وەکو ئەفەرموێ: ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوە ئایەتەکان و دەلیل و نیشانە روونەکانی خوان کە ئەیخوێنینەوە بەسەر تۆدا کە حەق و راستن و لای حەقەوە هاتوون و حەقیان پێ یە، دەی ئەبێ بێ بڕواکان لەپاش خواو ئایەتەکانی ئیتر ئیمان و باوەڕ بە چ قسەو باسێ تر ئەهێنن؟ واتە هیچ قسەو تارێك ناگاتە وتاری خوا لە قورئان دا، هیچ دەست کردێ ناگاتە دەست کردی خوا لەم بوونەوەرەدا، هیچ شتێکی حەق و راست ناگاتە حەق و راستی خواو بوونی خوا لە روونی و ئاشکرایی دا، کەواتە ئەو بێ بڕوایانە ئەگەر ئیمان و باوەڕ بەخواو دەلیل و نیشانەکانی خوا نەهێنن، ئیتر ئەبێ بەچی تر ئیمان بێنن؟ دیارە هیچ شتێکی تر نی یە کاریان لێ بکات و هەرگیز چاوەڕوانی ئیمانیان لێ ناکرێ. کەواتە هەرکەس ئیمان و باوەڕی نەهێنا ئەبێ هەڕەشەی سەختی لێ بکرێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ﴾ سزای سەخت و عەزابی بەتین بۆ هەرکەسێ کە زۆر درۆزنە و دەقی گرتووە بە درۆکردن و زۆر گوناهکارو تاوانبارە، بەراستی زۆر هەڕەشەیەکی سامناکەو جێگای ترس و لەرزە، چونکە لەلایەن خوایەکەوەیە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، تۆڵەی زۆر سەختەو ئەوەی بفەرموێ ئەیهێنێتە جێ.

ئینجا نیشانەی ئەم هەڕەشە لێ کراوە روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾ نیشانەو سیفەتی ئەو زۆر درۆزنە تاوانبارە ئەمەیە ئایەتەکانی خوا، کە دەلیل و بەڵگەی زۆر ئاشکرایان تێدایە ئەبیستێ کاتێ ئەخوێنرێتەوە بەسەری دا دوای ئەوە هەر سوورو بەردەوامە لەسەر کوفرو بێ بڕوایی یەکەی، لەکاتێك دا خۆی بە زل ئەزانێ و هیچ گوێی نی یە لەو ئایەتانە وەکو هەر نەیبیستبێ وایە.

ئەم شێوە ناشیرینەو ئەم سیفەتە پیسە هەرچەندە هینی کۆمەڵێ بوو لە بت پەرستەکانی مەککە، بەڵام لە هەموو چەرخێك دا وێنەی ئەو کۆمەڵە هەر هەیەو هەر ئەیشبێ، تەنانەت لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵمانانیش دا زۆرو زەبەندە هەن و بەناو پێشیان ئەگوترێ موسڵمان! زۆر کەس هەن لایان داوە لە رێگەی راست بە پێچەوانەی ئایەتەکانی خوا، ئەو ئایەتانەیان بەسەردا ئەخوێنرێتەوە لەگەڵ ئەوەدا وەکو کەڕو کوێر ئەکەن لە ئاستی ئەو ئایەتە روونانە، چونکە یەك ناکەون لەگەڵ ئارەزووی نەفسی پیسیان دا، بە گوێرەی عادەت و باوی خراپی ئەوان نین، ناگونجێن لەگەڵ بەتاڵ و تاوان و باری لاری ئەوان دا، دەربارەی هەرکەسێ ئەو سیفەتە پیسەی تێدا بێ خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەو کەسەی کە ئەو سیفەت و نیشانانەی تێدایە مژدەی بدەرێ بە سزایەکی سەختی ئێش و ئازاردار.

مژدە بۆ شتی خێرو چاکە دانراوە، بەڵام لەزۆر جاردا بەکار ئەهێنرێ لەسزاو ناخۆشی دا بۆ گاڵتەو لاقرتی کردن بەو کەسەی کە هەڕەشەی لێ ئەکرێ بەناوی موژدە پێدانەوە، جا لێرەدا ئەمە یەکێکە لەو شوێنانە، مەبەست زیادە سزا دانی دەروونی و نەفسی یە بە گاڵتەو لاقرتی پێ کردن بۆ ریسوا کردن و ئابڕووبردن.

﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ ۖ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ ۖ﴾

---

ئەو تاقمە بەدبەختە نەگبەتە سیفەتی تری پیس تریان هەبووە کە لێرەدا باسی ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا﴾ کاتێ هەر قسەو وتارێکی پێ بگات وابزانێ کە لە ئایەتەکانی ئێمەیە دەست بەجێ دەست ئەکات بە گاڵتەو لاقرتی کردن بێ ئەمەی تێفکرێ تا بۆی دەرکەوێ ئایا هیچێ هەیە هۆی گاڵتەکردنەکەی بێت؟ واتە هەر لەبەر ئەمە کە بە فەرمایش و کەلامی خوای ئەزانێ ئەو گاڵتەو لاقرتی یە ئەکات. ئەمە ئەوپەڕی تاوان و بێ شەرمی یە – خوا پەنامان بدات لێ ی – ئەم تاوان و بێ شەرمی یەش تەنها بۆ ئەو تاقمی یەکەمە نەبووەو هەر هەیشە تەنانەت لە وڵاتی ئیسلام و لەناو رۆڵەکانی موسڵمان دا بەزۆری هەن گاڵتە ئەکەن بە ئاین و بەرنامە بێ لەکەکەی خوا، تانەو تەشەر ئەدەن لەو کەسانەی ئیمان و باوەڕیان هەیە بە تایبەتی ئەو ئیماندارانە کە ئەیانەوێ و هەوڵ ئەدەن بۆ ئەمەی جیهان و ژیان بگێڕنەوە بۆ ژێر سایەی بەرنامەو ئایەتەکانی خوا، چەندەها ئەبیسترێ ئەو نەفامە تێنەگەیشتووانە ئەڵێن: تازە ئەمانگێڕنەوە بۆ دواوە، بۆ کۆنەپەرستی لەگەڵ چەند دەم درێژیی تر پێویست نی یە بە باس کردنی ئەو نەفامانە، نە خۆیان و نە قسە ناڕەواکانیان.

خوای گەورە دەربارەی ئەو تاقمانە ئەفەرموێ: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئەوانە کە ئەوە سیفەت و نیشانەیان بۆ باس کرا، بۆ ئەوانە سزایەکی وا هەیە کە ریسواو بێ ئابڕوویان ئەکات لەباتی ئەو گاڵتەو لاقرتیانەیان، ئەو سزایەش نزیك و ئامادەیە ﴿مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ﴾ لە دوایانەوە ئاگری دۆزەخەو بێ ئاگان لێ ی هەتا ئەکەونە ناوی. ﴿وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ﴾ هەر شتێ لە دنیادا فەراهەمیان هێناوە لەماڵ و ئەولاد هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، بەرگری هیچ سزایەکیان لێ ناکات، هەروەها هەرچی ئەو بت و پەرستراوانە کە بۆ خۆیان بڕیاریان داوە جگە لە خوا، ئەوانیش هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنن کە لە دنیادا خۆیان ماندوو کرد لە پەرستنیان دا بە ئومێدی ئەوەی نزاو تکایان بۆ بکەن، کەچی بە هەموو داخ و خەفەتێکەوە جگە لە بەد بەختی و نائومێدی و سزای نەبڕاوە هیچی تریان بۆ نەماوە.

وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ

---

**﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی گەورە سەرباقی سزا ریسواکەرەکەیان، تاوانەکەیان یەکجار پیسە لەباتی گاڵتەو لاقرتیەکەیان عەزابێکی ریسواکەریان هەیە، لەبەر زۆر گەورەیی سزایەکی زۆر گەورەیشیان هەیە خوا پەنامان بدات.**

**ئینجا حەقیقەتی ئەو قورئانە - کە بێ بڕواکان لاقرتی پێ ئەکەن - روون ئەکاتەوە و دیسان سزاو عەزابی سەختیان باس ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ﴾ ئەم قورئانە رێنموونی یەکی پاکو خاوێنە بۆ هەموو بارو رێگەیەکی پاکو راست، هیچ جۆرە لاری و ون بوون و خراپەیەك نزیکی ناکەوێتەوە، ئەو کەسانەی کە کافرن و باوەڕیان نی یە بە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆیان بۆ ئەوانە سزایەك هەیە لە جۆری بەتین ترین و بەهێزترین سزایەکی ئێش و ئازار گەیەنەر.**

**بەراستی زۆر زۆر هەڕەشەکە سامناکە، حەق وایە هەموو دەمارێ لە ئاستی بێتە لەرزە، هەناسە سوار ببێ، گەروو بێتە یەك، زۆر بەم پێ یە ئەم هەڕەشە سامناکەی چەند جار فەرمووە، چونکە تاوانەکەی زۆر زۆر گەورەیە.**

**پاش ئەو هەڕەشە سامناکە، ئینجا بە نەرم و ناسکی دڵ بێدار ئەکاتەوە، بە بیر خستنەوەی ئەم هەموو نیعمەتە گرنگانەی کە ژێر دەستی کردووە بۆ ئادەمیزاد لەم بوونەوەرە فراوانەدا، ئەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ﴾ ئەو خوایەی کە ناوی ﴿الله﴾ یە زاتێکی ئەوتۆیە کە دەریای ژێر بارو ژێر دەست کردووە بۆ ئێوە بۆ ئەمەی کەشتی هاتوچۆ بکات پیای دا، بە ئەمرو فەرمانی خواو ئێوەیش وان لە ناوی دا.**

**ئەم ئادەمی یە کە لەناو زۆربەی دروست کراوەکانی خوادا هیچ چاو نادات و بەشت تەماشا ناکرێ ئەم ئادەمی یە لەگەڵ ئەوەدا رێزێکی زۆر گرنگی هەیە لای خوای گەورەو خاوەنی بەشێکی زۆر فراوانە. ئەوەتا خوای گەورەو خاوەنی ئەم مەخلوقە گەورەو زۆر گرنگانە، بەڵکو ئەم بوونەوەرەی بۆ ژێر بار کردووە هەموو جوڵانەوەو گەردش و کارو**

فەرمانیٚ بە قازانجی ئەم ئادەمی یە تەواو ئەبیٚ، هەموو ئەبێت بە خزمەت بۆی، زیاد لەوەیش خوا رێنموونی کردووە بۆ ئەمەی کە بە هەولٚ و کۆششی خۆیشی زۆر لە دروست کراوەکانی خوا بەکار بێنیٚ لە خزمەتی خۆی دا، بەو جۆرە خوا هۆی خزمەتەکانی بۆ فەراهەم هێناوە، رێگەی بەکارهێنانیشی پیشان داوەو خستوویەتیە سەر رێگاکەی. دەریا یەکێکە لەو شتە زۆر گرنگانە کە هەر بوونی پێویستە بۆ ئادەمی، یەکێکە لە هۆکانی ژیان لەم زەوی یەدا بیٚ ئەو ژیان ناگونجیٚ، سەرباقی ئەوە خوایش ئادەمی فێر کرد کە چەند سوود و قازانجی تری لیٚ وەرگریٚ. لە یەکەمجارەوە فێری کرد کە کەشتی دروست بکات بگەڕیٚ بەناو دەریادا بەو شێوەی کۆنە، ئینجا بەرەبەرە شێوەکەی گۆڕا تا گەیشتە ئێستا، ئەم هەموو پاپۆڕی گەورەو ژێر دەریاو ئوستوٚڵە کە هەموو دەریایەکی پڕ کردووە، چەند هۆیەکی فەراهەم هێنا بۆ ئەمەی کە بگونجیٚ بۆ هەڵگرتن و گەڕانی کەشتی وەکو پاڵەپەستۆی لای سەرو چەسپانی باو هێزی راکێشەری زەوی و چەند شتی تر، ئادەمیشی رێنموونی کرد بۆ دروست کردنی کەشتی بۆ ئەمەی تێیدا بگەڕیٚ، ﴿وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ بۆ ئەمەی هەولٚ بدەن بۆ دەست خستنی هەندیٚ لە بەخشایش و نیعمەتی خوا، وەکو گۆشتی ماسی و ئەو شتە بەنرخانەی کە لەناو دەریاکان دا هەیە: وەکو دووڕو لۆلۆو مەرجان و هەندیٚ شتی نایابی تر، هەم بۆ پەیدا کردنی ماڵ و سامان بە بازرگانی، بۆ وەرزش و رابواردن و سەیران کردن لە دەریاکان دا ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بەڵکو بەهۆی ئەم نیعمەتانەوە سوپاسی خوای خۆتان بکەن، بەندەیی و گویٚ رایەڵی بۆ خوای خۆتان بەجیٚ بێنن.

دوای باس کردنی دەریا بە تایبەتی، ئینجا بەشێوەی گشتی باسی ئەو هەموو شتە ئەفەرمویٚ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ هەرچی وا لەناو ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا کە بریتی یە لەو هەموو هێزو وزەو ئەو هەموو نیعمەت و خێرو بێرو بەرەکەتە، ئەمانەی هەموو ژێر دەست کردوون سوود و قازانجیان هەیە بۆ ئادەمی و هەموو پێویستی و کاروباری ژیانیان پێك ئەهێنیٚ لەم زەوی یەداو ئادەمیشی فێر کردووەو رێنموونی کردووە بۆ رێگای بەکارهێنانیان کە ئەمانەیش هەموو هینی خوا خۆیەتی، بە تاك و تەنها و لە لایەن خۆیەوە بە فەزڵ و ئیحسانی خۆیەتی بیٚ ئەمەی هیچ کەس شایان و موستەحەقی ئەوە بێت، هیچ کەس هیچ مافێکی بەسەر خواوە بێت.

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغۡفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجۡزِيَ قَوۡمَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُم بَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِۖ

---

**﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان چەند دەلیل و نیشانەی روون و ئاشکرا هەن لە هەموو ئەو شتانەدا بۆ ئەو کەسانەی کە بیر ئەکەنەوەو تێفکرانیان هەیە لە کرداری خوادا.**

**بێگومان هەر بیرو ژیریی یەك ساغ و تێرو تەواو بێت لەم هەموو هێزو وزەو دەست کردە نایابە خاوەن یاسایەدا بەم ڕێکی و یەك کەوتن و یارمەتی دانە کە هەیە لە نێوانیان دا، هەموو بیرو ژیریی یەکی ساغ لە بیرکردنەوە لەمانەوە بە گورجی ئەڕوا بۆ باوەڕو گەردن کەچی بۆ کەسێ کە ئەمانەی دروست کردووەو دای هێناون.**

**ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە تەمێی ئیماندارەکان بکات بەمەی تەبیعەتیان بەرز بێت و حەوسەڵە دار بن و چاوپۆشیان ببێ دەربارەی نەفامی و نەزانی و قسەی ناڕەوا و ناشیرین کە رووبان تێ دەکات لە لایەن بێ بڕواکانەوە، چونکە ئەمان ئیمانیان هەیە کە کانی هەموو خێرو بەرەکەتێکەو ئەمان پەیوەندی یان بە پەروەردگاری خۆیانەوە هەیە، بێ بڕواکان بێ بەشن لەو نیعمەتە گەورەو دووچاری شتێ بوون کە هۆی هەموو خراپەو بەدبەختی یەکە لە هەردوو جیهان دا، کەواتە هەقە ئەمانە گوێ نەدەن بەو جۆرە شتانە، ئەوەیشیان بۆ ئەبێ بەهۆی، ئەجرو پاداشت لای خوا: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغۡفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو کەسانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە ببورن و چاوپۆشی بکەن تا ئەوانیش وا بکەن دەربارەی ئەو کەسانەی ئەوتۆ کە باوەڕیان نی یە بەهۆی ئەوەوە مەترسیان نی یەو بە تەمای نەگبەتی و نەهات و ڕۆژە سەختەکان نین، کە خوا ئەیانهێنێ بەسەر دوژمنەکانی دا، گوێ یان نەدەنێ و لێ یان گەڕێن بۆ خوا ﴿لِيَجۡزِيَ قَوۡمَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ بۆ ئەمەی جەزای هەر کۆمەڵێ بداتەوە بە گوێرەی کردەوەیەك کە کردوویانە، واتە پاداشت و ئەجری ئیماندارەکان بداتەوە لەسەر چاوپۆشی و لێ بووردنەکەیان و تۆڵەی**

خراپەو تاوانی خراپەکاران و تاوانبارانیش بسێنێ لێ یان. ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾ هەرکەسێ کردەوەی چاك بکات ئەوە بۆخۆی ئەیکات، چونکە سوودو قازانجی بۆ خۆیەتی، نادرێ بە یەکێکی تر، هەرکەس خراپە بکات ئەوە دژی نەفسی خۆیەتی چونکە زیانەکەی بۆ سەر خۆیەتی، واتە پاداشت و تۆڵەی هەموو کردەوەیەك بۆ خاوەن کردەوەکەیە، ئینجا هەمووشتان بۆلای پەروەردگارتان ئەگەڕێنەوە، لە رۆژی دوایی دا، هەمووتان بە گوێرەی کردەوەتان رەفتارتان لەگەڵ ئەکرێ، بێگومان گرۆی ئادەمی هەموو کات پێویستی هەیە بە بیرو باوەڕێکی ئاسمانی بۆ ئەمەی کە هەموو کاروباری بڕواو جێ بەجێ بێت بە گوێرەی فەرمان و بەرنامەی خوا، چونکە تەنها بەرنامەی خوا پاك و خاوێنە لە هەموو لەکەیەك، جگە لەوە هەموویان پڕن لە نەزانی و ناڕەوایی و ئارەزوو کاری و کەم و کوڕی، ئەمە شتێکی روون و ئاشکرایە، چونکە ئادەمی خۆی ناتەواوە، کەواتە بەرنامەکەیشی بە گوێرەی خۆیەتی، لەبەر ئەوە دانانی بەرنامەو رژێم و یاسا تایبەتی یە بە خواوەو قەدەغەیە لە لایەن خواوە بۆ هیچ کەسێکی تر، بەهۆی ئەوەوە خوای گەورەی خاوەن رەحم پێغەمبەرانی رەوانە کرد بە درێژایی تەمەنی گرۆی ئادەمی یەك لەدوای یەك، دەست بەدەست تا هات گەیشتە سەر دواترین و گەورەترینی هەمووان پێغەمبەرمان(ﷺ) و علیهم اجمعین. لەپێش رەوانەکردنی ئەم دا کاربەدەستی و قیادەی ئادەمی لەژێر ئاڵای ئاین و بەرنامەی خوادا لەناو نەوەی ئیسرائیلی دا بوو، ماوەیەکی دوورو درێژ، بەڵام لە خۆیانیان شێوان و لە سنووری بەرنامەو ئایینەکەی خوا دەرچوون، بەهۆی ئەوەوە ئەو کاربەدەستی و قیادەیان لێ سەنراو درا بە کەسێ کە شایانی ئەوەیە کە حەزرەتی محمدە(ﷺ)،وەکو لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾ سوێند بەخوا کتێب و حوکمڕانی و پێغەمبەرایەتیمان بەخشی و دامان بە نەوەکانی ئیسرائیل، ئەوەبوو تەورات کە شەریعەتی خوایە پێ یان درا، پێغەمبەری زۆریشیان تێدا رەوانە کرا بۆ بەهێز کردن و چەسپاندنی ئەو شەریعەتی خوا ﴿ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ رزق و رۆزی زۆرو زەبەندمان پێدان لەو هەموو شتە حەڵاڵ و پاك و بەلەزەتە کە لەو وڵاتە فەرو پیت دارەدا بوو کەوا لەنێوان نیل و فورات دا ﴿ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ فەزڵ وزیادەمان دان بەسەرگرۆی ئادەمی چەرخی خۆیاندا.﴿ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ ﴾ لە کاروباری ئاین و شەریعەتەکەیان دا چەند شتی روون و ئاشکرامان پێ دابوون هیچ گرێ و پێچ و پەنایەکی تێدا نەبوو.

﴿فَمَا ٱخْتَلَفُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيَۢا بَيْنَهُمْۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾

﴿فَمَا ٱخْتَلَفُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ﴾ کەواتە ئاژاوەو دووبەرەکی یەك کە بوویان و پەیدایان کرد لە دینەکەیان دا لەبەر نەزانین نەبوو، بەڵکو بە باشی هەق و ناهەقیان ئەزانی، چونکە وەکو فەرموی: شتی روون و ئاشکرایان پێ درابوو، بەڵکو دووبەرەکی یەکەیان هەر ئەمە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿بَغْيَۢا بَيْنَهُمْ﴾ لەبەر دوژمنایەتی و حەسادەتی نێوانی خۆیان بوو، بەهۆی ئەوەوە کاربەدەستی و قیادەکەیان لە زەوی دا دوایی هات و بۆ رۆژی دواییش تەنها لای خوایە خۆی ئەزانێ چۆن بڕیار ئەدات لە نێوانیان دا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان خوای تۆ بڕیار ئەدات لە نێوانیان دا لە رۆژی دوایی دا لەو شتەی کە ئاژاوەو دووبەرەکی یان هەبوو تێیدا، ئینجا خوای گەورە کاربەدەستی و جێ نشینی بڕیاردا بۆ پێغەمبەرێکی تازە بە گوێرەی بەرنامەو شەریعەتێکی تازە وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئینجا لەپاش نەوەکانی ئیسرائیل ئەی پێغەمبەر لە کاروباری ئایینەوە تۆمان خستۆتە سەر رێگاو شەریعەتێکی گەورەی بە نرخ، کەواتە شوێنی ئەو شەریعەتە بکەوەو پەیڕەوی بکەو نەکەویتە شوێنی هەواو ئارەزووی کەسانێکی ئەوتۆ کە نەفام و نەزانن، واتە جگە لە شەریعەتی خوا شوێنی هیچ رێگەو بەرنامەیەکی تر مەکەوە، بێگومان هەموو یاساو رژێم و بەرنامەیەکی تر بنەڕەتی لەسەر لایەنگیری و ئارەزوو کارییە، ئەوەیش دیارەو کارو پیشەی نەفام و نەزانە، هەر شتێ نەزان بکات ئەبێ ناڕەوایی و کەموکوڕی هەبێ، تەنها بەرنامەی خوا بێگەردو بێ لەکەیە لە هەموو ناڕەوایی و کەم و کوڕی یەك، چونکە خوا خوای هەمووەو ئاگاداریشە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچی لێ ون نابێ، کەواتە رێگای ئادەمی دوو رێگایە:

١- رێگاو شەریعەتی خوا.

٢- رێگای هەواو ئارەزووی نەفس.

ئیتر سێ یەم نی یە، چونکە هەرکەس لایدا لە رێگاو شەریعەتی خوا ئەیەوێ هەواو ئارەزووی خۆی بکات بەرێگاو پەیڕەوی کراوی خۆی، کەواتە جگە لە شەریعەتی خوا ئەبێ بگوترێ جاهیلیەت، چونکە دانەرو داهێنەرەکانی ئادەمی یە کە پڕە لە نەزانی، جگە لە دیمەن و دیوی دەرەوە ئیتر ئاگای نی یە لە هیچ شتێکی تر، مەگەر ئەو کەسانەی کە خوا

حاڵی کردوون له هەندێ شت، جا بەم جۆرە جاهیلیەت نابڕێ بەسەر ئایین و ڕێگای ماوەو چەرخ و کاتێکی تایبەتی دا، بەڵکو له هەموو کات و چەرخێك دا جگه له شەریعەتی خوا هەموو جاهیلیەتە، وەکو زۆر له زانایانی تەفسیر ئەو وشه بەو جۆرە ڕاڤەو تەفسیر ئەکەن، له تەفسیری ئایەتی: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ دا له سورەتی ﴿المائدة﴾ دا بەیضاوی ئەفەرموێ: ﴿وهي ملة متابعة الهوى﴾. واته جاهیلیەت بریتی یه له ئایینێ که شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووی نەفسه. له حەدیسەوە هەر ئەوە وەرئەگیرێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی به ئەبو زەر: ﴿إنك امرؤ فيك جاهلية، قال: جاهلية كفرأو إسلام...؟ قال: بل جاهلية كفر﴾[1]. کەواته هەموو لادانێ له شەریعەتی خوا هەر پێی ئەگوترێ جاهیلیەت با له چەرخی ئیسلامیش دا بێت، له لایەن موسڵمانانیشەوە بێت. بێگومان ئەوە شتێکی ڕاستەو هیچ حەق نی یه جێگەی هیچ سەر لێ کردنەوەو ڕەخنەیەك بێت. چونکه هەرچەرخێ له چەرخەکانی ئادەمی که پێی گوتراوە جاهیلیەت هەر لەبەر ئەوە بووە که ئایینی خوا لەناودا نەبووە، مەبەست لەم لێکۆڵینەوە ئەوەیە که روون ببێتەوە ئەم وشەیە: جاهیلیەت له شەرع دا ناوە بۆ لادان له ئایین و شەریعەتی خواو پەیڕەوی ڕێگاو بەرنامەیەکی تر، ئیتر له هەر چەرخ و کاتێك دا بێ، ئەمەی که ئەو وشەیە کراوە به ناو بۆ کات و چەرخی لەمەو پێش که زانیاری و شارستانی تازە نەبووە، ئەوە به گوێرەی باوی مێژوو نووسەکانی تازەیە دوای هاتنی ئیستیعمار بۆ وڵاتی ئیسلام، کەواته با ئینسانی موسڵمان ئاگای له دەمی خۆی بێ لەمەر وڵات و چەرخێك دا ئایینی ئیسلام پەیڕەوی نەکرا وشەی جاهیلیەتی بۆ بەکاربێنێ با له زانیاری تازەدا گەیشتبێتە بەرزترین پله وەکو ئێستای روسیاو ئەمەریکا. ئەمە شتێ نی یه به لایەنگیریی یان گۆترەکاری بیڵێین، چونکه ئەو وشەیە بۆ گەل و شوێنێ بەکار ئەهێنرێ که جەورو ناڕەوایی و فەرمانی ناپەسەندی تێدا باو بێت و ئەمەیش شتێکی ئاشکرایە ئەم دوو دەوڵەتە که ئەمرۆ پێشکەوتوو ترن له پێش چاوی هەموو، بوون به هۆی زوڵم و ناڕەوایی هەموو گۆی زەوی، هەموو به دەست پیلانی ئەمانەوە گیریان خواردووە هەرچی ئاژاوەو کوشتار هەیە هەمووی ئەوان ئاگرەکەی ئەنێنەوە، هەرگیز ناشیانەوێ که بیکوژێننەوەو هەتا بێت ئاگرەکەی بڵێسە پێ ئەدەن، لەگەڵ ئەمەدا، کارێکی وا بکەن ئاژاوە لەرووی زەویدا نەمێنێ، کەواته ئەوەی ئەوانە تەنها جاهیلیەت نی یه، بەڵکو ئەوە دڕندەیشە.

---

[1] واتەتۆکەسێکی کەجاهیلیەتیت تێدایە، ئەویش وتی جاهیلیەتی کوفر یان ئیسلام، ئەویش فەرموی: جاهیلیەتی کوفر.

لادان لەشەریعەتی خواوشوێنکەوتنی هەواوئارەزووی ئادەمی تاوانێکی ئەوەندە گەورەیەخوای گەورە مەترسی ئەخاتە بەر پێغەمبەر(ﷺ) و ئاگاداری ئەکاتەوە بە خۆپاراستن لە لادان لە شەریعەتی خوا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ شوێنی هەواو ئارەزووی نەزانەکان مەکەوە، بێگومان ئەوانە هیچ سودێکت پێ ناگەیەنن لە لایەن خواوە، ناتوانن بەرگری هیچ شتێکت لێ بکەن کە خوا بیەوێ بەسەرت بێنێ، نەزانە زاڵمەکان لەناو خۆیان دا دۆست و یارمەتی دەری یەکترن. خوا دۆست و یارمەتی دەری لە خوا ترسەکانە.

لەم فەرمودەوە دوو شت وەرئەگیرێ:

١- هۆی فەرمان دان بە شوێن کەوتنی هەوای نەزانەکان، واتە شوێنی ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، چونکە تۆ پەیوەندییت بەوانەوە نی یە، کەسێ شوێنی ئەوان ئەکەوێت کە بەشداربێت لە سیفەتی ئەوان دا، ئەوانە زاڵم و کافرن. دۆست و یارمەتی دەری خۆیانن، چونکە زاڵم شوێنی زاڵم ئەکەوێت، تۆی لە خواترس ئەبێ شوێنی فەرمانی خوا بکەوی، چونکە خوا دۆست و یارمەتی دەری لە خوا ترسانە.

٢- پیشانی ئەدا کە نابێ پشت ببەسترێ بە کافران، چاوەڕوانی یارمەتی یان لێ بکرێ با ئەوان دژی بەرژەوەندی یەکتر بن، لەبەر خاتری پێغەمبەر(ﷺ) چونکە ئەوانە هەموو یەکێتیان هەیە لەمەدا کە دژی ئیسلامن، بەلأم باکت نەبێ لە کۆمەڵیان، چونکە خوا یارمەتی دەری لەخواترسانە.

هەردووبار دەرسێکی گرنگە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) و بانگەوازەکەی بڕۆن و بلأوەی پێ بکەن، ئەبێ ئاگادار بن کە هیچ کات خۆشەویستی و دۆستایەتی بەکار نەهێنن لەگەڵ دوژمنەکانی خوادا، شوێنی ئارەزوو هەوای ئەوان نەکەون، پشتیان پێ نەبەستن، چاوەڕوانی خێرو چاکەیان لێوە نەکەن، بیم و ترسیش لە کۆمەڵیان نەکەن، پشت هەر بە خوا ببەستن، لە هەموو کاروباردا شوێنی ڕێگەی خوا بکەون، بێگومان هەر کۆمەڵە ئیماندارێك بجوڵێتەوە بە ڕێکی بە گوێرەی ئەو خاڵانەی کە باس کران، سەرکەوتوو ئەبن و یارمەتی دراو ئەبن لای خواوە.

هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾

**ئینجا پاش ئەو بەیانە گرنگە قورئان ئەناسێنێ و پیشانی ئەدات بە هەندێ لە سیفەتەکانی کە مەبەستی بەیانەکەی پێ بەهێزتر ئەبێت و جێگیر تر ئەبێت لە دڵ دا، ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ ئەم قورئانە بریتی یە لە چەند تیشکی روون و ئاشکرا کە ڕێگای رزگاری و گەیشتن بە ئامانج پیشان ئەدات بۆ ئادەمیزاد، ڕێنموونی ئەکات لە گومڕایی و ون بوون، ڕەحمەت و نیعمەتێکی گەورەیە لە لایەن خواوە بۆ کەسانێ باوەڕێکی بەهێزیان هەیە بە ئارامەوە، بێگومان دوو دڵی یان بۆ ئەو کەسانەی کە بە شوێنی باوەڕی وادا ئەگەڕێن بە ڕاستی، بە ڕاستی بە شوێن حەق دا ئەگەڕێن، نایانەوێ دەمبازی و چەنە بازی بکەن.**

**ئینجا بڕیاری جیاوازی دەر ئەکات دەربارەی حاڵی تاوانباران و چاکان، بێزاری دەر ئەبڕێ دەربارەی بڕیاری یەکسانی ئەو دوو تاقمە لە کاتێك دا کە لە ترازووی خوادا یەکسان نین و هاوتای یەك نین. ئەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ﴾[1] ئایا ئەو کەسانەی کە بە دەست قەست تاوان و خراپەکانیان کردووە گومان وا ئەبەن کە ئێمە ئەو تاوانبارانە وەکە ئەوانەیان لێ ئەکەین کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە، بەم جۆرە ژیان و مردنیان وەك یەك وابێ؟! واتە هەرچۆن لە ژیانی ئەم جیهانەدا جیاوازی ناخەینە نێوان چاك و خراپ، هەردوو لایان ئەژێنین، رزق و ڕۆزی و خۆشی ئەم جیهانەمان نەبەستووە بە چاکی و خراپییەوە، ئایا یەکسانی زۆر بێ جێ یەو جێگای بێزاری یە واتە لەو جیهان دا جیاوازی ئەخەینە نێوانیان، شێوەی ژیانی هەردوو تاقم لەو جیهان دا قورئان لە چەند شوێن دا باسی ئەفەرموێ. ئەگەر**

---

[1] خیلاف هەیە لە مەبەست بەم ﴿هم﴾ ە دوایی یەدا، ئایا هەردوو تاقمی یەکەم یان هەردوو بۆ تاقمی دووەمە، یان هەردوو بۆ هەردووە، هەر جۆر بیگری مەبەستەکە هەر یەکە کە ئەو دوو تاقمە یەکسان نین، بە هەموو جۆر ئەو مەبەستە ئەگەیەنێ، بەڵام دڵ زیاتر بۆ ئەوە ئەڕوا کە هەردوو بۆ هەردوو بێت.

به باشی بیر بکەینەوە لە حاڵی ئەم دوو تاقمە لەم جیهانەیش دا بە دیمەنی رووت وەکو یەکن لەراستی دا لێرەش هەر جیاوازن، چونکە چاکان خوای خۆیان ئەناسن، دڵیان یادی خوای تێدایە، لەبەر ئەوە پڕ لە ئارامەو ئەزانن: لە کوێوە هاتوون؟ بۆ کوێ ئەچن؟ هەوڵ بۆچی ئەدەن؟ بەرگەی هەموو خۆشی و ناخۆشی یەك ئەگرن، لە خۆشی دا لەپەت بەرەڵا نابن و لە ناخۆشیش دا دنیایان لێ نایەتە یەك، هەوڵ و تەقالایان بۆ کامەرانی خۆیشیانە و خەڵکی تریش، بەڵام بە پێچەوانەی بێ باوەڕە تاوانبارەکان: ئەمان ئارامی روو ناکاتە دڵیان، چاوبرسین و هەرگیز تێر ناخۆن، بەرگری خۆشی و ناخۆشی ناگرن، نازانن لە کوێوە هاتوون؟ بۆ کوێ ئەچن، هەوڵ و تەقەلایان هەر بۆ جێ بەجێ کردنی ئارەزووی ناڕەوای خۆیانە، قورئان و حەدیس واقیع حاڵی هەردوو تاقمی روون کردۆتەوە. ئای چەند شیرینەو پڕ بە پڕیانە ئەم ئایەتە: ﴿والذين كفروا يتمتعون و ياكلون كما تأكل الأنعام﴾ [1] خوای گەورە وەکو بە شێوەی ئینکارو بێزاری ئەو پرسیارەی کرد لەو گومانە ناڕەوا، ئینجا بێزاری و ئینکارەکە بەهێزتر ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ ئەو یەکسانیەی کە تاوانباران بڕیاری ئەدەن: عەجەب شتێکی خراپەو ناڕەوایە.

ئینجا بڕیاری جیاوازی نێوان ئەو دوو تاقمە بەهێزتر ئەکات بەم فەرمودە: ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بە حەق و عەدل، لەسەر حەق و عەدل دای رشتوون، واتە هەموو کاروبارێك رێك و راست و بەجێ یە، کەواتە ئەبێ جیاوازی بکرێ لە نێوان چاکان و خراپان دا، تۆڵەی زوڵم لێ کراوان بسێنرێ، چونکە ئەوە بەشێکە لە عەدل و راستی کە بنەڕەتە بۆ هەموو بوونەوەر. ﴿وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ﴾ خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد بەهۆی حەق و بەدی هاتنی حەق، بۆ ئەمەی هەموو نەفسێ بە گوێرەی کردەوەی خۆی جەزاو پاداشت بدرێتەوە ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ بەو جۆرە جەزاو پاداشت ئەدرێنەوەو هیچ زوڵم و ناڕەوایی یان لێ ناکرێ، بە کەم کردنەوەی پاداشت، یان زیادکردنی تۆڵەیان، بەڵکو خوای بە رەحم لوتفی وایە هەموو کات پاداشت بە زیادەوە ئەداتەوە لای خوارویی بەدەقات، بەڵام تۆڵە هەرگیز زیاد ناکات، ئیتر یا سووکی بکات یان هەر نەیسێنێ لە ئیمانداران.

---

[1] ئەو کەسانەی کە کافرن، رائەبوێرن، ئەخۆنو ئەنۆشن وەکو وڵاخ و ئاژەڵ، واتە بێ مەبەست و بێ ئامانجی ئادەمی یانە، بێ ئاگان لە هەموو شتێکی چاك، جگە لە خۆیان و تێرکردنی سکیان ئیتر هیچی تر نازانن.

﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ﴾

---

پاش ئەمەی کە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) بە شوێن کەوتنی بەرنامەی خواو خۆپاراستنی لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووی نەزانەکان. ئینجا باسی خراپی ئەو کەسانە ئەکات کە شوێنی هەوای نەفسی خۆیان ئەکەون، ئەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ هەواڵم بدەرێ ئایا بینیوتە ئەو کەسەی کە هەواو ئارەزووی خۆی گێڕاوە بە پەرستراوی خۆی، بەم جۆرە شوێنی ئەکەوێ بێ هیچ ملە جەڕێ و سەر لێ کردنەوەیەك: هەواو ئارەزووی بۆ هەر بارێك بڕوات، بە شوێنی دا ئەڕوا، واتە ئەو کەسە نموونەیەکی زۆر سەیرو جێگای سەرسوڕمانە کە چۆن بەو رادەیە سەری لێ تێك چووە لە ئایین و بەرنامەی خوا لای داوە، کە شتێکی حەق و دامەزراوە، ئارەزووی دانەمەزراوی ناڕەوای خۆی ناوەتە شوێنی خواو ئەیپەرستێ، ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً﴾ بەهۆی ئەوەوە خوایش ئەو کەسەی گومڕا کردووە، کە زانیویەتی شایانی ئەوەیە، مۆری ناوە بەسەر هێزی بیستن و دڵی داو پەردەی هێناوە بەسەر چاوو هێزی بینینی دا، واتە بەرگری کردووە لە هەموو هەست و فام و تێگەیشتنێك، کەواتە هیچ تەمێ و ئامۆژگاری یە نابیستێ، بیر ناکاتەوە هەرگیز لە هیچ دەلیل و بەڵگەیە، هیچ دروشمێ رێگەی راست نابینێ، خوای گەورە ئادەمی بە جۆرێکی تایبەتی دروست کردووە: هۆی زانین و تێگەیشتنی پێداوە. هەموو حەق و ناحەقێکی بۆ روون کردۆتەوە بە نیشانەو بەڵگەی بەهێزەوە، خواهیش و سەربەستی یەکی داوەتێ ئەتوانێ کام رێگای بوێ بیداتە بەر. لەگەڵ ئەمەدا کاتێ بەندە بەخواهیش و ئارەزووی خۆی رێگای چەوت و خراپی دایە بەر، پشتی کردە فەرمانی خواو گوێی نەدا بەو هەموو دەلیل و نیشانەو ئامۆژگارییە، هەرکات بەندە بە ئارەزووی خۆی وای کرد لەخۆی ئەو کاتە شایانی ئەوە ئەبێت کە خوا بەدبەختی بکات و قاری لێ بگرێ و بەرگری بکات لەهەموو هەست وفام وتێگەیشتنێ، کەڕوکوێروبێ هۆشی بکات لەئاییینی حەق ورێگەی راست، واتە بە تەواوی گومڕای بکات ﴿فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ﴾ کەواتە کە خوا بەو جۆرەی لێ کرد، ئیتر لە پاش خوا کێ هەیە رێنموونی ئەو سەر لێ تێك چوو گومڕا کراوەی خوا بکات.

أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ

واته هیچ كەسیٚ تر نی یە چاوەڕوانی هیچ گەڕانەوەیەك لەو كەسانە ناكریٚ: ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ئایا بیریٚ ناكەنەوە بۆ ئەمەی ئاگاتان لە خۆتان بیٚت، خۆتان بپاریٚزن لە لادان لە ئایین و بەرنامەی خواو شویٚن كەوتنی هەوای نەفستان كە بەو جۆرە هۆی قارو خەشمی خوایە؟ واتە بیر بكەنەوە با دووچاری ئەو بەدبەختی یە نەبن - خوا پەنامان بدات - لە قارو غەزەبی خۆی، آمین.

زۆر پیٚویستە بیركردنەوە لەم رستەیە: ﴿اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ﴾ بۆ ئەمەی بزانریٚ كە شویٚن كەوتنی جگە لە بەرنامەو شەریعەتی خوا هەمووی كوفرەو بت پەرستی یەو گیٚرانی ئەو شتەیە بە خواو پەرستنی بۆ شویٚن كەوتووەكانی. ئەمە شتیٚكە ریٚگەی هیچ قسەو لیٚكۆڵینەوەی تیٚدانییە، ئەوەتاقورئان بیٚ پیٚچ وپەنالەچەندشویٚندا ئەفەرمویٚ: پیٚغەمبەریش لەچەند جاردا فەرمویەتی... بڕیاری هەموو زاناو پیٚشەواكانی موسڵمانیشی لەسەرە.

ئینجا قسەیەكی نەفامانەی بت پەرستەكان ئەهیٚنیٚتە پیٚشەوە دەربارەی مردن و ژیان و زیندوو بوونەوە لەگەڵ بەرپەرچ دانەوەی دا ئەفەرمویٚ: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ ئەو بیٚ بڕوایانە ئەڵیٚن: هیچ ژیانیٚكی تر نی یە جگە لە ژیانی ئەم جیهانەمان، ئەمرین و ئەژین، واتە چینیٚكمان ئەمریٚ و چینیٚكی تر دیٚتە جیٚی بۆ ژیان، هەر بەم جۆرە ئەڕواو ئیتر ژیانی ترمان نابیٚ و زیندوو نابینەوە، هیچ شتیٚكی تر ئیٚمە نامریٚنیٚ جگە لە هاتن و ڕۆیشتنی چەرخ و ڕۆژگار.

ئا بەم جۆرە كەوتەنی و نەفامیە سەرنجی ژیانیان ئەدەن، چونكە ئەیان بینی بە پیٚش چاویانەوە چینیٚ ئەمریٚ و چینیٚكی تر پەیدا ئەبیٚت، مردن شتیٚكی دیاریی نەبوو كە بە پیٚش

چاوەوە یەخەیان پێ بگرێ، بەڵکو هەر ئەوەیان ئەبینی ئەم شەوو ڕۆژو چەرخە یەت و ئەڕوا، لەپاش ڕۆیشتنی ماوەیەك خەڵکی ئەمرێ لەبەر ئەوە چەرخ و زەمانەیان دائەنا بە هۆی مردن و نەمانیان. ئەوەندە کەودەن و تێنەگەیشتوو بوون بیریان نەئەکردەوە کە ئەو گیانەیان لە کوێوە بۆ ئەهات پاش ئەوەی کە ئەهات، کێ ئەیبردەوە و لێ ی ئەسەندەوەو هاتنی مردن کەی ڕژێمێکی هەیە، بەم جۆرە لەپاش ڕۆیشتنی ماوەیەکی دیاریی مردن بێت بۆ هەموو یەکێ هەتا ئەو گومانە ببەن، بڵێن: ئەوەتا ئەوەندە کات رابورد بەسەر فلان دا ئیتر مرد، بەڵکو منالّ و پیرو گەنج و نەخۆش و تەندروست و لاوازو قەڵەو وەکو یەك مردن روویان تێ ئەکات بێ یاسایەك. کەواتە زۆر نەزانی و نەفامیە گێرانی چەرخ و رۆژگار بە مرێنەری زیندووان، لەبەر ئەوە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ ئەوانە هیچ جۆرە زانینێکیان نی یە بەو قسەی کە ئەیکەن، ئەوانە هەر گومان و خەیاڵی رووتیان بوو دەربارەی قسەکەیان، واتە قسەکەیان زۆر بێ نرخە، شایانی ئەوە نی یە هیچ ئادەمی یەك بیلێ، چونکە هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی لەسەر نی یە، خۆیشیان لە رووی زانین و باوەڕی دڵەوە نایڵێن، دڵ دامەزراو نین لەسەری بەڵکو قسەیەکی رووتە و دێت بە دەمیان دا بەهۆی لاسایی و شوێن کەوتنی کوێرانەی نەفامانی گەلە پێشووەکانەوە. ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ کاتێ ئایەتەکانی ئێمە بخوێنرێتەوە بەسەریان دا کە روون و ئاشکران و پێچەوانەی قسەکەی ئەوان روون ئەکەنەوە ئەوانە هیچ بەڵگە و دەلیلێکیان نی یە جگە لەمە ئەڵێن بە پێغەمبەرو ئیماندارەکان: ئەگەر ئێوە راست ئەکەن ئەڵێن زیندوو بوونەوە هەیە و ژیانێ تر ئەبێ جگە لەم ژیانی ئێستا: ئەگەر راست ئەکەن دەی باوك و باپیرە مردووەکانمان زیندوو بکەنەوەو بیان هێننەوە.

ئەم قسەو پەڵپەیشیان هەر لە نەزانی و تێنەگەیشتنەوەیە، چونکە نەیان ئەزانی مەبەست و حیکمەت لە ژیانی ئەم دونیاو زیندوو بوونەوەی دوای مردن و رۆژی دوایی چی یە؟. نەیان زانیوە کە ژیانی ئەم دنیا هەلێکە خوا داویەتی بە بەندەکانی بۆ کردەوەو تاقی کردنەوەیان لەوەی خوا خستوویەتیە ژێر دەستیان، لە پاش ئەوە ئەیانمرێنێ لەو کاتەی کە

به گوێرەی حیکمەت و زانینی خۆی بۆی دیاریی کردوون، ئینجا زیندوویان ئەکاتەوە بۆ پرسیار و موحاسەبەیان لەسەر کردەوەکانی ژیانی ئێستا، بۆ روون بوونەوەی سەرئەنجام و بەرهەمی تاقی کردنەوەکەیان. کەواتە هیچ حیکمەت و مەبەستێك نی یە لە هێنانەوەیان بۆ ئەم دنیا، خوایش ئیشی بێ حیکمەت ناکات.

ئەو مردووانە ناهێنرێنەوە لەبەرئەوە تاقمی نەفام پەلپیان گرتووە، ئایا بۆچی بێنەوە؟ ئایا بۆ ئەمەی ئەو تاقمە نەزانە قەناعەت بکەن و دڵنیا بن کە خوا دەسەلاتی هەیە بەسەر زیندوو کردنەوەدا، زیندوو کردنەوە راستەو دێتە دی؟ ئایا ئەوانەی بەچاوی خۆیان نابینن لە هەموو کاتێك دا ئەو هەموو گیانلەبەرانە نەبوون، ئینجا پەیدا بوون، ئەو هەموو گیانلەبەرە لە پێشەوە مردووی بێ گیان نەبوون؟ لە پاشان ئەبوون بە زیندووی گیانلەبەر؟ دەی ئەوە چ جیاوازی هەیە لەگەڵ زیندوو بوونەوەی رۆژی دوایی دا بەڵکو ئەبێ دووبارە کردنەوەکەیان بە ئاسان تریان سەیر بکردایە، چونکە هەر شتێ فەراهەم بێنێ، ئەبێ باشتر باوەری ببێ بە دووبارە کردنەوەی، شتەکە زۆر رێك و روونە، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەدا کە بە سووك و ئاسانی شتەکەیان بخاتە پێش چاو، ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێ باوەرانە: خوا گیانی داوە بە ئێوەو کردوونی بە گیانلەبەر، ئینجا پاش ئەوە ئەتانمرێنێ، ئینجا پاش مراندنتان خوا بە زیندوویی کۆتان ئەکاتەوە لەکاتی هاتنی رۆژی دوایی دا، کە گومان نی یە تێیدا و بە قەتعی دێت. واتە ئەو پەلپە ئەوان ئەیگرن لە بابەت زیندوو کردنەوەو هێنانەوەی باو باپیریان، ئەگەر تێگەیشتوو بن پێویستیان نی یە بەوە، چونکە وێنەی ئەوە هەموو کات وا لەپێش چاویانەوە، ئەوەتا ئەم هەموو گیانلەبەرانە لە خاکێکی مردووی بێ گیان دروست ئەکات و فەراهەمی ئەهێنێ، دەی ئەمە چ جیاوازی یەکی هەیە و لەو زیندوو کردنەوەی کە ئەوان ئەیڵێن؟ ئەو خوایەی کە لە یەکەم جارەوە گیانی کرد بە بەری باوکو باپیرەکانیان دا، بۆچی ئەبێ نەگونجێ دووبارەیان بکاتەوە؟ بێگومان هەرکەس زانا بێت زۆر بە گونجاوی سەیر ئەکات و هەرگیز سەر لەشتی وا ناکاتەوە،

وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا

**﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئادەمی نەزانن بەهۆی ئەوەوە ئەو قسە بێ جێ یانە دێت بە دەمیان دا، دەم ئەکوتن لەشتی ناڕەوا. پاش ئەوەی باسی تواناو قودرەتی کرد بەسەر زیندوو کردنەوەدا بە تایبەتی، ئینجا بە شێوەی گشتی باسی ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ تەنها تایبەتی یە بە خواوە هەر بۆ خوایەو موڵکی ئاسمانەکان و زەوی، ئەو خاوەنی هەمووەو کاروباری هەموو بەدەست ئەوە، کەواتە هەرچۆنێ لە یەکەم جارەوە دروستی کردوون هەروەها ئەتوانێت هەرکەس و هەرچی وا لە نێوانیان دا نەیان هێڵێ و دووبارەیان بکاتەوە.**

**ئینجا شێوەیەك پیشان ئەدات لە شێوە سامناکەکانی ئەو ڕۆژەی کە بێ بڕواکان گومانیان هەیە تێیدا، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ * وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا﴾ ئەوانەی لەم جیهانەدا لەسەر شتی ناڕەواو بەتاڵ و ناحەقن، واتە پێچەوانەی ئاین و بەرنامەی خوان، ئەوانە هەموو خەسارەتمەندو ڕەنجەڕۆن لەو ڕۆژەدا کە قیامەت هەڵئەسێ و کاتی دیاریی کراو دێتە پێشەوە بۆ پرسیارو حیساب، لەو ڕۆژەدا هەموو ئوممەت و گەلێ ئەبینی، کۆمەڵ کۆمەڵ کەوتوون بەسەر ئەژنۆدا لە حەیبەت دا، هەموو گەل و ئوممەتێك بانگ ئەکرێ بۆلای دەفتەری کردەوەکانی.**

**لە یەکەم جارەوە پێشەکی پاشە ڕۆژی ئەوانە باس ئەکات کە لەم دنیا باوەڕیان نەبوو بە ڕۆژی دوایی، ئەمجار با بەباشی بە گوێرەی وشەکان، بیری بکەینەوە لەو ڕۆژە سەختە کە ئەو هەموو تاقم و چینەی تێدا کۆ ئەبێتەوە بە درێژایی ماوەی پەیدا بوونی ئادەمی تا کۆتایی هاتنی لەسەر ئەم زەوی یەدا، ئەو هەمووە کۆ بکرێنەوە لەیەك مەیدان داو هەموو لە حەیبەت دا خۆی بۆ نەگیرێ بە پێوەو بکەوێ بەسەر ئەژنۆدا بە چاوی فرمێسکاوی و لێوی وشکی بار گرتوو هەناسەی تەنگ و دڵە لەرزەوە، چاوەڕوانی محکمەو پرسیارن لە پێش دادگای خوای گەورەدا، نا ئومێدی لە هەموو شتێ جگە لە ڕەحمی خوا ئەویش بەهۆی ئیمان و کردەوەی چاکەوە کە لەم دنیادا کراوە.**

ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾

---

**با زۆر بەباشی بیر بکەینەوە لەم هەموو شێوە سامناکانەی ڕۆژی دوایی یە کە قورئان ناو بەناو ئەیهێنێتە پێش چاومان، بەڵکو بە ئیزنی خوا هەلی ژیانی ئەم جیهانە لە دەست خۆمان دەرنەکەین، قەڵغان و توێشووی تێدا هەڵگرین بۆ چارەسەریمان لەو ڕۆژە سەختەدا. ئینجا لە لایەن خواوە ئەگوترێ بەو کۆمەڵە کە ترس و سام چوار دەوری داون:** ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ * هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ **ئەمڕۆ سزاو پاداشتی ئەوەی کە لە دنیادا کردووتانە ئەدرێنەوە، تۆڵەو سزای ئەوانەتان لێ ئەسێنرێ، واتە بە گوێرەی کردەوەکانتان ڕەفتارتان لەگەڵ ئەکرێ، ئەمەی کە بانگ ئەکرێن بۆلای، دەفتەرو پەڕاوی ئێمەیە کە کردەوەکانی ئێوەی تێدا نووسراوەتەوە، لەسەرتان ئەدوێ و شایەتیتان لێ ئەدات بە حەقیانەت و ڕاستی بێ کەم و زیاد. بێگومان ئێمە فەرمانمان داوە بە مەلائیکە ئەوەی کردووتانە بینووسنەوە تێیدا، کەواتە ڕوون ئەبێتەوە بۆیان کە هیچ شتێك لە بیر نەچووە، چونکە خوایە کە هیچی لێ ون نابێ، فەرمانی داوە کە هەموو کردەوەیەك بنوسرێ.**

**لە پێشەوە بە کورتی ئەفەرموێ: ئەمڕۆ بە گوێرەی کردەوەکانتان ڕەفتارتان لەگەڵ ئەکرێ، ئەوا لێرەدا هەندێ بە درێژیی ڕوونی ئەکاتەوە:** ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ﴾ **ئینجا ئەوانەی کە لە دنیادا ئیمانیان هێناوە بەوەی پێغەمبەرەکانیان، کردەوە چاکەکانیشیان بەجێ هێناوە، ئەوانە لە پاداشت دا**

پەروەردگاریان ئەیانخاتە ناو رەحمەتی خۆی واتە بەهەشت، ئا ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی ئاشکرا، چونکە هیچ جۆرە لەکەو تەمو لێڵی تێدا نی یە، رزگار بوون لە چاوەڕوانی و دڵە لەرزەی ئەو رۆژە.

بە گورجی باسەکەیان ئەبڕێتەوە سووك و ئاسان بۆ ئەمەی پیشانی بدات هیچ گیرو گرفتێکیان نی یە، بە ئاسانی ئەگەن بە ئاوات و ئامانجی خۆیان. بەڵام کۆمەڵی تاوانباران بە جۆرێکی تر پیشان ئەدات، تانەو تەشەر لێدان و ئابڕوو بردن و تەریق کردنەوە بەوەی کە قسەو کردەوە خراپەکانیان ئەدەنەوە بە ناوچاوانیان دا، ئەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَـٰتِى تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمًا مُّجۡرِمِينَ * وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيۡبَ فِيهَا قُلۡتُم مَّا نَدۡرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ﴾ ئەوانەی کە لە دنیادا باوەڕیان نەهێناوە بە پێغەمبەران و ئەو ئایینەی کە خوا ناردوویەتی، ئەوانە پێ یان ئەگوترێ لە لایەن خواوە: ئایا پێغەمبەرەکانی من نەهاتنە لاتان؟ ئینجا ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەخوێنرایەوە؟

لەپاش ئەوە ئێوە خۆتان بە گەورەتر ئەزانی لەوەی کە ئیمان و باوەڕ بهێنن و مل کەچ بن بۆ فەرمانی خوا، ئێوە گەل و کۆمەڵێك بوون تاوانبارو دەقتان گرتبوو بە خراپەو تاوان کردنەوە، کاتێ ئامۆژگاری بکرانایەو پێتان بگوترایە: بێگومان بەڵێنی خوا راستەو ئەوەی بەڵێنی پێداوە دێتە جێ، رۆژی دوایی حەقەو هیچ گومانی تێدا نی یە، ئێوە بە سەر سوڕمان و لاقرتی یەوە ئەتان گوت: ئێمە نازانین رۆژی دوایی چی یە؟!

ئێمە لەو بابەتەوە جگە لە گومانێکی رووت هیچی ترمان نی یە، ئێمە بۆمان روون نەبووەتەوە ئەوەی ئێوە ئەیڵێن، واتە ئێوە لە دنیادا بەو جۆرە بوون ئەی ئێستا چۆنن؟ ئێستا بۆتان روون بووەتەوە کە ئەوەی پێتان ئەگوترا راست بوو؟

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

---

**بەڵێ باش بۆیان روون و ئاشکرا ئەبێ: ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ دەرئەکەوێ و ئاشکرا ئەبێ بۆیان ئەو کردەوە خراپانەی کە کردوویانە لە دنیاداو بە چاکیان ئەزانی. خراپی ئەو تۆڵە و سزایانە ئەچەژن و بەچاو ئەیبینن، دەوریان ئەدا تۆڵەی ئەوەی لاقرتی یان پێ ئەکرد.**

**دووبارە ئەگەڕێتەوە سەریان بە رەزیل کردن و ئابڕو بردن و نائومێد کردنیان ئەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ * ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەگوترێ پێ یان: ئەمڕۆ هیچ موبالاتتان پێ ناکەین، هیچ گوێتان پێ نادەین، لێتان ناپرسینەوە وەکو لەبیر چوو، هەرچۆنێ ئێوە لە دنیادا بیری ئەم رۆژەو دووچار بوونی ئەم رۆژەتان نەئەکردەوە، هیچ گوێتان لێ ی نەبوو، خۆتان بۆ ئامادە نەکرد. شوێن و ماواتان هەر ئاگرەو بەس، هیچ یارمەتی دەرێکتان ن یە رزگارتان کات لەو ئاگرە، ئەو عەزابە سەختەتان بەهۆی ئەوەوەیە کە ئێوە لە دنیادا ئایەتەکانی خواتان کردبوو بە شتێکی گاڵتەو لاقرتیتان پێ ئەکردن.**

**ژیانی دنیا هەڵیخەڵەتاندبوون، هەر بۆ ئەو هەوڵتان ئەداو لاتان وابوو جگە لەوە ژیانی تر نابێ، ئا بەو جۆرە سزای دەروونیشیان ئەدرێ – خوا پەنامان بدات –. ئینجا باسی ئەم کۆمەڵەبەدبەختەعاقیبەت شەرمەدوایی ئەهێنێ، بە جاڕدانی دواترین پاشەرۆژیان، ئەفەرموێ: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ ئەمڕۆ ئەوانە وان لە ئاگرداو ئیتر داوایان لێ ناکرێ کە**

هەولی ئەوە بدەن خوا لەخۆیان رازی بکەن. چونکە کاتی ئەوە تێپەڕی، ئەوە هەلێ بوو تازە لەدەست دەرچوو، لە دنیادا ئەوە ئەکرا، خوا پەنامان بدات بە رەحمی خۆی و یارمەتیمان بدات ئەم هەلەمان لەدەست دەرنەچێت. آمین.

باوی قورئان وایە مژدە بە کۆمەلی چاکانی راستەقینە ئەدات، ئەوانەی لە خواترسن و لە تاوانە گەورەکان خۆیان ئەپارێزن، کردەوە چاکەکان بەجێ ئەهێنن.

هەڕەشە لە کافران ئەکات، کەواتە ئیمانداری گوناهکار نە ئەوەندە پیاوە شایان مژدە بێت، نە ئەوەندەش تاوانبارە کە بە تایبەتی هەرەشەی لێ بکات. بێگومان ئەهلی بەهەشت تەنها ئەوانە نین کە مژدە پێ دراون، بەلکو دوو تاقمی تریش هەن:

١- ئەوانەی کە تەکلیفی شەرعیان لەسەر نی یە، وەك: شێت و مندالْ و ئەوانەی دەنگو باسی ئایینی خوایان پێ نەگەیشتبێ، ئیتر لەهەر چەرخێك دا ببێ، ئەمانە بێ عەزاب ئەخرێنە بەهەشت.

٢- ئەو گوناهبارانەی کە بە ئیمانی رێك و راستەوە ئەمرن، ئەمانەیش پاشەرۆژیان هەر بەهەشتە، ئیتر با پاش عەزاب دان بێت.

ئینجا لە پاش دیاریی کردنی پاشەرۆژی ئەو دوو کۆمەلە، سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە حەمدو سوپاس بۆ خوایەك کە تاك و تەنهایە و گەورەیی هەر بۆ ئەوە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، ئەفەرموێ: ﴿فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ * وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ ئینجا هەموو سوپاس و سەنایەك تەنها تایبەتی یە بە خواوەو هەر بۆ ئەو ئەگەڕێتەوە. ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی یە، پەروەدگاری هەمووجۆرەعالەمەکانە، دەسەلات وگەورەیی لەهەمووئاسمانەکان وزەویداهەربۆ ئەوەو هەر ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، هەموو کاروباری بەجێیەو پڕ لە مەسلەحەتە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ

---

# سورەتی(الأحقاف)
# مەككەیی یەو ٣٥ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە زۆر بە گرنگی لە سێ شت ئەدوێ، كە ئەم ئایینە گشتی یە هەتا هەتایی یەی ئیسلامە لەسەریان دامەزراوە، هەموو ئاداب و رژێم و بڕیارەكانی بە دەوری ئەم سیانەدا ئەخولێتەوە، هەموو شتێ بەستراوە پێ یانەوە، ئەو سێ شتەش بریتین لە:

١- باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا.

٢- باوەڕ بە پێغەمبەرێتی حەزرەتی محمد(ﷺ).

٣- باوەڕ بە رۆژی دوایی و پرسیارو تۆڵەو پاداشتی كردەوەكانی ئەم دنیایە.

لەهەموو رێگایەكی گونجاوەوە ئەم مەبەستانە ئەبات بە ناو دڵ و دەروون دا، لە چەند بارو روویەكەوە پیشانیان ئەدات و بەهێزو دامەزراویان ئەكات بە چەند بەڵگەو نیشانەیەكی بوونەوەری و دەروونی و مێژوویی، چەند شێوەیەكی رۆژی دوایی ئەخاتە پێش چاو بۆ ئەمەی دڵ پەیوەندی خۆی بەهێز بكات و هەوڵدان بۆ ئەو رۆژە بكات بە مەبەستی راستەقینەی خۆی، دڵ ئەگێڕێ بە ناوچەكانی ئاسمان و زەوی دا، بە جۆرێ ئەیكات بە پەراوێك كە حەقی بۆ روون بكاتەوە، وەكو قورئان پەراوێكە كە هەموو شتێكی پێویستی بۆ روون ئەكاتەوە، ئەمانە هەموو پێك ئەهێنێ بەو تەرزە قورئانی یە بێ وێنەیە. جابەپشتیوانی خوادەست پێ ئەكەین،خوای گەورەئەفەرموێ:﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * حمٓ * تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەم كتێبە كە قورئانە لە ئاسمانەوە وەجبە وەجبە لە لایەن خوایەكە كە ناوی ﴿الله﴾ یە، زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، هیچ كەس ناتوانێ دەست بخاتە كارو فەرمانیەوە، هەموو كارو كردەوەو بڕیاری بەجێ‌یەو پڕ لە بەرژەوەندی و حیكمەتە، كەواتە كتێبێكی بێ لەكەو بێ وێنەیە.

ئەم مەبەستە چەند جار لە سورەتێك دا ئەیفەرموێتەوە بۆ ئەمەی هەموو جارێ دڵ بێدار بکاتەوە بە گەورەیی و گرنگی قورئان، کە گەورەترین بەهرەی خوایە، یەکەم سەرچاوەیە بۆ ئەم ئایین و شەریعەتە گشتی یە هەتا هەتایی یە.

خوای گەورە دوو پەڕاوی روون کراوەی خستوەتە پێش چاومان بۆ ئەوەی خۆی بناسین و ڕێگەی ئەو بدەینە بەر:

یەکەم: قورئان کە ئەمەیە ئەیخوێنینەوە.

دووەم: ئەم بوونەوەرە گەورەیە کە وا بە پێش چاومانەوەو لێ ی وورد ئەبینەوەو تەماشای ئەکەین.

ئەم دووانە هەردووکیان شایەتی ئەدەن لەسەر زانین و تواناو حیکمەتی خوا، لەسەر ئەمەی کە هەموو کاروفرمانێ بە فەراهەم هێنان و بڕیاری ئەوەو هیچی لە خۆڕایی نی یەو هەموو شتێ لەبەر مەبەستێکی رێك و راستە، پەڕاوی بوونەوەر شایەتە لەسەر راستی قورئان لەو هەموو بەڵێن و مژدەو هەڕەشانەی کە ئەیکات. کەواتە پەیوەندی یەکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان ئەم دوو پەڕاوەدا، جا بەو بۆنەیەوە لە زۆر شوێن دا لە قورئان دا باسی بوونەوەر ئەهێنێ بەدوای باسی قورئان دا، یەکێ لەو شوێنانە ئێرەیە، کە لە پاش باسی قورئان ئەفەرموێ: ﴿خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیان دایە دروستمان نەکردووە بە دروست کردنێ نەبێ کە جگە لە راستی و حەق هیچی تری لەگەڵ دا نی یە، واتە دروست کردنیان لە خۆڕایی نی یە، بێ سوود و بێ مەبەستێکی گرنگ نی یە، بەڵکو لەبەر پێك هێنانی هەموو شتێکە کە هەقەو راستەو بەجێیە و پڕە لە بەرژەوەندی، عەدل و حیکمەت داوای ئەکات، ئەوەیش بریتی یە لە ناسین و گوێ رایەڵی پەروەردگارو بەدی هاتنی بەرهەمی سیفەتی دادپەروەریی و حیکمەتی خوا، کە ئەوەیش بەوە ئەبێت چاکان و تاوانباران جیا بکرێنەوە، هەریەکە پاشەرۆژی رێك و پێکی خۆیانیان بۆ فەراهەم بهێنرێ. کەواتە ئەم بوونەوەرە بۆ ئەمە دروست نەکراوە کە ئەم رژێمەی ئێستای نەبڕاوە بێت هەتا هەتایە، بەڵکو هەر بۆ ماوەیەکی دیاریی کراوە، کە هەتا کاتی هاتنی رۆژی دوایی یە کە قورئان ئەو هەموو ترس و سامەی چەند جار باس ئەفەرموێ، بەندەکانی خوای پێ ئەترسێنێ، ئیمانداران بەو ترساندنە سوود وەرئەگرن.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ

**خۆیان بەرگری ئەکەن لە تاوان کردن بەلاَم ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ﴾ کەسانێك کە کافرن – واتە ئەوانەی هەرگیز ئیمان ناهێنن – ئەوانە باکیان نی یە لەو ترساندنەو سزای ئەو رۆژە کە ئەترسێنرێن پێ‌ی، پشتی تێ ئەکەن و روو وەرگێڕن لێ ی. ئەو پەڕاوەی کە ئەیخوێنینەوە یەکەم مەبەستی داڕشتن و جێگیر کردنی باوەڕە بە تاك و تەنیایی خواو پەروەردگارێتی ئەو بۆ هەموو، پەڕاوی بوونەوەریش شایەتی ئەدات لەسەر ئەوە کە ئەم باوەڕە راستەو جگە لەوە ناگونجێ بەهیچ جۆر، هەرکەس بێ بەش نەبێ لە ژیریی و تێگەیشتن ئەو شایەتی یەی بەلاوە زۆر پەسەندە. کەواتە جێگای سەرسوڕمانە کە خەڵکی جگە لەخوا پەرستراوی تر بڕیار ئەدەن، چونکە ئەو پەرستراوانی ترە ئەبێ چی بن؟ چی یان بەسەر بێت؟ چی یان بە دەستە؟ چی یان داهێنابێ؟ ئایا بەشداری یان لە چ شتێکی ئەم بوونەوەرەدا کردووە؟ وەکو تەمێ‌ی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات کە بەو جۆرە بکۆڵێتەوە لەگەڵ ئەو سەر لێ تێك چووانەدا کە بە ناحەق و بێ جێ ئەو پەرستراوانە بڕیار ئەدەن، ئەوەش بەم رەنگە شایەتی یە راستەکەی بوونەوەریان بخاتە پێش چاو کە دەست نادا بۆ هیچ رەخنەو قسەو باسێ، مەگەر یەکێ بیەوێ هەر لە خۆیەوە دەمبازی بکات، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بەو بت پەرستانە بڵێ: هەواڵم بدەنێ لە بابەت ئەو شتانەی کە ئێوە هاواریان لێ ئەکەن و ئەیانپەرستن جگە لە خوا، ﴿أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ پیشانم بدەن ئایا ئەوانە چ بەش و پارچەیەکیان لە زەوی دروست کردووە، واتە کەسێ شایانی پەرستنە کە بتوانێ شت دروست بکات، بێگومان هیچ کەسێ نی یە کە بڵێ ئەو بتانە هیچ بەش و پارچەیەکیان لە زەوی دروست کردووە، یان شتێکیان لە زەوی دا دروست کردووە، تەنانەت ئەوانەیش کە جن یان مەلائیکە ئەپەرستن قسەی وا ناکەن، ناتوانن شتی وا بڵێن، چونکە راست و ژیریی ئەچن بە گژیان داو پیایان دا هەڵئەشاخێن. ئەوە زەوی هیچ، ﴿أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئەی ئایا هیچ بەشداری یە هەیە بۆ ئەوانە لە دروست کردنی ئاسمانەکان دا، واتە وەکو سەربەخۆ هیچ ناتوانن، ئایا هاوبەش و بەشداری یان هەیە، یان دەسەلاَت و تواناو خاوەنی یەکیان هەیە؟ بێگومان هەموو عاقڵێ ئەڵێ نەخێر، بەهیچ جۆر نە بەشداری یان هەیەو نە دەسەلاَت و توانا لە ئاسمان دا.**

﴿ائۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٤) وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ (٥) وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ (٦)﴾

**ئینجا ڕێگە ئەگرێت لە کەسانێ کە ئەوەندە نەفام بن گومانی ئەوا ناڕەوا ببەن، یان لە خۆوە بێ بەڵگەو نیشانەیەك باوەڕیان بە بت پەرستی هەیە، ڕێگایان لێ ئەبڕێتەوە، بەمەی داوای دەلیل و بەڵگەیان لێ ئەکات، دەلیل و بەڵگەی بیستن لە ئایینەکانی خوا لەمەوپێش، یان دەلیل و بەڵگەی عەقڵی و ژیریی، ئەفەرموێ:** ﴿ائۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ **ئەگەر لەم داواو قسەتان دا ڕاست ئەکەن دەی دەلیل و بەڵگەی لەسەر بێننەوە، بەم جۆرە کتێبێکم بۆ بێنن لە پێش ئەم قورئانەوە هاتبێت لای خواوە کە ڕەوای ئەم باوەڕەی ئێوەی دابێ، یان شتێ کە مابێتەوەو دەستکەوتتان بووبێت لە عیلم و زانینی گەل و ئوممەتە پێشووەکان، واتە بەڵگەیەکی عەقڵی ڕێك و پێکی ئەوانتان بە دەستەوە بێت لەسەر ڕاستی باوەڕەکەتان، دیارو زانراوە کە هەموو پەڕاوەکانی خوا ڕێکن لەگەڵ ئەوەی قورئان ئەیفەرموێ، هەموو زاناو عاقڵێ لەمەو پێش هەموو یەك باوەڕو یەك قسەن: کە خوا تاك و تەنیایە، هاوبەش و وێنەی لە هیچ شتێك دا نییە. ئا بەم شێوە حەکیمانە قورئان لەگەڵ بت پەرستەکان دا ئەکۆڵێتەوە بۆ ڕوون کردنەوەی ناڕەوایی بیرو باوەڕەکەیان، ئا بەم جۆرە بەرو دوایان لێ ئەگرێ، هیچ ماوەی تەکو جمیان ناهێڵێ.**

**هەر بەوە کۆتایی یان لێ ناهێنێ بەڵکو دێتە سەر نەفسی بتەکان، ڕوونی ئەکاتەوە کە بە هیچ جۆر دەست نادەن بۆ ئەمەی سوودێکیان لێ وەربگیرێ، کەواتە ئەوپەڕی گومڕایی و سەر لێ تێك چوونە، ئەو باری ئەوانی لەسەر، ئەفەرموێ:** ﴿وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ * وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ﴾ **ئای کێ هەیە گومڕا تر بێت لەو کەسەی کە هاوار بکات لە کەسێ، جگە لە خوا کەسێ بپەرستێ کە تا ڕۆژی دوایی بە هیچ جۆرێك نایە بە هاوارو لاڵەیەوەو لێ ی وەرناگیرێ؟ ئەو پەرستراوە هاوار لێ کراوانە بێ ئاگان لە لاڵەو پەرستنەکەیان تا ڕۆژی دوایی، لەم جیهانەدا بەو جۆرەن، کاتێ کە ڕۆژی دوایی دێت و ئادەمیزاد کۆئەکرێتەوە ئەبن بە دوژمنیان و یەخەی خۆیانیان**

لیٚ هەڵنەتەكێنن، دان نانێن بە پەرستنەكەیان دا، واتە لە دنیادا هیچ سوودێكیان لیٚ وەرناگرن، لە رۆژی دوایی دا وەك سوودیان نی یە زیانیان پیٚ نەگەیەنن، كەواتە هیچ كەس گومڕا ترو سەر لیٚ شێواو تر نی یە لەو كەسەی كە جگە لەخوا كەسێك یان شتێكی تر ئەپەرستیٚ و هاواری لیٚ ئەكات.

بت پەرستەكان هەندێكیان دارو بەردیان ئەپەرست، لەبەر زاتی خۆیان یان لەبەر ئەوە بە وێنەو هەیكەلی مەلائیكەیان دائەنان، هەندێكی تر یەكسەر لە رێوە مەلائیكەیان ئەپەرست، یان جن و شەیاتین، ئەمانە هیچیان ناچن بە هاواری هاوار كارانەوە: ئەوەی بیٚ گیانە ئاشكرایە، ئەوانەی كە زیندوون بەندەیەكی مل كەچن، خەریكی خۆیانن، نایان پەرژێتە سەر كەس، لە توانایشیان دا نی یە، چونكە بە هاوارەوە چوون بە شێوەی نهێنی تایبەتی یە بە خواوە وەكو لە سورەتی ﴿النمل﴾ دا ئەفەرمویٚ: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ زیاد لەوە مەلائیكە هەرگیز ناچن بە هاواری دوژمنی خواوە، شەیتانیش جگە لە هەوڵ دانی سەر لیٚ تێك دان و گومڕا كردن هیچ شتێكی تر ناكات.

بت پەرستی وەنەبیٚ هەر بریتی بێت لەو جۆرانەی كە لە كاتی هاتنە خوارەوەی قورئان دا باو بووە، بەڵكو بت پەرستی و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دان چەند شێوەی تریشی هەیە، بەڵام وەكو ئەوەی ئەو كاتە نین كە باو بووە، ئەم جۆرو شێوانەی تر كە شاراوەن، زۆر كەس دووچاری بوون و ئەبن و هەستی پیٚ ناكەن، ئەم بەشەیان دووبارە دوو بەشە: بەشێكیان خەڵكی پیٚ كافر ئەبن، ئەوەیش بریتی یە لە رەزامەندی و باوەڕ كردن بە بەرنامەو رژێم و یاسایەكی تر جگە لەوەی پێغەمبەرمان(ﷺ) هێناویەتی، ئەو بەشەكەی تریان ناگاتە ئەو رادەیە، ئەوەیش بریتی یە لە ترسان لە جگە لە خوا، ئومێد و چاوەڕوانی خێرو چاكە لیٚ ی، هەروەها رییا كردن و رووپامایی لە كردەوەی چاكەدا، ئەمانە وێنەیان هەموو جۆرێكن لەو تاوانە گەورە، فەرزە بەندەی خوا خۆی پاكو خاوێن بكاتەوە لیٚ یان.[1]

[1] ئەم مەبەستە لە سەرەتای سورەتی ﴿الزمر﴾ دا لیٚ ی دواین، تكایە تەماشا بكرێت.

**لەپاش ئەوەی کە پرو پووچی ئاین و باوەڕەکانی روون کردەوە، ئینجا باسی هەڵوێستی ناڕەوایان ئەکات دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو ئایینە حەقەی کە هێنای بۆ هەمووان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ [1] کاتێ ئایەتەکانی ئێمە کە روون و ئاشکران، ئەخوێنرێنەوە بەسەریان دا، ئەوانەی کە کافرن دەربارەی ئەو ئایەتە حەق و روونانە – هەر لەگەڵ بۆیان هات بێ بیر لێ کردنەوە – ئەڵێن: ئەمە جادوو سیحرێکی ئاشکرایە، هەڵوێستە ناڕەواکەیان بە جۆرێك باس ئەکات کە هۆی ناڕەوایی و بێزاری دەربارەی روون ئەکاتەوە لە سێ بارەوە:**

**١- ئایەتەکان روون و ئاشکران هیچ جۆرە پێچ و قۆرتێکیان تیادا نی یەو باش لێ ی حاڵی ئەبن.**

**٢- ئەو ئایەتانە حەق و راستن.**

**٣- بێ تێفکران وبیرلێ کردنەوەئەوبڕیارەناڕەوایەی بەسەردائەدەن، ئەڵێن: جادوو سیحرە.**

**ئینجا پلەیەکی تر بەرز ئەبێتەوە لە بێزاری دەربڕین دا دەربارەی قسەیەکی ناڕەوای تریان دەربارەی ئەو ئایەتە روونانە، بەشێوەی پرسیار ئەیهێنێ، بۆ ئەوەی وا پیشان بدات کە شتێکی زۆر دوورە قسەی وا ناڕەواو بێ جێ بکرێ، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ [2] ئایا ئەوان ئەڵێن کە ئەم قورئانە لە لایەن خواوە نەهاتووەو محمد بە درۆ بە دەم خواوە هەڵیبەستووەو دەست هەڵبەستی خۆیەتی، واتە ئایا دەم درێژیی یان ئەگاتە ئەو رادەیە کە قسەی وەها بێ جێ بکەن؟ کە بە خەیاڵی هیچ تێگەیشتوویەك دا نایەت.**

---

[1] شوێنەکە شوێنی رلناوە، واتە ﴿قالوا لها﴾ ئەوانەی کە ئایەتەکان ئەخوێنرێتەوە بەسەریان دا، ئەولنە دەربارەی ئەو ئایەتانە ئەڵێن، بەڵام بە شێوەی ئێستا فەرموی بۆ ئەوەی ئەولنە لەکەدار بکات بە سیفەتی کوفر کە پیسترین سیفەتە، ئایەتەکانیش سیفەتی حەقیان بۆ بەکار بێنێ کە جوانترین سیفەتە.

[2] وشەی ﴿أم﴾ لێرەدا(منقطعه) یە بە مانا ﴿بل﴾ ەو ﴿أی﴾ پرسیارە. ﴿بل﴾ بۆ کۆتایی هێنانە لە قسەی پێشو، بۆ دەست پێ کردن بە قسەیەکی تر.

﴿قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَىٰ بِهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (٨) قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ (٩)﴾

**دەربارەی ئەم قسە ناڕەوا دووورە خوا تەمیّ ی پیّغەمبەر(ﷺ) ئەکات، کە بەرپەرچیان بداتەوە بەم جۆرە شیرینە، بەم شیّوە کە پەیوەندی تەواوی پیّغەمبەر نیشان ئەدات بە خوای خۆیەوە، هیّزی دلّ و دلّنیایی بەو فەرمانەی پیّی سپیّرراوە، بیّ باکی لە هەموو شتیّ جگە لە خوا، بیّ نرخی هەموو شتیّ لەم بوونەوەرەدا، لەگەلّ ئەوەدا زۆر ترس و سامیان ئەخاتە بەر، لەگەلّ ئومیّدو چاوەڕوانی دا، ئەفەرمویّ: ﴿قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ بلّیّ ئەگەر من بەدرۆوە ئەم قورئانەم بە دەم خواوە هەلّبەستبیّ، بیّگومان خوا قارم لیّ ئەگریّ و هەر لەم دنیادا تۆلّەم لیّ ئەسیّنیّ، ئەو کاتە ئیّوە ناتوانن بەرگری هیچ شتیّکم لیّ بکەن لە لایەن خواوە، کەواتە من چۆن ئەویّرم شتی وا بکەم و خۆم بخەمە خەتەری وا گەورە، بیّ ئەمەی چاوەڕوانی هیچ سوودیّك بکەم، یان بەرگری هیچ زیانیّ لە لایەن ئیّوەوە، واتە ئەگەر من هەلّبیەستم ئەبیّ مەبەستم ئەمەبیّ ئیّوە باوەڕم پیّ بیّنن و شویّنم کەون، دەی کاتیّ کە من ئەزانم ئیّوە هیچ سوودیّکم پیّ ناگەیەنن و ناتوانن بەرگری هیچم لیّ بکەن ئیتر من چۆن ئیشی وا ئەکەم!!**

**ئینجا هەڕەشەیان لیّ ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ خوا ئاگادارەو لە هەموو زاناترە بەو تانەو رەخنەو لەکانەی کە ئیّوە دەری ئەبڕن و رۆئەچنە خوارەوە تیّیدا دەربارەی ئایەتەکانی، ﴿كَفَىٰ بِهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ بەسە خوا شایەت لە نیّوان من و ئیّوەدا، شایەت لەسەر راستی من، لەسەر راگەیاندنی ئەوەی پیّی سپاردووم، شایەت لەسەر درۆو ئینکاری و سەرکیّشی ئیّوە، واتەخۆی ئاگادارو شایەتە، شایەتی ئەدات وبڕیاریش ئەدات، کەواتە تەنیا ئەوە بەسە.**

**ئینجا وەکو ئەو هەڕەشەی کرد ئومیّدو چاوەڕوانیشیان ئەخاتە بەر ئەفەرمویّ: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ تەنیا هەر ئەو خاوەنی لیّ بوردنی زۆرو رەحمی بیّ سنوورە، واتە: لەوانەیە**

رەحمتان پێ بكات‌و بتانخاتە سەر ڕێگای ڕاست، بەهۆی ئەوەوە لێتان ببورێ لە هەموو تاوانی لەوەوپێشتان، نەك لێتان ببورێ با كافریش بن، چونكە لە كافری كۆتایی نەهێنەر نابووری.

ئینجا فەرمان ئەدات كە لە بارو ڕوویەكی ترەوە بكۆڵنەوە لە سروش و پێغەمبەرێتی یەكەی لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانەدا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ بڵێ: من لەناو پێغەمبەران دا یەكێكی تازە پەیدا بوو نیم، شتێ بڵێم كە ئەوان نەیان گوتبێ، بانگی ئێوە بكەم بۆ شتێ كە ئەوان بانگیان بۆ نەكردبێ، من یەكەم كەس نیم كە داوای پێغەمبەرێتیم كردبێ، ئەوە ئەمموو پێغەمبەرانی تری لە پێش منەوە هاتوون، ئەوانیش ئادەمی بوون وەكو من ئەوان چی یان ڕاگەیاندووە منیش هەر ئەوە ئەڵێم. كەواتە شتەكە باوو زانراوو ناسراو بوو، ئیتر بۆچی بە لاتانەوە شتێكی نەگونجاوە، بێ بیر كردنەوە لێ ی دەم درێژیی ئەكەن و قسەی ناڕەوا ئەكەن؟ كاتێ ئەڵێن: سیحرە، كاتێ تر ئەڵێن: درۆیە، دەست هەڵبەستی خۆیەتی ﴿وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾ [1] من نازانم چی دەربارەی من و ئێوە ئەكرێت لەمەو پاش، بەس من سروشم بۆ لا كراوەو پێم سپێرراوە كە بانگی ئێوە بكەم بۆ ڕێگەی خوا، من شوێنی هیچ شتێك ناكەوم و پەیڕەوی هیچ شتێك ناكەم جگە لەوەی كە لە لایەن خواوە بۆم هاتووە، واتە بەس من لەسەر ئەوەی پێم سپێرراوە ئەڕۆم و بەردەوام ئەبم بێ ئەمەی بزانم لەم ڕێگایەدا من و ئێوە چیمان دەربارە ئەكرێت. بەڵكو تەنیا گەردن كەچم، گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەری ئەكەم ئیتر هەموو كاروباری خۆم و فەرمانەكەم عایدی خوایەو بەدەست ئەوە، ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ من هیچ نیم جگە لە ترسێنەرێكی ئاشكرا، خەڵكی ئەترسێنم لە تۆڵەو عەزابی خوا، واتە لە سنووری خۆم و فەرمانەكەم دا وەستاوم. ئا ئەوەیە گوێڕایەڵی و گەردن كەچی ڕاستەقینە بۆ خوا، ئا ئەوەیە شەرم و حەیاو ئەدەب لەگەڵ خوادا، ئا ئەوەیە بەندەیی ڕێك و ڕاست و واز هێنان لە هەموو شتێ بۆ خوا.

---

[1] بەچەند جۆرێ تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام ئەمەی كە لێرەدلیە لەناو زانایان دا بەهێزترەو باشتر دڵ وەری ئەگرێ: زانینی تەواو لای خوایە.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ

---

**ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ ئەو بانگەوازەی پێغەمبەر(ﷺ) بسێننەوە و بڵاوی بکەنەوە، ئەبێ لەم رێبازەلانەدەن کەخوای گەورە دیاریی کردووە بۆ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) ئەگەر بە موو لا بدرێ کارەکە بە رێکی ناڕواو تەگەرەی تێ ئەکەوێ.**

**ئینجا بە شێوەیەکی پڕ لە دانایی ئامۆژگاریی یان ئەکات و ترس و خەتەرە ئەخاتە پێش چاویان لەسەر ئەو بێ باوەڕی و سەرکەشی یەیان، رێگەیەکیان پیشان ئەدات کە هیچ مەترسی تیادا نی یە، ئەفەرموێ:** ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ﴾ **ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: پێم بڵێن و هەواڵم بدەنێ ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن خواوە هاتبێ و ئێوەش باوەڕتان پێ نەهێنا، شایەتی لە نەوەی ئیسرائیل – کە زاناو شارەزان لە ئایینی خوادا – شایەتی دا لەسەر وێنەی ئەم قورئانە لە کتێبە پێشووەکان دا، بەهۆی ئەوەوە زانی کە قورئان راستەو ئیمانی پێ هێنا، ئێوەش هەر سەرکەشیتان کرد، واتە هێشتا بەوەش دڵتان دانەهێنا، ئایا ئەو کاتە ئێوە کافرو زاڵم نین؟ بێگومان چارەیان ناچارە ئەبێ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بڵێن: بەڵێ ئەو کاتە کافرو زاڵمین، دەی کە وایش بن بێ بەش‌و نائومێد ئەبن لە رەحم و بەزەیی خوا، هەرگیز رێگایان لە خێر ناکەوێ ناگەڕێنەوە بۆ رێگای راست،** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ **چونکە بێگومان خوا رێنموونی گەل و کۆمەڵی زاڵمان ناکات، کەواتە رێگاکەتان پڕ تر لە ترس و بیمە، چارەسەری خۆتان بکەن.**

**خوای خاوەن رەحم هیچ هۆی پەڵت و بەهانەی نەهێشتووەتەوە بۆ بەندەکانی: عەقڵ و هەست و فامی پێداون، پێغەمبەرو کتێبی بۆ ناردوون بە دەلیل و بەڵگەی روون و ئاشکراوە، بە روونی هەموو حەق و ناحەقی پێگەیاندوون، بە توانا و خواهیشی جوێی کردوونەتەوە،**

سەربەستیی داونەتیٚ کام ریٚگا بگرنە بەر، پاش ئەم هەموو شتە بەندەکە بە ئارەزوو خواهیش و سەربەستی خۆی ریٚگەی روونی خوای واز لیٚ هیٚنا و ریٚگەی شەیتانی دایەبەر، ئەو کاتە خوایش قاری لیٚ ئەگریٚ و دلٚی مۆر ئەکات، قاپی رەحمی خۆی لیٚ دائەخات – خوا پەنامان بدات –.

قورئان لە چەند ریٚگاوە بە چەند رەوشت لەگەلٚ دلٚ دا هەولٚ ئەدات و خەریك ئەبیٚ بۆ تیمارو چارەسەر کردنی لە نەخۆشی بیٚ باوەری و لادانی لە ریٚگای سروشتی ئادەمیزاد.

یەکیٚ لەو رەوشتانە کە زۆر بەکارە بۆ کوژاندنەوەی بلٚیسەی تەکەبورو سەرکەشی ئەم رەوشتەیە کە لەم ئایەتەدا بەکاری ئەهیٚنیٚ: ئەوەتا لەگەلٚ ئەمەدا خوا خۆی قورئانەکەی ناردووە، پیٚغەمبەر(ﷺ) وەکو رۆژی رووناك ئەزانیٚ کە ئەم قورئانە لای خواوە هاتووەتە سەری، لەگەلٚ ئەمەدا خوا تەمیٚی ئەکات کە بە شیٚوەی گومان و دوو دلٚی ئەوە راگەیەنیٚ و لەگەلٚ ئەو سەرکەشانە بدویٚ، بەو جۆرەی کە رابورد، ئەم رەوشتە دەرس و تەمیٚیەکی زۆر گرنگە بۆ ئەو کەسانەی کە خوا بۆی کردوون، کارو پیشەی پیٚغەمبەران بەجیٚ ئەهیٚنن، بانگی خەلٚکی ئەکەن بۆ ریٚگەی خوا، با ئەو بەختیارانە بزانن، کە هەندیٚ کەس ئەبیٚ بەم جۆرە قسەی لەگەلٚ بکریٚت.

زانایانی تەفسیر چەند رایەکیان هەیە لە بابەت ئەو شایەتە ئیسرائیلی یەوە هەندیٚ ئەلٚیٚن: مەبەست بەوە(عەبدوللاٚی کوری سەلام) ە کە لە مەدینە موسلٚمان بووە، ئەم ئایەتە لەم سورەتە مەدینەیی یەو مەککەیی نی یە. رایەکی تر ئەمەیە کە مەبەست پیٚی حەزرەتی موسایە، شایەتی یەکەی بریتی یە لە سیفەت و نیشانەکانی پیٚغەمبەر(ﷺ) کە لە تەورات دا هاتبووە خوارەوە.

رایەکی تریش ئەمەیە کە مەبەست کۆمەلٚیٚکە لە کات و چەرخی مەککەدا موسلٚمان بوون، شایەتی یەکەیان زۆر بە نرخ بوو لەو کاتەدا، بۆیە قورئان لە چەند شوێنیٚك دا باسی ئەفەرمویٚ: بەرەنگاری بت پەرستەکانی پیٚ ئەکات. دوای ئەمە جاریٚ تر قسەی ئەو بت پەرستانە پیشان ئەدات دەربارەی قورئان و ئەم ئایینەو ئیماندارانە، قسەیەکی زۆر نارەوای بیٚ جیٚ کە ئەیانکرد بە بیانوو بۆ ئیمان نەهیٚنانیان، ئەفەرمویٚ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ

﴿لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِۚ﴾ ئەوانەی کە کافرن دەربارەی ئەوانەی ئیمانیان هێنا، گوتیان: ئەگەر ئەوەی کە(محمد) دەیڵێت: ئیمان هێنان پێی چاك بوایە، ئەمانە لە ئێمە پێش نەئەکەوتن بۆی، واتە مادام ئەم لات و هەژارو بەندەو بێ کەسانە چەسپانی یان کردووە بۆ ئیمان هێنان، ئەبێ ئەم ئایینە باش نەبێ، چونکە ئەمان رێگایان لە خێر ناکەوێ، ئەگەر باش بوایە ئێمە رێگامان لێ ی ئەکەوت، ئێمە کە ماڵ و سامان و شان و شەرەفمان هەیە لەناو گەل دا.

ئەوانە کە لە یەکەم جارەوە ئیمانیان هێناو شوێنی پێغەمبەر کەوتن، هەروەها پێغەمبەرانی تریش – سەلامی خوایان لێ بێت – زۆرتر لە چینی هەژارو بێکەس و لێ قەوماوەکان بوون، چونکە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – عەدالەت و هۆی رزگاری یان هێناوە لە هەموو نارەوایی یەك، مەبەستێ لە مەبەستەکانی رەوانە کردنیان بەرگری هەموو دەست درێژیی و زوڵم و سەرکەشی و نارەوایی بووە، کەواتە ئەبێ داماوان و بەش خوراوان و لێ قەوماوان و داگیر کراوان یەکەم تاقم بن لە شوێن کەوتنی پێغەمبەران دا، بە تایبەتی دواترینی هەمووان پێغەمبەرمان(ﷺ) کە خوا رەوانەی کرد بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد، هەتا دنیا دنیایە بۆ لە ریشە هێنانی هەموو زوڵم و دەست درێژیی یەك، هەروەها لەو بارەیشەوە ئەبێ یەکەم تاقم کە دژیان هەڵسابن و هەموو توانایان بەکار هێنابێ لە بەرگری یان دا ئەبێ ستەمکاران و داگیر کەران و سەرکەشان بووبن، جا لێرەدا مەبەستی ئەو کافرانە تانەو تەشەردان بوو لەو ئیماندارانە و ئایینەکەیان، ئەو قسە نارەوایەیشیان ئەکرد بە بیانووی هۆی ئیمان نەهێنانیان، بەڵام زۆربەی ئەو سەرکەشە ستەمکارانە باش ئەیانزانی کە ئەو ئایینەی پێغەمبەر(ﷺ) راست و حەقەو هۆی ئیمان نەهێنانیان ئەوە بوو خۆیان بەزل ئەزانی و تەکەبور داگیری کردبوون، عاریان لێ ئەهات کە گوێڕایەڵی فەرمانێ بکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، ئەیانزانی ئەگەر گوێڕایەڵی بکەن ئەبێ ئەو پلەو پایەی بەرزی نارەوایی کۆمەڵایەتی یان نەمێنێ، ئەبێ واز بێنن لە دەست درێژیی و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بە ناحەق و بێ شەرعی. ئەو ستەمکارە سەرکەشانە ئارەزووی نەفس و شەیتان زاڵ ئەبێ بەسەریان دا، هەرگیز ناتوانن دان بە حەق دا بنێن، هیچ کاتێ دان بە هەڵەی خۆیان دا نانێن، هەر بارێك خۆیانی لەسەر بن ئەوە بە راست دائەنێن،

وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا

---

**پێچەوانەی ئەو بارەی خۆیان رەخنەدارو لەکەدار ئەکەن وەکو لەم فەرموودەیەش دا روون ئەبێتەوە: ﴿وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ﴾ ئەمانە کە بەهۆی قورئانەوە نەکەوتنە سەر رێگای راست عینادو سەرکەشی یان دەرئەکەوێ و روون ئەبێتەوە، بەهۆی ئەوەوە ئەڵێن: ئەمە درۆو دەلەسەو قسەی پڕوپووچی کۆنە، واتە ئیمان نەهێنانیان ناکەن بە خەتای خۆیان چونکە هەڵەو لاری بۆ خۆیان بڕیار نادەن و لەناو کۆڕو جەماوەردا وان نیشان ئەدەن کە خۆیان بێ لەکەو بێ هەڵەن، بەڵکو عەیب لەوەدایە کە بانگ ئەکرێن بۆ ئیمان هێنان پێی.**

**ئینجا دوای ئەمە باسی سروش و پێغەمبەرێتی ئەهێنێ بە دەست نیشان کردنی پەڕاوی حەزرەتی موساو رێکی ئەم قورئانە لەگەڵ ئەودا، هەروەك لە پێشەوە دەست نیشانی ئیسرائیلی یەکەی کرد لەسەری، ئەفەرموێ: ﴿وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ﴾ لەپێش ئەم قورئانەدا پەڕاوی موسا بوو، کە پێشەوا بوو بۆ ئادەمیزاد، رەحمەتێ بوو لەلایەن خواوە بۆ بەندەکانی، هەروەها هەموو ئایین و پەڕاوەکانی خوا رەحمەت بوون لەلایەن خواوە بۆ سەر زەوی و ئەوانەی وان لەسەر زەوی دا. ئەم قورئانەیش پەڕاوێکە باوەڕی هەیە بەوەی وا لە تەورات و هەموو پەڕاوەکانی تری خوادا، راستێ یان دەرئەخات، ئەم قورئانە کە بە زمانی عەرەبی هاتووە روون و رەوان و ئاشکرا بۆ ئەمەی پێغەمبەر – یان قورئان – ئەو کەسانە بترسێنن کە زاڵم و سەرکەشن، هاتووە بۆ مژدەدان بەوانەی کە خاوەنی کردەوەی چاکن. لەپێش قورئان دا ئینجیل هات، وەکو تەواوکەری تەورات وابوو، هاتنەکەی وەکو درێژە پێدان بەماوەی تەورات بوو، کەواتە باس کردنی ئینجیل پێویست نی یە.**

ئینجا باسی پاداشتی ئەوانە ئەکات کە مژدەیان پێ ئەدرێ، ئەو موژدەی کە ئەدرێ روونی ئەکاتەوە، مەرجی ئەو مژدەیەش باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ * أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بەراستی کەسانێ کە ئەڵێن: خواو پەروەردگاری ئێمە تەنها کەسێکە ناوی ﴿الله﴾ یە، پاش ئەوە رێك و پێك و دامەزراون لەسەر ئەو قسەو باوەڕی خۆیانە، دژ و پێچەوانەی ناجوڵێنەوە، بێ فێڵ و تەڵەکەو بە گوێرەی رۆژو زروف ناگۆڕێن، ئەوانە هیچ مەترسی یەکیان لەسەر نی یەو دڵ غەمگین نابن لە رۆژی دوایی دا، ئەوانە لە بەهەشتان بە نیشتەجێی یەکجاری بێ بڕانەوە، پاداشت ئەدرێنەوە بەو پاداشتە بەهۆی ئەو کردەوەی کە لەمەو پێش لە دنیادا کردوویانە.

خوای گەورە ئەم بەڵێنە زۆ گرنگە ئەدا بەو پاداشتە زۆر گەورە بەوانەی کە ئەو وشە ئەڵێن، دامەزراو ئەبن لەسەری، بەڵام پێویستە بەباشی روون بکرێتەوە، بزانرێ کە ئەوە وشەیەکی رووت نی یە بەدەم بگوترێ و ئیتر بەس، یان لەگەڵ بیرو باوەڕێکی رووت لەدڵ و دەروون دا، بەڵکو ئەو وشەیە بەرنامەیەکی تێرو تەواوی ژیانە بە هەموو ناوچەو کون و قوژبنەکانی یەوە.

ئەو کەسەی ئەو شتە پیرۆزە ئەڵێ کاتێ ئەو بەڵێنەی بۆ هەیە کە بەم جۆرەی خوارە بێت:

ا- عیبادەت و پەرستنی تەنیا بۆ خوا بێت، رووی دڵی تەنیا لای ئەو بێت، هەر لەو بترسێ و پشت هەر بەو ببەستێ.

ب- باوەڕی وا بێت کە کەس هیچی بەدەست نی یە، هەرچی خوا بیکات هەر ئەوە ئەبێت، هەرچی نەکات نابێ، کەواتە ئومێد و چاوەڕوانی هەر لە خوا بێت و بیم و ترسیشی هەر لەو بێت.

ت- لە هەموو کارو فەرمان و بڕیارێك دا تەماشای رەزامەندی خوا بکات، هەوڵی بۆ ئەوە بێت، تەنیا شوێنی بەرنامەی خوا بکەوێت.

پ- باوەڕی بە هیچ بەرنامەو یاسا و رژێمێ نەبێ جگە لەوەی خوا ناردوویەتی بۆ بەندەکانی بەهۆی پێغەمبەرمانەوە(ﷺ) باوەڕی وابێ کە جگە لەم شەریعەتەی خوا هیچ شتێکی تر راست نی یە.

ج- باوەڕی وابێ کە هەرچی هەیە و هەرچی وا لەم بوونەوەرەدا هەمووی یەکسەر پەیوەندی هەیە بە ئێمەوە، هەموو یەك ئەگرین لە پەیوەندیمان بە خوامانەوە.

دوای ئەوەی ئەو خاڵانە هاتە جێ، ئینجا لەسەر ئەو باوەڕە دامەزراوو دڵ ئارام بێ هیچ شتێ راینەکێشێ بە هیچ بارو لایەکی تردا. خوای گەورە لە دوا دوایی ئایەتەکەدا روونی کردۆتەوە کە ئەو پاداشتە لەسەر کردەوە چاکەکانیانەو بەردەوامی یان لەسەریان، کەواتە ئاشکرایە ئەو پاداشتە بۆ تەنیا وتنی ئەو وشەیە نی یە، یان لەبەر باوەڕی رووت نی یە، بەڵکو بۆ کردەوەیەکە بە گوێرەی ئەو وشەو باوەڕ پێ ی، چونکە وتنی رووت هیچ نی یەو وتن لەگەڵ باوەڕی بێ کردەوە ئەو نرخەی نی یە، کە خوا بەو جۆرە بەڵێنی وای بۆ دەربکات لە گەورەترین کتێبی دا. هەروەها هەموو وشەو بیرو باوەڕییەکانی ئیسلام هیچیان مەبەست پێیان وتنی رووت نی یە، یان لەگەڵ باوەڕدا بێ کردەوە، بە وێنەی وشەی(شایەتومان) وتنی رووت بێ تێگەیشتن و ئیمان و باوەڕی رێك و راست پێ ی، بەو وێنە کە لە وشەی ﴿ربنا الله﴾ دا باس کرا هیچ نرخی نی یەو ئەوەی ئەیڵێ پێ ی نابێتە ئیماندار، لەگەڵ تێگەیشتن و ئەو ئیمانە رێکەدا بێ کردەوە پێ ی ئەبێتە ئیماندار بەلای کۆڕی زانایانی ئیسلامەوە، بەڵام ئەو نرخەی نی یە، بەمجۆرە نابێتە پایەیەك لە پێنج پایەکانی ئیسلام.

ئەمەی کە گوترا خولاسەو پاڵفتە کراوە، قورئان و حەدیس و ئایینی پاکی ئیسلام جگە لەوەی تیادا نی یەو نایەوێ، جێگیر بوونی لەدڵ و دەروون دا زۆر زۆر پێویستە لەگەڵ رەنگ گرتن پێ ی، بۆ ئەمەی ئەو کەسەی ئەو جۆرە وشانە ئەڵێ، پێ ی ببێ بە موسڵمان و ئیماندار، هەموو بیرو باوەڕی تر کە ئیسلام نەیهێناوە فڕێ ی داو تێکەڵ و پێکەڵی نەکات، وەکو ئەبینرێ کە هەزارەها لەناو گەلی موسڵمان دا ئەو وشانە بە رێکی ئەڵێن و فەرزەکانیش بەجێ ئەهێنن لەگەڵ ئەوەدا بۆ ژیانیان باوەڕیان بە بەرنامەیەکی تر هەیە، جگە لەوەی ئیسلام هێناویەتی، هیچ هەست ناکەن بە هیچ نارێکی و دژی یەك لەنێوان ئەو دوو باوەڕەدا کە ئەیانەوێ کۆیان بکەنەوە لە دڵیان دا، باوەڕ بە ئیسلام و ئەو وشانە لەگەڵ باوەڕ بە رژێم و بەرنامەی تر، لەگەڵ ئەمەدا بە هیچ کلۆجێ ئەو دوو باوەڕە لای خوا یەك ناگرن، هەرکام بۆ ئەوی تریان نابێ.

ئینجادوو نموونه له ئادەمی ئەهێنێ و باسی ئەکات لەگەڵ پاشەرۆژیان دا نموونەیەکیان لەگەڵ سروشتی رێك و راست لەسەر رێگای راست ئەڕوا، ئەوی تریان له رێگەی راست لای داوه. لەسەرەتای باسەکەوە بە وەسیەت کردن بە چاکە لەگەڵ دایك و باوك دا دەست پێ ئەکات، ئەم وەسیەتە لە قورئان دا بە زۆری لەدوای باسی عەقیدەوە دێت یان لەگەڵ وێنەی ئەم باسەی ئێرەدا، ئەمەیش دوو شت نیشان ئەدات:

١- پەیوەندی باوك و دایك و رۆڵەیان – لەپاش ئیمان و عەقیدە – ئەبێ لە هەموو پەیوەندی یەکانی تر بەهێزتر بێت، ئەبێ زۆر بە گرنگ بگیرێ و راگیر بکرێ.

٢- پەیوەندی ئیمان و عەقیدە ئەبێ بەهێزترو لەپێش تر بێت لە پەیوەندی نێوان باوك و دایك و رۆڵەیان.

ئەم دوو نموونەی لێرەدا باس کراوە، لە یەکەم دا پەیوەندی ئیمان لەگەڵ پەیوەندی نەسەب یەکیان گرتووە، لەسەر رێگای راستی خوا ئەڕۆن، لە نموونەی دووەم دا جیاوازی کەوتووەتەنێوانیان، ئیتریەك گرتنیان نابێ،ئەفەرموێ:﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ﴾ وەسیەتمان کردووەتە لای ئادەمی بە رەوشتی چاك و کردەوەی چاك: چاکە کردن دەربارەی دایك و باوك.

ئەمە وەسیەتێکە لە لایەن خواو داهێنەری ئادەمی یەوە بۆ گرۆی ئادەمی، بە ناوی ئادەمێتی یەکەیەوە، بێ پێویستی بە سیفەتی تری، وەسیەت بە چاکە لەهەر بارێك و هەر جۆرێك، بێ هیچ قەید و مەرجێك، چونکە تەنیا سیفەتی باوکی و دایکی – بێ پێویستی بە سیفەتی تر – ئەو چاکە کردنە فەرزو پێویست ئەکات لەسەر شانی رۆڵەکان.

لە قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەم وەسیەتە زۆر جار هاتووە، بەلام وەسیەت کردن بۆلای دایك و باوك دەربارەی رۆڵەکانیان زۆر کەم هاتووە، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە ئادەمی بە سروشت – بەڵکو گیانلەبەرانی تریش – ئامادەیە بۆ هەموو چاکە و چاودێریی و خزمەتێك بۆ رۆڵەکانی بێ پێویست کردن بە هاندان و پێ گوتن و پاڵ پێوە نان، بێ منەت نان و چاوەڕوانی هیچ پاداشتێ، تەنانەت بێ چاوەڕوانی سوپاس و چاولەبەری، چونکە باوك و دایك رۆڵەکانیان بە بەش و پارچەیەك لە خۆیان سەیر ئەکەن، ژیانیان بە ژیانی

خۆیان ئەزانن، کەواتە پێویست بە هیچ شتێك ناکات، چاکەو خزمەتی خۆیان ئەکەن، بەلاّم چینی تازە بەو جۆرە نی یە، کەمتر لائەکاتەوەو بەلای چینی پێشکەوتوو لەخۆی، چونکە ئەمیش بۆ پێش دەمی خۆی ئەڕوانێ، چاوەڕوانی چین و تاقمێ ئەکات کە لەمەوە فەراهەم بێن و جێگەیان بگرنەوە، ببن بە هۆی درێژە دان بە ماوەی ژیانیان.

ئایینی پاکی ئیسلام زۆر بە گرنگی تەماشای ماڵ و خێزان ئەکات، لەبەر ئەوە لە هەموو بارو رووبەکەوە یاساو رژێمی تایبەتی بۆ داناوە، ئەگەر بێت و

بەجێ بهێنرێ و بە پێ ی ئەوانە ماڵ و خێزان پەروەردە بکرێت، هەرگیز هیچ شەڕو خراپەیە رووی تێ ناکات، ئاشکرایە بە گرنگ گرتنی ماڵ و خێزان زۆر بەجێ یە، ماڵی خۆیەتی، چونکە خۆشی و کامەرانی ئەم جیهانە بەوە ئەبێت کە گەل و کۆمەڵ رێك و پێك و پاك و خاوێن بێت، گەلیش لە ماڵ و خێزان پێك دێ، بە وێنەی پێك هاتنی خانە لە خشت و کەرەسەکان، کەواتە گەلی چاك و پاك لە خێزانی پاك و خاوێن فەراهەم دێت، هەر منداڵێك لەماڵی خراپ دا پەروەردە نەبێت و بەخێو نەکرێت – وەکو ئەوانەی کە لە هەندێ وڵات دا لەژێر دەستی دایکە دەست کردەکان داو لەشوێنە تایبەتی یەکان دا پەروەردە ئەکرێن – ئەو منداڵانەی بەو شێوە پەروەردە بکرێن و گەورە ببن، لەگەڵێ بارو رووی ژیانەوە بە شێوەیەکی نالەبارو دوور لە سروشتی ئادەمی یان بۆ پەیدا ئەبێت، ئەمە شتێکە دەروون ناسی باوەڕی پێ ی هەیە، جگە لەوەش تاقی کردنەوەو بەراورد کردن روونی کردووەتەوە، ئیتر پێویست بە هیچ ناکات، ماوەی نەهێشتووەتەوە بۆ دەمبازی ئەوانە کە لە سروشتی ئادەمێتی دەرچوون.[1]

ماڵی دایك زۆر گرنگترە لە ماڵی باوك وەکو لە فەرمایشتی پێغەمبەردا(ﷺ) روون ئەبێتەوە، پیاوێ عەرزی کرد: ئایا کێ لە هەموو کەس شایانترە بۆ ئەوەی چاکەی لەگەڵ بکەم؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: دایکت، ئەمجار وتی: لەپاش ئەو کێ؟ دووبارە فەرموی: دایکت، لەجاری سێ یەم دا فەرموی: باوکت.

---

[1] ئەم باسە پشت بەخوا لە شوێنی تردا بە درێژیی لێ ی ئەدوێین، بە تایبەتی لە سورەتی ﴿التحريم﴾ و ﴿الطلاق﴾ دا.

جا لێرەدا قورئان هەندێ لە سزاو ئەرك و نارەحەتی دایك نیشان ئەدات، هەركەسێ بیری لێ بكاتەوە تێ ئەگات كە پاداشتی دایك نادرێتەوە بە هیچ چاكەیەك لەم لایەن رۆڵەكانی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾ [1] ئادەمی دایكی هەڵیپێچاو نە سكی دا هەڵی گرتووە ئەو ماوە بە سزاو زەحمەت، ئەو بارە گرانەی داناوەو بوویەتی بە زەحمەت و نارەحەتی، بەو هەموو ئێشە سەختەوە، ماوەی هەڵگرتنی ئەو بارە گرانەو برینەوەی لەشیر(٣٠) مانگە، جا وەرە بیر بكەرەوە لەو هەموو سزاو مەینەتەكە دووچاری دایكی هەژار دەبێت!!

یەكێ لە نایابی و بێ وێنەیی قورئان ئەوەیە كە هەموو وشەیەكی بە گوێرەی ماناو مەبەستی ئەو شوێنەیە: بۆ ئەم مەبەستی ئەرك و زەحمەتی دایكە، ئەوەیە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿كرها... كرها﴾، لە سورەتی ﴿لقمان﴾ دا ئەفەرموێ: ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ﴾ هەردووكیان شێوەی نكەو هەناسەی توندی نیشان ئەدەن، وەكو ئەو كاتەی كە باری(حەمل) گران ئەبێت.
هەروەها یەكێكی تر لە عەجایەبی قورئان ئەوەیە: ئەو شتانەی ئەیخاتە پێش چاو بەڵگەو دەلیل بێت، یان هەرچی تر بۆ هەموو تاقمێ دەست ئەدات، بۆ هەموو جۆرە ئادەمیزادێك بەكار دێت، بە وێنە ئەم زەحمەت و ئەرك و مەینەتی دایكە كە لێرەدا ئەیخاتە پێش چاو، هەموو جۆرە ئادەمی یە لە هەر شوێنێ ژیابێ، ئەزانێ كە ئەو زەحمەت و ئەركە زۆر گران و قورسە. بەڵام بە گوێرەی زانیاری و زانینی تازە لێ ی بكۆڵینەوە باشتر روون ئەبێتەوە رادەی ئەو زەحمەت و ئەرك و فیداكاری یەی كە دووچاری دایكی هەژار ئەبێت لە پێناوی پەیدا بوون و شیر پێدانی رۆڵەكانی دا. بنەڕەتی منداڵ بریتی یە لە دوو شت:

---

[1] حەزرەتی عەلی – خوای لێ رازی بێت – لەم ئایەتەو ئایەتی سورەتی ﴿لقمان﴾ دا: ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ﴾ هەروەها ئایەتی سورەتی ﴿البقرة﴾: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾... هتد. لەم ئایەتانەوە وەری گرتووە كە لای خوارووی ماوەی منداڵ لە سك دا ٦ مانگە، كەواتە لێرەدا لای .خوارووی ماوەی حەملی باس فەرمووە لەگەڵ لای ژووروی ماوەی شیر پێدان، هۆی ئەوەیش بە گوێرەی تێگەیشتنی ئێمە ئەوەیە كە ئەو دوو تەرەفە مەزبوت و نەگۆڕاوە، زانینی تەواو لای خوایە.

١- له لایەن باوکەوە پێی ئەگوترێ خانەو سێل(خلية).

٢- له لایەن دایکەوە پێی ئەگوترێ گەرا(بويضة).

ئەم دووانە کە یەکیان گرت بەم جۆرە(بويضة) پێوەن بوو بە(خلية)، ئیتر دەست بەجێ ئەنوسێن بە دیواری منداڵدانەوە، ئەیدڕن و زامداری ئەکەن بۆ ئەوەی خوێنی لێ بێت تا هەڵی مژن، بەو جۆرەیش ناوەستن، لەبەرەوە خوێنی خولاسەو پاڵفتە لە هەموو لەشی دایکەوە دێت بۆیان تا حەوزێکی خوێنینیان بۆ فەراهەم دێت، ئەوانیش تیایدا ئەسوڕێنەوەو مەلە ئەکەن، هەموو کات بێ تێر خواردن لەو خوێنە ئەخۆن تا بژین و پەرە بسێنن و گەورە بن. ئەوان بەو جۆرە بێ وەستان خوێنی دایکیان ئەمژن و کەنە لە لەشی ئەکەن، دایکی هەژاریش لە بەرەوە ئەخوات و ئەخواتەوە، ئەو خۆراکە گرنگە بۆ ئەو چڵێسە تێر نەخۆرانە پەیدا ئەکات!!

ئەمەی کە گوترا ئەندازێکی زۆر کەمە وەکو نموونە، درێژەی ئەم باسە هەڵ ئەگرین بۆ شوێنی خۆی بە تایبەتی بۆ سورەتی ﴿الذاريات﴾ و ﴿الرحمن﴾ و ﴿الطلاق﴾ بە یارمەتی خوای گەورە. ئینجا زەحمەت و ناڕەحەتی لەدایك بوون و شیر پێدان و پەروەردە کردن و چاودێریی، لەگەڵ ئەو هەموو سزاو مەینەتەدا بە کەیف و خۆشی بە سەدەقە و قوربانی ئەبێ، کەواتە ئادەمیزاد ئەگەر هەرچی بکات ناگاتە ئەوەی هەڵسێ بە پاداشتی ئەو دایکە، لەگەڵ ئەوەدا ئەوانەی کە خراپەو بێ شەرمی یان نەبێ و ئەندازی چاکە بکەن، کەمترن لەوانەی چاکە ناکەن و خراپەی زۆر دەربارەی دایکیان ئەکەن، کە ماف بەو رادە گەورەو گرنگە لای خوا! ئای چەند راست و شیرینە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لە وەڵامی ئەو پیاوەی کە دایکی گرتبوو بە کۆڵی یەوەو تەواف کەعبەی پێ ئەکرد، پرسیاری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ماف دایکم بەسەر خۆمەوە بەجێ هێناوە، ئەویش فەرمووی: ﴿لا ولا بزفرة واحدة﴾[1].

---

[1] حافظ و أبوبكر البزاز لە بریرەوە ئەویش لە باوکی یەوە هێناویەتی.

حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ

---

ئینجا دێته سەر باسی نموونەی چاك ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ﴾ ئادەمی کە بەو ئەرك و زەحمەتە بەسەر شانی دایکی یەوە پەیدا ئەبێ بەشێك بەم جۆرەیە: پێ ئەگات و گەورە ئەبێ هەتا ئەگاتە هێزو ژیریی تەواوی خۆی.

ئەم پلەو قۆناغە لە نێوان(سی و چل) دایە، تەمەنی(چل) ئەوپەڕی پێگەیشتنە، لەم تەمەنەدا هەموو هێزو وزەکان تێرو تەواو ئەبن، ئادەمیزاد ئامادە ئەبێ بۆ بیر کردنەوەو تێفکران، لەو کاتەدا ئەگەر خاوەنی سروشتێکی ڕێك و ڕاست بێت بیر ئەکاتەوە لەم ژیانەو پاش ئەم ژیانەو پاشەڕۆژی خۆی، ئەزانێ ئەوا بەشێك لە تەمەنی ڕۆیشت و لەمەوپاش بەرەو نەمان ئەڕوات، لەبەر ئەوە لە نەفامی رابوردوو ئەگەڕێتەوە روو ئەکاتە خوای گەورە: ﴿قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾ ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم بنێرە دڵم کە سوپاسی نیعمەتێك بکەم کەداوتەورشتووتەبەسەرما و بەسەر دایك و باوکم دا، واتە نیعمەتی ئایینی پاکوخاوێن وخواناسی، یان هەموونیعمەتەکان بەشێوەی گشتی کە نایانە ژمارە!

ئەو بەندە چاکە خواناسە یەکەم جار هەست ئەکات بە نیعمەتی خوا، کە خۆی و دایك و باوکی داگرتووەو داپۆشیوە، گەورەیی و زۆریی و گرنگی ئەو نیعمەتەی بۆ روون ئەبێتەوە، لەگەڵ بێ نرخی و کەمی کردەوەی خۆی، لەبەرئەوە بەم جۆرە داوای یارمەتی ئەکات لە پەروەردگاری کە یارمەتی بدات و بنێتە دڵی بۆ ئەوەی هەڵسێ بە سوپاس کردن. ئەمە یەکەم داوای بوو.

دووەم: ﴿وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ﴾ یارمەتیم بدەیت و بنێیتە دڵم کە کردەوەی چاکی وەها بکەم کە تۆ رازی بیت پێی، واتە ئەوەی مەبەست و ئامانج بێت رەزامەندی خوایە.

﴿وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾﴾

**سێ یەم: ﴿وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ﴾ سەلاحەت و کردەوەی باش لەناو ڕۆڵەو نەوەکانم دا فەراهەم بێنە، لەبەر سوودی من، واتە ئەو کردەوە چاکەی کە هۆی ڕەزامەندی تۆیەو بە یارمەتی خۆت بە من بەجێی ئەهێنی، ئەو کردەوە چاکە بهێڵەو بەردەوامی بکە لەناو نەوەکانم دا. بێگومان ئەولادو نەوەی چاك لە ئاوات و ئامانجە گرنگەکانی بەندەی خواناسی موسڵمانە، لە هەموو گەنج و گەوهەرێ خۆشەویست ترە بەلایەوە، چونکە یەکێکە لەو سێ شتەی کە هۆی نەبڕانەوەی چاکەی ئادەمین پاش مردنی خۆیان، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿إذا مات ابن آدم انقطع عمله إلا من ثلاث﴾ یەکێ لەم سیانە ئەفەرموێ: ﴿وولد صالح یدعو له﴾. ئەم نموونە چاکە لە ئادەمی نزاکەی درێژە پێ ئەدات لە دایك و باوکی یەوە بۆ ڕۆڵەو نەوەی لەپاش خۆی بۆ ئەمەی هەموو چین و تاقمەکانی پێش و پاشی خۆی یەك بگرن لە خواناسی و گوێڕایەڵی دا، دیاریی دەستی بۆلای خواو شتێ کە ئومێدی وایە ببێتە هۆی وەرگرتنی نزاکەی ئەمەیە کە ئەڵێ: ﴿إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ بێگومان من تۆبەم کردووەتە لای تۆ، من یەکێکم لەوانەی کە گەردن کەچ و گوێڕایەڵین، کردەوەی خۆیان پاك و خاوێن ئەکەن بۆ تۆ. ئەم بەندە ساڵحە بەو جۆرە بوو لەگەڵ خوای خۆی دا کە باس کرا، خوای خاوەن ڕەحم و بەزەیش پاداشتی ئەو جۆرە کەسانە ئەداتەوە بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ ئا ئەوانەی کە سیفەت و نیشانەکانیان ئەوانە بوون کە باس کران، ئەوانەی کە تەوبەو گەڕانەوەیان بۆلای خوایە، ئەوانە کەسانێکی ئەوتۆن کە چاکترینی ئەو کردەوانەی کردوویانە[1]– واتەتاعەت وفەرزو سوننەتیان – وەرئەگرین لێ یان، چونکە ئەجرو پاداشتیان لەسەر ئەمانەیە، ئەبورێین و چاوپۆشی ئەکەین لە خراپەکانیان لەکاتێ دا کە لە کۆمەڵی بەهەشتی یەکانن لە ڕۆژی دوایی دا، بەو جۆرەیان لەگەڵ ئەکەین بە پێی بەڵێنێکی ڕاستی ئەوتۆ کە لە دنیادا پێیان دراوە.**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە کە بە گوێرەو ڕادەی گەورەترین کردەوەیان، هەموو کردەوە چاکەکانیان پاداشتی هەیە وەکو لە سورەتی ﴿الزمر﴾ دا ئەفەرموێ: ﴿وَيَجۡزِيَهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾.

وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِى وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾

**نموونەی خێرو چاکە لێرەدا باسی دوایی هات بە سیفەت و نیشانەو پاشەرۆژی چاکیانەوە، ئینجا دێتە سەر باسی نموونەی شەڕو خراپە بە باسی هەندێ لە سیفەت و نیشانەو پاشەرۆژی خراپ و سەختیان.**

**ئەم رۆڵە خراپە ئەوەندە ناپەسەندە دان نانێت بە ماف و نیعمەت و چاکەی دایك و باوکی دا بەسەری یەوە، وەکو کافریشە باوەڕی نی یە بە بەڵێنی پەروەردگاری بە هاتنی رۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە، وەکو خوا ئەفەرموێ:** ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِى﴾ **کەسێك کە گوتی بە دایك و باوکی ئۆف بێت لێتان، واتە بێزاری دەرئەبڕم لێتان و بوغزو رقم هەیە بۆتان، ئایا ئێوە هەڕەشەم لێ ئەکەن بەمەی کە من زیندوو ئەکرێمەوەو لە گۆڕ دەرئەهێنرێم؟**

**لەکاتێك دا ئەو هەموو چین و تاقمە لە پێش منەوە رۆیشتن بێ ئەمەی یەکێکیان لێ بگەڕێتەوەو زیندوو بکرێتەوە، واتە ئێوە نەزانن، باوەڕتان بە شتێکی نەگونجاو هەیە، هەڕەشەیش ئەکەن لە من بەو شتە نەگونجاوە!!**

**ئەو رۆڵە ناپەسەندە بێ شەرم و بێ باك بەو جۆرە کوفرو بێ باوەڕی خۆی دەرئەبڕێ لای دایك و باوکی،** ﴿وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ﴾ **ئەوانیش هاوار ئەکەنە لای خوا کە پەنایان بدات و بێت بە هاواریانەوە لە خراپی ئەو رۆڵە بێ باوەڕەیان یان خوا بێت بە هاوارەوە بۆ رێنموونی و هیدایەتی ئەو رۆڵە بێ باوەڕەیان، یان ئەڵێن پێی:** ﴿وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ **هاوار بۆ تۆ، عەمرت نەمێنێ، باوەڕ بێنە، بێگومان بەڵێنی خوا راستەو دێتە جێ،** ﴿فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ **لەپاش ئەو ترساندن و ئامۆژگاری یە ئەو هەر سوورە لەسەر بێ باوەڕیی یەکەی، ئەڵێ: ئەمەی ئێوە باوەڕتان پێی هەیە هیچ نی یە جگە لە قسەی پڕوپووچ و نووسراوەی کۆنی گەلە پێشووەکان، کە بەجێ ماون لێ یان!!**

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ﴿٢٠﴾

---

**لەهەموو چەرخ و چینێك دا وێنەی ئەو رۆڵە خراپە زۆر بووەو زۆریش هەیە، دەربارەی هەموو ئەوانە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە بڕیاری سزاو عەزاب لەسەریان جێگیر بووە لە لایەن خواوە، لە ریزی چەند گەل و کۆمەڵێ کە هاتن و رۆیشتن لە پێش ئەمانەوە، لە تیرەی جین و ئادەمی، چونکە ئەوانە لای خوا لە پێشەوە زانراون کە رەنجەڕۆو خەسارەتمەند ئەبن، خوا پەنامان بدات لە غەزەبی خۆی و یارمەتیمان بدات دووچاری رەنجەرۆیی و خەسارەتمەندی نەبین.**

**ئوف هەزار جار ئوف لە خەسارەتمەندی وەها: لە دنیا بێ بەشن لە ناسینی خواو ئیمان بە بەرنامەی خواو حەوانەوە لە سایەی سەھەندو سێبەری ئەو ئیمانەدا، ئینجا خەسارەتمەندی و لەدەست چوونی رەزامەندی خواو نازو رێزی بەهەشت، دوای سزاو عەزابی دۆزەخ و مانەوە تێیدا بێ بڕانەوە، خوا پەنامان بدات.**

**لەپاش ئەوە بە کورتی باسی پاداشت و تۆڵەی ئەو دوو کۆمەڵەی کرد، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە پرسیارو موحاسەبە بە وردی ئەکرێ، هەموو یەکە یەکە بە جیاواز، هەموو کەس بە گوێرەی کردەوەی خۆی رەفتاری لەگەڵ ئەکرێ، جیاوازی رادەو پلەی پاداشت و تۆڵە بە پێی کردەوەکانە، ئەفەرموێ: ﴿وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ چەند رادەو پلەی جیاواز هەیە بۆ هەموو ئەو دوو کۆمەڵە، لەبەر جیاوازی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، لە زۆری و کەمی و قورسی و سووکی و گەورەیی و بچووکیان دا، خوای گەورە بەو جۆرە ئەکات بۆ ئەوەی پاداشت و تۆڵەی کردەوەکانیان بۆ بەجێ بێنێ، ئەوانە هیچ زوڵمیان لێ ناکرێ بە کەم کردنەوەی پاداشت یان زیاد کردنی ئەندازەی تۆڵە، بەڵێ وەکو چەند جار**

باسمان کرد، خوا لوتفی زۆره هەموو کات پاداشت بە زیاد ئەداتەوە، لای خوارووی بە دەقات، بەڵام تۆڵەی بە ئەندازەی تاوانەکەیە.

لە بابەت ئەم دوو نموونەوە کە باسکران، چەند حەدیسێ ئەگێڕنەوە، کە مەبەست پێیان چەند کەسێکی تایبەتین. بۆ وێنە: بۆ یەکەم: حەزرەتی ئەبوبەکر، دەربارەی باوك و دایکی، بۆ نموونەی دووەم عبدالرحمن ی کوڕی دەربارەی باوك و دایکی. بەڵام هیچ لەم حەدیسانە سەحیح دەرناچن، زیاد لەوە ئەگەر بەهۆی کەسی تایبەتیشەوە هاتبن نابڕێن بەسەر ئەوانەدا، چونکە بە پێی ڕێزمانی عیلمی ئوسولێ هەر ئایەت و حەدیسێ لە شتی تایبەتی دا هاتبێ، بەهۆی ئەوەوە تایبەتی نابێ بەو شتەوە، بە تایبەتی لێرەدا خوای گەورە وا بەدوای هەردوو نموونەکە بڕیارێکی گشتی دەرئەکات، کەواتە چاك وایە هەر بەوێنەو نموونە تەماشا بکرێن وەکو لە تەفسیرەکەدا بەو جۆرە هاتن.

ئینجا شێوەیەك لە شێوەکانی ڕۆژی حیساب و پرسیار ئەهێنێتە پێش چاو، ئەو ڕۆژەی کە ئەمانە باوەڕیان پێی نی یە، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهَا﴾ ئەو ڕۆژەی کە کافرەکان ئەبرێن بۆ سەر ئاگر، یان ئەسوتێنرێن و پێی سزا ئەدرێن، لەو کاتەدا بە تەشەرەوە بۆ سزادانی دەروونیان پێ یان ئەگوترێ: هەموو خۆشی و لەزەتەکانی خۆتانتان دوایی هێناو تەواوتان کردن لەماوەی ژیانی دنیاتان دا، بە ئارەزووی خۆتان ڕاتان بوارد بەو هەموو نیعمەتە پاکو بە لەزەتەی کە بووتان، بێ ئەمەی گوێ بدەنە ئەم ڕۆژە، کەواتە بۆ ئەمڕۆتان خۆشیتان نەهێشتەوە، واتە هۆی ئەم سزایەتان ئەوەیە کە خوا لە دنیادا ئەو هەموو نازو نیعمەتەی پێ دابوون، بەڵام هیچ سوپاسی خواتان لەسەر نەکردووە، بە هیچ جۆر بیری ئەم ڕۆژەتان پێوە نەبوو، بەهۆی ئەوە سەرتان کردە ڕابواردن بە ئارەزووی نەفسی خۆتان، وێنەی وڵاخ و ئاژەڵ هەر ڕابواردنی ڕووت بێ پرسینەوە لە حەرام و حەڵاڵ، بەرگری خۆتان نەکرد لەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردبوون، تەنیا دنیاتان بۆ خۆتان بە ماڵ داناو هەڵتان بژارد. ﴿فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنْتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنْتُمْ تَفْسُقُونَ﴾ کەواتە ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ ئەسێنرێ بە سزاو عەزابی ڕیسوایی و بێ ئابڕوویی و زەلیلی و سەرشۆڕی، بەهۆی ئەوە کە لە دنیادا بە ناحەق تەکەبورتان ئەکرد لە زەوی دا، خۆتان بە زل ئەزانی و بە سووکی تەماشای بەندەکانی خواتان ئەکرد، هەم بەهۆی ئەوە کە لە گوێڕایەڵی خوا دەرچوو بوون، ئەو شتانەی قەدەغە بوون - بێ گوێ پێدان و سەر لێ کردنەوە - ئەتان کردن.

خوا پەنامان بدات لەم جۆرە ئادەمی یانە ئەمڕۆ زۆر زۆرە، کە ئەو سیفەت و نیشانە پیسانەیان بە زیادەوە تیادا هەیە، تەماشا ئەکەیت لەبەر نەفامی و بیٚ ئاگاییان، خۆیان بەشت ئەزانن، لوتیان ئەکەن بە کەڵە شاخ و بە چاوێکی زۆر نزم و پەستی تەماشای خەڵك ئەکەن، ئەوو رۆژ سەریان کردووەتە گوناهو تاوان لە هەموو بابەت، زۆر بە کەشخەوە خۆیان بە بەختیار ئەزانن، بیٚ ئاگان لەم پاشەرۆژەی کە قورئان ئەیفەرمویٚ، خوا پەنامان بدات لەو نەگبەتی و بەدبەختی یە، ئینجا بیٚ بڕواکان ئەترسێنیٚ بە بەرباد بوونی وێنەیان لە ئوممەت و گەلە پێشووەکان دا، کە بەربەرەکانیان ئەکرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان دا، بە کورتی نیشان ئەدات کە پاشەرۆژی ئەوانەی کە دژی پێغەمبەران و ئایینی خوا بوون هەموو هەر بەدبەختی و بەرباد بوون بووە، وەکو پاشە رۆژی بەختیاری و سەرکەوتن هەر بۆ پێغەمبەران و ئەوانەیە کە لەسەر رێبازی ئەوان رۆیشتبن. بە شێوەیەکی تایبەتی باسی هۆزو گەلیٚ ئەکات لە دانیشتوانی نیوە دورگەی عەرەب، لە پاشان بە کورتی بە شێوەی نادیاری چاوو دڵ ئەخشێنیٚ بە زۆر گەل و قەومیٚ تردا لەو دەوروبەرە کە خوا هەمووی بەرباد کردن، ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی براکەی هۆزی عاد بکە، واتە باسی هود کە پێغەمبەرێکی رەوانە کراو بوو بۆ سەر گەل و قەومەکەی، کە بەناوبانگ بوون بە عاد بەناوی باپیرە گەورەیانەوە.

لێرەدا بە سیفەتی برا ناوی برد بۆ ئەمەی خزمایەتی و هۆی خۆشەویستی پیشان بدات لەنێوان پێغەمبەرەکەو ئەو گەلەدا، لەگەڵ ئەوەدا بەو جۆرە سەرکەش و بیٚ باوەڕ بوون، کەواتە ئەم بەسەرهاتە وەکو هەڕەشە و ترساندنی تێدایە بۆ قورەیش، هەروەها دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەریشی تیادایە(ﷺ). ئەفەرمویٚ: باسی براکەی عاد بکە: ﴿إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ﴾[1] باسی ئەو کاتە کە قەومەکەی ترساند لە سزای خوا، ئەو قەومەی کە پرژو بڵاوبووەوە بەلای خوارووی نیوە دورگەی عەرەب دا – ئەڵێن: لە وڵاتی حضرموت بووە – خانووماڵیان دروست کردبوو لەسەر گردو تەپۆلکەکان، کە لە لم فەراهەم هاتبوون.

---

[1] وشەی ﴿أحقاف﴾ کۆیە، تاکەکەی ﴿حقیف﴾ ە بە مانای گردو شوێنی بەرزە کە لە لم پێك هاتبیٚ.

وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾

**ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) بەپێی فەرمانی خوا قەومەکەی ترساند، یەکەم کەس نەبوو، لەو فەرمانەدا، ﴿وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ﴾ چەند ترسێنەرانی لە پێش ئەوەوە لە نزیك و دوور لە وڵاتەکان دا هاتن و ڕۆیشتن، کەواتە شتێکی باو بووە ترساندن بەو جۆرە، کە هەموو پێغەمبەرانی تر نەتەوەو گەلی خۆیانیان پێ ترساندووە، کە کورتەو خولاسەکەی بریتی یە لە: ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئەمە کۆتایی بێنن لە بت پەرستی و جگە لە خوا هیچ شتێ تر مەپەرستن، چونکە بێگومان من مەترسی ئەکەم لە هاتنی سزای ڕۆژێکی سەخت و گەورە کە خوا بەسەرتان بێنێ لەسەر ئەو عەقیدەو باوەڕەی کە ئێوەی لەسەرن. ئایا مەبەست بەو ڕۆژە سەختە ڕۆژی دوایی یە؟ یا ڕۆژی هاتنی عەزابی ئەم دنیایە پێش سزای ڕۆژی دوایی؟ بە گوێرەی باوی خوای گەورە دەربارەی ئەو ئوممەتانەی کە کۆتایی یان نەهێنابێ لە کوفرو سەرکەشی، بە تەواوی مەنی خۆیانیان پڕ کردبێ، ئینجا خوای تۆڵەسێنەر هەریەکە ڕۆژێکی سەختی نەهاتی بەربادکەری بەسەرهێناون، هەریەکە بە جۆرە سزایە بەربادی کردوون، مەبەستی هەریەکێ لەم دووانە بووبێت ڕێکە، چونکە ئەوانە هەردوو ڕۆژەکەیان هەیە.**

**پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا وەکو عەقیدەو باوەڕ لە دڵ دا هەروەها یاساو بەرنامەیە لە ژیان دا، بە پێچەوانەی ئەوەوە هەموو جوڵانەوەو ڕەفتار کردنێ سەری لە عەزابەوە دەرئەچێ، لە دنیادا، یان لە ڕۆژی دوایی دا، یان لە هەردووکیان دا بە گوێرەی جۆری پێچەوانەکە. لە وەڵامی ئەوتەمێ و ئامۆژگاری یە ڕێکەو ئەو دڵسۆزی و ترساندنەدا، ئەو قەومە نەفامە نەگبەتە: ﴿قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ ئەیان گوت: ئایا تۆ هاتوویتە لامان بۆ ئەمەی بە درۆو دەلەسە هەڵمان خەڵەتێنی و لامان بدەیت لە پەرستنی بتەکانمان، واتە بێزاریمان هەیە دەربارەت!! بە گوێت ناکەین، دەی ئەگەر ڕاست ئەکەیت و ئەوانەی کە ڕاست ئەکەن، ئەو عەزابەمان بێنە سەر کە هەڕەشەمان لێ ئەکەیت پێی. ئەو وەڵامە ناشیرینەیان داوە بەدگومانی و تێ نەگەیشتن و لاقرتی کردن و کەشخە بە شتی پڕووپووچ و بەتاڵەوە!! بەڵام حەزرەتی هود بە ئەدەب و ئارامی پێغەمبەرێتی یەوە بەرەنگاری ئەو هەموو نەفامی و نەزانی یەیانی کرد،**

قَالَ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا۟ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَىْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا

---

بەم جۆرە: ﴿قَالَ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ﴾ وتی: من كاتی هاتنی عەزاب بۆ سەرتان نازانم، من هیچ دەست و دەسەڵاتم تێیدا نی یە تا پەلەی تێدا بكەم، زانینی ئەوە تەنیا لای خوایەو جگە لەخوا كەسی تر نایزانێ، خواخۆی ئەیزانێ لەكاتی دیاریی كراوی خۆی دا ئەیهێنێ، من ئەوەی پێی رەوانە كراوم پێتان رائەگەیەنم، پێغەمبەران جگە لە راگەیاندن هیچی تریان لەسەر نی یە. واتە دەین و هەواڵی خۆتان لەسەر خۆتانە ﴿وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾ بەڵام من ئێوە بە قەومێكی نەزان و بێ سەلیقە ئەبینم، بە نەفام و نەزانتان ئەزانم، نازانن پێغەمبەر چی یە؟ فەرمانی چی یە؟ نەفامیتان لەو رادەیەدایە دەربارەی برایەكی دڵسۆزی خۆتان كە بە راستی و پاكی تەمێتان ئەكات، ئەتان ترسێنێ بۆ ئەمەی خۆتان بپارێزن، دووچاری غەزەب و عەزابی خوا نەبن.

ئیتر لێرەدا درێژە نادات بەو بەرەبەرەكانی و دەمە دەمێ یەی كە ماوەیەكی زۆر كردیان لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا(ﷺ) بە كورتی ئەوە ئەبڕێتەوە بۆ ئەمەی بگاتە پاشەڕۆژە سەختەكەیان كە لێرەدا ئەوە پێویستەو زیادە پەیوەندی هەیە بە مەبەستی شوێنەكەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾ ئینجا كاتێ كە عەزابەكەیان بینی بە هەورێ كە پەیدا بوو لە كەنارەی ئاسمانەوە رووی كردە شیوەكانیان و بەرەو شیوەكانیان هات. كاتێ ئەوەیان بینی خۆشی و شادی یان تێكەوت و ﴿قَالُوا۟ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾ وتیان ئەمە هەورێكە بارانمان بۆ ئەبارێنێ.

چەند ریوایەتێك هەیە كە ئەو قەومە لە پێشەوە دووچاری گەرماو بێ بارانی و وشكی بوون، بە جۆرێ دووكەڵ لاسەری گرتبوون، ئینجا خوا بایەكی بەهێزی وێران كەری رەوانە كردە سەریان، كاتێ هات لە شێوەی هەوردا بوو، ئەوانیش لە خۆشیدا بەرەو پیری چوون بۆ ناو شیوەكان، بەڵام حەزرەتی هود(ﷺ) دای لە دەماغیان و فەرمووی پێ یان: ﴿بَلْ هُوَ مَا

﴿ ... اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ﴾[1] نەخێر وا نی یە کە ئێوە گومانتان بردووە، بەڵکو ئەوە ئەو عەزابەیە کە ئێوە پەلەتان پێ ئەنمایەوە، بە گاڵتەو لاقرتی یەوە. ئەوە: ﴿رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بایەکە سزایەکی سەخت و ئێش و ئازار گەیەنەری تێدایە، ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾[2] بایەکە هەموو شتێکیان بە هیلاك دا ئەبات و بەربادی ئەکات: خۆتان و ماڵ و حەیوان و ئاژەڵ و هەموو شتی ترتان، ئەمەیش لە لایەن خۆیەوە، بەڵکو بە پێی ئەمرو فەرمانی پەروەردگارێتی، چونکە هیچ جوڵانەوەو هیچ وەستان و هیچ رووداوێك لەم بوونەوەرەدا روونادات و پەیدا نابێت بە ئەمرو فەرمانی خوا نەبێت.

قورئان ئەو بایە بە جۆرێك نیشان ئەدات، کە زیندوو تێگەیشتووەو فەرمانی پێدا دراوە، ئەویش بە گوێرەی فەرمانەکە ئەجوڵێتەوە، ئەمە تەنها لێرەدا نیشان نادات، بەڵکو قورئان زۆر بە گرنگی ئەو شێوە نیشان ئەدات لە زۆر شوێن دا: دەربارەی زەوی و هەموو شتێك کە لەم بوونەوەرەدا هەیە، هیچ پێویست نی یە ئەو ئایەتانە لە شێوە ئاشکراکەی لابدەین و دەست بکەین بە تەئویل کردن لەبەرئەوەی لەگەڵ باوی ئێمەدا ناگونجێن و ئێمە هەستی پێ ناکەین، بەڵکو دروست نی یە لادانی ئەم جۆرە ئایەتانە لە دیمەنەکەیان بێ بەڵگەیەکی ئاشکراو روونی بەهێز، کەواتە باوەڕمان وابێت کە ئەم ئەرزو ئاسمان و دارو بەردو هەموو هێزو وزەکانی ئەم بوونەوەرەو هەموو شتێکی تر – کە ئێمە بە زیندوو تێگەیشتووی نازانین – باوەڕمان وابێ کە ئەمانە هەر زیندوون و گیانێکی تایبەتی خۆیان هەیە، هەست ئەکەن بە هەموو فەرمانێ کە پێ یان سپێررا بێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە، بەهیچ جۆر سەرپێچی یان نی یەو سەرکەشی ناکەن، وەکو زۆربەی ئێمە ئەیکات کە بەلای خۆمانەوە زیندوو تێگەیشتوو خاوەن هەست ئێمەین!!

لەناوئادەمیدائەوانەی ئیمانی بەهێزیان هەیەو چاوی دڵیان کراوەتەوە بە ناسینی خوای گەورە،ئەوانەهەست بەراستی ئەوەئەکەن وئەتوانن پەیوەندی بکەن لەگەڵ ئەوشتانەدا،شتیان لێوەربگرن ومەبەستی خۆیانیان پێ بگەیەنن،بەشێوەوجۆرێ ترجگەلەوەی باوەلەناوئێمەدا.

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: ئەمە قسەی زمانی حاڵە، بەلام لەبەرئەوەی خوێندنەوەی بەم جۆرە هاتووە: ﴿قل بل هو﴾ تەفسیرەکەم بە گوێرەی ئەو رایەی کە ئەڵێ قسەی حەزرەتی هودە ئەم خوێندنەوە با شاز بێت، ئەوەی تەفسیرەکە بەهێز ئەکات.

[2] هەرچەندە شێوەکە گشتی یە، بەلام تایبەتی یە بە شتومەکی ئەو کۆمەڵەوە وەکو لە عیلمی ئوسوڵی فیقهدا باس کراوە، کە هەست و عەقڵ و بڕیاری تایبەتی ئەدات بۆ شتی گشتی.

فَأَصْبَحُوا۟ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾

---

**ئەم بوونەوەرە چەندەها شتی نهێنی تیادایە، ئێمە هیچ ئاگامان لێ یان نی یە، هەر هیچ نەبێ با ئەم هێزو وزانەی کە بەرەبەرە بەرهەمیان دەرئەکەوێ، ئەمانەی کە لەمەوپێش بە خەویش بەدڵ دا نەئەهاتن، با ئەمانە بکەین بە بەڵگەو دروشم بە دەستمانەوە، بۆ ئەوەی لە خۆمانەوە بڕیاری نەبوون و نەگونجاوی نەدەین بەسەر هەر شتێك دا کە عەقڵمان بڕ ناکات.**

**کەواتە باوەڕمان وایە کە ئەو بایەی خوای گەورە ڕەوانەی کرد بۆ عەزابی ئەو هۆزە زیندوو خاوەن هەست بوو بەو فەرمانەی کە پەروەردگاری پێی سپێرابوو بە ڕێکی بەجێی هێنا، بەم جۆرە ئەو بێ باوەڕە سەرکەشانەی بەرباد کرد، ﴿فَأَصْبَحُوا۟ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ﴾ بەجۆرێ وایان لێ هاتبوو جگە لە شوێن و ماواکەیان هیچ شتێ تر نەئەبینرا، خۆیان و ماڵ و سامان و وڵاخ و ئاژەڵیان هیچی نەما، بەس شوێن و ماوا رووتەکە بێکەس و بی هیچ!! ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئا بەو شێوەو بەو جۆرە تۆڵە ئەسێنین لە قەوم و گەلە تاوانبارەکان، واتە ئەو عەزاب و تۆڵە سەندنە ڕەوشتێکی دامەزراوە دەربارەی ئەوانەی کە بەربەرەکانێی پێغەمبەران و ئاینی خوایان کردبێ، کەواتە با سەرکەشەکانی ئەم ئوممەتە بترسن لەخۆیان و بگەڕێنەوە لەو بارە لارەی کە لەسەرینی، وەکو بەم فەرمودەش باش مەترسی ئەخاتە دڵیان ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ئەو بایە بەربادی کردن دەسەڵات دارمان کردبوون، بە فراوانی ماوەمان دابوون لە شتێکی ئەوتۆدا کە ئێوەمان دەسەڵات دار نەکردووە تێیدا، واتە ئەو شتانەی کە دابوومان بەوان لەهۆی دەسەڵات و بەرزی و سەرکەوتن لە دنیادا بە ئێوەمان نەداوە، گوێچکە و چاوو دڵمان پێدابوون، واتە هۆی فام و تێگەیشتنمان پێدا بوون کە تێفکرین و ڕێگەی ڕاست بدەنە بەر، کەچی نە گوێچکەکانیان و نە چاوەکانیان و نە دڵەکانیان سوودی هیچ شتێکیان پێ**

نەگەیاندن!! لە کاتێك دا بەهۆی ئەوەوە کە بیریان نەئەکردەوە لە نیشانەو بەڵگە ئاشکراکانی خوادا، دانیان پیادا نەئەنا، کەواتە خۆیان ئەو شتە گرنگانەیان لە کار خستبوو، بەکاریان نەئەهێنان لە شتێك دا کە سوودی راستەقینەی ببێت بۆیان، بەهۆی ئەوەوە دووچاری ئەو عەزابە بوون، ئەو عەزابە کە گاڵتەیان لێ ئەهات، بە لاقرتی یەوە پەڵپیان پێ ئەنایەوە: ئەو عەزابە هاتە سەریان، چواردەوری دان. کەواتە لە جێ یە ئەوانە بەو زۆرو دەسەڵاتەوە بە با ئەوەیان بەسەرهات ئەبێت ئەوانەی بەربەرەکانێیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد خراپتریان لێ بکرێ و بەرباد بکرێن، کە بە دیمەن عەزاب دانیان ئاسانترە، هەرچەندە بۆ خوا هیچ شتێك قورس و گران نی یە، هەموو شتێك وەك یەك ئاسانە.

ئەبێ هەموو خاوەن فامێك لەم جۆرە ئایەتانەوە پەندو ئامۆژگاری وەرگرێت، هیچ کەس بە هیچ زۆرو دەسەڵات و بە هیچ شتێك نەخەڵەتێ و نەنازێ و مەغرور نەبێ، ئەوەتا چەندەها خاوەن سامان و لەشکرو هێز هاتن، هیچ لەوانە فریایان نەکەوت و سوودی هیچی نەبوو!!

ئینجا بە کورتی بەرباد بوونی دانیشتوانی دەوروبەری خۆیانیان ئەخاتە پێش چاو، کە شوێن و ماواکەیان ناسراو بوو لایان، وەکو عاد کە باس کرا، سەمود لە حیجردا و سبأ لە یەمەنداو مەدیەن و شارەکانی قەومی لوط کە لەسەر رێگای شام بوون، رائەبوردن بە لایان دا کاتێ ئەچوون بۆ کاروان بەرەو شام، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بەڕاستی لەناومان برد دانیشتوانی ئەو شارو وڵاتانەی کە بە چواردەورتان دا بوو، چەند جۆرو شێوەیەك دەلیل و بەڵگە روونەکانی خۆمانمان نیشان دان، بەڵکو بە هۆیانەوە بگەڕێنەوە، بەڵام نەگەڕانەوە، ئینجا ئێمەیش بەم جۆرە بەربادمان کردن، هەریەکە بە جۆرە عەزابێ کە لەپاش خۆیان بوون بە دەنگ و باس، دانیشتوانی مەککە ئەو دەنگ و باسانەیان بیستبوو، لەم سەرو لەو سەرەوە شوێن و ماوایان ئەبینن، ئەوانە هەموو بت پەرست بوون، وەکو بت پەرستەکانی مەککە، بە ئومێدی ئەوە کە لە تەنگانەدا فریایان بکەون و بەرگری عەزاب و نارەحەتی یان لێ بکەن. جا لێرەدا خوای گەورە سەرنجی مەککەیی یەکان رائەکێشێ بۆ ئەمەی کە ئەو گەلە پێشووانە بەو جۆرە کەوتنە ئەو تەنگاوو عەزابە تا بەرباد بوون، کەچی بتەکانیان هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن!! کەواتە با ئەمانیش لەوانەوە تەمێ خوار بن کۆتایی بێنن لەو باوەڕە بێ جێ و پڕو پووچەی کەوان لەسەری،

﴿فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٨﴾﴾

---

ئەفەرمویێ: ﴿فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ﴾ دەی با ئەو بتانەی کە ئەو گەل و قەومانە بڕیاریان دابوون بە پەرستراوی خۆیان، جگە لە خوا ئەیانپەرستن بە ئومێدی ئەوەی نزیکیان بخەنەوە لە خواو تکاو لاڵەیان بۆ بکەن لای خوا، دەی با ئەوانە فریای ئەو گەلانە بکەوتنایەو یارمەتی یان بدانایەو بەرگری ئەو عەزابانەیان بکردایە، کەچی ئەوە بوو هیچ سوودیان نەبوو، یارمەتی یان نەدان!! ﴿بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ﴾ نەك یارمەتی دان، بەڵکو لێ یان ون بوون، هەر نەیشیان ئەزانی لە کوێن!! چ جای دەست گرتن و یارمەتی دان ﴿وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ ئەوەبوو درۆ زلەکەی ئەوان، ئەوەبوو کە بە ناحەق و دەست هەڵبەست ئەیان کرد. واتە دانانی ئەو بتانە بە پەرستراوو باوەڕ بەوە سەری لەو عەزابە سەختانەوە دەرچوو، بە ریسوایی و زەلیلی و سەرشۆڕی یەوە، لە دنیادا بەرباد کران و بەرەو ئاگری نەبڕاوەی دۆزەخیش بەڕێ کران، کەواتە با قورەیش لە هاوڕێ و وێنەکانی خۆیانەوە تەمێ خوار بن و کۆتایی بێنن لەو ناحەقی یە کەوان لەسەری.

ئینجا لە دوا دوایی سورەتەکەدا ئەچێتەوە سەر مەبەستە گرنگەکەی سورەتەکە، کە بریتی یە لە بەهێزکردنی عەقیدەو ئیمان و داڕشتنی لە دڵ و دەروون دا، ئەویش بە گێڕانەوەی بەسەرهات و قسەی کۆمەڵێ لە جن کە گوێ یان گرت لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) بە هۆی ئەوەوە زۆر سەرسام بوون لەو وتارە نایابە، کاری لێ کردن و ئیمانیان هێناو گەڕانەوە بۆ ناو قەومەکەیان، بانگی ئەوانیشیان کرد بۆ ئیمان هێنان، بێگومان شتی وا زۆر گرنگە لەوانەیە دڵی ئادەمیزاد بێدار بکاتەوەو بیخاتە ئیش، چونکە ئادەمی باشتر ئەبێ ئیمان بێنێ بەم قورئانە کە لە بنەڕەتەوە بۆ ئادەمی هاتووە، بە تایبەتی قورەیش و گەلی عەرەب، کە لەو کاتەدا باوەڕێکی تایبەتی یان هەبووە بە جن، بە وێنە: لەناویان دا باو بوو ئەگەر یەکێکیان بە شەودا لە چۆڵی یەك دا بمایەتەوە، ئەیوت: ﴿اعوذ بعظیم هذا

الوادي﴾ یان ﴿بسيد هذا الوادي﴾ [1] هەندێکیان هەر بە تەواوی ئەیانپەرستن!! دەی ئەوا خوا لەم قورئانەدا – کە سەرسام بوون، تێیدا، زۆربەیان ئەیانزانی کە راستە، هەر عینادو سەرکەشی یان بەکارهێنا – ئیمان و گەردن کەچی ئەو کۆمەڵە(جن) ەی پێکەیاندن لەگەڵ شایەتی دانیان لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی ئەم قورئانە هەیە بە تەوراتەوەو یەك سەرچاوەیان هەیە، هەروەها ئەوانیش – وەکو قورئان – ئەم زەوی و ئاسمان و بوونەوەرەیان ئەهێنایەوە بە بەڵگەو دەلیل لەسەر دەسەڵاتی خوای گەورە بەسەر زیندوو کردنەوەدا، کە ئەمان لەبەر نەفامی یان سەریان ئەکردەوە لەمەی کە زیندوو بوونەوە شتێکی گونجاو و راستە.

وتاری ئەو کۆمەڵە(جن) ە چەند شتێکی تیادایە، کە بنەڕەتە بۆ عەقیدەیەکی تەواو، ئەو شتانەیش ئەمانەن:

١- باوەڕ بە سروش(وحی) خوا.

٢- یەکێتی عەقیدە لە نێوان قورئان و تەورات دا.

٣- دان نان بە راستی ئەوەی کە قورئان رێنموونی ئەکات.

٤- باوەڕ بە رۆژی دوایی و چ کردەوەیەك ئەبێتە هۆی عەزاب و سزا.

٥- دان نان و باوەڕ کردن بە هێزو دەسەڵاتی خوا بەسەر ئەم دروست کراوانەدا.

پێش ئەوەی کە وتاری ئەو کۆمەڵە بێنین و روونی بکەینەوە، باش وایە کە هەندێ لە بابەت(جن) ەوە بدوێین، چونکە لە بابەت ئەم تیرەوە رای ئادەمیزاد سێ جۆرە:

ا- کۆمەڵێ باوەڕیان پێ ی هەیە، بەڵام زۆر زیادە رەوی ئەکەن لە شانیان دا، ئەم باوەڕە لە کۆنەوە هەیە.

ب- کۆمەڵێك باوەڕیان بە بوونیان نی یە، هەروەها هەر شتێ کە هەستی پێ نەکەن.

---

[1] پەنا ئەهێنم بە گەورەو سەرۆکی ئەم شێوە لە هەموو شەڕو ناخۆشی یەك.

ت- کۆمەڵێ باوەڕیان پێی هەیە، بەو جۆرەی کە قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردووە بێ زیادو کەم.

جا لێرەدا ئەم رایەی سێ یەم روون ئەکەینەوە بۆ ئەمەی ئەم بگیرێ و جگە لەم ژێر پێ بکرێ، لەدڵ دەربکرێ. باوەڕمان هەیە کە تیرەیە لە دروست کراوانی خوا هەیەو ناوی(جن)ە، هەرکەس باوەڕی بە بوونی ئەم تیرە نەبێ کافرە، لە ئایینی خوا دەرئەچێ، چونکە پێچەوانەو دژی فەرمایشتی خواو پێغەمبەرە(ﷺ) ئەم تیرە لە ئاگر دروست کراوە - وەکو ئادەمیزاد لە خاك دروست کراوە - شەیتان لەم تیرەیەیە، ئەوان ئادەمی ئەبینن، بەڵام ئادەمی ئەوان نابینێ، ئەوانیش وەك ئادەمیزاد چەند بەرەو تایفەیەکن و توانای ژیانیان لەم زەوی یەداو لە ئاسمانیش دا، توانای کارکردنیان هەیە لەدڵ و دەروون و هەستی ئادەمی دا، ئەتوانن دەنگی ئادەمی ببیستن، لە قسەیان تێ ئەگەن. ئەم تیرەیەش وەکو ئادەمیزاد کافرو موسڵمانیان هەیە، ئەم ئەندازە هیچ گومانی تێدا نی یە، ئیتر بێ بەڵگەو دەلیل هیچی تری لێ ناڵێین، ئەم ئەندازەیەش بەسەو لەمە زیاتر پێویستمان نی یە، لە بابەت کات و شوێن و هۆی ئەم رووداوەوە چەند فەرمودەیەك هەن، لەناو هەموان دا فەرمودەیەك ئەهێنین کە زۆرتر جێگای باوەڕە، چونکە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە مەسنەدی خۆی داو بەیهەقی لە کتێبی(دلائل النبوة) داو بوخاری و موسلیم لە سەحیحی خۆیان دا ئەم فەرمودەیان هێناوە، کە هەر یەکە لە رێگای خۆیانەوە ئەیبەنە سەر ئیبن و عەباس - خوایان لێ رازی بێت - ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەو(جن) انەی نەدیوە، قورئانی بەسەر ئەوان و بۆ ئەوان نەخوێندووە، بەس هەواڵەکە بەم جۆرەیە: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێ لە یارەکانی لە مەککەوە دەرچوون، بە نیازی بازاڕی عکاظ، لەو کات و سەردەمەدا جن و شەیاتینی بەرگری کرابوون لە چوونی ئاسمان و هەواڵ زانینی ئاسمان، بەهۆی ئەوەوە هەواڵی بەرگری خۆیانیان بە تیرەو تایفەی خۆیان دا بڵاو کردەوە، ئەیان وت: هۆی ئەم بەرگری یە ئەمەیە رووداوێکی تازەیی ئەبێ رووی دابێ، هەڵسن بڕۆن کون و قوژبنی زەوی بگەڕێن، تەماشا بکەن، ئایا چی بووبێ بە هۆی ئەو بەرگری یە؟ لەو گەردشەیان دا - بە خواهیشی خوا - ئەو

کۆمەڵە لە(تومامە) وە هاتن و گوزەریان کرد بە(نەخلە) دا لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) خەریکی پێش نوێژی بەیانی بوو بۆ هەندێ لە یارەکانی، لەو شوێنەدا کاتێ کە دەنگی قورئان خوێندنی پێغەمبەریان بیست وەستان و وتیان: والله ئەمەیە بووەتە هۆی بەرگری!!، ئینجا گەڕانەوە بۆ ناو قەوم و گەلەکەیان، وتیان: گوێمان لە خوێنراوەیەکی نایاب بوو، ڕێنموونی ئەکات بۆ ڕێگای ڕاست، ئێمە هەرگیز هیچ کەس ناکەین بە هاوبەشی بۆ خوا، خوای گەورەیش وەحی کردە لای پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ ئەوەی سرووش کرابوو بۆلای وتاری ئەو(جن) یانە بوو، کەواتە مەبەست بەم ئایەتانەو ئایەتەکانی سورەتی ﴿الجن﴾ یەك ڕووداوە، وەکو ڕای بەهێزی زانایانیشی لەسەرە.

ئینجا بە جوانی ئەزانم کە هەندێ بکۆڵینەوە لەگەڵ ئەوانەی کە باوەڕیان بە بوونی(جن) نی یە: بێگومان ئەوەی باوەڕی بە خواو قورئان هەبێ شتی وا بەدڵی دا گوزەر ناکات، چونکە لەگەڵ ئیمان و باوەڕەکەیدا کۆنابێتەوە، کەواتە ئەوانەی کە پێویستیان بە لێکۆڵینەوە هەیە موسڵمان نین، جا دەربارەی ئەوانە ئەڵێین: هەندێ بیر بکەنەوە، هەروا قسە فڕێ مەدەن. ئایا بە چی بڕیاری نەبوونی(جن) ئەدەن؟ ئایا هەموو شتە نهێنی یەکانی بوونەوەرتان بۆ دەرکەوت و ئینجا بۆتان ئاشکرا بوو کە جنۆکە نی یە؟! بیرێك بکەنەوە لەم هەموو شتە نهێنی یانەی کە لەم چەرخە تازانەدا دەرکەوتن، ئەگەر لەوەوپێش هەرکەسێ باسی هەریەکەیانی بکردایە بە شێت دەرئەکرا!! هێشتا ئێمە لە سەرەتای ڕێگەی زانین و زانیاری داین، چەندەها شتی گرنگ بە ڕێکاوەیە دەرکەوێت کە ئێمە هەر بە خەیاڵیشمان دا نەهاتووە. کەواتە هەر هیچ نەبێ(جن) دابنێین بە یەکێ لەو شتە نهێنی یانە، هەر لە خۆتانەوە بە دەم بڕیاری نەبوونیان مەدەن، لام وایە ئەم تۆزە لێکۆڵینەوە بەسە بۆ هەموو خاوەن ژیری یەك و بەرگری ئەکات لەوەی لە خۆیەوە قسە فڕێدا.

وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ

**ئینجا با گویٚ بگرین بۆ ئەو رووداوە کە قورئان بۆمان باس ئەفەرمویٚ:** ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ﴾ **ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە کۆمەڵیٚ(جن) یمان لادایە لای تۆ، تا گویٚ بگرن لە قورئان کە ئەیخوێنی، ئەمە شتێك نەبوو هەرواوەکو رێکەوت، - هەرچەند هیچ شتێك بە رێکەوت نی یە، هەموو بڕیارو خواهیشی خوایەو لە ئەندازەیەك دا کە بۆ بارێکی تر ناگونجیٚ - بەڵکو خوا ویستی کە ئەو کۆمەڵە گویٚ بگرن لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) تا هەواڵی دواترین پەیامی خوا بزانن، وەکو لە پێشەوە هەواڵی تەوراتیان زانی بوو، بڕیار وابوو کە تاقمیٚ لە تیرەی(جن) ئیمان بێنن و رزگار ببن لەو ئاگرەی ئامادە کراوە بۆ شەیتانەکانی جن و ئادەمی، لەبەر ئەوە خوا ئەو کۆمەڵەی بەو شوێنەدا برد، ئینجا کاتیٚ کە گەیشتنە ئەو شوێنە، ئامادەی ئەو قورئان خوێندنە بوون کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەیخوێند، هەندێکیان گوتیان بە هەندیٚ تریان: بیٚ دەنگ بن. چونکە شیرینی و نایابی یەکەی هەست و دڵی داگیر کردن.** ﴿فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾ **ئینجا کاتیٚ کە دوایی پیٚ هێنرا، گەڕانەوە بۆلای قەوم و گەلەکەیان بە شێوەی ترسێنەریی، ترساندنیان لە عەزابی خوا.**

**دڵ و دەروون کە بە راستی ئیمانی تیادا جێگیر بوو، خاوەنەکەی ئەمێنێتە ئێش، پاڵی پێوە ئەنیٚ بۆ تێکۆشان، لەبەر ئەوە ئەو کۆمەڵە بەختیارە خۆیان پیٚ نەگیرا، گەڕانەوە بۆ ناو گەلەکەیان و ترساندنیان لەو باوەڕو بارەی کە لەسەری بوون، بانگیان ئەکردن بۆ ئەو رێگا راستەی کە خۆیان کەوتنە سەری،** ﴿قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ **وتیان: قەوم و گەلەکەمان بەراستی ئێمە کتێبێکمان بیست هێنرابووە خوارەوە لە پاش موسا، بە جۆرێك بوو رێك بوو لەگەڵ هەموو ئایین و کتێبەکانی پێش خۆی، بە راستی دانەنان. باسی ئینجیل و عیسایان نەکرد، رەنگە لەبەر ئەوە بێت کە ئینجیل وەکو بۆ بەهێزکردنی تەورات هاتبیٚ وابووە، چونکە شتێکی وای تیادا نەبوو کە زیادبیٚ لەوەی تەورات هێنای.**

يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣١﴾

**﴿يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ کتێبێکی وایە کە ڕێنموونی ئەکات بۆ عەقیدە و بیرو باوەڕێکی ڕاست و حەق، بەرنامەو شەریعەتێکی ڕێك، بێ گرێ و لاری.**

**پاش ئەمەی بەو جۆرە قورئانیان پیشانی گەلەکەی خۆیان داو پێ یان ناسین گوتیان: ﴿يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾[1] ئەی گەل و نەتەوەکەمان گوێ ڕایەڵی بکەن بۆ ئەو کەسەی کە بانگ ئەکات بۆ لای خواو باوەڕی پێ بێنن، خوا هەندێ لە گوناهەکانتان ئەسڕێتەوە، ئەتانپارێزێ و پەناتان ئەدات لە سزاو عەزابێکی ئێش و ئازار دەر. ئەو کۆمەڵە بە بۆنەوەی ئیمانە ڕاستەکەیانەوە ئەوەندە تێگەیشتبوون زانییان کە هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە بۆ سەر زەوی بانگ کردنە لەلایەن خواوە بۆ هەرکەسێ لە تیرەی جن و ئادەمی کە ئەم بانگەوازەی پێ بگات، ئەو کەسەی لەلایەن خواوە بانگ ئەکات پێغەمبەرە(ﷺ) هەروەها ئیمان و باوەڕیان هێنا بە ڕۆژی دوایی، زانییان کە ئیمان و گوێ ڕایەڵی هۆی لێبوردنە لە گوناهو پەنادانە لە عەزابی خوا، لەبەر ئەوە بەو جۆرە مژدەیان داو هەڕەشەیان کرد لە گەل و نەتەوەکەی خۆیان.**

---

[1] لە هەموو جێگایەکی وادا دەربارەی کافر ئەفەرموێ: ﴿مِن ذُنُوبِكُم﴾ دەربارەی موسڵمان ئەفەرموێ: ﴿ذُنُوبَكُم﴾ هەندێ ئەفەرموون وشەی ﴿مِن﴾ زیادەیەو بۆ جیاوازی ڕووتە لە وتاردا. بەڵام ڕای بەهێز ئەوەیە کە ئەو وشە بۆ گەیاندنی ئەوەیە کە هەندێ کە گوناهەکانیان ئەسڕێتەوە بە هۆی ئیمانەکەیانەوە، ئەوانیش ئەو گوناهانەن کە مافی خوان، بەڵام مافی بەندە بەسەریانەوە هەر ئەمێنێ. بەڵام ئیماندارەکان کە تەوبەو گەڕانەوەی شەرعی ئەکەن ئەبێت مافی خەڵکی بدەنەوە لەبەرئەوە خوا لە هەموو گوناهەکانیان خۆش ئەبێت، لەبەر بەهێزی ئەم ڕایە تەفسیرم بە گوێرەی ئەم ڕایە کرد. زانینی تەواویش لای خوایە.

وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِي ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ

---

(ئیبن و ئیسحاق) ئەڵێ: لێرەدا وتاری ئەو کۆمەڵە دوایی هات،بەڵام رای بەهێز زۆربە لەسەر ئەوەیە کە ئەم دوو ئایەتەی تریش کە دێت لە وتارەکەی ئەوانە، دیمەنی ئایەتەکانیش وا پیشان ئەدات، بە تایبەتی ئەم ئایەتە: ﴿وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِي ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ هەرکەسێ گوێڕایەڵی ناکات و ناچێت بەدەم بانگەوازی بانگ کەری خواوە ئەو کەسە لە خوا یاخی نابێ لەوڵات داو لە دەستی هێزو توانای خوا دەرناچێت، ئەو کەسە جگە لە خوا هیچ دۆست و یارمەتی دەرانی نی یە کە فریای بکەون و پەنای بدەن لە خوا، واتە هەموو کات هێزو توانای خوا چوار دەوری داوە، کەواتە تۆڵەی لێ ئەسێنێ و هیچ هۆی رزگاری نی یە لێ ی. بێگومان ترساندنی گەل و نەتەوەکەیان بەم ئایەتە تەواو ئەبێت، چۆن لە پێشەوە بانگی کردن بۆ ئیمان و گوێڕایەڵی، کەواتە ئەبێ باسی ئەوەیان بۆ بکات کە گوێ رایەڵی نەکردن پاشەڕۆژێکی سامناکی هەیە، لەبەر ئەوە لە پێشەوە گوتم: بە تایبەتی ئەم ئایەتە ئەبێت لەو وتارە بێت. هەروەها ئەم ئایەتی دووەمیش هەڵئەگرێ کە لەو وتارە بێت، بۆ بەهێزکردنی ئامۆژگاری یەکان، بەمەی لەبەر خۆیانەوە سەرسوڕمانی دەربڕن دەربارەی ئەوانەی کە گوێ رایەڵی ناکەن بۆ خوا، لەبەر ئەوە لایان وایە لێپرسینەوە نی یە، یان ئەتوانن خۆیان رزگار بکەن لە تۆڵەو عەزابی خوا!! ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ ئایا ئەوانەی کە گوێڕایەڵی ناکەن و ئیمان ناهێنن، ناترسن لە تۆڵەی سەختی خوا لە رۆژی دوایی دا؟! ئایا ئەوانە نازانن کە خوایەکی ئەوتۆ کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە هیچ ماندوویش نەبووە، واتە تواناو دەسەڵاتی خوا بێ سنوورە، نابڕێتەوەو کەم ناکات بە دروست کردن و فەراهەم هێنان هەرگیزو هەتا هەتایە، ئایا ئەو خوایە تواناو دەسەڵاتی نی یە بەسەر زیندوو کردنەوەی مردووەکان دا؟!

بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٣٣﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَ مَا يُوعَدُونَ لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّن نَّهَارِۭۚ بَلَٰغٞۚ فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾

---

**وەڵامی ئەم پرسیارە هەر ئەمە بێت: ﴿بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بەڵێ دەسەڵاتی هەیە، چونکە بێگومان خوا توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا.**

**بە بۆنەی زیندوو کردنەوەوە شێوەیەکی سامناکی ئەو ڕۆژە نیشان ئەدات لە دووچاری بێ باوەڕەکان دێت، لەو ڕۆژەدا ئیمان ئەهێنن، بەڵام هیچ سوودی لێ وەرناگرن، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّ﴾ لەو ڕۆژەدا ئەوانەی کە لەم جیهانەدا کافر بوون و باوەڕیان نەبووە بە عەزابی ڕۆژی دوایی، کە بە ئاگری دۆزەخ ئەسوتێنرێن بە تەشەرەوە بۆ سزادانی دەروونیان پێ یان ئەگوترێ – لە لایەن خواوە – ئەم عەزابە ڕاست نەبوو؟! واتە ئەمە ئەو عەزابەیە کە لە دنیادا باوەڕتان پێی نەبوو و لاقرتێتان لێ ئەهات پێی ئایا ئەمە ڕاست نەبوو؟! ئەوانیش بەو هەموو ئێش و ئازارەیانەوە، بە شورەیی یەوە ﴿قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾ دەڵێن:بەڵێ ڕاست بووسوێندبەپەروەردگارمان، ئەمانەکەلەم جیهانەدائیمان وگوێ ڕایەڵی یان نییەو گاڵتەیان لێ دێ، لەوێ بەو جۆرە سوێند لەسەری ڕاستی ئەخۆن!! کەواتە چۆن بە پرسیارەکە ڕیسواو بێ ئابڕوو ئەکرێن بۆ زیادە ڕیسوایی و تەشەر لێدان ﴿قَالَ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ ئەفەرموێ: کەواتە بچێژن ئەو عەزابە بە هۆی کوفرەکەتان لە دنیادا.**

**پاش ئەوەی لەم سورەتەدا دەم درێژیی و قسە ناڕەواکانی بێ باوەڕەکان خرانە پێش چاو، پاش ئەوەی پاشەڕۆژی سەختی تاوانباران ڕوون کرایەوە. لەگەڵ پاشەڕۆژی کامەرانی**

و بەختەوەری ئەوانەی کە گوێ رایەڵن بۆ فەرمانی خوا، پاش ئەمانە لە کۆتایی سورەتەکەدا تەمێی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات کە بە ئارام بێت و سەبر بکات لەسەر تاوانبارەکان، هیچ پەلەیان لێ نەکات، چونکە پاشەرۆژی بەد بەختی یان دیاریی کراوە، گەیشتنیان بەو پاشەرۆژی خۆیانە نزیکە ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ﴾[1] کەواتە ئەی پێغەمبەر ئارامت بێ و سەبر بکە لەسەر سزادانی قورەیش و بێ باوەڕیی و دەم درێژیی یان دەربارەی خۆت و ئەو ئایینەی کە بۆت هێناون، سەبر بکە هەرچۆنێ ئەو پێغەمبەرانەی کە پێیان ئەگوترێ ﴿اولوا العزم﴾ واتە ئەوانەی دامەزراو و خۆگرو بە ئارامن سەبریان کرد لەسەر سزاو بێ شەرمی و نالەباری گەل و ئوممەتەکانیان، پەلە مەکە هاتنی تۆڵەو سزای خوا بۆ سەر کافرەکانی قورەیش، چونکە بێگومان ئەو هەڕەشەی کە خوا لێ ی کردوون لە کاتی دیاریی کراوی خۆی دا دێتە جێ.

ئەمە تەمێ و ئامۆژگاری خوایە بۆ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) بە ئارام گرتن و سەبر کردن، ئەو پێغەمبەرەی کە لە رێگای خواو بەجێ هێنانی ئەو فەرمانەی کە پێ ی سپێررا بوو خۆی لە هەموو شتێك داڕنی، خۆی یەك تەن و یەك بار کرد لەو رێگایەداو دووچاری چەندەها ئازارو زەحمەت بوو تا رادەیەك منالْ و نەفامی لێ هان درا بە قسەی ناشیرین و بەرد باران!! تا خوێن بەسەرو ئەندامیدا هاتە خوارەوە، بێ شەرمی و تاوانی ئەو کافرانە گەیشتە ئەوپەڕی پلە، کردەوەی ناڕەوایان گەیشتە ئەوە کە سەری لەسوژدەدا بوو

---

[1] چەند رایەك هەیە لە دیاریی کردنی مەبەست بە ﴿أولوا العزم﴾ دا: ١.مەبەست هەموو پێغەمبەرانە. ٢.کۆمەڵێ لەپێغەمبەران: ئەوانەی دووچاری زیادە سزا بوون وەکو: نوح و ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئەیوب و داود... هتد. ٣.ئەو کۆمەڵەن کە خاوەنی شەریعەتێکی سەربەخۆن، بەناوبانگەکانیان پێنجن: نوح و ئیبراهیم و موساو عیسا و محمد – سەلامی خوایان لێ بێت –. ٤.مەبەست هەر ئەو پێنج کەسەیە. ئەم رایە بەناوبانگ ترو بەهێزترە، چونکە لە سورەتی ﴿الأحزاب﴾ و ﴿الشوري﴾ دا ئەم پێنجە باس ئەکات.

سڕوان کرا بەسەری دا!! کە ئەمە شتێکە بە بیر لێ کردنەوەی لەوانەیە دڵ بوەستێ، ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) لەگەڵ ئەوەدا خوا هێشتا بەو جۆرە تەمێ ی ئەکات، بە ئارام و پەلە نەکردن و خۆگرتن. بێگومان ڕێگاکە یەکجار سەخت و پڕ زەحمەت و تاڵی یە، ئەم جۆرە ئایەتانە بەرنامەیەکی زۆر گرنگن بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ ڕێگای پێغەمبەر(ﷺ) بدەنە بەر، بانگەوازەکەی ئەو وەلأم ئەدەنەوەو بلأوی ئەکەنەوە بەناو گەل و ولأتدا.

ئینجا دلنیاو دڵ ئارامی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾ ئەم بێ باوەڕانە بێگومان دووچاری ئەو سزا ئەبن کە هەڕەشەی پێ کراوە لێ یان، لەو ڕۆژەدا کە ئەو عەزاب و سزا ئەبینن وایان بەسەر دێت وەکو لەم جیهانەدا نەمابنەوە جگە لە ساتێك لە ڕۆژێ. واتە ئەوەندە سزاکەیان سەختە، ئەوەندە سەر لێ شێواون هەموو ژیانی ئەم جیهانەیان زۆر بە کەم و کورت دێتە پێش چاو، وەکو ساتێکی لێ دێت لەبەر بێ نرخی و بێ سوودی و بێ بەرهەمی. ﴿بَلَٰغٌ﴾[1] ئەم ئامۆژگاری یەی کە کران بەسەو هیچی تری ناوێ، هەرکەس بەم ئەندازە تەمێ خوار نەبێ بە هیچی تر چارەسەر ناکرێ. ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ ئینجا ئایا کەس بە هیلاك دا ئەبرێ و سزا ئەدرێ جگە لەو کەسانەی کە لە سنووری ئیمان و گوێڕایەڵی دەرئەچن؟ واتە: ئەوەی پێویست بێت لە تەمێ و ئامۆژگاری و ڕاگەیاندن کراوە، هیچ بەهانەیە بۆ کەس نەماوەتەوە، تەنیا ئەوانە دووچاری عەزاب ئەکرێن کە تەمێ وەرناگرن و گوێ ڕایەڵی ناکەن بۆ خوا.

---

[1] بەچەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە: ١.ئەم قورئانە، یان ئەم سورەتە بەسە، ئەمە جیاوازی یەکی وای نی یە لەگەڵ تەفسیرەکەدا. ٢.ئەمە ڕاگەیاندنە لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ). ئەو ساتی دنیا پێگەیشتنە پێش هاتنی عەزاب، چەند ڕای تریش هەیە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿١﴾

## سورەتی (محمد)

## مەدینەیی و ۳۸ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە مەدینەیی یە، ناویّ تریشی هەیە ﴿القتال﴾ واتە جەنگ و کوشتار، ئەم ناوە زۆر بەجیّ یە، چونکەهەمووباسی سورەتەکەبۆئەومەبەستەئەگەڕێتەوەوپەیوەندی پێوەهەیە.

لەبەر ئەوە لە سەرەتادا بە باسی کافرەکان و ئیماندارەکان دەست پیّ ئەکات، بە جۆریّ کافرەکان لەکەدار ئەکات و ریّزو پاکی و ریّك و راستی ئیماندارەکان دەرئەخات، تا روون ببیّتەوە کە شەڕو کوشتاری ئیماندارەکان لەگەڵ ئەوانەدا زۆر بەجیّ و رەوایە، ئەفەرمویّ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ ئەو کەسانەی کە کافرن و بەرگری ئایینی خوایان کردووەو بە ریّگای خوادا نەرۆیشتوون، ئەوانە هەر کردەوەیەکی چاکیان هەبیّ لەم جیهانەدا – وەکو دەست گرتن و یارمەتی دانی هەژاران، یان هەر چاکەیەکی تر – خوا لەو دنیا ئەو کردەوانە ون ئەکات لە خاوەنەکانیان، هیچ سوودو بەرهەمێکیان لیّ نابینن. واتە بەهۆی ئەو تاوانە گەورەی کە کردوویانە خوا قاریان لیّ ئەگریّ و هیچ نرخیّ نادات بە خێرو چاکەیان، تاوانە گەورەکەیان هەموو خێرو چاکەیەکیان ئەسڕێتەوە. خوای گەورە لە چەند ئایەتی تردا بیّ نرخی خێرو چاکەی کافرانی باس کردووە، بە جۆریّ روونی کردووەتەوە کە بۆ هیچ قسەو باس و لێکۆڵینەوەیەك دەست نادات، کەواتە پێویستە لەسەر هەموو ئیماندارێك ئەم مەبەستە لە دڵیدا جێگیر ببیّ، باوەڕی بەهێزی پیّی ببیّ، هەرکەس پێچەوانەی ئەوەی لە دڵ دا ببیّ کافر ئەبیّ یان تاوانبارێکی زۆر گەورەیە. جگە لەو ئایەتانەیش هەرکەس عەقڵ و ژیریی خۆی بخاتە کار ئەبیّ باش دڵنیا ببیّ بەمەی کە خێرو چاکەی کافران لای خوا هیچ نرخی نی یە، لە رۆژی دوایی دا هیچ سوودێك ناگەیەنیّ پیّ یان، چونکە کەسیّ باوەڕی بە خوا، یان بە بەرنامەکەی نەبیّ، چۆن ئەبیّ هیچ نرخیّ ببیّ بۆ هیچ چاکەیەکی؟

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾﴾

**ئەوانە هەر چاکەیەك بکەن وەکو ڕێکەوت و دەست ترازان وایە، هەموو کاتێ ئەو چاکەیان لێ ڕوونادات، چونکە پالْ پێوەنەری نی یەو لەسەر بەرنامەیەك نی یە. قورئان بەم جۆرە بەتینە لە یەکەم جارەوە هێرشی بردە سەر ئەو کافرانە، ئینجا لە بەرامبەر ئەوانەوە مژدە ئەدات بە ئیماندارەکان و ئەفەرموێ:** ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾[1] **ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە، بە گوێرەی ئیمانەکەیان کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە، ئیمانیان هێناوە بەو قورئانەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر محمد – کە هەر تەنیا ئەویش حەق و ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە بۆیان – ئەو کەسانە خوای گەورە هەموو تاوان و خراپەکانیان ئەپۆشێ و ئەسڕێتەوە، حالْ و باریان چاك ئەکات لە هەردوو جیهان دا، ئارام و ئاشتی و ئاسایش لە دلْیان دا فەراهەم دێنێ، کە ئەوەیش خۆشترین نیعمەتی ئەم جیهانەیە، چونکە هەموو خۆشی و ناخۆشی یەك ئەگەڕێتەوە بۆ دلْ و دەروونی، کاتێ دلْ و دەروون باش بێت هەموو کاروبارێکی باش ئەبێت، هەرکات خراپ بێت هەموو شتێکی خراپە، ئەم ئیماندارانە لەڕۆژی دواییش دا وان لە بەهەشت دا.**

[1] وشەی ﴿آمنوا﴾ لە پێشەوە ئیمان بە قورئانیش ئەگرێتەوە، بەلاّم بە تایبەتی لە هێنانی ئیمان بە قورئان بە دوایدا چەند شتێکی تیایە: ١.ڕێزو قەدری قورئان لای خوا. ٢.تەواو نەبوون و وەرنەگرتنی ئیمان بێ باوەڕو ئیمان بە قورئان، ئیمان بە قورئان ئەسلْ و بنەڕەتە. ٣.تاکو ببێتە هۆی هێنانی ئەم ڕستە، سەناکردنی قورئان بەمەی لەم ڕستەیەدا هەیە: ﴿وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ واتە پاش هاتنە خوارەوەی ئیتر هەر تەنیا قورئان حەق و ڕاستە، لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ﴿٣﴾﴾

ئینجا خوای گەورە تێمان ئەگەیەنێ لەهۆی ئەو هەڕەشە سەختە لە کافران و مژدە دان بە ئیمانداران،ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوەی کە باس کرا دەربارەی ئەو دوو کۆمەڵە بەهۆی ئەوەوەیە: ئەوانەی کە کافر بوون شوێنی شتی بەتاڵ کەوتوون، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە شوێنی حەق کەوتوون کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتووە. بەتاڵ، بۆشەو ریشەی نەکوتاوە بە لەشی بوون و بوونەوەردا، لەبەر ئەوە ئەڕواو نامێنێ، ئەوەیش شوێنی ئەکەوێ و دەستی پێوە ئەگرێ و پشتی پێوە ئەبەستێ ئەبێ هەر بڕواو نەمێنێ، هەروەها هەر شتێ بەهۆی بەتاڵەوە دەست کەوتبێ بێ نرخەو نامێنێ. بەڵام حەق دامەزراوەو ریشەی کوتاوە بە هەموو گیان و لەشی بوونەوەردا، بنەڕەتە بۆ بوونەوەرو هەموو کاروباری بوونەوەر لەسەر حەق راوەستاوە، بە هۆی ئەوەوە نەمان و فەوتان بۆ حەق نی یە، هەرکەس پشتی پێ ببەستێ هەر ئەوە گرەو ئەباتەوە، سەرکەوتن و پاشەرۆژ بۆ ئەو ئەبێت، هەر بەرهەمێك لەحەقەوە پەیدا بێت هەر ئەوە جێگای ئومێدە، کەواتە زۆر بەجێ و راستە شوێن کەوتووەکانی حەق و بەتاڵ بەو جۆرەیان دەربارە بکرێت کە سەرەتای سورەتەکە بۆی باس کردین، ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ﴾[1] ئا بەو جۆرە نایابە خوا حاڵ و بەسەرهات و پاشەرۆژی ئادەمیزاد – یان ئەو دوو کۆمەڵە – باس ئەکات و روونی ئەکاتەوە بۆیان. بێگومان حەق شایانی سەرکەوتنە، ئەبێ جێگیر ببێ و جڵەوی ژیان بگرێتە دەست لە زەوی دا، ماڤی بەتاڵیش ئەوەیە کە بڕواو تیابچێ، دیارە سەرکەوتن و جێگیربوونی حەق بە سەرکەوتن و جێگیر بوونی شوێن کەوتووەکانی یەتی، نەمانی بەتاڵیش بە نەمانی هێزی شوێن کەوتووەکانی یەتی، لەبەر ئەوە ئەوا خوای خاوەن رەحم و بەزەیی فەرمان ئەدات بە شکاندنی هێزی شوێن کەوتووەکانی بەتاڵ لە لایەن ئیماندارەکانەوە،

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست لە وشەی ﴿أمثال﴾ وێنەو چیرۆکەکانیانە، واتە خوا وێنەو چیرۆکی کردەوەی کافران ئەهێنێتەوە بە شوێن کەوتنی بەتاڵ، نائومێدی و خەسارەت مەندییان بە ون کردنی ئەو کردەوانە، وێنەو چیرۆکی کردەوەی ئیمانداران و گەیشتنیان بە ئامانج ئەهێنێتەوە بە شوێن کەوتنی حەق و سڕینەوەی گوناهیان، مەبەستەکە بە هەردوو بارا ناگۆڕێ و هەر یەکە. خوا خۆی باش ئەزانێ.

**ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ﴾ کەواتە کاتێ لە جەنگ دا گەیشتن بەوانەی کە کافرن بدەن لە گەردنیان و بیانکوژن. بت پەرستەکانی نیوە دورگەی عەرەب لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتەدا دووبەش بوون:**

**ا- جەنگاوەرو کوشتارکەر.**

**ب- ئاشتی خوازو خاوەن پەیمان.**

**جەنگ و کوشتار لەگەڵ بەشی دووەم دا قەدەغە بوو، لەبەر ئەوە - وەکو گوتمان مەبەست گەیشتنە پێیان لەکاتی جەنگ دا، فەرمانە تەنیا بە کوشتنی جەنگ کەران، فەرمان دان بە کوشتنی هەر بت پەرستێ کە بەردەست بکەوێ لە خاکی نیوە دورگەدا - ئەگەر ئیمانی نەهێنا - ئەو فەرمانە پاش هاتنە خوارەوەی سورەتی ﴿براءة﴾ دەرکرا.**

**دەربارەی ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ دا نەکراوە، یان پەیمانی داوەو ماوەی دیاریی کراوی بووبێ، ماوەکەی دوایی هاتبێ، یان ماوەی دیاریی نەکرابێ بەڵام چوار مانگ تێپەڕ بێت پاش هاتنە خوارەوەی سورەتی ﴿براءة﴾.**

**بەکورتی پاش دوایی هاتنی ماوەی دیاریی کراوی پەیمان، یان تێپەڕ بوونی چوار مانگ، ئیتر پاش ئەوە فەرمان درا کە نیوە دورگە پاك بکرێتەوە لە بت پەرست بە کوشتنیان یان موسڵمان بوونیان، ئەمەیش لەبەر ئەوەیە نیوە دورگە خوا کردی بە مەڵبەندو پایتەختی ئایینی ئیسلام، کەواتە پێویستە پاك و خاوێن بکرێت لە بت پەرستی و بت پەرستان. بێگومان هەموو کات کوشتنیان لە ڕێوە قەدەغە بووە، بەڵکو پێویستە لە پێشەوە بانگ بکرێن بۆ موسڵمان بوون، ڕێنموونی بکرێن، پاش ئەوە ئەگەر هەربە بت پەرست مانەوە، ئەو کاتە فەرمان دراوە بە کوشتنیان.**

مەبەست لەم فەرمانە ئەوەیە کە کوفرو بەتاڵ بەرگری بکریٚ و بوەستێنریٚ، بۆ ئەمەی ماوە ببیٚ بۆ پەرەسەندنی و بڵاو بوونەوەی رووناکی حەق لە جیهان دا، کەواتە هەرکات هێزی کوفرو بەتاڵ شکێنرا، بڵێسەی ئاگریان کوژایەوە، بە جۆریٚ تواناى پەلامارو بەرگری یان نەمێنیٚ ئیتر کۆتایی ئەهێنریٚ لیٚ یان و پێویست نی یە بنەبڕ بکرێن، وەکو روونیش ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەدا: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ﴾ بدەن لە گەردنیان و بیان کوژن هەتا کاتیٚ کە زۆر زۆریان لیٚ ئەکوژن، بە جۆرێك هێزیان ئەشکیٚ و تواناى بەرگری یان نامێنیٚ، ئیتر ئەو کاتە دەست گیریان بکەن بە دیلی، وریایی یان بکەن لە راکردن، بەڵام لە کاتێك دا دوژمن بەهێز بێت دەستگیر کردنیان بەرژەوەندی نی یە، کەواتە مەبەست بەم ئایەتەو ئایەتی سورەتی ﴿الأنفال﴾: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ هەر یەك شتە، ئەگەر چی زۆر لە زانایان لایان وایە جیاوازن، بەڵام ئەم گومانە زۆر جێگای سەرسوڕمانە، چونکە زۆر ئاشکرایە کە هیچ جیاوازی یان نی یە.

ئەم بڕیارە لەم ئایەتەدا بەشێوەی گشتی بۆ هەموو کات و چەرخێکە ئەبیٚ لە پێشەوە هێزی دوژمن بشکێنریٚ، تواناى پەلامارو بەرگری نەمێنیٚ، پاش ئەوە دەستگیر بکرێن بە تایبەتی کاتیٚ کە ژمارەی موسڵمانان کەم و ژمارەی کافران زۆر بیٚ بەرژەوەندی نی یە لە بەدیل گرتن دا.

ئینجا بڕیاری خوا لە قورئان دا دەربارەی دەستگیر کراوەکانی جەنگ ئەمەیە: ﴿فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾ پاش دەستگیر کردنیان یان بەرەڵایان بکەن بە خۆڕایی و پیاوەتی و هیچی تر، یان لە بریتی شتێك دا ئیتر ماڵ و سامان بێت یان کارو فرمانێك بێت کە سوود و بەرژەوەندی گشتی تێدا بێت، یان بە گۆڕینەوەی دیل لەگەڵ دوژمن دا.

لە قورئان دا دەربارەی دەست گیر کراوەکانی جەنگ هەر ئەم دوو بارە هەیە، بەڵام دووباری تریش هەیە لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەکارهێنراوە:

١- کردنیان بە بەندە، ئەمە زۆرجار بەکار هێنراوە.

٢- کوشتنیان، ئەمەش هەندیٚ جار رووی داوە.

لەبەرئەوە کۆڕی زانایان بڕیاریان لەسەر هەریەکێ لەم چوار بارە داوە، کە پێشەوای موسڵمانان بۆی هەیە بەکار هێنانی هەرکامێکیان. بەڵام ئەگەر بە جوانی ورد بینەوە لە بەسەرهات و هەواڵی هەریەکێ لەوانەی کە کوژراون بۆمان روون ئەبێتەوە کە کوشتنی هەریەکەیان هۆیەکی تایبەتی هەبووە، وەکو کردەوەی نالەباریان پێش ئەوەی بێن بۆ جەنگ نەك لەبەر هاتنیان بۆ جەنگ، کەواتە کوشتنی دیل شتێکی گشتی نی یە، بەڵکو تایبەتی یە بۆ یەکە یەکە، لەهەرکات و چەرخێك دا ئەم جۆرە کوشتنە روو بدات زۆر بەجێ‌یە و جێگای قسەوباس نی یە، بۆ وێنە وەکو کەسێك جاسووس بێت و دەستگیر بکرێت لە جەنگ دا ئەکوژرێت لەسەر جاسووسی یەکەی، نەك لەسەر جەنگ کردن و بەدیل گرتنی.

لەبابەت کردنیانەوە بە بەندە ئەڵێین: شتێکی ئاشکرایە کە رژێمی بەندایەتی لە پێش ئیسلام دا بڵاو بووە کە لە هەموو وڵاتێك دا، لە پیسترین شێوەدا بێ ئەوەی کەس بووبێ بێزاری دەربڕێ بەرامبەری، بەڵام کە ئیسلام هات هەر لە سەرەتاوە دەستی کرد بە بەرگری ئەو هەموو زوڵم و ناڕەوایی یە کە دەربارەی بەندە ئەکرا، بۆ هەڵگرتنی ئەو رژێمەو بۆ ئازاد کردنی بەندە چەند هۆیەکی فەراهەم هێنا، یەکێ لەوانە تەرخان کردنی یەك لەسەر هەشتی هەموو زەکات بەکار بهێنرێ بۆ ئەو مەبەستە.

هەرکەس ئەندازەیەك تێگەیشتن و شارەزایی ببێ لە ئایینی پاکی ئیسلام دا بە لایەوە روونە کە ئیسلام دژی رژێمی بەندایەتی یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا بڕیاری دەرنەکرد بە قەدەغە کردنی بە تەواوی، چونکە جگە لە موسڵمانەکان لەو کاتەدا کەس گوێڕایەڵی نەئەکرد، کەواتە قەدەغە کردنی زۆر بێ جێ دەرئەچوو، چونکە هیچ رەوا نی یە موسڵمانان دیلەکانی خۆیان ئازاد بکەن، بەڵام دوژمنەکانیان موسڵمانە دیلەکان بکەنە بەندە، لەبەرئەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەهەندێ کات دا بڕیاری بەندەیی ئەدا بەسەر دیلەکان دا و هەندێ جاریش بە خۆڕایی بەرەڵای ئەکردن و هەندێ جاری تریش لە بریتی دا، کەواتە هەرکات دوژمنانی ئیسلام وازیان هێنا لە بەند کردنی دیلەکان، ئەو کاتە موسڵمانەکانیش هەر بەوە رەفتار ئەکەن کە قورئانەکەیان بە رێکی بڕیاری لەسەر داوە: ﴿فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾ کە ئەمە بڕیارێکە بۆ هەموو کات و چەرخ و گەل و وڵاتێك رێك و گونجاوە هەتا هەتایە بڕیارێکی تری نی یە کە جێگای بگرێتەوە، ئەوەی لەم ئایەتەدایە ئەوپەڕی کردەوەی رێك و راستە دەربارەی دیلەکان،

جگە لەوەش ئەو دووبارەی کە لەم ئایەتەدا نین هیچیان پێویست نەکراون، بەڵکو لەگەڵ ئەم دووبارەیش دا سەرۆکی موسڵمانان بۆی هەیە کام لەو چوار بارە کە باسمان کرد بە بەرژەوەندی ئەزانێ وا بکات. ئەوەش شتێکی ئاشکرایە هەرکات دوژمنان کۆتایی یان هێنا لە کوشتنی دیل و کردنی بە بەندە، ئیسلام باشتر قەدەغەیان ئەکات، چونکە مەسڵەحەتیان تیا نابینێت، بێجگە لەوەش رەفتار کردن بە قورئان پێش ئەخرێ لە هەموو شتێکی تر، قورئانیش هەر ئەو دوو بارەیە کە هەموو کات چاك و گونجاوە.

مەبەست لەم لێکۆڵینەوە ئەوەی لەپاش بیر کردنەوەو تێروانینی تەواو لە هەمووبارو رووی ئەم مەسەلەیەو لێکدانەوەی هەموو رووداوەکانی لە پاش ئەوانە هەمو ئاشکرا ئەبێت کە ئەمەی لێرەدا وتمان شتێکە لە ئایینی پاکی ئیسلامەوە وەرگیراوەو رۆحی ئەم شەریعەتە تەنها ئەوە پیشان ئەدات.

مەبەست ئەوە نی یە کوشتنی دیل و کردنی بە بەندە بە یاسایەکی نەگۆڕاوی ئیسلامی ئەزانین و بەلامانەوە نارەوایەو ئەمانەوێ بە هەر جۆر بووە ئەو لەکەیە داشارین و پەردەیەکی بهێنین بەسەردا، چونکە بێگومان ئەگەر باوەڕمان وابوایە کە یاسایەکی هەمیشەیی نەگۆڕاوەو ئەبێ بەدی بێت، ئەو کاتە بە هیچ رەنگ سەرمان لێ نەئەکردەوەو گەردن کەچ ئەبووین بۆی، هەرچەندە نەگەیشتینانە لە هۆکەی، چونکە رەخنە گرتن و سەرکردنەوە لە بڕیاری خواو پێغەمبەر(ﷺ) ئەوپەڕی نەفامی و نەزانی یە، بێجگە لەوەش رەخنە گرتن و سەرکردنەوە لە بڕیاری خواو پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئیمان دا یەك ناکەوێت، خوای ئەفەرموێ:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ [1] و ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ [2]

ئینجا شتێ تر ماوە کە لێکۆڵینەوەی پێویستە:

---

[1] واتە: خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکات بڕیارێکیان دا رێگا نی یە بۆ هیچ ئیماندارێك، چ پیاو چ ئافرەت سەر بکاتەوە لەو بڕیارەو دەست بژنی تیادا بکات. سورەتی ﴿الأحزاب﴾.

[2] واتە: سوێند بە پەروەردگارت ئیمان و باوەڕیان نی یە هەتا تۆ ئەی پێغەمبەر نەکەن بە حەکەم لەنێوان خۆیان دا، لەپاش ئەوە لە دڵ و دەروونی خۆیان دا هیچ بێزاری و دڵ تەنگی یەکیان دەست نەکەوێ و هەستی پێ نەکەن و گەردن کەچ و سەرشۆڕ بن بۆ بڕیارو فەرمانەکەی. سورەتی ﴿النساء /٦٥﴾.

ئەم ئایەتەی کە پێوەی خەریکین پێش ئایەتی ژمارە ٥ ی سورەتی ﴿براءة﴾ هاتوّتە خوارەوە: ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡ﴾ هەروەها پێش ئایەتی ٢٩ ی هەمان سورەت: ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾ کەواتە ئەبێ ئەم ئایەتەی پێوەی خەریکین بسڕێتەوە بەم دوو ئایەتەی ﴿براءة﴾. چونکە ئایەتی ٥ وا پیشان ئەدات کە بت پەرستەکان ئەبێ بکوژرێن یان موسڵمان بن، ئایەتی ٢٩ وا پیشان ئەدات کە ئەهلی کیتاب یان کوشتار یان جزیەدان یان موسڵمان بوون، لەمەیشەوە وا گومان ئەبرێ کە بڕیاری بەرەڵا کردنیان بەخۆڕایی یان بە شت نەگونجاوە.

دەربارەی ئەم دوو ئایەتە ئەڵێین: ئایەتی ٥ تایبەتی یە بە بت پەرستەکانی نیوە دورگەی عەرەبەوە، چونکە – وەکو باسمان کرد – نیوە دورگەی عەرەب مەڵبەندو پایتەخت بوو بە ئیسلام. پێویستە پاك بکرێتەوە لەوانەی دژی ئیسلامن. ئایەتی ٢٩ دژی ئەم ئایەتە نی یە. چونکە بڕیاری جزیە بۆ ئەو لەشکرەیە کە تەسلیم ئەبێ و کۆتایی ئەهێنێ لە شەڕو کوشتارو رازی ئەبێ بەژیان لەژێر سایەی ئیسلام دا، ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو دیلانەیە کە گیراون پێش تەسلیم بوون و کۆتایی هێنان. بە کورتی پاش هاتنە خوارەوەی سورەتی ﴿براءة﴾ بت پەرستەکانی نیوە دورگەی عەرەب ئەبێ یان موسڵمان بن یان ئەبێ بکوژرێن، بت پەرست و ئەهلی کیتاب و کافرەکانی وڵاتەکانی تر ئەگەر جزیە بدەن وازیان لێ ئەهێنرێ و پارێزگاری هەموو مافێکیان ئەکرێ و دیلەکانیان پێش تەسلیم بوون و بڕیاری جزیە پێشەوای موسڵمانان ئەتوانێ بە خۆڕایی یان بە شت بەرەڵایان بکات، پاش تەسلیم بوون و بڕیاری جزیە شتەکە کۆتایی دێت بەو جزیە دانەو هەموو بەرەڵا ئەکرێن. خوای گەورە فەرمانی دا بە جەنگ و کوشتارو بەدیل گرتنی کافرەکان،

﴿حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ هەتا جەنگ چەك و كەرەسەی خۆی دائەنێ... واتە ئەم بڕیارانە بەجێ ئەهێنرێن تا جەنگ دوایی دێت بە نەمانی هێزی ئەو كافرانەی كە بەرگری ئایینی خوا ئەكەن بە جۆرێك جگە لە موسڵمان یان كافرێكی ئاشتی خواز ئیتر هیچ كەسێكی تر نامێنێتەوە، ئەمە بە وێنەی ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ﴾ [1] دیارە ئەگەر وەزع وای لێ بێت ئەو كاتە فەرمان نادرێ نە بە كوشتن نە بە دیل گرتنی هیچ كەس. خوای گەورە لە فەرمانی جەنگ و كوشتار بەسەر ئیماندارەكان دا هیچ پێویستی و داماوی یەكی نی یە پێیان، چونكە ئاشكرایە كە خۆی توانای بەرباد كردنی دوژمنانی ئایینەكەی هەیە، وەكو ئەو گەل و نەتەوانەی بەرباد كرد كە قورئان باسیان ئەفەرموێ. بەڵام ئەم فەرمان و ئەركەی خستە سەرشانی بەندەكانی بۆ ئەوەی تاقییان بكاتەوە بە كافرەكان، كافرەكانیش بەمان، بۆ ئەمەی هەریەكەیان شایانی پاداشت و تۆڵەی خۆیان بن، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾ كارو فەرمان ئەوەیە كە گوترا، ئەگەر خوا بیویستایە و هەركات بیەوێ تۆڵەی لێ ئەسەندن، یان لێ یان ئەسێنێ بەدەستی توانای خۆی بێ ئەمەی بیخاتە دەست ئێوە، بەڵام وای نەویست، وای نەكرد، بەڵكو فەرمانی دا بە ئێوە بە جەنگ كردن، ئەو ئەركەی خستە سەرشانی ئێوە، بۆ ئەمەی هەندێكتان بەهەندێكی ترتان تاقی بكاتەوە، واتە: ئێوە تاقی بكاتەوە بە كافرەكان تا بگەن بە رێزو پاداشتی گەورەی خۆتان، كاتێ لە تاقی كردنەوەكەدا دەرچوون، هەروەها كافرەكانیش بە ئێوە تاقی بكاتەوە بۆ ئەمەی هەندێ لە سزاو عەزابیان پێشەكی بچێژن لەسەر دەستی ئێوەدا، بەڵكو هەندێكیشیان كۆتایی بێنن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

ئەو كافرە سەركەشە ستەمكارانە كە لە هەموو چەرخ و گەلێك دا بەرگری ئایینی خوایان كردووە، خۆیان بەزل نیشان داوە لە ناو خەڵك دا، بە دیمەنیش زۆرو دەسەڵات و سامان لەدەستی ئەوان دا بووە، ئەوانە هەموو هیچ نموونەیەكیان نی یەو چاو نادەن لە چاو ئەم زەوی یەدا كە لەسەری ئەژین، كە چەند گەورەو فراوانە، زەویش هەر هیچ نانوێنێ لە چاو ئەو هەمو خۆرو ئەستێرەو كۆمەڵەی خۆری كەشكەشانەدا كە جگە لە خواكەس ماوەو

---

[1] واتەجەنگیان لەگەڵدا بكەن هەتاكەس سزا نەدرێ لە رێی خوا، ئایینی خوا بەرز ئەبێتەوەو گەردن كەچ ئەكرێت بۆی.

ئەندازەو ژمارەیان نازانیٚ، کەواتە ئەو کۆمەڵە بەدبەختە سەر لیٚ تیٚکچووانە بە خۆیان و هەموو شویٚن کەوتووەکانیانەوە، بە هەموو دانیشتوانی سەر زەویشەوە، هەموو ناگەنە رادەی گەردیٚك کە بەدەم هەناسەوە دەڕوات، بەڵکو هەر هیچ نرخیٚکیان نی یە لەبەردەم دەسەلاٚت و توانای بیٚ سنووری خوادا، جا ئەگەر خوای گەورە ئەو دوژمنە بیٚ نرخانە بە توانای خۆی بەرباد نەکات و فەرمان بدات بە بەندە دۆستەکانی کوشتاریان لەگەڵ بکەن و لەناویان بەرن، کاتیٚ ئەو فەرمانە ئەدات خیٚرو چاکەی ئەویٚ بۆ ئەو بەندە دۆستە گویٚ رایەلاٚنە دەیەویٚت چاکییان روون بکاتەوە بۆ خەڵکی و پەروەردەیان بکات و چڵك و چەپەڵی یان لیٚ دوور بخاتەوە تا وەك ئاڵتوونی پاڵفتە کراویان لیٚ بکات، ئەیەویٚ کردەوەی گەورەو شیرینیان بۆ فەراهەم بیٚنیٚت بۆ ئەمەی ریٚزو پاداشتی فراوان و نەبڕاوەیان دەست بخات لە بەزەیی بە زیاد بیٚت. خوای گەورە ئەیەویٚ تاقییان بکاتەوە، بەو تاقی کردنەوانە هەموو هیٚزو توانا و وزەیان ئەکەویٚتە سۆزو جۆش و پەرۆش لەپیٚناوی ئەو بارە پاك و راستەی کە بیٚ ئەو توانای ژیانیان نی یەو ژیانیان ناویٚ لە ژیٚر سایەی ئەودا نەبیٚت.

خوای گەورە ئەیەویٚت ئیماندارەکان پیٚ بگەیەنیٚ و پەروەردەیان بکات تا هەموو حەزو ئارەزوو خۆشەویستیان بۆ زەوی و شتەکانی لە دڵیان دەربچیٚ لە پیٚناوی رەزامەندی خوادا و تا لە جیٚگای لاوازی و بیٚ هیٚزیی دا هیٚزو توانایان پەیدا ببیٚ و هەموو کەم و کوڕی و ناتەواوییان تیٚرو تەواو ببیٚت، هەموو شتیٚکی دەخەڵ و پووچ لاچیٚ و بڕوا تا وایان لیٚ دیٚ خۆشەویستی خواو پیٚغەمبەرو تیٚکۆشان لە ریٚگای خوادا لەدڵ و دەروونیان دا قورس ترو بەهیٚز ترو خۆشەویست تر نەبیٚە لە خۆشەویستی باوك و براو کەس و کارو هۆزو گەل و ماڵ و سامان و خاك و نیشتمانیان، ئامادە نەبن بۆ قوربانی دان و فیداکاری بە هەموو شتیٚك لەم جیهانەدا، چونکە ئیمانداران تا نەگەنە ئەو رادەو پلە بەرزە خوا یارمەتی یان نادات، بەڵکو جیٚگای هەڕەشەی سامناکی خوایە، بە زاڵم دائەنریٚن وەك ئەم ئایەتە بەریٚکی روونی ئەکاتەوە: ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾[1] خوای گەورە ئەیەویٚ ئیماندارەکان ریٚك و پیٚك بکات

---

[1] واتە: ئەی پیٚغەمبەر بڵیٚ ئەگەر ئیٚوە باوك و کوڕو براو حەلاٚڵ و هاوسەرەکانتان و تیرەو هۆزو هەموو ئەو ماڵ و سامانەی کە بە رەنجی شان فەراهەمتان هیٚناوەو بازرگانی یەك کە مەترسی یەك کەوتن و لەدەست چوونی ئەکەن و

بەهۆی تێکەوتن و بینینی ئەو هەموو سزاو زەحمەتەی کە دووچاری ئەبن لە تێکۆشان دا بە تایبەتی خەتەرەو مەترسی گیان کە لە کاتی جەنگ دا چاوەڕوان ئەکرێت. بێگومان بە تێکەوتن و بینینی ئەو جۆرە شتانە مرۆڤ چالاك و بێ باك ئەبێ، سامناکترین شت کە مردنە لە پێش چاوی سووك و ئاسان ئەبێت، خۆشەویست ترین شتومەکی ئەم جیهانەی لا بێ نرخ ئەبێت، کەواتە وای لێ دێ زاڵ ئەبێ بە هیچ شتێك ناخەڵەتێ، رام ئەبێت لەسەر فیداکاری رادێت، لەسەر فیداکاری لە پێناوی رەزامەندی خواداو لە پێناوی روو کردنە خوادا بە خاوێنی و راستی کە ئەوەیش کانی هەموو خێرو فەڕو بەرەکەتێکە، هۆی هەموو کردەوەیەکی چاکە، هەرکات بە گوێرەی سروشتی ئادەمی دووچاری هەر هەڵەیەك بوو ئەو فیداکاری یەی ئەیسڕێتەوەو هەموو چڵك و چەپەڵی یەکی لێ دائەڕنێت. بێگومان کۆمەڵی ئادەمی و جیهان چاك نابێ و نایەتە سەر باری راست بە بێ بەرنامەو دەست، هیچ کەسیش شایانی ئەوە نی یە جڵەوی ژیانی ئادەمی بگرێتە دەست، هیچ کەس ئەو کارەی لێ نایەت و توانای بەجێ هێنانی نی یە جگە لەوانەی بەو جۆرە پاڵفتە ئەکرێن کە بە هۆی تێکۆشانەوە لەڕێی خوادا هەموو چڵك و چەپەڵی یەکیان دوور خرابێتەوە، کەواتە ئەم فەرمانە کە خوا خستی یە سەرشانی بەندە ئیماندارەکان پێویستی یەکی ناچاری یە بۆ ژیانی ئادەمی و هەموو جیهان.

ئینجا لەپاش ئەمانە هەموو کە باس کران ئەم فەرمانەی کە خوای گەورە داوای کردووە لە بەندە ئیماندارەکان ئەبێتە هۆی پلەو پایەی بەرزو رێزو پاداشتی نەبڕاوەی خوا بۆ هەندێ لە بەندەکانی، بە تایبەتی ئەوانەی کە شەهید دەبن، هەروەها ئەبێتە هۆی بوغزو نەفرین و سزاو تۆڵەی سەخت و سامناکی نەبڕاوەی خوا دەربارەی هەندێ تر لە ئادەمی، ئەمەیش کە خوا فەراهەمی ئەهێنێ بۆ هەردوو تاقم بە گوێرەی ناسین و زانینی خۆی کە بەندەکانی ئەناسێ، ئاگاداری هەموو نهێنی و ئاشکرایەکیانە، هەرکەس و هەرکام شایانی چی بێ ئیرادەو خواهیشی ئەوەی بۆ کردووە.

---

شوێن و ماواکانتان کە دڵتان پێی خۆشەو رازین پێیان، ئەگەر ئەمانە هەموو خۆشەویست ترە بە لاتانەوە لە خواو پێغەمبەرو تێکۆشان لە رێگای خوادا، ئەو کاتە راوەستن و چاوەڕوانی بکەن هەتا خوا عەزابی خۆی ئەهێنێ، خوا رێنموونی کۆمەڵی زاڵمان ناکات و نایانخاتە سەر رێگا، واتە ئەگەر ئێوە بەوجۆرە بن زاڵمن، بەراستی حەق وایە بەم نایەتە هەموو رەگ و دەمار بێتە لەرزەو هەناسە توند بێت.

وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٤﴾ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ﴿٥﴾ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴿٧﴾

---

**جا یەکەم جار پاشەرۆژی ئەوانە روون ئەکاتەوە کە گیانی خۆیان بەخت ئەکەن لە رێگای خوادا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ ئەو کەسانەی کە کوژراون لەرێگای خوادا، خوا هەرگیز کردەوەکانیان ون ناکات و نایفەوتێنێ، بەڵکو ئەیانهێڵێتەوەو زۆر زیادیان ئەکات، بەرهەمەکانیان پێ ئەدات، بە پێچەوانەی کردەوە چاکەکانی ئەوانەی کە کافرن و بەرگری ئایینی خوا ئەکەن، وەك لە سەرەتای سورەتەوە باس کرا. خوای گەورە لە دوو سورەتی قورئان دا ﴿البقرة﴾ و ﴿آل عمران﴾ ئەفەرموێ کە شەهیدان زیندوون، دیارە ئەبێ هەموو ئیماندارێك باوەڕی هەبێ بەو زیندوویی یە، ئیتر با ئێمە لەم زەوی یەدا جۆری ئەو زیندوویی یەمان نەدیبێ و نەیناسین، ئینجا وا لێرەش دا ئەو زیندوویی یە نیشان ئەدات بەمەی کە لەپاش شەهید بوونیان و گواستنەوەیان لە ژیانی جیهانەوە زیندوویی یەکەیان هەر بەردەوام ئەبێت، پەرە ئەسێنێت لەسەر ئەو رێگایەی کە لەسەری بوون: رێگای گوێڕایەڵی و هیدایەت و پاك و خاوێنی و لێ بڕانی راستی بۆ خوا، ﴿سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ﴾ ئەوانە کە لەرێگای خوادا کوژراون خوای گەورە رێنموونی یان ئەکات، بەردەوام راگیریان ئەکات، پەرەیان پێ ئەسێنێ لەسەر ئەو بارو حاڵی خۆیانە، کاروباریان باش ئەکات: واتە پاش شەهید بوونیان خوا چاودێریی و سەرپەرشتیان ئەکات بە رێك و پێك کردنی کاروباریان و پاك و خاوێن کردنی رۆحیان لە هەموو ژەنگ و چڵکی ئەم زەوی یە، بە جۆرێ رێك بن لەگەڵ ئەو کۆمەڵە بەرزەی کە سەرکەوتوون بۆ لایان: کۆمەڵی بەندەو مەلائیکە نزیکەکان لە خواوە[1]. ﴿وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ﴾ ئەیانخاتە ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنی پێداون لەم**

---

[1] به چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە، ئەو جۆرانە تایبەتی یەکیان نی یە بە شەهیدانەوە، بەلام ئەو شوێنەو ئەو ئایەتەیش کە بەدوای دا دێت شوێنی باس کردنی ئەو شتانەن کە خوا بە شەهیدانی دەبەخشێ.

جیهانەدا، ئەو بەهەشتەی کە لە کاتی شەهید بوونیان دا پێی ئاسیون و پیشانی داون.[1]

وەکو لە چەند حەدیسێك دا ئەفەرموێ: یەکێ لەوانە ئەمەیە کە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەددا ئەفەرموێ: پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمویەتی: شەش شت ئەدرێ بە شەهید، واتە تایبەتی یە پێ یانەوە:

١- لەکاتی ڕژانی یەکەم دڵۆپی خوێنی دا هەمو گوناهی ئەسڕرێتەوە.

٢- شوێنی خۆی دا لە بەهەشت دا ئەبینێ.

٣- لە بەهەشت دا حۆری(العين) ی پێ ئەدرێ.

٤- ترسی نابێ لە راچڵەکانی هەرە گەورە.

٥- لەسزای قەبر ئەپارێزرێ.

٦- ئەرازێنرێتەوە بە خشڵێ کە پێی ئەوترێ ﴿حلة الإيمان﴾.

خوا بە کەرەمی خۆی بەشدارمان بکات.

پاش نیشاندانی ئەم هەموو پایەو پلەو رێزو نازەی شەهید، فەرمان ئەدا بە ئیمانداران کە خۆیان یەك تەن و یەك دڵ و یەك نیازو یەکبارو یەك روو بکەن بۆ خوا، پەلامار بدەن بۆ یارمەتی ئاین و بەرنامەکەی، بەڵێنیان ئەداتێ بە یارمەتی خۆی زاڵیان بکات و سەریان بخات لەو جەنگ و خەباتانەی کە ئەیکەن بەرامبەر دوژمنانی خوا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتی خوا بدەن خوایش یارمەتی ئێوە ئەدات، زاڵتان ئەکات بەسەر دوژمنانتان دا، بەهێزو دامەزراوتان ئەکات لە بەربەرەکانێ و تێکۆشان لەگەڵ کافرەکان دا، لە بەجێ هێنان و هەڵسان بە مافە گرنگەکانی نیعمەتی ئیسلام بەسەرتانەوە. بێگومان خوای گەورە پێویستی

---

[1] وەکو لە پێشەوە گوتم: ئەم ئایەتەیش بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوە: ١.لەم دنیادا باسی کردووە بۆیان، هەتا سۆزو شەوقیان بۆی پەیدا بوو، بەهۆی ئەوەوە کردەوەیەکیان کرد هەتا پێی شایانی بەهەشت بوون. ٢.بۆی روون کردنەوە بە جۆرێك هەموو یەکێ لەوان شوێنی خۆیان ئەناسن. ٣.بۆن خۆشی کردووە بۆیان. ٤.دیاریی کردووە بۆیان بە جۆرێك هەریەکەیان شوێن و بەهەشتێکی جیاوازی هەیە. ئەمانە هەموو ئەگونجێن، بەڵام وەکو وتمان: ئەمانە تایبەتی نین بە شەهیدەوە، ئەوەی تایبەتی یە بە شەهیدەوە ئەوەیە کە حەدیسەکە باسی فەرموو، کەواتە تەفسیری بەوە بکرێتەوە چاکترە. خوا باشتر ئەزانێ.

به هیچ کەس و هیچ شت نی یە، کەواتە پێویستە بزانین مەبەست بە یارمەتی دانی خوا چی یە؟ خوای گەورە مافی ئەوەی هەیە کە بەندەکانی دڵ و دەروونی بۆ پاك و خاوێن بکەن، رووتی بکەن بۆی لە هەموو هاوبەشێك، چ هاوبەشی ئاشکراو چ شاراوەو نادیاریی، جگە لەخوا هیچ کەس و هیچ شتێ تری تیادا نەهێڵن، مافی ئەوەی هەیە کە خۆشەویست تر بێت لای بەندەکانی لە خۆیان و هەموو خۆشەویستێکیان، هەموو حەزو ئارەزوو کردارو رەفتارو پەنهانی و ئاشکرایی خۆیان بخەنە شوێن فەرمانی خواو رەزامەندی خوا، جا هەرکات بەندەکانی خوا بەرامبەر خوای خۆیان بەو جۆرە بوون، ئەو مافانەیان بەجێ هێنا، ئەو کاتە یارمەتی خوایان داوە لە دڵ و دەروونیان دا.

خوای گەورە شەریعەت و بەرنامەیەکی ناردووە بۆ ژیانی بەندەکانی لە هەموو بارو روویەکەوە، جا هەرکات بەندەکانی خوا یارمەتی ئەو شەریعەت و بەرنامەیان دا، هەوڵ و تێکۆشانیان کرد بۆ گێرانی ئەو شەریعەت و بەرنامەیە بە حاکم و کاربەدەست لە هەموو کاروباری ژیانیان دا، شوێنی هیچ بیروباوەڕی تر نەکەوتن، ئەو کاتە یارمەتی خوایان داوە لە واقیعی ژیانیان دا وەك بەو جۆرەی پێشەوە یارمەتی ئەدەن لە دڵ و دەروونیان دا، مەبەست بە یارمەتی دانی خوا ئەوەیە، ئینجا پێویستە لەسەرمان ئەندازەیە بیر بکەینەوە لە فەرمودەکانی خوا، لە پێشەوە فەرموی: ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لێرەش دا ئەفەرموێ: ﴿إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ﴾ باش وردبینەوە تا بزانین تێکۆشان بۆ خوا کامەیە؟ شەهید کێ یە؟ بەڵێنی خوا بۆ کێ یە؟ بێگومان لەم فەرمودانەوە روون ئەبێتەوە کە هیچ تێکۆشان و مردن و کوژران و یارمەتی دانێ بۆ خوا نی یە کاتێ نەبێ کە ئەمانە لەبەر خوابن، هەر لەرێگای خوادا بن، هەر بۆ بەرز کردنەوەی ئایین و بەرنامەی خوا بن، هیچ شتێکی تریان نابێ تێکەڵ بکرێت، ئەمە شتێکی روونە لەم فەرمودانەوە وەکو پێغەمبەریش(ﷺ) رووونی کردووەتەوە لە چەند فەرمودەیەکی دا، یەکێ لەوانە ئەمەیە لە ئەبو موسای ئەشعەری یەوە، ئەفەرموێ: [1] پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی پیاوێك کە جەنگ بکات لەبەر چالاکی و ئازایی، پیاوێك لەبەر

[1] بوخاری و موسلیم و ئەبو داود و تیرمزی و نەسائی گێراویانەتەوە.

غیرەت و حەمیەت، پیاوێك لەبەر خۆ دەرخستن و شۆرەت، ئەمانە کامیان بۆ خوایەو لە ڕێگای خوادایە، ئەویش لە وەڵام دا ئەفەرموێ: هەرکەس جەنگ بکات هەر لەبەر ئەمەی کە تەنها وشەی خوا – واتە ئایینی – بەرزتر بێ بەسەر هەموو شتێك دا، تەنها ئەو جەنگە لە ڕێگای خوادایەو بەس. کەواتە بەڵێنی خوا تەنها بۆ ئەو کەسەیە، هەر جەنگ و تێکۆشانێك بکرێت بۆ هەر مەبەستێك، بە هەر ناوێکی ترەوە بکرێت لەژێر هەر ئاڵایەکی تردا بکرێت، هیچیان بۆ خوا نی یەو بەڵێنی خوا بۆ جەنگاوەرەکان نی یە.

وشەی شەهید زۆر بەنرخ و گەورەیە، دروست نی یەو ناڕەوایە بەکار بهێنرێ بۆ کەسێ نەبێ کە گیانی خۆی بەخت کردبێ تەنها لەبەر خواو لە ڕێگای خوادا و بەناوی خواوەو بۆ بەرزکردنەوەی وشەو بەرنامەو ئایینی خوا، ئیتر جگە لەوە مەبەستێکی تر نی یە بەو وشە پیرۆزە لای خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) با هەموو موسڵمانێ ئەمە بزانێ و لە دڵی دا جێگیر ببێ و باوەڕی بەهێزی پێ بێنێ، تا بە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) نەجوڵێتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی ئەیانەوێ بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) بسێننەوەو خەڵك بانگ بکەن بۆ ڕێگای خوا، ئەمانە پێویستە هەمووکات ئەو مەبەستە لە پێش چاوی خۆیان لانەبەن، تاکو ئەو کارە گرنگەی کە پێوەی خەریکن پاکو خاوێن بێ و هیچ مەبەستێکی تری تێکەڵ نەبێت، بە هیچ ناوێکی ترەوە نەبێت، لەژێر هیچ ئاڵایەکی تردا نەبێت، بەڵکو وەکو پێغەمبەرو یارەکانی هەر بۆ خوا بێت و بەناوی خواوەو لەژێر ئاڵای ئایینی خوادا، چونکە بەوجۆرە نەبێت خوا نایەوێت و یارمەتی نادات.

وشەی شەهید لە ئیسلام دا بەکار هێنراوە بۆ چەند تاقمێکی تر لە موسڵمانان لەوانە: موسڵمانێك کە لەسەر ماڵ و ناموسی کوژرا بێت، یان موسڵمانێك بە سووتان یان خنکان یان لەلایەن زاڵمێکەوە بە ناحەق کوژرا بێت، یان بە هەندێ نەخۆشی مردبێ کە لە کتێبە حەدیسەکان دا باس کراوە. بەڵام ئەمانەشەهیدی ڕاستەقینەنین، بەڵکو خوای خاوەن لوفت و بەزەیی لوتفیان لەگەڵ ئەکات،زیادەپاداشتیان ئەکاتەوە،قەرەبووی ئەوبەسەرهاتە سەختەیان بۆ ئەکاتەوە، بە وێنەی شەهیدی ڕاستەقینە لە خەڵك جیایان ئەکاتەوە، پلەو پایەیان بەرز ئەکاتەوە لە ڕۆژی دوایی دا لە هاودەم و وێنەی خۆیان کە ئەو بەسەرهاتەیان نەبووبێ.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٩﴾

۞ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ

---

ئەمە مەرج و بەڵێنی خوا بۆ ئیمانداران، ئینجا دێتە سەر کافرەکان و ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ ئەوانەی کە کافرن، بەرگری ئایینی خا ئەکەن، ئەوانە وەك پەستی و دانەمەزراوی و هەڵخلیسکانیان بووبێ، واتە خوای گەورە بڕیاری ئەوانەی بەسەردا داون، هەموو کردەوە چاکەکانیشیان ون ئەکات لێ یان، بە جۆرێ هیچ سوودو بەرهەمێکی نابێ بۆیان بە پێچەوانەی ئیماندارەکان وەکو باس کرا. ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئەوەی کە خوا دەربارەی ئەو کافرانەی ئەکات بەهۆی ئەوەوەیە کە رقیان لەو ئایین و بەرنامەیە کە خوا هێناویەتی یە خوارەوە، بێزاری و پێ ناخۆشی دڵیان هەیە دەربارەی واتە دڵ و دەروونیان بەو جۆرەیە دەربارەی ئەو ئایین و بەرنامەی کە خوا ناردی بۆ گرۆی ئادەمی، بەهۆی ئەوەوە کۆتایی ناهێنن لە کوفرو سەرکەشی و بەرگری و بەربەرەکانێ لەگەڵ ئایینی خواو پێغەمبەری خوادا، ئینجا خوایش بەو جۆرە قارو غەزەبیان لێ ئەگرێ ﴿فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾[1] بەهۆی ئەوەوە خوا هەموو کردەوە چاکەکانیانی بەتاڵ کردەوەو بێ سەرو شوێن لەناوی بردن و هیچ سوودو بەرهەمێکیان نابێ بۆیان. بێگومان گەورەترین و بەنرخترین چاکەو نیعمەتی خوا بەسەر ئادەمی یەوە ئەم شەریعەت و بەرنامەیە، کە پەیڕەوی کردنی هۆی کامەرانی و ئارامی هەردوو جیهانە، ئەمە شتێك نی یە کە بە دەمبڕو گۆترە کاری، یان بەشێوەی لایەنگیری بگوترێ. بەڵکو ئەوە هەموو بیرو باوەڕو یاساو رژێمەکەی ئاشکرایە و

---

[1] وشەی ﴿أحبط﴾ ئێش و قورسی زۆرە لە دڵی ئەو هەڕەشە لێ کراوانەدا کە تێ ئەگەن لە مانا ئەسڵی یەکەی، چونکە ﴿حبوط﴾ لە زمانی عەرەب دا بریتی یە لە ئاوسان و باکردنی سکی حەیوانێ کە گیایەکی ژەهرداری خواردبێ، ئەو کاتە سکی با ئەکات مەتا ئەتەقێ، بە گوێرەی رێزمانی عیلمی بەلاغە بە دوو جۆر ئیستیعارەی تیادا ئەکرێ: ١.تەشبیهی کردەوەکانیان ئەکات بەو گیانلەبەرەی کە ئەو خواردنە خراپەی خواردبێ و بای کردبێ تا تەقیبێ. ئەمە پێ ی ئەگوترێ(ئیستیعارەی مەکینە). ٢.(ئیستیعارەی تەبەعیەی موسەڕەحەیە) بەمەرکام بگیرێ کاری گرنگی کردووە لە دڵی ئەوانەی کە لێ ی تێکەیشتوون.

وا به پێش چاوەوە، ئەگەر هەموو ئادەمی لەم جیهانەدا کۆ ببێتەوەو بکۆڵێتەوە لێ یان، لە رووی ژیریی یەوە ناتوانێ رەخنەیە بدۆزێتەوە، ناتوانێ وێنەی بهێنێ.

زیاد لەمەیش ئەم بەرنامە گەورەیە چەند جارێ تاقی کرایەوەو لە واقیعی ژیان دا بەدی هێنراو دەرکەوت کە تەنها ئەو رێکە لەگەڵ سروشت داو چارەسەری هەموو گرێ و قۆرتی ژیان ئەکات، تەنیا ئەو مافی هەموو خاوەن مافێك ئەدات. ئەم نیعمەت و خەڵاتە گەورەی خوا بەم جۆرە هات بۆ گرۆی ئادەمی لەگەڵ ئەوەدا لە هەموو چەرخ و چینێك دا زۆرو زەبەندە لە جێنشینەکانی یەکەم چین کە ئەم ئایەتەیان دەربارە هاتە خوارەوە: ئەو بەدبەختانە بە ئاشکرا - ئەگەر بە دەمیش نەڵێن - لەناو چاویان دا بێزاری و رق و کینەیان هەست پێ ئەکرێ دەربارەی ئەم شەریعەت و بەرنامەی خوا، چونکە پێچەوانەی ئەو بیرو باوەڕە لارەیە کە دەقیان پێوە گرتووە، یەك ناکەوێ لەگەڵ ئەو شتانەی کە دڵ و دەروونی ناسازو نەخۆشی ئەوان ئەیانەوێ، نەفامی و خراپەیان لە رادەیەك دایە لەوانەن بەناو بردنی ئیسلام دائەچڵەکێن وەکو هەواڵێکی ناخۆشی سامناك ببیستن، یان شتێکی ناهەموار روویان تێ بکات، خۆیان ئەپارێزن لە بیستنی ناوەکەیشی!!

ئینجا بە گوێرەی باوی قورئان هەرناو بەناوێك سەرنج رائەکێشێ بۆلای گەلە پێشووەکان و پاشەرۆژی سەخت و سامناکی تاوانبارەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ۖ﴾ ئایا ئەوانە بە زەوی دا نەگەڕاون و بە وڵات دا هاتوچۆیان نەکردووە تا تەماشا بکەن و ببینن کە پاشەرۆژی سەختی ئەو گەلە تاوانبارانەی پێش ئەمان چۆن بوو؟ خوای گەورە سزای سەختی دا بەسەریان داو دانی بەسەریەك دا بە خۆیان و هەرچیان هەبوو بەربادی کردن و لەڕیشەی هێنان، واتە ئەو بت پەرستانە کە باوەڕیان نی یە بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە بە راست نازانن کە گەڕاون بە وڵات داو جێگاو شوێنی وێران بووی گەلە پێشووەکانی خۆیانیان بینیوە، وەکو عادو سەمود و حیجر کە ئەمانە لەسەر رێگاکانیان بوون کاتێ ئەچوون بۆبازرگانی، بەناوبانگ بوو کە ئەوانە هەموو - وەکو ئەمان- دژی پێغەمبەرەکانیان بوون و بەرگری ئایینی خوایان ئەکرد. خوایش ئەوەی بەسەر هێنان کە بەسەری هێنان، کەواتە با تەمێ بن لەو گەلانەوە، کۆتایی بێنن لە سەرکەشی و کەلەرەقی، ئەگەر نا وێنەی ئەوانیان بەسەر دێ،

وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا﴾[1] بۆ ئەم كافرانە هەیە چەند وێنەی ئەو سزاو كردەوانەی كە دەربارەی تاوانبارانی گەلە پێشووەكان كرا. خوای گەورە باوی هەروا بووە، پاشەرۆژی سەخت و بەدبەختی دووچاری دوژمنانی ئایین و پێغەمبەرەكانی كردووە، پاشەرۆژی خۆشی و كامەرانی داوە بە دۆستەكانی خۆی، ئەوەی كردووە بە یاساو رێبازێكی گشتی، وەكو لە چەند شوێنێك دا قورئان بۆمان باس ئەكات و لێرەیش دا ئەیگەیەنێ بەم فەرمودەیە: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ﴾ ئەوەی كە زانرا لە بەرباد كردنی دوژمنەكانی پێغەمبەران، یارمەتی دان و رزگار كردنی شوێن كەوتووەكانی ئایینی خواو پێغەمبەرەكانی، ئەوە هەمووی بەهۆی ئەوەیە كە خوا یارمەتی دەری كەسانێكە بروایان هێناوە، بێ بڕواكان هیچ یارمەتی دەرێكیان نی یە، هەركەسێك خوا یارمەتی دەری بێ پاشەرۆژی سەركەوتن و كامەرانی مسۆگەر بووە، تەنیا ئەو یارمەتی یەی بەسە بۆ هەردوو جیهان، پێویستی بە هیچی تر نی یە، هەر بەلاّو ناخۆشی یەك بێتە رێگای ئەوە هەمووی تاقی كردنەوەیەو خێرو خۆشی بە دواوەیە، لەو بارەكەی ترەوە هەركەس خوا یارمەتی دەرێ نەبێت هیچ كەسێ نی یە بتوانێ یارمەتی بدات، ئەگەر هەموو ئادەمی و جن قۆڵی بگرن بێ سوودە ئەبێ هەر بكەوێ، ئەگەر هەموو هۆی پارێزگاری بۆ فەراهەم هاتبێ ئەبێ هەر لەناو بچێ، ئەمە شتێكە هەروا بووەو هەروا هاتووەو هەروایش ئەبێ، ئیتر زۆر پێ چووبێ، یان كەم، یان زۆری پێ بچێ یان كەم!! هەر هێزو تواناو سەركەوتنێ، یان هەر زاڵ

---

[1] شوێنەكە شوێنی راناوە، واتە ﴿ولهم﴾ لەباتی ﴿وللكافرين﴾ بەلاّم بەم جۆرەی ئێستا لەكەداریان ئەكات بە پیسترین لەكە كە بریتی یە لە كوفر.

بوون و مۆڵەت دانێ کە ئەبینرێ بە دوژمنەکانی خواوە شتێکی کاتی یەو دامەزراو نی یە، بەڵکو دیمەن و قەبارەیەکی رووتە، جێگای دڵخۆشی و دڵ پێوە بەستن نی یە، چونکە ماوەکەی کەمەو ویست و خوایشی خێری خوای لەگەڵ دا نی یە، بەڵکو ئەبێتە هۆی بەدبەختی و بێ بەشی رۆژی دوایی، لەم جیهانەیش دا ئەبێتە هۆی بێ ئارامی و سزای دڵ و دەروون، وەکو ئەفەرموێ لە سورەتی ﴿التوبة﴾ دا: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴾[1] ئەم جۆرە شتانە لە زمانی زانایانی شەریعەت دا پێ یان ئەگوترێ ﴿استدراج﴾ دوژمنانی خوا بەهۆی دەسەلات و سامان و سەرکەوتنیانەوە دڵ دامەزراو ئەبن لەسەر ئەو بارو رێگا لارەی کە داویانەتە بەر تا سەریان لە غەزەب و عەزابی نەبڕاوەی خواوە دەرئەکات. هەرکەس باوەڕی رێك و بەهێزی هەیە ئەبێ دڵنیا ببێ، چونکە بە چاوێکی قورئانی تەماشای هەموو شت ئەکات، بە تەرازووی رێك و راستی قورئان بەراوردی هەموو شت ئەکات، کەواتە نرخ نادات بەهەر شتێك کە لای خوا نرخی نەبێ، هەرکەس باوەڕی رێك و بەهێزی نی یە، بەچاوی نابینای هەواو نەفسی خۆی سەرنجی هەموو شت ئەدات، بە تەرازووی عەقڵی لارو سێ سووچی خۆی شت بەراورد ئەکات، ئەوە بڕوا چی ئەکات بیکات، ئەو کەسە ئەبێ بە مەراقەوە بژی و بە مەراقەوە سەربنێتەوە. ئینجا خوای گەورە بە کورتی بەشی ئەو ئەو دوو کۆمەڵە دیاریی ئەکات: کۆمەڵی ئیمانداران و کۆمەڵی کافران، با ئێمەش تێفکرێین و بەراوردیان بکەین،

---

[1] واتە: با ماڵ و سامان و نەوەی ئەو کافرانە سەرسامت نەکات، چونکە خوا مەبەستی هەر ئەوەیە سزایان بدات بەو شتانە لەم ژیانی دنیادا، ئەیەوێ گیانیان بە کافری دەربچێ، چونکە ئەو ماڵ و سامانە ئەبێتە هۆی بێ ئارامی، بەو بارەی کە لەسەریەتی و کۆتایی ناهێنێ تا بە کافری لەدنیا دەرئەچێ بەرەو دۆزەخی نەبڕاوە.

إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم ﴿١٤﴾

---

**ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ﴾ **بێگومان ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە خوا ئەیانخاتە ناو بەهەشتانێك کە لە ژێر کۆشکەکانی دا رووبارەکان دێن و دەڕۆن، ئەوانەی کە کافرن لەم جیهانەدا رائەبوێرن و ئەخۆن بە وێنەی ئاژەڵ، لە رۆژی دوایش دا ئاگر هەوارو شوێن و جێگای دانیشتنی ئەوانە.**

**ئەو ئیماندارانە هەرچەند لەم جیهانەدا لەزۆر کات دا پاکترین و خۆشترین رابواردنیشیان هەیە، ئەگەر خۆشی و رابواردنییشیان نەبێ بە کەم و کوڕی بژین هەر هێشتان ئەوان لە کۆمەڵەکەی تر چاکترن. چونکە دڵ ئارامن بەهۆی ئەوەوە دڵیان یادی خوای تیایە، هەرچەند ئەم کۆمەڵەیە بەختیارە ئەم جیهانەیشیان باشترە بەڵام خوای گەورە باسی ئەوەی نەفەرمووە، ئەو بەراوردە ئەخرێتە نێوان بەشی گرنگ و گەورەی ئیماندارەکان و بەشی سامناکی نەبڕاوەی کافرەکان. بەشی ئیماندارەکان ئەو بەشە بەنرخە بەرزە خاوەن رێزەیە کە لە دەستی رەحم و بەزەیی خوای وەرگرن. بەشی کافرەکان لەم جیهانەدا خواردن و خۆراکێکی ئاژەڵی یەو لەو جیهانیش ئاگری ئاگری نەبڕاوەی دۆزەخە، خوا پەنامان بدات. ئەو شێوە رابواردن و خواردنی ئەو کافرانە کە خوا نیشانمان ئەدات یەکجار جێگای تێفکران و سەرنج راکێشانە، چونکە هیچ نیشانەو دروشمێکی ئادەمی ناهێڵێ پێ یانەوە، بەڵکو ئاژەڵی یەکی پەتی!! چڵێسی، ماشکە ماشکەو ماشینەوە بێ خۆگرتنەوەو خۆپاراستن، بیر کردنەوە لە چاك و خراپ و رەواو ناڕەوا، بێ مەبەست و ئامانجێ جگە لە ماشینەوەو تێرکردنی ئارەزوو. ئەم شێوە – وەکو ناشیرینەو بێزراوە لای هەموو کەس کە سروشتی ئادەمیێتی نەشێوابێت – زۆر زیانی هەیە بۆ ژیان و جیهان لەگەڵێ بارو رووەوە، مەبەست ئەوە نی یە دەست بگیرێ بەسەر دەم و ئارەزووداو خواردن و خواردنەوەی چاك و خۆش**

قەدەغە بكرێت، بێگومان ئەوە پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە، خوا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ [1] پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿لا رهبانية في الأسلام﴾ [2] بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە ئادەمی ئازادو سەربەست بێت، بەندەیی هیچ كەس و هیچ شت نەكات جگە لە خوا، ئەو كەسانەی ئەبن بە بەندەی ئەڵقە لە گوێی سك و ئارەزووی خۆیان، لە پێناوی ئەوەدا ئامادەن دووچاری هەموو كردەوەیەكی ناڕەوا ببن، هەموو فەرمانێكی ناشیرین بكەن، ئەبێ هەر بەو مەبەستە تایبەتی یە بێ نرخەی خۆیانەوە خەریك ببن، پەردەشیان بەسوودو چاكەی گشتی، رەحم و بەزەیی یان نامێنێ، لەگەڵ ئەمە بێ جیاوازبێ لە هەموو گیان لەبەرەكانی تر، ئەبێ مەبەست و ئامانجی پاك و خاوێن بێ. بتوانێ خۆی بگرێتەوە لە شتی ناڕەوا، ئارەزوو زاڵ نەبێت بەسەری دا، ئەبێ گرنگترین ئامانجی خزمەت و پێك هێنانی سوودی گشتی بێت، هەوڵی ئەو شتانە بدات كە رادەو پلەی ئادەمێتی بەرز ئەكاتەوە بە گوێرەی ئەو بەرنامەیەی خوای پەروەردگار بۆی ناردووە.

خوای گەورە ئادەمی كردووە بە جێنشینی لەزەویدا، كەواتە ئەبێ پایەو پلەی خۆی بناسێ، هەوڵی ئەوە بدات لەو پلەبەرزە نەیەتە خوارەوە، بێ بەش نەبێ لەو رێزەی خوا پێی داوە. ئەو شێوە ناشیرینەی كە قورئان نیشانی داین زۆر بە روونی ئەبینرێ لە زۆر كەسەوە لە هەموو چەرخ و وڵاتێك دا، بە تایبەتی لەم چەرخەدا كە خوای گەورە نازاو نیعمەتی بە لێشاو رشتووە بەسەر بەندەكانی دا.

بەهۆی فراوانی ئەو هەموو شتەوەو بەهۆی دووركەوتنەوەی خەڵكی لەم رەوشتی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرو شێوە ناشیرین و نارێكە سەر كراوەتە ئەم هەموو نازو نیعمەتەی خوا، ئەبینرێن كە زۆربەی قسەو گفتوگۆیان هەر باسی خواردنە، روونی ئەكەنەوە كە گرنگترین ئامانجیان ئەوەیە كە بەیانی ئەو شتە بخۆن و نیوەڕۆ ئەوەو ئێوارە ئەوە...

ئینجا لە نێوانی بەراورد كردنی ئیمانداران و كافرەكان و بەشەكانیان ئەیخاتە پێش چاو بەراوردكردنی مەككەو ئەو شارانەی تری پێش ئەمان كە خوا بەربادی كردن، بەوە دڵنەوایی ودڵخۆشی پێغەمبەر ئەداتەوەو هەڕەشەیشە، لە مەككەیی یەكان، ئەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ

---

[1] واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ و بە بێزاری یەوە پرسیار بكە: ئایا ئەوە كێ یە؟ ئەو كەسەی كە ئەو شتە جوانانەی كە هۆی ئارایش و جوانین و ئەو رۆزی و خۆراكە پاك و خاوێنانە كە خوا فەراهەمی هێناوە بۆ بەندەكانی، ئایا كێ یە ئەو كەسەی ئەوانە قەدەغە ئەكات!!

[2] رەوا نی یە لە ئیسلام دا: پەناگیری و وازهێنان لە ژیانی دنیاو بە تەنیا خواپەرستی بكرێت.

﴿هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ﴾[1] زۆر دانیشتوانی شاری تر هەبوون کە بەتین و بەهێز تر بوون لە دانیشتوانی ئەم شارەی تۆ – واتە مەککە – کە تۆیان دەرکرد، ئەوانە هەموومان بەرباد کردن و لە ریشەمان هێنان، ئینجا هیچ یارمەتی دەرێك نەبوو بۆیان بەرگری ئەو عەزابەیان لێ بکات، واتە دڵنیابەو غەمبار مەبە پاشەرۆژو سەرکەوتن هەر بۆ تۆ ئەبێت وەك هەموو ئەو برا پێغەمبەرانەت، ئەوانەی ئەیانەوێ بەرگری تۆو ئایینەکەت بکەن بەربادیان ئەکەین وەك ئەو هەموو هاوڕێ تاوانبارانەیان.

هەر لەسەر بەراورد کردنی ئەو دوو کۆمەڵە ئەڕوات لەگەڵ باس کردنی هۆی یارمەتی دانی ئیمانداران و نەبوونی یارمەتی دەر بۆ کافرەکان، ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم﴾ ئایا کەسێکی ئەوتۆ دڵنیاو دامەزراو بێت لەسەر بەڵگەو نیشانەی روون لە لایەن پەروەردگاری یەوە دەربارەی ئەو باوەڕو بەرنامەی لەسەریەتی، ئایا ئەو کەسە وەك ئەو کەسانە وایە کە کردەوەی خراپ و ناڕەوای خۆیان لە پێش چاویان چاك و شیرین کرابێ، لەو بارو باوەڕەی کە گرتوویانەتە ئەستۆیان شوێنی هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون بێ ئەمەی هیچ نیشانەو بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت؟ بێگومان ئەم دووانە وێنەی یەك نین و لە یەکتر جیاوازن، واتە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو کەسانەی باوەڕیان پێ هێناوەو شوێنی کەوتوون ئەو رێگە راستەی کە وان لەسەری چاك ئەیناسن، ئەزانن کە لای خواوە هاتووە، بەڵگەو نیشانەی وەك قورئان ئەو هەموو بەڵگە ژیریی یانەی کە قورئان نیشانی ئەدات بە دەستیانەوەیە، کەواتە بە تەواوی بێ هیچ گەردو لەکەیە دڵنیاو بەهێزو دامەزراون بەو رێگەو رەوشت و بەرنامەی خۆیانە، ئەمان بەم جۆرەن و ئەوانەی کە باوەڕیان نی یەو شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) نەکەوتوون، ئەو باوەڕو رێگەیەی کە داویانەتە بەر نایناسن بەڵکو خەڵەتێنراون، سەریان لێ تێك دراوە بۆیە بە چاکی ئەزانن، چونکە هیچ شتێکیان بە دەستەوە نی یە بیکەن بە دروشم لەسەری بەڵکو کوێرانە شوێنی هەواو ئارەزووی ناڕەوای خۆیان کەوتوون، کەواتە هەرکەس لە ژیریی بێبەش نەبێ هەرگیز رێگای ئەمانە ناداتە بەر، بەڵکو ئەکەوێتە شوێن رێگای راستی پێغەمبەر(ﷺ).

---

[1] ئەڵێن: ئەم ئایەتە کاتێ هاتە خوارەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە رێگەدا بوو لە بەینی مەککەو مەدینەدا، کاتی کۆچ کردنی هات بۆ گەیاندنی بێ نرخی بت پەرستەکان.

مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾

---

**ئەودوو كۆمەڵە كە لە ڕێگاو ڕەوشت و بەرنامەدا جیاوازن، بێگومان ئەبێ پاشەڕۆژیشیان جیاواز بێت، لێرەدا شێوەیەك لە شێوەكانی جیاوازیان باس ئەفەرموێ:** ﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾ **شێوەو نایابی بەهەشتێكی ئەوتۆ كە بەڵێن دراوە بە لە خواترسەكان ڕوون ئەبێتەوەو دەرئەكەوێت لەم وتارەدا كە دێت: لەو بەهەشتەدا چەند ڕووبارێك هەیە لە ئاوی تام و بۆن و ڕەنگ نەگۆڕاوو بێگەردو لەكەو چەند ڕووبارێك لە شیرێك كە تامی نەگۆڕاوە، واتە نەترشاوەو بەهیچ جۆر تێك نەچووە، چەند ڕووبارێك لە ئارەق و شەرابێك كە خۆش و بە لەزەتە بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوە، واتە وەكو هینی ئەم جیهانە نی یە تام و بۆنی ناخۆش بێت و سەرخۆشی و بێ هۆشی و سەریەشی لێ پەیدا بێت، بەڵكو خۆش و بە لەزەت و تام و بۆن خۆشە، زیادە كەیف و ئاهەنگ و وریایی و تەندروستی لێ پەیدا ئەبێت، چەند ڕووبارێك لە هەنگوینی پاڵفتە هیچ شتێكی تری تێكەڵ نی یە: نە مێوو نە كرێش و نە هیچی تر، لەو بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە میوەیەك هەیە بۆ ئەو لە خواترسانە، لە لایەن پەروەردگاریانەوە لێ بووردن و سڕینەوەی هەموو گوناهو تاوانیان هەیە.**

**ئەمە چەند نموونەیەك بوو لەسەر ئەو بەهەشتەی كە خوا ئەیدات بەو كەسانەی كە لەخواترسن، بەهۆی ئەوە خۆیان لەم جیهانەدا ئەپارێزن، سەر ناكەنە تاوان و خراپە، قاپی ڕەحم و بەزەیی خوا لەسەرخۆیان داناخەن، دەی ئایا ئەم كۆمەڵە بەختیارە وەكو ئەو كەسانەن كە لەم جیهانەدا بێ باكن لەخوا، بەهۆی ئەوە سەر ئەكەنە هەموو خراپەیە، تا خوا قاریان لێ ئەگرێت، بێ بەشیان ئەكات لە ڕەحم و بەزەیی خۆی، بەهۆی ئەوەوە تۆڵەیان لێ ئەسێنێ بە ئاگرێ كە تیایدا ئەمێننەوە هەتا هەتایە بێ دوایی هاتن و بڕانەوە، ئاوێكیان دەرخوارد ئەدرێ كە لە پلەی هەرە بەرزی گەرمیدایە، كە ئەیخۆنەوە ڕیخۆڵەكانیان پارچە**

پارچه ئەكات. بێگومان ئەم دوو وێنەیە نموونەیەكی زۆر كەمن لەوەی خوای گەورە ئامادەی كردووە بۆ ئەم دوو كۆمەڵە، هەردوو وێنەكە نموونەی خۆشی و ناخۆشی یەكن كە وان بە پێش چاوەوەو لەم جیهانەدا وێنەیان هەیە، چەندەها خۆشی و ناخۆشی تر هەیە كە وێنەیان لەم جیهانەدا دروست نەكراوە. بە تایبەتی خۆشی ی بەهەشت، وەكو خوا دەربارەی كۆمەڵێ لە چاكان دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾[1] پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿يقول الله: اعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رات ولا اذن سمعت و لا خطر على قلب بشر﴾.[2]

خوا خۆی بەندەكانی ئەناسێ، ئەزانێ كە چ شتێك كار ئەكات لەدڵ و دەروونیان، چ جۆرە تەمێ و ئامۆژگاری یەك بەهێزترەو چەند شێوەو جۆر پێویستە. ئادەمی چەند جۆرێكن، دڵ و دەروون و سروشتیان جیاوازە، هەر یەكە جۆرە شتێكی پێ خۆشترەو زیادە ترس و بیمی لە شتێ هەیە، هەندێ زۆرتر ئارەزووی خواردن و خواردنەوەی خۆش و بەلەزەت ئەكەن، هەندێ تر زۆرتر خۆشیان لە پۆشاكی چاك و كۆشك و شوێنی نایاب هەیە، هەندێ تر باخ و بێستان و كانی و رووبارو سێبەرو سەهەندیان پێ خۆشترە، بە گوێرەی ئەم هەموو تاقم و چینە جیاوازیانە خوای گەورە دڵخۆشی بەندەكانی دەداتەوە بەم جۆرە نازو نیعمەتانە، وەكو بە درێژیی لە ئایەتەكانی قورئان دا باسی فەرمووە، هەموو جارێك ئەچن بە گوێمان دا، هەروەها بۆ دۆزەخی یەكانیش.

ئینجا لەم ١٦ ئایەتەدا كە دێت هەڵوێستی ناپاك و مونافیقەكانی مەدینە باس ئەكات، هەڵوێستیان دەربارەی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) و دەربارەی ئەو جیهادو تێكۆشانەی كە خوای گەورە بریاری داو پێویستی كرد بەسەر موسڵمانانەوە بۆ بەرزكردنەوەی ئایینی خوا، ئەو تێكۆشانەی كە لەمەو پێش لەم سورەتەدا باس كراوە، هەموو سورەتەكە بەو مەبەستەوە بەستراوەو پەیوەندی هەیە.

---

[1] هیچ كەس نازانێ رادەو پلەی بەرزو چۆنیەتی ئەو نازو رێزەی كە ئامادە كراوەو داشاراوە بۆ ئەو بەندە چاكانە، ئەو نازو نیعمەتەی كە هۆی دڵخۆشی و چاو روون بوونەوەیە. سورەتی ﴿السجدة /١٧﴾.

[2] خوا ئەفەرموێ: شتی وام بۆ بەندە ساڵحەكانم ئامادەكردووە كە هیچ چاوێك نەیدیوە، هیچ گوێ یەك نەیبیستووە، بە خەتەرە بە دڵی هیچ كەس دا نەهاتووە، زیاد لەوە كە ئاگادارم كردوون بەسەری دا، واتە كە نموونەیانم لەم جیهانەدا دروست كردووەو بینیوتانە.

ئینجا دێته سەر هەڵوێستیان لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینەو یەك گرتنیان هەموو پێکەوە بۆ پیلان گێڕان دژی موسڵمانەکان. ئەو تاقمە پیسە لەمەدینەدا پەیدا بوون، لە مەککەدا هیچ هۆیەك نەبوو بۆ پەیدا بوونیان، چونکە موسڵمانەکان لە چەرخی مەککەدا بە بێ هێزو دەسەلاَت سەیر ئەکران، بەڵکو لەو چەرخەدا ئەوەندە چەوساوە بوون ئەوەی دوژمنیان نەبوو نەیئەوێرا خۆی بکات بە خاوەنیان، ئەوەی دوژمنیان بووایە بە ئاشکرا دوژمنایەتی خۆی ئەکرد، هیچ کەس ناچار نەبوو لە ترس دا لە پێش چاویان خۆی بکات بە موسڵمان، بەلاَم بە پێچەوانەی ئەوە لە کات و چەرخی مەدینەدا زۆرو دەسەلاَت کەوتە لای موسڵمانەکان، بەهۆی ئەوەوە کۆمەڵێکی دڵ نەخۆش کە سەرکەوتنی ئیسلام و موسڵمانەکانیان پێ ناخۆش بوو، توانای ئەوەشیان نەبوو دوژمنایەتی یەکەیان دەربڕن، ئەو کۆمەڵە پەیدا بوون، بە دیمەن – لەترس دا – خۆیان بە موسڵمان نیشان ئەدا، لەدڵەوە کافر بوون، پڕ دڵیان ڕق و کینە بوو دەربارەی پێغەمبەرو موسڵمانەکان، هەموو کات بە شوێن هەلێك دا ئەگەڕان تا بەهەر جۆر ببێ زیان بگەیەنن بە موسڵمانەکان، بە تایبەتی سەرۆکی ئەو کردەوە ناڕەوایانە عەبدوڵلاَی کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول بە هەموو جۆر هەوڵ و تەقەلای ئەدا لەوبارەیەوە، چونکە لە پێشا بڕیار بوو بکرێت بە پاشای مەدینە، بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی لە کیس چوو، بۆیە بە یەکجاری ئاگری تێچوو بوو، بوونی جوولەکە لە مەدینەدا بەو هەموو دەسەلاَت و هێزو سامانەوە، بەو هەموو دوژمنایەتی و ڕق و کینەوە کە دەربارەی پێغەمبەرو ئایینەکەی بوویان، ئەمەیش هاندەرو یارمەتی دەرێکی زۆر بەتین بوو بۆ پێك هاتنی ئەو بزووتنەوە ناڕەوایە لە مەدینەدا. ئەو دوژمنە کۆڵ نەدەرانە دەستیان تێکەڵ کردو یەکیان گرت، بێ وەستان خەریکی پیلان گێڕی بوون، بوون بە خەتەرێکی گەورە لە ڕێگای موسڵمانەکان دا تا ماوەی پێنج ساڵ، واتە تا نیوەی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینەدا. ئەو دوو تاقمە زاڵمە نەئەوەستان لە هەموو پیلان و کارێکی ناڕەوا بەهەر جۆرێ پێ یان بکرایە، بەلاَم – الله بەرەکەت بدا – قورئانیش ئەهاتە خوارەوە ئەو پیلان و کردەوە ناپەسەندەی کە بە دزی یەوە ئەیانتەند ئاشکرای ئەکردو هەواڵی دڵیشیان، بەدرۆی ئەخستنەوە لە هەموو درۆو دەلەسەو پروپاگەندەیە دڵیشیان، بەدرۆی ئەخستنەوە لە هەموو درۆو دەلەسەو پروپاگەندەیە کە بلاَویان ئەکردەوە، جا – وەکو لە پێشەوە وتم – ئەم ئایەتانەی کە دێن پەیوەندی یان بەو دوو تاقمە خراپەوە هەیە.

**ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا﴾ [1] هەندێکە لەو کافرانە کەسێك کە حازری کۆمەڵی موسڵمانانە، لای تۆ بەدیمەن باش گوێ ئەگرێ لە تۆ، ئەوەی تۆ ئەیڵێیت گوێی لێ یە، هەتا کۆمەڵ هەڵئەسن و بڵاوەی لێ ئەکەن کاتێ کە لای تۆ دەرئەچن ئەو موونافیقە ناپاکانە ئەپرسن، ئەڵێن بەوانەی کە علیم و زانینیان پێدراوە – واتە موسڵمانەکان – ئەڵێن: ئەوە چی بوو ئێستا وتی؟ بێگومان ئەو موونافیقانە عەرەب بوون وەکو هەموو ئەوانی تر، ئەو کەسەی کە قسەی بۆ ئەکردن پێغەمبەر بوو(ﷺ) کە بەناوبانگ بوو لە فەسیحی و رێك و پێکی و قسە رەوانیدا، سەرباقی ئەوەیش زۆرتر بە قورئان قسەی بۆ ئەکردن کە وێنەی نی یە، کەواتە ئەوانە ئەو پرسیارانەیان ئەکرد یان لەبەر ئەوەبوو بەڕاستی وەریان نەگرتبوو، چونکە دڵیان لای نەبوو، بەهۆی ئەوەوە ئیمانیان پێی نەبوو، حەزیان لێ نەئەکردو کینەو بوغزیان بوو دەربارەی، یان بەهۆی ئەو بارە پیسەی کە لەسەری بوون خوا فام و تێگەیشتنی لێ سەندبوون، یان ئەیانویست رەخنەو لەکە نیشان بدەن لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) بەمەی کە هیچ مەبەست و سوودێکیان لێ وەرناگیرێ، ئەوەتا ئەمان بە باشی گوێ یان بۆ گرت لەگەڵ ئەوەدا هیچ لێ ی حاڵی نەبوون و هیچ شتێکیان لێ وەرنەگرت، هەروەها ئەگونجێ کە مەبەستیان لەو پرسیارە گاڵتەو لاقرتی بێت بەمەی کە یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە گرنگ خەریك ئەبوون بەو فەرمودانەوە، زۆر سوور بوون و بە هەموو هێز هەوڵیان ئەدا بۆ وەرگرتن و لەبەرکردنی هەموو وشەیەك کە لە پێغەمبەریان ببیستایە.**

---

[1] ئەو موونافیقانە بە دیمەن خۆیان بە موسڵمان نیشان ئەداو لە دڵەوە کافر بوون، کەواتە ﴿هم﴾ ئەگونجێت مەبەست موسڵمانان بێت وەکو ئەگونجێت مەبەست پێی کافرەکان بێت، بەڵام لەمەوپێش باسی کافر لەناودا بوو، ئەم کۆمەڵە ئەوەندە پیسن شایانی ئەوە نین بە دیمەنی رووتیش ناو ببرێن بە موسڵمان چونکە لە راستی دا کافرن، لەبەر ئەوە لە تەفسیرەکەدا لەسەر باری دووەم رۆیشتم.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا

---

ئەمانە چەند نیازو مەبەستێکی ناڕەوا بوون لەو پرسیارە بێ جێ یە وەرئەگیرێن کە ئەو تاقمە پیسە ئەیان کرد، بەڵگەی روونن لەسەر خراپی و دڵ پیسی ئەو پرسیار کەرانەو نیشانەیان لەسەر ئەوەی کە بوون بە جێگای قارو غەزەبی خوا، وەکو لەم فەرمودەیشەوە بە تەواو روون ئەبێتەوە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیان دا، ئەوانە شوێنی هەواو ئارەزووی نەفسی خۆیان کەوتوون، بەهۆی ئەوەوە دەربارەی فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە بوون کە باسکران.

بێ ئیمانەکان بەو جۆرە بوون، بەڵام ئیماندارەکان بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ﴾ کەسانێك کە رێگای خوایان داوەتە بەرو رێنموونی خواو پێغەمبەریان وەرگرت، خوا رێنموونی ئەوانی زیاتر کردو ترسان لە خوای لە دڵیان دا جێگیر تر کردو ئەو سیفەتەی پێ ئەدان. واتە ئەوان راستیان کرد کە رێگای خوایان دایە بەر، خوایش پاداشتی دانەوە بە زیادە رێنموونی و یارمەتی دان کە لە هەموو شت چاکترەو کانی هەموو چاکەو خۆش بەختی یەکە لە هەردوو جیهان دا، ئەویش بریتی یە لە حاڵەتێ لە ناو دەروون دا کە پێی ئەوترێ ﴿تقوی﴾ واتە خۆپارێزی لەو شتانەی کە هۆی رەزامەندی ئەون، ئەویش بەهۆی هەست کردن بە گەورەیی و ئاگاداری و دەسەڵاتی خوا بەسەر خۆیان و هەموو شتێك دا. خوای بە رەحم ئەم بەخششە بەنرخەیان پێ ئەدات بەرامبەر بەو دڵ مۆر کردن و بێ هەستی و بێ ئاگایی و کوێرکردنی چاوی دڵی ئەو کۆمەڵە بەدبەختە مونافیقەی کە لەم چەند ئایەتەدا خەریکین پێیانەوە، لەبەر ئەوە ئەوا ئەگەڕێتەوە سەریان، ئامۆژگاری یان ئەکات و ئەیان ترسێنێ بەو حیساب و پرسیارەی کە چاوەڕوانی ئەکرێت لە رۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً﴾ ئایا ئەو مونافیقانە چاوەڕوانی جگە لە رۆژی دوایی ئەکەن کە لە ناکاودا کتوپڕی بێت یەخەیان بگرێ؟ ﴿فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا﴾ چونکە نیشانەو دروشمەکانی – واتە زۆربەیان – هاتووە، رەوانە کردنی دواترینی پێغەمبەران گرنگترین نیشانەیەتی، چونکە ئەوە تێگەیاندنە بەوەی کە ئیتر ئەمە دواترین ترساندنە لە لایەن خواوە دوا دوایی ئەم جیهانە نزیکە.

فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ ۖ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ ۙ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ

---

**لەو کاتەوە تا ئێستا هەرچەندی پێ چووبێ لەمەو پاشیش هەرچەندی تری پێ بچێ هەر کەمەو نزیکە، چونکە کات و چەرخ و ڕۆژ لای خوا جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لای ئێمەیە، ئەوەی ماوە زۆر کەمەو چاو نادات لە چاو ڕابردوودا، کەواتە لەم بارەیشەوە هەر کەمە. کەواتە هەرکەس خاوەنی ژیریی بێت نابێ هەروا بێ باك و بێ غەم لێ ی دانیشێ، غەمێکی ئەو ڕۆژەی نەخوات، هەرکەس هەر چارەسەرێکی پێ بکرێ لەم ماوەدا پێ ی ئەکرێ** ﴿فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ﴾ **کاتێ ڕۆژی دوایی هات و ئەم جیهانە نەما ئیتر بیر کردنەوەو ئامۆژگاری وەرگرتنیان لە کوێ ئەبێ، چۆن ئیتر دوای ئەوە هیچیان بۆ ئەکرێ؟!**

**ئینجا ڕووی فەرمایش ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) و ئیماندارەکان بۆ ئەوەی کە بەردەوام بن لەسەر ڕێگای ڕاستی خۆیان: ڕێگای پەرستنی خوا بەتاك و تەنیاو زیکرو یادی و داوای لێ بوردن و هەست کردن بە ئاگاداری خوا بەسەر هەموو شتێك دا، هەموو بژین لەسەر ئەو بارە ڕێکە بە چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی یەوە، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ)** ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ **واتە کاتێ کە زانیت خۆش بەختی بۆ ئەوانەیە کە ڕێگای خوا ئەدەنە بەرو بەدبەختی و بێ بەشی بۆ ئەوانەیە کە لە ڕێگای خوا لائەدەن، کاتێ کە ئەوە ئەزانیت کەواتە تۆیش بەردەوام و دامەزراوتر بە لەسەر ئەوەی کە وای لەسەری کە بریتی یە لە زانین و باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا، کە ئەمە یەکەم شتێکە هەموو کاروباری پێغەمبەری – هەروەها هەموو پێغەمبەرانی تر – لەسەر ڕاوەستاوە، ئەوەیە پاڵفتەو مەبەست و ئامانجی ڕاستەقینە لە ناردنی ئایینی خوا بۆ سەر زەوی لە هەموو چەرخێك دا. ئەو وشە پیرۆزە کورتەی ئەم شەریعەت و بەرنامە گشتی یە هەموو کاتی یە ئەبڕاوەیە کە هەموو کاروباری هەردوو جیهانی کۆکردووەتەوە، هەموو تەمێ و ئامۆژگاری یەکی تر ئەبێ لەسەر ئەم بنەڕەتە بێت، هەتا مەبەست بەم شتە پیرۆزە جێگیر تر بێت لە دەروون دا بەندە زیاتر هەست ئەکات بە کەم و کوڕی خۆی بەرامبەر بەخوا، لەو هەستەوە داوای لێ بوردن پەیدا ئەبێت وەکو لێرەدا لە**

پاش ئەمە ئەفەرموێ: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ داوای لێ بوردن بکە لە گوناهت. بێگومان پێغەمبەران بە تایبەتی پێغەمبەرمان(ﷺ) خوا بە جۆرێك دروستی کردوون هەر ئارەزووی گوناهیشیان نەبووە، چ جای کردنی ئەو شتانەی کە بۆ ئەوان ناوبراون بە گوناه لە جۆری گوناهەکانی ئێمەو بەندەکانی تری خوا نەبووە، بەڵکو گوناهی ئەوان بریتی یە لەو کەم و کوڕی یە کە بوویانە بەرامبەر بە خوا، بریتی یە لە کردنی شتێ کە حەرام و قەدەغە نەبووە، بەلاَم نەکردنی چاکتر بووە، ئەو جۆرە شتانە هەرچەند گوناهو تاوان نین، بەلاَم شایانی پلەو پایەی بەرزی ئەوان نین لەبەر ئەوە بۆ ئەوان بە گوناه ناوبراون.

خوای گەورەهەواڵی داوەبەلێبوردنی هەموو ئەو جۆرە شتانە کە لە پێغەمبەرمانەوە(ﷺ) رووی دابێ لەوەو پێش و لەوەوپاش، بەلاَم لەگەڵ ئەوەیش دا فەرمانی پێداوە بە داوای لێ بوردن. بێگومان ئەم فەرمان و تەمێ کردنە زۆر بەجێ یە، چونکە ئەو داوای لێ بوردنە یادو سوپاسی خوایە لەسەر لێ بوردنەکەی خوا، هەم ئەبێتە تەمێ و پەند بۆ هەموو ئیماندارەکان کاتێ کە ئەبینن پێغەمبەر(ﷺ) بەو هەموو شانو نازو رێزەیەوە لای خوا، لەگەڵ ئەوەدا لێ ی بوراوە، خوا بەو جۆرە فەرمانی داوە کە داوای لێبوردن بکات، ئیتر هیچ کەسی تر لە خۆی ناگۆڕێ، هەموو هەست ئەکەن بە تاوان و ناتەواوی خۆیان، بێجگە لەوانیش پێغەمبەر(ﷺ) لەهەموو کەس باشتر خوای ناسیوە، هەتا خوا باشتر بناسرێ هەست ئەکرێ بە کەم و کوڕی بەندە بەرامبەر بە خوا. کەواتە ماڧ خۆیەتی فەرمانی پیا بدات بە داوای لێبوردن. لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو کەس زیاتر داوای لێ بوردنی کردووە لە خوا، لە هەموو رۆژو شەوێك دا زیاتر لە حەفتا جارو سەد جار تۆبەی ئەکردە لای خواو داوای لێبوردنی لێ ئەکرد. چونکە لە هەموو کەس باشتر خوای ناسیوە، کەواتە ترس و سامی بەتین تر بووە.

خوای خاوەن بەزەیی فەرمانی دا کە بۆ ئیماندارەکانیش داوای لێ بوردن بکات: ﴿وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ داوای لێ بوردن بکە لە گوناهی پیاوان و ئافرەتانی ئیمانداران. ئەمەیش دووبارەتەمێ کردنێکی گرنگەبۆئیمانداران کە پەیڕەوی پێغەمبەری خۆشەویستیان بکەن(ﷺ) ئەوانیش لەناویەکدا خاوەنی بەزەیی و دڵسۆزبن دەربارەی یەکتر، داوای لێبوردن بکەن بۆ یەکتر. ئەم تەمێ گرنگەی تێدایە وەکو بیر خستنەوەیشە بە رەحم و بەزەیی خۆی و بە گەورەیی ئەم نیعمەتەی بەسەر بەندەکانی یەوە: نیعمەتی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ).

ئینجا هەمیتر بێداری ئەکاتەوە بە ئاگاداری خوا بەسەر هەموو شتی بەندەکانیدا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ﴾ خوا ئەزانێ و ئاگای هەیە لە گەڕان و هاتوچۆیان لە

ڕۆژدا لە هەر شوێنێك دا بن، لە وەستان و ئارام گرتن و نیشتەجێیتان لە شەودا لە هەر جێگایەك دا بن.[1] بێگومان دڵی بێدار بەم تەمێ یە مەترسی پەیدا ئەكات بە یەكجار: ئارامی چاوەڕوانی چاودێریی و بەزەیی خوا كە ئاگادارە بەسەریدا لە هەر لایەك بگەڕێ و لە هەر شوێنێ ئارام بگرێ، مەترسی لەو زانین و دەسەڵاتەی كە هەموو كات دەوری داون لە هەموو شوێن و بە هەموو جۆر.

ئا ئەمەیە پەروەردە كردن، پەروەردەو پێگەیاندن بە بێداركردنەوەی هەموو كاتێ و هەستێكی تێرو تەواوو وریایی و خۆپارێزیی و چاوەڕوانی، بەرهەمی ئەم پەروەردە بێ وێنەیە پێك هاتنی ئەو كۆمەڵە بوو كە مێژووی ئادەمی شتی وای نەدیوە، ئەو كۆمەڵەی كە جڵەوی ئادەمی و ژیانیان كەوتە دەست، توانیان هەموو ماف بگەیەنن بە خاوەنەكەی بێ كەم و كوڕی.

ئینجا دێتە سەر باسی مونافیقە دڵ نەخۆشەكان، باسی هەڵوێستیان بەرامبەر فەرمانی خوا بە تێكۆشان و جەنگ و كوشتار لە ڕێگای خوادا، هەڵوێستی ترسنۆكی بێ ئارامییان بەرامبەر ئەو فەرمانە، پاشەڕۆژی خراپیان ئەگەر لەسەر ئەو باری خۆیانە بەردەوام بن و نەیەبە سەر ڕێگای گوێڕایەڵی و ڕاستی لەگەڵ خوادا وەكو ئیماندارەكان، ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ﴾ ئەوانەی كە ئیمان و باوەڕیان هێناوە ئەڵێن: كاشكێ سورەتێ لە قورئان بهێنرایەتە خوارەوە لە بابەت جەنگ و كوشتار لە ڕێگای خوادا، واتە ئاواتە خوازن بۆ ئەوەو بە ئاواتەوە چاوەڕوانی بۆ ئەكەن. ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ﴾ ئینجا كە سورەتێكی ڕوون و ڕەوان بهێنرێتە خوارەوە ﴿وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ﴾ لەو سورەتەدا باسی جەنگ و كوشتار بكرێت، واتە فەرمانی پێ بدرێت، بڕیار بدرێت لەسەر ئیمانداران، هەر لەگەڵ ئەوە كرا ئەبینی ئەوانەی كە لە دڵیان دا نەخۆشی هەیە، واتە مونافیقەكان، ترسێكی وا داگیریان ئەكات كە بە هیچ جۆرخۆیان پێ ناگیرێ وبێ ئارامی و لاوازی و بێ هێزیی دڵ و دەروونیان ئاشكرائەبێ،

[1] ئەم دوو وشە ئەگونجێ ﴿اسم مكان﴾ بن یان ﴿مصدر الميمي﴾ بن هەردوو جۆرەكە تەفسیر كراوەتەوە، ئینجا بە دوو جۆری تر تەفسیر كراوەتەوە: ١.جێگای هاتوچۆیان لەم جیهانەدا و جێگەی ئارام گرتن و مانەوەتان لە ڕۆژی دوایی دا. ٢.هاتوچۆو جێگاتان لەم جیهانەدا و شوێنی مانەوەو ئارامتان لەگۆڕدا، بە هەموو جۆر هەر باشەو ئەگونجێ. یەكێ لە گەورەیی قورئان ئەوەیە كە وشەیەك بۆ چەند جۆر تەفسیر دەست ئەدات و هەموویشی هەر ڕێك و پێكە ڕاستە.

يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾

---

ئەگەنە رادەیەکی وەها مەگەر تەنها قورئان بزانیٚ باسی بکات و بیهێنێتە پێش چاو کە ئەفەرمویٚ: ﴿يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ﴾ ئەو مونافیقانە ئەبینی بە جۆرێك تەماشا ئەکەن و ئەڕوانن بۆت بە وێنەی روانینی کەسێك کە لە هۆش چوویێ لەبەر مردن، واتە دووچاری بیٚ هۆشی و نارەحەتی و گیان کەنشت بوویێ. ئەو جۆرەی کە قورئان فەرموویەتی لاسایی ناکرێتەوە، هیچ وتارێکی تر بە هیچ زمانیٚ جێگەی ئەمەی قورئان ناگرێتەوە، بەلاَم مەبەستەکە وەرئەگیریٚ کە ئەوپەڕی ترس و سام و بیٚ ئارامی تا رادەی لەرزۆکی و نەمانی هەست و فام. دوای ئەوە بەو جۆرە ئەو شێوە بیٚ ئابڕووییەی نیشان دان.

ئینجا دەرمان و چارەسەریشیان نیشان ئەدات،ئەفەرمویٚ: ﴿فَأَوْلَىٰ لَهُمْ * طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ﴾[1] کەواتە چاك بۆ ئەوانە گویٚ رایەڵی و قسەی رێك و راستە کە لە ئایینی خوادا باشە، ئەو گویٚ رایەڵی و قسە راستە شەرعیانە کە ئیمانداره راستەقینەکان وان لەسەری. بەڵیٚ بە راستی ئەمە چاکتر بوو بۆ ئەو دلٚ نەخۆشانە کە وەکو تێکەڵی ئیماندارەکان بوون، بە دیمەن خۆیان نیشان ئەدا کە ئیمانداران هەر بەو جۆرەیش راستیان بکردایە لە قسەو کرداردا، ئەوە چاکتر بوو تا ئەو ترس و لەرزو بیٚ ئارامی و ئابڕوو چوونەی کە لیٚ یانەوە ئاشکرا ئەبوو، ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئینجا کاتیٚ کە کارەکە راست گەڕاو

---

[1] زۆر لە تەفسیرەکان لەسەر ئەوەن کە لێرەدا دوو رستەی هەیە: ١.﴿أولي لهم﴾. ٢.﴿طاعة و قول معروف﴾. لەم کاتەدا رستەی یەکەم بە دوو جۆر تەفسیر کراوە، بە هەردوو جۆر نزای شەڕە لیٚ یان، بەم جۆرە وەیل و خراپە بۆ ئەوان داباریٚ بەسەریان دا، یان کاروباریان سەری لە ناخۆشی و خراپەوە دەرچێت، پاشەڕۆژی خراپەیان دووچار بێت، زانین لای خوایە، رستەی دووەم ﴿مبتدأ﴾ ەکەی لابراوە واتە ﴿و أمرهم طاعة و قول معروف﴾ یان خەبەر لابراوە واتە ﴿طاعة و قول معروف خير لهم﴾ بەلاَم بە گوێرەی تەفسیرەکە یەك رستەیە وەك وروون کراوەتەوە.

ئەبێ هەر ببێ، جەنگ و کوشتار هاتە پێشەوەو پێویست بوو لەسەریان، کەواتە ئەگەر ڕاستیان بکردایە لەگەڵ خوادا بێگومان ئەوە چاك بوو بۆیان، واتە ئەمانە لە پێشەوە لەکاتی ئارام و خۆشیدا بە دەم – وەکو ئیماندارەکان – سوور بوون لەسەر تێکۆشان و جەنگ کردن لە ڕێگای خوادا، بە دەم خۆیان بە ئیمانداری ڕاست ئەدایە قەڵەم، کەواتە ئەگەر ڕاستیان بکردایە ڕاستی یەکە باش بوو بۆ ئەوان، مەبەست ئەوە نی یە کە ئەو بارەی ئەوانی لەسەرن هیچ چاکی هەیە، بەڵکو قورئان بەو جۆرە نەرم و ناسك و شیرینە ئەیەوێ تیمارو چارەسەری ئەو دڵە نەخۆشانە بکات، بەڕاستی ئەمە دەرس و تەمێ یەکی گرنگە بۆ هەرکەس کە ئەیەوێ تیمارو چارەسەری ئەو دڵە نەخۆشانە بکات، بەڕاستی ئەمە دەرس و تەمێ یەکی گرنگە بۆ هەرکەس کە ئەیەوێ خەڵك بهێنێتە سەر ڕێگای ڕاست.

ئینجا قورئان لا ئەکاتەوە بە لایانەوەو ڕووی فەرمایشتیان تێ ئەکات بە هەڕەشە کردن لێ یان بە دووچار بوونی پاشەڕۆژی خراپ ئەگەر بە تەواوی کافری خۆیان دەربڕن، ئەو پەردە تەنکەی ئیمانە نەهێڵن بەسەر خۆیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾ ئایا ئێوە بە تەمای ئەوەن – ئەگەر پشت بکەنە ئایینی ئیسلام – کە خراپەو ئاژاوە بنێنەوە لە زەوی دا و قەتعی ڕەحمتان بکەن و خزمایەتیان نەهێڵن، واتە لەپێش ئەوەی ئایینی ئیسلام بێت ئێوە خەریکی خوێنڕێژیی و ئاژاوە بوون لە وڵات دا، دەست دار بێ دەستی ئەخواردو دایئەپاچی، گوێتان لە خزمایەتی و ڕەحم نەبووە، بە هۆی ئیسلامەوە ئەو خراپەو ناڕەوایی یانە نەما، ئێستا بە تەمای ئەوەن پشت هەڵکەن لە ئیسلام و بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو نەفامی و نەزانی یە. کەواتە خۆتان بپارێزن و ئاگاداری خۆتان بن دەست بە ئیسلامەوە دووبارە نەکەونە ناو چاڵی گومڕایی و نەزانی و بەدبەختی.[1]

---

[1] وشەی ﴿تولیتم﴾ بە دوو جۆر تەفسیر کراوەتەوە: ١.پشت کردنە ئیسلام بەو جۆرەی کە لە تەفسیرەکەدا وترا. ٢.گرتنە دەستی کاروباری وڵات و حوکمڕانی، بەم جۆرە، واتە ئایا چاوەڕوانی ئەکرێ لە ئێوە ئەگەر بوون بە کاربەدەست کە ئاژاوە... هتد، واتە بەڵێ ئەوەتان لێ چاوەڕوانی ئەکرێ، هەرکەس بیانناسێ هەر چاوەڕوانی ئەوەیان لێ ئەکات، زانینی تەواو لای خوایە.

أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِ

**﴿ أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴾ ئا ئەوانە کە لەسەر ئەو بارە خراپەی خۆیان ئەبن و هیچ کاتێ ناگەڕێنەوە هەتا بە تەواوی پشت ئەکەنە ئەم ئاییینەی کە بە دیمەن گرتووتانەتە گەردن، ئا ئەوانە کەسانێکی ئەوتۆن کە خوا نەفرینی لێ کردوون، بەهۆی ئەوەوە کەڕی کردوون لەبیستنی شتی حەق و راست، کوێری کردوون لە بینینی رێگەی راست و هەموو بەڵگەو نیشانەکانی، واتە بەهۆی ئەوەی راستیان نەکرد لەگەڵ خوادا، پشتیان کردە گەورەترینی نیعمەت و چاکەی خوا، کە بریتی یە لەم ئاییینی پاکی ئیسلامە، بەهۆی ئەوەوە خوا بەو جۆرە قارو غەزەبیان لێ ئەگرێ، قاپی ی بەزەیی و رەحمەتی خوایان لێ دائەخات. خوای خاوەن بەزەیی هیچی نەهێشتووەتەوە بۆ بەندەکانی، رێگای هەموو پەڵپ و بەهانەیەکی رێك و راستی بڕیون بەهۆی قورئانەوە، چونکە قورئانەکەی بە جۆرێکە هەرچی هۆی رێنموونی هەیە تێیدا هەیە، بە جۆرێکە هەرکەسێ قورئانی بیستبێ و تێگەیشتبێ لێ ی زۆر جێگای بێزاری و سەرسوڕمانە کە نەکەوێتە شوێنی و رێگا راستەکەی نەداتە بەر، جا لەبەر ئەوە ئەوەتا لێرەدا بە شێوەی بێزاری و سەرسوڕمان ئەم پرسیارە لەبارەی ئەو دڵ نەخۆشانەوە ئەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴾[1] دەی ئایا ئەوانە بیر ناکەنەوەو تێ نافکرن لەم قورئانە؟ تا بەهۆی ئەوەوە بکەونە سەر رێگای راست، یان چەند دڵێك هەر قار لێ گیراوو داخراوەو قوفڵی تایبەتی دراوە بەسەری دا، بەهۆی ئەوەوە ئامۆژگاری یەکەی قورئان ناچێتە ناو ئەو دڵانەوە، بەرگری هەیە لەنێوان تیشکی روناکی قورئان و ئەو دڵە رەشە تاریکانەدا، بەهۆی ئەوەوە بێ بەشن لە ناسین و بینینی رێگای راست، واتە هۆی فکرو گومڕایی ئەمانە یەکێکە لەم دوو شتە: بیر نەکردنەوە لەو هەمو کوفرو گومڕایی ئەمانە یەکێکە لەم دوو شتە: بیر نەکردنەوە لەو هەموو رێنموونی**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون کە ﴿أم﴾ منقطیعە و ئەو﴿ا﴾ یەی کە گرتوویەتی یە خۆی بۆ دان پیانانە ﴿تقریر﴾ واتە: بەڵێ چەند دڵێ بەرگری کراوە لە رووناکی قورئان وەکو هەندێ شت پێوە ئەدرێ و قوفڵ ئەدرێ، ئیتر نە هەواو نە رووناکی تێ ی ناچێ.

و تەمیٚ و ئامۆژگاری یەی قورئان، یان بەرگری کەری نهێنی بەسەر دڵەکانیانەوە. جارێکی تریش شێوەو باری لاری ئەو موناфیقانە روون ئەکاتەوە، هۆی هەڵگەڕانەوەیان لە ئیمانەکەیان نیشان ئەدات، ئەو ئیمانەیان کە بەدەم دەریان ئەبڕی و لە دڵیشەوە خەریک بوون بە تەواوی دامەزرێن لەسەری و ئارام بگرن، ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَـٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ﴾ بێگومان کەسانێك کە پاشەو پاش گەڕانەوە بۆ دواوە – واتە بۆ ئەو کوفرو گومڕایی یەی کە لەسەری بوون – گەڕایشنەوە لە پاش ئەوەی کە حەقیان بۆ دەرکەوت و ڕێگای ڕاستیان بۆ ئاشکرا بوو، ئەو کەسانە شەیتان سەری لیٚ شێواندن و ئەوەی لەبەر چاو شیرین کردن و ئاسانی کرد، بەخەیاڵ پڵاو ئامانج و ئاوات و ئومێدی زۆر فراوانی خستە بەردەمیان لەو ڕێگە چەوتەی کە بە دودا گێڕاندنی یەوە بۆی.

ئینجا هۆی ئەو زاڵ بوونی شەیتانەش بەسەریان دا روون ئەکاتەو، ئەفەرمویٚ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ﴾[1] ئەو زاڵ بوونی شەیتانە بەسەریان دا بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئەیان گوت بەو کەسانەی کە ڕق و کینەیان هەبوو لە قورئان و ئەو ئایینەی خوا هێناویەتە خوارەوە، واتە ئەیان گوت بە جوولەکەکانی مەدینە: گویٚ ڕایەڵیتان ئەکەین لە هەندیٚ کاروفرمان دا، ئەوەیش وەکو نەچوون بۆ غەزاو کۆمەڵ نەکردن لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ).

جوولەکە یەکەم کەس بوو لە ڕق و کینەدا دەربارەی ئەم ئایینەو پێغەمبەر(ﷺ) چونکە بە تەمای ئەوە بوون کە دواترین پێغەمبەر لەوان بێت تاکو ئەو دەسەڵات و پادشایەتی یەی کە هەیان بوو لیٚ یان سەنرابوویەوە دووبارە ببێتەوە، بە چاوەڕوانی یەوە گەلیٚ جار هەڕەشەیان ئەکرد لە بت پەرستەکان کە ئەو پێغەمبەرە لەوان ئەبێت، لەپاشان کە بینیان ئەوا ئەو پێغەمبەرە لەوان نەبوو، ڕق و کینەیان هەڵگرت، بە تایبەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە یەکجار ڕق و کینەیان بەهێز بوو بڵێسەی سەند، کاتیٚ کە زانییان بە شەڕو شۆڕ چاری ناکەن کەوتنە پیلان گێڕی و موئامەرە بە هەموو جۆرو بەو سروشتە لارە پڕ کینەی خۆیانە، هەمووداخ لەدڵ و موناфیقیٚ لکا پیٚ یانەوەو دەستی تێکەڵ کرد لەگەڵیاندا.

---

[1] ئەم ئایەتە بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوە: ١.پێچەوانەی ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە. واتە جولەکەکان وتیان بە موناфیقەکان. ٢.یەکیٚ لەم دوو کۆمەڵە وتیان بە بت پەرستەکان، بەڵام ئەمەی کە لە تەفسیرەکەدایە باشتر ئەچێتە دڵەوە، خوا خۆی باشتر ئەزانیٚ.

وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِسۡرَارَهُمۡ ﴿٢٦﴾ فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٢٨﴾

جا ئەمانەی کە شەیتانْ زال بوو بەسەریان دا تا هەڵیگێڕانەوە لە ئیسلام و بەدبەختی کردن، ئەمانە بوون کە بەڵێنیان دا بەو جوولەکانە لە هەندێ کارو فرماندا کە بریتی بوو لە پیلان گێڕی دەربارەی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) ئەو بەڵێنەیان بەو جوولەکانە بوو بەهۆی زالْ بوونی شەیتان بەسەریان دا تا لەو رووناکی ئیسلامە رایکێشان بۆ تاریکی کوفرو خوایش بەم جۆرەی باقری دەرخستن، هەواڵی دان بە پێغەمبەرو موسڵمانان، هەڕەشەیشی لێ کردن بە چەند هەڕەشەیەکی سەخت و سامناك، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِسۡرَارَهُمۡ﴾[1] خوا ئەزانێ و ئاگای هەیە لە پەنهان و نهێنی کردنیان دەربارەی ئەو هەموو پیلان و قسە ناڕەواکانیان، کەواتە پیلانەکانیان و داشاردنیان بەچی ئەچێت و چ نرخێکیان هەیە کە چواردەور دراون بە زانین و دەسەلاّتی بێ سنووری خوا؟! دیارە ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر سامناکە دەربارەی ئەو پیلان گێڕانە، وەکو دڵخۆش کردن و ئارام پێدانە بە ئیماندارەکان بە جۆرێك هیچ بیم و سام و هیچ نرخێك ناهێڵێتەوە بۆ پیلان گێڕان و پیلانەکانیان.

ئینجا هەڕەشەی سەخت و ئاشکراتریان لێ ئەکات بە سزادانیان لەکاتی گیان کێشان دا لە لایەن مەلائیکەکانەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾ ئینجا ئایا ئەو مونافیقانە چی ئەکەن؟ چ چارەیە بۆ خۆیان فەراهەم ئەهێنن کاتێ کە مەلائیکەکان گیانیان ئەکێشن بە لێدانیان لە دەم و چاوو بەرو پشتیان.

---

[1] ئەم وشەیە بە دوو جۆر ئەخوێنرێتەوە ﴿اسرارهم﴾، ﴿أسرارهم﴾ لەوەی کە ئێستا باوە یەکەمە کە چاوگەو ماناکەی پەنهان کردن و نهێنی کردنی قسەو پیلان گێڕی یەکەیانە بە دژی یەوە فەراهەمیان ئەهێنا، دووەم کۆیە تاکەکەی ﴿سرّ﴾ واتە خوا ئەزانێ و ئاگای هەیە لە نهێنی یەکانیان، بە هەرکام راستەو جوانە.

ئەمانە خۆیانیان زۆر لا خۆشەویست بوو، ئەیانپاراست لە جەنگ و کوشتار لە ڕێگەی خوادا بۆ ئەمەی دووچاری مردن و کوژران نەبن، دەی ئەوا خوای تۆڵەسێنەر مردن و گیان دەرچوونیان نیشان ئەدات بەو شێوە سامناکە دڵ داچڵەکێنەرە، ئەوانە لەو کاتە زۆر تەنگە ناهەموارەدا کە هیچ دەسەڵات و توانایان نی یە، لەو کاتەدا ئەم جیهانە بەجێ ئەهێڵن و ئەڕۆن بۆ جیهانی تر، گیان کێشان بەو هەموو سەختی و سامناکی و ئێش و ئازارەوە کە هەیەتی، سەرباقی ئەوە لەو کاتەدا ئەو مەلائیکانە دەست بکەن بە سزاو لێدانیان لەبەرو لەدواوە - پەنا بەخوا - چی لەوە سەختترە؟ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەو گیان کێشانە بەو جۆرە بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە شوێنی شتێ کەوتوون کە هۆی قارو غەزەبی خوایە، ڕەزامەندی خوایان پێ ناخۆش بوو، بەهۆی ئەوەوە خوایش هەموو کردەوەکانی بەتاڵ کردنەوەو زایەی کردن، واتە ئەوانە خۆیان بوون بەهۆی ئەوەی کە بەسەریان دێت، چونکە شتێکیان ئەکرد کە خوا پێی ناخۆشە هۆی قارو غەزەبی خوایە، هەوڵیان بۆ کردەوەیە نەئەدا کە هۆی ڕەزای خوایە، کەواتە خوایش بەو جۆرەیان لێ ئەکات.

ئەم مونافیقانە کە ئەو هەموو پیلان و تاوانەیان ئەکرد دڵیان بەوە بەستبوو کە ئیماندارەکان پێیان نازانن، بە لێزانی خۆیان کارێکی وایان کردووە وەکو پەندی کوردی ئەڵێ: لە تەڕ ئەخۆن و لە وشك ئەخەون. لەگەڵ ئیماندارەکان دا بەشدارن لە هەموو سوودو قازانجێك دا، بە فڕوفێڵیش خۆیان ئەدزنەوە لە هەموو ناخۆشی یەك کە ڕوویدات لەناو ئیماندارەکان دا، خۆیان ئەکەن بە ئیماندارو لە ژێریشەوە لەگەڵ جوولەکە و هەموو دوژمنەکانی ئیسلام دا بە هەموو جۆر خەریکی پیلان گێڕی و دوژمنایەتی و پڕو پاگەندەن.

﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ ﴿٢٩﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ فَلَعَرَفۡتَهُم بِسِيمَٰهُمۡۚ وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٠﴾

**ئەوانەبەو جۆرە ئەیانویست بژین، ئینجا خوایش ئاوا هەڕەشەی لیٚ کردن کە ئاشکرایان ئەکات لای ئیماندارەکان و باقریان دەرئەخات، ئەفەرمویٚ:** ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ﴾[1] **ئایا ئەوانە کە نەخۆشی لە دلّیان دا هەیە گومانیان وا بردووەو وایان زانیوە ئەو رق و کینەی کە هەیانە دەربارەی ئیسلام و ئیماندارەکان و شاردویانەتەوە لە دلّیان دا، ئایا گومانیان وایە کە خوا ئەو رق و کینە دەرناهێنیٚ و ئاشکرای ناکات؟ واتە گومانەکەیان راست نی یەو خوا کینەو رقەکەیان ئاشکرا ئەکات لە موسلّمانەکان بەهۆی ئەوەوە کە هەوالّیان ئەدات بە پیٚغەمبەر(ﷺ) و ئەفەرمویٚ بە پیٚغەمبەر(ﷺ):** ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ فَلَعَرَفۡتَهُم بِسِيمَٰهُمۡ﴾ **ئەگەر ئیٚمە بمانەویٚ ئەوانەت نیشان ئەدەین و ئایانناسیٚنین پیٚت بە چەند نیشانەو دروشمیٚك، ئینجا بیٚگومان ئەو کاتە تۆش ئەتناسین بەهۆی ئەو شیٚوەو نیشانانەیانەوە.**

**ئەم ئایەتە پیٚش ئەوەبوو کە خوا چەند کەسیٚك لەوانەی ئاشکرا کرد لە پیٚغەمبەر(ﷺ) بەخۆیان و ناوەکانیانەوە، لەگەلّ ئەوەدا کە لەو کاتەدا خوای گەورە بەو جۆرە ئاشکرای نەکردبوون، بەلاّم بە شیٚوەی قسە کردنیان دا هەر دەرئەکەوتن بۆ پیٚغەمبەر(ﷺ) وەکو ئەفەرمویٚ:** ﴿وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ﴾ **سویٚند بەخوا تۆ ئەو مونافیقانە ئەناسی و بۆت دەرئەکەون لە شیٚوەو گفتوگۆی لارو پیٚچیان دا، واتە هەر بە قسە کردن ئەیانناسی چونکە شیٚوەی قسەیان جیاوازە بە توانج و لاری یەوە ئەیکەن و نا راستی لیٚ وەرئەگیریٚ،** ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾ **خوا ئەزانیٚ و ئاگای هەیە لە هەموو کردەوەکانتان بە گویٚرەی نیازی خۆتان رەفتارتان لەگەلّ ئەکات، چونکە هەموو کردەوەیەك بە گویٚرەی نیازی خاوەنەکەیەتی.**

---

[1] وشەی ﴿أم﴾ لیٚرەدا منقطعیە وەکو چەند جاریٚ وتمان بە مانا ﴿بل﴾ و ﴿أ﴾ ی پرسیارە، وشەی ﴿بل﴾ لیٚرەدا وەکو لە چەند شویٚنیٚکی تردا گوترا بۆ کۆتایی هیٚنان و برانەوەی مەبەستەکەی پیٚشووەو دەست کردنە بە مەبەستیٚکی ترو پرسیارەکە بۆ ئینکارو بیٚزاری یە.

وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ (٣١) إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ (٣٢)

**ئینجا رووی فەرموودە ئەکاتە هەموو ئوممەت بەڵێن و هەواڵیان ئەداتێ بەمەی کە تاقییان ئەکاتەوە تا ڕاست و ناڕاست ئاشکرا ببێ، ئەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ﴾ سوێند بەخوا تاقیتان ئەکەینەوە، بە داوا لێ کردن و فەرمان پێدان بە شتی قورس و گران تا بزانین جیای بکەینەوە تێکۆشەرەکانتان و ئەوانەتان کە بە ئارامن و خۆگرو لەسەر کارو فەرمانی قورس و زەحمەت، سوێند بەخوا هەواڵ و دەنگ و باسەکانتان تاقی ئەکەینەوە، هەواڵ و دەنگ و باسی کردەوەکانتان تا چاك و خراپتان روون ببێتەوە، یان هەواڵەکانی خۆتان کە ئەڵێن ئیمانداریین و ڕاست ئەکەین لەگەڵ خواو پێغەمبەردا(ﷺ) تا دەرکەوێ ڕاست و درۆتان، واتە روونی ئەکەینەوە کام کردەوەی باشەو کام خراپەو کام ڕاست ئەکات و کام درۆ ئەکات. لێرەدا جێگای دوو پرسیار هەیە:**

**١- بێگومان خوا ئاگای لە هەموو شتە، هەموو کردەوەو خاوەن کردەوەیە ئەناسێ، ئەزانێ کێ خراپە و کێ چاکە، کەواتە ئەو تاقی کردنەوە لەبەر چییە؟ چۆن بۆ خوا بەکار ئەهێنرێ؟ بەڵێ خوای گەورە هەموو کەس ئەناسێ و ئەزانێ ئامادەیی بۆچی هەیە، بەڵام بە ڕەحم و بەزەیی خۆی بڕیاری نەدا کە بە پێی زانینی خۆی ڕەفتار بکات لەگەڵ بەندەکانیدا، بەڵکو بڕیاری دا کاتێ تۆڵە بسێنێ و پاداشت بداتەوە کە ئەوەی خۆی ئەیزانێ بەدی بێت لە لایەن بەندەکانی یەوە، دیارە ئەوەیش بە تاقی کردنەوە نەبێت نابێت. کەواتە تاقی کردنەوە بە خۆشی و ناخۆشی، تەنگاوەو کامەرانی، داوا لێ کردن و قەدەغە کردن، ئەمانە هەموو ئەوەی پێ ئاشکرا ئەبێت و بەدی دێت کە خوا زانیویەتی و ئەیزانێ، بە تاقی کردنەوە دەمی هەموو کەس ئەبەسترێ، ڕێگای هیچ پەڵپ و پرسیارێك نامێنێ، مەبەست لە تاقی کردنەوەکە پێزانینی خەڵکە نەك خوا.**

٢- ئایا کە خوا هەموو شت ئەزانێ، هەر زانیوییەتی، کەواتە مەبەست بەم زانینە چی یە کە بۆخۆی بڕیار ئەدات لەپاش تاقی کردنەوە؟ بێگومان خوا ئاگای لە هەموو شت هەیە لە پێش بوون و ڕوودانیدا وەکو پاش پەیدا بوون و ڕوودانی بێ گۆڕان و جیاوازی لە زانینەکەی دا، بەڵام لە پێش پەیدا بوون و ڕوودانەکەدا بە جۆرێ ئەیزانێ کە شتەکە هەیەو خەڵکیش ئەیزانن، کەواتە ئەوەی کە ئەگۆڕێ پەیوەندی زانینەکەی خوایە لەگەڵ بوون و نەبوونی زنراوەکەدا، نەك زانینی خوا، ئەو ناگۆڕێ و وەکو خۆیەتی. پێویستە ئیماندار بترسێ لە هەندێ تاقی کردنەوەو داوای ڕەحم و لێ بوردن بکات لەخوا وەکو فضیلی کوڕی عیاض ئەفەرموێ: ﴿اللهم لا تبلنا فإنك إن بلوتنا فضحتنا و هتكت استارنا و عذبتنا﴾ [1] ئینجا لەدوا دوایی سورەتەکەوە ئەدوێ لە کۆمەڵی کافران و ئیمانداران هەریەکە لە ڕوویەکەوە، دەربارەی کافران ئەدوێ لەم ڕووەوە کە هەرچەند هەوڵ و تێکۆشان بکەن لە دوژمنایەتی دا، هەرچەند هێزو دەسەڵاتیان هەبێ هیچ نرخیان نی یەو ناتوانن بەرگری ئایینی خوا و ئیماندارەکان بکەن، خوا هەموو پیلانەکانیان بەتاڵ ئەکاتەوە. لە ئیماندارەکان ئەدوێ لەو ڕووەوە کە بانگیان ئەکات بۆ بەردەوامییان لەسەر تێکۆشان و فیداکاری بە گیان و ماڵ بێ تەفرەو سستی و لاوازی، بێگومان دان بە خزمایەتی و دۆستایەتی و لە دەست دەرچوونی هەموو بەرژەوەندی یە وەکو – بە یارمەتی خوا – بەدرێژیی دێتە پێشەوە.

لەیەکەم جارەوە لە کافرەکان دەست پێ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـًٔا وَسَيُحۡبِطُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ [2] بێگومان ئەوانەی کە

---

[1] واتە: خوا تاقیمان مەکەرەوە، چونکە ئەگەر تاقیمان بکەیتەوە و ئابڕوومان ئەبەیت و نهێنی یەکانمان دەرئەخەیت و ئەزابمان ئەدەیت.

[2] ئایا مەبەست بەمانە بت پەرستەکانە کە لە یەکەم جاری سورەتەکەدا باس کران، یان مەبەست پێی هەرکەسێکە کە ئەو سیفەتانەیان بووبێ بە شێوەی گشتی، یان جوولەکەکانی مەدینە بێت لەو کاتەدا، هەموو هەر ئەگونجێ وزانینی ڕاست هەر لای خوایە.

کافرن و بەرگری خەڵکیان کردووە لە ئایینی ڕۆیشتن بە ڕێگای خواداو دژو پێچەوانەی پێغەمبەر(ﷺ) وەستاون، کە ئەم کردەوە ناڕەوایانەیشیان هەیە لەپاش ئەمەی کە ڕێگای ڕاستی خوایان بۆ دەرکەوت و بەباشی حەقیان بۆ ڕوون بووەوە، واتە ئەمە ئەوپەڕی خراپەیە کە بە زانینەوە تاوان و سەرکەشی یەکەیان ئەکەن، دژو پێچەوانەی ئایینی خواو پێغەمبەر(ﷺ) وەستاون.

ئەو کافرانەی هەرگیز زیان بە ئایینی خوا ناگەیەنن، توانای ئەوەیان نی یە هیچ گرێ و قۆرتێك بێننە ڕێگای بڵاو بوونەوەی، هەرچەندە زۆر توانایان هەبێ، هەرچەندە توانای سزادانی ئیماندارەکانیان بووبێ ئەوە شتێکی کاتی بووە بە گوێرەی فەرمانی خوا ڕوویداوە لەبەر چەند حیکمەت و بەرژەوەندی یەك، پاشەڕۆژو سەرکەوتن هەر بۆ کۆمەڵی ئایینی خوا بووە، ڕیسوایی و بەرباد بوون بۆ دوژمنانی ئایینی خواو پێغەمبەرانە –سەلامیان لێ بێت–، خوایش هەموو کردەوەکانیان بەتاڵ ئەکاتەوە لەمەوپاش، کردەوەی پیلان گێڕیان، بەم جۆرە هەموو فێڵ و کەڵەکەکانیان ئەروخێنێ، هەر کردەوەی چاکیشیان بووبێ لەدنیادا پاداشتیان ناداتەوە بە هۆی کوفرو بەربەرەکانێکانیانەوە.

ئەوە بڕیارێکی تەواوە لە لایەن خواوەو بەڵێنێکی ڕێك و ڕاستە بەمەی کە ئەوانەی بەرامبەری ئایینی خوا وەستاون و ئەوەستن لە چەرخی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەتا بێت دژو پێچەوانەی ئەوەستن بۆ بەرگری کردنی، ئەوانە هەرچەند هێزو دەسەڵات و توانایان هەبێ ناتوانن زیان بگەیەنن و ئەو بەرگریی یەیان پێ ناکرێ.

دیارە مەبەست ئەمە نی یە کە ئایینەکە لەخۆیەوە بڵاو ئەبێتەوە، بەڵکو بە مەرجێ کافرەکان زیان ناگەیەنن و بەرگری یان پێ ناکرێ کە کۆمەڵی ئیماندار هەبێ و بە ڕێکی هەڵسێ بە کارو فەرمانی خۆی یەك بارو یەك دڵ بکات لەبەر خواو بە گوێرەی فەرمان و بەرنامەی خوا بە وێنەی یەکەم کۆمەڵی ئەم ئوممەتە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾

**پاش ئەمەی ئەو پاشەڕۆژە سامناکەی باس کرد دەربارەی ئەو کافرانە، ئینجا رووی فەرمایش ئەکاتە ئیماندارەکان و ئەیانترسێنێ لەو پاشەڕۆژە خراپەو تەمێ یان ئەکات بە گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ **ئەی ئیماندارەکان گوێ رایەڵی خوا بکەن و گوێ رایەڵی پێغەمبەر بکەن، کردەوە چاکەکانتان بەتاڵ مەکەنەوە بەو شتانەی کە ئەبێتە هۆی ئەوە، وەکو کوفر – چ ئاشکرا بێ و چ پەنهانی – وەکو ریباو منەتو کەشخە کردن بەسەر خەڵك دا واتە خۆتان بە وێنەی کافرەکان لێ مەکەن، ئەو خورەوشتی ئەوانە مەگرن.**

**لەم فەرمودەدا وا دەرئەکەوێ کە لەناو کۆمەڵی ئیماندارەکان دا چەند کەسێ وا بووە کە بە تەواوی نەگەڕاون بە شوێن گوێ رایەڵی دا، یان هەندێ شت لەسەر شانیان قورس بووە، یان هەندێ فیداکارییان بەلاوە زەحمەت بووە، بەهۆی ئەوەوە چەند تائیفەیەکی بەهێزی جیاجیا بەرەنگاری ئیسلام وەستا بوون، لەهەموو لایەکەوە دەمیان لێ داچەقاندبوون ئەیانویست بە جارێ هەڵیان لووشن، زیاد لەوە چەند پەیوەندی یەك هەبوو لە نێوان ئەمان و ئەو کافرانەدا، ئەو پەیوەندی یانە بە ئاسانی لە ریشە نەئەهێنران. بێگومان ئەم تەمێ یە کاریگەر بوو لەدڵ و دەروونی ئیماندارە راستەکان دا، دڵ و دەروونیان هاتە لەرزەو ترس و بیمیان لێ نیشت کە شتێکیان لێوە روو بدات ببێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەو سڕینەوەی چاکەکانیان، پێشەوا(ئەبو نەسری مەروزی) لە(کتاب الصلاة) دا ئەفەرموێ:(ئەبو قودامە) لە(وەکیع) ەوە ئەویش لە(ئەبو جەعفەری رازی) یەوە ئەویش لە(رەبیعی کوڕی ئەنەس) ەوە ئەویش لە(ئەبو العالیە) ەوە ئەفەرموێ: یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لایان وابوو کە هیچ گوناهێك زیان ناگەیەنێ بەو کەسەی کە خوا ئەپەرستێ بە تاك و تەنیا وەکو هیچ کردەوەیەکی چاك نرخ و سوودی نی یە لەگەڵ بت پەرستی دا هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئیتر پاش ئەوە ئەترسان لەوەی کە گوناه کردەوەکانیان بەتاڵ بکاتەوە.**

**لە(عبدالله ی کوڕی موبارەك) ەوە ئەویش لە(ئەبوبەکری کوڕی مەعروف) ەوە ئەویش لە(موقاتیلی کوڕی حەببان) ئەوە ئەویش لە(نافیع) ەوە ئەویش لە(ئیبن وعومەر) ەوە – خوا**

له هەموویان رازی بێت – لامان وابوو کە هەموو چاکەیەك وەرنەگیرێ لە موسڵمانان هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئینجا وتمان ئەبێ ئەو شتەی چاکەکان بەتاڵ ئەکاتەوە بریتی بێت لە گوناهە گەورەکان و گوناهە زۆر ناشیرینەکان، هەتا ئایەتی سورەتی ﴿النساء﴾ هاتە خوارەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ [1] ئینجا کۆتاییمان هێنا لە قسە کردن لەو بابەتەوە بەڵام مەترسیمان نەکرد لەو کەسانەی کە دووچاری ئەو گوناهە گەورانە بێت، ئومێدمان هەبووبەلێبوردن وچاوپۆشی خوالەوکەسەی کەدووچاری ئەوگوناهانەنەبێت.

لەم فەرمودانەوە روون ئەبێتەوە کە موسڵمانەکان بە چ جۆر ئایەتەکانی قورئانیان وەرئەگرت، تا چ رادەیەك کاری لێ ئەکردن و چۆن ئەترسان لە جولاّنەوە بە پێچەوانەی قورئان، چەند هەوڵ و تێکۆشانیان ئەکرد بۆ ئەمەی کە بە گوێرەی بەرنامەی ئەو بجولێنەوەو رەفتار بکەن. بەو هەستە رێك و راستە موسڵمانان ئەژیان لەگەڵ قورئان دا، موسڵمانی راستەقینە ئەبێ هەروا بێت، ئەو جۆرە موسڵمانانە خوای لەگەڵ دایەو یارمەتی ئەدات، رۆیشتن بە رێگە راستەکەی خوادا تەنها بەو جۆرە ئەبێت، ئینجا پاشەرۆژی بەدبەختی ئەوانە باس ئەکات کە دژی پێغەمبەر بوون(ﷺ) لە کاتی خۆی دا، نەگەڕانەوە تا لەسەر ئەو بارە مردن، هەروەها هەرکەس دژی ئایینەکەی بێت لەپاش خۆی بێ گەڕانەوە تا مردن ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾ بێگومان کەسانێك کە کافر بوون و بەرگری خەڵکیان ئەکرد لە ئایینی خوا دوای ئەوە ناگەڕێنەوە تا بە کافری ئەمرن، ئەوانە هەرگیز خوا لێ یان نابوورێ و تاوان و گوناهیان ناسڕێتەوە – خوا پەنامان بدات – ئیتر ئەوانە بێ بەش ئەبن لە رەحم و بەزەیی خواو لە عەزابی بەتینی نەبڕاوەدا ئەبن هەتا هەتایە. کەواتە ماوەی ژیانی ئەم جیهانە هەلێکە خوا هەڵیخستووە، قاپیی تۆبەو گەڕانەوە کراوەتەوەو خراوەتە سەر پشت هەتا کاتی غەوغەرەو نائومێدی لە ژیان، ئیتر دوای ئەوە نەگەڕانەوە وەرئەگیرێ و نە لێ بوردن هەیە.

---

[1] بێگومان خوا خۆش نابێت لەوەی کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێ و لەوە بگەڕێتەوە ئەبوورێ لە هەرکەسێ کە خوا خۆی بیەوێ.

فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ

---

ئەم ئایەتە وەکو هەڕەشەیە لە کافرەکان بۆ ئەمەی فریای خۆیان بکەون تا کات و هەلیان لە دەست دەرنەچووە، هەروەها ترساندنە بۆ ئیماندارەکان و ئاگادارکردنەوەیان بۆ ئەمەی خۆیان بپارێزن لەو شتانەی کە نزیکیان بخاتەوە لەو ڕێگە سامناکەی کە کافرەکان داویانەتە بەر، وەکو لەم فەرموودەیەوە روون ئەبێتەوە کە دەربارەی ئیماندارەکان ئەیفەرمویْ: ﴿فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾ کەواتە ئیماندارەکان سست و لاوازو زەعیف مەبن و داوا مەکەن و مەیل مەکەن – بە سەر شۆڕی – بۆلای ئاشتی و کۆتایی هێنان لە جەنگ لەگەڵ ئەو کافرانەدا کە باس کران، ئێوە – ئەگەر موسڵمانی راستەقینە بن – زاڵترو بڵند ترن و خوا لەگەڵتانە هەرگیز کردەوەکانتان زایە ناکات و جیا ناکاتەوە لێتان و پاداشتی کەم ناکاتەوە.

ئەم ترساندن و ئاگادار کردنەوەی ئیماندارانە وا پیشان ئەدات کە لەناو کۆمەڵەکەیان دا چەند کەس بووە کە ئەرك و زەحمەتی جەنگ و تێکۆشان زۆر بەتین و قورس بووە لەدڵ و دەروونیان دا، بەهۆی ئەوەوە سستی رووی تیْ کردوون و ئارەزووی ئاشتی و حەوانەوەیان بووە، یان وەکو وتمان لەمەوپێش خزمایەتی و چەند بەرژەوەندی یەك هەبووە رایکێشاون بۆ ئارەزووی ئاشتی لەبەر ئەوە قورئان بەو جۆرە تەمێی کردن کە هەر لە دەستی قورئان دێت، لە پێشەوە پاشەرۆژی سەختی کافرەکانی خستە پێش چاو بۆ ئەوەی ترس و سام دڵیان داگریْ، بە هەموو جۆر دوورکەونەوە لەو ڕێگای کە سەری لەو پاشەرۆژەوە دەرئەچێت، ئینجا دڵی بەهێزکردن بەمەی کە ئەوان بەرزو بڵندو زاڵترن، خوایان لەگەڵە، ئینجا دڵخۆشی دانەوە بە ئەجرو پاداشتی تەواوی بیْ کەم و کوڕی.

بەڕاستی خاوەن ئیمانی راستەقینە ماف خۆیەتی بەم جۆرە فەرمودانە بگاتە ئەوپەڕی پلەی شادمانی و کامەرانی و بەختیاری، ئەبیْ لە هەموو کات دا شانازی بکات بە ئیمانەکەیەوە، تەنها ئەو بەسەرمایە دانیْ بۆ خۆی. هەتا بیر بکەینەوە لەم فەرمودەیە کەمە،

ئایا چ پلەو رادەیەك ئەگاتە ئەمە كە خوا بفەرمویٚ: ئێوە بڵند ترینن، خواتان لەگەڵە، هەموو كردەوەو تێكۆشان و فیداكاری یەكتان وەرئەگیریٚ هیچی لیٚ زایە نابیٚ و كەم و كوڕی لە پاداشتتان دا نابێت؟!

ئیماندارانی راستەقینە ئیتر چی یان ئەوێت؟ ئەوان بەرزترو بڵند ترن لە بابەت بیروباوەڕو تێگەیشتن لە ئادەمی و ژیان و بوونەوەر، لە بابەت پەیوەندی یانەوە بە پەروەردگاریانەوە كە هەر ئەوە بەرزترین و بڵندترینی هەموو شتە، هەروەها ئیماندارانی راستەقینە بەرزترو بڵند ترن لە بابەت هەست و خووڕەوشتەوە.

ئەوانە بەرزو بڵندترن لەبابەت رێزو هێزو یارمەتی یەوە چونكە هێزو دەسەلآتی بیٚ سنووری خوایان لەگەڵ دایە، كەواتە بۆچی سستی روویان تیٚ بكات و داوای ئاشتی بكەن بە سەرشۆڕی؟!!

زۆر جار لەدەست چوونی ماڵ و سامان ئەبێتە هۆی ئەو سستی و سەرشۆڕی یە، ئەوا بیٚ نرخی ماڵ و سامانی ئەم ژیانی دنیاشیان ئەخاتە پێش چاو لەگەڵ پاداشتی تەواوی رۆژی دوایی لەسەر ئەوبەشە كەمەی كە ئەیدەن لە رێگای خوادا لەو ماڵ و سامانە زۆرەی كە خوا پیٚ ی داون، ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ ژیانی ئەم جیهانە – جگە لەوەی كە بۆ خوا بێت – هیچی تر نی یە جگە لە(لەهو لەعب) وەكو گاڵتەو گەپی مندالآن!! بێگومان ژیانی ئەم جیهانە وەكو گاڵتەی مندالآن وایە كاتیٚ ئامانجێكی گرنگ و بەرێزی لەگەڵ دا نەبێت، ئەویش كاتیٚ بەو جۆرەیە كە مەبەست هەر رابواردن بێت جیاواز لەو بەرنامەی كە خوا بۆی داناوە، ئەو بەرنامەیەی كە ئەم جیهانەی كردووە بە جێگای كشتوكاڵی رۆژی دوایی و بەڕێوەبردنی كاروباری ئەم جیهانە بە گوێرەی ئەو بەرنامەی خوای كردووە بەهۆی دەست كەوتنی نازو رێزی نەبڕاوەی ئەو جیهان وەكو لەم فەرمودەیشەوە وەرئەگیریٚ: ﴿وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ﴾ ئەگەر ئیمان ئەهێنن و لەخوا ئەترسن و خۆتان ئەپارێزن لەهۆی غەزەب و قاری خوا، خوا پاداشتی ئیمان و كردەوە چاكەكانتان ئەداتەوە، بێگومان ئەو كاتە خەریك بوونی ئەم جیهانەیش بە گوێرەی بەرنامەی خوا بەشێكە لە كردەوە چاكەكان. كەواتە ئیمان و لەخواترسان ژیانی ئەم جیهانە لە گەمەو گاڵتە دەرئەكا، رادەی بەرز ئەكاتەوەو ئەیكات بەهۆی دەست كەوتنی رۆژی دوایی و پاداشتە بیٚ وێنەو نەبڕاوەكانی ئیسلام.

وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَـٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَـٰلَكُم ﴿٣٨﴾

---

﴿لَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ﴾ خوای گەورە خاوەن حیکمەت و بەزەیی و ئاگادار بە سروشتی بەندەکانی و ئەوەی کە داوای کردووە لە بەندەکانی و ئەو ئەرکەی خستوویەتی یە سەرشانیان لە رادەی توانادایە، ئەگەر بە رەحم و بەزەیی خۆی وای نەکردایە گەلیٚ لە بەندەکانی سەرپێچیان ئەکرد، بەهۆی ئەوەوە تیادا ئەچوون. بە وێنە ئەوەتا داوای هەموو ماڵەکانیان لیٚ ناکات، چونکە ئەو کاتە زۆر کەس ملە جەڕەی ئەکردو گویٚ رایەڵ نەئەبوو، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَـٰنَكُمْ﴾ ئەگەر خوا داوای هەموو ماڵەکانتان لیٚ بکات، ئینجا تەنگەتاوتان بکات بەو داوا کردنە، ئێوە چروکی بەکار ئەهێنن و نایدەن، ئەو کینەو رقەبەرییەی کە ئەتان بێت دەربارەی ئیسلام ئاشکرای ئەکات، واتە خۆتان پیٚ نەئەگیرا، ئەو کاتە رق و کینەتان دەرئەبڕی، هەر لەدڵ و دەروون دا پێچی نەئەخوارد.

ئینجا ئەو بارەی کە هەیانە دەربارەی بەخت کردنی ماڵ لە رێگای خوادا ئەیدات بە ناوچاویان دا، بە شێوەی قورئانی بیٚ وێنە تەمیٚ یان ئەکات، ئەفەرمویٚ: ﴿هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ﴾ ئێوە ها ئەوانە بانگ ئەکرێن و داواتان لیٚ ئەکریٚ بەمەی کە ماڵ و سامان بەخت بکەن لە رێگەی خوادا، ئینجا هینی واتان هەیە کە چرووکی ئەکات و گویٚ رایەڵی ناکات، ﴿وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ﴾ هەرکەسیٚ چرووکی بکات ئەو کەسە چرووکی دەربارەی خۆی ئەکات، لە نەفسی خۆی ئەگرێتەوەو زیان بە خۆی ئەگەیەنیٚ، چونکە هەرچی بدات لەرێگای خوادا هەمووی ئەکریٚ بە زەخیرەو توێشوو، بۆی ئامادە ئەکرێت پیٚی ئەدریٚ لە رۆژێك دا کە پیٚ ئەگیریٚ و پێویستی پیٚی هەیە، رۆژیٚ کە رووت و قوتە و هیچی نی یەو هیچ سوودی پیٚ ناگەیەنیٚ جگە لەوەی کە لەم جیهانەدا

کردوویەتی بە توێشوو زەخیرە بۆ ئەو ڕۆژە. خوا هیچ پێویستی نی یە، ئێمە بێ نەواو پێویستمان هەیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ﴾ تەنها خوا بێ پێویستە لە هەوو شتێك، هەر ئێوە بێ نەواو فەقیرو خاوەن پێویستن. بێگومان بەندەکانی خوا هەرچی یان هەیە خوا پێ‌ی داون، خوا پێویستی نی یە نە بە بەندەکانی نە بەو شتانەی پێ‌یان ئەدات و نە بەو شتانەی کە ئەیکات بە زەخیرەیان بۆ ڕۆژی دوایی، بەندەکانی پێویستیان بەو هەیە لە هەردوو جیهان دا، کەواتە ئیتر چرووکی و دەست گرتنەوە بۆچی؟! لەبەر چی؟ لەپاش ئەم تەمێ و ئامۆژگاری یە شیرینانە هەڕەشەیەکی زۆر سامناك ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم﴾ ئەگەر ئێوە ئیمانی ڕاستەقینە ئەهێنن و خۆتان ئەپارێزن لە غەزەبی خوا بە گوێڕایەڵی، ئەوە خوا پاداشتی ئەو ئیمان و لە خواترسی یەتان ئەداتەوە، ئەگەر سەرکەشی ئەکەن و پشت ئەکەنە ئیمان و گوێ ڕایەڵی، ئەوە لە باتی ئێوەدا گەل و کۆمەڵێکی تر جگە لە ئێوە ئەهێنێ لە شوێنی ئێوە، ئینجا ئەوانە وێنەی ئێوە نابن، واتە ئێوە بەرباد ئەکات و کۆمەڵێکی چاك ئەخاتە شوێنی ئێوە گوێڕایەڵ ئەبن و سەرپێچی ناکەن. بێگومان ئەو کەسانە کە خوا پەیانکات بە هەڵگری ئاڵای ئایینی خۆی بە تایبەتی هەڵگرانی ئاڵای ئەم ئایینە بە ڕێك و ڕاستی وەکو یەکەم چین ئەو کەسانە بەختەوەرترینی هەموو بەندەکانی خوان، چاکەی خوا بەسەر ئەوانەوە لە هەموو چاکەیەك گەورەترە، بەنرخترین بەخششی پێداون، کەواتە هەرکەس شادمان نەبوو بەو چاکەو شانازی نەئەکرد بەو بەخششەوە، قەدرو ڕێزی ئەو نیعمەتە گەورەی لا نەبوو بەڕاستی ماق خۆیەتی کە ئەو بەخشش و چاکەیەی لێ بسێنرێتەوەو ئەو خەڵاتەی بدرێ بە یەکێکی تر کە قەدرو ڕێزی بزانێ و بەلایەوە بێت.

بەڕاستی هەڕەشەیەکی ئێجگار سامناکەو ترساندنێکی زۆر بەتین و بەهێزە، زۆر کاریگەر بوو لەدڵی یارەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) خوا بە ڕەحم و بەزەیی خۆی دڵ و دەروون و هەستمان برازێنێتەوە بە وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاری یەکانی قورئان و سەر لە نوێ چین و گەلێکی قورئانیمان بۆ فەراهەم بێنێ، آمین.

## سورەتی(الفتح)
## مەدینەیی یەو ٢٩ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە لەساڵی شەشەمی کۆچیدا هاتە خوارەوە پاش پەیمانی حودەیبیە، بە بۆنەی ئەم رووداوەوە هاتە خوارەوە، لەبەر ئەوە جوان وایە پێشەکی ئەو رووداوە باس بکەین بۆ ئەمەی تێ بگەین لەو بارو دۆخەی کە ئەو موسڵمانانەی تێدا ژیان کاتی ئەو رووداوەو هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە.

لەپاش کۆچ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە بت پەرستەکان بەرگری موسڵمانەکانیان کرد لە ئامۆشۆکردنی مەککە، تەنانەت لەو چوار مانگەیش دا کە شەڕو ئاژاوەی تیادا قەدەغە بوو، بە تایبەتی بەرگری لە هاتوچۆی کەعبە بە تاوانێکی زۆر گەورە سەیر ئەکرا. لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە کەللە رەق و دڵ رەق بوون رەوای ئەو تاوانە گەورەیان ئەدا.

لەو سەردەمەدا پێغەمبەر(ﷺ) لەخەودا پێ ی نیشان دراو خۆی و موسڵمانەکانی بینی کە چوونە کەعبە، بە جۆرێك کە هەندێك مووی سەری کورت کردووەتەوەو هەندێ تاشیویەتی، کە ئەویش نیشانەی لێ بوونەوەیە لە تەواف و زیارەتی کەعبە، ئەو خەوەی گێڕایەوە بۆ موسڵمانەکان و ئەوانیش مژدە بەخش بوون و خۆشییان تێکەوت.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا کە بچێ بۆ مەککە بە نیازی بەجێ هێنانی عەمرە، بێ نیازی شەڕو ئاژاوە، داوای کرد لە عەرەبەکانی لادێ ی چواردەوری مەدینە بێ ئەوەی بە کۆمەڵ بچن نەوەك قورەیش جەنگیان لەگەڵ بکەن، یان بەرگری یان بکەن لە زیارەتی کەعبە.

زۆر لە عەرەبەکانی لادێ نەهاتن، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئیحرامی پۆشاو هەندێ حوشتریان لەگەڵ خۆیان دا برد کە پێ ی ئەگوترێ: ﴿هدي﴾ و لە مەککە سەر ئەبڕرێن، ئەدرێن لە رێگای خوادا، لەبەر ئەوەی بزانن کە بەنیازی شەڕو شۆر نەهاتوون، لە مانگی(ذی القعدة) دا لە مەدینە دەرچوو لەگەڵ کۆچکەرو پشتیوان و ئەو عەرەبانەدا کە لە لادێکانەوە هاتبوون کە هەموو نزیکەی ١٤٠٠ کەس ئەبوو، رۆیشتن هەتا گەیشتنە(عوسفان)[1] لەوێدا(بەشیری کوڕی سوفیلی کوڕی کەعب) یان پێگەیشت، وتی ئەی پێغەمبەری خوا قورەیش زانیویانە بە هاتنەکەت، ئەوەتا بە بە خاو خێزانەوە هاتوون بۆ بەرەنگاریتان، لە(ذي

---

[1] شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا، دوو قۆناغی ئەمێنێ بۆ مەککە.

طول) خستوویانه، هەموو پێستی پڵنگیان پۆشیوە، سوێندیان خواردووەو پەیمانیان داوە کە بەسەریان دا تێناپەڕێ بۆ مەککە هەرگیز، خالیدی کوڕی وەلیدیان کردووە بە سەرکردەی سوارەکانیان و پێشڕەو ناردوویانە بۆ(کراع الغمیم)[1] لەوێدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی ئەی هاوار بۆ قورەیش شەڕو کوشتارو خواردوونی، واتە بۆچی کۆتایی ناهێنن؟! ئایا چ زیانێکیان ئەکرد ئەگەر لێم گەڕانایە بۆ عەرەبەکانی تر؟؟ ئەگەر من لەناو بەرن ئەوە شتێکە ئەوان ئەیانەوێ، ئەگەر خوا سەریشم بخات بەسەریان دا ئەوا موسڵمان بوونایە لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان دا بە فراوانی توانایەکیان ئەبوو، ئایا گومانیان چۆنە؟ واتە گومانیان وایەکەمن لەم کاری خۆمەدەست هەڵئەگرم؟ سوێند بەخوا بێ کۆتایی تێکۆشان ئەکەم لەسەر ئەم ئایینەی کە پێ‌ی رەوانە کراوم هەتا خوا سەرم ئەخات، یان لە پێناوی دا ئەکوژرێم.

ئینجا فەرموی: ئایا پیاوێکی شارەزا هەیە لەگەڵمان بێت لە رێگایەکی ترەوە جگە لە رێگای قورەیش؟ پیاوێکی تائیفەی ئەسلەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دێم، لەگەڵی دا کەوتنە رێ، بردنی بەڕێگایەکی وشکی زۆر بەرداویدا، بەناو چەند شیوو دۆڵێك دا دووچاری زەحمەتی زۆر بوون، کاتێ کە لێ ی دەرچوون و گەیشتنە زەوی یەکی سەخت و نەرمان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هەموو بڵێن داوای لێ بوردن و سڕینەوەی گوناه ئەکەین لە خواو تۆبە ئەکەینە لای، ئەوانیش بە جارێ چوون بە شوێن فەرمودەکەی دا، لە پاشان فەرموی: سوێندبەخوا ئەمەی ئێوە وتتان ئەوە بووکەداواکرالەنەوەکانی ئیسرائیل بیڵێن و نەیان وت[2].

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بە دەستە راست دا بڕۆن بەناو(حمض) دا [3] لەسەر رێگەی (ثنیة المراد) لای(حودەیبیە) لە خوارووی مەککەوە بە قۆناغێ، لەشکرەکە ئەو رێگایەی دایە بەر، سوارەکانی قورەیش تەپوتۆزی لەشکری موسڵمانەکانیان بینی، بۆیان دەرکەوت کە لە رێگای ئەوانەوە نەهاتن، بەغار گەڕانەوە بۆلای قورەیش، پێغەمبەر(ﷺ) نەوەستا، هەتا رۆیشت بە(ثنیة المراد) دا لەوێدا حوشترەکەی ئەژنۆی داداو خۆی خست، ئینجا خەڵکیش وتیان: حوشترەکەی مانی گرتووە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: نەخێر مانی نەگرتووە، هیچ کات ئەو خوەی نەبووە، بەڵام ئەو کەسەی کە کاتی خۆی فیلەکەی ئەبرەهەی بەرگری کرد هەر ئەو کەسەیە بەرگری ئەمیشی کردووە لە رۆیشتن، واتە خوا بەندی کردووە لە چوون بۆ

---

[1] خانوویەکە لە پێشەوەی عوسفانەوە هەشت میل لێ ی دوورە.

[2] مەبەست ئەوە بوو کە قورئان ئەفەرموێ: ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُولُواْ حِطَّةٞ﴾.

[3] ناوی شوێنێکە بە دەوروبەری مەککەدا.

مەککە، فەرموی: سوێند بە کەسێ کە گیانی منی بەدەستە قورەیش هەر پەڵپ و داوایەکم لێ بکەن کە ڕێزی قەدەغەو سنووری خوای تیادا بێت بۆیان جێ بەجێ ئەکەم، ئینجا بە لەشکرەکەی فەرموو لێرەدا بخەن، عەرزی کرا لەم شوێنەدا ئاو نی یە تا لەسەری ببەزین، ئینجا ئەویش تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێناو دای بە یەکێ لە یارەکانی کە بیبا لە جێگەی چاڵاوێك دا دایچەقێنێ، ئەویش دایچەقاند و ئاو هەڵقولا. پاش خستن و ئارام گرتن(بودەیلی کوڕی ورقای خوزاعەیی) لەگەڵ چەند کەسێکی تردا هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ کرا ئایا بەهۆی چی یەوە هاتووە؟ ئەمیش فەرموی: کە بۆ هیچ شەڕو جەنگێ نەهاتووم، بۆ زیارەتی(بیت) هاتووم بەجۆرێ ڕێزو قەدری ڕاگیر کەم. ئەو سکاڵای کە لەمەوپێش باسمان کرد کە فەرموی بە بەشیری کوڕی سوفیان بەمیشی فەرمو، ئەوانیش گەڕانەوە بۆلای قورەیش، بەوجۆرەهەواڵیان پێدان، ئەوانیش وتیان بابۆشەڕیش نەهاتبن سوێندبەخوانابێ بە زۆر بەسەر ئێمەدا بێت هەرگیز، نابێ عەرەب دەنگ و باسی وا سەرشۆڕی لە ئێمەوە ببیستن.

ئینجا(مکرزی کوڕی حفص) یان نارد، کاتێ لە دوورەوە پێغەمبەر(ﷺ) بینی فەرموی: ئەمە کەسێکی غەدر کەری بێ وەفایە. ئەمیش هات و پرسیاری کردو پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی دایەوە بە وێنەی وەڵام دانەوەی(بودەیل)، ئینجا ئەویش گەڕایەوە هەواڵەکەی دا بە قورەیش. ئەوانیش سەرۆکی ئەحابیشەکان(الحليس) ناویان نارد، کاتێ لە دوورەوە پێغەمبەر(ﷺ) بینی فەرموی ئەمانە کۆمەڵێکن کە عیبادەت کەرن، ماڵاتەکەی(هدي) یەکان ڕووبەرووی بەرن با ببینن و بزانن کە ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، ئەویش کە ئەوەی بینی نەهاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لە حەیبەت ڕێزی ئەو ماڵاتەی کە هێنراون بدرێن لە ڕێ ی خواداو لەوێ بەند کراون زۆر پەرێشان بوو. ئەمیش وەکو پێشووەکان هەر ئەو هەواڵەی دا بە قورەیش. قورەیشی یەکان پێ یان وت کە تۆ کۆچەری و لادێیت و هیچ نازانی، ئەویش رقی هەڵساو وتی: والله ئێمە سوێند خواری ئێوەمان نەکردووە لەسەر شتی وا، ئایا کەسێ بیەوێ بێت بۆ زیارەتی ماڵی خوا بە ڕێزو قەدرەوە بەرگری ئەکرێ سوێند بە کەسێ گیانی منی بەدەستە ئەبێ لە محمد گەڕێن یان هەموو تاقمی ئەحابیش دژتان ئەوەستین، ئەوانیش پێ یان وت: بابە لێمان گەڕێ با بزانین بیرێکی لێ بکەینەوە شتێ بۆ خۆمان دائەنێین.

ئینجا ناردیانە لای(عوروەی کوڕی مەسعود) کە ئەو بڕوا، ئەویش وتی: کۆمەڵی قورەیش من بینینم ئەوانەی کە ئێوە ناردتان دووچاری چی بوون لەوان، من کاتێ ئەو بەسەرهاتەی ئێوەم بیست هەرکەس لە تائیفەکەم بە گوێ ی کردبم هێناومە بۆ لاتان، ئامادەم

به گیانی خۆم لەگەڵتان، ئەوانیش وتیان راست ئەکەیت، تۆڵای ئێمە جێگای گومانی خراپ نیت.(عورڕوه) رۆیشت تا گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە بەردەمی دا دانیشت و گوتی: ئەی محمد لە هەموو جۆرێ خەڵکت کۆ کردووەتەوەو هاتووی بۆ سەر کەس و کاری خۆت، ئەتەوێ بەربادیان بکەیت؟! وتی بەراستی قورەیش بە گەورەو بچووکی یەوە هاتوون و پێستی پڵنگیان پۆشاوەو هەموو سوێندیان خواردووە کە بە زۆر بەسەریان دا تێنەپەڕیت، سوێند بەخوا وەکو لە پێش چاومەوە بێت سبەی رۆژ هەموو لێت دوورئەکەونەوە، لەوکاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر لە پشتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دانیشتبوو، تێیخوڕی و بە ناشیرینی فەرمووی: ئێمە لێ ی دوور ئەکەوینەوە؟! ئینجا(عورڕوه) ئەڵێ: ئەمە کێ یە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) ئەفەرموێ: ئەمە کوڕی ئەبو قوحافەیە، ئەڵێ: بەخوا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە پیاوەتیەکت بەسەرمەوە هەیە.وەڵامم ئەدایتەوەو قسەم پێ ئەگوتی،(عورڕوه) لەکاتی قسە کردن دا دەستی ئەبرد بۆ ریشی پێغەمبەر(ﷺ) و(مغیرەی کوڕی شوعبە) یش وەستابوو بەلای سەری پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە چەکەوە، ئەیخوڕی یە(عورڕوه) هەرکات دەستی ئەبرد بۆ ریشی پێغەمبەر(ﷺ) ئەیوت: دەستت لابە با باڵت نەپەڕێنرێ،(عورڕوه) یش ئەیوت: هاوار بۆ تۆ قسە رەق و دڵ رەقی، پێغەمبەریش(ﷺ) زەردەخەنەیەکی ئەکرد،(عورڕوه) ئەڵێ: ئەمە کێ یە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەمە برازاتە(موغەیرەی کوڕی شوعبە) یە،(عورڕوه) یش ئەڵێ: ئەی بێ وەفای بەد نەمەك، مەبەست لەوە خوێنی ١٣ پیاو بوو لە بەنی مالك بە لای موغەیرەوە عورڕوە ئەو ١٣ خوێنەی دابوو بۆی.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی عورڕوەی دایەوە بە وێنەی ئەو وەڵامانانەی کە فەرمووی بە نوێنەرەکانی تر، ئینجا عورڕوە هەڵسا لە خزمەتی و ئەیبینی ئەوە کە موسڵمانەکان ئەیکەن دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) هیچ کەس نایکات. کە دەست نوێژ ئەگرێ بە جارێ پەلامار ئەدەنە ئاوی دەست نوێژەکەی بە موفەرەك ئەیخۆنەوەو ئەیکەن بەسەرو چاوو لەشی خۆیان دا، کە ئەمەی بینی گەڕایەوە بۆ ناو قورەیش ووتی: کۆمەڵی قورەیش من(کیسرا) و(قەیسەر) و(نەجاشی) م بە هەموو سەڵتەنەت و پادشایەتی خۆیانەوە بینیوە، واللە هیچ پادشایەکم نەدیوە لەناو رەعیەتەکەیدا بەوێنەی محمد لەناو یارەکانیدا، سوێند بەخوا بۆ هیچ شتێ دەستی لێ هەڵناگرن، کەواتە فیکرێکی خۆتان بکەن.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)(خەراشی کوڕی ئومەیەی خوزاعی) بانگ کردو بە سواری حوشترێکی خۆی ناردی بۆ مەککە تا پێیان راگەیەنێ کە نیازی خراپەی نی یەو بۆ زیارەت

هاتووه، مەککەیی یەکان حوشترەکەیان سەربڕی و ویستیان خەراشیش بکوژن، بەڵام ئەحابیشەکان [1] بەرگری یان کردو گەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ).

دوای ئەوە قورەیش ٤٠ تا ٥٠ پیاویان نارد بۆ ئەمەی چەرخە بکەن بە دەوری لەشکری موسڵمانەکان دا، بەڵکو یەکێکیان دەست بکەوێ و بیکوژن. بەڵام کە هاتن هەموو دیل و دەست گیر کران، هێنانیانە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لێ یان بوردو بەرەڵای کردن و لەپاش ئەمەیش کە بەو نیازە پیسە هاتبوون و لەشکرەکەیشیان دابووە بەر بەردو تیر.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە عومەر کە بچێ بۆ مەککەو پیاو ماقوڵەکانیان تێ بگەیەنێ لە نیازی پاکی ئەمان، ئەویش عەرزی کرد کە لە مەککەدا لە کەس و کاری خۆم یەکێ گومان نابەم کە بەرگریم لێ بکات، خۆت ئەزانی کە دوژمنایەتی من بۆ قورەیش و رق و رەقی ی من لە ئاستیان لەبەر ئەوە مەترسی ئەکەم کە بمکوژن، بەڵام یەکێکت عەرز ئەکەم کە لایان بەڕێزە عوسمانی کوڕی عەففان، ئەویش بانگی کردو ناردی بۆلای ئەبو سوفیان و پیاوە گەورەکانیان کە هەواڵی مەبەست لەم هاتنەیان پێ راگەیەنێ، ئەویش رۆیشت و تووشی سەعیدی کوڕی عسان بوو، خستی یە بەردەم خۆیەوەو پەنای دا هەتا ئەو فەرمانەی پێ ی سپێررا بوو بەجێ ی بێنێ، ئینجا حەزرەتی عوسمان چووە لای ئەبو سوفیان و گەورەکانی تری قورەیش و ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرمووبوو پێ ی راگەیاندن، ئەوانیش پێ یان وت: ئەگەر ئەتەوێ تەواف بکەیت رێگات لێ ناگرین، ئەویش فەرموی نەخێر، شتی وا ناکەم تا پێغەمبەر(ﷺ) تەواف نەکات.

قورەیش حەزرەتی عوسمانیان بەرنەدا کە بگەڕێتەوە، هەواڵ وا هات بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە کوژراوە، ئەویش فەرموی: ئێرە بەجێ ناهێڵین و کۆتایی ناهێنین هەتا نەجەنگێین لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا – ئەگەر راست بێ کە عوسمان کوژراوە – بەهۆی ئەوەوە بانگی کردە یارەکانی بۆ پەیمان دان لەسەر مردن، لەوێدا ئەو پەیمانە بەسترا کە پێ ی ئەگوترێ: ﴿بيعة الرضوان﴾ [2].

(جابیری کورشی عبدالله) – خوا لێ یان رازی بێت – ئەفەرموێ: پەیمانی لێ وەرگرتین لەسەر رانەکردن، ئەفەرموێ: هەموو کەس پەیمانی دا جگە لە(جیدی کوڕی قەیس) خۆی لە پەنا حوشترەکەی دا شاردەوە، دوای ئەوە هەواڵ هات کە حەزرەتی عەسمان نەکوژراوە.

---

[1] کۆمەڵێ بوون لەخەڵکی لادێی وکۆچەری لەرێگایەکەوەهاتبوون پێی ئەگوترێ(حوبەیش) و لە مەککە نیشتەجێ بوون.

[2] واتە: پەیمانێ کە رەزامەندی خوای لەسەرە.

لەو پەیمانەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو دەستی خۆی خستە ناویەك لە باتی عوسمان دا، لە ریوایەتێك دا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەمە دەستی چەپم لە باتی عوسمان، ئەمە چاكترە لە دەستی راستی خۆی.

ئینجا قورەیش(سوهەیلی كوڕی عەمر) یان نارد بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: برۆ سوڵحی لەگەڵ بكە، بەڵام ئەبێ ئەمساڵ هەر بگەڕێتەوە، سوێند بەخوا نابێ لەناو عەرەب دا بگێڕرێتەوە كە بە زۆر هاتە سەرمان.(سوهەیل) هات كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە دوورەوە بینی فەرموی: ئەیانەوێ سوڵح و یەك كەوتن بكەن بۆیە ئەم پیاوەیان نارد. كە گەیشتە بەرەوە دەستی كرد بە قسەكردن و درێژەی دا بە قسە. لە لایەن هەردوو لاوە قسە هاتوچۆ پێ كرا، لێكۆڵینەوە، ئینجا بڕیاری سوڵح و یەك كەوتن درا بەو جۆرەی كە لەمەوپاش دێت.

كاتێ كە بڕیاری ئەوە درا هیچ نەما جگە لە نووسین، حەزرەتی عومەر – خوا لێ ی رازی بێت – خۆی پێ نەگیراو هەڵپەڕی و چووە لای حەزرەتی ئەبوبەكرو وتی: ئایا ئەو پێغەمبەری خوا نی یە؟ ئەویش وتی با پێغەمبەری خوایە. وتی: ئایا ئێمە موسڵمان نین؟ وتی: ئایا ئەوانە بت پەرست نین؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئایا لەسەرچی ئەو سەرشۆڕی یە بەسەر خۆمان بێنین لمە ئایینەمان دا؟ حەزرەتی ئەبوبەكر وتی: عومەر رێگاكەی ئەو بگرەو بیدەرە بەر من شایەتی ئەدەم كە پێغەمبەری خوایە.

ئینجا عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی كە وتی بە ئەبوبەكر عەرزی ئەمیشی كرد، ئەمیش وەكو ئەبوبەكر وەڵامی دایەوەو فەرموویشی: من بەندەو پێغەمبەری خوام، دژو پێچەوانەی فەرمانی ئەو ناكەم، ئەویش من زایە ناكات.

حەزرەتی عومەر – خوا لێ ی رازی بێت – لەمەوپاش ئەفەرموێ: لەو كاتەوە هەتا ئێستا هەر خەریكم نوێژو رۆژووی زیادە ئەكەم، بەندە ئازاد ئەكەم و خێر ئەكەم لەبەر ئەو قسانە كە ئەو رۆژە كردومەو بە چاكیشم زانی.. بێگومان ماڤی خۆی بووە كە بەو جۆرە ترساوە، چونكە بە هیچ جۆر رێگا نی یە بۆ هیچ ئیماندارێك سەر بكاتەوە لە هیچ بڕیارێكی خواو پێغەمبەر(ﷺ).

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی كردە حەزرەتی عەلی – خوا لێ ی رازی بێت – پێ ی فەرمو بنوسە: بسم الله الرحمن الرحيم سوهەیل وتی: من ئەمە نازانم بڵێ: بإسمك اللهم ئەویش ئەوەی نووسی، ئینجا فەرموی: بنووسە: ئەم بەندانەی كە لەم نووسراوەدایە شتێكە كە محمد پێغەمبەری خوا سوڵحی لەسەر كرد لەگەڵ قورەیش دا.(سوهەیل) وتی: ئەگەر

شایەتیم بدایە کە تۆ پێغەمبەری جەنگم لەگەڵ نەئەکردی، ناوی خۆت و باوکت بنووسە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی وا بنووسە.

ئەگێڕنەوە کە حەزرەتی عەلی فەرموی: من وشەی ﴿رسول الله﴾ ناکوژێنمەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: نیشانی خۆمی بدە خۆم ئەیکوژێنمەوە، فەرموی: خوا ئەزانێ کە من پێغەمبەری خوام. فەرموی بنوسە: ئەمەی لەم نووسراوەدایە شتێکە کە محمدی کوڕی عبدالله سوڵحی لەسەر کرد لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمردا نوێنەری قورەیش.

ئەو بەندانەی کە سوڵحی لەسەر کرابوو ئەمانە بوون:

١- دە ساڵ ئاشتی لە نێوان هەردوولادا کۆتایی بێنن لە کوشتن و دەست درێژیی لە یەك و مەترسی یان لەیەك نەبێ.

٢- هەرکەس لەلایەن قورەیشەوە هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بێ پرس و رای کەس و کاری بنێررێتەوە بۆیان، هەرکەس لە کۆمەڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) چوو بۆلای قورەیش نەیگێڕنەوە.

٣- دزی و خیانەت نەبێ لە نێوان هەردوولادا.

٤- هەرکەس پەیمان ئەبەستێ لەگەڵ هەریەکێ لەم دوو تەرەفەدا بەرگری نەکرێ.

٥- ئەمساڵ پێغەمبەر(ﷺ) بگەڕێتەوەو نەچێتە مەککە، ساڵی تر ئەوان لە مەککە دەرچن، ئەمیش لەگەڵ موسڵمانەکان بچنە مەککە، سێ رۆژ بمێننەوە، هیچ چەکێکیان پێ نەبێ جگە لە شمشێر لە کێلاَن دا.

ئینجا پاش نووسینی ئەو نامەیە چەند پیاوێك لە هەردوو کۆمەڵ کران بە شایەت لەسەر ئەم سوڵح و یەك کەوتنە. لە موسڵمانان ئەبوبەکری صدیق و عومەری فاروق و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و عبدالله ی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمرو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و محمودی کوڕی مەسلەمەو عەلی کوڕی ئەبو طالب و موکریزی کوڕی حفص کە لەو کاتەدا هێشتا بت پەرست بوو.

کاتێ کە بڕیاری سوڵح و یەك کەوتن دوایی هات، ئەبو جەندەلی کوڕی ئەم عەمرە کە نوێنەری قورەیشە بە زنجیر کراوی لە دەست قورەیش خۆی دەرکردو هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێ عەمری باوکی بینی پەلاماری دایە بە لێدان لە سەرو چاوی و یەخەی گرت و وتی: ئەی محمد پاش تەواو بوونی بڕیارەکە هاتووە، ئەبێ وەرنەگیرێ و بمدەیتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی راست ئەکەیت.

باوکەکەی یەخەی کوڕەکەی گرت و بەرەو مەککە رایکێشا بەرەو قورەیش بیباتەوە، ئەبو جەندەل بە هەموو هێزی هاواری کرد: موسڵمانەکان ئایا من بگەڕێنرێمەوە ناو بت پەرستەکان سزام بدەن لەسەر دینەکەم؟ پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی دایەوە: ئەبا جەندەل خۆت بگرەو سەبر بکەو چاوەڕوانی پاداشت بکە لای خوا، بێگومان خوا دەروو ئەکاتەوە لە تۆیش و لە موسڵمانانی تریش کە بێ دەسەلأت و زەلیل و پێ گیراون، ئێمە تازە پەیمانمان بەستووە، نابێ غەدرو ناڕەوایی بکەین.

(زەهەری) ئەڵێ: ئینجا حەزرەتی عومەر هەڵساو لەگەڵیدا رۆیشت بە جۆرێك دەسکی شمشێرەکەی لێ یەوە نزیك خستبووەوە، پێی ئەفەرموو: ئەبا جەندەل سەبر بکە، ئەوان بت پەرستن، کوشتنی هەرکامیان وەکو کوشتنی سەگێك وایە، لەپاشان فەرموی: مەبەست ئەوە بوو شمشێرەکە بگرێ و باوکی بکوژێ و خۆی پێ رزگار بکات، بەلأم دڵی نەهات و باوکی بردی یەوە.[1]

با لێرەدا بیر بکەینەوە لە دڵی بەهێزو پڕ لە ئیمانی ئەو موسڵمانانە کە چۆن بەرگری ئەو شتە قورسەیان کرد، ئەمانە لە ماڵەوە هاتن بە دڵنیایی بەو خەوەی پێغەمبەرەوە، هیچ گومانیان نەبوو لە چوونی مەککەو تەواف کەعبە، کەچی ئێستا بە دیمەن دووچاری ئەو سەرشۆڕی یە بوون، نائومێدی لە هەموو لایەکەوە رووی کردە دڵیان. جا وەرە بەم سەرشۆڕی و نائومێدی یەوە بتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ مەدینە، بۆ لاقرتی و تانەو تەشەری جولەکەو مونافیقەکانی مەدینە، بێگومان مەگەر هەر لە دەستی زانکۆی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) بێت ئەو جۆرە هەڵکەوتووانە هەڵبخات کە بەرگەی ئەو جۆرە شتانە بگرن.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە یارەکانی: هەڵسن و حوشترو ماڵأتەکان سەربڕن لە پاشان سەر بتاشن، واتە ئیحرام بشکێنن، سێ جار ئەوەی فەرمو کەس هەڵنەسا، لەپاش چووە مەنزڵەکەی خۆی وەك گلەیی گێڕایەوە بۆ دایکی ئیمانداران(ام سلمه) – خوای لێ رازی بێت – ئەویش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پێت خۆشە ئەوە بکەن؟ خۆت بڕۆ هیچ بە کەس مەڵێ و ئەوەی کە هێناوتە لە مەککە سەری بڕی سەری بڕە، ئینجا سەرتاش بانگ بکە سەرت بتاشێ، ئەمیش وای کرد. کە خەڵك ئەوەیان بینی بە گورجی هەڵسان و حوشترو ماڵأتەکەی خۆیانیان سەربڕی، ئەوەندە بە پەلە سەری یەکتریان ئەتاشی خەریك بوون هەندێکیان هەندێ تریان سەر کەلکەن لە داخ و پەلە پەل دا.

---

[1] ئەبوجەندەل لە پاشان وتی:مەبەستم ئەوەبووکە رێزی پەیمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بگرم، نەك لەبەر دڵ نەهاتن بوو.

ئینجا گەڕایەوە بۆ مەدینە، لە ڕێگادا ئەم سورەتەی بۆ هات. پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل حەدیسێك ئەهێنێ لە مەجمەعی کوڕی حارثەی ئەنصاری یەوە ئەفەرموێ: ئامادەی بەسەرهاتی حودەیبیە بووین، لە گەڕانەوەدا خەڵکی کەوتنە پەلە، هەندێ پرسیاریان کرد لە هۆی ئەو پەلە کردنە , لە وەڵام دا پێیان وترا: وەحی هاتووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەیانەوێ بگەنە خزمەتی تا بزانن چی بۆ هاتووە. ڕۆیشتین تا کراع الغمیم تەماشا ئەکەین پێغەمبەر(ﷺ) وا بەسەر وڵاخەکەیەوە، خەڵکی لێ ی کۆبوونەتەوە، ئەویش سورەتی ﴿الفتح﴾ یان بەسەردا ئەخوێنێ، لەپاشان یەکێ عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا ئەو بەسەرهاتە فتح بوو، واتە زاڵ بوون و سەرکەوتن بوو؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ فتح بوو، سوێند بە کەسێ گیانی(محمد) ی بەدەستە.

هەروەها پێشەوا ئەحمەد فەرمودەیەکی تر لە حەزرەتی عومەرەوە ئەهێنی و بوخاری و ترمزی و نەسائیش ئەو فەرمودەیە لە حەزرەتی عومەرەوە ئەهێنن کە ئەم سورەتە هاتە خوارەوە لە کاتی گەڕانەوەیان دا لە حودەیبیە.

ئەمە بوو ئەو جەوەی کە ئەم سورەتەی تیادا هاتە خوارەوە، لەو بەسەرهاتە گرنگەدا ئەو دڵە گەورەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بەو شێوەی کە باسکرا پڕ لە ئارام بوو بە گوێرەی ئەوەی خوا نابوویە دڵی، خۆی بۆ یەك لا کردەوەو خۆی رووت کرد لە هەموو شتێك، هەموو بەشێکی خۆی یان موسڵمانانی لەخۆی داڕنی، بەڵکو لە هەموو هەنگاوێك دا ئەوەی خوا نابوویە دڵی، خۆی بۆ یەك لا کردەوەو خۆی رووت کرد لە هەموو شتێك، هەموو بەشێکی خۆی یان موسڵمانانی لە خۆی داڕنی، بەڵکو لە هەموو هەنگاوێك دا، لە هەموو جوڵانەوەیەك دا خۆی بە موو لانەدا لەوەی خوا نابوویە دڵی و ئەیزانی ڕەزامەندی خوا لەوەدایە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾

---

**لەبەرئەوەی لە سەرەتای سورەتەکەدا خوای گەورە ئەو هەموو مژدانەی دا، کە ئەو هەموو خۆشی و شادمانی یەی خستە ئەو دڵە گەورەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) و فەرموی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾[1] بەڕاستی ئێمە فەتحێکی روون و ئاشکرامان بۆ کردی: کە بریتی یە لەم سوڵح و یەك کەوتنی حودەیبیە.**

**ناوی ئەبا بە فەتح، چونکە بوو بە هۆی دان نانی قورەیش بە ئیسلام و پێغەمبەرو موسڵمانان و هێزو دەسەڵاتیان دا، بە جۆرێ ناچار بوون سوڵحیان لەگەڵ کردن، بوو بەهۆی فەتحی مەککە، بە هۆی ئەو سوڵحەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی خاڵی بوو پەرژایە سەر عەرەبەکانی تر. بەڵێ بەڕاستی مافی خۆیەتی پێ‌ی بوترێ فەتح، چونکە قاپی کراوەیە لە خەڵکی کە بە ئارام و ئاشتی بانگ بکرێن بۆ ئیسلام، بێ سڵەمینەوە لە یەکتر، بکۆڵنەوە لەو رێگا راستەی کە خوا دیاریی کرد، بەهۆی ئەوەوە لەماوەی دوو ساڵی پاش ئەم سوڵحەدا خەڵکێکی زۆر موسڵمان بوون، چەند چەندانەی ئەوانەی لەوەو پێش موسڵمان بووبوون، بەڵگەی ئاشکرا لەسەر ئەمە ئەوەیە کە لە ساڵی ئەم سوڵحەدا ١٤٠٠ کەس کۆبوونەوەو لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) چوون، کەچی دوو ساڵ پاش ئەوە ١٠٠٠٠ کەس کۆبوونەوەو لە خزمەتی دا چوون بۆ فەتحی مەککە. کەواتە بەڕاستی ئەم سوڵحە فەتحێکی گەورە ئاشکرا بوو لە بانگ کردن و بانگەوازەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) وەکو فەتح بوو لە بابەت خاك و وڵاتەوە، ئەوەبوو بە هۆی ئەم سوڵحەوە پێغەمبەر(ﷺ) پەرژایە سەر ئەوە کە نیوەدورگە لە خەتەرو**

---

[1] چەند رایەك هەیە لە مەبەست بەم ﴿فتح﴾ە: ١.گرتنی مەککە. ٢.گرتنی خەیبەرو فەدەك و شوێنەکانی تر، بە وشەی رابردوو فەرموی بۆ زیادە دڵنیایی کردن لەسەری. ٣.زاڵ بوونی رۆم لەو ساڵەدا بەسەر فارس دا، ناوبردنی بە فتح، چونکە هەواڵی ئەو زاڵ بوونە کە قورئان فەرموی هاتە جێ. ئەوەیش موعجیزەیە بۆ قورئان، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە رای زۆریەی لەسەرە، بەڵگەش چەند فەرمودەیەکی سەحیحە، زانینی تەواویش لای خوایە.

مەترسی جوولەکە رزگار بکات، بەهۆی داگیر کردنی سەختترین قەڵاو گرنگترین مەڵبەندیانەوە(خەیبەر).

هەروەها ئەم سوڵحە فەتح بوو لەبابەت هەڵوێستی نێوان موسڵمانان و قورەیش و بت پەرستەکانی تر، هەر بێ ئارامی و مەترسی یەکی موسڵمانان هەبوو لەو کۆمەڵە گەورەیە نەما، ئەو سەرکەشی یە وشك و کەشخەو کەللە رەقییەی کە قورەیشی داگیر کردبوو هێواش بووەوە، عەرەبەکانی تر کاتێ قورەیشیان بەو شێوەیە بینی ئەوان باشتر سام و ترس چووە دڵیانەوە باشتر دانیان بە قەوارەی موسڵمانەکان دا نا. بێگومان ئەم بەسەرهاتە فەتحێکی گەورەبوو بۆ دڵ و دەروونی موسڵمانەکان، بە تەواوی پاڵفتە بوون و شایانی ئەوە بوون کە خوای گەورە ئایەتی رەزامەندی خۆی لێ یان بنێرێتە خوارەوە، وێنەو شێوەی شیرینیان باس باش بفەرموێ لە قورئان دا، وەکو لە سورەتەکەدا بە یارمەتی خوا پێ ی ئەگەین. کەواتە با تێ بگەین لە هەندێ هۆی ئەو خۆشی و شادی یەی کە رووی کردەوە دڵی گەورەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو خۆشی یەی کە لەم فەرمودەیەوە روون ئەبێتەوە: سورەتێ هاتۆتە خوارەوە بۆ سەرم خۆشەویست ترە لام لە دنیاو لە هەرچی وا لەدنیادا.

ئەم فەتحە کە نیعمەتێکی گەورەو بەرێز بوو، بوو بەهۆی چەند شتێ کە هەر یەکێکیان چاکەیەکی زۆر گەورەو گرنگە لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ئەفەرموێ: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ[1] وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا * وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا﴾ ئەو فەتحەمان بۆ باس کردی بۆ ئەمەی:

١- خوا ببورێ و بسرێتەوە لە تۆ هەرچی کەم و کوڕی لەمەوپێش و لەمەوپاشت هەیە.
٢- چاکەی خۆی بەسەرتەوە تەواو بکات بەم جۆرەی لە هەردوو جیهان دا بەرزت بکاتەوە.
٣- بتخاتە سەر رێگای راست لە گەیاندنی فەرمانەکەت و بەجێ هێنانی کاروباری پێغەمبەرێتی یەکەت دا و دامەزراوت بکات لەسەر ئەو رێگە راستە.
٤- یارمەتیت بدات و زاڵت بکات بە یارمەتی یەك کە بەرزیی تیادا بێت. واتە ئەم فەتحە ئەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئایینی خواو شکاندنی هێزی کوفر، ئەوەیش ئەبێتە هۆی ئەو هەموو جۆرە چاکەی خوا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ).

---

[1] چەند جار لەمەوپێش وتمان کە پێغەمبەر(ﷺ) گوناهی نەبووە، بەڵام دیارە لە ئاستی خوا کەم و کوڕی و ناتەواوی هەبووە، ئەوە هەرچەند گوناه نەبوو، بەڵام شایانی پلەو پایەی بەرزی ئەو نی یە، لەبەر ئەوە بە گوناه ناوبراوەو لێبوردنی ئەوێ. خوا منەت ئەنێ بەسەری دا لەو لێبوردنە، هەموو سوپاس و منەتێ بۆ خوایە.

﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾

---

ئەمە بەشی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئینجا بەشی ئیماندارەکان باس ئەفەرموێ لەم فەتحەدا: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ خوا کەسێکە کە ئارام و دامەزراوی خستە ناو دڵی ئیماندارەکانەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو ئیمان و باوەڕە بەهێزەی کە هەیانە ئیمان و باوەڕی تر زیاد بکەن، واتە رادەی دامەزراوی عەقیدەو ئیمانەکەیان بەهێزترو دامەزراوتر بێت لەسەر ئەو ئیمانە و باوەڕەی کە بوویان. بێگومان ئەگەر خوای خاوەن بەزەیی بەو جۆرە دامەزراوو دڵ ئارامی نەکردنایە، کوڵی دەروونیان دانەئەمردەوەو گەردن کەچی و رەزامەندییان بۆ پەیدا نەئەبوو بەرامبەر بەو رووداوەی حودەیبیە، کە بە دیمەن بە نائومێدی و سەرشۆڕی تەواو بوو!

خەڵکی لە ماڵەوە هاتن، خۆشی خۆشی چاوەڕوانی بەدی هاتنی خەوی پێغەمبەر(ص) بوون، حوشتر دیاریی کراو نیشانەی کرا بە ملدا بۆ سەربڕین و کردنی بە خێر لە مەککەدا، کەچی بە نائومێدی گەڕانەوە بۆ تانەو تەشەری جوولەکەو مونافیقەکان. حوشترەکان لە حودەیبیە سەربڕان.

سەختی ئەم رووداوە لە پلەیەك دا بوو پیاوی وەك حەزرەتی عومەر بینێتە زەلەو پەلە، وەکو لە پێش سورەتەکەوە هەندێکمان باس کرد. زیاد لەوەی باس کرا ئەگێڕنەوە کە چووە لای حەزرەتی ئەبوبەکر زۆر بە نارەحەتی یەوە وتی: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) پێی نەگوتین ئێمە دێینە کەعبەو تەواف ئەکەین؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ. بەڵام ئایا پێی گوتیت ئەمساڵ دێیت؟ ئەویش وتی: نەخێر. ئەویش فەرموی: بێگومان بە دەچیتە بەیت و تەوافیش دەکەیت. واتە لەمەوپاش. لەپاش ئەوە هەر خۆی پێ نەگیرا چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی کە عەرزی ئەبوبەکری کرد عەرزی ئەمیشی کردو ئەمیش لە وەڵام دا ئەبوبەکر چی وت ئەوەی فەرموو پێی.

هەروەها پیاوی وەك حەزرەتی عەلی لەکاتی نووسینی نامەی سوڵحەکەدا گەیشتە ئەو رادە کە ﴿الرحمن الرحيم﴾ و ﴿رسول الله﴾ ی نەکوژاندەوە، لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە کوژاندنەوەی لەسەر پەڵپی سوهەیلی کوڕی عەمر تا پێغەمبەر(ﷺ) خۆی کوژاندی یەوە.

گوێڕایەڵی یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەو رادەیەدا بوو عوروەی کوڕی مەسعودی سەرسام کرد، کاتێ گەڕایەوە بۆلای قورەیش وتی: من کیسراو قەیسەرو نەجاشیم دیوە، ئەو گوێڕایەڵی و خۆشەویستی یەی کە هاوڕێکانی محمد هەیانە دەربارەی هیچ کەسم نەدیوە. لەگەڵ ئەمانەدا ئەو بەندانەی کە سوڵحی لەسەر کرا ئەوەندە قورس و گران بوو بوون لە دڵیان دا سەرسامی کردبوون، ئەوە بوو سێ جار پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە سەربڕینی حوشترە خێرەکان و ئیحرام شکاندن کەس گوێڕایەڵی نەکرد، تا پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بۆ خۆی ئەوەی بەجێ هێنا.

کاتێ ئەم جۆرە شتانە بخرێتە پێش چاوو بیریان لێ بکرێتەوە، ئینجا نرخی ئەو ئارام و دامەزراوی یە ئەزانرێ کە خوای گەورە دای بەو کۆمەڵە ئیماندارە –خوا لێ یان رازی بێت– بەڵام ئەو هەموو داخ و مەراق و قسەو باسەیان هەموو لەبەر خوا بوو، غیرەت کەشی بوو لەسەر ئایینەکەیان، لەبەر ئەوە خوا ئەو چاکەی لەگەڵ کردن، تا رادەو پلەی ئیمان و عەقیدەکەیان بەرزتر ببێتەوە. وەکو ئایەتەکە پیشانی داین.

ئینجا تێمان ئەگەیەنێ کە زانین و زاڵ کردنی ئیمانداران و سەرشۆڕ کردنی دوژمنەکانی ئایینی خوا زۆر ئاسانەو هیچی تێ ناچێت وەکو بەم فەرمودەیە نیشانی ئەدات: ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ هەر تەنها بۆ خوایەو موڵکی خوایە هەموو لەشکرەکانی ئاسمانەکان و زەوی، خوا هەموو کات اناو خاوەن حیکمەتە، هەموو شت ئەزانێ و هەموو کارو فەرمانی بەجێ و پڕ لە بەرژەوەندی یە.

﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾

---

**هەر بە پێی ئەو زانین و حیکمەتەی خۆی ئەو ئارامی و دامەزراوی یەی خستە دڵی ئیماندارەکانەوە لەو بەسەرهاتە سەختەدا:** ﴿لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[1] **بۆ ئەمەی پیاوو ئافرەتە ئیماندارەکان بخاتە ناو بەهەشتانێك کە لە ژێر کۆشکەکانیان دا رووبارەکان دێن و دەچن، ئەوانیش بێ برانەوە دەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا، بۆ ئەمەی هەر گوناهو تاوانێکیان هەبێ بیسرێتەوە لێ یان و دایان پۆشێ ئاشکرایان نەکات، ئەوە لای خوا گەیشتنە بە ئامانجی زۆر گەورە. بەڵێ ئا ئەوەیە ئامانجی هەرە گەورە، چونکە دەستکەوتنی هەموو خۆشی و سوودو نیعمەتە بێ ئەمەی هیچ ناخۆشی و زیانێکی تێکەڵ بێت، واتە سەختی ئەو بەسەرهاتەو خۆگرتن و گوێڕایەڵی ئەوان لەو بەسەرهاتەدا بوو بەهۆی ئەو پاداشت و لێبوردن و گەیشتن بەو ئامانجە هەرە گەورەیە.**

**ئەو کۆمەڵە بەختیارە کاتێ لە یەکەم جاری سورەتەکەوە بەڵێنی مژدەی خوایان بیست دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) عەرزیان کرد نۆشی گیانت بێ ئەم بەڵێنە گەورەی خوا. ئەمە بەشی خۆت، ئەی بەشی ئێمە؟ کاتێ ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە دڵ و دەروونیان پڕبوو لە خۆشی و شادمانی و رەزامەندی بەم بەشە گەورەیە.**

---

[1] چەند رایەکی تر پەیوەندی ﴿ل﴾ لە وشەی ﴿لیدخل﴾ ەدا: ١.شتێکی نەگوتراو کە وەرنەگیرێ لە پێشەوە: ئەوەی کرد کە کردی ﴿لیدخل﴾. ٢.﴿فتحنا﴾. ٣.رستەی ﴿لیزدادوا﴾. ٤.هەموو ئەوانەی کە گوترا بە هەموو جۆر هەر رێکەو زانینی تەواویش لای خوایە.

ئینجا بەشێکی لە حیکمەتی خۆی دەرئەخات لەو بەسەرهاتەدا ئەفەرموێ: ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾ [1] ئەو بەسەرهاتەی بەو جۆرە کرد بۆ ئەمەی سزاو عەزابی پیاوو ئافرەتە مونافیقەکان بدات، هەروەها پیاوو ئافرەتە بت پەرستەکان، سزای ئەمانە هەموو بدات کە گومانی خراپ ئەبەن بە خواو باوەڕیان نی یە کە هەموو بڕیاری خوا بەجێ یە، لایان وابوو کە یارمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئیماندارەکان نادات، گومانیان وابوو ئیتر هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و کەس و کاریان، هەموو ئەکوژرێن. هەر بۆ سەر خۆیان ئەگەڕێتەوە ئەو بەسەرهات و رووداوە خراپەی کە گومانی ئەبەن و چاوەڕوانی ئەکەن بۆ ئیماندارەکان، خوا غەزەب و قاری هەیە لەسەریان، دەری کردوون و بێ بەشی کردوون لە رەحم و بەزەیی خۆی، دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون، کە دۆزەخ عەجەب شوێن و نیشتەجێ یەکی خراپە بۆ ئەوان، پەنا بە خوا لەم هەڕەشە سامناک و لەم ترساندنە بەتینەی خوا دەربارەی ئەو کۆمەڵە سیاچارە.

لەم هەڕەشە سەختە بەتینەدا مونافیقەکانی کرد بە هاوبەشی بت پەرستەکان، لە لەناوبردن دا پێشی خستن، چونکە مونافیقی سیفەتێکی زۆر ناشیرین و پەستە، لە بت پەرستی پیس ترە لەم بارەیەوە زیانی ئەمان لەناو گەل دا زۆرترو بەتین ترە، چونکە دوژمنایەتی یەکەیان ئاشکرا نی یە تا ئیماندارەکان خۆیان بپارێزن و ئامادە بن بۆیان، بەڵکو بە فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و سەر لێ شێوانە دیارە ئەوە زیانی زیاترە.

خوای گەورە ئەو هەموو دوژمنە جیاوازانەی کۆکردووەتەوە لەو ئایەتەدا، بارو حاڵ و پاشەڕۆژی سەخت و سامناکی باس کردن، ئینجا بێ نرخی ئەو دوژمنانەو دەسەڵات و حیکمەتی خۆی باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ تەنها بۆ خوایەو موڵکی خوایە هەموو لەشکرەکانی ئاسمانەکان و زەوی، خوا هەموو کات دەسەڵات و توانای بێ سنووری هەیە، زاڵە بەسەر هەموو شتێك داو کاروباری بەجێ یە.

---

[1] ئەم رستەیە بە شێوەی نزایش تەفسیر کراوەتەوە، واتە یا خوا بۆ سەر ئەوان بگەڕێتەوە ئەوەی کە گومانی ئەبەن و چاوەڕوانی ئەکەن.

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ

---

**ئینجا رووی فەرمایش ئەکاتەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئیش و فەرمانەکەی دیاریی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ ئێمە تۆمان رەوانە کردووە بۆ سەر ئادەمی بە جۆرێك شایەت بیت لەسەریان و مژدە دەر بیت پێ یان و ترسێنەریان بیت، شایەتی بدەیت لەسەر گەیاندنی ئەو ئاینە و شەریعەتەی کە پێی رەوانە کراوی، لەسەر باوەڕی ئیمانداران و کوفرو بێ باوەڕی ئەوانەی کە رێگەی خوایان نەداوەتە بەر، مژدە بدەیت بە لێبوردن و رەزامەندی و پاداشتی چاك و پاشەرۆژی کامەرانی بە ئیماندارو گوێڕایەڵان، ترسێنەری بێ باوەڕو سەرکەشەکان بیت بە قارو غەزەب و عەزابی خوا.**

**ئەمە کورتەی فەرمانی پێغەمبەرە(ﷺ) ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە ئیمانداران مەبەست لە رەوانە کردنی پێغەمبەریان(ﷺ) بۆ روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا﴾ مەبەست لە رەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەیە کە هەمووتان باوەڕو ئیمان بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، یارمەتی خوا بدەن بە یارمەتی دانی بەرنامەو شەریعەتەکەی، خوا بە گەورە بگرن لە دڵ و دەروونتان دا، بەیانی و ئێوارە یادی بکەن، باسی پاکی و بێگەردی بکەن لە هەموو لەکەو گەردێ [1] بە کورتی مەبەست لە رەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) باوەڕ کردنە بە: خوایەتی خواو پێغەمبەرێتی پێغەمبەر، هەڵسان بەو شتەی کە ئیمان و باوەڕەکەی داوای ئەکات، کە بریتی یە لە یارمەتی دانی ئاین و بەرنامەکەی خواو یادی خواو پەیوەندی دڵ و دەروون بە خواوە لە هەموو کات دا، کە**

---

[1] هەندێ لە زانایان راناوی(هـ) لەدوو کردارە پێشووەکەدا ئەباتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەرچەندە بەو جۆرەیش باشەو ئەگونجێ، بەڵام زۆریە لەسەر ئەوەیە کە مەبەست بە هەرسێکیان خوایە، دڵیش زیاتر بۆ ئەم رایە ئەڕوات، چونکە ئەم راناوانە یەك جۆرین باشترە بە گوێرەی رێزمان و باوی هۆنینەوە.

ئەمانەیش هۆی بنەڕەت و هۆی هەموو خۆشی و کامەرانی یەوە لە هەردوو جیهان دا.

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە بۆ ئەمەی خوا بناسێنێ بە خەڵکی و پەیمانی گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ خوا وەرگرێ لە بەندەکانی خوا، باو بووە لەکاتی ئەو پەیمانەدا هەموو پیاوێکی ئیماندار دەستی خستووەتە ناو دەستی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ئەو کۆمەڵە بەختیارە کە لە حودەیبیەدا بەو جۆرە پەیمانیان دا – وەکو باسمان کرد – جا بە گوێرەی ئەو باوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەربارەی ئەو کەسانەی کە پەیمانیان داوەو ئەیدەن بە پێغەمبەر(ﷺ)، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی کە پەیمان لەگەڵ تۆدا ئەبەستن، ئەوانە هەر لەگەڵ خوادا پەیمان ئەبەستن. کەواتە پەیمان دان بە پێغەمبەر(ﷺ) پەیمان دانە بە خوا، خوا بەو جۆرە تەماشای ئەکات، چونکە مەبەستی پەیماندەرەکان تەنیا خوایە، پێغەمبەریش(ﷺ) هەموو شتی بۆ خوایە و بە پێی فەرمانی خوایەو لەکاتی پەیمان بەستنەکەدا لە باتی خوا دەستی ئەخاتە ناو دەستیان، ئەوا خوایش ئەفەرموێ: دەستی یارمەتی و ڕەزامەندی خوا وا بەسەر دەستی ئەوانە کە پەیمان ئەدەن بە پێغەمبەر(ﷺ). سبحان الله بە چ شێوەیەکی نایاب و شیرین و سامناك ئەو پەیمان بەستنە پیشان ئەدات، دڵ و هەست بێدار ئەکاتەوە کە خوا ئامادەی ئەو پەیمانەیە و ئەو خاوەنیەتی، ئەو پەیمان ئەدات و بەو پەیمان ئەدرێت، کەواتە ئەو پەیمانە هەر ئەمێنێ با پێغەمبەریش ئامادە نەبێت، یان هەر لەم جیهانەیش دا نەبێت. ئەم شێوە شیرینەی کە قورئان پیشانی دا ئەبێتە بەرهەڵستێکی زۆر بەتین و بەهێز پارێزگاری ئەو پەیمانە ئەکات لە شکاندن و هەڵوەشاندنەوەی. پاش نیشاندانی ئەو شێوە نایابەی ئەو پەیمانە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ﴾ کەواتە هەرکەس پەیمانەکە ئەشکێنێ و هەڵی ئەوەشێنێتەوە ئەو کەسە دژی خۆی ئەجوڵێتەوە، چونکە زیانی ئەو پەیمان شکاندنەی هەر بۆ سەر خۆی ئەگەڕێتەوە، کەواتە هەر خۆی ڕەنجەڕۆیە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، خۆی بێ بەش ئەکات لە پاداشتی خوا، خۆی ئەخاتە بەر قارو غەزەبی خوای خۆی. هیچ زیانێك ڕوو ناکاتە دەسەڵات و موڵکی خوا. چونکە خوا هیچ پێویستی بە هیچ شت و بە هیچ کەس نی یە، بەس خۆی خاوەنی ڕەحم و بەزەیی یەو پێی خۆشە بەندەکانی باش بن.

وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ

---

﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ هەركەس ئەوەی کە پەیمانی لەسەر بەستووە لەگەڵ خوادا لەسەری ئەڕواو ئەیباتە سەرو نایشکێنێ ئەوە لەمەودوا خوا پاداشتێکی گەورەی پێ ئەدات. ئەو شتەی خوا پێی بفەرموێ:(گەورە) ئەبێ ئێمەی دانیشتووی ئەم زەوی یە چی لێ بزانین؟!!

پەیمان دان بە خوا لەپاش پێغەمبەر(ﷺ) هەر بەردەوام بووەو هەر بەردەوامیشە تا ڕۆژی دوایی لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر دەستی جێنشینەکانی دا، کاتێ جێنشینی نەماو شێوەی دەوڵەت و میری نەما بۆ موسڵمانەکان ئەو کاتە پێویستە لەناو خۆیان دا پەیمان بدەن بە یەکتر لەسەر تێکۆشان لە ڕێگای خوادا، یارمەتی دانی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێنای، بۆ دیاریی کردنی پێشەوایە بۆ موسڵمانان، ئەمە شتێکە بڕیاری هەموو زانایانی ئەم ئوممەتەی لەسەرە، هیچ جێگای سەر لێ کردنەوە نی یە، لەم بابەتانەوە فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆرو بەناوبانگەو بڵاوبووەتەوە لەناو کتێبەکانی حەدیس و تەفسیرو عیلمی کەلام دا، بە نموونە ئەم فەرمودەیە ئەهێنین کە پێشەوا نەوەوی لە پەڕاوی ریاض الصالحین دا هێناویەتی: ﴿من مات و لم یکن في عنقه بیعة مات میتة جاهلیة﴾[1] نابێ هیچ کەس بڵێ هیچ ناکرێ و تازە دنیا شێواوەو کەس بە گوێی کەس ناکات، ئەمانەو وێنەیان هیچ نرخێکیان نی یە لای خوا، چونکە ئێمە تێکۆشانمان لەسەرە بە گوێرەی تواناو بە پێی ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی، ئیتر بەرهەم و پاشەڕۆژ بە دەست خوایەو داوا لە ئێمە ناکرێ. زیاد لەوە بە چ ئەزانرێ کە هیچ ناکرێ؟ ئایا پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی، هەروەها پێغەمبەران – سەلامیان لێ بێت – هەر بە تێکۆشان ئایینی خوایان بەرز نەکردووەتەوە؟ ئایا چەرخ و چینی ئەوان لە یەکەم جارەوە لە چەرخ و چینی ئێمە خراپتر نەبوو؟ ئایا ئەوانەی

---

[1] واتە: هەرکەس بمرێ و پەیمانێ نەبێ لە گەردنی دا ئەو کەسە ئەمرێ بە مردنێکی نەفامانە، واتە لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام نامرێ.

ئەیانەوێ بیرو باوەڕی خۆیان لە وڵات دا بچەسپێنن و بڵاوی بکەنەوە بە جیهان دا هیچ سەر نەکەنەوە لەوەی کە موسڵمانانی ئەمڕۆ سەری لێ ئەکەنەوە. هیچ مەترسی نەکەن و نەڵێن هیچ ناکرێ با لێ ی گەڕێین؟ دەی ئایا ئێمەی موسڵمان بۆ ئەبێ بترسین و سەر لە شت بکەینەوە؟ ئایا لەڕۆژی دوایی دا پێمان بڵێن: کە خاوەنی بیرو باوەڕەکانی تر نەترسان و تێکۆشانیان کرد، ئێوە بۆچی ترسان؟ لەگەڵ ئەوەدا خوا بەڵێنی پێدان کە یارمەتیتان بدات، ئەو کاتە وەڵامان چی ئەبێت؟ بێگومان هیچ وەڵامێك نی یە جگە لە سەری خەجاڵەتی داخستن. وەکو لە سەرەتاوە باسمان کرد زۆر لە عەرەبەکانی لادێی و کۆچەری لە دەوروبەری مەدینە نەهاتن بۆ ئەم سەفەرە، خۆیان گرتە دوا، چونکە ئیمان لە دڵیان دا جێگیر نەبووبوو، لە قورەیش ئەترسان و چاوەڕوانی بەرباد بوونی ئەوانەیان ئەکرد کە ئەچن بۆ سەر قورەیش، ئەو قورەیشەی کە شان و جێگای بەرزی هەبوو لە دڵی هەمووان دا، بە هیچ جۆر دانیان نەئەنا بە ئیسلام و موسڵمانان دا، بەچاوی خۆیان بینیان لەوەوپێش دووجار هاتنە سەر مەدینە بۆ بەرباد کردنی، کەواتە ئەبێ چۆن ئەمان ئەتوانن بچنە سەریان؟ کاتێ خوا کارەکەی وەرگێڕا بە پێچەوانەی گومانەکەی ئەوان، دیارە ئەو کۆمەڵە ترسنۆکە ئەگۆڕێن بەم بارەدا، جا لەم چەند ئایەتەدا کە دێت خوای گەورە هەواڵی دان بە پێغەمبەر(ﷺ) کە پاش گەڕانەوەیان بۆ مەدینە ئەوان دێن و عوزر ئەهێننەوە، ئایەتەکان ئەیانخەنەوە بە درۆوەو باقریان دەرئەخەن،ڕێنموونی پێغەمبەر(ﷺ)ئەکەن کە بە چ جۆر وەڵامیان بداتەوە،ئەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا﴾ ئەو عەرەبە کۆچەری و لادێییانە کە خۆیان گرتە دوا دێن بۆلات و پێت ئەڵێن: ماڵ و ئەهل و عەیالەکانمان خەریکیان کردین و پەردشیان نەداین تا بێین، کەواتە داوای لێبووردنمان بۆ بکە لای خوا. ئەمانەچەند تیرەیەك بوون بە دەوروبەری مەدینەدا، وەکو وتمان پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێنیاندابۆئەم سەفەری حودەیبیە، ئەوانیش لەبەر ترسنۆکی و لاوازی ئیمان و باوەڕخۆیان گرتەوا، لە دواییدا بەم بەهانە درۆیانە ئەیانویست خۆیان ڕزگار بکەن، بەهانەی بێ جێ ئەگینا ئەی خەڵکی تریش وەکو ئەوان ماڵ و ئەهل و عەیالی نەبوو؟ جا کەوابێ ئیتر کەس هەڵنەسێ بە هیچ کاروبارێکی ئاینی، بەڵام وا لێرەدا خوای گەورە بە درۆیان ئەخاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ﴾ بە زمانیان شتێ ئەڵێن کە لە دڵیاندا نییە.

﴿قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾﴾

---

ئەم دواکەوتووانە کە گوێڕایەڵییان نەکردو نەچوون بە دەم فەرمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ترسیان بوو کە تووشی کوشتن و زیان بن، ئەوا خوا لێرەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر کە پێ یان بڵێ: خوا هەرچی بڕیار دابێ هەر ئەوە ئەبێ و هیچ کەس ناتوانێ پێچەوانەی بڕیاری ئەو هیچ فەراهەم بێنێ، فەرمانی دا کە بەم جۆرە تەمێ یان بکات بۆ چارەسەری ناخۆشی و لاوازی دڵ و دەروون و ئیمانیان، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا﴾ بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ زیانی بۆ ئێوە، ئایا کێ هەیە خاوەنی هیچ شتێ بێ بۆ ئێوەو بەرگری ئەو زیانەتان لێ بکات؟ واتە هەرچی خوا بیەوێ هەر ئەوە ئەبێ و هیچ کەس توانای بەرگری کردنی نی یە، کەواتە نەهاتن و دواکەوتنیان بەرگری هیچ زیانێکی نەئەکرد کە خوا بیویستایە، هیچ سوود و قازانجێکی ڕانەئەکێشا ئەگەر خوا نەیویستایە، ئەم پرسیارە ئەوە ئەگەیەنێ کە بەندە ئەبێ گەردن کەچ بێت بۆ فەرمان و بڕیاری خوا بێ سەر لێ کردنەوەو وەستان و گیرو گرفت، هەروەها هەڕەشەو ترساندنی لێ وەرئەگیرێ دەربارەی ئەوانە کە خۆیان دواخست لەو سەفەرەو گوێڕایەڵی پێغەمبەریان(ﷺ) نەکرد، ئەو هەڕەشەو ترساندنە لەم فەرمودەوە وەرئەگیرێ: ﴿بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا﴾ خوا ئاگادارە بە هەموو کردەوەتان، ئاگادارە لە نەچوون و خۆ دواخستنتان و نیازی دڵتان، کەواتە بەهانە درۆکانیان هیچی تێدا بەسەر نی یە.

ئینجا به روونی ئەوەی لە دڵیان دا بوو دەری ئەخات، ئەیدات بەناو چاویان دا، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ السَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًا بُورًا﴾ ئەو عوزرو بەهانەتان راست نەبوو، بەڵکو گومانتان وابوو کە پێغەمبەرو ئیماندارەکان لەو سەفەرەدا قورەیش بەربادیان ئەکەن و ئیتر هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆ لای ماڵ و منداڵیان، ئەوە لە دڵتان داو لە پێش چاوی دڵتان رازێنرابووەوە، تا بە تەواوی ئەوە چەسپی بووە دڵتان، ئیتر بیرتان نەئەکردەوە لای خواو ئەو گومانە خراپەتان ئەبرد بە خوا، ئێوە لای خوا گەلێکی دڵ مردووی بێ خێرو بێرو خراپ بوون، باوەڕو نیازی خراپتان هەیە، بێگومان ئەو دڵانەی کە بەو جۆرە لە خوا پچڕان و بەد گومان و نیاز خراپن بێبەشن لە هەموو خێرو چاکەیەك و پاشەرۆژیان نەمان و بەرباد بوونە.

وێنەی ئەو کۆمەڵە لە هەموو چەرخ و کاتێك دا هەن، کاتێ ئیماندارانیان بینی کە بە دیمەن کەم و بێ هێزن و کۆمەڵی بەتاڵیان دی زۆرو خاوەن هێزن لەو کاتەدا دنیایان لێ دێتەوە یەك، دوور ئەکەونەوە لە ئیمانداران و گومانیان وایە کە ئەو ئیماندارانە تازە تێیەربوون، چەند جار بە وێنەی رووداوی حودەیبیە خوای پێچەوانەی گومانەکەیان ئەهێنێتە دی، بەڵام بە داخەوە ئەو دڵ نەخۆشانە پەندو تەمێ وەرناگرن. بێگومان بێ ئیمانی، یان لاوازی ئیمان ئەبێتە هۆی ئەو هەموو نالەباری یە، ئەوا خوای گەورە ئەیانترسێنێ و هەڕەشەی سەخت و سامناك ئەکات لەو کەسانەی ئیمانیان نی یە، بەزەیی و لێبوردنی خۆیشی ئەخاتە پێش چاو بۆ ئەمەی چەسپانی بکرێت بۆ لای خوا پێش ئەمەی هەل لە دەست دەرچێ،

وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾

---

**ئەفەرموێ:** ﴿وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ سَعِيرًا * وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ **هەرکەس ئیمان و باوەڕی نەهێناوە بە خواو پێغەمبەرەکەی – واتە هەر بەو جۆرە بێت تا ئەمرێ – ئەو کەسە خۆی زیاندارو ڕەنجەڕۆ ئەبێت، چونکە ئێمە ئاگرێکی هەڵگیرساوی بەتینمان ئامادە کردووە بۆ کافرەکان،[1] تەنها بۆ خوایە هەموو ئاسمانەکان و زەوی، واتە توانای بێ سنووری هەیە و هیچ کەس ناتوانێ دەست بخاتە هیچ کارێکی، کەواتە ئەو خوایەی کە ئەو هەڕەشە سەختە ئەکات لە کافران. هەرکەس هەرماڵ و سامانێکی ئەوێ تەنها لای خوا دەست ئەکەوێ، هەر داماوی یەکی هەبێ هەر بە خوا چارەسەر ئەکرێت، کەواتە ئەبێ دەست بنرێ لە هەموو شتێکەوە لە پێناوی فەرمانی خواو ڕەزامەندی خوادا، ئەو خوایەی کە ئەبوورێ لە تاوان و خراپەی هەرکەس کە بیەوێ لێ ی ببورێ، سزای هەرکەسیش ئەدات کە بیەوێ سزای بدات، خوا هەموو کات لێبوردەو بە ڕەحمە، کەواتە لێبوردن و سڕینەوەی تاوان و ڕەحم و بەزەیی خوا هەموو کات زۆر زۆر نزیکە لە بەندەکانی خواوە ئەگەر خۆیان بیانەوێ و بەدەستی کردەوەی خراپی خۆیان ئەو قاپی یە فراوانە لەسەر خۆیان دانەخەن. زاناو پێشەواکانی تەفسیر ئەفەرمون: خوای گەورە بەڵێنی دا بەو ئیماندارانەی کە لە حودەیبیە پەیمانیان دا بەمەی کە خەیبەر ئەگرن ئەو ماڵ و سامان و غەنیمەتەی خەیبەر تایبەتی یە بەوانەوە، جا لێرەدا هەواڵ ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە کاتێ ئەچن بۆ ئەو غەزاو غەنیمەتە ئەوانەی کە خۆیان دزی یەوە لە هاتنی حودەیبیەدا داواتان لێ ئەکەن کە ڕێگایان بدەن لەگەڵتان بێن، تۆیش ڕێگایان مەدە.**

---

[1] ئەم شوێنە شوێنی ڕاناوە واتە لەباتی ﴿للكافرين﴾ دا ﴿لهم﴾ بەڵام بەم جۆرەی فەرمووە لەبەرئەوەی لەکەداریان بکات بەو سیفاتە پیسە کە هۆی هەموو بەدبەختی یەکە، تاکو ڕوون بێتەوە کە هەرکەس لەگەڵ ئیمان بەخوا ئیمانی بە پێغەمبەریش نەبێ هەر کافرە.

ئەم هەواڵە پاش گەڕانەوە بۆ مەدینە بە ماوەیەکی کەم بەدی هات، ئەوەبوو کە لە مانگی قوربان دا گەڕانەوەو وەستان تا قوربان دوایی هات لەگەڵ چەند رۆژی مانگی موحەرەم. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بەوانەی کە هاتبوون بۆ حودەیبیە بە دەرچوون بۆ سەر خەیبەر کە دواترین مەڵبەندی بەتینی جولەکەکان بوو لەنیوە دورگەدا، جا لەو کاتەدا ئەو کۆمەڵە عەرەبە هاتنە پێشەوە، داوایان ئەکرد کە ماوەیان بدەن ئەوانیش لەگەڵیان بن، چونکە هیچ ترسی نەبوو بە هەنگوینی بێ مێشیان ئەزانی، پێغەمبەریش(ﷺ) بەرگری کردن وەکو ئەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ﴾ لەمەو پاش کاتێ ئەتانەوێ دەرچن و بڕۆن بۆلای چەند غەنیمەت و ماڵ و سامانێك بۆ ئەمەی دەستی خەن و وەری بگرن، لەو کاتەدا ئەو کۆمەڵە عەرەبەی کە باس کران پێتان ئەڵێن: لێمان گەڕێن و با شوێنتان کەوین، ئەوانە ئەیانەوێ بڕیارو فەرمودەی خوا بگۆڕن، واتە ئەو بەڵێنەی کە لە حودەیبیە دای بە گرتنی خەیبەرو بڕیاری غەنیمەتەکەی تەنها بۆ ئەو کۆمەڵە ئیماندارەی کە لە حودەیبیە پەیمانیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەیانەوێ ئەو بەڵێن و بڕیارە بگۆڕن و پێچەوانەی ئەوە بەدی بێت، ئەی پێغەمبەر تۆیش بڵێ: هەرگیز ئێوە لەگەڵمان نابن و شوێنمان ناکەون، واتە: نەیەن، ئا بەو جۆرە خوا لەمەوپێش فەرمویەتی. واتە بڕیاری خوایە کە ئێوە لەگەڵمان نەبن، ﴿فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا﴾ ئینجائەوانیش ئەڵێن: نەخێر بڕیاری خوا بەو جۆرە نییە، بەڵکوئێوە حەسادەتمان پێ ئەبەن، پێتان ناخۆشە بەشدار بین لەو غەنیمەتەدا.

ئەوان ئەو گومانە ناڕەوایەش ئەبەن بە ئیمانداران، ئەوا خوایش بەرپەرچیان ئەداتەوە ئەفەرموێ: ﴿بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ نەخێر وا نی یە بەڵکو ئەوان فامیان نی یەو هیچ تێ ناگەن کەمێك نەبێ لە کاروباری ئەم جیهانەیان.

ئەمانە لە حیکمەتی خوا تێ ناگەن، ئەو کەسەی کە پولەکی و چاوبرسی یەو لە پێناوی تەماع دا فەرمانی خوا ژێر پێ ئەکات، ئەو کەسە ماف ئەمەیە بێبەش بکرێ و بەوە سزا بدرێ، ئەو کەسەی دەست لە تەماع هەڵئەگرێ لە پێناوی خوادا ماف ئەوەیە کە تایبەتی بکرێ بە خەڵات و بەخششی گرنگەوە، کەواتە ئەوانەی چوون بۆ ئەو سەفەرە کە چاوەڕوانی نارەحەتی و زیانی لێ ئەکرا ئەبێ دڵخۆش بکرێن، ئەوانی تر بێبەش بکرێن.

قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾

**ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەواڵ بدات بەو کۆمەڵە عەرەبە کە لەمەوپاش تاقی ئەکرێنەوە بە بانگ کردن بۆ جەنگ لەگەڵ کۆمەڵێکی بەهێزدا، ئەفەرموێ: ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ﴾[1] بڵێ بەو کۆمەڵە عەرەبە کە لەمەو پاش بانگ ئەکرێن بۆ لای گەل و کۆمەڵێ کە لە جەنگ دا خاوەنی هێزێکی بەتینن، جەنگیان لەگەڵ ئەکەن یان موسڵمان ئەبن. واتە جەنگ کردن لەگەڵیان بەردەوامە تا موسڵمان ئەبن، ئیتر بارێکی تر نی یە بۆ ئەو کۆمەڵە: ﴿فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئینجا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی ئەبن ئەوا پاداشتێکی شیرینتان ئەداتەوە لە هەردوو جیهان دا، ئەگەر سەرکەشی ئەکەن و پشت ئەکەنە فەرمانی خوا وەکو لەمەوپێش بۆ چوونی حودەیبیە سەرکەشیتان کرد، ئەگەر بەو جۆرە ئەبن خوا سزاتان ئەدات بە سزایەکی بەتین. لەبەر ئەمە دیمەنی ئایەتەکە وا نیشان ئەدات کە پێویستە هەموو دەرچن بۆ ئەو جەنگەی کە بانگ ئەکرێن بۆی، ئەوا خوای خاوەن ڕەحم و بەزەیی ئەوانەی لێ بەدەرکردن کە توانای جەنگیان نی یەو بەهانەیان هەیە،**

---

[1] هەندێ بەم جۆرە تەفسیری ئەکەنەوە: بانگ ئەکرێن بۆ گەل و تاقمێ کە فەرمان دراوە بە جەنگ و کوشتاریان، ئینجا یان کوشتاریان لەگەڵ ئەکەن تا زاڵ ئەبن بەسەریان دا، یان بێ جەنگ و کوشتار موسڵمان ئەبن، بەڵام بە پێی خوێندنەوەی رستەی ﴿أو يسلمون﴾ منصوب بە ﴿إن﴾ ی بڕیار دراوە واتە ﴿أو يسلموا﴾، بە پێی ئەمە کە باوەڕ ئەبێ بەو جۆرە بێت کە لە تەفسیرەکەدا هەیە، زۆریەش بەو جۆرەیان فەرمووە، بە گوێرەی ئەوە مەبەست لەو کۆمەڵە یان هۆزی سەقیف و هەوازنن کە لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) یان بەنی حەنیفەو کۆمەڵی پاشگەزەکان لە ئایین لە چەرخی یەکەم خەلیفەدا، چونکە بێجگە لەوانە هەر تاقمێ تر کە جەنگی لەگەڵ دا کرابێت پاش هاتنی ئەم سوو ئایەتە، باری تریش هەیە بۆیان کە جزیە دانە، یان ئەگەر ستەی ﴿أو يسلمون﴾ تەفسیر بکرێتەوە بە گەردن کەچی بۆ ئیسلام، بە موسڵمان بوونیان یان بە جزیە دان وەکو بەو جۆرە وترا لە لایەن ئەو کەسانەوە کە ئەڵێن مەبەست بەو کۆمەڵە فارس یان رۆمە چونکە ئەمانە یەکێ لە سێ ڕێگایان هەبووە موسڵمان بوون یان جیزیە دان یان کوشتار.

لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ۞ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ هیچ گوناهو ئەرەجێ نی یە لەسەر کوێرو شەل و نەخۆش، واتە ئەمانە داوایان لێ ناکرێ بچن بۆ ئەو جەنگ و کوشتارەی کە ئەو کۆمەڵەی بۆ بانگ ئەکرێ، کوێرو شەل عوزرو بەهانەی هەمیشەیی یان هەیەو نەخۆشیش تا چاك ئەبێتەوە. ئینجا بەڵێن و هەڕەشەکە دووبارە ئەکاتەوە: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ هەرکەس گوێڕایەڵ ئەبێت بۆ خواو پێغەمبەری خوا، ئەو کەسە خوا ئەیخاتە ناو بەهەشتانێکەوە کە لەژێر کۆشکەکانی دا رووبارەکان هاتوچۆ ئەکەن، هەرکەس سەرپێچی ئەکات و پشت ئەکاتە فەرمانی خوا ئەو کەسە خوا سزای ئەدات بە سزایەکی پڕ پێش و ئازار. خوای گەورە بەم هەموو جۆرەو بەم هەموو شێوەو رێگایە دەرمان و چارەسەر پیشان ئەدات بۆ هەموو دەردو دایەکی دڵ و دەروون، رێگای رزگاری روون ئەکاتەوە بە جۆرێك هیچ کەس هیچ پەڵپ و بەهانەیەکی نی یە، دووچاری هەرچی ببێ گوناهو تاوانی خۆیەتی. لێرەدا بە دوای سورەتەکە هەواڵ و دەنگ و باسە لە ئیماندارەکان و قسە و باسە لەگەڵیان. لە یەکەم جارەوە باسی رێزو پایەو رادەی بەرزیان ئەکات لەسەر ئەو پەیمانە راستەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا بەستیان و مژدەیان ئەداتێ و بەڵێن ئەدا بە سەرکەوتن و دەستکەوتنی گرنگ ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ**

يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا * وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾[1] بەڕاستی خوا ڕازی بوو لە ئیماندارەکان لە و کاتەدا پەیمانیان لەگەڵ تۆدا بەست لەژێر درەختەکەدا، ئینجا خوا ئاگادار بوو بەسەر دڵسۆزی و ڕاستی دڵیان دا بەهۆی ئەوەوە ئارام و دامەزراوی باراند بەسەریان دا، پاداشتی دانەوە بە فەتحێکی نزیك کە بریتی یە لەو سوڵح و یەك کەوتنەی حودەیبیە کە قاپی هەموو فەتح و سەرکەوتنێکی کردەوە، هەروەها پاداشتی دانە بە چەند غەنیمەت و دەستکەوتێکی زۆر کە وەری ئەگرن، خوا هەموو کات زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هەموو کارو فرمانی ڕاست و بەجێیە، ئای لەو کاتە پیرۆزەی کە ئەم مژدە پیرۆزەی تیا داباری لە هەوری کەرەم و ڕەحمی خواوە بەسەر دڵ و دەروون و هەستی ئەو کۆمەڵە بەختیارەدا!! هەتا بیر بکرێتەوە لەو ڕادەو پایە بەرزو بەجێیە، مافی خۆیەتی: خوای گەورە کە پێویستی بە هیچ کەس نی یە، هەموو بوونەوەر خەریکە پارچە پارچە بێت لە ئاستی گەورەیی خوا، ئەو خوایە مژدەی ئاوا بدات لە گەورەترین پەڕاوی دا بە کۆمەڵێ لە بەندەکانی، ناوی ئەو شوێنە ببا کە ئەوان لێ ی بوون و شێوەو باریان باس بکات کە بە هۆیەوە شایانی مژدە بوون!! ئایا چ زمانێ، یان کام پێنووس بتوانێ ڕادەی گەورەیی ئەو مژدەیە و ئەندازەی ئەو شادمانی و خۆشی ئەو لوتفە گەورەیە ڕوون بکاتەوە؟!!

---

[1] لە هێنانی فرمانی ڕانەبردوودا دوو شت هەیە: ١.ئامادە کردن و هێنانە پێش چاوی ئەو شێوە شیرینەی پەیمان بەستنەکە. ٢.تازە بوونەوەی کات لەپاش کات. زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم فەتحە نزیکە گرتنی قەڵای خەیبەرە کە لە پاش گەڕانەوەیان ڕووی دا، هەندێ تر ئەفەرموون: مەبەست گرتنی شاری مەککەیە کە دووساڵی بەسەردا نەهات ڕزگار کرا، هەندێ تر ئەفەرموون: مەبەست گرتنی(هەجەر) ە زانینی تەواویش لای خوایە.

وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾

**ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە ئیماندارەکان و مژدەیان ئەداتێ: ﴿وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ﴾ [1] خوا بەڵێنتان پێ ئەدات بە چەند دەستکەوت و غەنیمەتێکی زۆر کە لەمەوپاش وەری ئەگرن، ئینجا پەلەی کرد بۆتان بە بەدی هێنانی ئەم دەستکەوتە، یان پێشەکی کە ئەم سوڵح و یەك کەوتنە کە بوو بەهۆی دەستکەوتەکانی تر، بەرگری دەست درێژیی خەڵکی کرد لێتان – واتە قورەیش – بۆ ئەمەی دووچاری هیچ زیانێ نەبن، ﴿وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ ئەمەی ئەم رووداوە – کە زۆر قورس و گران بوو لەسەر دڵ و دەروونی ئیماندارەکان لە یەکەم جارەوە – ببێتە بەڵگەیەکی روون بۆیان و بەهۆی ئەوەوە تێ بگەن کە خوا خێرو چاکەی ئەوانەی ویست، هەرخۆی پاشەرۆژی هەموو شت ئەزانێ، یارمەتی ئیماندارەکان ئەدات. ئەوبارەی پێغەمبەری(ﷺ) لەسەربووە ئەوە رێك و راست بووە، ئەمان هەڵە بوون، کەواتە ئیتر جارێکی تر سەرنەکەنەوە لە هیچ بریارێکی خواو پێغەمبەر(ﷺ): ﴿وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ هەروەها بۆ ئەمەی رێنموونیتان بکات و بتانخاتە سەر رێگای راست بەهۆی گەردن کەچی و گوێرایەڵیتان بۆ بریاری خواو پێغەمبەر(ﷺ).**

**خوای گەورە خاوەن بەزەیی یە بەو جۆرەی دڵنەوایی ئەو کۆمەڵە بەختیارەی کرد، ئەو بەڵێنە گرنگانەی پێدان، ئەوانیش پاش ئەوە بە شادمانی و خۆشی ژیان بە چاوەڕوانی بەدی هاتنی بەڵێنەکانی تری، مانەوە تا یەکە یەکە بە چاوی خۆیان هەموویان بینی، لە هەرکات وچەرخێکدا،هەرگەل وکۆمەڵێ وەکوئەوانەراست بکەن لەگەڵ خواوپێغەمبەردا(ﷺ) بێگومان خوا یارمەتی یان ئەدات، پاشەرۆژی بەختەوەری و سەرکەوتن هەر بۆ ئەو تاقم و کۆمەڵە ئەبێت، ئیتر زۆری پێ بچێ یان کەم، بە گوێرەی حیکمەت و زانینی خوا خۆی.**

---

[1] زۆر لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست وەرگرتن و دەستکەوتنی خەیبەرەو بەرگری کراوەکان جولەکەکانی خەیبەرو هاوپەیمانەکانیان، مەبەست بە دەستکەوت، یان بەرگری کردنەکە نیشانەی رێزیانە لای خوا یان لەسەر راستی پێغەمبەر کە بەڵێنی پێدان بە گرتن و دەستکەوتی خەیبەر کاتێ گەڕانەوە لە حودەیبیە، یان لەسەر دەستکەوتەکانی تر لەسەرگرتن و فەتحی مەککە، هەرجۆرێ بێت لەمانە هەر راستە، بەلاّم جۆری تەفسیرەکە بەهێزترە، چونکە رای ئیبن و عەباسە – خوا لێ یان رازی بێت –.

﴿وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾

---

**خوای گەورە بەڵێنی پێدان و منەتی نا بەسەریان دا بە بەرگری خەڵك لە دەست درێژیی بۆ سەریان، ئینجا بەڵێن ئەدات بە دەستکەوتی تر کە لە توانای ئەوان دا نەبووە، تەنها خوا خۆی فەراهەمی ئەمێنێ، ئەفەرموێ: ﴿وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا﴾[1] بەڵێنتان ئەداتێ بە فەتح و دەستکەوتی تر کە دەسەڵاتتان نەبوو بەسەری دا، لەمەو پێش یاخی بووە لە دەستتان، بەڵام خوا خۆی ئامادەی کردووەو بڕیاری داوە بۆتان و ئاسانی ئەکات لەسەرتان بێ ئەرك و بێ جەنگ، ئەویش کە بریتی یە لە گرتنی شاری مەککە کە ڕووداوی حودەیبیە گرنگ ترین هۆ بوو بۆی، ئەو مەککەیەی کە سەرکەشترین بوو لەسەر ئیماندارەکان. ئەو مەککەیەی کە لەمەوپێش دووجار پەلاماری داو هاتە سەر موسڵمانەکان، خوا خۆی چارەسەری کرد، ئەو مەککەیەی کە لە ساڵی حودەیبی یەدا بەرگری یان کرد لە زیارەتی کەعبە، ئەو مەککەیەی کە بەرهەڵستێکی زۆر بەهێزبوو لە بەردەمی ئایینی خواو ئیماندارەکان دا، ئەو مەککەیە خوا بە سووك و ئاسانی سەرشۆڕو گەردن کەچی کرد بۆ ئایینەکەی خۆی، ڕزگاری کردن لە تاریکی شەوی ڕەشی کوفرو بت پەرستی، ئەم شتانە بۆ خوا هیچی تێ ناچێت، چونکە خوا هێزو توانای هەیە بەسەر هەموو شتێك دا.**

**لەپاش ئەو هەموو مژدەو بەڵێنە گەورەو گرنگانە، بە تەواوی دڵی ئیماندارەکان پاراو ئەکات بەمەی کە لایەن خواوە یارمەتی دراون، ئەو سوڵح و یەك کەوتنە لەبەر بێ هێزی و بێ**

---

[1] بۆ ڕوون کرنەوەی مەبەستی ئەم ئایەتە چەند رایەکی تر هەیە: ١.گرتنی خەیبەر. ٢.گرتنی فارس و ڕۆم. ٣.هەموو فەتح و دەست کەوتێ کە لەوەو پاش بۆ موسڵمانان ڕووی دا. ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە زیاتر جێگای باوەڕە، چونکە گرنگترەو بێ ئەرك و شەڕیش بە دەست هات.

دەسەڵاتی ئەمان نەبوو هەروەکو لەبەر بێ هێزی و دەسەڵاتداری بت پەرستەکان نەبوو، بەڵکو ئەمە شتێك بوو خوا فەراهەمی هێنا لەبەر چەند حیکمەت و بەرژەوەندی یەك کە هەندێکمان لەمەوپێش باس کرد، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا * سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ ئەگەر ئەوانەی کە کافرن جەنگیان لەگەڵ دا بکردنایە بێگومان ئەشکان و روویان وەرئەگێڕاو رایان ئەکرد. دوای ئەوە نە دۆستێکیان دەست ئەکەوت پاسیان بکات و نە یارمەتی دەرێ یارمەتی یان بدات، خوا باوو رەوشتی خۆی بەو جۆرە دامەزراندووە، باوو رەوشتێ کە تێپەڕی کرد لەمەوبەر لەگەل و ئوممەتە رابردووەکان دا بەمەی کە حەقی بەرز کردووەتەوە بەتاڵی ژێر خستووە لەکاتی دیاریی کراوی خۆی دا، دەست ناکەوێ هیچ جۆرە گۆڕانێ

بۆ باوو رەوشتی خوا، واتە ئەوەی خوا ویستوویەتی و ئەیەوێ تەنیا ئەوە بووەو ئەبێ.

لە پێشەوە باسمان کرد کە چل پەنجا کەس لە قورەیش هاتن بۆ ئەوەی بە دزی یەوە دەستێ لە کۆمەڵی ئیمانداران بوەشێنن، بەڵام خوای گەورە کارێکی وای کرد ئەوانە هەموو بە دیل گیران، هێنرانە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لێیان بوردو فەرمانی دا بە بەرەڵا کردنیان، جا لێرەدا ئەوەیان بیر ئەخاتەوە و پێ یان رائەگەیەنێ کە ئەوە شتێ بوو خوا فەراهەمی هێنا بێ زیان و کوشتار، خوا ئەوەیان بیر ئەخاتەوە تاکو هەموو کارو فەرمانەکانیان بگێڕنەوە بۆلای خوا، لە هەموو شتێك دا گەردن کەچ و گوێڕایەڵ بن بۆ خواو بە رێکی لەکارکردنی دەستی قودرەتی خوا تێ بگەن، تێ بگەن لەوەی کە هەرچی خوا ئەیکات هەر ئەوە چاکە، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ خوا کەسێکە کە بەرگری دەستی ئەوانی کرد لە ئێوە، واتە ماوەی نەدان زیانتان پێ بگەیەنن، بەرگری ئێوەیشی کرد لەوان لەناو جەرگەی مەککەدا — ئەو شوێنە بەشێکە لە حەرەمی مەککە — لەپاش ئەوەی ئێوەی زاڵ کرد بەسەریان داو بەدیل خستنی یە ژێر چنگتان، خوا هەموو کات بینایە بە ئەو شتانەی ئێوە ئەیکەن.

ئینجا هەواڵ ئەدات بە ئیماندارەکان دەربارەی دوژمنەکانیان کە لای خوا چۆنن، چۆن سەیری کردەوەکانیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ هەر ئەوانەی کە ئاژاوەیان هەیە لەگەڵتان و بەو جۆرە بەربەرەکانێ و دوژمنایەتی ئەکەن، ئەوانە باوەڕیان نەهێناوە بە ئایینی خواو کافرن. واتە ئەوەندە ڕۆچوونەتە خوارەوە لە کوفرو بێ باوەڕی دا وەکو ئەو سیفەتە خراپە هەر بۆ ئەوان بێت، هەر ئەوان شایانی ئەوەبن کە لەوە لەکەدار بکرێن[1].

دەربارەی بیروباوەڕ تانەیان لێ ئەدات، بە کوفر لەکەداریان ئەکات، کە ئەمە پیسترین تاوان و بێزراوترین لەکەیە لای خوا، بنەڕەتی هەموو خراپەیەکە، لەبابەت کردەوە تاوانباریان ئەکات بە گوناهێکی یەکجار گەورە لای خۆیان و لای هەموو ئایینێ کە ناویان بیستبێ لە حەزرەتی ئیبراهیمەوە تا دێتە سەر خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾ بەرگری ئێوەیان کرد لە زیارەتی ماڵی خوا، هەروەها بەرگری ئەو(هدی) یەی کە بەند کراو ڕاگیر کراوە، بەرگری یان کرد لەوەی بگاتە شوێنی دیاریی کراو بۆ سەربڕینی کە خاکی(مینا) یە. [2] کەواتە ئەوانە ئەوەندە تاوانبار بوون شایانی ئەوە بوون کە خوا فەرمان بدات بە جەنگ و کوشتاریان، موسڵمانەکان زاڵ بکات بەسەریان دا تا بنەبڕیان بکەن، بەڵام بەو جۆرە بە یەك کەوتن و بێ کوشتارو زیان ئەو بەسەرهاتەی دوایی پێ هێنا، لەبەر ئەوە لە مەککەدا چەند موسڵمانێك هەبوو لەپیاو و ئافرەت کۆچیان نەکردبوو، کەواتە ئەگەر جەنگ ڕووی بدایە ئەوانیش پێوە ئەبوون، هەروەها لە تاقمی کافرەکان دا چەند کەسێ هەبوو کە بێنە سایەتی ڕەحمەتی خواو ئیمان بهێنن.

---

[1] ئەم ڕستەیە بە گوێرەی ڕێزمانی عەرەبی بۆ(حصر) ە لەبەر ئەوە یەکەمجار بە شێوەی(حصر) تەفسیرمان کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کە کافران تەنیا بریتی نین لەو کۆمەڵە، کەواتە(حصر) ەکە بۆ موبالەغەیە، لەبەر ئەوە لە پاشان دیمەنەکەم گۆڕی.

[2] ﴿هدی﴾ بەو حوشترو ماڵاتانە ئەڵێن کە لە وڵاتانەوە دیاریی ئەکرێن و ڕەوانە ئەکرێن بۆ مەککە تا لە مینادا سەربڕبڕێن و بدرێن لە ڕێگای خوادا. لێرەدا مەبەست لەو حەفتا حوشترە بوو کە لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) دیاریی کران و هێنران، لە حودەیبیەدا بەرگری کران.

﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَاءٌ مُّؤْمِنَاتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَئُوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌ بِغَيْرِ عِلْمٍ لِّيُدْخِلَ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَىٰ وَكَانُوا أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا﴾

---

**لەبەر ئەم دوو هۆیە خوا بەرگری دەستی موسڵمانانی کرد لەو تاوانبارانە وەکو لێرەدا بۆمان روون ئەکاتەوە:** ﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَاءٌ مُّؤْمِنَاتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَئُوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌ بِغَيْرِ عِلْمٍ لِّيُدْخِلَ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ﴾ **ئەگەر لەبەر چەند پیاوێکی ئیماندارو ئافرەتێکی ئیماندار نەبوایە لەناو کۆمەڵی بت پەرستەکانی مەککەدا بوون لێرە نەتان ئەناسین، ئەگەر جەنگ رووی بدایە بە نەزانین لەگەڵ ئەمانیش دا ئەمانیشتان ئەکوشت و پێشێلتان ئەکردن، بەهۆی ئەوەوە لە لایەنی ئەو ئیماندارانەوە زیان و ناخۆشی دووچارتان ئەبوو، بەداخ و مەراق بۆ خواردن، خوێن و کەفارەت دان، تانەو تەشەری دوژمن لەسەر کوشتنی ئو ئیماندارانە، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە خوا دەستی ئێوەی نەئەگرت لە کوشتنی ئەو بت پەرستانە، بەڵام دەستی ئێوەی گرت و بەرگری کردن بۆ ئەمەی هەرکەسێکی بوێ لەو کەمەڵە بیخاتە ناو رەحمەتەکەی خۆی، واتە رێنموونی بکات و یارمەتی بدات تا موسڵمان ببێ:** ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ **ئەگەر جیابوونایەتەوەو ئاوا تێکەڵ نەبوونایە، بەڕاستی ئەوانەیان کەکافربوون سزامان ئەدان بەسزایەکی ئێش و ئازار دەر، بە کوشتن و بەدیل گرتن.**

**ئینجا باسی دڵ و دەروونی خراپیان ئەکات لە پاش ئەوە باسی بیرو باوەڕی خراپ و کردەوەی کردن، ئەفەرموێ:** ﴿إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ [1] **باسی ئەو**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: وشەی ﴿إذ﴾ زەرفە بۆ وشەی ﴿عذبنا﴾. هەندێ تر ئەفەرمون: بۆ وشەی ﴿صدوركم﴾. بەڵام ئەم دووەمە لەبەر دووری یەکەی بە دوور دائەنرێ.

کاتە بکە ئەوانەی کە کافر بوون تەکەبورو کینەو بوغزی بەتینیان خستبووە دڵی خۆیانەوە، تەکەبورو کینەی نەفامانەی بێ جێ، واتە بە هۆی ئەوەوە عینادو سەرکەشییان بەکارهێنا لەکاتی نووسینی نامەی یەك کەوتنەکەدا، ئەوەبوو رایان نەبوو ﴿الرحمن الرحیم﴾ و ﴿رسول الله﴾ بنووسرێ، وەك ئەو تاوانە زۆر گەورەیان کرد. بەرگری کردنی پێغەمبەرو یارەکانی لە زیارەتی ماڵی خوا، بەمە رێزی ماڵی خوایان شکاند کە لە سایەو پەنای دا بە ئارامەوە ئەژیان، هەروەها رێزی ئەو مانگانەیان نەگرت، بەرگری ئەو حوشترانەیان کرد تا بگەنە جێگای خۆیان و بکرێن بە خێرو رێزیان شکاندن.

ئەو هەموو تاوان و سەرکەشی و نالەباری یەیان بەکارهێنا، بەڵام خوا ئیماندارەکانی پاراست، لەباتی ئەو بەدخویی و بەد کرداریيە ئەمان بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا﴾[1] ئینجا خوا ئارامی و دامەزراوی هێنایە خوارەوەو رشتی بەسەر پێغەمبەرەکەی و ئیماندارەکان دا، هانی دان بۆ وشەی پەرستنی خوای تاك و تەنیا و خاوێن کردنی دڵ و دەروون بۆی و ترس و سام لێ ی، نووساندنی بەو وشەیەوەو نەیهێشت لێ ی ببنەوە، لای خوا ئەوانەی لە هەموو کەس شایاتر بوون بۆ ئەو وشەیە و ئەهل بووی بۆی، بەهۆی ئەوەوە سەرکەشییان نەبوو لە هیچ فەرمانێکی خواو پێغەمبەر(ﷺ) هەموو خۆشەویستی و کینەیان بۆ خوا بوو نەك لەبەر خۆیان، گەردن کەچ ئەبوون بۆ هەر شتێ کە رەزامەندی خوایان تیا بەدی بکردایە. بێگومان ئەمە وەسف و سەنایەکی یەکجار بەنرخە لە لایەن پەروەردگارەوە، ئاشکرایە خۆی ئەزانێ شایانی ئەوەن،

---

[1] وشەی ﴿کلمة التقوی﴾ بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە: ١.بسم الله الرحمن الرحیم – محمد رسول الله. ٢.لا إله إلا الله وحده لا شریك له. ٣.لا إله إلا الله و الله أكبر. ٤.لا إله إلا الله. ٥. لا إله إلا الله محمد رسول الله. ٦.بسم الله الرحمن الرحیم. ٧.لا إله إلا الله وحده لا شریك له له الملك و له الحمد و هو علی كل شيء قدیر. ٨.دامەزراندن و پەیمان بردنە سەر.

وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ

---

**﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ خوا هەموو كات ئاگادارە بە هەموو شتێك. لەمەوپێش باسمان کرد کە ئیماندارەکان لە مەدینەوە بەرەو مەککە بە دڵخۆشی یەوە هاتن، شادمان بوون بەو خەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دیبووی، زۆر دڵنیا بوون لە بەدی هاتنی لەو سەفەرەدا، لە پاشان زۆر بە توندی دڵنیایان ئەکات کە ئەو خەوە راستەو لەلایەن خواوە بووە، بێگومان دێتە دی، جارێ لە پێشەوە شتی گرنگتر هەیەو خۆی ئەزانێ و ئەوان نازانن، ئەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾ سوێند بەخوا بە تحقیق خوا راستی کرد لەگەڵ پێغەمبەرەکەی دا لەو خەوەی دا کە بینی بە حەقیانەت، چونکە ئەوەی کە بینی لەو خەوەیدا لەکاتی تایبەتی خۆیدا بەدی دێت، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾ سوێند بەخوا بە تحقیق بە ئاسایشەوە، بێ ترس و بیم ئەچنە ئەوماڵی خوا کە پێی ئەوترێ: ﴿المسجد الحرام﴾ ئەگەر خوا بیەوێ بە جۆرێك لەپاشان سەرتان ئەتاشن و کورتی ئەکەنەوە، واتە پاش ئەو چوونە هەندێکتان سەرتان ئەتاشن و هەندێکتان کورتی ئەکەنەوە، کە ئەو عیبادەتە بەو سەرتاشین یان سەر کورت کردنەوەیە کۆتایی دێت، لەو چوون و مانەوەدا هیچ ترسێکتان نابێ.**

**ئاشکرایە کە بەڵێنی خوا راستەو بە هیچ جۆر ناگونجێ کە بەدی نەیەت، کەواتە هێنانی رستەی ﴿إن شاء الله﴾ بۆ گەیاندنی گومان و دوو دڵی نی یە، بەڵکو بۆ تەمێ کردنی بەندەکانی خوایە تا هەموو کارو فەرمانێ ببەستن بەویستی خواوە، تاکو دڵ و دەروونیان ئارام بگرێ و دامەزرێ کە مەیل و ویستی خوا لەسەر هەموو شتێکەوەیە. هیچ شتێك سەرپێچی لێ ناکات[1].**

---

[1] ئەو رستە هەندێك جار تەنیا لەبەر پیرۆزی ئەوترێ، بۆ پیرۆز کردنی ئەو کارە بەناوی خوا، چەند رایەکی تریش هەیە: ١.بەهۆی ئەو کەسانەوە هاتووە کە ئەو زیارەتەیان بۆ نەبووە لەبەر مردن یان شتێکی تر. ٢.گێڕانەوەی وتەی ئەو فریشتەیە کە لە خەودا بە پێغەمبەری فەرموو. ٣.گێڕانەوەی وتەی پێغەمبەرە کە فەرموی بە یارەکانی.

فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾

پێغەمبەر لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا ئەو خەوەی بینی، لەساڵی حەوتەمی کۆچیدا بەدی هێنا، چونکە خۆی ئەزانێ چی شایانی پێشخستنە و چی دواخرێ چاکە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ خوا شتێکی زانیوە کە ئێوە نەتانزانیوە، واتە زانیویەتی کە چاکەو حیکمەت لەوەدایە ئەو ساڵە نەچنە مەککە، لەبەر ئەوە ئەو چوونەی دواخست، لە پێشەوە فەتحێکی نزیکی فەراهەم هێنا کە بریتی یە لە سوڵحی حودەیبیە. [1]

بە جوانی ئەزانم لێرەدا باسی بەدی هاتنی ئەو بەڵێنە بکەم کە لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بەدی هات: لەمانگی(ذي القعدة) دا پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ساڵی پێشوو خۆی و ئەو کۆمەڵە لە مەدینە دەرچوون بەرەو مەککە بە نیازی عومرەوە لە(ذو الحليفه) دا واتە(بیری عەلی) ئیحرامیان پۆشی وەکو ساڵی پێشوو چەند حوشترێکیان دیاریی کردو لەگەڵ خۆیان بردیان تا لە مینا سەر ببڕێن و بکرێن بە خێر. بە ﴿لبيك اللهم لبيك﴾ ڕۆیشتن تا نزیکی(مر الظهران) لەوێدا محمدی کوڕی حەکەمەی خستە پێشەوە لەگەڵ سوارەکان داو ئەو چەکانەی کە پێ یان بوو، قورەیش ئەم سوارو چەکانەیان بینی ترسێکی زۆریان لێ نیشت و لایان وابوو کە پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی شکاندووەو بۆ جەنگ هاتووە، ئەو تاقمەی کە ئەم گومانەیان برد گەڕانەوە بۆ مەککەو هەواڵیان دا بە دانیشتوان.

کە گەیشتنە(مر الظهران) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا لەوێدا خستیان، جگە لە شمشێر هەموو چەکێکی تری نارد بۆ یاجیج و بە شمشێری رووت لە کێلان دا – بە گوێرەی پەیمان – ڕۆیشتن بۆ مەککە. پێش ئەوەی بگەنە مەککە قورەیش موکریزی کوڕی حەفصیان نارد وتی: ئەی محمدتا ئێستا تۆمان نەناسیوە بە پیاوێك کە پەیمان بشکێنی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: کوا شتی وا بووە؟ ئەویش وتی: بەتیرو کەوان و رمەوە هاتووی، ئەویش وتی: شتی وا نەبووە. ئەو چەکانەمان ناردووە بۆ یاجیج، ئەویش وتی: ئێمەیش تۆمان هەر بەو جۆرە بەوەفا دیوەو ناسیوە.

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست فەتحی خەیبەرە، زانینی تەواو لای خوایە.

سەرۆکەکانی قورەیش لە مەککە دەرچوون، لە داخ و کینەو مەراق دا چاویان بەرایی نەئەهات پێغەمبەرو یارەکانی ببینن، بەڵام دانیشتوانی مەککە بە پیاوو ئافرەت و منداڵەوە لەرێگاوسەربانیماڵەکانیان دانیشتن بۆ تەماشا کردنی پێغەمبەرو یارەکانی. پێغەمبەر(ﷺ) بە سواری حوشترەکەی کە ناوی(قصوا) بوو – ئەوەی کە ساڵی پێشوو ئەژنۆی دادا لە حودەیبییەدا چونکە ماوە مابوو، بەڵام ئەمساڵ کە کاتی خۆی بوو – بێ گیرو گرفت هاتە ناو شاری مەککەویارەکانی بەشوێنی دا بە دووبارە کردنەوەی دروشمی ﴿لبيك اللهم لبيك﴾ەوە.

ئا بەو جۆرە خەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەدی هات لە ساڵی دووەمی پەیمانی حودەیبییەدا، لەساڵی دوای ئەوەدا فەتحی گەورە رووی دا، ئاڵای ئیسلام بەسەر مەککەدا بەرز بووەوە، جگە لە ئایینی خوا هیچ دروشم و نیشانەیەکی تیادا نەما، پاش ئەوە ئاڵای ئیسلام بەسەر هەموو نیوە دورگەدا بەرز بووەوە.

ئینجا بەڵێنی گەورەو دواترین مژدەی هەرە بەرز بەدی هات، کە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ خوا کەسێکە کە پێغەمبەرەکەی خۆی محمدی رەوانە کردووە بە رێنموونی کردنەوە بۆ رێگای راست، هەموو شتێکی خێرو چاك و بە ئایینی حەق و راستەوە، بۆ ئەوەی ئەم ئایینە راستە بەرزو بڵند بکاتەوە بەسەر تیرەی ئایین دا هەمووی، خوا بەسە بۆ شایەتی لەسەر ئەوەی کە بەڵێنەکەی راستەو بەدی دێت، یان شایەت لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەی.

خوای گەورە وەکو ئەم بەڵێنەی دا بەدیشی هێنا لە زۆربەی وڵات و ئاوەدانی سەرزەوی دا پێش ئەوەی نیو چەرخی بەسەردا تێپەرێت. ئەم ئایینە سەرکەوت بەسەر ئیمپراتۆریەتی کیسراو زۆربەی ئیمپراتۆریەتی قەیسەردا، سەرکەوت تا گەیشتە هیندو چین و مەلایرو ئەندەنوسیاو شوێنەکانی تری خواروی ئاسیا، هەروەها ئەم ئایینە سەرکەوت و بەرز بوویەوە بەسەر هەموو ئایینێك دا پەرەی سەند – تەنانەت پاش کشانەوەیشی لەرووی رامیاری یەوە – لەبەشی زۆر لەو وڵاتانەی کاتی خۆی موسڵمانان گرتیان بە تایبەتی لە ئەوروپاو دورگەکانی دەریای ناوەراست دا.

ئەم ئایینە دوای لاواز بوونی هەڵگرەکانی هەر پەرەی سەندو بەرز بووەوە بەسەر ئایینەکان دا بێ کۆمەك و تۆپ و تەیارەو دەبابە. هەتا بێت بەرز ئەبێتەوە بەسەر هەموو ئایین و بیرو باوەرێك دا بەهۆی ئاشکرا بوونی راستی ئەم ئایینەوە، چونکە ئەم ئایینە لەخۆی دا بەهێزەو هەر بە سروشتی خۆی ئەروات و بڵاو ئەبێتەوەو پەرە ئەسێنێ چونکە

ڕێکە لەگەڵ سروشتی ئادەمیدا، بە سووك و ئاسانی و بێ گیرو گرفت دان ئەنێ بە پێویستی گیان و لەش و ژیری و دڵ و دەروون دا لە سنووری ڕێك و راستی و ژیریی دا، هەروەها پێویستی ئاوەدانی و شارستانی و پێشکەوتن و پێویستی هەموو تاقم و چینێ لە دانیشتوانی زنج و دەوارەوە هەتا دانیشتوانی خانووە سەر لەهەور دەرەکان، بەڵکو هەتا بێت روون ئەبێتەوە کە تەنها ئەو بەرنامەی ئەم ئایینە هێنای دوورە لە هەموو لاری و لەکەیەك، تەنها ئەم ئایینە دەسەلأتی هەیەو ئەگونجێ لە هەموو بارو روویەکەوە جڵەوی ژیان بگرێتە دەست و بەرێکی بیبات بەرێوە.

قورئان لەچەندرووییەکەوە موعجیزەیەو نیشانەیە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) یەکێ لەوانە ئەو هەواڵە غەیبی یانەیە جگە لەخوا کەسی تر نەیزانیوە. لەم سورەتەدا بە لای هەندێ لەو هەواڵانەدا رابوردین، بەجوانی ئەزانم لێرەدا بیانهێنمەوە یادو پێش چاو:

١- ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ بە هەر جۆرێك بێ هەواڵێکی غەیبی تێدایە، چونکە ئەگەر مەبەست بەم فەتحە فەتحی مەککە بێت یان فەتحەکانی تر ئەوە ئاشکرایە. ئەگەر مەبەست پێ ی ئەو یەك کەوتن و سوڵحە بێت وەکو لە تەفسیرەکەدا لەسەری رۆیشتن هەر هەواڵێکی غەیبی یە، چونکە هیچ کەس نەیئەزانی کە ئەو بەسەرهاتە ئەوەندە گرنگ ئەبێ و سەری لەو هەموو خێرو بێرەوە دەرئەچێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆربەی ئیماندارەکان بە سەرشۆڕی تێگەیشتن، بەلأم ناچار بوون.

٢- هەواڵی تر لە ئایەتی ١١ و ١٣ دا لە عوزر هێنانەوەو بەدگومانی و بە درۆ خستنەوەی ئەو تاقمە عەرەبانەی کە خۆیان دواخست لە سەفەری حودەیبیە.

٣- هەواڵی تر لە ئایەتی ١٤ دا دەربارەی داواو قسەو نیازیان.

٤- لە ئایەتی ١٥ دا هەواڵی ئەمەی کە لەمەوپاش ئەو کۆمەڵە بانگ ئەکرێن بۆ جەنگ کردن لەگەڵ ئەو لەشکرە بەهێزە کە باسی فەرموو، ئەو بانگ کردنە بەدی هات، وەکو لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا باس کرا.

٥- ئەو بەڵێنانەی کە لە ئایەتی ١٩ و ٢٠ دا هەن.

٦- بەڵێنی بەدی هێنانی خەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئایەتی ٢٦ دا.

٧- بەڵێنی سەرخستن و بڵند کردنەوەی ئایینی خوا لە ئایەتی ٢٧ دا.

ئینجا کۆتایی بە سورەتەکە ئەهێنێ بە باسی وێنەو شێوەی گرنگی پێغەمبەرو یارەکانی، ئەو وێنەو شێوەیە کە لە تەورات و ئینجیل دا باس کراوە.

﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ﴾

یەکەم جار بە باس کردنی سیفەتی پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) دەست پێ ئەکات، ئەوسیفەتەی کە بت پەرستەکانی قورەیش دانیان پیادا نەئەناو نوێنەرەکەیان سوهەیلی کوڕی عەمر بەرگری کرد کە بنووسرێ لە نامەی سوڵحەکەدا: ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ﴾[1] محمد پێغەمبەری خوایە. بێگومان شایەتی دانی خوا لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) وەسف و سەنای بەم سیفەتە بالآترینی هەموو شتەو ئیتر هیچی تری ناوێ، چونکە کاتێ ئەم سیفەتەی هەبوو ئیتر ئەبێ گەیشتبێتە پۆپەو ئەوپەڕی رادەی هەموو خووڕەوشت و سیفەتێکی پاك و بەرزو شیرین، ئەبێ دوور بێ لە هەموو گەردو لەکەیەك کە رادەی ئادەمێتی پێ پەست ئەبێت، بەهۆی ئەم سیفەتەوە رادەی ئەو کۆمەڵە ئیمانداره ئەوەندە بەرز بووەوە کە خوا لە تەورات و ئینجیل و قورئان دا بەو جۆرە سەنایان بکات و رێزیان نیشان دا. کەواتەئەو رێزو سەنا بەرزەی ئەو کۆمەڵە بەختیارە هەر ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنی ئەو سیفەتە.

خوای گەورە وێنەو شێوەی ئەو کۆمەڵە روون ئەکاتەوە لە چەند بارو روویەکەوە، بە چەند وشەو وتارێك بەو رەوشتە قورئانی یەی کە لە توانای هیچ کەس دا نی یە لاسایی بکاتەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ ئەو کەسانەی کە لەگەڵ محمددان، واتە باوەڕیان پێ هێناوەو پەیڕەوی ئەکەن، ئەوانە بەم جۆرەی خوارەوەن:

١- ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾ زۆر بە تین و دڵ رەقن بەرامبەر کافرەکان، لەگەڵ ئەوەیش دا باوکو براو خزمیانی تێدا بوون، بەڵام ئەبێ هەموو پەیوەندی یەك ژێر پێ بکرێ لە پێناوی

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ئەوە رستەیەکی تەواوی سەربەخۆیە شایەتی لەسەر دراوە کە روون ئەکاتەوە، بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەو دوو جۆرە نابێتە رستەی تەواو: ١.محمد خەبەرە بۆ مبتدایەکی لابراو ﴿رسول الله﴾ سیفەتە بۆی. ٢.محمد مبتداو رسول الله بۆی و ﴿والذين آمنوا﴾ عەتفە بۆ محمد و خەبەرەکەیان أشداوە.

پەیوەندی باوەڕدا. پێویستە لەسەر ئیماندارەکان خۆشەویستی و دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنانی باوەڕو ئایینەکەیان دا بەکار نەهێنن، خۆ ئەگەر وانەبێ باوەڕو کردەوەکانیان وەرناگیرێ، ئەم مەبەستە چاکتر روون ئەبێتەوە لە چەند ئایەتێکی سورەتی ﴿المجادلة﴾ دا کە بە ویستی خوا لەوێ بە درێژتر باسی ئەکەین. ئەمە سەنگی مەحەك و بەڵگەی بەهێز لەسەر ئیمان، بێگومان ئەگەر ئەم سیفەتە زۆر گرنگ نەبووایە پێشی سیفەتەکانی تر نەئەکەوت.

٢- ﴿رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾ دڵ نەرم و خاوەن بەزەیین لەنێوان خۆیان دا، واتە هەرچۆنێ رق و کینەیان لەبەر خوایە هەروەها نەرمی و سۆزو خۆشەویستیشیان هەر لەبەر خوایە، نە لەبەرخۆیانە، نە لەبەر کەسی تر.

٣- ﴿تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا﴾ ئەیانبینی لە رکوع و سوژدەدان. ئەم رستەیە وا پیشان ئەدات ئەوە شێوەیەکی هەموو کاتی بووبێت بۆ ئەو کۆمەڵە، بە جۆرێك هەرکەس سەرنجیان بدات بەو شێوە ئەیانبینی. دیارە ئەوە مەبەست نی یە، بەڵام کڕنوش و سوجدە عیبادەت و پەرستنی خوا نیشان ئەدات کە ئەوەیش حاڵەتێکی دامەزراوی راستەقینە بووە لە دڵ و دەروونیان دا، وەکو هەموو کات هەر سەریان لە رکوع و سوژدەدا بووبێت. بێجگە لەوەیش بە شەوو بە رۆژ ئەوەندە خەریکی نوێژ ئەبوون و زۆربەی کاتی خۆیان لەوەدا بەخت ئەکرد وەکو بارو حاڵێکی هەمیشەیی بووبێت وابووە.

٤- ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ﴾ مەبەست و نیازیان لە کردەوەکانیان دا خوایەو داوای پاداشت و فەزڵ و رەزامەندی خوا ئەکەن. کەواتە هەرچۆنێ بە دیمەن گوێڕایەڵ و خواپەرستن هەروا دڵ و دەروون و هەستیشیان لەگەڵ خوادایە.

٥- ﴿سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾ نیشانەو دروشمی تایبەتی خۆیان لە روو دەم و چاویان دایە، کاتێ سەرنج بدرێن هەست بەو نیشانەیە دەکرێت، کە ئەویش لە بەرهەمی خوا پەرستی یەکەیانەو بەهۆی ئەوەوە بۆیان پەیدا بووە.

﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾﴾

مەبەست بەو شێوەیە رووناکی یەکی ناوچاوانەو زەرە شیرینی یەکە دوور لە کەشخەو تەکەبور، شێوەی لەسەر خۆیی و نەرم و نیانی و شەرم و ئەدەب پەیدا ئەبیٚ بۆ ئەو کەسانەی کە دڵیان لای خوایە. مەبەستی ئەوەیە نەك مەبەستی خاڵ و نیشانەیە لەناوچاوان دا بەهۆی زۆر سوجدە بردنەوە – وەکو هەندیٚ وایزانیوە – ئەوە راست نی یە وەکو مجاهد فەرموی: بە منصور – کە بەو جۆرە گومانی بردبوو – فەرمووی: ئەو خاڵ و نیشانەیە لەوانەیە لە رووی کەسێك دا پەیدا ئەبیٚ کە دڵی لە دڵی فیرعەون رەق ترە، کەواتە چۆن ئەکریٚ بە نیشانەی ئیمانداری و راستەقینەی وەکو ئەو کۆمەڵە بەرزە. ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ﴾[1] ئەوانەی کە باس کران سیفەت و نیشانەی نایابی ئەو ئیماندارانەیە کە خوا باسی فەرمووە لە تەورات دا، بەو جۆرە ناوونیشانی هەڵداون و مژدەی داوە بە جیهان بۆ پەیدا بوونیان بە چەند هەزار ساڵ پێش هاتنیان بۆ جیهان. ﴿وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ﴾ وێنەو سیفەتیان لە ئینجیل دا ئەمەیە: ﴿كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ﴾ وەکو کشتوکاڵ و چێنراوێك وان کە چەکەرەو چرۆو وەچەی دەرکردبیٚ، ئینجا بە هێزی کردبیٚ تا قایم و ئەستوور بووبیٚ، ئینجا بە رێکی وەستابیٚ لەسەر ساقەکەی بە جۆرێك کشتوکاڵ کەرەکان سەرسام بکات لە نایابی و جوانی و شیرینی و پڕی و ئەستووری دا.

---

[1] بە دوو جۆری تر ئەم ئایەتە تەفسیر کراوەتەوە: ١.وشەی ﴿وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ﴾ عطفە بۆ ﴿مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ﴾. وشەی ﴿ذَٰلِكَ﴾ هێمایە بۆ ئەو سیفەتانەی پێشوو. واتە لە تەورات و ئینجیل دا ئەو سیفەت و نیشانە پێشوانەیان بۆ باس کراوە، ئەو کاتە رستەی ﴿كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ﴾ سەربەخۆیەو وێنەیەکی ترە قورئان بۆیان ئەهێنێتەوە. ٢.وشەی ﴿ذَٰلِكَ﴾ هێمایە بۆ نادیارییەکی رستەی ﴿كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ﴾ واتە وێنەیان لە تەورات و ئینجیل دا ئەمەیە کە لەم رستەیەدا. بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە دڵ باشتر بۆی ئەڕوات.

خوای گەورە لە ئینجیل دا مژدەی داوە بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) و کۆمەڵە بەختیارەکەی، وێنەی هێناوەتەوە بۆ ئەو کۆمەڵە بە پارچە کشتوکاڵی کە یەکەم جار کەم و بێ هێزو لاوازە، ئینجا بەرە بەرە زۆر بەهێز ببێ تاوای لێ دێ خەڵکی سەرسام بکات لە زۆری و پڕی و بەهێزیی دا، ئەم وێنەیەیان بۆ ئەهێنێتەوە: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ﴾ بۆ ئەمەی بەمان داخ و مەراق بدات بە کافرەکان کە بەم جۆرە خوا ئەو کۆمەڵەی ئەوێ، ئەم وێنە شیرینەیان بۆ ئەهێنێتەوە: ئای چەند وێنەیەکی رێك و راستە، ئەو کۆمەڵە لە یەکەم جارەوە کەم و بێ دەسەلآت و بێ نرخ تەماشا ئەکران، لەپاشان ئەوە بوو بەو جۆرە زۆر بوون و هێزو دەسەلآت کەوتە لای ئەوان. بە جۆرێك تا ئێستایش زانایان سەریان سوڕماوە لەو کۆمەڵە لە هەموو بارو روویەکەوە. بەڵێ ئەو تۆوە پاکە دەستی قودرەتی خوا چاندی بۆ ئادەمیێتی، تا سەر لە نوێ سەوز ببێتەوە پاش ئەوەی وشك و برین و بە تەواوی بێ خێرو بێر بوو، ئەو تۆوە خاوێنەی چاند و بە ئاوی رەحمەتی بێ سنوری خۆی تێر ئاوی کرد، لەسەر دەستی دڵسۆز ترین و لێزانترین پاسەوان دا پێ‌ی گەیاند، ئەو پاسەوانە بەرێزە پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێرەی وەحی و فەرمانی خوا ئەو کۆمەڵەی پەروەردە کرد، بەو پەروەردەیە بوون بە کۆمەڵێکی بێ وێنەو شیاوی ئەوە بوون کە خوا لە چەند سورەتێکی قورئان دا سەنایان بکات، هەروەکو لە پێشەوە لە تەورات و ئینجیل دا سەناوی و مژدەی داوە بە هاتنیان.

ئینجا پاش ئەو هەموو سەناو رێزەیان کە نیشانی داین ئەوا بەڵێنیشی پێدان بە سڕینەوەو لێبوردنی هەموو گەردو لەکەیەکیان، بە پاداشتێکی گەورە، ئەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾[1] خوا بەڵێنی داوە بەو کۆمەڵەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون(ﷺ)، ئەوانە کەسانێکی ئەوتۆن کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە، بەڵێنی داوە بەوانە بە لێبوردن و سڕینەوەی گوناهەکانیان و بە جەزاو پاداشتێکی گەورە، شتێ کە خوا پێ‌ی بەفەرموێ گەورە، ئاخۆ رادەی بەرزی ئەبێ چۆن بێت؟! ئەبێ فام و ژیریی ئێمە چۆن پێیدا بگات؟

یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پایەو رێزیان بەو جۆرەیە لای خوا، کەواتە ئەبێ رێزو خۆشەویستیان جێگیر ببێ لەدڵی هەموو ئیماندارێك دا، هەر دڵێ خۆشەویستی ئەو

[1] هەموو زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: کە وشەی ﴿من﴾ لێرەدا بۆ(تبین) ە، واتە بۆ روون کردنەوەی تیرەیە، جگە لەوە دەست نادات لێرەدا، بۆیە بەو جۆرە تەفسیرم کرد.

کۆمەڵەی تێدا نەبێ ئەبێ ئیمانی تێدا نەبێ، یان ئەگەر کەمێك ئیمانیشی هەبێ ئەوەندە بێ هێزو لاوازە زۆر مەترسی لێ ئەکرێت کە بە بچووکترین هۆ نەمێنێ.

ئەوان دۆستی خواو پێغەمبەر بوون و راستیان کرد لەگەڵ ئەوان دا، کەواتە هەرکەسێ خواو پێغەمبەری بوێ ئەو کۆمەڵەیشی ئەوێ، ئەمە شتێکی ئاشکرایە و هیچ جێگای قسەو باس و لێکۆڵینەوە نی یە چ جای رق و کینەو دەم درێژیی دەربارەیان، ئەوە لەگەڵ ئیمانی ساغ دا کۆنابێتەوە.

پێشەوا مالیك و کۆمەڵێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە هەرکەسێ دەربارەی ئەو کۆمەڵە کینەی ببێ ئەو کەسە کافرە، بەڵگەیشیان ئەم ئایەتەیە: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ﴾ ئەم بەڵگەیەش بەهێزە چونکە ئەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات کە کافر رق و کینەی هەیە لەو کۆمەڵە.

پێویستە لەسەر هەموو ئیماندارێك دەمی خۆی ببەستێ لە رەخنە گرتن لە یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەر شتێکی ناڕەوای بیست لێ یانەوە رووی دابێ، لە یەکەم جارەوە بە راستی نەزانێ، چونکە دوژمنەکانی ئیسلام زۆر شتی زۆر و زەبەندەیان هەڵبەستووە، وەکو زانراوە، ئەگەر لای زاناو پێشەواکان بۆی روون بووەوە کە راستە ئەوانە ئادەمیزادن، ئادەمیش زۆر جێگای هەڵەو تاوانە جگە لە پێغەمبەران کە خوا بەرگری کردوون لە تاوان و خراپە کاری، ئیتر لەوان بەدەر دەست ئەدەن بۆ تاوان و بەردەوامیش نابن لەسەر تاوانی بچووك، دەست بەجێ ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا.

ئینجا ئەگەر عوزرو بەهانەی بۆ نەدۆزرایەوە ئەبێ رەخنە نەگرێ و بێ دەنگ بێ، چونکە ئەوانە خوا بەڵێنی داوە بە لێبوردن و سڕینەوەی هەموو تاوان و گوناهێکیان، دەی ئیتر ئێمەی تاوانبار بۆ ئەبێ چاوپۆشی نەکەین، دەم درێژیی بکەین دەربارەیان؟!!

هەرچەندە ئێرە جێگای ئەم قسەو باس و لێکۆڵینەوەیە نی یە، بەڵام بە بۆنەی ئەم ئایەتانەوە بە پێویستم زانی کە هەندێ لە ئیمانداران ئاگادار بکەمەوە تا بێ بیر کردنەوەو بێ باك نەدوێن لەو هەڵکەوتووانە.

زۆر جار ئەبیسترێ رەخنەی بێ جێ ئەگیرێ لێ یان، بەڵکو زۆر بێ شەرمانە دەم درێژیی یان دەربارە ئەکرێت کە ئەوەیش پێچەوانەی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەرە(ﷺ) کەواتە با تەوبەو گەڕانەوە بکرێ بۆلای خوا لەو جۆرە تاوانانە.

## سورەتی(الحجرات)
## مەدینەیی یەو ١٨ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە زۆر گرنگە لەگەڵ ئەمەدا کە کورتە، چەند شتی گەورە گەورەی تێدایە لە بابەت عەقیدەو شەریعەت و بەرنامەی رژێمی ژیان و کۆمەڵایەتی و پەروەردە کردن و تەمێ دادان و پاك و خاوێن کردنی خوورەوشت و چەند شتی تر، ئەوەی لەم سورەتە وەرئەگیرێ بە سەداقەت زیاترە لە ئەندازەی قەبارەی سورەتەکە.

ئەم سورەتە دوو شتی زۆر گەورە پیشان ئەدات کە زۆر شایانی بیر کردنەوەن:

١- رێگاو رچەو رێبازێکی زۆر روون و رێك دائەنێ، رێگای راست نەخشە ئەکێشێ بە هەموو نیشانەو دروشمی یەوە بۆ ژیانی گەل و جیهانێکی بەرزو بەرێزو پاك و بێگەرد بە چەند بیرو باوەرو بەرنامەیەکەوە کە ئەو ژیانەی لەسەر راگیر بێت، بە جۆرێ وەکو پێی فەراهەم بێت پارێزگاریشی بکات بۆ ئەمەی هەمیشەیی بێت و بمێنێتەوە. گەل و جیهانێکی تایبەتی فەراهەم بێت کە روو لە خوا بکات و شایانی ئەوە بێت بە گەل و جیهانی خوایی دابنرێ، گەل و جیهانێکی پاك و خاوێن لە هەموو بارو روویەکەوە، ئەو گەلەی کە ئەیەوێت فەراهەم بێت گەلێکە سنووری هەموو پەیوەندی یەکی بۆ دیاریی کراوە، پەیوەندی لەگەڵ خوادا. لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) پەیوەندی لەگەڵ ئەندامەکانیدا و پەیوەندی هەموو یەکە یەکەی ئەندام لەنێوان خۆیان داو لەگەڵ گەلەکەیان دا.

٢- ئەو هەموو کۆششە گرنگە هەمیشەیی یە کە قورئانی پیرۆز کردی بۆ فەراهەم هێنان و پێگەیاندن و پەروەردەکردنی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە کە سەد لە سەد بوون بە نموونەو نوێنەرێکی راستەقینە بۆ ئەو عالەمە بەرزە پەرێزە پاك و خاوێنە کە قورئان داوای ئەکات، بەو تێکۆشانە گرنگە ئەو کۆمەڵە فەراهەم هات لەسەر زەوی دا کە هەموو

مێژوو و فەلسەفەیەك تیایان دا سەرگەردانە، كۆمەڵێكی وا كە دەربارەیان وتراوە: هەموو ئەندامێكیان ئەڵێی قورئانێكی گیانلەبەرە بەسەر زەوی دا ئەگەڕێ، ئەو كۆمەڵە بەرزە پێك هات بەڵام نەك بە شێوەیەكی كتوپڕی یان بە جۆرێكی تایبەتی دژو پێچەوانەی سروشتی ئادەمی. نەخێر بە هیچ شێوەیەك لەو شێوانە فەراهەم نەهات بەڵكو بەرە بەرەو بە هەوڵ و تێكۆشانێكی زۆر بە هێزو بەتین و لە كات و ماوەیەكی پێویست دا بۆ ئەو هەموو هەوڵ و تێكۆشانە، بە سەبرو ئارامێكی زۆر دوورودرێژ بۆ هەڵگرتنی باری زۆر قورسی تاقی كردنەوەو پاڵفتە كردنی دڵ و دەروون لە هەموو چڵك و چەپەڵی و لەكەیەك، لە ریشە هێنانی هەموو خوو رەوشتی بەدو خراپ و چاندنی خوورەوشتی پاك و خاوێن لە جێگاكەیان دا، بەم جۆرە ئەو كۆمەڵە كەس نەدیوە پێگەیشت بە گوێرەی بەرنامەو فەرمانی خواو لە ژێر چاودێریی لوتف و كۆمەكی خوادا تا توانیان بە رێكی پەیرەوی پێغەمبەرەكەیان(ﷺ) بكەن، یارمەتی بدەن لە راگەیاندن و بڵاوە پێ كردنی ئەو ئایینە گەورە گشتی یە هەتا هەتایی یەی خوا كە هاتە سەر پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەموو جیهان.

ئەم سورەتە لە یەكەمجارەوە بانگ ئەكاتە ئیماندارەكان و تەمێ یان ئەكات بە شتێ كە بنەرەتی هەموو پیت و فەرێكە، هۆی رزگاری یە لە هەموو خراپەو نالەباری و هەڵەیەك، دەست مایەیە بۆ رەزامەندی خواو دەستكەوتی نازو نیعمەتی نەبڕاوەی رۆژی دوایی، ئەوەش كە بریتی یە لە وەستان بە دیاری حوكم و بە دیاری خواو پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە هەموو كاروبارێك دا و چاوەڕوانی تەمێ و بڕیاری خواو پێغەمبەر(ﷺ) بە گەردن كەچی و رەزامەندی دڵەوە بانگی ئیماندارەكان ئەكات بە سیفەتی ئیمان كە هۆی پەیوەندی و بەستنەوەی دڵە بە خواو پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆ بێدار كردنەوەی دڵ و دەروون و هاندانیان بۆ سۆزو پەرۆش لە گوێڕایەڵی و فەرمان بەرداری دا،

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ

**ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە لە هیچ کاروبارێك دا پێش مەکەون لە حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەر(ﷺ) و هیچ بڕیارێك نەدەن لە خۆتانەوە کە نەگەڕێتەوەو وەرنەگیرێ لە حوکم و بڕیاری ئەوانەوە، ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەو شتانەی پێچەوانەی فەرمان و ڕەزامەندی خوان ﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خوا ئەبیستێ و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا، کەواتە هەر پێشکەوتنێ بکەن خوا ئەیبیستێ و پێ ی ئەزانێ.**

**ئەمە شیرین ترین تەمێ و ئەدەب دادانێکی دەروونی بوو بۆ ئیمانداران، ئەمە بەرنامەیەکی ڕێك و ڕاست و تەواو بوو بۆیان. ئەو ئیماندارانە چونکە ئیمانەکەیان تێرو تەواوو بەهێزبوو ئەو تەمێ یەیان بە باشی وەرگرت، ئیتر پاش ئەم ئایەتە هیچ کامیان لە خۆیەوە هیچ بڕیارێکی نەئەدا و هیچ ڕاوێژێکی نەئەکرد بۆ خواو پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەموو کارو فەرمانێ لە پێشەوە ئەگەڕانەوە بۆلای فەرمایشی خواو پێغەمبەر(ﷺ).**

**پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئەبو داود و تیرمزی و ئیبن و ماجە حەدیسێ ئەهێنن لە موعازی کوڕی جەبەلەوە – خوا لە هەموویان ڕازی بێت – پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ ویستی موعاز ڕەوانە بکات بۆ یەمەن پێ ی فەرمو: ئایا بە چی حوکم ئەکەیت لەوێ؟ موعازیش عەرزی کرد بە کتێبی خوا، واتە قورئان، ئینجا پێ ی فەرموو ئەگەر لە قورئان دا بڕیارت دەست نەکەوت؟ ئەمیش عەرزی کرد: بە پێ ی فەرمودەو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ئینجا فەرموی: ئەگەر لەوەشدا دەستت نەکەوت؟ عەرزی کرد کۆشش ئەکەم ڕای خۆم ئەخەمە کار. واتە لەبەر ڕووناکی قورئان، یان حەدیس بڕیار ئەدۆزمەوە. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دا بەسەر سنگی و دڵی داو فەرموی: سوپاس بۆ خوایە کە یارمەتی ڕەوانە کراوی پێغەمبەرەکەی خۆی داوە ڕووی کردە ڕاست و خێر، تەوفیقی دا بۆ شتێك کە خواو پێغەمبەر پێ ی ڕازین.**

ئەو ئایەتە بەفەڕە بە جۆرێك كاری لیٚ كردن: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە شتێكی ئاشكرای زانراوی بكردایە لەو ئیماندارانە، ئەترسان لە وەڵامدانەوەی بە گوێرەی زانینی خۆیان، نەوەك ببێتە پێشكەوتن لە بڕیاری خواو پێغەمبەر(ﷺ) بەڵكو لە وەلاّم دا ئەیانگوت: خواو پێغەمبەر زاناترن.

(ئەبوبەكری كوڕی حاریسی سەقەفی) – خوای لیٚ رازی بێت – حەدیسیٚ لە باسی(حجة الوداع) دا ئەگێڕێتەوە، لەو حەدیسەدا ئەفەرمویٚ: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری كرد: ئەم مانگە چ مانگێكە؟ ئێمەش وتمان: خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) باشتر ئەزانن، ئینجا بیٚ دەنگ بوو هەتا گومانمان وابوو كە ناوی تری بۆ دائەنیٚ، ئینجا فەرموی: ئایا ئەمە ذي الحجة نی یە؟ واتە مانگی قوربان. وتمان بەڵیٚ مانگی قوربانە، ئینجا فەرموی: ئەم شارە چ شارێكە؟ وتمان خواو پێغەمبەر باشتر ئەزانن؟ ئینجا بیٚ دەنگ بوو هەتا گومانمان وابوو كە ناوی تری بۆ دائەنیٚ، جگە لە ناوەكەی خۆی، ئینجا فەرموی: ئایا ئەمە(البلدة الحرام) نی یە واتە مەككە؟ وتمان بەڵیٚ ئەوە. ئینجا فەرموی: ئەم رۆژە چ رۆژێكە؟ وتمان خواو پێغەمبەر زاناترن، ئینجا بیٚ دەنگ بوو هەتا گومانمان برد كە ناوێكی تری لیٚ ئەنیٚ، ئینجا فەرموی: ئایا ئەمە رۆژی جەژنی قوربان نی یە؟ وتمان: بەڵیٚ ئەو رۆژەیە.

ئا بەو جۆرە ئەو ئیماندارانە تەمیٚ یان وەرگرت لە پاش هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەو ترس و سامێكی وەها پەیدا بوو لەدڵ و دەروونیان دا بۆ شتی وا روون و ئاشكرا كە پرسیاری لیٚ كردن هیچ كەس زاتی نەبوو لە خۆیەوە وەلاّم بداتەوەو وەستان بە دیار بڕیاری پێغەمبەرە(ﷺ) و علیهم اجمعین.

ئینجا تەمیٚی ئیماندارەكان ئەكات بە قەدرو رێزگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) بە دڵ، بە جۆرێك جویٚ یان بكەنەوە لە خەڵكی لە شێوەی قسەو گفتو گۆكردن لە گەڵیدا، بۆ ئەم مەبەستەش بە سیفەتی ئیمان بانگیان ئەكات و ئەیانترسێنیٚ لە گوێڕایەڵی نەكردن. ئەفەرمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئەی كەسانیٚ كە ئیمانتان هێناوە: دەنگتان بەرز مەكەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا كاتیٚ كە قسەی لەگەڵ دا ئەكەن، ﴿وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ﴾ بە دەنگی بەرزو ئاشكرا قسەی لەگەڵ مەكەن بە بیٚ رێزو بیٚ شەرمانە بە وێنەی باوی خۆتان ﴿كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ﴾ كە هەندێكتان بە دەنگی بەرزو بیٚ رێز قسە لەگەڵ هەندێكی ترتان ئەكەن، بەڵكو با دەنگتان بەسەبرو نزمتر بێت لە دەنگی پێغەمبەر(ﷺ)،

﴿أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾[1] بۆ ئەوەی کردەوە چاکەکانتان بەتاڵ نەبێتەوە کە خۆشتان هەستی پێ ناکەن. واتە قسە کردن لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بە دەنگی بەرزو بێ شەرمانە بێ قەدرو بێ ڕێزی نیشان ئەدات، ئەوەش نیشانەی کوفرو بێ باوەڕیی یە کە گەردی هەموو کردەوەیەکی چاك ئەدا بەبادا، یان ئەو شێوە گفتو گۆ ناڕەوا زۆر جار ئەبێتە هۆی قارو غەزەبی خوا کە هەموو کردەوە چاکەکان بەرباد ئەکات، ئەم بانگ کردنەی خواو ئەم ترساندنەسامناکەی بەتەواوی کاری کردلەدڵی ئیماندارەکان داو هەموو دڵیانی پێ هاتە لەرزەو هەموو کات وریای خۆیان بوون لەوەی کە دەمیان بترازێ بە پێچەوانەی ئایەتەکە.

پێشەوا(بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ لە(ئیبن ئەبی مەلیك) ەوە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بە بۆنەی حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەرەوە – خوا لێ یان ڕازی بێت – لەساڵی نۆهەمی کۆچیدا کاتێ کە تاقمێ لە بەنی تەمیم هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، حەزرەتی ئەبوبەکر عەرزی کرد کە قەعقاعی کوڕی معبد بکات بە سەرکردەیان، حەزرەتی عومەر داوای کرد کە ئەقرەعی کوڕی حابسی بکات بە سەرکردەیان، لە پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر فەرموی بە حەزرەتی عومەر تۆ مەبەستت هەر ئەوەیە کە پێچەوانەی من بکەیت، ئەویش وتی نەخێر هیچ مەبەستم ئەوە نی یە، هەندێ لەسەر ئەوە ڕۆیشتن هەتا دەنگیان بەرز بووەوە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. حەزرەتی ئەبوبەکر فەرموی کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە وتم ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا ئیتر قسەت لەگەڵ دا ناکەم بە وێنەی کەسێ نەبێ کە قسەیەکی نهێنی هەبێ، واتە بە وێنەی چپە نەبێ قسەت لە خزمەت دا ناکەم.

---

[1] وشەی ﴿أَن تَحۡبَطَ﴾ و وێنەی وەك ئەو بە پێی ڕێزمانی عەرەبی پێیان ئەوترێ: ﴿مفعول لە﴾ بە دوو جۆر باس کراوە: بە گوێرەی بەسری یەکان وشەی ﴿کرهة یان خوف﴾ بڕیار ئەدرێ ئەو کاتە عیللەتە بۆ نەهیەکەو بە گوێرەی کوفییەکان ﴿ل﴾ لەپێش ﴿إن﴾ بڕیار ئەدرێ، ئەو کاتە عیللەتە بۆ فیعلە پێشووەکە، بەم جۆرە کە ئەو فیعلە سەری لەو ڕووداوە دەرئەچێ کە لە پاش ﴿أن﴾ دێت.

(إبن الزبير) ئەفەرموێ: پاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە حەزرەتی عومەر قسەی لە خزمەت دا نەئەکرد بە جۆرێ ببیستێ هەتا پرسیاری لێ ئەکردو دووبارەی ئەکردەوە، واتە زاتی نەبوو ئەوەندە دەنگ بەرز بکاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە یەکەم جارەوە قسەکەی وەرگرێ. پێشەوا ئەحمەد حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە - خوا لێی رازی بێت - ئەفەرموێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە سابیتی کوڕی قەیس خۆی شاردەوەو لەماڵ دا بە غەمباری یەوەدانیشت و وتی: منم کە دەنگم بەرزکردووەتەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا(ﷺ) من ئەهلی ئاگرم، کردەوەم بەتاڵ بووەتەوە، ئەم سابیتە پیاوێکی گوێ گرانی دەنگ گەورە بوو خۆی پێ چار نەئەکرا قسەو دەنگی زۆر بەرز بوو، بەهۆی ئەوەوە بەو جۆرە غەم و خەفەت دایگرتبوو نەئەهاتە دەرەوە، بەم جۆرە کە دیار نەبوو پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پرسی موسڵمانانیش بەسەرهاتەکەیان عەرزکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی نەخێر وا نی یە بەڵکو ئەو لە بەهەشتایە، ئەنەس - خوای لێ رازی بێت - ئەفەرموێ: بەهۆی ئەو مژدەوە ئێمە هەموو سابتمان بە بەهەشتی سەیر ئەکردو باوەڕمان بوو کە بەهەشتی یە کاتێ چاومان پێ ئەکەوت و ئەگەڕا بەناو خەڵك دا.

یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و علیهم ئا بەو جۆرە فەرمودەکانی خواو پێغەمبەریان(ﷺ) وەرئەگرت و بەو شێوە کاری لێ ئەکردن، بۆیە توانیان ئالأی ئیسلام بەرزکەنەوە بەو جۆرە کەس نەدیوەو لەو ماوە کورتەدا بەو کەم و کوڕی یەی کە هەبوو لە دەسەلأت و ژمارەیان دا، بەلأم ئێستا لەگەڵ ئەم هەموو زۆری و تێری و تەواوی یەدا بەم جۆرەن کە ئەبینرێ، چونکە پەیڕەوی و رێبازی قورئانیان واز لێ هێناوەو کەوتوونەتە سەر رێبازی دوژمنەکانی قورئان، هەتا نەگەڕێنەوە بۆلای ئایینە بەرزەکەیان هەر ئەمە بەشیان ئەبێ کە هەیانە وەکو پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە لە حەدیسێك دا کە لە کتێبە سەحیحەکان دایە ئەفەرموێ: ﴿سلط الله عليكم ذلا لا ينزعه عنكم حتى ترجعوا إلى دينكم﴾.[1]

[1] واتە خوا زەلیلیتان ئەدات بەسەرداو لە کۆڵتان ناکاتەوە هەتا نەگەڕێنەوە بۆلای ئایینەکەی.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾﴾

**ئینجا رێنموونی ئەکات و هانی ئیمانداران ئەدات لەسەر دەنگ نزم کردنەوە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بەم فەرمودەیە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ بەراستی کەسانیٚ کە دەنگیان نزم ئەکەنەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە خوا دڵەکانیانی تاقی کردۆتەوە هەتا پاك و خاوێنی کردوونەتەوەو پاڵفتەی کردوون بۆ ترس و سام و شەرم لە خواو بەهۆی ئەوەوە بوو خۆپاراستنی لە قەدەغەکانی خواو ئەو شتانەی کە هۆی قارو غەزەبی خوان، ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە لەلایەن خواوە سڕینەوەی گوناهو تاوانیان و پاداشتی گەورە، ئەم سیفەتەی کە باسمان کردو لە زمانی شەرع دا پێی ئەوتریٚ: ﴿تقوی﴾ بەخشینێکی ئێجگار گەورەو گرنگە خوا بە خەڵات ئەیدات بەو دڵانەی کە لە تاقی کردنەوەدا بە پاك و خاوێنی دەرچووبن. جا ئەو ئیماندارانەی کە بە شەرمەوە دەنگیان سەبرو نزم ئەکردەوە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) ئەوانە دڵەکانیان خەڵات کرابوو بەو سیفەتە گرنگە.**

**ئەم شەرم و ئەدەبەی کە ئەم ئایەتە تەمێی ئیماندارانی پیٚ کرد تەنها بۆ کاتی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە لەم جیهانەدا بەڵکو لەپاش بەجیٚ هێشتنی ئەم جیهانەش ئەوە هەر ماوەتەوەو هەر هەیە. جێنشینی دووەم - خوا لیٚ ی رازی بێت - گوێی لە دوو پیاو بوو بە دەنگی بەرز قسەیان ئەکرد لە مزگەوتی پێغەمبەردا(ص) ئینجا چوو بۆلایان و پێی فەرموون: ئایا ئێوە ئەزانن لە چ شوێنێك دان؟ لە پاش ئەوە فەرموی: ئێوە لە کوێوە هاتوون؟ عەرزیان کرد خەڵکی تائیفین، ئینجا فەرموی: ئەگەر خەڵکی مەدینە بوونایە لێدانێکی چاکم ئەکردن، واتە نەشارەزان لەبەر ئەوە لێتان ئەبوورم.**

**زاناکان و پێشەواکان لەسەر ئەوەن کە دەنگ بەرزکردنەوەی لای قەبری بە فەڕی پێغەمبەر(ﷺ) خراپە هەرچۆنیٚ لەکاتی ژیان دا خراپ بووە. چونکە پێویستە شەرم کردن و ڕێزگرتنی لە هەموو کاتێك دا خوا بە لوتفی خۆی دڵمان پڕ بکات لە خۆشەویستی و ڕێزی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ).**

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾

---

لەساڵی نۆهەمی کۆچیدا کە پێی ئەوترێ: ﴿عام الوفود﴾ [1] وەفدی بنی تەمیم هاتن چونکە کۆچەری بوون تازە موسڵمان بوون وێڵ و ئوسوڵیان نەئەزانی لە دەری هۆدەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە بە دەم مزگەوتەوە بوون بانگیان کرد: ئەی محمد وەرە دەرەوە بۆلامان، مەبەستیان ئەوە بوو کە بێت و بە خزمەتی بگەن، بەڵام هەر ئەوەندەیان لێ ئەزانی، جا بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ تەمێ دادان و پێشان دانی شێوی وێڵ و ئەدەب، لەو بابەتەوە، لە یەکەم جارەوە ناشیرینی کردەوەکەیان پیشان ئەدات ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ [2] بێگومان کەسانێ کە لە دوورەوە لە دەری هۆدەکانەوە بانگت لێ ئەکەن، زۆربەی ئەوانە عەقڵیان نی یە، واتە ئەگەر عەقڵیان ببوایە بەو جۆرەیان نەئەکرد، چونکە عەقڵ بەرگری خاوەنەکەی ئەکات لە ئیشی بێ وێڵ و پاڵی پێوە ئەنێ بۆ ئەدەب و رێزگرتنی خاوەن رێز بە تایبەتی تەمێ و ئەدەب و رێزی کەسێکی وەکو پێغەمبەر(ﷺ) کە پێشەوای گرۆهی ئادەمی یە.

ئینجا شێوەی ئەدەب و رێز پیشان ئەدات ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئەگەر ئەوانە سەبریان بکردایەو بوەستانایە هەتا ئەهاتیتە دەرەوە بۆ لایان بێگومان ئەوە باش بوو بۆیان لەو پەلە کردن و بێ ئەدەبی یە کە کردیان.

ئینجا رێنموونی ئەکات و هانیان ئەدات لەسەر گەڕانەوە لەو بێ ئەدەبییەو بێ وێڵ و ئوسوڵی یە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوا زۆر لێ بوردەو بێ رەحمە، قاپی لێ بوردن و

---

[1] واتە ساڵی وەفدەکان، چونکە لە هەموو تیرەکانی عەرەب وەفد هات بۆ خزمەت پێغەمبەر(ص).

[2] زەمەخشەری ئەڵێ زۆریە ئەفەرموێ: یان لەبەر ئەوەیە لەو کۆمەڵەدا پیاوی عاقڵ بووەو مەبەست دەرکردنی ئەوانەیە، یان مەبەست بەزۆریە هەمووە، ئەویش بە گوێرەی باوی عەرەبە کە لە باتی شتی نەبوودا کەم بەکار ئەهێنرێ بەو جۆرە مەبەست بە زۆریە هەمووە!! خوا خۆی ئەزانێ.

بەزەیی کراوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە شایانی ئەوەبن، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە ئەگەڕێنەوەو پەشیمان ئەبنەوە لە هەڵەو تاوانیان. ئەو تەمێ و شەرم و ئەدەبە جێگیر بوو لەناو ئیمانداران دا، لە پێغەمبەریشەوە سەروازی کردو هەرماوە لە ناو موسڵمانان دا دەربارەی هەموو مامۆستاو پێشەواو پیرێك، زانای لە خواترسی باوەڕ پێکراو(ئەبو عوبەید) ئەفەرموێ: تەقەم نەداوە لە قاپی هیچ عالمێك بەڵکو وەستاوم هەتا خۆی هاتۆتە دەرەوە.

یەکەم بانگ کردنی ئیمانداران بۆ دیاریی کردنی قیادەو سەرچاوەی هەموو فەرمان بڕیارێکیان بوو.

دووەم بانگ کردنیان بۆ تەمێ کردنیان بوو لە بابەت تەمێ و ئەدەب و ڕێزیان بۆ قیادەکەیان کە ئەم دووانە بنەڕەتە بۆ هەموو تەمێ و حوکم و بڕیارەکانی سورەتەکە، چونکە پێویستە سەرچاوەیەکی ڕوون و ڕێکیان هەبێ بۆ هەموو کاروباریان، هەروەها پێویستە ڕێزو نرخی ئەو سەرچاوە لە دڵ و دەروونیان دا هەبێ، ئەو کاتە گوێ ڕایەڵی ئەو فەرمان و بڕیارانە ئەکەن کە لەو سەرچاوەوە دەرئەکرێ ئینجا بانگی تر ئەکرێن کە ئەو هەواڵانەی پێ یان ئەگات بە چ شێوەیەك وەری ئەگرن؟ پێویستە لەسەریان شوێن هەموو هەواڵی نەکەون، پەلە نەکەن لە وەرگرتنی هەواڵی هەندێ کەس دا، تا ڕوون نەبێتەوە ڕاستی یەکەی، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ﴾ ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە ئەگەر پیاوێکی فاسق و خراپ هەواڵێکی بۆ هێنان، ڕوونی بکەنەوەو لە ڕێوە وەری مەگرن و مەکەونە شوێن قسەی چونکە ناخۆشە لە خۆتانەوە لەسەر قسەو هەواڵی ئەو پیاوە خراپە کۆمەڵێ دووچاری سزاو نارەحەتی بکەن. لەپاشان کە هەواڵەکە درۆ دەرچوو بە داخ و مەراقەوە پەشیمان ئەبنەوە لەسەر کردەوەکەتان و ئاواتەخواز ئەبن کە ئەوەتان نەکردایە. واتە شوێن کەوتنی هەواڵی پیاو خراپ ئەو مەترسی یە گەورەی تێدایە، کەواتە وریابن هەواڵەکەی ڕوون بکەنەوە.

ئەم ڕوون کردنەوەیە بۆ هەواڵی پیاو چاکان نی یە، هەواڵ قسەی پیاو چاکان نابێ جێگای گومان بێت، کەواتە کۆمەڵێ ئیمانداران لەناو یەك دا ئەبێ جێگای باوەڕبن بۆ یەکتر، بەس وەکو ئایەتەکە ئەفەرموێ هەر فاسق و پیاو خراپ جێگای باوەڕ نی یە، کەواتە نە هەمووهەواڵێ وەرئەگیرێ ونەهەموو هەواڵێ بەرپەرچ ئەدرێتەوە، هەرکات کۆمەڵی ئیمانداران

بەوجۆرەرەفتاریانکردئەم کاتەهەموو کاروبارییان بە رێکی ئەڕوا. زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بە بۆنەی وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبو موعیتەوە.

ئیبن و کەسیر ئەفەرموێ لە موجاهیدو قەتادەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) وەلیدی نارد بۆلای بەنی موستەلەق [1] بۆ زەکات ئەوانیش هاتن بە پیری یەوە بە زەکاتەکەیانەوە، ئەویش بەهۆی دوژمنایەتی یەکەوە هەیبوو لەگەڵیان دا ترسا لێ یان و گەڕاوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی بەنی موستەلەق کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی جەنگت لەگەڵ بکەن، هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام. پێغەمبەریش(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی ناردو فەرموی پەلە پەل مەکە، ئەویش هات بۆ سەریان و بەشەو چەند کەسێکی نارد کە بە دزی یەوە جوست و جۆ بکەن ئەوانیش گوێ یان گرت کە بانگ و نوێژیان هەیە و موسڵمانن و هاتنەوە هەواڵەکەیان دا بە حەزرەتی خالد.

ئینجا ئەمیش بەرۆژ هاتە ناویان و دڵشاد بوو بەراستی موسڵمانییان، ئینجا گەڕاوە بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵە راستی یەکەی عەرز کرد. ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، قەتادە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿التثبت من الله و العجلة من الشيطان﴾ [2] بە هەر جۆر ببێ ئەم ئایەتە شێوەیەکی گشتی پیشان ئەدات لە هەموو کات و چەرخ و کەلێك دا، بەراستی پێویستە هەموو موسڵمانێك بە پێ ی ئەم فرمانە رەفتار بکات. بە تایبەتی کاربەدەستان پێویستە لەسەریان بە مو لەوە لانەدەن ئەگینا دووچاری زوڵم و ناڕەوایی زۆر دێن، ئەو کاتە وەکو خەڵکی لەوانەوە دووچاری سزاو ناڕەوایی ئەبن، خۆیشیان ئەخەنە بەر قارو غەزەبی خواو تف و نەفرینی ئادەمی، وا دەرئەکەوێ لەکاتی هەواڵەکەی وەلیدی کوڕی عوقبەدا هەندێ لە موسڵمانەکان دڵیان قوڵی دابێت و کەوتبێتە راپەڕین و بیستبێتی کە پێغەمبەر(ﷺ) بە گورجی تۆڵە بسێنێ لە بەنی موستەلەق، هەرچەند رق و راپەڕینەکەی دڵیان لەبەرخواو ئایینی خوا بووە، بەڵام وەکو لە یەکەم جاری سورەتەکەوە تەمێ ی کردن و فەرمانی دا – ئەبێ موسڵمان(ئیماندارەکان) چەسپانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) بکەن لەبەر ئەوە بەم فەرمودە بێداری کردنەوە بۆ زیادە روون کردنەوەو بەهێزکردنی ئەو تەمێ یە،

---

[1] هۆزێکی عەرەبن.

[2] ئیبن کەسیر بەم جۆرەی لە تەفسیرەکەی دا هێناوە، واتە سەبرو پەلە نەکردن لە لایەن خواوەیەو پەلەکردن لەلایەن شەیتانەوە.

وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾

**ئەفەرموێ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ بزانن کە ئێوە پێغەمبەری خواتان لە نێوان دایە، واتە بیر لەوە بکەنەوەو قەدری ئەو نیعمەتە گەورەیە بزانن، چونکە زۆر شتێکی گرنگ و گەورەیە کە پەیوەندیی یەکی ئاوا ئاشکرا لە نێوان ئاسمان و زەوی دا هەبێ بۆ هەموو پێویستی یەك هەواڵ لە ئاسمانەوە بێت بۆ دانیشتوانی زەوی، هەواڵی ئاشکراییان، هەواڵی نهێنیان، تەنانەت هەواڵی خەتەرەو نیازی دڵ و دەروون لە چەند کات و لە چەند جاردا، هەتا بیری لێ بکرێتەوە گەورەیی و گرنگی روونتر ئەبێتەوە، ئای(ام ایمن) – خوای لێ رازی بێت – چ فەرمودەیەکی شیرینی بەجێی هەیە لەم بابەتەوە: کاتێ کە تەعزیەی لێ کراو دڵ خۆشی درایەوە لەپاش ئەمەی پێغەمبەر(ﷺ) لە دنیا دەرچوو، فەرموی: بەخوا خۆ من ئەزانم ئەوەی لای خوایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە چاکترە بەڵام دڵم بۆ ئەوە نارەحەتە کە پەیوەندی نێوان ئاسمان و زەوی پچڕاو ئیتر هەواڵ لە ئاسمانەوە نایەت بۆ دانیشتوانی سەر زەوی. خوای گەورە وەکو بێداری کردنەوە بۆ ئەمەی پەلە نەکەن لە هیچ شتێك داو چاوەڕوانی راو بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) بکەن، وەکو بەو جۆرە تەمێی کردن. ئەوا زیاتر شتەکە روون ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾[1] لە مەرجێك دا پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێتان**

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە: ١.قورتوبی و زۆریە ئەفەرمون: تەمێ ئەکات کە درۆ نەکەن، چونکە پێغەمبەریان لەناودایە، راستی یان لێ ئەڵێ و ئەوانیش بێ ئابڕوو ئەبن، واتە بزانن بیر بکەنەوە کە پێغەمبەرتان لەناودایە کەواتە درۆ نەکەن و لەسەر ئەم رایەش رستەی ﴿لَوْ يُطِيعُكُمْ﴾ سەربەخۆیە. ٢.ئەو رستەیە حاڵە لە یەکێ لەو دوو(ضمیر) ە لە وشەی ﴿فیکم﴾ دا:(ضمیر) ی فاعل لە وشەی ﴿کائن﴾ ی بڕیار دراودا، یا(ضمیر) ی ﴿کم﴾ فرمان دان بە زانین ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو رستەیە کە حاڵە واتە بزانن کە پێغەمبەرتان لەناودایە بە جۆرێك لە کاتێك دا ئەگەر لە شەرتێك دا لە گوێ.. هتد. بەم دوو جۆرەیش ئەگونجێ بەڵام ئەوەی کە لە تەفسیرەکەدایە دڵ بە ئارام ترە پێی و زانینی تەواو لای خوایە.

بكات لە زۆركاردا بێگومان ئێوە ئەكەونە زەحمەت و نارەحەتی، واتە بڕیارو راوێژی ئێوە، چونكە لە خۆتانەوەیە هەڵەی زۆرە، كەواتە ئەگەر پێغەمبەر بە گوێی ئێوە بكات لە زۆر شت دا ئەكەونە زەحمەت، بەڵام ئەگەر ئێوە بوەستن و چاوەڕوانی بڕیاری پێغەمبەر بكەن دووچاری خراپە نابن چونكە ئەو خوای گەورەو میهرەبان سروشی بۆ ئەكات، یان شتی خێرو چاكە ئەنێتە دڵی، كەواتە راو تەگبیرو بڕیاری ئەو چاكترە بۆ ئێوە.

لە پێشەوە پیشانی دا كە هەندێ لە ئیماندارەكان پەلە و هەڵەیان كردو ویستویانە كە پێغەمبەر(ﷺ) دەست بەجێ بنێرێتە سەر ئەو تائیفەو تۆڵەیان لێ بسێنێ ئەوا لێرەدا عوزریان بۆ ئەهێنێتەوە بەم فەرموودەیە: ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ﴾ [1] بەڵام خوا ئیمانی خۆشەویست كردووە لای ئێوەو شیرینی كردووەو رازاندوویەتی یەوە لە دڵەكانتان دا، كوفرو تاوانە گەورەكان و هەموو گوناهەكانی تری بوغزاندووەو بێزراندوونی لای ئێوە، واتە پەلە كردنتان لە تۆڵە سەندن لەو تائیفە بە هۆی ئەوەوە بوو كە ئاین و ئیمانەكەتان زۆر خۆشەویست بوو لاتان، رقتان بەتین بوو دەربارەی كوفرو سەركەشییان خۆتان پێ نەگیرا.

---

[1] بەجۆرێ تر تەفسیر كراوەتەوە: كە ئەم فەرموودە سەنایە لە لایەن خواوە دەربارەی ئەوانە كە پەلەیان نەكردو چاوەڕوانی بڕیاری پێغەمبەریان كرد(ﷺ) بە جوێ كردنەوەی ئەوانەیە، بەم شێوە رێك ترە لەگەڵ دیمەنی ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ﴾ دا چونكە بێگومان پەلە نەكردن و چاوەڕوانی بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) باش بووەو ئەوە رۆیشتن بوو بە رێگای راست دا، كەواتە بە گوێرەی تەفسیرەكە ئەبێ رێك بخرێ بەم جۆرە مەبەست بە ﴿أولئك﴾ ئەو كەسانەن كە ئیمان خۆشەویست كراوە لایان و كوفر بێزێنراوە ئیتر بێ تەماشا كردنی ئەو هەڵەیان، یان حەسرەكە ئیزافییە بێجگە لەم دوو جۆرە كە لە تەفسیرەكان دا هەن جۆرێكی تر چووەتە دڵی خۆمەوەو زۆر دڵنیام پێی بەڵام زاتم نەبوو لە تەفسیرەكەدا ئەوە بنووسم، چونكە لە هیچ كتێبێكی تەفسیردا نەم دیبوو، بەڵكو شتێكەو كەوتۆتە دڵم، ئەویش ئەمەیە: خوای گەورە لە رستەی ﴿لو یطیعكم﴾ دا گەیاندی كە ئیماندارەكان هەڵەی زۆریان هەیە ئینجا بۆ ئەمەی ئەو كۆمەڵە بەختیارە دڵخۆش بكات بۆ ئەمەی بە لەكەدارو تاوانبار تەماشا نەكرێن بەم فەرموودەیە سەنای كردن و پلەی بەرزی روون كردنەوە، هەروەها تا ببێتە زیادە تەمێ و بیرخستنەوەیە بۆیان تا ئەوەی كە چاكە چاكتر ببێ و ئەوەی كەم و كوڕی هەیە نەیهێڵێ و ئەوانەیان هەڵەیەكی وایان بووبێ كۆتایی بێنن لێ ی، زانینی تەواو لای خوایە.

فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٨﴾ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٩﴾

---

**ئەو کەسانەی کە ئیمان لە دڵیان دا خۆشەویست کرابێ و کوفرو تاوان بێزراو بێ لایان هەر ئەوانەن کەوتوونەتە سەر ڕێگای ڕاست و کردەوەی ڕەوان، ﴿فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ﴾ خوا بەو جۆرە ئیمانی خۆشەویست کرد لایان و کوفرو گوناهی بێزران لەبەر لوتف و فەزڵ و چاکە کردن لەلایەن خواوە دەربارەیان. ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا و زانایە بە هەموو کاروباری و ئەزانێ کێ شایانی چی یە؟ هەموو کاروبڕیاری بەجێ یەو پڕ لە بەرژەوەندی یە[1].**

**بێگومان ئیسلام چارەسەری داناوە بۆ هەموو گیرو قۆرتێکی ژیان لە هەموو بارو روویەکەوە، یەکێ لەوانە بریتی یە لە یاسای کوژاندنەوەی جەنگ و ئاژاوەیەك، کە بەرپا ببێ لە نێوان کۆمەڵی موسڵمانان دا. بۆ ئەم مەبەستە گرنگە رژێمێکی هەیە کە پێی ئەوترێ: ﴿نظام التحكيم و قتال الفئة الباغية﴾ واتە رژێمی حەکەم دانان و جەنگ کردن لەگەڵ کۆمەڵی دەست درێژی کەردا.**

**ئەم رژێمە گرنگە هەرچۆنێ دایهێناوە پێش هەموو جۆرە هەوڵ و تێکۆشانەکانی ئادەمی بۆ ئەو مەبەستە، هەرچۆنێ پێشکەوتووەو زۆر تێرو تەواوە و پاکە لە هەموو لەکەو کەم و کوڕی یەك، مەترسی جەورو لایەنگیری لێ ناکرێ، چونکە گەڕانەوەی هەمووان ئەبێ بۆلای خوای هەمووان و پەروەردگاری هەمووان بێت. ئەفەرموێ: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ**

---

[1] بیچاوی ئەفەرموێ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿کفر﴾ بریتی یە لە دان نەنان بە چاکەو نیعمەتی خوادا. ﴿فسوق﴾ بریتی یە لە دەرچون لە ناوەراست بە زیادە رەوی یان کەم و کوڕی. ﴿عصیان﴾ بریتی یە لە سەرکەشی کردن لە گەردن کەچی خوا.

فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ۖ فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيءَ إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ ۚ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا ۖ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴾ ئەگەر دوو تاقم و کۆمەڵ لە ئیمانداران شەڕو ئاژاوەیان کرد لە نێوان خۆیان دا، دەست بەجێ پەلامار بدەن بۆ یەکخستن و ئاشت کردنەوەیان و چاك کردنەوەی تێك چوونی نێوانیان، بە ئامۆژگاری و بانگ کردنیان بۆ لای خوا.

ئینجا ئەگەر یەکێکیان دەست درێژیی ئەکرد بەسەر ئەوی تریان دا واتە یەك نەئەکەوت ئەوە جەنگی لەگەڵ دا بکەن و کۆتایی لێ مەهێنن و وازی لێ نەهێنن تا ئەگەڕێتەوە بۆلای فەرمانی خوا، کە بریتی یە لە کۆتایی هێنان لە ئاژاوەو رازی بوون بە فەرمان و بڕیاری خوا لەو شتەدا کە ئاژاوەیان هەیە تێیدا، ئینجا ئەگەڕ گەڕاوەو کۆتایی هێنا لە سەرکەشی بە عەدالەت، یەکیان بخەن، بەینیان چاك بکەنەوە بە گوێرەی فەرمان و بڕیاری خوا، لەسەر هەموو کارو فەرمان دا بە عەدل و بە گوێرەی فەرمانی خوا رەفتار بکەن. چونکە خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێت کە بەو جۆرە رەفتار ئەکەن.

ئەم ئایەتە بە بۆنەی ڕووداوێکی تایبەتی یەوە هاتبێتە خوارەوە وەکو لە چەند کتێبی حەدیس و تەفسیردا ئەفەرموێ: یان هەر لە ڕێوە یاسایەکە هاتۆتە خوارەوە بۆ چارەسەری هەر ئاژاوەو ناکۆکی یەکە ڕوو بدات لە نێوان ئیمانداران دا. بە هەر جۆرێ بێ دیارە یاسایەکی گشتی نەگۆڕاوە هاتۆتە خوارەوە بۆ پاراستنی کۆمەڵ و گەلی موسڵمانان لە بەش بەش بوون و پچڕانی پەیوەندی برایەتی یان و دەست درێژیی یان لە یەکتر، بۆ دامەزراندن و بەهێز کردنی حەق و عەدل کە بڕیاری خوایە. ئەم ئایەتە سیفەتی ئیمان هەر ئەهێڵێتەوە بۆ ئەو دوو کۆمەڵە کە شەڕو ئاژاوە ئەکەن لەگەڵ ئەمەدا هەڵئەگرێ یەکێکیان دەست درێژیی بکات بەڵکو هەڵئەگرێ کە هەردوو کۆمەڵ ناڕەوایی و دەست درێژیی بکەن هەریەکە لە ڕوویەکەوە، ئەویش یەکێکە لە لوتف و بەزەیی یەکانی خوا کە بە تاوان و ناڕەوایی وا گەورەیش هەر بەندەکانی لە قەڵای ئیمان دەر ناکات.

إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلْأَلْقَٰبِ

---

خوای گەورە دوای ئەو بڕیارە دڵی ئیمانداران ئەهێنێتە پەرۆش بۆ ئەمەی بە توندی ئەو فەرمانە بگرن و هەڵسن بەو یەك خستن و بڕینەوەی ئاژاوەیەوە هەروەها ئاژاوەکەرانیش کۆتایی بێنن لە ناڕەوایی، گوێڕایەڵی بکەن. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[1] ئیمانداران هەموو برای یەکن، واتە نابێ هیچ بارێکیان ببێ دژی برایەتی، چونکە دامەزراون لەسەر یەك بنەڕەت کە ئیمانە، ئیمانەکەشیان هۆی ژیانی کامەرانی نەبڕاوەیە، کەواتە ئاژاوەو تێك چوونی نێوانی براکانتان چاك بکەن، سوڵحیان بکەن، لە خوا بترسن لەمەی کە پێچەوانەی بڕیارو حوکمی خوا بجووڵێنەوە، یان گوێی پێ نەدەن و بە گرنگ نەیگرن، بەڵکو رەحمتان پێ بکرێ لەسەر گوێڕایەڵیتان و هەڵسانتان بەو فەرمانە. بێگومان هەرکات ئیمانداران هۆشی ئەو برایەتی یەیان پێوە بێ کە خوا بڕیاری داوە لە نێوانیان دا، هەرکات ئەوەیان لەبیر بێت ئەبێ هەر خۆشەویستی و ئاشتی و یارمەتی و یەکێتی بڵاو ببێتەوەو جێگیر ببێ لە نێوانیان دا، ئەبێ دوژمنایەتی و ئاژاوە بە بەسەرهاتێکی ناڕەوای تایبەتی تەماشا بکرێت کە دژی پێچەوانەی ئەو برایەتی یەیە کە بنەڕەتەکەی ئیمانەکەیانە، بە گوێرەی سروشتی ئادەمی کە هەڵە بازە هەرکات ئیمانداران کەوتنە هەڵەی ئاژاوەو شەڕو شۆڕو دوژمنایەتی، ئەبێ بیر بکەنەوەو بگەڕێنەوە بۆ سایەی ئەو برایەتی یەیان کە بنەڕەتەکەی ئیمانەکەیانە. ئەگەر خۆیان بۆ خۆیان ئەو بیرەیان نەکردەوەو نەگەڕانەوە، ئەوکاتە خوای گەورەی خاوەن بەزەیی فەرمانی داوەو پێویستی کردووە لەسەر شانی کۆڕی ئیماندارانی تر کە بە زۆر شەڕو ئاژاوەکەیان نەهێڵن تا رادەی

---

[1] شوێنەکە شوێنی(ضمیر) ە. واتە ﴿بینهما﴾ بەڵام فەرموی: ﴿أخویکم﴾ بە ئیزافە کردنی بۆلای ئەو ئیماندارانەی کە ئەو فرمانەیان پێ سپێرراوە بۆ زیادە هاندان لەسەر تێکۆشان لە بەجێ هێنانی فەرمانەکەیان دا، هەروەها بۆ ئەمەی کە بێداریان بکاتەوە کە کارەکە تایبەتی هەیە بە خۆیانەوە، چونکە کاری برای خۆیانە، بە دووان فەرموی چونکە ئاژاوەکەران دوو کۆمەڵن یان لەبەر ئەمەیە لای خوارووی بە دوو کەس ئەبێ.

بەکارهێنانی چەك و کوشتنی ئەوەی سەرکەشی ئەکات و ئەو موسڵمانانەی سەرپێچی ئەکەن با زۆر زۆر موسڵمانیش بن کوشتنیان ڕەوایەو خوێنیان حەڵاڵە لەبەر پاراستنی کۆمەڵی موسڵمانان لە تەفرەقەو بەش بەش بوون و پچڕانی پەیوەندی برایەتی یەکەیان وەکو لە پێشەوە باس کرا. ئیتر ئەوانەی کە شەڕو ئاژاوەیان هەیە، ئایا دوو کۆمەڵ بێت لەگەڵی موسڵمانان یان کۆمەڵێ بێت هەڵگەڕابێتەوە لە پێشەوای شەرعی موسڵمانان؟ یان بیەوێ خۆی جوێ بکاتەوەو پەیمان نەدا بە پێشەواو کاربەدەستی ڕاستەقینە، چونکە لە ڕژێمی ئیسلام دا ئەبێ هەموو موسڵمانان یەك پێشەوایان هەبێ و ئەبێ هەموو شوێن یەك سەرکردە بکەون و ئەگەر هاتو یەکێ بە شەرع کرا بە پێشەواو پەیمانی پێ درا، ئیتر هەرکەسێ تر داوا بکات ئەبێ بەرگری بکرێ و ئەم ئایەتەی بەسەردا بەجێ بهێنرێ، بە گوێرەی بڕیاری ئەم ئایەتە حەزرەتی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – کوشتاری کرد لە بەسەرهاتی(جەمەل و صفین) دا، گەورەو زاناکانی یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یارمەتی یان داو بە گرنگی کوشتاریان کرد لەو دوو بەسەرهات و کارەساتە ناهەموارەدا کە ڕووی کردە کۆمەڵی موسڵمانان، چەند کەس لە ئەسحابەکان کە خۆیان گرتە دواو یارمەتی حەزرەتی عەلی یان نەداو بێ دەنگ و بێ لایەنگر مانەوە وەکو(سەعدو ئیبن و عومەر و ئوسامەو محمدی کوڕی مەسلەمە) یان لەبەر ئەمە بوو حەقیان بۆ ڕوون نەبووبووەوە، یان لەبەر ئەوە بوو – وەکو پێشەوا جصاص – ئەڵێ: لایان وابوو کە حەزرەتی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – کۆمەڵێکی وای لەگەڵ دایەو پێویست ناکات بەمان، بەڵام باری یەکەم بەهێزترە وەکو وەرگیراوە لە پاشان لە قسەی خۆیانەوە، هەروەها بەڵگەیەکی تر ئەمەیە کە حەزرەتی(ئیبن و عومەر) لە پاشان پەشیمانی دەربڕی لەسەر ئەوە کە یارمەتی پێشەوای ڕاستەقینەی نەدا، حەزرەتی عەلی. هەرچەندە پێویستە هەموو موسڵمانان یەك پێشەواو یەك سەرکردەیان هەبێ، بەڵام ئەگەر هاتو چەند سەرکردەیەکیان بۆ پەیدا بوو وەك بینرا لەو کاتانەشدا بڕیاری ئەم ئایەتە هەر دەست ئەدا کە بەجێ بهێنرێ چ بۆ ناوخۆی هەموو میری و دەوڵەتێ و چ بۆ نێوانی میری یەك لەگەڵ میری یەکی تردا، لەو کاتانەشدا پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانان و کاربەدەستان پەلامار بدەن و بکەونە بەین بە گوێرەی ئەو ڕژێمەی کە ئەم ئایەتە هێنای، ئەو ڕژێمەی کە ئیسلام دایهێناوە دەست ئەدا بۆ هەموو چەرخ و گەل و چینێ هەتا هەتایەو ناگونجێ بۆ گۆڕان بە شتێ تری باشتر یان بە وێنەی ئەم. هەموو یاساو ڕژێمی ئیسلام هەروایە، بەڵام بڵێین چی زۆربەی خەڵکی سەرلێ شێواوەو نایەوێ لەبەر ڕووناکی خۆردا دانیشێ و خۆی ئەخاتە ناو

تاریکی و ئەیەوێ رووناکی وەرگرێ لە قوتوولەیەك کە بە فتیلەی چڵکن و نەوتی رەش ئیش ئەکات، خوا پەنامان بدات. ئەو گەلە بەرزو پاك و خاوێنەی کە ئیسلام هەڵی ئەخات بە رێنموونی قورئان و لەژێر چاودێریی قورئان دا گەلێکی وایە کە داب و باوی ئێجگار بەرزە، بۆ هەموو یەکێ لە ئەندامەکانی رێزی خۆی هەیە نابێ زامدارو لەکەدار بکرێ. رێزی هەموو یەکێ لە ئەندامەکان بەشێکە لە رێزی گشتی و زامدار کردن و لەکەدار کردنی هەموو ئەندامی ئەگەڕێتەوە سەر هەموو گەل، تەنانەت ئەگەڕێتەوە بۆ سەر لەکەگرەکەیش، چونکە لە ئیسلام دا کۆمەڵ و گەل هەموو یەك بەشن و یەك پارچەیەو رێزی هەریەکێ رێزی هەمووەو رێزی هەموو گشتی رێزی هەموو یەکە یەکەیە.

ئینجا با باش گوێ بگرین لەم ئایەتانە لەم بابەتەوە، بە رێکی پەندو تەمێکانی وەربگرین و گوێڕایەڵی بکەین بۆ فەرمانەکانی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ﴾[1] ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە با هیچ کۆمەڵە پیاوێك گاڵتەو لاقرتی نەکات بە هیچ کۆمەڵە پیاوێکی تر، چونکە لەوانەیە ئەمان لای خوا چاکتر بن لە لاقرتی کەرەکان، با هیچ کۆمەڵە ئافرەتێك گاڵتە نەکات و لاقرتی نەکات بە هیچ کۆمەڵە ئافرەتێکی تر، چونکە لەوانەیە ئەمان چاکتر بن لای خوا لەوانەی لاقرتی یەکە ئەکەن. واتە ئیمانداران چ پیاو چ ئافرەت لاقرتی نەکەن بە یەکترو بە چاوی سووك و ریسوایی تەماشای یەکتر نەکەن. بێگومان ئەم خووە ناپەسەندە زۆرە لەناو گەل دا بەهۆی هەندێ شتەوە کە بە خاوەن نرخ دائەنرێن، بۆ وێنە ئەبینرێ کە ساماندار لاقرتی ئەکات و بە چاوی سووك تەماشای بێ دەست و فەقیر ئەکات، هەروەها بەهێز بۆ لاوازو بێ هێزو ساغ و سەلیم بۆ نەخۆش و ناتەواوو شەل و کوێر، زیرەك بۆ تەمەڵ، فامدار بۆ بێ فام و نەزان. ئەولاد دار بۆ وەجاغ کوێر، کەس و کاردار بۆ بێ کەس، هەروەها ئافرەتێ بەرواڵەت و جوان لاقرتی ئەکات و چاوی ریسوایی تەماشای ناشیرین و بێ رواڵەت ئەکات، یان گەنج دەربارەی پیر.

---

[1] وشەی ﴿قوم﴾ لە زمانی عەرەبیدا بۆ پیاو دانراوە لە ئەسڵ دا، هەندێ جار بەکار ئەهێنرێ و مەبەست هەردوو تیرەکەیە، وەکو ﴿قوم نوح﴾ بەلام لەو کاتانەدا مەجازەو لێرەدا ئەبێ مەبەست پێی هەر پیاو بێ، چونکە لە بەرامبەری یەوە ئافرەت باس کراوەو هیچ بەڵگەیەکیش نی یە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتیش مەبەست بێت، بە شێوەی کۆمەڵ قەدەغەی کرد، چونکە زۆرتر ئەو لاقرتی یانە لە شوێنە گشتی یەکان دا ئەکران لە نێوان تاقمەکان دا ئەگەر نا لاقرتی کردن قەدەغەیە کۆمەڵ بیکات یان یەك کەس.

ئەم خوە ناشیرینە دەردێکی زۆر کاری یە لەناو گەل داو هۆکەشی ئەو جۆرە شتانەیە کە بە دیمەن بەنرخن و خەڵکی بە خاوەن نرخی تەماشا ئەکەن وەکو باس کرا. ئەوا خوای گەورە قەدەغەی کردووەو تێشمان ئەگەیەنێ کە ئەوەی نرخی ببێ لای خوا شتی ترە، جگە لەمانەیە کە لەم زەوی یەدا نرخدارن لای نەفامان، کەواتە ئیماندار ئەبێ شەرم بکات و بترسێ لە لاقرتی کردن نەوەك لاقرتی پێ کراوەکەی لای خوا خاوەن نرخ بێت ئەو کاتە ئەبێ گاڵتە بکات و بە سووکی تەماشای کەسێ بکات کە بەلای خواوە بە نرخە کە ئەویش ئەوپەڕی بێ شەرمی و تاوانێکی ئێجگار گەورەیە.

قورئان هەربەوەوە نەوەستاوە، بەڵکو سۆزی برایەتی ئیمانی ئەهێنێتە جۆش، تاڕادەیەك هەموو ئیمانداران وەکو یەك لەش و یەك نەفس لێ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾[1] نەفسی خۆتان رەخنەدارو زامدار مەکەن، مەبەست ئەوەیە رەخنەو عەیب لە یەکتر مەگرن، بەڵام بەو جۆرە فەرموی تا ئەو یەکێتی یە بگەیەنێ بۆ ئەمەی باشتر خۆ پارێزیی بکرێ لەوتاوانە[2]. هەندێ لاقرتی کردن بەمە ئەکرێ کە بانگی یەکێ بکرێ بە ناوێکی ناشیرین کە پێی ناخۆشە بەو ناوە بانگ بکرێ، هەستی لەکەو تانەو تەشەری لێ ئەکا، ئەوە هەر لە کۆنەوە بوو تا ئیسلام هات قەدەغەی کرد، تەمێی ئیماندارانی کرد کە ئەزیەتی برا دینی یەکانی خۆیان نەدەن بەو ناوە ناڕێکانەوە بانگیان نەکەن، هەروەها پێویستە ئیماندار دەم پاك بێت شتی ناشیرین بەدەمی دا نەیەت، کەواتە شتێکی ناڕەوایە بۆ هەردوو: بانگ کەرو بانگ لێ کراو، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِ﴾ بانگی یەکتر مەکەن بە ناو و لەقەبی ناشیرین و خراپ، کەواتە ئەبێ ئیمانداران ناوی ناڕێك و ناشیرین لە یەکتر نەنێن، ئەگەر کەسێ ناوی چاك و خراپیشی هەبوو، ئەبێ بە ناوە چاکەکەی بانگ بکرێ، ئەگەر هەر ناوی خراپی هەبوو پێویستە بگۆڕرێ بۆ ناوی چاك و شایان.

---

[1] هەندێ ئەفەرمون مەبەست ئەوەیە: مەبن بەهۆی عەیب و رەخنە لەخۆتان، بەم جۆرە کە ئێوە خەڵکتان عەیب دار کرد خەڵکیش ئێوە عەیب دار ئەکات.

[2] وشەی ﴿لمز﴾ لە بنچینەدا دانراوە بۆ زامدار کردن، کەواتە بە گوێرەی بنچینەکەی: خۆتان زامدار مەکەن، کەواتە بەم وشە دڵ باشتر دائەچڵەکێ تا وشەیەکی تر کە ئەم مەعنایە ئەگەیەنێ.

بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟

پێغەمبەر(ﷺ) چەند ناوو لەقەبێکی ناشیرینی چەند کەسێکی گۆڕی کە لەوەوپێش لەکاتی جاهیلی دا باو بوو بەو لەقەبانەوە بانگ ئەکران. ئینجا سیفەتی ئیمان بیر ئەخاتەوەو ئەیهێنێتە جۆش بۆ بەرگری ئەم گوناهە بەمەی کە ئەمە دژی ئیمانە وەکو هەڵگەڕانەوە لە ئیمان وایە، ئەو کەسانەی کە ناگەڕێنەوە بۆلای خواو تۆبە ناکەن زاڵمن، ئەفەرموێ: ﴿بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ مەردوم پاش ئیمان هێنان ئیتر زۆر ناشیرین و خراپە ناوبانگی گوناهو تاوان بکەوێتە شوێنی، بەو جۆرە باس بکرێ و ناوببرێ، واتە بانگ کردنی خەڵکی بەناوی خراپ و ناڕەوا گوناهەو قەدەغە شکاندنەو دەرچوونە لە سنووری ئیمان. لەپاش ئیمان زۆر ناڕەوایە گەڕانەوە بۆ ئەوانە، هەرکەس تۆبەی لێ نەکات ئەو کەسانە زاڵمن چونکە لەباتی گوێڕایەڵی سەرکەشی ئەکەن، خۆیان ئەخەنە بەر قارو غەزەبی خوا، خوا پەنامان بدات بە رەحم و بەزەیی خۆی. ئا بەو جۆرە نایابە بنەڕەتی یە ئەدەبی دەروونی دائەڕێژێ بۆ ئەو گەلە قورئانی یە بەرێزە.

ئینجا بەرهەڵست و پەرژینێ تر بۆ گەلی ئیماندار فەراهەم ئەهێنێ بۆ بەرگری یان لە شکاندنی رێزو سەربەستی خەڵکی و فێری ئەوەیشیان ئەکات کە چۆن هەست و دڵ و دەروونیان پاك و خاوێن بکەنەوە لە ئاستی برا ئیماندارەکانیان. بە گوێرەی باوی خۆی لە پێشەوە بە سیفەتی ئیمان بانگیان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ﴾ ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە خۆتان دوور خەنەوە لەزۆر لەو گومانانەی کە دێت بە دڵ و دەروون دا واتە دەروونی خۆتان پاك بکەنەوە لە ئاستی خەڵکی و خۆتان مەدەن بەدەم هەمووگومانێکەوە، چونکەهەندێ گومان بردن گوناهە،چونکەناحەق و ناڕاستە.

گومان سێ بەشە: هەندێ پێویستە شوێن کەوتنی وەکو گومانی خێرو چاکە بەخوا، هەروەها گومان بردن لە کاروباری ئایینی کە پەیوەندی بە بیرو باوەڕەوە نی یە، بەڵکو

پەیوەندی بە کردەوەوە هەیە، وەکو گومانی پێشەواو زاناکانی موسڵمانان دەربارەی ئەو بڕیارە شەرعی یانەی کە دەلیل و بەڵگەی تەواوی لەسەر نی یە، لەو بابەتانەوە گومانیان چۆن بوو ئەبێ شوێن بکەون و رەفتاری پێ بکەن.

هەندێ تر لە گومان حەلاڵە وەکو گومان بردن لە کارو فرمانی ژیان و گوزەرانی ئەم جیهانەدا، گومانی قازانج و زیان و چاکی و خراپی و... هتد. بەشی سێ یەم قەدەغەو گوناهە وەکو گومان بردن لە کاروباری ئایینی ئەوەی پەیوەندی بە عەقیدەو باوەڕەوە هەیە، هەم وەکو گومانی خراپ بە ئیمانداران لە خۆوە بێ نیشانەو بەڵگەیەکی بەهێز، ئەوەی کە لێرەدا جێگای باسەو مەبەستە لەم ئایەتەدا ئەم بەد گومانی یەیە لە ئاستی ئیمانداران، بەلاّم بە شێوەی نادیاریی ئەیفەرموێ: بۆ ئەمەی ئیحتیات بکرێ لە هەموو گومانێك داو بیر بکرێتەوە لێ ی تا بزانرێ لە بەشی گوناهو قەدەغەیە یان نا؟ ئا بەم جۆرە قورئان دەروون پاك ئەکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی و بەد گومانی تا نەکەوێتە گوناهەوە، ئەیەوێت پاك و بێگەرد بێت دەربارەی براکانی ئەو خۆشەویستی یەی کە لە دڵی دایە گەرد نەگرێ، بە چاوی بێ لەکەیی بە هەموو ئارامی و دڵپاکی یەوە بژین هەموو پێکەوە، ئای چ شیرینە ژیان لەناو گەلی وادا!! بەلاّم وەنەبێ مەبەست تەنها پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروون بێت و بەس، بەڵکو بڕیاری ئەم ئایەتە بیروباوەڕو یاسایەکە بۆ رەفتار کردن لەگەڵ خەڵك داو پەرژینە بۆ پاراستنی ماف ئەو کەسانەی کە لەناو گەلی موسڵمانان دا ئەژین. بەم جۆرە هیچ کەس تۆڵەی لێ ناسێنرێ بەهۆی گومانی تاوانەوە پێ ی، هیچ کەس نابرێ بۆ دادگا بۆ محاکمە کردن بەهۆی ئەوەوە گومانی خراپەکاری لێ کراوە، بەڵکو گومانی رووت نابێتە هۆی تەحقیقات و لێکۆڵینەوە لەگەڵ گومان پێ براودا.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿إذا ظننت فلا تحقق﴾ [1] کەواتە هەموو کەسێ بە بێ تاوان تەماشا ئەکرێ و هەموو ماف و سەربەستی ئەپارێزرێ، بە گومانی رووت هیچی دەربارە ناکرێ هەتا روون نەبێتەوە کە شتەکەی کردووە، جێنشینی دووەم عومەری فاروق – خوای

---

[1] تەبەرانی ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە حاریسەی کوڕی نوعمانەوە، واتە بە پێ ی گومانت رەفتار مەکە.

لیٚ رازی بیٚت – هەڕەشەی ئەبو لۆلۆئەی بیستبوو، خۆیشی فەرمووی ئەمە هەڕەشەی لیٚ کردووم، ئەو کابرایە بەندەیەکی ئاگر پەرستی غەریب بوو لە مەدینەدا، لەگەڵ ئەمەدا هیچی دەربارە نەکرا، بەڵکو هەر بانگیش نەکرا بۆ تحقیقات و لیٚپرسینەوە، بە سەربەستی ئەخولایەوە تا ئەو هەڕەشەیەی بردە سەر، ئەو کردەوەیەی کرد کە کردی: لە نویٚژی بەیانی دا لەکاتی پیٚش نویٚژیی دا جیٚنشینی دووەمی شەهید کرد.

ئیسلام تا ئەم رادە پاریٚزگاری ریٚزو سەربەستی و مافی ئادەمیزاد ئەکات. دەی با بزانین ئایا لە چ میٚژوویەك دا و لە چ ولاٚتیٚك داو لە چ رژیٚم و بیرو باوەڕیٚکی تردا شتی ئاوا بە خەویش ئەبینریٚ؟ لە چ ولاٚتیٚ لەوانەی کە پیٚیان ئەوتریٚ دیموکراتی و بەناوبانگن لە بابەت بەجیٚ هیٚنانی ماف و ریٚزی ئادەمی یەوە، لە کام لەوانە بە خەتەریش بە دڵ دا دیٚت ئا ئەمەی کە قورئان لەم ئایەتانەدا بانگی ئیمانداراانی بۆ ئەکات و لە ژیانیش دا پیٚکی هیٚناو بنەڕەتی گەلی موسڵمانی لەسەر داڕشت.

ئینجا ئەڕوا بۆ یاساو بیروباوەڕیٚکی تر کە پەیوەندی بەمەی پیٚشەوە هەیە ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ جوست و جۆ مەکەن بۆ دۆزینەوەی لەکەو عەیبی خەڵکی، نەکەونە شویٚن خراپەو تاوانی خەڵکی و مەگەڕیٚن بە دوای دا، واتە دەخلتان نەبیٚ بە پەنهانی و نهیٚنی خەڵکی یەوە. ئەم جوست و جۆکردن و گەڕان بە شویٚنی لەکەو خراپەدا هەندیٚ جار لە بەدگومانی یەوە پەیدا ئەبیٚت، هەندیٚ جار سەربەخۆ لە ریٚوە بە هەردوو جۆرەکە لیٚرەدا مەبەستە بۆ قەدەغە کردن.

قورئان بەرهەڵستی و بەرگری ئەم کردەوە بیٚ نرخە ئەکات بۆ پاك و خاویٚن کردنەوەی دڵ و دەروون و رەوشت لەم کردەوە ناڕەواو لەم خووە پیسە، بەلاٚم ئەمیش وەکو پیٚشوو مەبەست تەنها ئەو پاك و خاویٚن کردنە نی یە، بەڵکو ئەمیش یاساو بیرو باوەڕیٚکی گرنگ و سەردەستەیە لە رژیٚمی کۆمەلاٚیەتی دا، لە بەجیٚ هیٚنانی هەموو کارو فرمانی یاسادانان و جیٚ بەجیٚ کردنی(تشریعی وتنفیذی) دا لەناو گەلی بەرزی بەڕیٚزی ئیسلام دا خەڵکی ئەژین بە جۆریٚ بە ئارام و ئاسایش هیچ مەترسی یەکیان نی یە نە لە خۆیان و نە لە ماڵیان و شتی نهیٚنیان و نە لەو کارو کردەوانەیان کە پیٚ یان ناخۆشە ئاشکرا بن لای کەس، بەهیچ جۆر

ڕێگا نی یه بۆ شکاندنی ڕێزی هیچیٚ لەوانە، تەنانەت بەرگری کردنی تاوان و خراپەکاری – کە پێویستە لەسەر کاربەدەست – نابێتە هۆی ڕوودانی ئەم کردەوە بەدە کە لەم ئایەتەدا قەدەغەی کرد، واتە ڕەوا نی یە بۆ کاربەدەستیش بە بگەڕیٚ بە شوێن تاوان و خراپە نهێنی یەکان داو خەڵکی بە گوێرەی دیمەن و زاهیرەکەی تەماشا ئەکریٚ و هیچ کەس ماڤ ئەوەی نی یە بگەڕیٚ بە شوێن نهێنی و پەنهانی دا، تاوان و خراپە لە کاتی ئاشکرا بوونی دا تۆڵەی لەم جیهانەدا هەیە.

ئەبو داود ئەفەرمویٚ: ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبە بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو موعاویەوە ئەویش لە ئەعمەشەوەو ئەویش لە زەیدی کوڕی وەهبەوە. زەید ئەفەرمویٚ: هاتنە خزمەت ئیبن و مەسعود – خوا لیٚ یان ڕازی بێت – عەرزیان کرد: فلأن ریش ئارەقی لیٚ ئەچۆڕیٚ. ئەویش فەرموی: ئێمە بەرگریمان لیٚ کراوە بگەڕێین بە شوێن کردەوەی نهێنی خەڵکی دا، بەلأم ئەگەر شتێکمان بۆ دەرکەوت بە پیٚی ئەوە ڕەفتار ئەکەین.

پێشەوا موجاهید لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەفەرمویٚ: تۆڵە لەسەر تاوانیٚ بسێنن کە دەرئەکەویٚ بۆتان، واز بێنن لەوەی خوا پەردەی داوە بەسەری دا، واتە تاوانە نهێنی یەکان.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەگێڕێتەوە لە(دەجین) ناو کاتبی عوقبەی کوڕی نافیع – خوای لیٚ ڕازی بێت – ئەڵیٚ عەرزی عوقبەم کرد: کە چەند دراوسیٚ یەکمان هەیە عارەق ئەخۆنەوە، من بانگی سەربازیان بۆ ئەکەم. ئەویش فەرموی وا مەکە، بەلأم مۆچیاریان بکەو هەڕەشەیان لیٚ بکە. ئەویش بەو جۆرەی لەگەڵ کردن و سوودی نەبوو ئینجا وتی بانگی سەربازیان بۆ ئەکەم، عوقبەش فەرموی: هاوار بۆ تۆ وا مەکە چونکە من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە ئەیفەرمو: ﴿من ستر عورة مؤمن فكأنما استحيا مؤدة﴾ [1].

لە کتێبی سیرەت دا ئەگێڕێتەوە کە جێنشینی دووەم – خوای لیٚ ڕازی بێت – شەو ئەگەڕا بە مەدینەدا – بە گوێرەی باوی خۆی کە ئارامی نەبوو لە ترسی ئەمەی کە شوانی گەلە لە هەرچی ڕوو بدات پرسیاری لیٚ ئەکریٚ – لەماڵێك دا گویٚی لە گۆرانی و بەزمیٚ بوو

---

[1] واتە هەرکەسیٚ عەیب و لەکەی ئیماندارێك داپۆشیٚ وەکو کچێکی زیندە بەچاڵ کراو لە گۆڕەکەی زیندوو بکاتەوەو بە زیندوویی دەری بێنیٚ وایە. ئەبو داود و نەسائی لە لەیسی کوڕی سەعدەوە.

گومانی برد کە ئەوانە ئارەق ئەخۆنەوە خۆی پێ نەگیرا بەسەر دیواردا بازی دا ناو خانووەکەو بەجۆرێ تێیخوڕین، خاوەن ماڵەکە ناسی کە حەزرەتی عومەرە وتی: یا امیر المؤمنین بە هێواشی تۆ خۆت لە سێ بارەوە پێچەوانەی فەرمانی خوا جوڵاّیتەوە، جارێ ئاگات لەخۆت بێت، ئەمیش فەرموی چۆن؟ ئەویش عەرزی کرد:

١- خوا ئەفەرموێ: ﴿یا ایها الذین آمنوا لا تدخلوا بیوتا غیر بیوتکم حتی تستأنسوا و تسملوا علی اهلها﴾ [1] تۆ نە پرست کرد و نە سەلام.

٢- خوا ئەفەرموێ: ﴿واتوا البیوت من ابوابها﴾ [2] تۆ لە قاپی یەوە نەهاتیتە ماڵەوە.

٣- خوا ئەفەرموێ: ﴿ولا تجسسوا﴾ [3] تۆ گەڕایت بە شوێن لەکەو عەیبی خەڵك دا.

ئینجا حەزرەتی عومەر - خوای لێ رازی بێت - وتی راست ئەکەیت، چووە دەرەوەو پەشیمان بووەوە لە کردەوەی خۆی. بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانەو زۆر شایانی بیر لێ کردنەوەیە: کابرایەکی کەم نرخ کە جێگای گومانی خراپەکاریش بێت ئا بەو جۆرە چەلان بەرچەلانی سەرۆك و پێشەوای گشتی بوەستێ و بیباتەوە بە خۆی داو تاوانباریشی بکات لەسەر ئەمەی بێ پرس چووەتە ماڵی، بە شوێنی لەکەو خراپەیدا ئەگەڕێ، ئا بەو جۆرە بوەستێ لە رووی داو ئەویش هیچی بۆ نەمێنێتەوە پەشیمانی و سەرداخستن نەبێ. ئایا شتی وا بە خەویش ئەبینرێ لەو ولاّتانەیش دا کە ناوبانگیان پەیدا کردووە بە دیموکراتی و پارێزگاری ماف ورێزی ئادەمی؟هێشتابەخەویش نابینرێ لەپاش ئەمەی کەئیسلام بە ١٤٠٠ ساڵ پێش بەوجۆرەرێزوسەربەستی ومافی ئادەمی داوبەکردەوەبەدی هێنابێ کەم وکوڕی!!

---

[1] واتە: ئیماندارەکان نەچنە هیچ ماڵێ کە ماڵی خۆتان نەبێ هەتا پرس نەکەن و سەلام نەکەن لە خاوەن ماڵەکە، . سورەتی ﴿النور / ٢٧﴾.

[2] واتە لە قاپی یەوە بچنە ماڵان. سورەتی ﴿البقرە / ١٨٩﴾.

[3] واتە مەگەڕێن بە شوێن و لەکەو عەیبی خەڵکیداو جوست و جۆ مەکەن بۆ ئاگاداری بەسەر خراپەی نهێنی خەڵك دا. سورەتی ﴿الحجرات /١٢﴾.

ئینجا بەرگری و قەدەغەی غەیبەت دێتە پێشەوە: قەدەغەی بەو جۆرەی کە هەر لە دەستی قورئان دێت، هەر بەخۆی ئەکەوێ کە شێوەی راستەقینەی هەرشتێ بخاتە پێش چاو، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ با هەندێکتان غەیبەتی هەندێکی ترتان نەکات، واتە ناوی یەکتر مەبەن لەپاش ملێ بە جۆرێ کە ناوبراو پێی ناخۆش بێت، ئایا هیچ کەس لە ئێوە پێی خۆشە کە گۆشتی برای خۆی بە مردویی بخوات؟ واتە ناوبردنی ئیمانداران بە خراپەو لەپاش ملێ وەکو خواردنی گۆشتیان وایە بە مردوویی. دەی بێگومان ئەوەتان پێ ناخۆشە، کەواتە ناوبردنەکەش وەکو ئەوە وایە بێزی لێ بکەنەوە. با تەماشا بکەین و بیر بکەینەوە لەمەی لەم ئایەتەدا لە چەند روویەکەوە ئەم قەدەغەی بەتین و بەهێز کرتووە:

١- وێنەو نموونەیەکی زۆر قێزەون و بێزار ئەهێنێتەوە بۆ قەدەغە کراوەکە کە بە بیر لێ کردنەوەشی ئەزێت ئەکات بە دڵ و دەروون، بە بینینی قێز ئەکرێتەوەو ئێڵنج دێت: شێوەی خواردنی گۆشتی برای خۆی بە مردوویی!!

٢- هێنانی ئەو وێنەکاری یە بە شێوەی پرسیاری بێزاری دەربڕین بۆ گەیاندنی زیادە دان نان بە بێزاری وێنەکەدا.

٣- بەکارهێنانی وشەی پێخۆشی و خۆشەویستی بۆ شتێ کە ئەوپەڕی پلەی قێزەونی و بێزاری هەیە، واتە ئەوەندە نەفامن شتی واتان پێ خۆشە؟

٤- گەیاندنی شێوەی گشتی لە وشەی ﴿أَحَدُكُمْ﴾ دا، واتە ئەو وێنە ئەوەندە بێزراوە هیچ کەسێ نی یە ئەوەی پێ خۆش بێت.

٥- هێنانی رستەی ﴿فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ بەدوی وێنەکاریەدا بۆ ددان پیانان و روون کردنەوەی بێزاری و قیزەونی یەکەی.

دوا بەدوای قورئان پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر بە توندی دوا لەم گوناهە، لە چەند فەرمایشێ دا دڵی داچڵەکان لە تارمایی رەشی ناشیرینی ئەم تاوانە، ئەبو داود حەدیسێ ئەهێنێ لە

حەزرەتی عائشەوە – خوای لیٚ رازی بیٚت – کە جاریٚ بە گویٚرەی سروشتی ئافرەت لە هەویٚ ساریدا ئەفەرمویٚ: وتم بە پیٚغەمبەر(ﷺ) دەربارەی حەزرەتی صفیە – خوای لیٚ رازی بیٚت – – کە یەکیٚکە لە دایکی ئیمانداران – صفیە کولٚت بەسە، ئەویش فەرموی: بیٚگومان وشەیەکت وت ئەگەر تیٚکەڵی ئاوی دەریا بکریٚ تیٚکی ئەشیٚویٚنیٚ و ئەیگۆڕیٚ. هەروەها ئەبو داود حەدیسیٚ تر ئەهیٚنیٚ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە – خوا لیٚ ی رازی بیٚت – ئەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر فەرموی: کاتیٚ شەوڕەویم پیٚ کرا بۆ ئاسمانەکان رابوردووم بەلای کۆمەڵیٚك دا نیٚنۆکیان لە مس بوو بەوانەدەم و چاوو سینەی خۆیانیان دائەڕنی، وتم بە جوبرەئیل ئەمانە کیٚن؟ فەرموی ئەمانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی ئادەمی ئەخۆن، واتە غەیبەت ئەکەن.

پیٚشەوا ئیبن کەسیر حەدیسیٚ ئەهیٚنیٚ لە تەفسیرەکەی داو ئەڵیٚ: سەحیحە: ماعیز ناویٚ هاتە خزمەت پیٚغەمبەر(ﷺ) عەرزی کردوە کە زینای کردووەو پاکی بکاتەوە، ئەویش گویٚی نەدا بە قسەکەی هەتا چوار جار لە پاشان لە جاری پیٚنجەم دا بە دریٚژیی پرسیاری لیٚ کرد ئەویش بە باشی روونی کردەوە کە زینای کردووە لە ترسی عەزابی ئاگر ئەیەویٚ پاك ببیٚتەوە و حەددی شەرعی بەسەردا بدریٚ کە رەجم کردنە، چونکە ئەو پیاوە ژنی هیٚنابوو، یانی ژنی حەلاٚلی خۆی هەبوو، لەپاشان پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا رەجم کراو مرد لەپاشان پیٚغەمبەر(ﷺ) گویٚی لە دوو پیاو بوو قسەیان ئەکرد یەکیٚکیان بەویتری وت تەماشا ئەکەیت ئا ئەمە خوا گوناهەکەی پۆشابوو وازی لەخۆی نەهیٚنا هەتا وەك سەگ رەجم کرا. لە پاشان پیٚغەمبەر(ﷺ) تەشریفی رۆیشت هەتا دای بەلای کەرە تۆپیویٚك دا، بانگی کردە ئەو دوو پیاوە کە ئەو قسەی بیست لە یەکیٚکیان و ئەوی تریش گویٚی بۆ گرت فەرموی: دابەزن لە گۆشتی ئەو کەرە بخۆن، ئەوانیش وتیان: خوا لیٚت خۆش بیٚت ئەی پیٚغەمبەری خوا ئایا ئەوە ئەخوریٚ؟ ئەمیش فەرموی ئەوەی کە ئیٚستا وتتان دەربارەی ئەو برا موسڵمانەتان، خراپتربوو لە خواردنی گۆشتی ئەو کەرە تۆپیوە، ئینجا فەرموی: سویٚندم بە کەسیٚ کە گیانی منی بەدەستە ئەو برا موسڵمانەتان ئیٚستا لەناو رووبارەکانی بەهەشت دا خۆی ئەشۆریٚ و مەلە ئەکات.

پاش باسی قەدەغە کردنی ئەم تاوانانە ئینجا هەستی لە خوا ترسان ئەهێنێتە جۆش و ئامارژە ئەکات بۆ کەسانێ کە ئەو تاوان و قەدەغانەیان شکاندووە، بە گەڕانەوە بۆ لای خوا بە چاوەڕوانی رەحم و بەزەیی یەکەی، ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾ بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لە قارو غەزەبی، بەدوورکەوتنەوە لە قەدەغەکانی و هەرکەسێ قەدەغەی شکاندووە بگەڕێتەوە، چونکە خوا زۆر زیادە لوتف ئەکات لە وەرگرتنی گەڕانەوەو تۆبەدا، بەم جۆرە ئەبوورێ لە گوناهی ئەو کەسانەی کە بە راستی ئەگەڕێنەوە، ئیتر گوناهەکانیان هەرچەند زۆر بن، هەر ئەنداز گەورەبن، ئەو تۆبە کارانە وا لێ ئەکات وەکو گوناهو تاوانیان هەر نەبووبێ، خوا زۆر بە رەحم و بەزەیی یە بەو کەسانە کە خۆیان ئەپارێزن لە گوناه، بەو تاوانبارانەی کە ئەگەڕێنەوەو تۆبە ئەکەن لە لای خوا.

ئا بەم جۆرە کەس نەدیوە، قورئان چارەسەری گەلی کرد لە هەموو دەردو نەخۆشی یەکی دەروونی و کۆمەلأیەتی تا گەلەکەی پاك و خاوێن بووەوەو بەرز بووەوەو گەیشتە ئەو رادەو پلەیەی کە مێژووی ئادەمی لە هەموو تەمەنیدا شتی وای بەخۆیەوە نەدیوەو هەرگیز نایشبینرێ لەژێر چاودێریی و پەروەردەو ئالأی ئەم قورئانەدا نەبێ.

پاش ئەم چەند بانگ کردنە لە کۆمەڵی ئیمانداران لە یەکەم جاری سورەتەکەوە تا ئێستا: بانگ کردنیان و دەست گرتنیان بۆ بەرزبوونەوە بۆ ئەو رادە بەرزە رووناکە لە هەموو ناوچەو بارو روویەکی دەروونی و کۆمەلأیەتی یەوە. لەپاش دامەزراندن و دارشتنی ئەو هەموو پەرژین و بەرهەڵستە بەتینە بەمێزانە بە چواردەوری رێزو ماف و سەربەستی ئادەمیزاددا، پاش بەرزبوونەوەو گەیشتنی بەو رادەو پلەی هەرە بەرزە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾

---

پاش ئەمانە هەموو ئینجا بانگ ئەکاتە ئادەمیزاد یەکسەر بە هەموو تیرەو جۆرو رەنگ و شێوەکانی یەوە، بانگی ئەکات بۆ ئەمەی بیانگێڕێتەوە بۆ تاقە بنەڕەتەکەی کە لیٚ یەوە هاتوون، بۆ ئەمەی هەموو بە یەك ترازوو بەراوردی هەموو نرخ و دارو بیٚ نرخیٚ، هەموو چاك و خراپیٚ بکەن. ئەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟﴾ ئەی ئادەمیزاد بە تێکراییی ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە نێرو میٚ یەك و کردومانن بە چەند تیرەو تائیفەیەك بۆ ئەمەی یەکتر بناسن، واتە ئەی گرۆی ئادەمیزاد کە جیاوازن بە چەند تیرەو رەنگیٚ، بەش بەشن بە چەند گەل و نەتەوەو کۆمەڵیٚ ئێوە هەمووتان لە یەك بنەڕەتن، کەواتە دووبەرەکی مەبن و تاقم تاقم لیٚ مەوێستێنەوەو ئاژاوە مەنێنەوە لە نێوان خۆتان دا.

ئەی گرۆی ئادەمی ئەو کەسەی کە ئەم بانگەتان لیٚ ئەکات کەسێکە کە ئێوەی دروست کردووە لە نێرو میٚ یەك و کردوونی بە چەند گەل و کۆمەڵێك بۆ ئەمەی یەکتر بناسن، دۆستایەتی و یەك کەوتنتان ببیٚ نەك بۆ ئەمەی شەڕو ئاژاوەو جیاوازی بنێنەوە، جیاوازی زمان و رەنگ و سروشت و خووڕەوشت و بەکاری پێزانین و وریایی نابیٚ بیکەن بە هۆی ئاژاوەو دووبەرەکی نانەوە. بەڵکو ئەو جۆرە جیاوازی یە مافی ئەوەی هەیە ببێتە هۆی کۆمەکی و قۆڵ گرتنی یەکترو هاوکاری تا بە هەمووتان ئەوەی کە پێویستە بەجیٚ ی بێنن بۆ بەسەر بردنی ژیان لەم جیهانەدا، رەنگ و تیرەو زمان و نیشتمان و ئەم جۆرە شتانە هیچ جۆرە نرخێکی تایبەتی یان نی یە لای خوا، لە ترازووی خوادا هیچ کێشانەو دەنگ و باسێکیان نی یە، تەنها ترازوویەك هەیە لای خوا بۆ بەراوردی چاکەو خراپەو نرخداری و بیٚ نرخی وەکو پیشانمان ئەدات لێرەدا کە ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾ بەرێزترتان بە لای خواوە لە خوا ترس ترتانە، واتە رادەی رێزی بەندە بەلای خواوە بە گوێرەی رادەی لە خواترسی یەتی، هەتا لە پلەی لە خواترسی و گویٚ رایەڵی دا بەرزتر بێت رێزی زۆرترە

لەلای خوا، کەواتە هەرکەسێ کە لە هەموو کەس لەخواترس و گوێڕایەڵ تر بێت ئەو کەسە بە لای خواوە لە هەموو کەس بەرێزترە، کەواتە تەنها شتێ نرخی هەیە بەلای خواوە کە بریتی یە لە لەخواترسان و خۆپارێزیی لە شکاندنی قەدەغەی خوا، ئیتر جگە لەوە هەرچی لەم جیهانەدا نرخی بۆ دائەنرێ و بەربەرەکانێ و ئاژاوەی لەسەر ئەکرێ، ئەوانە هیچی نرخیان نی یە بەلای خواوە، نرخداری راستەقینەش ئەوەیە کە لای خوا نرخی هەبێ، ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان خوا زانایە بە ئێوەو ئاگادارە بەسەر پەنهانی و نادیاریی و هەموو دیوی دەرو ناوتان دا، کەواتە هەرچۆنێ خۆی ئەزانێ چی نرخدارە هەروەها ئەیشزانێ کێ بەراستی لە خواترسە.

خوای گەورە هۆی بەهێزی و نەگۆڕاوی یەکێتی و برایەتی بۆ روون کردووینەتەوە کە بریتی یە لەمەی هەموو تەنها خوایەکمان هەیە کە خوای هەمووە بێ جیاوازی، هەموو یەك بنەڕەتمان هەیە و لەباوك و دایکێ هاتووین. هەروەها تەنها یەك ئالای دیاریی کردووە بۆمان کە تەنها ئەوە بەرز بکەینەوە، تێکۆشان و بەربەرەکانێ ئەبێ بۆ پێشکەوتن بێ لە وەستان دا لەژێر سایەی ئەو تەنها ئالآیەدا، ئالآی لەخوا ترسی و گوێڕایەڵی بۆ خوا بە گوێرەی دواترین و گەورەترین بەرنامەی خوا کە هاتە سەر گەورەترینی پێغەمبەران – سەلات و سەلامی خوا لەسەر هەمووان بێت –. هەرکات تەنها ئەم ئالآیە بەرز بکرێتەوە، ئیتر هەموو جیاوازی نێوان ئادەمی لە پێش چاو ون ئەبێ و خۆی ئەشارێتەوە: جیاوازی رەنگ و خاك و زمان و تیرەو نەژادو سامان و هەروەها هەموو جیاوازیەکانی تری ئەم زەوی یەو ئەم جیهانەیە، تەنها بەو ئالآیە ئادەمی رزگار ئەبن لە تاریکی شەوی رەشی رەگەزایەتی کە ماوەیەکی دوورودرێژە ئاسمانی ئادەمێتی داپۆشیوەو جیهانی ئادەمێتی وێران و بەرباد کردووە.

ئەو رەگەزایەتی یە ناڕەوایەی کە دژو پێچەوانەی ئایینی خوایەو دژی سیفەتی عەدالەت و بەزەیی خوایە، دژی خوو رەوشتی پێغەمبەران و لە خواترسەکانە. ئیتر ئەو رەگەزایەتی یە بە هەموو بەش و وێنەو شێوەکانی یەوە لە هەر دیمەنێك داو لەژێر هەر پۆشاکێك داو بە هەر ناوێکەوە بێ، هەمووی زۆر دوورە لە ئیسلامەوە، ئیسلام کۆنابێتەوە لەگەڵی دا، ئیسلام قەدەغەی ئەکات و بەرگری ئەکات بۆ ئەمەی رژێمی ئادەمێتی خۆی بچەسپێنێ لەژێر تاقە

ئالآكەدا(ئالآی خوا)... نەك ئالآی نیشتمان، یان ئالآی نەتەوە، یان ئالآی هەر بیرو باوەڕێكی تر، ئای چەند گرنگە فەرموودەكانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە بەرگری و قەدەغەكردنی رەگەزایەتی دا، یەكێ لەو فەرموودانە ئەمەیە: ﴿دعوها فإنها منتنة﴾ [1] بەڵێ بەراستی شتێكی بۆگەنە، ئەوەتا بۆگەنی هەموو جیهانی داگیر كردووە، هەرچی بێ ئارامی و ناڕەوایی و شەڕو ئاژاوەی ئەمڕۆ هەیە هۆی هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ جۆرێ لە رەگەزایەتی، وەكو ئاشكرایەو وا بە پێش چاوەوە، رزگار بوونیش نی یە تەنها بە گەڕانەوە نەبێ بۆ ئەو چارەسەرەی كە ئیسلام كردی، لەو رێگایەوە نەبێ كە ئیسلام دیاریی كرد هیچ كەس ناگات بە ئامانج، پێك هێنانی گەلێكی ئادەمی جیهانی ئەبێ هەر لەسەر ئەو بنەڕەتە بێت كە ئیسلام دایهێنا، ئەوەتا لە چەند رێگایەكی ترەوە، لەسەر چەند بنەڕەتێكی تر هەوڵ دراوەو هەوڵ دەدرێ، بەلآم سوودی نی یە.

پەیڕەوی تەنها ئەم ئایەتە كە پێ یەوە خەریكین بەسەر بۆ چارەسەر كردنی هەموو ئاژاوەیە لەم جیهانەدا، بەسە بۆ كردنەوەی گرێ و گۆتاڵی نێوانی گەلەكانی جیهان، پەیڕەوی ئەم ئایەتە تەنها بەسە، چ جای هەموو سورەتەكە كە ئەو هەموو بیروباوەڕە گرنگانەی تێدابوو بینیمان و چ جای هەموو ئەم شەریعەتە گەورەی ئیسلامە.

ئەگەر هەموو دەوڵەتەكانی جیهان راستیان بكردایە و لەسەر رێگای راست بوونایە ئەم ئایەتەیان ئەنووسی بە پیتی رووناكی لە مینبەری نیشتەجێی نەتەوە یەككگرتووەكان، ئەیان كرد بە سەر مەشق بۆ خۆیان، لەبەر رووناكی ئەم ئایەتەو بە پێی رێنموونی ئەم ئەجوولآنەوە. ئیسلام هات جاڕی مافی ئادەمی دا، بە كردەوەیش بەجێی هێنا بێ كەم و كوڕی لە كاتێك دا كە كەس لە خەویش دا شتی وای بەدڵ دا نەئەهات، بەڵكو زۆربەی خەڵكی دژی ئەو جاڕدان و كردەوە بوون، لەگەڵ ئەوەدا زۆر بەداخەوە خەڵكی چاوی ئەوە نابینێ و ئەڵێ فەرەنسا جاڕی مافی ئادەمی دا!!!

---

[1] واتە كۆتایی لێ بێنن، چونكە شتێكی بۆگەنە. پێشەوا موسلیم لە كتێبە سەحیحەكەی دا لە حەدیسی جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە.

﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾

له هەموو شت سەیرتر ئەمەیە رۆڵەکانی موسڵمانیش ئەو قسە بێ جێ و ناڕاستە ئەکەن، بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە!! ئینجا لە دوا دوایی سورەتەکەدا نرخ و شێوە راستەقینەکەی ئیمان روون ئەکاتەوە بە بۆنەی بەرپەرچ دانەوەو تەمێی هەندێ لە عەرەبە کۆچەریی یەکان کە هێشتا ئیمان جێگیر نەبووبوو لە دڵ و دەروونیان دا، بەم عەرەبانە بێژراوە کە بەناوبانگن بە(بنی اسد) منەتیان ئەنا بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) ئەیان وت ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە موسڵمان بووین و جەنگمان لەگەڵ نەکردی و عەرەبەکان جەنگیان لەگەڵ کردی، ئەوا خوایش قسەکەیان ئەهێنێ و تەمێی پێغەمبەری(ﷺ) دادا کە بەرپەرچیان بداتەوەو بیانباتەوە بە خۆیان دا، نیازو ئەوەی لە دڵیاندایە روونی ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ﴾ [1] کۆمەڵێ لە عەرەبە خێڵەکی یەکان هاتنە لات و ئەیانگوت ئێمە ئیمانمان هێناوە، ئەی پێغەمبەر لە وەڵامیان دا بڵێ پێیان: ئیمانی راستەقینەتان نەهێناوە، واتە راست ناکەن، چونکە ئیمان ئیمان بریتی یە لە باوەڕهێنانی دڵ بە وەرگرتن و رەزامەندی و ئارامەوە، ئێوە ئەوەتان بۆ پەیدا نەبووە، ئەگینا منەتتان نەئەنا بە موسڵمانێتی و جەنگ نەکردنتان. بەڵام بڵێن: بە ناچاری خۆمان کردووە بە موسڵمان و شایەتمانمان هێناوەو گەردن کەچیمان پیشان داوە،

---

[1] بە گوێرەی باری هۆنینەوەی وتار، بە پێی پێویستی رێك وەڵام لەگەڵ پرسیاردا ئەبوایە بیفەرموایە: ﴿لا تقولوا أمنا﴾ یان بیفەرموایە: ﴿لم تؤمنوا ولكن أسلمتم﴾، بەڵام بەو جۆرەی ئەفەرموو، چونکە ئەو کاتە شێوەی باری یەکەم قەدەغە ئەبوو لە وتن: ﴿أمنا﴾ کە ئەویش شێوەو دیمەنی جوان نی یەو نابێ، باری دووەم وای پیشان ئەدا کە جەزم و دڵنیایی هەیە بە موسڵمانێتی یان بە تەواوی لەگەڵ ئەوەدا بە شەرعی موسڵمان نەبوون.

ئێوە هێشتا ئیمان نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە، واتە ئیمانی راستەقینەو حەقیقەتەکەی دانەمەزراوە لە دڵەکانتان دا.

رای پێشەوایان جیاوازە لەم کۆمەڵە عەرەبەدا، پێشەوا بوخاری و کۆمەڵێ لەسەر ئەوەن کە ئەوانە موونافیق بوون، زۆربە لەسەر ئەوەیە کە ئەوانە موونافیق نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێ بوون لە موسڵمانان هێشتا ئیمان لە دڵیان دا بەهێزو دامەزراو نەبوو، بەڵام خۆیان لەپلەو رادەیەك دا پیشان ئەدا لە رادەی راستەقینەی خۆیان لەبەر ئەوە بەو جۆرە تەمێ کران و برانەوە بە خۆیان دا، بۆ ئەوەی تەمێ خوار بن، ئەم رایە بە بەهێزتر ئەزانرێ، چونکە ئەگەر ئەمانە موونافیق بوونایە قورئان بەم جۆرە هێواش نەئەبوو لەگەڵیان دا. ریسواو بێ ئابڕووی ئەکردن، وەکو باوی وایە لە هەموو کاتێك داکە باسی موونافیق بکات لەبەر ئەوە لەسەر ئەم رای دووەمە رۆیشتم.

ئەم کۆمەڵە لەگەڵ ئەوەدا بەو جۆرە ناتەواو بوون، خوای خاوەن رەحم و بەزەیی دڵخۆشی یان ئەکات و لێ بوردن و بەزەیی خۆی ئەخاتە پێش چاویان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَـٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەگەر گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکەن هیچ لە کردەوە چاکەکانتان کەم و ناتەواو ناکات و پاداشتی تەواوتان ئەداتەوە، چونکە بێگومان خوا زۆر لێ بوردەو بە رەحمە، زۆر لێ بوردووە لە خراپەی ئەوانەی گوێڕایەڵی ئەکەن، زۆر خاوەن بەزەیی یە، زیادە پاداشت ئەداتەوە بە چەند قات لای خوارووی بە دە قات، لە لوتف و کەرەمی بە زیاد بێت[1].

---

[1] بە گوێرەی ئەو رایەی کە لە تەفسیرەکەدایە ئەو موسڵمانێتی یە زاهیرەیان با ئیمانی دامەزراوی لەگەڵ دا نەبێت، ئەبێتە هۆی وەرگرتنی کردەوەی چاکیان، پاداشت ئەدرێنەوە لەسەری بێ کەم و کوڕی، بەڵام بە گوێرەی ئەو رایە کە ئەفەرموێ ئەوانە موونافیق بوون ئەو دیمەنە موسڵمانێتی یە نابێتە هۆی وەرگرتنی کردەوەی چاکیان ئەوکاتە مەبەست بە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەریان(ﷺ) ئەمەیە کە موونافیقی یەکەیان فڕێ بدەن و بە رێکی موسڵمان ببن، زانین لای خوایە.

ئینجا شێوەی ئیمانی ڕاستەقینە ڕوون ئەکاتەوە بە باسی هەندێ لە سیفەت و نیشانەکانی کۆمەڵی ئیمانداره ڕاستەکان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئیماندارانی ڕاستەقینە هیچ کەس نین جگە لەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بە خواو پێغەمبەری خوا، ئینجا پاش ئەو باوەڕەیان ئیتر گومان و دوو دڵی یان نەبووە، بەڵکو دامەزراو و نەگۆڕاو بوون لە هەموو خۆشی و ناخۆشی و ترس و تەنگاوەیەك دا، تێکۆشانیان کردووە بە ماڵیان و بە لەش و گیانیان لە ڕێگەی خوادا، کەواتە ئیمانی ڕاستەقینە باوەڕێکی بەهێزی دامەزراوی

نەگۆڕاوە بە هەموو ئارامێکەوە بێ دڵەچرکێ و بە ئارامی و بێ دوو دڵی. ئیمانی ڕاستەقینە خاوەنەکەی ئەخاتە تێکۆشان بە ماڵ و گیان لە ڕێگای خواداو بۆ بەرزکردنەوەی ئالأی خوا، چونکە دڵ هەرکاتە شیرینی ئەو ئیمانە ڕاستەقینەی چەشت خۆی پێ ناگیرێ و پەلامار ئەدات و خاوەنەکەی ئەخاتە ئیش بۆ دەرخستن و ئاشکرا کردنی ئەو ئیمانە و پێك هێنانی و بەدی هێنانی بەرهەمەکانی لەژیان و جیهانی ئادەمی دا، ئەو دڵە پڕ لە ئیمانە هەرگیز خۆی پێ ناگیرێ و توانای نی یە هەروا بێ دەنگ دانیشێ و پەك کەوتوو دەستەپاچە بەرامبەر بەو هەموو کاروبارو کردەوەو ڕووداوانەی کە دژو پێچەوانەی ئیمانەکەیەتی، چونکە هەموو شتێ لەوانە ئەبێتە هۆی ئێش و سزای ئەو دڵە کەواتە ڕائەپەڕێ بۆ دوور خستنەوەو نەهێشتنی ئەو ئێش و ئازارەی کە ئەو دڵەی بێ ئارام کردووەو ژیانی لێ تاڵ کردووە، کەواتە تێکۆشان لە ڕێگای خوادا شتێکە هەڵئەقوڵێ لە دڵی ئیماندارەکەوەو خۆی پێویستی پێ‌ی هەیە و ناچارە بۆی، مەبەستی خۆی پێك ئەهێنێ، تا ڕادەی هێزو دامەزراوی ئیمان بەرزتر بێت ڕاپەڕین و تێکۆشانی خاوەن ئیمانەکە بەتین ترە، بەڵام دیارە هەموو تێکۆشانێ لە هەموو ڕوویەکەوە سنورو چۆنێتی دیاریی کراوە لە ئایینی پاکی ئیسلام دا ئەبێ بەپێ‌ی ئەوەو بەو جۆرە بکرێ.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟ ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾﴾

---

دامەزراوی ونەگۆڕان وتێکۆشان لەڕێگای خوادا بەرهەم و نیشانەی ئیمانی راستەقینەن، کەواتەئەو کەسانەی کە خاوەنی ئەوەن، ئەوانە راست ئەکەن وەکو خوای ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ تەنها ئەوانە – کە باس کران – راست ئەکەن: راست ئەکەن لە عەقیدەو باوەڕەکەیان دا، راست ئەکەن کاتێ ئەڵێن: ئێمە ئیمانداریـن. بەڕاستی ئەم ئایەتەو وێنەی، ئێجگار سامناکن چونکە زۆر بە روونی پیشان ئەدات کە ئەو کەسانە خۆیان بە ئیماندار ئەدەنە قەڵەم، ئەو نیشانەو بەرهەمانەیان نەبێ راست ناکەن، دەی ئەگەر بە رێکی ئێمەی کۆمەڵی موسڵمانی ئەمڕۆ خۆمان بدەین لەم قەپانە، بەم ترازووە خۆمان بکێشین، ئاخۆ لە سەد کەس دوو کەسمان هەیە بە تەواو بەراست دەرچێ؟ بە تایبەتی لەبابەت دامەزراوی و نەگۆڕانەوە، هێجگار موسڵمانی ئەمڕۆ وێرانەو تیادا چووە، وەکو بەچاو ئەبینین هەر رۆژێ لەسەر بەزمێکن، هەر رۆژێ شوێنی بیرو باوەڕێك ئەکەون، بە مەرجێ ئیسلامیان ئەوێ کە لەرێگای ئیسلام دا درکێ نەچێ بە پێیان دا، زیانیان لێ نەکەوێ، بەڵکو بە مەرجێ سوودو قازانجیان دەست کەوێ.

مەبەست لەم موسڵمانە وێرانانە ئەوانەیە کە بە گەرم و گوڕی هاتوچۆی مزگەوت ئەکەن، ئەگینائەوی تری هەرباس ناکرێ. خوابەرەحمی خۆی لەبەرخاتری قورئانەکەی و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی رووەمان بکاتەوە خۆی، لە خەوی بێ ئاگایی خەبەرمان بکاتەوە، آمین.

پاش ئەمەی ئیمانی راستەقینەی روون کردەوە بەخۆی و هەندێ بەرهەم و نیشانەیەوە، ئینجا دێتەوە سەر ئەو کۆمەڵە عەرەبە، تێیان ئەگەیەنێ کە خوا ئاگای لە دڵی ئەوانەو ئەوەی لە دڵیان دایە، ئاگای لە هەموو شتە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ئایا ئێوە خوا ئاگادار ئەکەن بەسەر ئاییـنی خۆتان دا، هەواڵی ئەوەی پێ ئەدەن بەمەی کە هاتنە لای من و پێتان

وتم: ئێمه ئیمانمان هێناوه؟!! خوا هەرچی وا له ئاسمانەکان و زەوی دا هەمووی ئەزانێ و ئاگای لێ یەتی، خوا به هەموو شت ئاگادارەو هیچ شتێك لەو شاراوه نی یه، واته ئێوه زۆر نەزان و بێ شەرمن که ئەتانەوێ به قسەو هەواڵی درۆ خۆتان له دەست خوا قوتار بکەن!!

ئادەمیزاد خۆی به زانا ئەداته قەڵەم، بێگومان خوا هەندێ زانینی پێداوه، بەڵام پێویسته بەو تۆزه رووناکی زانینه خۆی لێ نەگۆڕێ و له سنووری خۆی دەرنەچێ، بۆ ئەمەی سەری لێ نەشێوێ، بەڵکو بەو تۆزه رووناکی یه پێوسته بیر بکاتەوه که خۆی ناناسێ، نازانێ خۆی چی یه؟ ئەو هەموو هەست و هێزو وزه که خوا پێ ی داوه، ئەوانه چین و چۆن پەیدا بوون، چۆن ئیش ئەکەن؟ تەنانەت ژیریی خۆی ناناسێ، نازانێ چۆن ئیش ئەکات؟ ناتوانێ چاودێریی خۆی بکات له کاتی ئیش کردن دا، هەرکات بیەوێ خەریك ببێ به خۆیەوه پەکی ئەکەوێ له چاودێریی خۆی، کەواته ژیریی خۆی دەسته پاچەیه لەئاستی خۆی و بارو رێگای ئیش و کردەوەی خۆی که ژیریی جێگای شانازی ئادەمی یەو یەکەم چەکی دەستی یەتی له رێگای زانین و زانیاری ئەم جیهانەدا.

لەپێشەوه وتمان که ئەو عەرەبه کۆچەری یانه هاتنه خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) خۆیان به ئیمانداری راستەقینه داناو پیشان داو منەتیان ئەنا بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ)، خوای گەورەیش تەمێ ی کرد که بەرپەرچیان بداتەوه له بابەت ئیمانەکەیانەوه.

ئەوا لێرەدا باسی منەتنانەکەیشیان ئەکات و فەرمان ئەدات که بەرپەرچیان بداتەوەو تەمێ یان بکات لەو بارەیشەوه، ئەفەرموێ: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ منەت ئەنێن بەسەر تۆدا بەمەی که موسڵمان بوون ئەی پێغەمبەر پێ یان بڵێ: ئێوه منەتی موسڵمانەتی خۆتان مەنێن بەسەر من دا، بەڵکو ئێوه ئەگەر راست ئەکەن ئەڵێن ئیمانمان هەیه خوا منەت ئەنێ بەسەر ئێوەدا بەمەی که رێنموونی کردوون بۆ ئیمان و باوەڕ هێنان و ئەو رێگا راستەی پیشان داون.

لێرەدا پێویسته هەندێ بوەستین و بیر بکەینەوه لەنرخ و گرنگی ئیمان. باش بیر بکەینەوه بۆ ئەمەی قەدری ئەم نیعمەته گەورەی خوامان هەموو کات لەپێش چاو بێت و شادمان بین و شانازی پێوه بکەین، بیر بکەینەوه با بێدار ببینەوه که هەرکەسێ خوا ئەم نیعمەتەی پێدابێ، ئیتر هیچی لەکیس نەچووه، هەرکەس بێبەش بووبێ لەوه، بێبەشه له

هەموو پیت و فەڕێك، وەكو هیچ دەستكەوتێكی نەبووبێ وایە، با بەدرێژایی تەمەنی هەموو شتی ئەم جیهانە هینی ئەو بێ. بێگومان گەورەترین چاكەی خوایەو بەنرخترین منەتی خوایە بەسەر بەندە ئیماندارەكانییەوە، بە نرخترو گەورەتر لە گیانەكەیان و هەموو رۆزی و خۆشی ئەم جیهانە.

ئیمانی راستەقینە بەم شێوە قورئانی یە خاوەنەكەی ئەكات بە شتێكی تایبەتی جیاواز، زۆر جیاواز لەوانەی كە بێبەشن لەو نیعمەتە. یەكەم شتێ كە ئیمانی قورئانی فەراهەم ئەهێنێ بۆ خاوەنی، فراوانی زانین و تێگەیشتنیەتی دەربارەی بوونی خۆی و بوونی ئەم بوونەوەرەو پەیوەندی نێوان خۆی و ئەم بوون و بوونەوەرەو ئیش و دەوری خۆی لەوەدا، هەروەها تێگەیشتنی لە نرخی هەموو شتێك، دانان و بینینی هەموو شتێ لە شوێن و جێگاو رادەی خۆی دا.

بەهۆی ئەو ئیمانەوە ئارامی و دامەزراوی لە دڵ و دەروون دا فەراهەم دێت، لە بەسەر بردنی ژیان بەسەر ئەم زەوی یەوە، بەهۆی ئەو ئیمانەوە ئولفەت و ئارامی و دڵنیایی یەك پەیدا ئەبێ لەگەڵ هەموو بوونەوەرو لەگەڵ خوای بوونەوەردا، بەهۆی ئەو ئیمانەوە خاوەنەكەی هەست ئەكات بە نرخ و رێزی خۆی، بەمەی كە توانای هەیە هەڵسێ بە كارو فرمانێكی زۆر گەورەو گرنگ كە ببێتە هۆی رەزامەندی خواو چاكەو خێرو فەڕی دروست كراوانی خوا. بەهۆی ئەو ئیمانەوە فام و تێگەیشتنی نامێنێتەوە لە چواردەوری تەنگی ماددەو سنووری كۆتایی هاتووی، بەڵكو لەوە تێئەپەڕێ بۆ دەریای بێ پەیی دوایی نەهاتووی غەیب و نهێنی.

بەهۆی ئەو ئیمانەوە ئادەمی خاوەن ئیمان خۆی ئەناسێ و ئەندازێكی پێویست لەخۆی ئەگات: ئەزانێ كە ئەندامێكە لە تیرەی ئادەمی كە هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ یەك بنەڕەت، ئەو بنەڕەتە پێك هاتووە لە دوو بەش: بەشێكی خاك كە بەهۆی ئەم بەشەوە بەشدارە لەگەڵ هەموو گیان لە بەرەكانی ترو هیچ نرخێكی زیادەی نی یە بەسەر ئەوان دا، ئەو بەشەكەی تری بریتی یە لە رۆحەكەی كە لە عالەمێكی ترەو زیادە تایبەتی و نرخی هەیە بەلای پەروەردگاری یەوە، كەواتە ئادەمی هەر نرخ و زیادەیەكی هەیە لەناو هەموو دروست كراوەكانی خوادا، ئەو نرخ و زیادە بەهۆی ئەم بەشەوەیە، كەواتە هەرچۆنێ هەوڵ ئەدا بۆ

پێك هێنانی پێویستی ئەو بەشەكەی، هەروەها تێكۆشان ئەبێ بكات بۆ ئەوەی ئەم بەشەكەی تری داوای ئەكات و ئەیەوێ.

هەروەها ئادەمی ئیماندار ئەزانێ كە بە هۆی ئیمانەكەیەوە یەكێكە لەو گەل و كۆمەڵەی كە بەدرێژایی تەمەنی ئادەمی هاتووە، ئەو كۆمەڵەی كە لەگەڵ دووری چەرخ و شوێنیان دا – هەر یەك كۆمەڵەو سەركەڵەكانی پێغەمبەرانە – ئەم زانین و هەستە بەسە بۆ ئارام و بەهێزكردنی دڵی ئیماندار، ژیانێ بەو هەستەوە بەسەر ببرێ تامێ تری هەیەو لەزەتێ تری هەیە، ئیمانداری قورئانی هەست و تێگەیشتنی فراوانتر ئەبێت بە خۆی و گەل و تیرەكەیەوە، ناوەستێ و لەوە تێئەپەرێت بۆ بوون و بوونەوەر ئەزانێ كە هەموو بەش و پارچەیەكی زیندووەو رۆحێكی تایبەتی هەیە، وەكو بوونەوەر، هەموو بە گشتی رۆحێكی هەیە، رۆحی هەموو ئەو پارچە و بەشانە لەگەڵ رۆحی گەورەی بوونەوەردا بە یەكجار هەموو كات روویان كردۆتە پەروەردگاری خۆیان و ئەیپەرستن و سەناو سوپاسی ئەكەن و بە گەردن كەچی گوێڕایەڵی ئەكەن بۆی و بە موو لە فرمانی لا نادەن، ئەو ئیمانداره ئەو كاتە ژیان بەسەر ئەبات لەناو ئەو بوونەوەرە فراوانەدا، بە ئولفەت و ئارام و سۆزی برایەتی و خۆشەویستی و یەكێتی یەوە، ئەو كاتە ئەزانێ لە كوێوە هاتووەو؟ بۆچی هاتووە؟ بۆ كوێ ئەڕوا؟ لەو شوێنەی بۆی ئەڕوا چی دەست كەوت ئەبێ؟ ئەزانێ كە ئەم جیهانە جێگای كشتوكاڵی ئەو جیهانە كە بۆی ئەڕوا، ئەزانێ لەو جیهانەدا پرسیارو تۆڵەو پاداشت هەیە لەسەر هەموو كردەوەیەك، گەورەو بچووك، ئاشكراو پەنهانی، ئەو كاتە بێ ئارامی و دوو دڵی و سەرگەردانی روو ناكاتە دڵ و دەروونی، ئینجا لەپاش ئەمانە هەموو، ئاشكرایە كە ئیمان هێزێكی پاڵ پێوەنەری ئێجگار گرنگە بۆ بەكارهێنان و خستنە ئیشی هەموو هێزو وزەكان بێ كۆتایی و ئەوەی لە دەست ئیمان دێت لە گۆڕینی بارو رووی ژیانی گەل و ئەندامی گەل و هەموو جیهان لە رادەیەك دایە هەموو مێژو و زانین و فەلسەفەیە سەرگەردان ئەكات. ئەمە نموونەیەك بوو لە باسی گرنگی و نرخی نیعمەتی ئیمانەوە بۆ ئەمەی نەشارەزا بزانێ و شارەزا باش بیر بكاتەوە لەم فەرمودەی خوا: ﴿بل الله یمن علیكم ان هداكم للإیمان﴾ بەڵكو رێزو نرخەكەی هەموو كات لەپێش چاو ون نەبێت و قەدری ئەو گەورەترین چاكەو نیعمەتی خوا بەجێ بهێنرێ.

ئینجا کۆتایی باسەکە ئەهێنێ بەباسی فراوانی زانینی خواو بینینی هەموو کردەوەی بەندەکانی با ئەو کۆمەڵە عەرەبە تێ بگەن کە خوا ئاگای لە نهێنی دڵ و دەروونیشیان هەیە، چ جای قسەیان، کەواتە تەمێ خوار بن شتێ نەڵێن کە پێچەوانەی ئەوەیە خوا ئاگای لێ یەتی، وەکو کۆتایی سورەتەکەو ئەو هەموو تەمێ و بڕیارەکانی هێنا پێ ی، با دڵی ئیمانداران بێدار ببێتەوەو ترس و سامی ئاگاداری خوا لەدڵی هەمووان دا جێگیر ببێت بەهۆی ئەوە پێچەوانەی ئەو هەموو بڕیارو فەرمانانە ئەجوڵێنەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ بەڕاستی هەرچی نهێنی و شاراوەی ئاسمانەکان و زەوی هەیە خوا ئەیزانێ و ئاگای لێ یەتی، خوا بینایە بە هەموو کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن.

بەڕاستی دوایی هێنانی سورەتەکە بەم ئایەتە ئێجگار بەتام و بەلەزەتە هەر لە دەست قورئان دێت ئەم جۆرە شتانە، خوا بە رەحمی خۆی هەست و دەروونمان رووناك بکاتەوە بە قورئانەکەی – آمین.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ﴿١﴾ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ﴿٣﴾

---

## سورەتی(ق)
## مەککەیی یەو ٤٥ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتەزۆرسامناك وبەهێزە ئەدالەدڵ و دەروون، وشەکانی و شێوەی هۆنینەوەیان و ئاوازەو دەنگیٚ کە لیٚ یانەوە فەراهەم دێت ئێجگار بە تینەو تەقە ئەدات بە بەنوکەی دڵ داو ئەیهێنێتە لەرزە، لە هەموو لایەکەوە ئاگاداریی خواو چاودێریی هەموو کاتیٚ ئەیهێنێتە پێش چاو دەربارەی هەموو جوڵانەوەو کردەوەو نیازو خەتەرەی ئادەمی هەر لە لەدایك بوونی یەوە هەتا ماوەی ژیانی و مردنی و زیندوو بوونەوەی و پرسیارو موحاکەمەی، چەند نموونەیەك لە سزای رۆژی دوایی و نازو رێزی ئەهێنیٚ و شێوەکانی پیشان ئەدات کە ئێجگار کاریگەرن لە تواناداا نی یە لاسایی کردنەوەی هەر ئەوەندە هەیە دڵی بێدارو وریا هەستی پیٚ ئەکات و نازانیٚ بە زمان بیڵێت. بێگومان لە بەرزو گرنگی یەتی کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەم سورەتەی ئەکرد بە خوتبەی جەژن و جومعەو لە کۆمەڵی گەورەدا خوتبەی پیٚ ئەدا. کەواتە با بە دڵێکی زۆر وریا و بێدارەوە گویٚ بگرین لەم سورەتە بەهێزە بەتینە، بەڵکو تەمیٚ خوار ببین پیٚی و ئینجا خوا رەحممان پیٚ بکات.

خوای گەورە ئەفەرمویٚ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * قٓ﴾ لەچەند گرنگ سورەتێك دا لەمەوپێش باسی وێنەی ئەم جۆرە پیتانەمان کرد لەو چواردە پیتە کە قاپیی ٢٩ سورەتیان پیٚ کراوەتەوە، بە تایبەتی هەندیٚ بە درێژیی دواین لەم بابەتەوە لە یەکەم جاری سورەتی

﴿يس﴾ ەوە، کەواتە لەو ڕووەوە لێرەدا پێویست بە هیچی تر ناکات. ﴿وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ سوێند بە قورئانی بەرزو خاوەن شان و شەرەف.

خوای گەورە لێرەدا وەکو لە سورەتی ﴿صٓ﴾ دا سوێند ئەخوات بە قورئان، سوێند لەسەر خوراوەکە باس نافەرموێ. بێگومان لە یەکەم جاری قسەو وتارەوە سوێند خواردن دڵ و دەروون بێدارو وریا ئەکاتەوەو گرنگی مەبەست پیشان ئەدات، بە تایبەتی لێرەدا کە خوا سوێند ئەخوات بە قورئانەکەی خۆی ئێجگار مەبەستێکی گەورەو گرنگ ئەگەیەنێ، چاوەڕوانی هاتنی ئەکرێت، ڕەنگە مەبەست بەم سوێندەش لێرەو وێنەی ئێرەدا هەر ئەوە بێت، چونکە بەدوای سوێندەکەدا وشەی ﴿بل﴾ ئەهێنێ کە لەم جۆرە شوێنانەدا بۆ وازهێنانە لەو مەبەستەی پێشوو، دەست پێکردن بە مەبەستێکی سەربەخۆی تر. کەواتە ئەو بێدار بوونەوەی دڵ و ئەو گرنگی مەبەستەی کە سوێندەکە فەراهەمی ئەهێنێ لێرەدا بە جارێ ڕوو ئەکەنە ئەو مەبەستەی کە لەپاش وشەی ﴿بل﴾ ەوە دێت، ئەو کاتە باشتر گوێی بۆ ئەگیرێ و وەرئەگیرێ.

لەلایەن زۆر لە زانایانەوە چەند شتێ کراوە بە سوێند لەسەر خوراو، هەندێکیان بە دوور دانراوەو هەندێ بە نزیك، لە نێوان ئەوانەدا دڵ بۆ یەکێکیان ئەچێ کە بریتی یە لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ)، چونکە ئەوە زۆر بە ڕوونی وەرئەگیرێ لەو ڕستەیەی کە لەپاش وشەی ﴿بل﴾ ەوە دێت، واتە سوێند بە قورئانێك کە گەورەو شان و شەرەف دارە، محمد پێغەمبەری خوایەو ڕاست ئەکات لەوەی کە ڕایئەگەیەنێ بە خەڵکی، بەم جۆرە سوێند پێ خوراو ئێجگار ڕێکە لەگەڵ سوێند لەسەر خوراودا، چونکە قورئان موعجیزەو هۆی ڕوون کردنەوەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمانە(ﷺ) ﴿بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ﴾[1] ئەوانە سەریان سوڕماوە لەوەی کە لە خۆیان ترسێنەرێکیان بۆ هاتووە، چونکە نەزان و نەفامەکانی ئەم ئوممەتە، وەکو نەزان و نەفامی ئوممەتەکانی پێشوو لایان وابوو کە پێغەمبەر نەبێ لە تیرەی

---

[1] لە سورەتی ﴿یس﴾ دا بە درێژی بەرپەرچی ئەو باوەڕە نارێکەمان داوەتەوە، با سەرنج بدرێت.

ئادەمی نەبێت، ئەبێ لە مەلائیکە بێت، وەکو قورئان ئەو باوەڕە ناڕێکەیانی لە چەند شوێنێك دا باس فەرمووە بۆمان.

هەرکەس بەچاوی ژیریی ورد ببێتەوە ئەزانێ کە ئەوە هیچ جێگای سەر لێ کردنەوەو سەرسوڕمان نی یە، بەڵکو شتێکی زۆر رێك و راستەو سروشتی ساغ هەر ئەوە وەرئەگرێ، کە پێغەمبەری ئادەمی یەکێ بێت لە تیرەی ئادەمی. یەکێ بێت لەو گەل و کۆمەڵە، هەست بکات بەوەی ئەوان هەستی پێ ئەکەن، بە زمانی خۆیان قسەیان لەگەڵ دا بکات، بەشداریی یان بکات لەژیان و هۆی ژیانیان دا، رادەی تواناو وزەو ئارەزوویان بزانێ، ئەبێ ببێتە پێشەوایان و یەکەم کەس بێت لە هەڵسان بەو هەموو ئەرك و کارو فەرمانەی کە ئەو ئایینە داوای ئەکات. کەواتە ئاشکرایە ئەگەر پێغەمبەرەکە بەم جۆرە نەبێت ئەو کارو فەرمانەی بۆ ناڕواو ئەو پێشەوایەتی یەی بۆ ناکرێ. ئەو نەفامانە سەریان سوڕ ئەما لە پێغەمبەرێتی، بە تایبەتی لە هەواڵی زیندوو بوونەوە، کە لە یەکەم جارەوە پێغەمبەرەکان رایان ئەگەیاند بە گەلەکانیان، سەرکردنەوەو سەرسوڕمانەکەیشیان زۆر بێ جێ و بێ هۆ بوو، هەموو هەر قسەیان ئەوەبوو کە پاش ئەمەی مردین و بووین بە خۆڵ چۆن تازە زیندوو ئەبینەوە؟!

وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ * أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ﴾[1] ئەوانە سەریان سوڕ ئەما لەوەی کە لە خۆیان ترسێنەرێکیان بۆ بێت، لەپاش ئەوە سەرسام ئەبوون لە هەواڵی زیندوو بوونەوە ئەیانوت ئەمە شتێکی نەناسراوی کەس نەدیوە چۆن ئایا ئێمە بمرین و بکرێین بە خۆڵ تازە دووبارە ئەکرێینەوەو ئەگەڕێینەوە بۆ ژیان؟ ئەوە گەڕانەوەیەکی دوورە لای ئێمەو نەگونجاوە.

---

[1] بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە: کە مەبەست گێڕانەوەی سەرسوڕمانیانە لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ص)، لەسەر هەردوو جۆرەکە مەبەست بە ﴿الکافِرون﴾ چمیری ﴿و﴾ ە لە وشەی ﴿عجبوا﴾ دا، بەلآم بەم جۆرە گۆڕی لەبەر لەکەدار کردنیان و مۆرنان بە سەریان دا بە پیسترین لەکە کە کوفرە. خوا خۆی باش ئەزانێ.

باوەڕ بە زیندوو بوونەوە یەکێکە لە بنەڕەتەکانی ئیسلام، بنەڕەتێکە کە هەموو بیرو باوەڕو یاساو رژێمەکانی ئیسلام بەستراون پێ یەوە، زیندوو بوونەوە شتێکی زۆر پێویستە ناچاری هەیە بۆی، چونکە پێویست کراوە لە لایەن خواوە لەسەر ئادەمی کە لەسەر رێگای حەق و راست راوەستێ و بەرگری ناحەق بکات، خێرو چاکە بەهێز بکات، شەڕو خراپە لەناو بەرێ، پێویست کراوە لەسەری کە هەموو هەوڵ و کۆشش و کردارو رەفتاری ببەستێ بە پەرستنی خواوە. دەی کەواتە پێویستە بە گوێرەی سیفەتی عەدالەتی خوا پاداشت دانەوە لەسەر ئەو کردەوە چاکانە وەکو تۆڵە سەندن لەسەر تاوان و دەست درێژیی، ئەو پاداشت و تۆڵە لەم جیهانەدا بەجێ نایەت، کەواتە پێویستە بە جیهانێ تر، کە ئەو بەرهەمی عەدالەتی خوای تێدا بەدی بێت، بێجگە لەمانەیش باوەڕ بە رۆژی دوایی، پاڵ پێوەنەرێکی زۆر بەهێزی گرنگە بۆ روو کردنە خێرو چاکەو بەرگری لە تاوان و خراپە، هەر دڵێ ئەو باوەڕەی تێدا نەبێ هەرگیز نایەتە سەر راستە رێ، ئەگەر هاتە سەری دامەزراو نابێ، سەر لێ کردنەوەو سەرسوڕمانی نەفامەکان بە راستی جێگای سەرسوڕمانە، چونکە زیندوو بوونەوە ئەوەندە گونجاوو ئاشکرایە وەکو بەپێش چاوەوە بێت وایە.

ئەونەفامانەکەبەلایانەوەدوورەبەباشی ئەزانن کەئەم هەمووئادەمی وگیانلەبەرانەلەخاك فەراهەم دێت، دەی ئەوتواناى کەلەیەکەم جارەوەلەخاك دروستی ئەکات ئایابۆئەبێ نەتوانێ دووبارەی بکاتەوە؟! لەگەڵ ئەمەدا بە پێی باوی ئێمە دووبارە کردنەوە سووك و ئاسانترە.

خوای گەورە بەرەنگاری ئەم بێ باوەڕانە ئەکات بە جۆرێ لە پێشەوە دڵی ئەو بێ ئاگایانە بێدار ئەکاتەوە لە خەوی بێ ئاگایی دایان ئەچڵەکێنێ، بۆ ئەمەی چاوی ئەو دڵانە بکرێتەوە بیر بکەنەوەو سەرنجی بەرهەمی تواناو دەسەڵاتی بێ سنووری خوا بدەن، ئەو کاتەئەودڵانە پاك ئەبنەوە لە چەپەڵی ئەو باوەڕە لارە، مەگەر دڵێ کە بە تەواوی مردوو بێت.

قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ ﴿٤﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾

---

**ئەم بێ باوەڕانە بنەڕەتی بێ باوەڕیی یەکەیان، ئەمە بوو کە مردوو ئەبێت بە خاك و پرژو بڵاو ئەبێتەوە، هەر پارچەیەکی ئەکەوێتە شوێنێ، تێکەڵی خاك و ئەو هەموو شتی ترە ئەبێت، بە جۆرێك جیا ناکرێتەوەو کەس نازانێ لە کوێ یەو کامەیە؟ ئەوا لە یەکەم جارەوە ئەدات لەو بنەڕەتە ئەفەرموێ: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ﴾ بەراستی ئێمە زانیومانەو ئاگامان هەیە لەوەی کە زەوی ئەیخوات لە لەشی ئەوان، بەرە بەرە ئەو لەشی ئەوانە بۆ هەر شوێنێ پرژو بڵاو بوویێتەوەو بۆ هەر جێگایەك رۆیشتبێ و بۆ هەر شتێك گۆڕابێ هەرهیچی لەمانە شاراوە نی یە لە ئێمە، لای ئێمە پەڕاوێ هەیە، نەگۆڕاوو پارێزەری هەموو شتێکە، بە درێژیی هەموو شتی تێدا نووسراوە، واتە ئاگامان لە هەموو شت هەیەو هیچ شتێکمان لێ ون نابێ.** [1]

**ئینجا بەهۆی ئەو باوەڕە پووچەوە ئەو رەخنە بێ نرخانەیان روون ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ﴾** [2] **ئەوانە کە ئەو باوەڕە بێ جێ یەیان هەیە و ئەو رەخنە ناراستانە ئەگرن باوەڕیان نەهێناوە بە شتی حەق و راست، واتە: بەو ئایین و قورئانەی کە بۆیان هات، بەهۆی ئەوەوە کەوتوونەتە کارێکی تێکەڵ و پێکەڵی دانەمەزراوو هەردەمێ قسەیە ئەکەن و هەر جارێ شتێ ئەڵێن و لەسەر بارێ ناوەستن.**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون ئەمە چیرۆکە بە وێنەی کەسێ کتێب و دەفتەرێکی هەبێ و موتاڵای بکات. زانین لای خوایە.

[2] وشەی ﴿بل﴾ بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی تر لێرەدا.

حەق و راست تەنها نوختەیەکی دامەزراوی نەگۆڕاوی بەهێزە، ئەوەی باوەڕی پێ ی هەبێ بەسەریەوە ئەوەستێ و جێگیر ئەبێ بێ جووڵەو ئەم لاو ئەولا، جگە لە حەق و راست هەمووی دانەمەزراو و بەرگە نەگرو نەگۆڕاوە، هەردەمە بە لایەك داو هەرجاری بە بارێك دا، کەواتە هەرکەسێ لە حەق لابدات و باوەڕی بە بەتاڵ هەبێ، دامەزراو و جێگیر نابێ، هەردەمە باوەڕو قسەیەکی هەیە، هەردەمێ ئارەزوویەك رایئەکێشێ بۆ شتێك، کەواتە ئەکەوێتە گێژاوو چاڵی گومڕایی و سەرگەردانی، ئەمە شتێکی ئاشکرایە بە چاو ئەبینرێ حاڵ و باری تاقمی حەق و بەتاڵ بەو جۆرە کە وترا. ئینجا هەندێ لە بەرهەمی دەسەڵات و توانای بێ سنووری خوا ئەخاتە پێش چاو لەم شتانەی کە وان بە پێش چاوەوە بۆ ئەمەی روون ببێتەوە لای هەموو خاوەن ژیریی یەك کە زیندوو کردنەوە شتێکی زۆر گونجاوو ئاسانە لای ئەو خاوەن دەسەڵاتە، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴾ ئایا ئەوانە کە باوەڕیان نی یە بە زیندوو کردنەوە کوێرن و بەهۆی ئەوەوە چاوێکیان هەڵنەخستووە بۆلای ئاسمان بە لای سەرووی خۆیانەوە تا بیر بکەنەوە کە چۆنمان دروست کردووەو رێك و پێکمان خستووەو بەرزمان کردۆتەوە بێ پایەو ئەستوون، رازاندوومانەتەوە بەو هەموو مانگ و ئەستێرەیە، هیچ کون و درزێکی تێدا نی یە، واتە وەکو خانو و کۆشکێکی بێ لەکەو کەم و کوڕی و هیچ جۆرە عەیبێ. ﴿وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴾ زەویمان راخستووە بە فراوانی بۆ ئارام گرتن و نیشتەجێ یی بەسەر پشتی یەوە، چەند شاخ و چیای گەورەی قورسی دامەزراومان خستۆتە ناو زەوی بۆ ئەمەی بەرگری بکات لە تاسەو لەنگەرە، لە هەموو جۆرێکی جوان شیرینمان تێدا رواندووە.

﴿تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ٨ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ٩ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ١٠ رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ١١ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ١٣ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖ﴾

---

**ئەم هەموو ئاسمان و ئەستێرەو شتانەمان بەو جۆرە پێ کردووە. ﴿تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ﴾ لەبەر روون کردنەوەی چاول دڵ و تەمێ و ئامۆژگاری بۆ هەموو بەندەیەکی گەڕاوە بۆلای پەروەردگاری خۆی و ئەم بوونەوەرە نایابەی کەوا بە پێش چاوی یەوە، ئەم بوونەوەرە کتێبی کراوەی پەروەردگاریەتی، بە هەموو زمانێ ئەخوێنرێتەوە، بۆ هەموو کەس دەست ئەدات لێ ی ورد ببێتەوەو موتاڵای بکات. خوێندەوارو نەخوێندەوار، شارستانی و لادێ یی، هەموو چینێك، هەموو کەسێ توانای هەیە لەڕادەی خۆی داو ئەندازەی پێویستی خۆی توێشووی لێ وەرگرێ بۆ دۆزینەوەی حەق و دامەزراندن لەسەر باری حەق و رۆیشتن بە رێگای حەق دا، بە مەرجێ بە شوێن حەق دا بگەڕێ و بیەوێ بگات بە حەق، ئەو حەقەی کە بریتی یە لە ناسین و باوەڕ بە خوای پەروەردگارو گوێ رایەڵی و پەرستنی بە تاك و تەنیا کە بوونەوەر بە هەموو پارچەو بەشەکانی یەوە شایەتی لەسەر ئەوە ئەدات، بەڵام ئەو کەسانەی کە بە دوای حەق دا ناگەڕێن و نایانەوێ رێگای حەق بدەنە بەر، ئەو کەسانە هەست ناکەن بەو شایەتی یە ئاشکراو روون رەوانەی بوونەوەر، هەرچەندە پلەو پایەیان بەرز بێت لە ناسین و زانیاری لەم بوونەوەرەدا، هەرچەند تێکۆشان و لێکۆڵینەوەو بەراوردیان بەتین و فراوان بێت بۆ دۆزینەوەی نهێنی یەکان و تایبەتی یەکانی ئەم بوونەوەرەو بەش و پارچەکانی، کەواتە ناسین و زانینەکانیان ناتەواوەو رووکەشە، چونکە لەگەڵ حەق دا نی یەو جوێ بۆتەوە لە حەق، وەکو ئەمڕۆ باوە لەو بەرنامەی کە دانراوە بۆ زانین و زانیاری و ناونراوە(المناهج العلمية).**

**ئینجا چەند بەرهەمی تری توانای خۆی بە چەند لاپەڕەیەکی تر لە کتێبی بوونەوەر پیشان ئەدات بۆ روون کردنەوەی حەق و باوەڕ هێنان بە زیندوو کردنەوە، ئەفەرموێ:**

﴿وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ * وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ * رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ

﴿وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗا﴾ ئێمە هێناومانەتە خوارەوە لای ئاسمانەوە ئاوێکی بە فەڕی خاوەن پیت و سوودی زۆر، بە هۆی ئەو ئاوەوە ئەڕوێنین چەندەها باخ و درەخت و میوەو دانەوێڵەی ئەو کشتوکاڵەی کە دروێنە ئەکرێن، دار خورمای درێژ درێژ کە گۆپکەی زۆری پڕیان هەیە و کۆمەڵی کردووەو کەوتوون بەسەر یەک دا لەناو کیسەکانیان دا، ئەمانەشمان هەموو رواندووە لەبەر رۆزی دانی بەندەکانمان، هەم بەو ئاوە کە باراندوومانە خاك و وڵاتێکی مردووی وشك و برینمان پێ زیندوو کردۆتەوە، دوای ئەوە کە ئەم هەموو شتە نایابەی خستە پێش چاو سەرنجی راکێشا بۆ بیر لێ کردنەوە لەوەی تیای دا ناوە بێگومان بیر کردنەوە لەمانەدا چاوی هەموو دڵێکی زیندوو ئەکاتەوەو باوەڕ بە دەسەڵات و توانای بێ سنووری خوا لەو دڵانەدا جێگیر ئەکات، پاش نیشاندانی ئەم هەموو بەرهەمە گرنگانە، ئینجا مەبەستەکەی ئێرە کە زیندوو کردنەوەیە بە سووك و ئاسان ئەخاتە پێش چاو بە تایبەتی کە وێنەیەکی زۆر رێك و پێکی تێرو تەواوی پیشان دا کە بە ئاشکرا هەموو جارێ دوبارە ئەبێتەوە، ئەوەیش کە بریتی یە لە زیندوو کردنەوەی خاکە وشکە مردووەکان، ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ﴾ ئا بەو تەرزەو بەو ئاسانی یە بە وێنەی خاکە وشکە مردووەکان کە ئەو هەموو شتەی لێ ئەڕوێ و بە زیندوویی دێتە دەرەوە، هەر بەو جۆرەیە دەرچوونی مردووەکان لە گۆڕەکانیان بە زیندوویی.

یەکێ لە نایابی و بێ وێنەیی قورئان ئەوەیە کە هەموو وشەیەکی لە جێگای خۆی دایەو بە پێی ئەو شوێنەیە کە دانراوە تێیدا، لە هەر شتێ دوا لە بارو روویەکی یەوە لێ ی ئەدوێ کە ئێجگار رێك و پێکە لەگەڵ ئەو شوێنەو مەبەستی ئەو شوێنەدا، بۆ نموونە لەم شوێنەدا لە پێشەوە باسی بێ باوەڕیی کافرەکانی کرد لە بابەت زیندوو بوونەوەوە، ئینجا هۆی بێ باوەڕیی یەکەیانی روون کردەوە کە بریتی یە لە بێ باوەڕییان بەو حەقەی بۆیان هاتووە، لەپاش ئەوە چەند دەلیل و بەڵگەیەکی روون و بەهێزی هێناوە بە ئاسمان و زەوی و کەژو چیاو ئەو جۆرانەی کە ئەڕوێن لە زەوی دا، هەروەها بەڵگەی هێناوە بە باران و رواندنی دارو درەخت و باخ و میوەو دانەوێڵەو دارخورما... هتد. ئەمانەی هەموو هێنایەوەبە بەڵگە لەسەر راستی و بەجێی زیندوو کردنەوە، بۆ ئەم بەڵگەو دەلیلانە چەند سیفەت و نیشانەیەکی هێناوە، بەجۆرێ لێ یان دوا زۆر رێك و پێك بوو لەگەڵ سیفەت و نیشانەکانی حەق دا بەم جۆرە: بێگومان حەق واتە: ئەو شتەی کە راستەو هەیە، چەند نیشانەو سیفەتێکی هەیە کە بریتین لە: بەرزی، دامەزراوی، نەگۆڕانی و جوانی و شیرینی. بەم شێوە لە ئاسمان دواوەو

بارێکی کردووه به نیشانەو بەڵگە کە ئەو سیفەت و نیشانانەی تێدا روونە، شێوەی ئاسمانی بەرزی دامەزراوی نەگۆڕاو و رازێنراوەی ئارایش کراو بەو هەموو ئەستێرەیە، هەروەها لە زەوی دواوە کە دامەزراوی نەگۆڕاوە لەگەڵ شێوەی چیاو بەرزی ی دامەزراوی نەگۆڕاو، لەگەڵ شێوەی جوانی و ئارایش بەو شتانەی کە روێنراون تیای دا، هەروەها شێوەی شیرینی باران کە لە بەرزەوە دێت لەگەڵ جوانی و جەمالی ئەو کشتوکاڵە رازاوەو ئەو هەموو دارخورما بەرزە دامەزراوە کە ئارایش کراوە بەو بەرو گوڵ و هێشووە شیرینانە.

قورئان بەم تەرزە زاڵە کار ئەکات لە هەر دڵێ کە نەمردبێ و بە تەواوی وشك نەبووبێتەوە، بەو شێوە بێ وێنە ئەدوێ، بۆیە هەرگیز کۆن نابێ و هەموو کات تەڕو تازەیە لای دڵە نەمردووەکان، تام و مەزەی خۆشی هەرگیز کۆتایی نایەت و تێری لێ ناخورێ، پاش ئەمەی چەند لاپەڕەیەك لە کتێبی مێژووی ئادەمی ئەهێنێ و بە کورتی پاشەڕۆژی رەشی بەدبەختی بێ باوەڕەکان لە گەلەکانی رابردوو پیشان ئەدات، ئەو بێ باوەڕانەی کە دەم بازی و بەربەرەکانێ یان کرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان دا – درودی خوایان لێ بێت – بە وێنەی ئەم بت پەرستانەو بێ باوەڕانەی ئەم ئوممەتە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ئەفەرموێ:
﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ * وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ * وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ﴾[1] گەلی نوح باوەڕیان نەهێنا بە نوح و بە درۆزنیان دایە قەڵەم، هەروەها ﴿اصحاب الرس﴾ باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکەیان، تائیفەی سەمود باوەڕیان نەهێنا بە حەزرەتی صالح، تایفەی عاد بە هود، فیرعەون و کۆمەڵەکەی بە حەزرەتی موساو هارون، گەل و قەومەکەی لوط بە لوط و ﴿اصحاب الأیکة﴾ بە پێغەمبەرەکەیان کە بە ناوبانگە بە حەرزەتی شوعەیب. هەروەها گەلەکەی توبەعی حیمیەری کە باسمان کرد لە سورەتی ﴿الدخان﴾ دا.

[1] وشەی ﴿الرس﴾ بیرێکی سەنگ چن نەکراوە ﴿أصحاب الرس﴾ گەلێ بوون پێغەمبەرێکیان بۆ رەوانە کرا ئەوانیش ئیمانیان نەهێناو پێغەمبەرەکەیان خستە ناو بیرێك و شەهیدیان کرد، خوایش بەریادی کردن، ئیتر زیاد لەوە پێویست نی یە هیچ بڵێین ﴿أیکة﴾ چڕو دارستانی پڕە کە چووبێ بەناو یەك دا. ﴿أصحاب الأیکة﴾ دانیشتوانی ئەو وڵاتە بوون، پێغەمبەرەکەیان بەناوبانگە بە ﴿شعیب﴾.

ئاشكرایه كه لێرەدا درێژە پێدانی ئەو گەلانەو بەسەرهاتیان پێویست نی یە، بەڵكو بۆ ئەم شوێن و مەبەستی ئێرە هەر ئەمە پێویستە كە ئەفەرموێ: ﴿كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ هەموو یەكێ لەوانە باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەكانیان و بە درۆزنیان دانە قەڵەم بەهۆی ئەوەوە هەڕەشەی منیش لەسەریان هاتە جێ و بەدی هات. كەواتە با ئەمانیش ترسیان لێ بنیشێ و لە گەلە بێ باوەڕەكانی رابردووەوە تەمێ خوار بن، فریای خۆیان بكەون، ئیمان بێنن تاوەكو ئەوان هەلیان لە دەست دەرنەچووەو هەروەها با پێغەمبەرو ئیماندارەكانیش بە ئارام و دڵنیا بن كە پاشەرۆژی سەركەوتن و رزگاری و بەختیاری هەر بۆ ئەمانە.

دیمەنی ئەم فەرمودە وا پیشان ئەدات كە هەموو یەكێ لەو گەلانەی هەموو پێغەمبەرانی بە درۆزن دانابێ، لەگەڵ ئەمەدا هەریەكێ باوەڕی بە پێغەمبەری خۆی نەهێناو بە درۆزنی داناوە، بەڵام باوەڕ نەهێنان و بەدرۆ خستنەوەی تەنها هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – چونكە هەموو پێغەمبەران برای یەكن لە ئایینی خوادا، هەموویان لە یەكەمەوە تا دواترینی هەمووان بە خۆیان و شوێن كەوتووەكانیشیان یەك ئوممەتن و هەموو یەك باوەڕو عەقیدەیان هێناوە، كەواتە باوەڕ نەكردن بە هەركام باوەڕنەكردنە بە هەموو، هەموو یەك درەختەو ریشەو پەلی كوتاوە بۆ هەموو چەرخ و وڵاتێ، هەموو پەلێكی ئەو درەختە بەفەڕو نموونەو نوێنەرو كورتەیەكی هەمووە، كەواتە هەركەس لە هەر پەلێكی ئەو درەختە بەفەڕە بكەوێ ئەو كەسە لە هەموو درەختەكە كەوتووە بە هەموو پەل و ریشەكانی یەوە لەبەر ئەوە ئیمان وەرناگیرێ لە هیچ كەس و لە هیچ گەلێ تا باوەڕ نەهێنێ بە هەموو پێغەمبەران – سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت –.

ئینجا هەم ئەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی زیندوو بوونەوە، بەڵگەی تری لەسەر ئەهێنێتەوە بەمەی كە هەرچۆنێ لە یەكەم جارەوە خوا دروستیان ئەكات، هەروەها دووبارەیشیان ئەكاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ﴾ ئایا ئێمە دەستە پاچەو بێ دەسەڵات بووین لە دروستی كردنی یەكەم جاردا؟ واتە: نەخێر، پێویست بە وەڵام نی یە خەڵكەكە حازرو بزر شایەتە لەسەر ئەو دەسەڵاتە، واتە ئەوانە باوەڕیان هەبوو، ددانیان ئەنا بە دەسەڵاتی خوا لە دروست كردنی یەكەم جاردا. ﴿بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ بەڵكو ئەوانە لە گومان و لێ شێواندن لە دروست كردنی تازەكی، واتە بیر ناكەنەوە لە دروست كردنی خەڵكی لە یەكەم

جارەوە، تا بیکەن بە نیشانەو بەڵگە لەسەر دووبارە کردنەوەو دروست کردنی تازە، چونکە پێچەوانەی باوو باوەڕێکە کە دەقی پێوە گیراوە[1].

ئینجا دەست پێ ئەکات بە تیمار کردنی و چارەسەر کردنی دڵە بێ باوەڕەکان، بە هێنان و پیشاندانی چەند شتێکی ئێجگار سامناک. لە یەکەم جارەوە باسی چاودێریی و ئاگاداری هەموو کاتێ خوا لە بەندەکانی ئەکات، لە پاش ئەوە مردن و سەختی گیان کەنشت، دوای ئەوە زیندوو بوونەوەو پرسیار و حیساب و هێنانی دەفتەری کردەوەکان.

ئینجا شێوەی ناهەمواری دۆزەخ کە گڕو بڵێسەی لێوە دێت و تینوە بۆ سوتاندنی بێ باوەڕەکان، لەپەنای ئەوەوە شێوەی بەهەشت و نازو ڕێزە نەبڕاوەکەی باس ئەکات، ئەمانیش بەو تەرزە قورئانی یە بێ وێنە کە لە توانای هیچ کەس دا نی یە لاسایی کردنەوەی، بێگومان هەر دڵێ بەم قورئانە چارەسەر نەکرێ ئەو دڵە هەرگیز دەست نادات بۆ چارەسەریی، بێ بەشە لە هەموو خێروبێرێ، شایانی ئەوەیە کە قاپی ی ڕەحم و بەزەیی خوای لێ داخرێ، خوا پەنامان بدات لەقارو غەزەبی خۆی، آمین.

لەم چەند ئایەتەدا کە دێت ئادەمیزاد ئەخاتە گشت، لە دایك بوونی یەوە ئەیهێنێ تا مردنی و تا زیندوو بوونەوەو پرسیارو موحاسەبەی ڕۆژی دوایی هەتا سەری ئەکات بە نیشتەجێی ئێجگاری نەبڕاوەدا: دۆزەخ یان بەهەشت، بۆی روون ئەکاتەوە کە لە یەکەم جاری یەوە تا دوایی هەموو کات وا لە ژێر ڕەقابەی چاودێریی خوادا، لەناو چنگی دەسەڵات و توانای بێ سنووری خوادا. بەراستی شتەکە ئێجگار سامناکە لای هەر دڵێ کە زیندو و بێدار بێت، ئەبێ چۆن بێت ئەم ئادەمی یە بێ دەسەڵاتە کە هیچ شتێکی خۆی بە دەستی خۆی نی یەو هەموو کات چوار دەوری درابێ بە ئاگاداری و دەسەڵات و توانای خوا؟ ئەو خوایەی کە ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا تەنانەت خەتەرەی دڵی!! ئەو کەسانە کە بزانن و هەست بکەن بەوە کە ئەمن و ئیستخباراتی میری بە دوایان دا ئەگەڕێن و موراقەبەیان ئەکەن، ئەوانە ئارامیان لێ ئەبڕێ و دنیایان لێ دێتەوە یەك، لەگەڵ ئەوەدا خۆ داشاردن و ڕزگار بوون لەدەست میری زۆر جار ئەگونجێ بە پەنابردن بۆ وڵات و میری یەکی تر، یان بەدەم گرتن لە هەموو قسەو باسێك، یان بە هەر جۆرو شێوەیەکی تر، بەڵام چی ئەکرێ لەگەڵ خوا کە هیچ پەنادەرێ نی یە لێ ی و هیچی لێ ون نابێ و هیچ شتی لێ ناشارێتەوە.

---

[1] هەندێ تەفسیری بەم جۆرە ئەکەنەوە: ئایا بەهۆی دروست کردنی یەکەم جارەوە دەستە پاچە بووین پەکمان کەوت لە دروست کردنی تازە، ئەمەش هەر ئەبێ بەڵام زۆر بەهێز نی یە، خوا ئەزانێ.

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ١٦ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ١٧ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ١٨﴾

---

**ئینجا با به دڵ گوێ بگرین لەم ئایەتە سامناکە بەهێزانە: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥ﴾ [1] بێگومان ئێمە ئادەمیمان دروست کردووە، ئەزانین و ئاگامان هەیە لەو شتەی کە خۆی بە خەتەرە لە دەروونی خۆی دا ئەیڵێت، واتە ئاگادارین بەسەر ئەو خەتەرانەی کە بە دەروونی دا گوزەر ئەکەن.**

**سەرەتاو یەکەم جاری ئایەتەکە بەڵگەیەکی روونە لەسەر زانین و ئاگاداری یەکەی خوای گەورە، چونکە ئەو ئادەمی یانەی کە ئەم هەموو کەرەسەو ئامێرو شت و مەکانە بە دەستکرد فەراهەم ئەهێنن ئاگادار ترن بەسەر هەموو کەرەسەو نهێنی یەکانیان دا، دەی لە جێ یە ئادەمی ئا بەو جۆرە بێت؟ ئەوخوایەی کە هەموو کاروباری هەموو شتی بە دەستە، ئەم هەموو شتەی لە نەبوون دروست کرد، ئەوئادەمی یەکەیشی فێری ئەم شتانە کردووە، هەر زانینێکیش هەیە هەر خوا بۆی فەراهەم هێناوە، بێگومان دروست کردنی هیچ شتێ ناگونجێ بێ زانین و ئاگاداری بەو شتە، وەکو خۆیشی ئەفەرموێ: ﴿الا یعلم من خلق﴾ [2] کەواتە ئادەمی کە لە هەموو بارو روویەکی یەوە خوا لە نەبوون دروستی کردووە ئەبێ هەموو شتی روون ئاشکرا بێت لەو پەروەردگارەی.**

**ئینجا زیاتر ئاگاداریی یەکەی روون ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ﴾ [3] ئێمە نزیك ترین لە ئادەمی یەوە لە شا رەگی ملی خۆی، واتە زاناترو ئاگادارترین بە ئادەمی لەو کەسەی کە نزیك تر بێت لێ یەوە لە شاڕەگی ملی.**

---

[1] تەفسیرەکە بە گوێرەی ئەوەیە کە وشەی: ﴿ما﴾ موصولە بێت، ئەگونجێ مصدریە بێت ئەو کاتە ضمیری ﴿ە﴾ ئادەمی یەو بەم جۆرەیە: ئاگام هەیە لە وەسوەسەو خەتەری خۆی بۆ خۆی، بەڵام لەسەر موصولەیەتی چمیرەکە بۆ ﴿ما﴾ یە. چمیرێ مفعول بێت بریار ئەدرێ، واتە ﴿مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥ﴾ بە هەر جۆرێك بگیرێ مەبەستەکە هەریەکە، ئیتر خوا باش ئەزانێ.

[2] واتە: ئایا کەسێ شت دروست ئەکات زانا نی یە بە دروست کراوەکەی؟ واتە بەڵێ زانایە. سورەتی ﴿الملك﴾.

[3] لێرەدا مەبەست بە ﴿حبل﴾ رەگە ﴿ورید﴾ ئەو رەگەیە کە خوێنی ئادەمی پێدا گوزەر ئەکات و ئیزافەکە بەیانی یەیە. واتە مەبەست بە ﴿حبل﴾ لێرەدا ﴿ورید﴾ ە ئەمە دوو شاڕەگە لەم لاو لای ملی ئادەمیدا لەسەریەوە دێن و

هەرکەسێ ئەم باوەڕە لە دڵی دا جێگیر ببێ ماناى ئەوەیە کە بکەوێتە دڵە لەرزە، بێگومان هەرکەسێ هۆشی بەلای ئەم باوەڕەوە هەبێ زاتی نابێ وشەیەك بڵێ کە خوا رازی نەبێت پێ ی، بەڵکو ناتوانێ هیچ نیازو بڕیارێکی ناڕێك و ناڕەوایشی ببێ.

تەنها بەستنەوەی دڵ بە مەبەستی ئەم ئایەتەوە بەسە بۆ جڵەو گرتنەوەی نەفس لە هەموو خراپەیەك، بەسە بۆ جێگیر بوونی سام و ترس و شەرم لە خواو بێداری و خۆپارێزی یەکی هەموو کاتی. هێشتا بەوەوە ناوەستێ بەڵکو سەرباقی کە خوا بەو جۆرە ئاگادارە، ئادەمی هەموو کات دوو مەلائیکەی لەگەڵ دایە لە هەموو هەڵسان و دانیشتن و جوڵان و وەستان و خواردن و خواردنەوەو خەوو بێداری دا، هەموو کردەوەیەکیان لێ وەرئەگرن، هەر وشەیەك بە دەمیان دا بێت لەسەریان ئەنووسن و تەسجیلی ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ * مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[1] ئێمە بەوجۆرە کە وترا نزیکترین لەکاتێك دا کە دوو مەلائیکە دەفتەردارە کە هەموو شتێکی ئادەمی وەرئەگرن و ئەینوسن. واتە هەرچۆنێ ئێمە ئاگادارین بەسەر هەموو شتێکی ئادەمیدا هەروەهایش بەپێ ی فەرمانی ئێمە دوو مەلائیکە هەموو کردارو رەفتاری ئەنووسن و پارێزگاری ئەکەن لەلای خۆیان تا رۆژی دوایی. لای راستی یەوە مەلائیکەیە هاونشین و هاوسەریەتی و دانیشتووە لای، لای چەپی یەوە مەلائیکەیە هاوسەرەو دانیشتووە.

ئادەمی هیچ وشەیەك لە دەمی فڕێ نادات و هیچ وتارو قسەیەك ناکات کە مەلائیکەیەکی حازری ئامادەکراو بەسەریەوە نەبێ و لای ئەو وشەو قسەیە حازر نەبێ. واتە مەلائیکە وا لە کەمین دا بۆ ئادەمی، چاوەڕوانی ئەکات و بەسەریەوە وەستاوە فەرمانی پێدا دراوە بە

---

بەستراون بە بەتۆکەی دڵەوە، ئەمە کراوە بە پەندو چیرۆك بۆ زۆر نزیکی وەکو ئەڵێن: ﴿والموت أدنى لي من الوريد﴾ بە گوێرەی فەرمودەی زاناکان مەبەست لێرەدا نزیکی زانین و ئاگاداری خوایە. وەکو لە تەفسیرەکەدا وتراوە، یان مەبەست نزیکی مەلائیکەیە، چونکە ئەم ئایەتە لە بەشی موتەشابیهاتە کە زانین حەواڵەی خوا ئەکرێت، یان بە جۆرێکی شایان مەبەستێکیان بۆ دیار ئەکرێت.

[1] هەندێ ئەفەرمون وشەی ﴿إذ﴾ پەیوەندی بە ﴿اذكر﴾ ی بۆ بڕیار دراوە هەیە وەکو لە زۆربەی شوێن دا بەو جۆرە ئەکرێ، بەم جۆرەش رێکەو مەبەستەکە هەریەکە بەلاّم لە تەفسیرەکەدا لەسەر ئەو رایەیە کە ئەفەرموێ: پەیوەندی بە وشەی ﴿الرب﴾ ەوە هەیە، چونکە بەم جۆرەیان پیشانی ئەدات کە خوا هیچ پێویستی نی یە بە نووسین و وەرگرتنی ئەو دوو مەلائیکە، واتە خوا ئاگادار ترە لەوان، ئەوەی شارایەوە لەوان لەخوا ئاشکرایە، بەلاّم بە گوێرەی ئەو راکەی تر ئەمە پیشان نادات، خوا خۆی ئەزانێ.

نووسینی هەموو گفتوگۆیە. بێگومان هەموو ئیماندارێك ئەبێ باوەڕی هەبێ بەم نووسین و وەرگرتن و نووسینی مەلائیكە، هەركەسێ ئەو باوەڕەی نەبێ كافرەو ئیمانی لێ وەرناگیرێ، بەلآم ئیتر ئێمە نازانین چۆنی وەرئەگرن و چۆنی ئەنووسن و تەسجیلی ئەكەن، هیچ رەوا نی یەو رێگەمان نی یە لەخۆوە دەم بكوتین لە چۆنێتی ئەم جۆرە شتانە كە غەیبین و خواو پێغەمبەر(ﷺ) بۆمانی روون نەكردووەتەوە، بەڵكو ئەبێ باوەڕمان پێ‌یان هەبێ، بەو جۆرە كە هاتوون بێ لێكۆڵینەوەو چۆنێتیان، لە سنووری زانینی دیاریی كراوی خۆمان ئەوەستین.

ئێمە لە چەرخی خۆمان دا چەند شتی نایابی سەرسوڕهێنەرمان بینی وەكو ئەم هەموو شریتی سینەماو تەلەفزیونە كە هەموو رەنگ و قسەو جووڵانەوە وەرئەگرن تەنانەت هەناسەیش، بە چاوو گوێی خۆمان ئەیانبینین و ئەیانگێڕێتەوە بێ زیادو كەم رێك وەكو خۆی. ئەمەی كە ئێستا پەیدا بووە بە خەتەرەیش بە دڵی باوك و باپیرمان دا نەئەهاتن. كەواتە هیچ راست نی یە هیچ ژیریی یەك سەر بكاتەوە لە وەرگرتن و تەسجیل كردنی مەلائیكە بۆ هەموو كردەوەو قسەو وتارێكی ئێمە وەكو راست نی یە كە بە گوێرەی خەیاڵی خۆمان دەم بكوتین لە چۆنێتی ئەو شتانە كە لە سنووری زانینی ئێمەدا نین، بەڵكو هینی عالەمێكی ترن كە ئێمەی ئەم زەوی یە هیچ دەنگ و باس و هەواڵێكیان نازانین جگە لەو ئەندازەی كە خوا هەواڵی پێداوین بە هۆی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوەی پێویست بێت بۆ ئێمە تەنها ئەوەیە هەست بكەین كە لای راست و چەپمانەوە مەلائیكە هەن هەموو كردارو وتارمان وەرئەگرن و لەسەرمانی ئەنووسن، تا رۆژی پرسیارو حیساب، ئیتر بێ قسە كردن لە چۆنێتی نووسین و وەرگرتنەكەی.

ئەم هەست و زانینەمان بەسە بۆ ئەمەی ئاگامان لە خۆمان بێت و فریای خۆمان بكەوین و هیچ پێویستمان نی یە بەمەی بێ هودە بكۆڵینەوە لە شتێ كە لە سنووری زانینی ئێمەدا نی یە، ئەو كەسانەی كە بەهۆی قورئان و فەرمایشتەكانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) كەوتوونەتە سەر رێگای راست، لە سوودو بەرهەمی ئەو دووانەدا بەشدار بوون ئەوانە هەموو سەربازێكی گوێ رایەڵ بوون چی یان پێ سپێررا بوو هەر ئەوەیان ئەكرد بێ زیادو كەم و بێ سەر لێ كردنەوەو لێكۆڵینەوە.

خوای گەورە هیچ پێویستی نی یە نە بە مەلائیكەو نە بە نووسین و دەفتەری مەلائیكە، بەلآم فەرمان دانی بە نووسینی مەلائیكەو حازر بوونیان هەموو كات لەگەڵ ئادەمی دا، هەواڵ دانی بەوە پاڵ پێوەنەرێكی گرنگە بۆ بەندە لە بەجێ هێنانی خێرو چاكەو گەڕانەوەی

له خراپه، هەروەها دڵنیا کردنه لەسەر ئەوه که کردەوه گرنگەو پاداشت و تۆڵه لەسەر کردەوەیه. بێجگه لەمانەش بەم نووسین و شایەتانه ڕێگا ئەبڕرێتەوه له تاوانباران، ئەو مەلائیکەی لای ڕاسته خێرو چاك ئەنووسێ، ئەوەی لای چەپ خراپەو گوناه ئەنووسێ.
ئەوەی لای ڕاست ئەمیرو سەرۆکه بۆ ئەوەی لای چەپ، جا له لوتف و بەزەیی خوا بەزیاد بێت، بەنده هەر کات چاکەیەکی کرد ئەوەی لای ڕاست ئەینووسێ به دەقات، ئەمه لای خواروویەتی، هەرکات خراپەی کرد گورج ئەوەی لای ڕاست ئەفەرموێ بەوەی لای چەپ مەینووسەو لێ ی گەڕێ حەوت سەعات، بەڵکو زیکرو تەسبیحێك بکات، یان داوای لێ بوردن بکات، ئەگەر هەر نەیکرد ئینجا لەسەری ئەنووسێ بێ زیاده تەنها گوناهێکی لەسەر ئەنووسێ.[1]

هەندێ ئەفەرمون هەر قسەی چاك و خراپ ئەنووسرێن، واته ئەوەی پاداشت و تۆڵەیان هەیه نانووسرێن، بەڵام زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن که هەموو وشەو قسەیه ئەنووسرێ به گشتی وەکو دیمەنی ئایەتەکه پیشانی ئەدات، تەنانەت نکەو ناڵەی نەخۆشیش ئەنووسرێ.

ئەگێڕنەوه له پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوه – خوای لێ ڕازی بێت – که له کاتی مردنی دا بەگوێرەی باوی ئادەمی نکەی هەبوو، لەپاشان گوێی لێوه بوو وترا: که نکەو ناڵەیش ئەنووسرێ، بەهۆی ئەوەوه ئیتر بێ دەنگ بوو هەتا له دنیا دەرچوو – خوای لێ ڕازی بێت –.

خوا پێداوەکان ئا بەو جۆره گوێڕایەڵ بوون ئا بەو شێوه فەرمان بەرداریيان ئەکرد!! لەپاش ئەمەی ژیانی ئادەمی لەم جیهانەدا بەو جۆره پیشان دا که هەموو کات وا لەژێر ئەو ڕەقابه بەتینەدا، ئینجا دێته سەر باسی مردن که قۆناغێکی ئادەمی یه، ژیانی ئەم جیهانەی پێ دوایی بێت، لەکاتی بڕینی ئەم قۆناغەدا هەموو حەق و ناحەقێك ڕوون ئەبێتەوه، تەنانەت بۆ ئەوانەیش که له ڕێگای ڕاست لایان داوه لەم جیهانەدا،

---

[1] ئەمه هەندێکه له حەدیسێ که له کتێبه باوەڕ پێکراوەکان دا هەیه، به چەند ریوایەتێك هاتووه، یەکێ لەوانە(ریاض الصالحین) ه لەباسی(إخلاص) دا.

وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٠﴾
وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٍ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴿٢١﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ﴾[1] سەختی و بەتینی گیان کەنشت کە فام و هۆش ناهێڵێ حەقیقەتی کار ئەهێنێ و روون و ئاشکرای ئەکاتەوە، واتە لە کاتی مردن دا دەرئەکەوێ و روون ئەبێتەوە کە ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵیان پێدا هەموو حەقەو راستە، کەواتە نەفام و نەزانەکان فامدارو زانا ئەبن، بێ باوەڕەکان باوەڕ ئەهێنن، بەڵام بەداخەوە تازە ئەو زانین و باوەڕە هیچ سوودێ ناگەیەنێ، بەڵکو داخ و سزا بەتین تر ئەکات و بارەکە قورس تر ئەکات. بێگومان مردن زۆر سامناکەو ئادەمی لەم جیهانەدا ئەیەوێ بە هەر جۆر خۆی لێ دوور بخاتەوە، بەڵام ئەوە هیچ سوودی نی یەو رزگاری و خۆ لادان نی یە لێ ی وەکو ئەوترێ بە ئادەمی لەو کاتە ناهەموارەدا: ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾[2] ئەم مردنە سامناکە شتێکی ئەوتۆ بووە کە لەمەوپێش لە دنیادا خۆتت لێ لائەداو ئەتویست کە دووچاری نەبی.**

---

[1] زۆر جار فیعلی رابردوو ئەوترێ و مەبەست رووداوی لەمەوپاشە لەبەر چەند هۆیەك، یەکێ لەوانە هێما کردنە بەوەی ئەو شتە ئەوەندە راستە وەکو رووی دابێ وایە، جا بەو گوێرە ئەم فیعلە رابردووەم بە رووداوی لەمەوپاش راڤە کردووە وەکو چەند فیعلێکی تر کە لەمەوپاش دێت: ﴿وجاءت , وقال، نفخ﴾ وێنەی ئەمانە زۆر لە قورئان دا.
تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ﴿ب﴾ لە وشەی ﴿بالحق﴾ دا بۆ تەعدیە بێت و بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە کە ﴿ب﴾ بۆ موحاسەبە بێت، واتە سەختی و بەتینی مردن دێت کە حەقی لەگەڵ دایە، بەم جۆرەیش هەر رێکەو هەر پێشووەکە ئەگەیەنێ. بەڵام زۆریە لەسەر پێشووەکەیە.
[2] تەفسیر بە گوێرەی ئەوەیە کە وشەی ﴿ما﴾ موصولە بێت، بە شێوەی نافیەش تەفسیر کراوەتەوە، واتە خۆتت بۆ لا ئەدرا لەو مردنە، بەم جۆرەیش هەر ئەبێت، بەڵام زۆریە لەسەر پێشووەکەیە. وشەی ﴿ذلك﴾ کە بۆ دوورە زۆرجار بەکار ئەهێنرێ بۆ نزیك لەبەر چەند هۆیەك، یەکێ لەوانە بۆ هێما کردنە بە سامناکی و ناهەمواری ئەم شتە نزیکە وەکو لێرەدا، جا لەبەر ئەوە بەنزیك تەفسیرم کردووە، وتم: ئەم مردنە، بەڵام سیفەتی سامناکیم بۆ هێنا کە لە وشەی ﴿ذلك﴾ دەرئەکەوێ لێرەدا. خوا خۆی ئەزانێ.

وشەی ﴿سكرة﴾ لەرزە ئەخاتە دڵ - پەنا بەخوا - ئەبێ مەردوم چۆن بێت لەو پلە سەختەدا؟ كوڕی ئەوێ لە حەیبەتی سام و ئێش ئاگای بەلای خۆیەوە بێت، ئێمە ئەبینین لەم جیهانەدا، ئادەمی هیچ هۆشی بەلای هیچ كەس و هیچ شتێكەوە نی یەو نامێنێ كاتێ كە ئێشێكی سەخت پەیدا ئەبێت لە ئەندام و پارچەیەكی دا، ئەوەیش لەبەر ئەوەیە كە ئەو ئەندام و پارچەیە گیانی تێدایە. دەی با لەمەوە بیر بكەینەوە لە كاتی گیان كێشان كە بەجارێ ئەو دەردو ئێشە پەلاماری رۆح ئەدات كە تێكەڵەو پەیوەندی بە هەموو لەشەوە هەیە لە دیوی دەرو ناوەوە. سەختی یەكەی لە رادەیەك دایە كە ئەرك و قورسی خستۆتە سەر شانی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) لە كتێبە سەحیحەكان دا هەیە كە لەو كاتەدا عەرەقی تەوێڵی بەفەڕی خۆی ئەسڕی و ئەیفەرموو: سبحان الله، إن للموت لسكرات، ئەوەی فەرموی لە كاتێك دا كە خۆی ئەیویست بڕوا بۆلای تاقمو كۆمەڵی هەرە بەرز، سۆزو ئارەزووی لیقای خوای خۆی هەبوو،خوا بە بەزەیی خۆی یارمەتیمان بدات لەو پلە سەختەو سامناكەدا. آمین.

ئینجا لە سەخت و سامناكی گیان كێشان و مردنەوە، ئەمانبات بۆ باسی زیندوو كردنەوەو پرسیارو موحاكەمەی ئەو رۆژە سەختە، كە هەر حازر كردنی وێنەكەی و بیر لێ كردنەوەی خورپە ئەخاتە دڵ و دەمار ئەهێنێتە لەرزەو سام و ترسێكی بەتین فەراهەم ئەهێنێ لە دڵ و دەروون و هەموو هەست دا، ئەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ﴾ فو ئەكرێ بە(صور) دا كاتی ئەو رۆژی بەدی هاتنی هەڕەشەی خوایە كە لەم جیهانەدا لەسەر زمانی پێغەمبەرەكان دا رایگەیاند بە بەندەكانی. ﴿وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ﴾ هەموو كەسێ لەو رۆژەدا دێت بۆ جێگای پرسیارو محاكەمە بە جۆرێك دوو مەلائیكەی لەگەڵ دایە، یەكێكیان ئەیبات و ئەوی تریان شایەتی كردەوەیەتی، چەند رایەك هەیە لەم سایەق و شایەتەدا. بەهێزترین ئەمەیە: كە ئەوانە دووانەكەن كە لەم جیهانەدا چاك و خراپەی بەندەكان ئەنووسن.

لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِالْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾

**لەو كاتە تەنگەدا پێی ئەگوترێ: ﴿لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ بێگومان تۆ لەمەوپێش لە دنیادا لە بێ ئاگایی دا ئەژیای، بێ ئاگا بووی لەم ڕۆژو بەسەرهاتە، ئینجا ئێمەیش پەردەی بێ ئاگاییمان لابرد لێت، کەواتە: ئێستا باش تەماشا بکە، چونکە چاوت ئەمڕۆ تیژەو باش ئەبینێ و ئەوەی بەرگری ئەکرد لە بینینی لابرا کە بریتی بوو لە بێ ئاگایی و خەریك بوون بە شت و مەکی دنیاوەو دەق گرتن هەر بەو جۆرە شتانەوە. ئەگەر مەبەست بەو کەسەی کە قسەی لەگەڵ ئەکرێ و ئەوەی کە پێی ئەوترێ تەنها کافر بێت ئەوە دیارە کە کافر لەم جیهانەدا بێ ئاگایە لەو ڕۆژو بەسەرهاتە تەنانەت کافرێکیش کە باوەڕی هەبێ بە ڕۆژی دوایی، چونکە باوەڕەکەی بە جۆرێکی ڕاستەقینە نی یە کە خوا ئەیەوێ. ئەگەر مەبەست هەموو یەکە یەکە بێت بە شێوەی گشتی کافر بێت، یان موسڵمان ئەو کاتە مەبەست بە بێ ئاگایی موسڵمان ئەوەیە کە هەموو کات لەدنیادا دڵی نەداوەتێ و چاوی تێ نەبڕیوە، بێجگە لەوەش هەرچەند باوەڕی بەهێزی ڕێك و ڕاستی بووبێ، ئەو باوەڕەی وەکو خەو و بێ ئاگایی وایە لەگەڵ ئەوەی ڕۆژی دوایی کە بە چاوی خۆی ئەیبینێ، وەکو پەندی فارسی ئەڵێ: ﴿شنیدن کی بود مانند دیدن﴾.**

**ئینجا ئەو مەلائیکەی کە شایەتەو دەفتەری کردەوەو ژیانی ئەو کەسەی پێیە ئەچێتە پێشەوەو قسەی خۆی ئەکات وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ قَرِينُهُ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ [1] ئەو مەلائیکەی کە لەگەڵیدا بووە لە دنیاداو هاوسەری بووە، ئەڵێ: ئەمە شتێکی ئەوتوە کە نووسراوە لام و**

---

[1] هەندێ ئەڵێن مەبەست بەم هاوسەرە ئەو شەیتانەیە کە لەم جیهانەدا کابرا شوێنی کەوتووە تا زاڵ بووە بەسەری داو گومڕای کردووە، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە بەهێزەو ڕای زۆربەی لەسەرە، خوا خۆی ئەزانێ.

ئامادە کراوە بێ زیادو کەم. ئیتر لێرەدا هیچ باسی پرسیارو تەماشای دەفتەرو هیچ شتێك ناکات، ئەیەوێ بە گورجی بڕیارەکانی خوا پیشان بدات. ئەفەرموێ: ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ * مَنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ * ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ﴾ [1] خوای گەورە فەرمان ئەدات بەو دوو مەلائیکە کە باس کران، ئەفەرموێ پێیان: توڕی دەنە ناو دۆزەخەوە هەرکەسێ کە زۆر کافرو بێ باوەڕو سەرکەش بووە لەحەق و زۆر ڕێگە گری خێرو چاکە بووە، ئەو مافانەی بەسەریەوە هەبوو بەجێی نەئەهێناو دەست درێژیی کەرو لە سنوور دەرچووبوو، گومان و دوو دڵی هەبوو لە خواو ئایینی خوادا خوای تری بڕیار داوەو هاوبەشی بۆ خوا داناوە، هەموو یەکێ لەوانە بخەنە ناو عەزابێکی زۆر بەتین و بەسۆ. باس کردنی ئەم سیفەتە ناشیرینانە ئێجگار تەنگی و بەتینی ڕۆژەکە پیشان ئەدات، چونکە ئەبێتە بەڵگە لەسەر قارو غەزەبی بەتینی خوا لەو ڕۆژەدا – خوا پەنامان بدات –. هەروا بە دەم خۆشە بڵێن قارو غەزەبی خوا، ئەو خوایەی کە تواناو دەسەڵاتی سنووری نی یە، ئەو خوایەی کە هەموو ئەم بوونەوەرە بە هەموو ئاسمانەکان و زەوی یەوە نزیکە پارچە پارچە بین لە حەیبەتی ئەو، پەنا ئەبەین بە ڕەحم و بەزەیی یەکەی لە قارو غەزەبی. پەنا ئەبەین بە خۆی کە بمانپارێزێ لە خۆی، پەنا ئەگرین بە عەفوو لێ بوردنی لە سزاو تۆڵە سەندنی، لەو کاتەدا کە ئەو بڕیارو فەرمانە ئەدرێ هاوسەرەکەی ئەو ئادەمی یە ئەکەوێتە دڵە لەرزەو ئەیەوێ خۆی پاك بکاتەوە لە تاوانی ئەو ئادەمی یە وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَـٰكِن كَانَ فِى ضَلَـٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾ [2] هاوسەرەکەی ئەڵێ ئەی پەروەردگارەکەمان من ئەم بەندەیەم گومڕا نەکردووە، واتە من زۆرم پێ نەهێناوە لەسەرکەشی و کافریی یەکەی دا، بەڵکو خۆی لە گومڕایی یەك دا بوو دوور لە حەق و ڕێگای ڕاست، واتە خۆی سەری لێ تێك چوو بوو من دەسەڵاتم نەبووە بەسەری دا.

---

[1] هەندێ ئەفەرمون ﴿الذي﴾ مبتدلو ﴿فألقياه﴾ خەبەرەکەیەتی و ڕستەیەکی سەریەخۆیە، بە گوێرەی تەفسیرەکە ﴿الذي﴾ بەدەله لە وشەی ﴿کل کفار﴾ بە هەردوویار هەر باشەو ئەگونجێ.

[2] لە پێشەوە قسەی هاوسەرەکەی بە پیتی عەتفەوە فەرمو، بەڵام لێرەدا بە سەریەخۆ فەرموی بێ پیتی عەتف، چونکە ئەمەی ئێرە وەکو بەرپەرچ وایە بۆ قسەی کابرای کافر، کەواتە قسەکان دەست نادەن بۆ کۆبوونەوە، کەواتە پیتی ﴿و﴾ ی عەتفی کە کۆبوونەوە ئەگەیەنێ ناگونجێ، بەڵام پێشووەکە کۆئەبێتەوە لەگەڵ ڕستەی پێش دا.

ئەو کەسانەی کە لەسەر کافری بەردەوام ئەبن لە دنیادا دوو جۆر هاوسەریان هەیە، یەکێکیان لە مەلائیکەیە وەکو باس کرا، ئەوی تریان لە تیرەی شەیتانە، وەکو لە سورەتی ﴿الزخرف﴾ دا باسمان کرد لە کاتی تەفسیری ئایەتی: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴾ [1] جا لێرەدا مەبەست لەم هاوسەرە جۆری یەکەمە یان دووەم؟ بە هەردوو جۆر هەر ئەگونجێ، بەڵام زۆربە لەسەر ئەوەیە کە لێرەدا مەبەست جۆری دووەمە، دڵ بەم رایە بە ئارام ترە وەکو دەرئەکەوێ لەم فەرمودەیشەوە: ﴿قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ﴾ خوا ئەفەرموێ پێیان شەڕە قسەو دەمە دەمێ مەکەن لای من لە کاتێك دا کە من لە پێشەوە لە دنیادا هەڕەشەم لێ کردن لەسەر کوفرو سەرکەشی، ئەم هەڕەشەیەم پێ راگەیاندن لە کتێبەکان و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکان.

لەپێشەوە وتمان لەم فەرمودەوە وا دەرئەکەوێ کە ئەم هاوسەری ئێرە لە تیرەی شەیتانە، چونکە ئەو کافرە رێگای نی یە دەمە دەمێ بکات لەگەڵ هاوسەرە مەلائیکەکەدا، چونکە ئەم هەوڵی گومڕا کردنی نەداوە، ئەوەی هەوڵی دابێ و لە خشتەی بردبێ هاوسەرە شەیتانەکەیەتی، بێجگە لەوەش خوا هەڕەشەی نەکردووە لە هاوسەرە مەلائیکەکەی. بەڵێ دیمەنی ئەم فەرمودە بەو جۆرە پیشان ئەدات، بەڵام ئەو بارەکەی تریش هەر ئەگونجێ بەم جۆرە ئەو هاوسەرە هەرچەند بەندەی گوێ رایەڵی خوایە، هیچ گوناهو تاوانی نی یە، بەڵام رۆژەکە ئەوەندە سەختە و کاتەکە ئەوندە تەنگە سام و ترسی لێ ئەنیشێ لە هاوسەری ئەو کافرە تاوانبارەو لەبەر ئەوە هاواری لێ هەڵئەستێ و بێ تاوانی خۆی دەرئەبڕێ، بەم جۆرە ناهەمواری رۆژەکە باشتر روون ئەبێتەوە. ئای هاوار بۆ رۆژێك کە بێ گوناهو بێ تاوانی تیادا بکەوێتە دڵە لەرزەو بیەوێ بە هەر جۆرێك خۆی پاك بکاتەوە، لەسەر ئەم رایە رەنگە ئاژاوەکەیان بریتی بێت لەوە: کافرەکە ئینکاری نووسراوەکەی بکات و ئەویش دیارە بەرپەرچی ئەداتەوە، خوا پەنامان بدات.

---

[1] واتە: هەرکەس خۆی کوێر بکات لە زیکرو یادی خوا شەیتانێکی بۆ ئامادە ئەکەین کە هاوسەری بێ هەمیشە.

**﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ [1] من بڕیاری خۆمم لە پێشەوە پێکەیاندووە، هیچ بڕیارێك لای من ناگۆڕێ، من خاوەن زوڵم و ناڕەوایی نیم دەربارەی بەندەکانم بەم جۆرە بێ تاوان سزایان بدەم، یان تۆڵەی ناڕەواو زیادیان لێ بسێنم. بێگومان بڕیار لەسەر دراوان زانراون و دیاریی کراون لای خواو بە هیچ کلۆجێ دەست نادەن بۆ زیادو کەم و گۆڕاندن، کەواتە ئەوانەی کە تاوانیان ئەسڕێتەوەو خوا لێ یان ئەبووڕێ ئەوانە هەر لە ڕێوە بڕیاری عەزابیان نەدراوە بەڵکو لای خوا بڕیاری ڕزگارییان دراوە، کەواتە ئەوانە جێگای ئەوە نین گومان ببرێ بە گۆڕانی بڕیار دەربارەیان، هیچ ڕەخنەیەکیان پێ ناگیرێ.**

**ئینجا شێوەیەکی تری سامناکی ئەو ڕۆژە سەختە پیشان ئەدات، شێوەی دۆزەخ کە تینووە بۆ سووتاندنی خەڵکی، هەر داوا ئەکات وەکو چڵێسێکی تێر نەخۆر، ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ [2] باسی ئەو ڕۆژە بکە کە ئێمە ئەڵێین بە دۆزەخ ئایا پڕ بوویت؟ ئەویش ئەڵێ ئایا زیاتر هەیە؟ واتە لەگەڵ ئەمەدا پۆل پۆل ئەو هەمووەی تێ تووڕ ئەدرێ لەتیرەی ئادەمی و جن کە تەنها خوا خۆی ئەزانێ ژمارەی، لەگەڵ ئەوەدا دۆزەخ ئەوەندە داخ لە دڵ و تینووە بۆ سووتاندنی خەڵکی هەر داوای زیاتر ئەکات و ئەڵێ: با بێت با پڕیش بووبێ، خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات. آمین.**

---

[1] بە چەند جۆرێك ئیعراب دروستە لەم ڕستەو ڕستەی پێشوودا بە هەر جۆرێ لەوانە تەفسیرێکی تایبەتی کراوە، بەڵام مەبەستەکە لە هەموو جۆرەکان دا هەریەکە لەبەر ئەوە باسم نەکردن.

[2] بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: ١.دۆزەخ لەگەڵ ئەو هەموو گەورەیی و فراوانی یەدا ئەوەندەی تێ تووڕ ئەدرێ بە تەواوی پڕ ئەبێ و خۆی ئەڵێ: ئایا شوێنی زیادەم هەیە؟ واتە نەخێر بە تەواوی پڕ بووم، هیچ شوێنم نەماوەتەوە، ئەم ڕایە ڕێکترە لەگەڵ دیمەنی ئەم ئایەتەدا: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾. ﴿هود / ١١٩﴾.
٢.دۆزەخ ئەوەندە فراوانە لەگەڵ ئەو هەموو دۆزەخییانەدا، هەر هێشتا جێگای بۆشی هەیە و داوا ئەکات پڕ بکرێتەوە، ئەم ڕایە هەرچەند لەگەڵ دیمەنی ئایەتەکەدا ڕێك نی یە. بەڵام چەند حەدیسێکی سەحیح فولکیریەتی، حەدیسی بوخاری: ﴿يلقي في النار و تقول: هل من مزيد حتى يضع قدمه فيها فتقول: قط قط﴾ لە نێوان ئەم سێ ڕایەدا دڵم باوەڕی بەهێزی بەوە هەیە کە لە تەفسیرەکەدا نووسیم، چونکە شوێنەکەو شێوەی وەڵامەکە وا پیشان ئەدات کە دۆزەخ داوای هەمیتر ئەکات، هەرچۆنێ لەگەڵ حەدیسەکان دا ڕێکە لەگەڵ ئەو ئایەتەدا کە وترا یەك ئەکەوێ، چۆن با پڕ بووبێ هەر تینووەو بڵێسەی لێوە دێت تا خوا تینوویەتیەکەی ئەشکێنێ ئیتر خوا خۆی باش ئەزانێ.

وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾

**ئینجا بەرامبەر بەم هەموو سەختی و ناخۆشی و ترس و سامەوە شێوەیەکی نازو ڕێزو کامەرانی پیشان ئەدات بۆ لە خواترسەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ * هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ﴾ بەهەشت نزیك ئەخرێتەوە بۆ لە خواترسەکان لە شوێنێك دا کە دوور نی یە لێ یانەوە، دڵخۆش ئەکرێن و پێیان ئەوترێ ئەمە جەزاو پاداشتێکە بەڵێنتان ئەدرێتێ پێ ی، واتە پێش چوونی بەهەشت دڵخۆش ئەکرێن بەمەی کە ڕەزامەندی هەیە دەربارەیان و ئەو پاداشتە گەورەیان بۆ ئەبێت.**

**ئینجا لە باتی سیفەتی لە خواترسی چەند سیفەتێکی تر ئەمێنێ بۆ ئەوانەی کە لە ڕۆژی دوایی دا بەهەشتیان لێوە نزیك ئەخرێتەوە ئەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ * مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾ بەهەشت نزیك ئەخرێتەوە لە هەموو کەسێکەوە کە زۆر ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو پارێزگاری سنوورو قەدەغەکانی خوا ئەکات، پارێزگاری ئەو کەسەی کە ئەم جیهانەدا ترساوە لە خوای خاوەن ڕەحم و بەزەیی خۆی لە پەنهانیدا، یان بێ ئەمەی دیبێتی و بە دڵێکی گوێڕایەڵ و گەردن کەچەوە ڕووی کردۆتە خواو ئەچێتە حوزووری لە ڕۆژی دوایی دا، ئەمە بەڵێنی خوایە - کە دەست نادات بۆ گۆڕان - بە هەرکەسێك کە خاوەنی ئەم سیفەتانە بێت، کەواتە هەرکەس خوا پێداوبێت و ئامادەدار بێت بیری خۆی پێوە ئەبێت و ئەزانێ ئەم ماوەی ژیانە هەلێکەو خوا هەڵی خستووە بۆی و لە دەستی خۆی دەرناکات، پشت ئەبەستێت بە خواو تێکۆشان ئەکات بۆ پێك هێنانی ئەم سیفەتانە بۆ دەست کەوتنی ڕەزامەندی خواو ئەو بەڵێنە بێ وێنەی نەبڕاوەی ئەو جیهانە، خۆی ڕوو سووری ئەو ڕۆژە سەختە ئەکات بە جۆرێ ئەم سیفەتانە وەکو شیرو نەجمە بە ناوچاوانیانەوە ئەدرەوشێتەوە، خوا بە لوتفی خۆی یارمەتیمان بدات. آمین. لێرەدا وەکو لە چەند شوێنی تردا ئەفەرموێ لە: ﴿الرحمن﴾ ترساوە بۆ ئەمەی بزانرێ کە بەندە وەکو ترسی هەبێ ئەبێ چاوەڕوانی بەزەیشی هەبێ، بۆ ئەوەی کە پێویستە ترسی هەبێ لە خوا لەگەڵ یادی سیفەتی ﴿ڕەحمی﴾ دا چ جای لەگەڵ یادی سیفەتی قارو غەزەبیدا.**

ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ ﴿٣٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٖ ﴿٣٨﴾ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ ٱلۡغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾

---

**پاش ئەو هەموو ڕێزی بەتین و دڵخۆش کردنە ئینجا پێیان ئەوترێ: ﴿ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ * لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ﴾ بچنە ناو بەهەشتەوە بێ مەترسی لە هیچ سزایەك و بێ باك لە دوای هاتنی خۆشی و نازو نیعمەتی، یان بچنە ناویەوە بە جۆرێ مەلائیکە لەلایەن خواوە سەلامتان لێ ئەکات. ئەو ڕۆژە ڕۆژی مانەوەیە لە بەهەشت دا بێ دواهاتن و بڕانەوە، بۆ ئەوانە هەیە لەو بەهەشتەدا هەرچی ئارەزوو ئەکەن و هەرچی یان ئەوێ، هێشتا لای ئێمە هەیە زیاد لە داواکەی خۆیان لەوانەی کە خوا وێنەی لەم جیهانەدا دروست نەکردووە، کەواتە: هەرچۆنێ بڕانەوە نی یە بۆ ژیان و خۆشی یان لە بەهەشت دا شتی وایشیان پێ ئەدرێ کەهەر بە خەتەرەیش بەدڵی هیچ کەس دا نایەت، لە لوتف و بەزەییەکەی بە زیادبێت.**

**ئینجا لە دوا دوایی سورەتەکەدا چەند شتێکی لەمەوپێشی سورەتەکە بە کورتی دووبارە ئەکاتەوە، بەڵام بە شێوەو دیمەنێکی تر کە تام و بۆنی تریان هەیە، جگە لە تام و بۆنی یەکەمجار. یەکێ لە نایابی قورئان ئەوەیە کە یەك مەبەست چەند جارێ ئەفەرموێتەوە، هەرجارەی بە جۆرێکی جیاواز لە جارەکانی تر ئەبێتە هۆی تەڕو تازە بوونەوەو نەبێزراوی ئەو مەبەستە لەهەست و دەروون دا، ئەفەرموێ: ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ هَلۡ مِن مَّحِيصٍ﴾ لەپێش ئەم بێ باوەڕانەوە زۆرمان بەرباد کردووە لە تاقم و چینی چەرخەکانی پێشوو، کە ئەوان لە هێزو دەسەڵات دا لەمان بەتین تر بوون، بەهۆی ئەو هێزو دەسەڵاتەیانەوە کارو فرمانیان کرد لە وڵاتەکان دا، گەڕان و چەرخیان کرد بۆ بازرگانی و دەست کەوتی سامان و خێرو بێری زەوی.**

ئایا ئەو تاقم و چینانە هیچ شوێنی راکردنیان بوو لە تۆڵەو عەزابی خوا؟ واتە: نەخێر هیچ پەنادەرێکیان نەبوو، کەواتە با ئەمانە فام و تێگەیشتنیان ببێ و تەمێ خوار بێن لە وێنەکانی خۆیانەوە. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ بەراستی لەو بەسەرهات و بەربادبوونی گەلە رابردووانەدا تەمێ و عیبرەت هەیە بۆ هەرکەسێ کە دڵی هەبێ و دڵێ مردوو نەبێ، واتە بە فام و تێگەیشتوو بێ و بیربکاتەوە، یان گوێ بگرێ بۆ بیستنی گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانە، لەکاتێك دا وەکو گوێ ئەگرێ هۆشی بەلای خۆیەوە بێت و دڵێ بێدار بێت. کەواتە ئەو کەسانەی کە بیر ناکەنەوە لەو جۆرە شتانەو تەمێ خوار نابن، ئەوان دڵێ مردوون وەکو بێ دڵێ وان، یان ئەو کەسانەی کە باسی ئەو بەسەرهاتانە کاریان لێ ناکات، ئەوانە هۆشیان لای خۆیان نی یەو دڵیان بێدار نی یە. ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ سوێند بەخوا ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانمان دروست کرد لەماوەی شەش رۆژدا، هیچ زەحمەت و ماندوێتیمان دووچار نەبوو. واتە لە جێ یە دروست کردنی ئەو هەموو بوونەوەرە گرنگە لە یەکەم جارەوە هیچ ئەرك و زەحمەتی نەبێ، ئیتر ئەبێ زیندوو کردنەوەو دووبارە کردنەوەی مردووەکان چ ئەرکێکی هەبێ.

﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ * وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾ کەواتە بە ئارام بەو سەبر بکە لەسەر ئەو قسە ناڕەوایانەی کە ئەو بێ باوەڕانە ئەیڵێن دەبارەی زیندوو بوونەوەو ئەو ئایینەی کە تۆی پێ رەوانە کراوە، باسی پاکی و بێگەردی پەروەردگارت بکە بە سوپاسی یەوە لەپێش خۆرکەوتن و لە پێش ئاوا بوونی دا، هەروەها لە هەندێ کاتی شەودا لەپاش نوێژەکان باسی پاکو بێ لەکەیی خوای خۆت بکە[1]. واتە دڵت ببەستە بە خواوە.

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست بەوەی پێش خۆر کەوتن نوێژی بەیانی یە، بەوەی پێش ئاوا بوون نوێژی عەسرو نیوەڕۆیە، بەوەی لە هەندێ لە شەودا شەو نوێژە، بەوەی پاش نوێژەکان نوێژە سوننەتەکانە، زانینی تەولو لای خوایە.

وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ۚ ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

---

﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ * يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ﴾ **گویێ بگرە لە هەواڵ و بەسەرهاتەکانی رۆژی دوایی کە لە لایەن خواوە پێت ئەگات: گوێ بگرە لەوەی کە مردووەکان لە گۆڕەکانیانەوە دەرئەچن و دێنە دەرەوە، رۆژێك کە جارچی خوا جاڕ ئەدات و بانگ ئەکات لە شوێنێکی نزیکەوە لە هەمووان بە جۆرێك بانگەوازو جاڕەکەی ئەگات بە هەموو، ئەڵێت: ئەی ئێسکە رزیوەکان و پێست و موو گۆشتە پرژو بڵاوەکان خوا فەرمانتان پێ ئەدات کە هەموو کۆ ببنەوە بۆ موحاکەمەو بڕینەوەی هەموو کاروباری: گوێ بگرە لەوەی کە هەموو ئەو صیحەو تێ خوڕینە ئەبیستن کە بۆ شتێکی حەق و راستەو شتێکی حەق ئەهێنێ کە بێ باوەڕەکان ئەمڕۆ لە جیهان دا باوەڕیان پێ ی نی یە، ئەو رۆژە رۆژی دەرچوونی مردووەکانە لە گۆڕەکانیان بۆ جیاکردنەوەی هەموو حەق و ناحەقی.**

**ئینجا بەڵگەیەکی زۆر روون و ئاشکرا ئەهێنێتەوە لەسەر ئەو زیندوو بوونەوەیە، بە کورتی شێوەکەی ئەخاتە پێش چاوو ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ * يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ۚ ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ **بەڕاستی لەم جیهانەدا ئێمە گیان ئەدەین بە گیانداران و لە بێ گیانی یەوە ئەیانکەین بە گیانلەبەرو زیندوو، ئێمە ئەیانمرێنین و گیانیان لێ ئەسێنینەوە، تەنها بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەو پاشەرۆژی هەمووان بۆ پاداشت و تۆڵە لە رۆژی دوایی دا، رۆژێ کە زەوی لە ئاستی ئەوان شەق ئەبات و ئەوانیش دێنە دەرەوە لەناو سکی زەوی دا بە جۆرێك بە چەسپانی بە دەم بانگی ئەو مەلائیکەی کە بانگی هەمووان ئەکات، ئەوەیش زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەیەکی سووکو ئاسانەو هیچی ناوێ جگە لەمەی مەیل و خواهیشی خوا رووی تێ بکات. بێگومان گیان پێدان و مراندن لەم جیهانەدا زۆر**

بەڵگەیەکی روونە لەسەر زیندوو بوونی رۆژی دوایی، چونکە ئەو کەسەی کە قارچك و ئەو تۆمەو چەکەرە ناسکانە لەناو سکی زەوی دا زیندوو ئەکاتەوە زەوی یەکە لە ئاستیان شەق ئەکات و ئەیانهێنێتە دەرەوە، ئەو دەسەڵاتەی ئەمانە ئەکات باش باش ئەتوانێ مردووەکانیش لەناو سکی زەویدا زیندوو بکاتەوەو بیانرووێنێتەوەو زەوی یەکەیان لە ئاستی شەق بکات و بە گورجی بیانهێنێتە دەرەوە.

ئینجا لە کۆتایی سورەتەکەدا پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیا ئەکات و دڵخۆشی ئەداتەوەو کاروفرمانی دیاریی ئەکات و هەڕەشەیش ئەکات لە بێ باوەڕەکان بەم فەرمودەیە. ﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴾ ئێمە زاناترین بەوەی کە ئەو بت پەرست و بێ باوەڕانە ئەیڵێن دەربارەی تۆو ئایینەکەت، تۆ دەسەڵات دار نیت بەسەر ئەوانەدا ناچاریان بکەیت لەسەر ئیمان و باوەڕ هێنان، ئەوە لە تۆ داوا ناکرێ، ئەوەی لەسەر تۆیە راگەیاندنە، سوودی راگەیاندنەکەشت تەنها بۆ لەخوا ترسەکانە، کەواتە ئەو کەسەی کە لە هەڕەشەی من ئەترسێ بەم قورئانە بیترسێنەو مۆچیاری بکە. بێگومان هەموو دڵێکی تێگەیشتوو بە فام و هۆشدار ئەهێنێتە لەرزە، سام و ترسی هەڕەشەکانی دەروون دائەگرێ، بە بەڵێنەکانی ئومێدو چاوەڕوانی پەیدا ئەکات، ئەو هێزو دەسەڵاتەی قورئان هەیەتی بەسەر دڵ و دەروون دا هیچ زۆردارێك لەم جیهانەدا نیەتی. واتە پێویستی بە زۆر پێ هێنان و ناچارکردن نی یە لەسەر ئیمان هێنان، هەر دڵێ تەڕایی و نەرمی تێدا بێت بەم قورئانە چارەسەر ئەکرێ و ئەخرێتە سەر رێگای راست. ئەو دڵەی کە رەق و سەرکەشە و بێبەشە لە هەموو خێرو بێرێك، ئەوە هەر بۆ ئەوە چاکە ببێتە سوتەمەنیی ئاگری دۆزەخ.

خوا پەنامان بدات لە قارو غەزەبی خۆی، ترس و سامی خۆی و هەڕەشەکانی قورئانەکەی بخاتە دڵ و دەروونمانەوە، بە ئومێدو چاوەڕوانی بەڵێنەکانی لەش و گیانمان پاراو بکاتەوە. آمین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾

## سورەتی(الذاريات)
## مەككەیی یەو ٦٠ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە مەبەست و ئامانجی بەستنەوەی دڵ و دەروونی ئادەمی یە بە خواوەو پچڕینی لە هەر شتێ کە ببێتە کۆسپ و بەرگری بکات لە پەرستن و بەندەیی خوا، هان ئەدات بۆ خۆ رووت کردن و خۆ یەك تەن و یەك بار کردن بۆ خواو راکردن بۆلای خوا بە تەواوی. لە یەکەم جارەوە دەست پێ ئەکات بە سوێند خواردن بە چوار شت لە دروست کراوەکانی خوا بە چەند وشەیەك کە لەمەو پێش بەم مەبەستانی ئێرە باوو ناسراو نەبوون، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا * فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا * فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا * فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾[1] سوێند بەو بایانەی کە تۆزو هەورو هۆی ئاوس بوونی درەخت و بەروبووم و میوەجات بەرزو پرژو بڵاو ئەکەنەوە، هەروەها هەموو شتەکانی تر لەوانەی کە ئادەمی ئەیانزانێ یان نایانزانێ، دوای ئەوە سوێند بەو هەورانەی کە هەڵگری بارانن، ئینجا سوێند بەو کەشتی یانەی کە ئەگەڕێن بەسەر پشتی ئاودا بە ئاسانی، دوای ئەوە سوێند بەو مەلائیکەتانەی کە باران و رۆزی و شت و مەکەکانی تر دابەش ئەکەنەوە، سوێند بەمانە هەموو﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ * وَإِنَّ الدِّينَ

---

[1] ئەم چوار وشەیە بە چەند شتی تر تەفسیر کراونەتەوە، بەلاَم ئیمامی عومەرو ئیمامی عەلی و ئیبن عەباس و زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە لە تەفسیرەکەدا وتراوە، ﴿ف﴾ بۆ گەیاندنی جیاوازی پلەی سوێند پێ خوراوەکانەو مەبەست بەرزبوونەوەیە لە خوارەوە بۆ بەرزتر ئەگەر مەبەست پێیان چوار شتی جیاوازبن، وەك لە تەفسیرەکەدایە، چونکە دابەش کردنی هەموو کارو فرمان لەم بوونەوەرەدا بەڵگەیەکی بەهێزترە لەسەر دەسەڵات و حیکمەتی خوا، تا گەڕانی کەشتی یەکان لە دەریاکان دا بێ ئەمەی بنیشن، ئەمە بەهێزترە لە هەڵگرتنی هەور بۆ باران، ئەم روون ترو بەهێزترە لە یەکەم سوێند کە بریتی یە لە هەڵگرتن و پرژو بڵاو کردنەوەی با بۆ ئەو شتانەی کە لە تەفسیرەکەدا باس کران.

﴿ بێگومان ئەوەی کە ئێستا بەڵێنتان پێ ئەدرێ هەموو راستەو دێتە جێ و بێگومان جەزاو تۆڵەهەیە و بەدی دێت.

باو هەورو کەشتی و مەلائیکە لە دروست کراوەکانی خوای گەورەن خۆیان بە خۆیان – وەکو دروست کراوەکانی تر – هیچیان بەدەست نی یەو هیچیان پێ ناکرێ، بەلاّم خوا کردوونی بەهۆی دەرکەوتنی بەشێ لە زۆرو توانای خۆی، هەندێ لە بەرهەمی خواهیش و توانینی بێ سنووری خۆی بەهۆی ئەوانە دەرئەخات بۆ بەندەکانی، خوای گەورە کە سوێند ئەخوات بەم دروست کراوانەو رێزو نرخیان پێ ئەدات، دڵ و دەروون بێدار ئەکاتەوە بۆ بیر کردنەوە لەو هەموو ئەڵگەو نیشانە روونانە کە لەو شتە گرنگانەدا هەن، بێگومان هەموو خاوەن ژیریی و بیرێکی بەهێزی رێکی ئەو بیرەی کردووە چاوی دڵی دەستی قودرەتی خوا ئەبینێ لەوانیش و لەو شتانەیش کە لەوانەوە فەراهەم دێت.

بە تایبەتی باس کردنی ئەوانەو سوێند پێ خواردن و ناوبردنیان بەو شێوەو بەو سیفەتە تایبەتیانە کە باوو ناسراو نەبوون ئێجگار گرنگیان پیشان ئەدات و سەرنج رائەکێشێ بۆ بیر کردنەوە تیایان دا. ئەم چوارە پەیوەندی یەکی ئاشکرایان هەیە بە مەبەستێکی گرنگ لە مەبەستەکانی سورەتەکە، کە بریتی یە لەباسی رۆزی و ئازاد کردنی دڵ و دەروون لەمەی کەسێ ببێتە بەندەی ئەڵقە لە گوێی رۆزی، رزگارکردنیەتی لەمەی کە هەمیشە بەژێر باری مەراقیەوە نقەی بێت.

ئەم چوارە ئەو پەیوەندیەیان هەیە، وەکو پەیوەندی بەتینیشیان هەیە بە سوێند لەسەر خوراوەکەو بەجۆرێ لە دووبارەوە ئەبێ بە بەڵگەیەکی بەهێز لەسەری:

١- لەم رووەوە کە کەسێ دەسەلاّتی ببێ بەسەر دروست کرانی ئەو شتە نایابانەدا، دەسەلاّت و توانایشی هەیە بەسەر زیندوو کردنەوەو پرسیارو تۆڵەو پاداشت دا.

٢- لەم بارەوە کە سروشتی ئەم دروست کراوانە بەم هەموو رژێمە تێرو تەواوەوە شایەتە لەسەر ئەوەی کە ئەم هەموو کاروبارە لەخۆڕایی پێك نەهێنراوە، بە رێکەوت و گۆترەکاری نی یە، بەڵکو لەبەر مەبەست و حیکمەتێکی زۆر گرنگە، نەبوونی پرسیارو حیساب بۆ تۆڵەو پاداشت پێچەوانەی دادو کاردروستی خوایە.

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمۡ لَفِي قَوۡلٖ مُّخۡتَلِفٖ ﴿٨﴾ يُؤۡفَكُ عَنۡهُ مَنۡ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلۡخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي غَمۡرَةٖ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسۡـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ هُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ يُفۡتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُواْ فِتۡنَتَكُمۡ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ

---

ئینجا سوێندێکی تر ئەخوات بە ئاسمانی رازاوەی رێك و پێك تەنراو بەو هەموو رێگایە، لەسەر ئەوەی کە بێ باوەڕەکان دەبارەی پێغەمبەر(ﷺ) یان وڕئان چەند قسەو رایەکی جیاوازیان هەیە هەر جارێ بە جۆرێ، قدامەزراو نین لەسەر قسەو بارێك ئەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡحُبُكِ * إِنَّكُمۡ لَفِي قَوۡلٖ مُّخۡتَلِفٖ﴾[1] سوێند بەو ئاسمانەی کە خاوەنی چەندەها رێگاو رێبازە، بە جۆرێ گۆل گۆل لێ ی وەستاوەتەوە وەکو ئاوێکی وەستاو کە با لێ ی بدات، سوێند بەو ئاسمانە ئەی بێ باوەڕەکان ئێوە وان لە قسەو باسێکی جیاوازدا هەردەمێ بە جۆرێك و لەسەر بارێ ناوەستن و سەقام ناخۆن، دیارە ئەوەیش نیشانەی نەفامی و نەزانی خۆیان و بێ جێی قسەکانیانە. ﴿يُؤۡفَكُ عَنۡهُ مَنۡ أُفِكَ﴾[2] ئەو کەسەی کە لائەدرێ لەم قورئانەو ئەو ئایینە راستەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، ئەو کەسە کەسێکە کە بەپێی زانین و بڕیاری خوا لادراوە، ئەو لادانەی لەزانینی ژێر باری خوادا رابردووەو تێپەڕی کردووە. ئینجا هەندێ لەسەر ئەو بێ باوەڕە لادراوانە ئەڕوات بە نزای شەڕ لێ یان، بەمەی بەد گومانن دەربارەی رۆژی دوایی، قسەی دامەزراویان نی یە لەو بارەیشەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُتِلَ ٱلۡخَرَّٰصُونَ * ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي

---

[1] رەنگە پەیوەندی نێوان سوێند لەسەر خورلو ئەمە بێ کە قسەکانی بێ باوەڕەکان لە جیاوازی و پێچەوانەی خۆیان و مەبەستیان دا وەکو رێگاکانی ئاسمانەکان وایە لە دووریان و جیاوازی ئەو شوێنانەی بۆی ئەڕۆن.

[2] ئەمە بە گوێرەی ئەوە کە راناوی ﴿ه﴾ ی وشەی ﴿عنه﴾ بگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یان بۆ قورئان لەسەر ئەم بارەیە جۆرێ تریش باس کراوەو تەفسیر کراوەتەوە، واتە هەرکەس لادرابێ ئەو کەسە لەم قورئانە لائەدرێ، چونکە لادان هەر بریتی یە لە لادان لەم قورئانە، ئەگەر راناوەکەی بۆ وشەی ﴿قول﴾ بگەڕێتەوە ئەو کاتە بەم جۆرە تەفسیر ئەکرێتەوە، ئەو کەسەی کە لادراوە لادانەکەی لەو قسەو باسە جیاوازەو بەهۆی ئەوەوە پەیدا بووە، بەم دوو جۆرەیش هەر ئەگونجێ و خوا باش ئەزانێ.

غَمْرَةٍ سَاهُونَ﴾ یاخوا نەفرین لێ کراوبن ئەو درۆزنانە کە لە خۆوە بە گزاف دەم ئەکوتن، دەرکرێن لە رەحمەت و بەزەیی خوا، ئەوانە کەسانێکن وان لەناو نەزانینێك دا داپۆشیون و داگیری کردوون، هەست ناکەن و بێ ئاگان لەوەی داوایان لێ کراوە وەکو مەست و سەرخۆش وان بەهۆی باوەڕیان نی یە بە رۆژی دوایی، جا لەبەر ئەوە بە شێوەی بێ باوەڕیی و بە بێزاری یەوە ﴿يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ﴾ پرسیار ئەکەن ئەڵێن ئایا کەی، چ کاتێ رۆژی دوایی دێت، واتە: هاتنی ئەورۆژە شتێکی زۆردووورەوجێگای بڕوا نییە.

ئەو پرسیارە ناڕەوایە شایانی ئەوەیە کە بەم جۆرە سەخت و سامناکە وەڵام بدرێتەوە ﴿يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ﴾ ئەو رۆژە روو ئەدات لە رۆژێك دا کە ئەو بێ باوەڕانە ئەخرێنە سەر ئاگری دۆزەخ و بەتین و بەهێز ئەسوتێنرێن پێی بە جۆرێ وەکو مەعدەن کە لەناو بۆتەدا ئەتونێرێنەوە!! لەگەڵ ئەو نزا سەختەدا سزای دەروونی ئەدرێن بە تەشەر لێدان، پێیان ئەوترێ: ﴿ذُوقُواْ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ﴾ سزای خۆتان بچەژن، ئەمە بۆ ئەوەی کە ئێوە لە دنیادا بە لاقرتی یەوە پەلەتان پێ ئەنایەوەو ئەتان وت: کوا بۆ نەهات؟

ئینجا بەرامبەر ئەم تاقمە بەدبەختە سیاچارە تاقمێ تر باس ئەکات کە بەختەوەرن، خاوەنی پاشەڕۆژی نازو رێزو کامەرانین. ئەو تاقمە باوەڕی رێك و پێکیان هەیە، لە خۆوە بەدرۆو گزاف قسە ناکەن، لە خواترسن، بێ شەرم نین، بێدارو وریان، خواپەرستی ئەکەن و داوای لێ بوردن ئەکەن، تەمەن و ماوەی ژیانی خۆیان بەخت ناکەن بە بێ هۆشی و بێ ئاگایی: ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ﴾ بێگومان لە خواترسەکان، تاقمی بێداری خاوەن هەستی بەتین بە رەقابەو ئاگاداری خوا بەسەریانەوە، ئەو تاقمە وان لەناو باخ و سێبەرو سەهەندو کانیاوو سەرچەشمەی زۆرو گرنگ دا ﴿ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ﴾ بە جۆرێ بەو دڵخۆشی و رەزامەندی یەوەئەو شتانە ئەبن کە خوای خۆیان پێیان ئەدات،

إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾

---

**﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ﴾ چونکە ئەوانە لە پێش ئەوەدا لە دنیادا کردەوەی چاکیان کردبوو، خواپەرستی یان بە جۆرێ ئەکرد، وەکو بە چاو خوا ببینن، چونکە باوەڕی بەهێزیان هەبوو کە هەرچەند ئەمان خوا نەبینن خوا ئەمان ئەبینێ. ئینجا کردەوە چاکەکانیان روون ئەکاتەوە بەم چەند فەرمودەیە:**

**١- ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ﴾[1] ئەوانە کەمێك لە شەو ئەخەوتن ئیتر هەر خەریکی شەونوێژو خواپەرستی بوون، واتە شەو کە کاتی ئارام گرتن و خەوتنە، ئەوانە کەمێکی نەبێ ئەوی تریان بەخت ئەکرد لە خواپەرستی دا، ئەوانە بە خەبەر بوون کاتێ کە خەڵکی لە گەرمەی خەودا بوون.**

**٢- ﴿وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ لەبەرەبەیانیان دا داوای لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهیان ئەکرد، واتە ئەوانە لەگەڵ ئەوە کە لە شەودا کەم ئەخەوتن و زۆر خەریکی عیبادەت و خواپەرستی ئەبوون، کاتێ رۆژ ئەبووەوە دەستیان ئەکرد بە پاڕەو لاڵەو داوای لێ بوردن وەکو لە شەودا هەر خەریکی خراپەکاری بووبن. ئەوانە کۆمەڵێ بوون خوا یارمەتی دان و حاڵی کردبوون لە مانای خواپەرستی، بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ خوای خۆیان دا بەو جۆرە بەراستی کەمەری بەندەیی و پەرستنی خوایان بەستبوو، بەرامبەر بە خەڵکی و ئەو ماڵەی کە خوا پێ ی دابوون، بەم جۆرە بوون:**

**٣- ﴿وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ﴾ لە ماڵ و سامانیان دا بەش و مافێك هەبوو بڕیاریان دابوو لەسەر خۆیان بۆ ئەو کەسەی کە داوا ئەکات و سواڵ کەرەو بۆ ئەو کەسەش کە**

---

[1] وشەی ﴿ما﴾ بۆ سێ بار دەست ئەدات: ١.زیاد بێت وەکو بە گوێرەی ئەوە لە تەفسیرەکەدایە ئەو کاتە ﴿قليلا﴾ یان زەرفە یان سیفەتە(ظرف یان صفه) بۆ مفعولی لابرلو. ٢.مصدريه بێت. ٣.موصوله بێت لەسەر ئەم دووبارە وشەی ﴿قليلا﴾ زەرفەو لە شوێنی خەبەردایە بۆ ﴿ما﴾ یان بۆ ﴿هجوع﴾ ەو دروست نی یە ﴿ما﴾ نافی یە بێت، چونکە بە گوێرەی رێزمانی عەرەبی ئەوەی لە پاشی یەوە بێت نابێ عەمەل بکات لەوەی لە پێشی یەوەیە، ئەم ئایەتە لە چەند بارێکەوە کەم خەوی و بێ ئیسراحەتیان پیشان ئەدات لە پێناوی خواپەرستی یان دا.

بیٚ ئەوایەو بێبەشەو بەڵام لە رووی نایەت داوا بکات لە کەس بە هۆی ئەوەوە بێبەشە لە خێرو سەدەقە.

ئینجا سەرنج رائەکێشیٚ بۆ بیر کردنەوە لە چەند شتێك کە بەڵگەو نیشانەیەکی روون لەسەر تاك و تەنهایی خواو زانین و دەسەلأت و بەزەیی بیٚ سنووری ئەفەرمویٚ: ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ * وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ لە زەوی دا چەند نیشانەو بەڵگەی روون هەیە بۆ ئەوانەی کە دڵ بە ئارام و دامەزراون بەهۆی باوەڕو زانینی بەهێزیانەوە، دەی ئایا لە خۆتان ورد نابنەوە تەماشایەکی ناکەن؟ واتە تەماشای ئەو هەموو نیشانە روونانە بکەن کە لە نەفسی خۆتان دایە.

ئێمە ئەم زەوی یە کە ئێمەی بەسەرەوە ئەژین پێشانگایەکی زۆر گرنگین بۆ ئەو هەموو شتە نایابانەی کە خوای گەورە فەراهەمی هێناون، تا ئێستا کەمێك لەوانەمان بۆ دەرکەوتووەو رۆژ بە رۆژ بەرە بەرە بۆمان روون ئەبنەوە، قاپی ئەم پێشانگایە لەسەر پشتە بۆ هەرکەسیٚ ئەیەویٚ بچێتە ناوی یەوەو بیر بکاتەوە توێشووی لیٚ هەڵگریٚ بۆ زیادە زانین و باوەڕ، بۆ هەموو جۆرە کەسێك دەست ئەدات کە بە گوێرەی رادەو پلەی فام و زانینی بەشی خۆی لیٚ وەرگریٚ، بەڵام هەتا پلەی ژیریی بەرزو بەهێز بێت بەشەکەی زۆرترو قەڵەوترە.

یەکەم تاقم کە ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا بە گوێرەی فام و بەراوردو زانینی خۆیان چەندەها بەڵگەو نیشانەی دڵنیاکەریان دەست کەوت لەم دوو پێشانگایەدا، هەروەها هەموو تاقمیٚ پاش ئەوان، تا گەیشتە چەرخی ئێمە کە زانیاری(ماددی) پلەی بەرز بووەوە، لە بەرهەمی بەراورد کردن دا چەند شتی فراوانی نهێنی دەست کەوت بوو لەم بوونەوەرەدا، کە لەمەوپێش بە خەوو خەتەرەیش بە دڵ دا نەئەهاتن، لەم چەرخی ئێمەدا دەستکەوتی ئێمە لەم دوو پێشانگایەدا زۆر زۆرترو نایاب ترە، بەم پیٚیە جیهان سەرکەویٚ هەتا بێت بەڵگەو نیشانەی گرنگ ترو نایاب تر دەست کەوت ئەبیٚ بۆ چین و تاقمەکانی پاش ئێمە.

بە جوانی ئەزانم هەندیٚ دەست کەوتی ئەم چەرخی خۆمانە بخەمە پێش چاو: ئەم زەوی یە کە ئامادەکراوە بۆ ژیان، خوای گەورە جویٚی کردووەتەوە بە چەندەها شتی تایبەتی، ئەگەر یەکیٚ لەوانە نەبیٚ، یان ساتمەیەکی تیٚ بکەویٚ ئەم جۆرە ژیانە کە ئێستا هەیە لەم زەوی یەدا پەکی ئەکەویٚ و بەسەر نابریٚ، ئەگەر قەبارەی بگۆڕیٚ بە گەورە یان بچووك تر ئەگەر باری لەگەڵ خۆردا بگۆڕیٚ بە دوور یان نزیك، ئەگەر قەبارەی خۆرو رادەی گەرمی بگۆڕیٚ، ئەگەر گەردش و خولانەوەی بە دەوری خۆی و خۆردا بگۆڕیٚ بە سست یان چەسپان

تر، ئەگەر قەبارەی مانگ یان دووری و نزیکی یەکەی لە زەوی یەوە بگۆڕیٰ، ئەگەر رادەی وشکی و تەڕی ئاو بگۆڕیٰ بەزیادو کەمی، ئەگەر قەبارەی هەوا – کە دەوری زەوی داوە بگۆڕیٰ بە کەم و زۆری، یان رادەی ئەو کەرەسانەی کە لیٰ ی پێك هاتووە بگۆڕیٰ.

ئەگەر... ئەگەر.. ئەگەر.. تا هەزارەها شتی تری وەکو ئەمانە کە باس کران، ئەوەی ناسراوەو ئەوەی هێشتا نەناسراون. دەی ئایا هەموو یەکیٰ لەمانە دەلیل و نیشانەیەکی زۆر روون وبەهێزنین لەسەرتاك و تەنهایی و توانین و زانین و بەجیٚیی هەموو کارو فەرمانی خوا؟

ئینجا ئەم هەموو خۆراکە کە فەراهەم هێنراوە لەم زەوی یەدا بۆ ئەو هەموو زیندو گیانلەبەرانەی کە ئەژین بەسەر پشتی زەوی یەوە، یان گەردش ئەکەن بەلای سەرویەوە، یان لەناو ئاوو دەریا و رووبارەکانی دا، یان خۆیان داشاردۆتەوە لەناو غارو ئەشکەوتەکانیان دا، یان نیشتەجیٰ بوون لە کون و درزەکان و ناوسکی زەوی دا، ئەو هەموو قوت و خۆراکە پێك هاتوون بۆ بوون و مانەوەی ئەو هەموو زیندو و گیانلەبەرانەی کە نایەتە ژمار، نە خۆیان و نە جۆری قوت و خۆراکەکانیان، ئەو هەموو قووت و خۆراکەی کە شاراوەیە لەناو سکی زەوی دا، یان ئاشکرایەو لەناوو جێگای ئاوەکانی دایە، یان گەردش ئەکات و ئەگەڕیٰ لەناو هەواکەی دا، یان رووا‌وە بەسەر پشتی یەوە، یان لە لایەن خۆرو چەند شتی ترەوە بۆیان هاتووە کە هەندێکی ناسراوەو هەندێکی هێشتا نەناسراوە. بەلاٌم بیٰ بڕانەوە هەڵئەقوڵیٰ و دێت بە گوێرەی حیکمەت و خواهیشیٰ، کە ئەم پەروەردگایەی دروست کردووە، بۆ ئەم جۆرە گیان و ژیانە، ئامادەی کردووە بە هەموو پێویستی یەکیانەوە بۆ ئەو هەموو جۆرە زیندەوەرو گیانلەبەرانە.

ئینجا ئەم هەموو دیمەن و شێوە شیرینە لەم زەوی یەدا بۆ هەر شوێنیٰ بڕۆیت، بۆ هەر شوێنیٰ و هەر کویٰ یە چاو هەڵخەیت، ئەم هەموو دۆڵ و تەختایی یە، ئەم هەموو شیوو چیاو دەریایی بچووك و گەورەو دەریا لوش و رووبارو حەوزو کانیاوە زۆرانە، ئەم هەموو پارچە زەوی یانە کە رازاونەتەوە بەو گشت شینایی و کشتوکاڵ و باغ و باغچەکە ئارایشن بەو هەموو گوڵ و پەل و گەلاٌو بەرو میوە جۆر جۆرە کە نایەتە ژمارە، هەریەکە شێوەو دیمەنێکی جیاوازو تام و بۆن و رەنگێکی تایبەتی یان هەیە، لەگەڵ ئەوەدا هەموو لەخاکیٰ ئەڕوێن، بەئاویٰ ئاو ئەدرێن، لەگەڵ ئەوەدا دەستی قودرەت هەموو کات وا لە کاردا تاقم و چینیٰ لا ئەباو تاقم و چینیٰ ئەهێنیٰ، بیٰ ئەمەی هیچ گۆڕان و جیاوازی یە روو بدات لە هیچ جۆریٰ لەو هەموو جۆرانەدا.

ئینجا ئەم هەموو گیانلەبەرانە کە ئەژین لەم زەوی یەدا بە هەموو تیرەو جۆرەکانی یەوە کە تا ئێستاش ژمارەیان نەزانراوە، چ جای ژمارەی یەکەیەکەیان، هەموو یەکێ لەو تیرەو جۆرانە گەل و ئوممەتێکی تایبەتی یە، یەکێك و فەردێ لەوانە بەڵکو هەموو پارچەیەکیان سەرسوڕهێنەرە هەرگیز نایابی یەکەی دوایی نایەت بۆ ئێمە.

ئەگەر هەموو ئادەمی بیر بکەنەوە لەو هەموو شتە نایابەی کە خوای گەورە لەم زەوی یەدا دروستی کردوون، بیانەوێ ژمارەیان بکەن و هەموو ئەو بەڵگەو نیشانە گرنگانە روون بکەنەوە کە لەو شتە نایابانەدا هەن. ئەگەر هەموو ئادەمی کۆببنەوە، بیانەوێ شتی وا بکەن هەرگیز بۆیان ناکرێ و بۆیان دوایی نایەت، بەڵام چاوی دڵی خەڵکی کوێرو نابینایە لە ئاستی ئەم هەموو شتە نایابەو ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە گرنگە ئاشکرایانە، هەموو لە ئاستی ئەم پێشانگا فراوانەی خوا کوێرن جگە لەوانەی کە باوەڕو زانینێکی تەواویان هەیە بەهۆی ئەوەوە دڵیان بە ئارام و دامەزراون. بەڵێ لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا زۆرو زەبەندە هەن پێیان ئەوترێ زانا، بەڵام تەنهادیمەن ودیوی دەرئەبینن وئەزانن، ئیتربێ ئاگان لە ناوەڕۆك و راستی و حەقیقەتی شت.

لەبابەت زەوی یەوە بەو جۆرە بە کورتی هەندێ دوام، ئینجا حەز ئەکەم لەبابەت خۆیشمانەوە هەندێ بدوێم: ئادەمی گرنگ ترین و نایاب ترین دروست کراوەکانی خوایە لەم زەوی یەدا، بەڵام هەر دڵێ بێبەش بێت لە ئیمان بە چاوی قورئانی تەماشای ئادەمی نەکات، بێ ئاگایە لە نرخی ئادەمی و لەو هەموو شتە نهێنی یە نایابانەی کە پەروەردگار فەراهەمی هێناون لەم ئادەمی یەدا. بێگومان شتێکی زۆر نایاب و سەرسوڕهێنەرە لەبابەت دیمەن و پێك هێنانی لەشی یەوە، وەکو دیوی ناو رۆحی یەوە، نموونەو نوێنەری هەموو بوونەوەرە لە زۆربەی بارو روویەوە، وەکو شاعیری خواناس ئەڵێ:

و تزعم انك جرم صغير وفيك انطوى العالم الأكبر [1]

هەرکاتێ ئادەمی بەفام وهۆشەوەبیر بکاتەوە لە خۆی ئاگادار ئەبێ بەسەر چەندەها شتی نهێنی وسەرسوڕهێنەردا،پێك هاتنی لەش بەهەمووپارچەکانیەوە،دابەش کردنی ئەو هەموو پارچەو ئەندامانە، شێوەو رێگای هەڵسانیان بەو هەموو کارو فەرمانەیان بەسووك و ئاسانی. کاروفەرمانی هەزم کردنی خۆراك و هەڵمژینی، کاروباری هەناسەدان و وەرگرتنی، سووڕی

---

[1] واتە تۆ ئەی ئادەمی خۆت ناناسی و لات وایە هەروا قەبارەو لەشێکی بچووکی لەکاتێك دا کە عالەمی هەر گەورە لە تۆدا شاراوەتەوە.

خوێن لە دڵ و دەمارەکاندا، کۆئەندامی دەمارو پێك هێنانی ئەو هەموو کەرەسەو یەك گرتنیان و بەڕێوەبری یان بۆ لەش، لولە بچووکەکان ﴿الغداد الصغیرة﴾ پەیوەندییان بە گەورە بوون و پەرەسەندن و ئیش وکارو ڕژێمی لەشەوە. یەك کەوتن و یارمەتی دانی هەموو کۆئەندامەکانی لەش بۆ یەکترو ڕێك و پێکی یان لە ئاستی یەك، زۆر بەوردی و تێرو تەواوی. لەناو هەموو پارچەو بەش و ئەندامێکی لەشدا چەند نایابی وەها هەیە کەهۆش و فام و ژیریی سەرگەردان ئەکات.

ئینجا گرنگی و نایابی ڕۆحی ئادەمی و ئەو هەموو وزەو توانایەی کە خوا پێ ی داوە، تێگەیشتن و ڕێ پێ بردنی بەو هەموو ناسراوو زانراوانە، ڕێگای زانین و ناسینەکەی، لەبەر کردن و هەڵگرتن و بیرکەوتنەوەی ئەو هەمووە، کۆکردنەوەو ڕاگیر کردنی شێوەو سورەتی ئەو هەمووە. ئەوە هەمووی لە کوێ یەوە چۆن کۆبووەتەوەو ئەمێنێتەوە؟ ئەو گشت شێوەو وێنە چۆن لە کوێ نەخش ئەبەستێ؟ چۆن هەرکات داخواز بکرێن بە گورجی پەیدا ئەبن، ئەمانە هەموو شتێکی ئاشکراو زانراون، ئەوەی کە نەزانراوو نەناسراوە، زۆرترو گرنگ ترو گەورەترە، جارجارێ، ناوبەناو ئاسارو بەرهەمیان دەرئەکەون و لە هەندێ کات دا ئەبن بە بەڵگە لەسەر جگە لەمەی ئێمە هەستی پێ ئەکەین لەو هەموو غەیبی یە هەست پێ نەکراوەی کە جگە لەخوا کەسی تر ئەندازەو ژمارەیان نازانێ.

ئینجا لەمانە هەموو نایاب ترو سەرسوڕهێنەرتر ئەمەیە: کە ئەم ئادەمی یە پێك دێت و دروست ئەکرێ لە تەنها سێڵێ(خلیە) کە هەڵگری هەموو ئەو شتانەیە کە تایبەتین بەم تیرەوە، ئەو هەمووەی تێدا کۆکراوەتەوەو تێیدا شاراوەتەوە، لەگەڵ هەندێ لە سیفەت و دروشم و نیشانەی تایبەتی باوك و دایك و نەنك و باپیرە نزیکەکانی.

دەی ئایا ئەم هەموو شتە چۆن لەم تەنها سێڵەدا جێگای کرایەوە، تەنها ئەم سێڵە سادەیە چۆن ئەم ئادەمی یەی لێ پێك دێت بەم هەموو کەرەسەو کۆ ئەندام و هێزو وزەو شتە نایابانەوە؟ چۆن تەنها شتەکە بە چاوی ڕووت نابینرێ، ئەبێ بەم ئادەمی یە گەورەو گرنگە؟ بەڕاستی هەرکات بەوردی بیر بکرێتەوە لەو کاتەی کە منداڵ لەدایك ئەبێ، دڵ و سی یەکانی ئەخرێتە ئیش بۆ دەست پێکردن بە ژیان لەم سەر زەوی یەدا، بیر کردنەوە لەو ڕووداوە زۆر گرنگە، هۆش و ژیریی سەرگەردان ئەکات، دڵ و دەروون پڕ ئەکات لە ئیمان بەو دەستی قودرەتەی کە ئەو هەموو مەکینەو جیهازانە ئەخاتە ئیش!! هەروەها بیر کردنەوە لەوەی کە زمانی منداڵ ئەکەوێتە ئیش بەرە بەرە بۆ وتنی ئەم هەموو پیت و وشەو قسەو

باسه، گەڕانی زمان بۆ جێگای ئەو پیت و وشانە بێ سەرپەرشتی خاوەن زمان. بەڵکو بیر کردنەوە لە گفتوگۆ کردن و دەنگی گەرو و حەنجەرە، بێگومان ئێجگار سەرسوڕهێنەرە، ئەگەرچی بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە سام و هەیبەتی نەماوە، بەڵام بیر لێ کردنەوەی بە هۆش و بێداری یەوە نایابی و گرنگی یەکەی تەڕو تازە ئەکاتەوە، وەکو یەکەم جار بیبینین!! ورد بوونەوەو بیر کردنەوە لە هەموو پارچەیەکی ئادەمی هۆی سەرسوڕمانەو پتەوکردنی ئیمان، هیچ پێویست نی یە قوڵ بۆی داچین، تەنها شێوەو دیمەنەکەی و ئەوەی بە چاو ئەبینرێ هێماو دەست نیشان ئەکات بۆ نهێنی و نەبینراوەکانی، هەموو یەکێ لەم تیرەیە بە تەنها عالەمێکی تایبەتی یەو وێنەی هیچ کەسێکی تری نی یە نە لە شێوەو نیشانەکانی داو نە لە ژیریی و بیری داو نە لە گیان و هەستی دا، بەڵکو لەم تیرەدا – کە ئەندامەکانی بە بلیۆنەها ژمارە ئەکرێن – هەموو ئەندامێکی نموونەیەکی تایبەتی یەو سروشتێکی تاکی جیاوازە لە هیچ چین و چەرخێك دا دووبارە نەبووەتەوەو دووبارە نابێتەوە. هەرچۆنێ نەخشی سەرپەنجەی هیچ کەس وێنەی هی کەسی تر نی یە لە هیچ چەرخ و چینێك دا! نایابی و عەجایەبی ئادەمی بە چەندەها کتێبی ئاوەها دوایی نایەت، بەڵکو ئەوەی کە ئێستا دەرکەوتووە ئەگەر بە درێژیی باس بکرێ پێویستی بە چەند بەرگێك هەیە، ئەوەی کە نەزانراوە هێشتا زۆرترە لە زانراوەکەی.

قورئان بە درێژیی باسی نافەرموێ، بەڵکو دڵ بێدار ئەکاتەوەو لە خەوی بێ ئاگایی خەبەری ئەکاتەوە، بۆ ئەوەی تەماشا بکات و ورد ببێتەوە لەم عەنتیکەخانەی کە خوای گەورە دروستی کردووەو خستوویەتە بەرچاوو دڵ، بۆ ئەمەی بەندەکانی ژیان ببەنە سەر لەم جیهانەدا بە فام و هۆش و بیر کردنەوە، تا توێشووی بەرزی بە نرخی خۆیان دەست کەوێت و بە ژیانێکی ئادەمی یانە راببوێرن، نەك بە ژیانی وڵاخ و ئاژەڵی، بێگومان خۆش ترین و بەتام ترین کاتەکانی تەمەن و ژیانی ئادەمی، ئەو کاتانەیە کە بەسەری ئەبات بە یادی خواو بیر کردنەوەو تەماشاکردنی ئەم بوونەوەرە، بە تایبەتی لەناو بوونەوەردا ئەم ئادەمی یە کە نایابترینی هەموانە، بیر کردنەوە لەم پێشانگا گەورەیە کە خوا رازاندویەتەوە، تەماشاکردنی بە چاوی ئیمان و خواپەرستی، ئەم قورئانە بەم تەرزە نایابە ئادەمی سەر لەنوێ فەراهەم هێناو گەیاندوویەتی یە ژیانێکی تازەی کامەرانی، کە وێنەی نەبووەونایشی بێت هەرگیز تا هەرگیز. بەو شێوە بەرزە پڕی دڵ و دەروون و هەستی ئەکات لەتوێشووی زانین وفام وهۆش.لەپاش ئەوەی سەرنجی راکێشابۆ ئەو دوو پێشانگا گرنگانە،

**ئینجا سەرنج رائەكێشێ بۆ پێشانگایەكی غەریبی كە لەوێدا هەموو رزق و رۆزی و چارەو بەش دیاری كراوەو براوەتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ﴾[1] رۆزیتان و بڕیاری بەش و رۆزیتان لە ئاسمان دا، هەروەها هەر جەزاو پاداشتێك كە بەڵێنتان پێ دراوە، ئەویش هەر بەلای ژوورو لە ئاسمان دایە، چونكە بەهەشت بە لای سەرووی ئێمەوەیە، یان بە هۆی ئەوە كردەوەی چاك و پاداشتەكەی لە ئاسمان دا نووسراوەو بڕیار دراوە.**

**ئەمە سەرنج راكێشان و تەمێ دادانێكی زۆر گرنگ و بەجێ یە، چونكە بەهۆی ئەوەوە كە ئاشكرایە و بە چاو ئەبینرێ، ئەو كاتە ئەو چاو بڕین و پشت پێ بەستنەیش نەبێتە هۆی كەم بوونەوەی یادی خوا یان پچڕانی لەخوا بەتەواوی، لەبەر ئەوە ئەوا قورئان چاوو دڵ و دەروونی ئادەمی ئەگێڕێتەوە بۆ لای ئاسمان سەرچاوەی هەموو پیت و فەڕێك. ئەیگێڕێتەوە بۆلای خوا بۆ ئەمەی چاوەڕوانی هەر لە ئەو بكات و پشت هەر بە ئەو ببەستێ، زەوی و هەرچی هۆی ژیان و رۆزی یەكە هەیە لە زەوی دا، بە جۆرێ خەریكیان ببێت كە چاوو دڵی بڕێتە خواو خەڵات و بەخششی خوا، واتە هەموو كات هەست بكات كە ئەم شتانە هەموو خوا فەراهەمی هێناون بۆ سوودو خزمەتی بەندەكانی، هەموو بەڵگەو نیشانەیەكی روون لەسەر گەورەیی و بەزەیی خوا. ئیمانداری راستەقینە ئەم تەمێ یە باش وەرئەگرێ و تێ ئەگات، ئەزانێ مەبەست واز هێنان نی یە لە كاروباری جیهان و هۆی ژیان، چونكە ئەزانێ خوا ئادەمی دروست كردووە بۆ ئەمەی ببێتە جێنشینی لە زەوی داو ئاوەدانی بكاتەوەو هەموو كاروبارێ بگرێتە دەست، هێزو وزەكانی بەكار بێنێ لە خزمەتی خۆی دا، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە دڵ و پشت تەنها نەبەستێ بەم زەوی و جیهانەوە، بەهۆی خەریك بوون بەمانەوە دڵ نەپچڕێ لەخوا، هەموو كات هەست بكات كە هەموو شت ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو بە دەست خوایەو هەموو شت لای ئەو براوەتەوەو دەست نادات بۆ گۆڕان. هەركات ئیماندار بەم جۆرە بوو، ئەو كاتە هەموو هەوڵ و تێكۆشان و خەریك بوونی ئەم جیهانەی ئەبێتە عیبادەت و خواپەرستی، هەموو ئەم جیهانەی ئەبێتە كشتوكاڵ بۆ رۆژی دوایی،**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست هۆی رزق و رۆزی یە، ئەوەیش وەكو تیشكی خۆرو باران و هەموو ئەو شتانەی كە ئەبن بەهۆی پەیدا بوون و فەراهەم هاتنی ئەم هەموو شتە لە زەوی دا.

ڕۆژی هەتا هەتایی و نەبڕاوە، دڵ و دەروونی ئازاد ئەبێت لە بەندایەتی جگە لە خوا، ڕزگار ئەبێ لە بێ ئارامی یە کە دڵ و دەروون داگیر ئەکات کاتی پچڕانی لە خواو یادی خوا.

لەپاش ئەمانە ئینجا خوای گەورە سوێند ئەخوات لەسەر حەق و ڕاستی ئەمانەی کە فەرمووی، ئەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ﴾ سوێند بە خوای ئاسمان و زەوی ئەوەی باس کرا حەق و ڕاستەو جێگای گومان نی یە بە وێنەی قسەو گفتوگۆی خۆتان، واتە هەرچۆنێ خۆتان لە نێوان خۆتان دا قسەو گفتوگۆ ئەکەن و هیچ گومانتان لەوەدا نی یە، هەر بەو وێنە ئەوانەی کە وترا ڕاستەو جێگای گومان و دوو دڵی نی یە. بێگومان بیر کردنەوە لەم سوێندە سام و ترس ئەخاتە ناو ئەو دڵانەی کە زیندوون و پاراون بە یادی خوا، ئێجگار گرنگی سوێند لەسەر خوراوەکە پیشان ئەدات.

لەم بابەتەوە زەمەخشەری لە تەفسیری کەشاف دا ڕووداوێکی گرنگ ئەگێڕێتەوە بە جوانی ئەزانم لێرەدا بیخەمە ڕوو: ئەگێڕێتەوە لە(ئەسمەعی) یەوە کە ئەڵێ: لە مزگەوتی جامیعی بەسرەوە ئەهاتم تووشی پیاوێك بووم بەسەر سواری یەوە پێ ی وتم: لە چ تیرەیەکی؟ وتم لە تیرەی بەنی ئەسمەعم، وتی لە چ شوێنێکەوە هاتووی؟ وتم لە شوێنێکەوە کە قورئانی تێدا ئەخوێنرا، ئینجا وتی: قورئانم بەسەردا بخوێنە، ئەڵێ منیش دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی ﴿الذاريات﴾ تا گەیشتمە ئەم ئایەتە: ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ﴾ وتی بەسە! ئینجا هەڵسا حوشترەکەی سەربڕی و دابەشی کرد بەسەر هەرکەسێ کە ئەهات و ئەڕۆیی، تیرو شمشێرەکەی شکاندو ڕۆیی! ئەسمەعی ئەڵێ: لە پاشان لە خزمەت(هارون الرشيد) دا چووم بۆ حەج کاتی دەستم کرد بە تەواف ئەزانم یەکێ بە دەنگێکی سەبرو نزم بانگم لێ ئەکات، کە لام کردەوە بینیم هەمان پیاوە زەردو لاواز بووە، سەلامی لێ کردم داوای خوێندنی ئەو سورەتەی لێ کردم دووبارە منیش دەستم پێ کرد، تا گەیشتمە هەمان ئایەت هاواری لێ هەڵساو سەیحەیەکی پێکاو وتی: ئەو بەڵێنەی خوامان بینی و لەخۆمان دا بەدی هات، ئینجا وتی: هەمی تر بخوێنە منیش ئەم ئایەتەم خوێند: ﴿فورب السماء و الأرض.. هتد﴾ سەیحەیەکی پێکاو وتی: سبحان الله ئایا ئەوە کێ یە قارو غەزەبی خوای هەڵساند هەتا سوێندی خوارد؟ باوەڕیان پێ نەکرد هەتا ناچاریان کرد بە سوێند خواردن!! سێ جار ئەم قسەی کردو بە دەم ئەو قسەوە گیانی دەرچوو!!

هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ قَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ﴿٢٨﴾ فَأَقۡبَلَتِ ٱمۡرَأَتُهُۥ فِي صَرَّةٖ فَصَكَّتۡ وَجۡهَهَا وَقَالَتۡ عَجُوزٌ عَقِيمٞ ﴿٢٩﴾ قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٠﴾

**ئینجا بە کورتی باسی بەسەرهاتی هەندێ لە پێغەمبەران ئەکات - سەلامی خوایان لێ بێت - کە لە هەر یەکێکیان دا بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەو گرنگ هەیە، وەکو ئەو هەموو دەلیل و نیشانە روونانە کە لە پێش ئێستاوە دەست نیشانی بۆ کردن و هەروەها چەند بەڵێنیان تێدا هەن کە خوای گەورە پێ‌ی دان و بەدی هێنا بە وێنەی ئەو بەڵێنەی کە لە ئایەتی پێشوودا باسی فەرموە، سوێندیشی لەسەر خوارد. لە یەکەم جارە وە دەست پێ ئەکات بە باسی حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام) بە شێوەی پرسیار باسەکەی ئەکاتەو بۆ نرخ و بایەخ پێدان بۆ ئەمەی دڵ و دەروون ئامادە بکات و بیخاتە پەرۆش بۆ گوێ لێ گرتن و وەرگرتنی ئەفەرموێ: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾ ئایا هەواڵی میوانە رێزگیراوەکانی ئیبراهیمت بۆ هاتووەو ئەو دەنگ و باسەت پێگەیشتووە؟ ئەوانە چەند مەلائیکەیەك بوون خوا ناردنی بۆ وێران کردنی دێهات و شارەکانی قەومی لوط پێغەمبەر(علیه السلام) بۆ ئەمەی لە پێشەوە برۆنە لای حەزرەتی ئیبراهیم مژدە بدەن بە خۆی و حەرەمی کە خوا کوڕێکی زانایان ئەداتێ، ئەو مەلائیکەتانە لە دیمەنی ئادەمی و بە شێوەی میوان هاتن، ئەویش رێزی لێ گرتن، لەبەر ئەوە ناویان ئەبا بە میوانێکی رێزگیراو، دیارە لای خوایش هەر رێزگیراون. ﴿إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ﴾ [1] هەواڵی ئەو کاتەی کە ئەو میوانانە هاتنە لای. ﴿فَقَالُواْ سَلَٰمٗا﴾**

---

[1] ئەمە بە گوێرەی ئەوەیە کە ﴿إذ﴾ ظرف بێت بۆ ﴿حدیث﴾، ئەگونجێت ظرف بێت بۆ ﴿ضیف﴾ یان ﴿مکرمین﴾.

ئینجا وتیان سەلامت لێ ئەکەین ﴿قَالَ سَلَٰمٌ﴾[1] ئیبراهیمیش وتی: سەلامتان لێ بێت. ﴿قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ﴾ ئێوە کۆمەڵێکی نەناسراون، واتە ناتان ناسم ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ * فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ قَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ﴾ ئینجا بێ تەفرە بە پەنهانی لە میوانەکانەوە هەڵسا چوو بۆلای خێزانی بۆ ئەمەی خۆراکێکیان بۆ فەراهەم بێنێت، لەپاشان گوێرەکەیەکی قەڵەوی بۆ سەربڕین و بە برژاوی بۆی هێنان و نزیکی خستەوە لێ یان، بەم جۆرە لەبەردەمیان دا داینا – وەکو باوە – وتی پێیان: ئایا ناخۆن؟ واتە بە نەرم و ناسکی پێی وتن: فەرمون، بخۆن.

ئەم کردەوە جوانانەی حەزرەتی ئیبراهیم چەند رەوشت و ئادابێکی شیرینمان پیشان ئەدات دەربارەی میوان و میوانداری، پێویستە بیکەین بە سەرمەشق بۆ خۆمان و بە پێی ئەوە رەفتار بکەین:

١- بە دەمەوە چوونی میوان و رێزگرتنی با نەناسیش بێت، وەڵام دانەوەی سەلام بە چاکترو شیرینتر.

٢- بە زوویی هەواڵ دان بۆ پێك هێنانی خۆراك وەکو وشەی ﴿ف﴾ ئەیگەیەنێ، بە شێوەی پەنهانی خەریك ببێ بۆ ئەمەی میوانەکە بەرگری نەکات و شەرم نەیگرێ.

٣- بەگوێرەی دەسەڵات خۆراکی چاك فەراهەم بهێنرێ و زۆرو فراوان بێت، بۆ ئەمەی میوانەکان شەرم نەکەن و تێر بخۆن بە گوێرەی پێویستی خۆیان.

٤- بە نەرم و ناسکی داوای لێ بکرێ بۆ خواردنی خۆراکەکە وەکو وشەی ﴿ألا تاکلون؟﴾ پیشانی ئەدات[2].

---

[1] بە پێی رێزمانی عەرەبی وەڵامەکەی حەزرەتی ئیبراهیم شیرین تر بووە، چونکە سەلامی ئەوان بە رستەی فیعلی بوو، وەڵامەکەی حەزرەتی ئیبراهیم بە رستەی ئیسمی بوو، کە هەمو کاتێ ئەگەیەنێ بە پێچەوانەی فیعلی یەکە.

[2] چونکە ئەو پرسیارە بۆ عەرز کردنە بە نەرم و ناسکی یەوە، بەڵام ئەگەر ئەم پرسیارە کاتێ بوویێ کە ئەوان نە خواردنیان پیشان دا ئەو کاتە پرسیارەکە بۆ بێزاری دەربڕینە.

حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام) بەو جۆرە خۆراکەکەی رازاندەوەو بردی یە بەردەمیان، ئەوان دەستیان بۆ نەبرد، چونکە مەلائیکە بوون - کە خۆراك ناخۆن - بەلاّم لەو کاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم نەیئەزانی. ﴿فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةً﴾ بەهۆی ئەوەوە لەدڵی خۆی دا مەترسی لیّ کردن کە ئەوانە نیازی خراپیان هەیە بەهۆی ئەوەوە نایانەویّ نەمەکی بکەن، یان مەترسی یەکەی لەم رووەوە بوو کە هەستی شتی تری لیّ کردن، ئەوانیش لەو کاتەدا خۆیان لیّ ئاشکرا کردو دڵنیایان کردو مژدەیان دایە: ﴿قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ﴾ وتیان مەترسە موژدەیشیان دایە بە کوڕێك کە لە پاشەرۆژدا زۆر زانا ئەبێت، ئەو کوڕەیش بریتی بوو لە حەزرەتی ئیسحاق کە لە پاش دا خوا کردی بە پێغەمبەر - سەلامی خوا لەسەر خۆی و باوکی و هەموو پێغەمبەران بێت - سارا خاتوونی خێزانی ئافرەتێك بوو پیر بوو بوو، هەرگیز منداڵی نەبوو، بە پێی ئافرەتی بە شەرم قیژەو سەیحەیەکی پێکاو بە هەردوو دەست شەپۆڵەیەکی دا بە دەم و چاوی خۆی دا وەکو ئەفەرمویّ: ﴿فَأَقۡبَلَتِ ٱمۡرَأَتُهُۥ فِي صَرَّةٖ فَصَكَّتۡ وَجۡهَهَا وَقَالَتۡ عَجُوزٌ عَقِيمٞ﴾ ژنەکەی ئیبراهیم کە لە شوێنی کەناردا بوو کاتیّ ئەو موژدەیەی بیست بە سەیحەوە هاتوو چوو بۆ ناو ماڵەکەی، لە شەرمان بە هەردوو دەستی شەپاڵەیەکی دا بە دەم و چاوی خۆی دا، وتی: من پیرە ژنێکی نەزۆکم ئیتر چۆن منداڵم ئەبیّ؟!! ﴿قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِۖ﴾ مەلائیکەتەکان فەرمویان: هەرچۆنی ئێمە مژدەمان داوە، خوای تۆ بەو جۆرەی فەرموە، واتە ئێمە لە لایەن خواوە ئەو مژدە ئەدەین. ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بێگومان تەنها ئەو هەموو کارو فەرمانی راست و بەجیّ یەو زانایە بە هەموو شتیّ کەواتە هەواڵەکە زۆر بەجیّ یەو جێگای گومان نییە.

و صلی الله و سلم علی محمد و آله و کل عبد مصطفی

﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾

**ئینجا کە دەرکەوت بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ئەوانە مەلائیکەن، هاتنیان بە کۆمەڵ ئەبێ لەبەر فەرمانێکی گرنگ بێت، پرسیاری لێ کردن. ﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ وتی کەواتە ئەو کارە گرنگەی کە بۆی هاتوون چی یە ئەی نێرراوەکان؟ مەلائیکەتەکان وەڵامیان دایەوە: ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ﴾ وتیان: بێگومان ئێمە رەوانە کراوین بۆلای گەلێکی خراپەکاری تاوان کەر – واتە قەومەکەی لوط پێغەمبەر – ﴿لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ﴾ بۆ ئەمەی بیبارێنین بەسەریان دا جۆرە بەردێك لە جۆری (گل متك) کە لە قوڕ پەیدا بووە. ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾ کە ئەو جۆرە لەلایەن جوای تۆوە ئامادە و رەوانە کراوە، یان دیاریی کراوە بۆ ئەو گەلەی کە زیادە رەوی یان کردووە لە ناحەقی و کاری ناڕەوادا.**

**ئەو قەومە – کە زۆر زیادە رەویان کرد – لە تاوان و خراپەکاریدا و بە تەواوی لایان دا لە ئایینی خوا و سروشتی ئادەمی، کاتێ بەو جۆرە مەنی خۆیان پڕ کرد خوای گەورە بەو جۆرە بەربادی کردن و ژێراو ژوور و بەردەبارانی کردن.**

**ئیترئەوبەسەرهاتە بەهۆی بورکان و تەقینەوەیەوە بووبێ کەلەناوسکی زەوییەوە بەرد و گلمتی بەتینی هاویشتبێ بەرزی کردبێتەوەوباراندبێتی بەسەریاندابەهۆی مەلائیکەتەکانەوە یان بە هەر جۆر و شێوەیەکی تر بووبێ؟ یەکسانەو بۆ خوا هیچی تێ ناچێت، هەرکەس بێبەش نەبێ لە فام و تێگەیشتن بیریێ بکاتەوە لەو کەسەی کە ئەم بوونەوەرەی دروست و راگیر کردووە، بەم هەموو هێزو وزەوە کە بەرە بەرە بۆمان دەرئەکەون، لەپێش دەرکەوتنیان هیچ کەس باوەڕی نەبوو پێ یان، هەرکەس بێبەش نەبێ لە ژیریی تۆزێ ئاوا بیریێ بکاتەوە، ئەو کەسە هیچ کاتێ سەرناکاتەوە لەم جۆرە شتانە، با بڵێن بەردی بورکان بووە، یان هەر شتێ تر دوای ئەوە هەمووی هینی خوایە و بە دەستی خوایە.**

**ئەو بەسەرهاتە لێرەدا بە کورتی باسی ئەفەرموێ بە گوێرەی پەیوەندی بە مەبەستی ئەم شوێنەوە ئەفەرموێ: ﴿فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئینجا هەرکەس لە ئیمانداران لەو شارەدا بوون کردنمانە دەرەوە لەبەر پاراستنیان لەو سزاو عەزابەی کە هات بەسەر شارەکە**

﴿فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾

---

**﴿فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ ئینجا لەو شارەدا دەستمان نەکەوت جگە لە خێزان و ماڵێ لە موسڵمانان، ئەوەش لوط بوو لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا بێجگە لە ژنەکەی کە ئەویش ئیمانی پێ نەهێناوبە کافری رۆیی لەناو کۆمەڵی کافرەکاندا، خوا پەنامان بدات آمین. ﴿وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾ ئەوشارەمان بەوجۆرە وێرانکرد،بەڵگەونیشانەیەکی روونمان بەجێ هێشت تیای دا بۆ کەسانێك کە ئەترسن لە سزای سەختی ئێش و ئازار گەیەنەر.**

**ئەو نیشانەش بریتی بوو لەو بەردانە، یان ئەوەیە کە شوێنەکەیان بوو بەو ئاوە رەشە بۆگەنە کە ئێستا پێی ئەڵێن: ﴿البحر الميت﴾. دیارە ئەو لە خواترسانە سوود وەرئەگرن لەو جۆرە نیشانانە، ئەوانەی کە لە خواترس نین و ئامادە نین بۆ ئەمەی ترس و سامی خوا بچێتە دڵیانەوە، ئەوانە چاوی دڵیان کوێرە و سمەسای لێ براوە نیشانە و بەڵگە روونەکانی خوا نابینن نە لە خۆیان دا و نە لە زەویدا و نەلەرووداوەکان و بەسەرهاتەکانی مێژوودا.**

**ئایەتی دووەم لە بەسەرهاتی موسا پێغەمبەردایە (ﷺ) ئەمیش بە کورتی تێ ئەپەڕێنێ و ئەفەرموێ: ﴿وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾[1] لە بەسەرهاتی موسا و رەوانە کردنیا چەند نیشانە و بەڵگەی ئاشکرا هەیە، لەو کاتەدا کە رەوانەمان کرد بۆلای فیرعەون بە موعجیزەی روون و ئاشکراوە. ﴿فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ﴾ ئینجا بەهۆی هێزو دەسەلات و لەشکریەوە پشتی کردە حەق و باوەڕی نەهێنا بە موسا پێغەمبەر بەو هەموو موعجیزە گەورانە کە**

---

[1] ئەگەر وشەی ﴿وفي موسا﴾ عطف بێت بۆ سەر ﴿وفي الأرض﴾ بەو جۆرە ئەوترێ کە لە تەفسیرەکەدایە، ئەگەر عطف بێت بۆ نزیك کە ﴿فيها﴾ بە لە پێشی یەوە ئەو کاتە ئەبێت وشەی ﴿تركنا﴾ بە نەزەر ئەمەوەیە مەعنا ﴿جعلنا﴾ بێت، هەروەها ئەو دوو باسەکەی تریش کە دێت.

پیشانیدا. ﴿وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ﴾[1] وتی: ئەمە یان سیحر بازە ئەمانە پیشان ئەدات، بە جادوو سیحر بازی ئەیکات یان شێتە و لەلایەن جنۆکەوە بۆی فەراهەم دێت. لێرەیشدا وەکو باسی پێشوو، باسەکانی پاشی بە کورتی کۆتایی پێ ئەهێنێ بە باس کردنی پاشەرۆژی سەختیان کەجێگای تەمێ خوارییە. ئەفەرموێ: ﴿فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ﴾ ئینجا ئێمەش غەزەبمان گرت لە خۆی و لەشکرەکەی بەم جۆرە فرێمان دانە ناو دەریاوە و خنکانمان لە کاتێك دا کە فیرعەون جێگای تانە و تەشەر بوو لەسەر ئەو کوفر و سەرکێشیەی کە هەیبوو.

ئینجا دێتە سەر ئایەت و نیشانەی سێ یەم لە بەسەرهاتی تائیفەی عاددا، ئەفەرموێ: ﴿وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ﴾ لە بەسەرهاتی تائیفەی عاددا نیشانەیەکی روون هەیە لەو کاتەدا کە بایەکی بێ خێرو پیتمان رەوانە کردە سەریان کە بەربادی کردن و لە ریشەی هێنان. ناوبراوە بە ﴿عقیم﴾ کە لە بنەڕەت دا بە مانا نەزۆك و بێ بەرە، چونکە ئەو بایە نە ئاو و نە هۆی زیندوو بوونەوەی پێ نەبوو، وەکو ئەو گەلە چاوەڕوانی یان لێ ئەکرد بەڵکو هۆی مردن و بەرباد بوونی پێ بوو، وەکو ئەفەرموێ: ﴿مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ﴾ ئەو بایە لە هەر شتێکی دابێ وازی نەهێناوە هەتا وەکو مردووییەکی رزیوی لێ کردووە لە پارە پارە ئەبێ و دائەڕزێ.

(با) هێزێکە لە هێزەکانی ئەم بوونەوەرە، لەشکرێکە لە لەشکرەکانی خوا رەوانەی ئەکات بە گوێرەی مەیل و خواهیشی خۆی و لەکاتی دیاریی کراوی خۆی دا. لە هەندێ کات دا بۆ باران زیندوو کردنەوەی زەوی و دانەوێڵە، هەندێ جار بۆ بەرباد کردن و وێران کردن، لەم جۆرە شوێن و باسەدا هیچ رێگە و ماوە نی یە بۆ هیچ رەخنەیەکی بێ جێ و نەفامانە کە هەندێ کەس دەمبازی پێ ئەکەن ئەڵێن: با شتێکە بە پێی رژێمی تایبەتی خۆی ئەگەڕێ، لێرەو لەوێ هەڵ ئەکات بەهۆی چەند پاڵ پێوەنەرێکی سروشتی یەوە.

ئەو کەسانەی بێ هۆشانە ئەو قسانەیان بە دەمدا دێت بیری ناکەنەوە لەوە کە ئەو کەسەی بای دروست کردووە، ئەو رژێمی گەڕانەی بۆ فەراهەم هێنا، ئەو کەسە دەسەڵاتی هەیە بە پێی مەیل و ئارەزووی خۆی لە چوارچێوەی ئەو رژێمەی کە بۆی داناوە زاڵی بکات بەسەر هەرکەس و هەر شتێکدا.

---

[1] هەندێ ئەفەرمون مەبەست لە وشەی ﴿رکن﴾ وەکو وشەی ﴿جانبة﴾ وایە لە ئایەتی ﴿أعرض بجانبه﴾ واتە پشتی کردە ئەو ئایینە راستەی کە موسا هێنای بە عیناد و تەکەبورەوە.

وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾

---

**لەپاش باسی نیشانە و بەڵگەی سێ یەم دێتە سەر باسی ئایەتی چوارەم لە بەسەرهاتی تائیفەی سەموددا ئەفەرموێ: ﴿وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ﴾ لە بەسەرهاتی هۆزی سەموددا نیشانەی روون هەیە لەو کاتەدا کە پێ یان وترا: رابوێرن هەتا ماوەیەك، واتە مۆڵەت دران هەتا کات و ماوەیەك، ئیتر ئەو کاتی مۆڵەتە ئەو سێ رۆژەیە پاش سەربڕینی حوشترەکەی سالح پێغەمبەر (ﷺ) وەکو لە سورەتی ﴿هود﴾ دا ئەفەرموێ؟ یان ماوەی ژیانیان بوو لەم جیهانەدا لە پاش رەوانە کردنی سالح پێغەمبەر تا سەربڕینی حوشترەکەی؟ بە هەرکام لەم دووانە ئەگونجی. ﴿فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ * فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ﴾ ئەو تائیفە خۆیان بە گەورە ئەزانی و سەرکەشی یان لە فەرمانی خوای خۆیان کرد بە هۆی ئەوە سزای بەتین داگیری کردن و دای لێ یان، لە کاتێك دا کە ئەیانڕوانی و بەچاوی خۆیان تەماشایان ئەکرد. ئیتر ئەو سزایە ئاگرێك بوو لە ئاسمانەوە هات و دای بەسەریان دا، یان پیا هەڵشاخانێ بوو لەلایەن مەلائیکەوە، بوو بەهۆی بەرباد بوونیان؟ ئینجا ئەوانیش نە توانای ژیان و مانەوەیان هەبوو بە بەرگری و بەرهەڵستی ئەو سزایە، نە لەوانە بوون کە سەرپێچی بکەن و خۆیانی لێ لابدەن.**

**ئینجا بە کورتی و بە چەسپانی بەسەرهاتی گەلی نوح پێغەمبەر ئەخاتە پێش چاو و ئەفەرموێ: ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾[1] گەلی نوحمان بەرباد کرد لە پێش ئەو گەلانەوە بوون کە باس کرا، چونکە بەڕاستی ئەوانە گەلێ بوون لە سنووری بەندەیی خواو گوێڕایەڵی دەرچوو بوون، بە کوفرو گوناه سنوورو قەدەغەی خوایان شکاندبوو.**

---

[1] وشەی ﴿قوم﴾ یان مفعولە بۆ ﴿أهلكنا﴾ ی بڕیار دراو وەکو باسەکانی پێشوو پیشانی ئەدەن، یان بۆ وشەی ﴿انكر﴾ کە بڕیار ئەدرێ لە زۆر شوێن دا، بە گۆڕینی شێوەی ئەم باسە لە باسەکانی پێشوو دیمەنی رێك تر ئەبێ لەگەڵ دیمەنی ئایەتی پاشەوە، چونکە ئەو کاتە هەردوو رستەی فیعلی ئەبن.

وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾

لە پێشەوە دەست نیشانی کرد بە چەند دەلیل و نیشانەیەکی مێژوویی لەم ٥ بەسەرهاتانەدا لەپاش ئەوانە دووبارە ئەگەڕێتەوە بۆ چەند بەڵگە و نیشانەیەکی بوونەوەری تر، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ [1] ئاسمانمان بینا کردووەو دروستمان کردووە بەهێز و توانا، بەڕاستی پان و فراوان کەری ئاسمانین.

ئایا مەبەست بە ئاسمان و شوێنی گەڕان و خولانەوەی ئەو هەموو ئەستێرە و مانگ و رۆژە بێت؟ یان مەبەست ئەو هەموو مەجەڕانە بێت کە هەریەکێ لەوانە ئەڵێن بە سەدەها ملیۆن ئەستێرەی تێدایە؟ یان مەبەست تەبەقێ بێت لەو تەبەق و بۆشایی یانەی بەلای سەروومانەوە کە ئەو هەموو ئەستێرانەی تێدا پرژ و بڵاو بووەتەوە؟ یان هەر مەبەستێ تر بێ؟ بە هەرجۆرێ لەمانە مەبەست بێت هێزو توانای بێ سنووری خوا چاك روون ئەکاتەوە لە دڵ و دەروون دا، ئیمان و باوەڕی بەهێز و جێگیرو دامەزراو ئەکات. هەروەها دڵ فراوانی یەکی باش روون ئەکاتەوە ئەوە ئەبینین ئەو هەموو قەبارە گرنگانە کە بە ملیۆنەها ژمارە ئەکرێن بە رووی ئاسمانەوە لەگەڵ ئەوەدا لە ئاستی ئەو هیچ چاوێکی وەها نادەن بە وێنەی موورو هەڵماتێ نەبێ کە لە دەشتێکی گەورەدا پرژ و بڵاو کرابنەوە.

ئینجا سەرنج رائەکێشێ بۆ ئەم زەوی یەی کە وەکو بێشکەی منداڵ خوا کردوویەتی بەهۆی دامەزراوی و ئارامیمان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ﴾ زەویمان راخستووەو ئامادەمان کردووە، وەکو ژێرەخەر بۆ نیشتەجێ‌ی و ئارام گرتن بەسەریەوە، کەواتە ئێمە چاکترین کەسێن کە شت ئامادە ئەکا، رێك و پێك خەری هەموو شتێکین. بێگومان ئەو هەموو شتەی کە خوا فەراهەمی هێناوە لەم زەوی یەدا، ئەبنە هۆی ژیان بەسەر

---

[1] بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە هەمووی هەر رێکە: ١- دەسەلات و توانادارین. ٢- نێوانی ئاسمان و زەویمان زۆر فراوان کردووە بە لێشاو، بە گوێرەی تەفسیرەکە ئەگونجێ قسەی زانایانی ئەمڕۆ راست بێت کە ئەڵێن بوونەوەر کێشی دێت هەموو کات.

بردن لەم جیهانەدا، بە ئەوپەڕی خۆشی و کامەرانی یەوە، بە سووك و ئاسانی، هەموو یەکێ لەو شتانە جێگای سەرسوڕمانە، بیر لێ کردنەوەیان لەلایەن هەموو خاوەن ژیری یەکەوە هۆی ئیمان و باوەڕی بەهێزە بە خوایەتی خوا.

ئینجا شتێکی نایابمان بۆ دەرئەخات کە خەڵکی لێ ی بێ ئاگا بوو، ئەوەش بریتی یە لە یاسا و بنەڕەتی دروست کراوەکانی خوا لەم زەوی یەدا بەڵکو هەموو بوونەوەر بە تێکڕایی، ئەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ لە هەموو شتێ دوو جۆری جیاوازمان دروست کردووە: نێرو مێ، ئەوەمان کردو بۆمان باس کردن، بەڵکو بیر بکەنەوە تا بزانن کە تەنها خوا تاکەو بێ هاوڕێ و بێ وێنەیە، ئیتر جگە لەو هەموو شتێ دوو جۆرە وێنەدارو هاوڕێی هەیە، کەواتە خوایەتی تەنها شایانی ئەوەو تایبەتی یە بەوەوە[1].

بەڕاستی ئەمەی ئەم ئایەتە دەری ئەخات کە یاسای دروست کردنی هەموو شتێ – نەك گیانلەبەر – لەسەر دوو جۆری و دوو هاوسەرە، بە یەك گرتنیان هەموو شتێ فەراهەم هاتووە، دەرخستنی ئەمەیە، ئێجگار گرنگ و نایابە بەڵێ بۆ تاقمێ گیانلەبەر ئەم یاسایە هەر زانراو بووە لە پێش هاتنی ئەم ئایەتەیش دا، بەلاّم بە تێکڕایی لە هەموو شتێك دا هەرگیز بە دەروونی هیچ کەس دا نەهاتووەو بە پێی ئەم ئایەتە ئەوەی کە زانایانی ئەمڕۆ بڕیاری ئەدەن ئەڵێن هەموو بوونەوەر لە زەڕە پێك هاتووە، زەڕەیش پێك هاتووە لە دوو جۆر لە جەمسەری کارەبایی کە پێی ئەڵێن: سالیب و موجەب (–، +)، بە پێی ئەم ئایەتە ئەو بڕیارە لە راستەوە دەرئەچێ و زۆر جێگای باوەڕە. لەپاش ئەمەی ئەو هەموو شتە نایابەی خستە پێش چاو لە ئاسمان و زەوی و خەڵك و ئەو هەموو دروست کراوانەدا، کە ئەوانە هەموو دڵێکی زیندوو رائەکێشن بۆ لای پەروەردگار.

---

[1] هەندێ لەمەوپێش تەفسیری ئەم ئایەتەمان بەم جۆرە کردەوە: هەموو دروست کراوەکانی خوا دوو جۆرن وەکو ئاسمان و زەوی، شەو و رۆژ، مانگ و خۆر، وشکایی و دەریایی، تاریکی و رووناکی، ئیمان و کوفر، مردن و ژیان، ئاوو ئاگر، بەهەشت و دۆزەخ.. هتد، بەلاّم بەوجۆرە لەگەڵ دیمەنی ئایەتەکەدا رێك نی یە، چونکە ئایەتەکە وا پیشان ئەدات کە هەموو شتێ بە دوو جۆر دروس کراوە، دەی هەموو یەکێ لەوانە یەك جۆرە بەو جۆرە تەفسیرە، هەندێ تر تایبەتی یان کردووە بە گیانلەبەرانەوە، واتە لە هەموو شتێك لە گیانلەبەران دووجۆرمان دروست کردووە، نێرو مێ.

﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ (٥٠) وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ (٥١) كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ (٥٢) أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ (٥٣) فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ (٥٤) وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٥٥)﴾

پاش ئەمانە و لەم کاتە دا بانگ ئەکاتە هەمووان یەکسەر فریای خۆیان کەون هەموو بە جاریٚ رابکەن بۆلای خواو هەموو خۆیان رزگار بکەن لە دەست ئەوانەی جگە لە خوای گەورە کە سەرو دلی داگیر کردوون و ئارامی لا هەلگرتوون، ئەفەرمویٚ: ﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ *وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾ ئەی پێغەمبەر بلیٚ بە بەندەکانم: کەواتە هەمووتان رابکەن بۆلای خوا بە ئیمان هێنان و پەرستنی بە تاك و تەنیا و نووساندن بە گوێڕایەلی یەوە بۆی، من ئاوا هاوارتان لیٚ ئەکەم، چونکە بە راستی من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام واتە لە لایەن خواوە رەوانە کراوم ئەتان ترسێنم لە سزای خواو ئەو شتانەی کە هۆی سزاو تۆلەی خوان، ئەو سزایەی کە ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی کە سەری بەندەیی بۆ خوا شۆڕ ناکەن، ئەو شتانەی کە پێویستە خۆپاراستن لیٚ یان بە روونی بۆتان باس ئەکەم.

ئینجا لێرەدا فرمان ئەدات کە باسی گەورەترین تاوان بکات بە تایبەتی کە پێویستە خۆپاراستن لیٚ ی ئەفەرمویٚ: لەگەلٚ خوادا هیچ خوایەکی تر بڕیار مەدەن، باوەڕتان بە هیچ پەرستراوێکی تر نەبیٚ، واتە تەنها خوا بپەرستن، بە بیٚ هاوبەش و بیٚ هاوسەر بێگومان من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، لەلایەن خواوە هاتووم ئەتان ترسێنم لە خواو لە سزای سەختی خوا. ئەم رستەیەی دووبارە کردەوە لەم دوو ئایەتە کورتەدا کەوان پێکەوە، بۆ زیادە بیر خستنەوەو نەهێشتنی بەهانەی خەلکی، چونکە هەرکەس کەهۆش و فامی هەبیٚ و ترسێنرا لە شتیٚ، ئیتر لە پاش دا هیچ بەهانەی بە دەستەوە نامێنیٚ.

ئینجا دلخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) ئەداتەوە لەسەر بیٚ باوەڕیی و ئەو قسە ناڕەوایانەی ئەو بیٚ باوەڕانە ئەیان کرد و ئەیانگوت دەربارەی: دەمیٚ ئەیانگوت سیحر بازە، دەمیٚ ئەیانگوت

شێته و ئەم قورئانه جنۆکه پێی ئەڵێ، ئەفەرمویْ: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾ هەرچۆنیْ ئەم بیْ باوەڕانە بە تۆ ئەڵێن، هەروەها بە وێنە هیچ پێغەمبەریْ تریش پێش تۆ نەهاتووە بۆ گەلەکانی پێش ئەمان مەگەر هەموو یەکیْ لەوانە دەربارەی پێغەمبەرەکەیان وتویانە ئەمە سیحربازە یان شێتە. واتە تۆ بە تەنیا نیت ئەو هەموو پێغەمبەرانە پێش تۆ هەموو وەکو تۆیان دەربارە کراوەو ئەوانیش سەبریان کرد تا خوا سەری خستن و پاشەڕۆژی سەختی دا بە دوژمنەکانیان، کەواتە تۆیش وەکو ئەوان سەبر بکە و راوەستە بە بەر کاری خواوە. کەواتە هەموو تاقمەکانی کۆمەڵی بیْ باوەڕان یەك سروشتیان هەبووە و بە یەك جۆر دواون دەربارەی پێغەمبەرەکان – سەلامی خوایان لەسەر بێت – ﴿أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦ﴾ ئایا ئەوانە لە نێوان خۆیان دا وەسێتیان کردووە بۆ یەکتر بەوە کە هەموو بە یەکجار بەو جۆرە بن؟ نەخێر شتیْ وا نەبووە، چونکە کات و چەرخی یان جیاواز بووە و چاویان بە یەك نەکەوتووە. ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾ بەڵکو هەموو گەل و کۆمەڵێکی یاخی و سەرکێش بوون و هەموو وەك یەك لە حەق و رێگای راست لایان دابوو. واتە ئەوانە – هەرچەند کات و چەرخی یان دوورو جیاواز بووە، بەڵام هاوبەشییان لە تاوان و سەرکێشیدا کۆی کردوونەتەوەو یەك بارو یەك قسەی فێر کردوون – چونکە هەموو یەك سروشت بوون.

خوای گەورە بەوجۆرە دڵنەوایی پێغەمبەری خۆشەویستی کرد (ﷺ) ئینجا فەرمانی پیْ ئەدات کە گویْی نەبیْ لە بیْ باوەڕیی و ئیمان نەهێنانیان، بەردەوام بێت لەسەر تەمیْ و ئامۆژگاری خۆی، ئەفەرمویْ: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ * وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ پاش ئەوەی تۆ چەند جار تەمیْی ئەو بیْ باوەڕانەت کرد و بانگت کردن بۆ رێگای خوا، ئەوان هەر بە قسەیان نەکردیت، ئیتر تۆیش گویْ یان پیْ مەدەو پشتیان تیْ بکە، چونکە ئەو کاتە تۆ لۆمە لیْ کراوو تانە لیْ دراو نیت لەسەر ئیمان و باوەڕ نەهێنانی ئەوانە، تۆ هەر بەردەوام بە لەسەر تەمیْ و مۆچیاری خۆت چونکە بێگومان تەمیْ و مۆچیاری سوود ئەگەیەنیْ بە باوەڕداران. واتە ئەوانەی خوا بڕیاری ئیمانی دابن، هەروەها ئەوانیش ئیمانیان هێناوە، چونکە بەوە زیاتر تیْ ئەگەن و دامەزراو تر ئەبن لەسەر رێگای راست.

وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾

---

**ئینجا لێرەدا مەبەست بە راکردن بۆلای خوا روون ئەکاتەوە، ئەو فرمانەی کە ئادەمی دروست کراوە بۆ جێ بەجێ هێنانی ئاشکرای ئەکات، ئەفەرموێ:** ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ[1] * مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ * إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾ **من جنۆکە و ئادەمیم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە بم پەرستن، من مەبەستم نی یە و داوای هیچ رزق و رۆزی یەك لەوان ناکەم، نامەوێ کە خۆراکم بدەن، واتە من لەگەڵ بەندەکانم دا وێنەی ئاغاو خاوەن بەندەکانی تر نیم کە بەکاریان ئەهێنن لە پێك هێنان و فەراهەم هێنانی رۆزی و ماڵ و سامان و پێویستی خۆیان دا. بێگومان تەنها خوا رۆزی دەر و خاوەنی هێزو بەتینە.**

**ئەم فەرمودە کورتە شتێکی ئێجگار گرنگ و بە نرخ پیشان ئەدات کە ژیانی ئادەمی لەسەر زەوی دا هەرگیز بە رێکی ناڕواو بە خۆشی بەسەر نابرێ بێ باوەڕ بەو شتە گرنگەو بێ بەدی هێنانی لە ژیاندا.**

**ئەو شتەیش بریتی یە لە پەرستنی خوا بە تەنها و بەندەیی و گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی لە هەموو کاروباری ژیان دا، نەك تەنها بۆ نوێژو رۆژوو شتەکانی تر کە پێ یان ئەوترێ**

---

[1] دیمەنی ئەم ئایەتە یەك ناکەوێ لەگەڵ دیمەنی ئایەتی ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ﴾ بۆ یەك خستنیان زانایان چەند شتێکیان فەرمووە، لە نێوان ئەوانەدا دووانیان باس ئەکەین کەزیاترەوی ئارامی دڵن: ١- خوای گەورە جن و ئادەمی بە جۆرێ دروست کردووە کە هەر شایانی خواپەرستی بێ، فام و هەست و ژیریی پێداون، بەڵگە و نیشانەی زۆر و زەبەندەی بۆ دانـاون و پیشان داون، پێغەمبەرانی بە موعجیزە بۆ ناردوون، کەواتە وەکو هەر بۆ خواپەرستی دروست کراین وان، سروشتیان هەر بۆ ئەوە ئەگونجێ، لەبەر ئەوە بە شێوەی موبالەغە پەرستنی خوا کراوە بە مەبەست لە دروست کردنیان لێرەدا، لەبەر ئەوە خوا زانیویەتی کە زۆر لەوانە لە سروشتی پاك و خاوێنی خۆیان لائەدەن و رێگای کوفر ئەدەنە بەر، کەواتە وەکو هەر بۆ ئاگر دروست کراین وانە لەبەر ئەوە لە ئایەتی ﴿الأعراف﴾ دا سووتاندن بە ئاگر کراوە بە مەبەست لە دروست کردنیان.

٢- پیتی ﴿ل﴾ لە ئایەتی ﴿الأعراف﴾ دا پێی ئەوترێ لامی عاقیبەت، واتە بۆ گەیاندنی مەبەست و ئامانج نی یە، بەڵکو بۆ روون کردنەوەی عاقیبەت و پاشەڕۆژی ئەوانەیە بە وێنەی ئایەتی ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾. زانین لای خوایە.

﴿الشعائر التعبدية﴾ واتە نیشانە و دروشمەکانی خواپەرستی، چونکە تەنها بەجیٚ هیٚنانی ئەمانە نرخیٚکی ئەوتۆیان نی یە و کاروباری جیهان و ژیانیان پیٚ بەسەر نابریٚ، جیٚنشینی ئادەمی لەم زەوی یەدا تەنها بەوانە پیٚك نایەت، هەرگیز بەرگری جەورو ستەمکاری و نارەوایی لەسەر زەوی دا ناکریٚ و ئارام و ئاشتی رووناداتت بە گویٚرایەڵی نەبیٚ بۆ هەموو فەرمانەکانی خوا لە هەموو بارو روویەکەوە. بیٚجگە لەمانەش گویٚرایەڵی خوا تەنها لە نویٚژو رۆژوو شەعائیرەکانی تردا و ئیتر سەرپیٚچی و جوڵانەوە بە پیٚچەوانەی فەرمانەکانی تری خوا هەرگیز نابیٚ بە خواپەرستی دابنریٚ، ئەوە لای خوا، خواپەرستی نی یە، کەواتە ئاشکرایە ئەو عیبادەت و خواپەرستی یەی کە کراوە بە مەبەست لە دروست کردنی جن و ئادەمی بریتی یە لە گویٚرایەڵی و پەرستنی لە هەموو بارو روویەکەوە. شیٚوەی راستەقینەی عیبادەت و پەرستنی خوا لە دوو شت دا دەرئەکەویٚ:

١- هەست کردنی دڵ و دامەزراندنی لەسەر ئەمە کە تەنها خوایە هەیە جگە لەم خوایەی کە شایانی پەرستنە خوای تر نییە، هەموو بەندەکانی ئەبیٚ تەنها ئەو بپەرستن و گویٚرایەڵی فەرمانەکانی ئەو بن، ئیتر جگە لەوە هیچ بارو ریٚگایەکی تر نییە.

٢- روو کردنی دڵ بۆلای ئەو تەنها خوایە لە هەموو جوڵانەوەو کردەوەیەك لەم جیهانەدا روو کردن بە پاك و خاویٚنی و خۆداڕنین لە هەموو هەستیٚکی تر.

بەم دوو شتە پیٚك دیٚت مبەستی راستەقینە لە وشەی عیبادەت، پەرستنی راستەقینە تەنها ئەوەیە، لەو کاتەدا هەموو شتیٚ بەندە بە تیٚکرایی عیبادەت و پەرستنی خوایە، تەنانەت خەوو خواردنەکەشی، ئەو کاتە لە هەموو کافرو فرمانیٚك دا یەکەم مەبەستی فەرمانبەریٚتی و گویٚرایەڵی خوایە، لەو کاتەدا بە راستی لە هەموو شت فیرار ئەکات بۆلای خوا، لەو کاتەدا ئازادی و سەربەستی راستەقینە وەرئەگریٚ. ئەو کاتە دڵ و دەروونی ئەو بەندە خواپەرستە پڕە لە ئارام و ئاسایش و رەحەتی لە هەموو کردەوەو بەسەرهاتیٚك دا، ئیتر ئایا بگات بە بەرهەمی کردەوەکانی یان نە ؟ چونکە مەبەستی گرنگی ئەو بەندەیە تەنها پیٚك هیٚنانی رەزامەندی خوایە، کەواتە خوا هەرچۆنی کردو هەرچۆنی هیٚنایە پیٚشەوە ئەم رازی یە و هەر ئەو بارە بە چاك ئەزانیٚ. بە راستی ئەمە پلەو پایەیەکی ئیٚجگار بەرز و بڵندە و هیچ کەس پیٚی ناگات جگە لەوانەی کە بە ریٚکی بژین لە سایەتی سیٚبەری قورئان دا، وەکو یەکەم تاقم کە ئەم قورئانەیان وەرگرت لە پیٚغەمبەرەوە (ﷺ) وعلیهم اجمعین.

فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

**ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بەم ترساندنە سامناکە دەربارەی ئەو بێ باوەڕانەی کە ئیمانیان نەهێناو پەلەیان ئەکرد بە هاتنی ئەو سزایەی کە هەڕەشەیان لێ ئەکرا پێی: ئەفـــــەرموێ:** ﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ * فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴾ **بەڕاستی بەشێ لە سزا هەیە بۆ ئەوانەی کە زوڵمیان کرد لە پێغەمبەر بە بێ باوەڕیی، بە وێنەی بەشە سزای هاوڕێکانیان لە گەلە پێشووەکان، کەواتە با پەلەم لێ نەکەن. واتە با پەلە پەلم لێ نەنێنەوە بە هێنانی ئەو بەشە سزای خۆیان کە چەند جار بە لاقرتی یەوە ئەڵێن: کوا؟ بۆچی نەهات؟ ئایا کەی روو ئەدات ئەگەر ئێوە راست ئەکەن؟ کەواتە وەیل بۆ کەسانێك کە کافرن و ئیمانیان نەهێنا لەم جیهانەدا و وەیل بۆیان لەبەر ئەو رۆژە سەختەیان کە هەڕەشەیان لێ ئەکرێ پێی. خوا پەنامان بدات لە قارو خەشمی خۆی ئامین.**

**صلى الله و سلم على سيدنا محمد وعلى آله و صحبه أجمعين**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلطُّورِ (١) وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ (٢) فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ (٣) وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ (٤) وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ (٥) وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ (٦) إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ (٧) مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ (٨)

## سورەتی (الطور)
## مەككەیی یەو ٤٩ ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە پەلامارو هێرشێكی بەتینی بەهێز ئەكاتە سەر دڵ و دەروون بۆ فڕاندن و تاونانی هەموو خەتەرەو خەیاڵی ناڕەوا، هەموو شك و گومان و دوو دڵی یە كە ئەكشێن و خۆیان جێگیر ئەكەن لە كون و قوژبنی دەروون دا و خاوەنەكەی بێ ئارام ئەكەن و بەرگری ئەكەن لەوەی كە بە ئارامەوە دامەزرێ لەسەر باوەڕی راست و رێگای راست.

ئایەتەكانی لە یەكەم جارەوە تا دوایی سورەتەكە بە وشە و وتارو مەعناو مەبەست و شێوەیەك دێت ماوە نادات بۆ هیچ لادان و ملەجەڕێ یەك، ئەم سورەتە دەست پێ ئەكات بە سوێند خواردن بەچەند شتێكی پاك و بەنرخ لە زەوی و ئاسمان دا، هەندێكیان دیاریی و زانراون، هەندێ تریان نادیارو نەزانراون. سوێند ئەخوات بەوانە لەسەر شتێكی گەورەی سامناك كە دڵ و هەست ئەهێنێتە ترس و لەرزە، ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ وَٱلطُّورِ * وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ * فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ * وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ * وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ * وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ [1] * إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ * مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ﴾ سوێند بە كێوی طورو بە كتێبێكی گەورە كە بە رێكی نووسراوەتەوە لە تیا نوسراوێكی گرنگ دا كە مۆر كراوە بە ئاشكرا ئەخوێنرێتەوە، سوێند بەو ماڵەی كە ئاوەدان كراوەتەوە بە پەرستنی خواو سوێند بەو بانەی كە بەرزكراوەتەوە، واتە ئاسمان،

---

[1] ﴿كتاب مسطور﴾ بەچەندشتێك تەفسیر كراوەتەوە: تەورات، قورئان، هەموو كتێبەكانی خوا، لوح المحفوظ، هەروەها ﴿بيت المعمور﴾ یش بە كەعبەو بەو شوێنەی كە جێگای خواپەرستی تایبەتی یە لە ئاسمان و پێی ئەوترێ ﴿ضراح﴾.

سوێند بەو دەریایەی کە پڕ کراوە، یان هەڵ ئەگیرسێنرێ لە ڕۆژی دوایی دا، سوێند بەمانە هەموو بە ڕاستی سزای خوای تۆ دێتە جێ و بەدی دێت دەربارەی ئەوانەی شایانی سزابن، هیچ بەرگری کەرێك نی یە بۆ ئەو عەزابە. بێگومان ئەم سوێندو سوێند لەسەر خوراوە ئێجگار گەورەو سامناکن، کار ئەکەن لە هەموو دڵێکی زیندوو، لە بابەت کارکردنیانەوە، ڕوواوێکی گرنگ هەیە شایانی باس و گێڕانەوەیە.

حافظ ابوبکر کە بەناوبانگە بە (ابن ابی الدنیا) لە باوکی یەوە ئەویش لە موسای کوڕی داودەوە، ئەویش لە صالحی مەری یەوە، ئەویش لە جعفری کوڕی زەیدەوە ئەفەرموێ: شەوێ لە شەوان حەزرەتی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - ئەگەڕا بە مەدینەدا - رابورد بەلای ماڵێك دا یەکێ لە موسڵمانان لەو کاتە خەریکی شەو نوێژ بوو، ئەویش وەستا و گوێی گرت لە قورئان خوێندنی لەو نوێژەدا موسڵمانەکە دەستی کرد بە خوێندنی ئەم سورەتە هەتا گەیشتە ئەم ئایەتە، ئینجا حەزرەتی عومەر فەرموی: سوێند بەخوای کەعبە سوێندێکی ڕاستە و ئینجا لە سواری وڵاخەکەی دابەزی و پاڵی دا بە دیوارێکەوە لەوێدا مایەوە لەپاش دا گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی لە سام حەیبەت دا مانگێ لەماڵەوە کەوت خەڵکی ئەهاتن بۆلای بۆ سەر لێدان و عیادەت کردنی و هەواڵ پرسینی و نەیان ئەزانی نەخۆشی یەکەی چی یە؟ خوای لێ ڕازی بێت. بێگومان عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - چەند جارێ تریش بێئەوجارە ئەم سورەتەی بیستووەو خوێندوویەتی، چەند جارێ لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستووە، لە نوێژدا چونکە لە نوێژی مەغریب دا ئەم سورەتەی ئەخوێند. بەڵام هیچ جارێك وەك ئەم جارە نەبوو. ئینجا خوا وای ڕێکخست دڵ و هەستی لەو کاتەدا ئاگادارتر و کراوەتر بوو بە هۆی ئەوەوە چووە ناو دڵی یەوەو جێگیر بوو تیای دا، بە شێوە قورئانی یە ڕاستەقینەکەی خۆی، نزیك لەو وێنەی کە هەموو جارێ دڵە گەورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) وەری ئەگرت لە سەرچاوەی گەورەوە، لەبەر ئەوە ئەو جارە کاری کرد لە دڵە پڕ لە ئیمانەکەی جێنشینەکەیشی.

يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴿١٠﴾ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾

---

**ئینجا شێوەیەکی زۆر سامناک باس ئەکات کە ڕووئەدات لە سەرەتای هاتنی سزای ئەو ڕۆژە سەختەوە ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا * وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا﴾ ئەو سزایە ڕوو ئەدات لە ڕۆژێك دا کە ئاسمان پارچە پارچە ئەبێت و ئەکەوێتە جوڵەو هاتوچۆ ئەکات و بەیەك دا دێت، کێو و چیاکان ئەبن بە تۆز وەکو هەڵم و تەم ئەکەونە لای سەرووی زەوی و بە ڕووی زەویدا ئەڕۆن.**

**با هەندێ بیر بکەینەوە لە سەختی و سامناکی ئەو ڕۆژە، ئەم هەموو مانگ و ڕۆژو ئەستێرە گەورە گەورانە بەو هەموو بە هێزو بەتینی یەوە ئەو جۆرەی بە سەردا بێت، ئەو هەموو کێوە سەختە بەرزە دامەزراوانە ببن بە تۆزو وەکو هەورو تەم بکشێن بە ڕووی زەوی دا، پەنا بەخوا ئەبێ ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێ بێت؟ ئایا ئەبێ ئەم ئادەمی یە بچووکە لەڕە لاوازە چۆن بێ، لەگەڵ ئەو ڕووداوە ناهەموارەدا. لەم کاتەدا کە ئەم هەموو ترس و لەرزە ئەخاتە دڵ و دەروون، لەم کاتەدا سامناك تر ئاراستەی بێ بڕواکان ئەکات نزای شەڕیان لێ ئەکات کە ئەوەلەلایەن خواوە بڕیارێکی بەرگری وچارنەکراوە، ئەفەرموێ: ﴿فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ کەواتە سزای سەخت وبەهیلاکداچوون بۆبێ بارەڕەکان. ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ﴾ ئەوانەی لەم جیهانەدارۆچوونەتەخوارەوەلەشتی بەتاڵی ناڕاست و گاڵتە ئەکەن و خەریکی شتی بێهودەن.**

**ئەم سیفەتە سەروبەرو ڕێك و پێك بوو لەگەڵ ئەو کۆمەڵە بت پەرستە بیرو باوەڕە پڕوپووچە کە یەکەم جار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێدا. ژیانی ئەو گەلە کە بنەڕەتی لەسەر**

ئەو بیرو باوەڕە ناڕەواو ئەو تێگەیشتنە ناڕاستە بوو کە قورئان لە زۆر جێگادا لەناو بەناو بۆمان باس ئەفەرموێ. ژیانی ئەو کۆمەڵە سەر لێ تێك چووە، بێگومان هەمووی گاڵتەو شتی بێ سوود و بێ نرخ و بێ مەبەست و ئامانجێکی بەرێز. بەڵام وە نەبێ هەر ئەو کۆمەڵە وابن، بەڵکو هەرکەس و هەر کۆمەڵ و هەر گەلێ بە تێگەیشتن و بیرو باوەڕێ تر بژی جگە لەوەی ئیسلام هێنای و نەخشەی کێشا بۆ هەموو ئادەمی، ئەوانیش هەموو ژیانیان گاڵتەیە و بێ نرخە، هەموو هەوڵ و تێکۆشانیان رۆچوونە خوارەوەیە لە شتی بەتاڵ دا کە سەری لە هیچ بۆشی یەوە دەرئەچێ، ئەمە شتێکی راستە و کاتێ بە جوانی روون ئەبێتەوە کە هەموو بیرو باوەڕو فەلسەفەکانی تر بهێنرێ و بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەوەی کە ئیسلام فێرمان ئەکات و پیشانمان ئەدات دەربارەی بوونەوەرو ژیان و ئادەمی، فرمان و پەیوەندی ئادەمی لەم بوونەوەرەدا، ئادەمی لە کوێوە هاتووە؟ بۆچی هاتووە؟ بۆ کوێ ئەچێ؟ هەروەها هەموو هەوڵ وتێکۆشان وخەریك بوونی لەم جیهانەدا کە کراوە و ئەکرێ لەسەر بنەڕەتی هەموو بیرو باوەڕوفەلسەفەکانیتر، ئەوانە هەموو وەکو گاڵتەو گەپی منداڵان وایە لە چاو خەریك بوون و هەوڵێ کەلەسەربنەڕەتی تێگەیشتن و بیرو باوەڕی ئیسلام بکرێ و لەبەر رووناکی ئەو بکرێ.

هەموو خاوەن ژیریی یەك بێ لایەنگیری ئەو بەراوردە بکات دڵنیا ئەبێ کە شتەکە ئاوایە، ئەوەی کە باوەڕی بەم شتە راستە بێگەردە نی یە، ئەو کەسە نەشارەزایە، یان نایەوێ دان بنێ بە حەق داو ملی بۆ شۆڕ بکات، یان ژیریی ناتەواوە، کەواتە بە هەر جۆر بگیرێ سوچ لەو کەسەوەیە و ئیتر چی لێ بکرێ؟

ئینجا شێوەیەکی زۆر ناهەموار پیشان ئەدات لە شێوەکانی سزای دوا رۆژی ئەو بێ باوەڕانەی کە لەم جیهانەدا سەریان کردۆتە شتی بێ نرخ و بە کارو فرمانی بێ هودەوە خەریکن، ئەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا * هَٰذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾[1] لە رۆژێك

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: ﴿يوم﴾ ە بەدەلە لە ﴿يوم﴾ ەی پێشوو، بەم جۆرەیش هەر رێکەو یەك مەبەستە.

دا پاڵ ئەنرێ بەوانەو ئەدرێنە بەر بۆلای ئاگری دۆزەخ بە پاڵ پێوەنانێکی زۆر بەتین، لەو رۆژەدا پێ یان ئەوترێ: ئا ئەمە ئاگرێکی وایە کە ئێوە لە دنیادا باوەڕتان پـێ‌ی نەبوو، بە درۆتان ئەزانی.

ئەو پاڵ پێوەنانە بەو شێوە سەخت و ناشیرینە زۆر رێك و شایانە لەگەڵ ئەوانەی کە سەریان کردۆتە گوناهو تاوان، خەریکن بە شتی بێ کەڵکەوە، ئەوانە – خوا پەنامان بدات – بەو جۆرە ئەدرێنە بەر بەرەو ئاگری دۆزەخ تا ئەیانگەیەننە قەراغی، لەو کاتەدا بۆ سزادانی دەروون کردەوەی ناڕەوای خۆیان ئەدرێتەوە بە ناوچاویان دا بەو جۆرەیان پـێ ئەوترێ کە باس کرا وەکو رەزیل ئەکرێن تەشەریشیان لێ ئەدرێ بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ﴾[1] ئایا سیحرو جادووە ئەم سزایە؟ ئایا ئێوە نابینن؟ ئەوانە لە دنیادا ئەیانوت: قورئان جادووە دەی ئایا ئەم ئاگر و سزای ئاگرەیش کە قورئان هەواڵی پێداون و ترساندنی پـێ‌ی ئەمیش جادوو سیحرە؟ هەروەها ئەوانە چاویان بـڕی نەئەکردو ئەو رووناکی و راستی یەی قورئانەیان نەئەبینی، دەی ئایا ئەم ئاگرەیش هەر نابینن؟!

پاش ئەو تەشەرو لاقرتی پـێ کردنە ئینجا تیری نائومێدی ئەدرێ لە بەنۆکەی دڵیان، خوا پەنامان بدات، پێ یان ئەوترێ: ﴿ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ﴾ بچنە ناوی یەوە، ئینجا دان بگرن بە خۆتان دا، هاوارو گریە و زاری ئەکەن، یان بێ ئارامی و گریان و هاوار بکەن، هەردوو بارەکە یەکسانە بۆتان و هیچ سوودی نی یە بۆتان، چونکە: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ تۆڵەتان لێ ناسێنرێ جگە لە تۆڵەی کردەوەیەك کە کردووتانە لە دنیادا. واتە: هۆی ئەم سزاو عەزابە بەتینە، تازە رووی داوەو دەست نادات بۆ گۆڕان، یان بۆ سەرەوە گرتن، کەواتە هیچ شتێ سوودی نی یە و بەرگری ناکات.

---

[1] تەفسیرەکە بە گوێرەی ئەوەیە کە ﴿أم﴾ مونقەتیعە بێت، هەڵئەگرێ موتەسیلە بێت، ئەو کاتە ئەڵێن، ئایا ئێوە چاوتان بەرگری کراوەو نابینن وەکو خۆتان لە دنیادا ئەتان وت: ﴿إنما سكرت أبصارنا﴾.

إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾

---

ئینجا بە گوێرەی باوی قورئان کە هەڕەشە و مژدەو ترساندن و دڵخۆشی کردن ئەمێنێ بەدوای یەك دا لەپاش باسی هەندێ لە سزای پیاو خراپ و ناپاکەکان ئەوا هەندێ لە نازو ڕێزی چاکان و پاکان باس ئەفەرموێ بەم چەند ئایەتە: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ * فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾[1] بەڕاستی لەخوا ترسە پارێزەرەکان وان لە بەهەشت و ناز و نیعمەتدا، بە جۆرێ خۆشی و لەزەت رائەبوێرن بە هەموو پاداشت و بەخششێ کە خوای خۆیان پێی داون، لە کاتێکدا کە خوای خۆیان پاراستوونی لە سزای ئاگری دۆزەخ، کە ئەو پاراستنە خۆی بە تەنیا زیادە چاکە و میهرەبانی یەکە بێجگە لەو هەموو ناز و ڕێزە کەس نەدیوەشی کە لەگەڵی دایە. سەرباقی ئەو هەموو چاکەو خۆشی یە پێ یان ئەوترێ: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بخۆن و بخۆنەوە بە خواردن و خواردنەوەیەك کە نۆشتان بێت بێ هیچ ناخۆشی یەك بەهۆی کردەوەیەك کە لە دنیادا کردووتانە.

ئای لەم خۆشی و شادمانییە!!! ئەم هەموو نازو نیعمەتە ئەڕژێنرێ بە سەریان بە بێ دوایی هاتن و بڕانەوە، هێشتا لەسەر ئەوەش دا پێ یان ئەوترێ کە ئەوە ماڤی خۆتانە و شایانی خۆتانە ئەم نازو نیعمەتە.

ئەو خوا پێداوانە لە بابەت خواردن و خواردنەوەوە بەو جۆرەن، لە بابەت شوێن و جێگای دانیشتنەوە لەگەڵ دۆست و خۆشەویستان دا بەم جۆرەن: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ﴾

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ﴿ما﴾ موصولە بێت و ڕستەی ﴿ووقاهم﴾ حاڵ بێت لە فاعیلی ﴿أتا﴾ یان مفعولی هەردوکیان بێت، ڕستەی ناوبراو عکفە لەسەر ﴿أتاهم﴾ یان بۆ سەر ﴿في جنات و نعيم﴾ بەو جۆرانەش هەر رێکە و تەفسیر کراوەتەوە. زانین لەلای خوایە.

وان لەناو ئەو بەھەشتانەدا بە شێوەیەك پاڵیان داوەتەوە تیایان دا بەسەر كورسی و تەختی رازاوەی ریزدراو بەرێكی. ئینجا شتی زۆر گرنگ حەڵاڵ و هاوسەری چاكە ئەوا ئەویش باس ئەفەرموێ: ﴿وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾ ئافرەتی جوانی چاو رەشی چاو قەوی ئەكەین بە حەڵاڵ و هاوسەریان. میهرەبانی خوا هەر بەوەوە ناوەستێ، بەڵكو بۆ زیادە رێزو دڵنەوایی ئەو لە خواترسانە، رادەو پلەی هەموو رۆڵە و نەوە ئیماندارەكانیان بەرز ئەكاتەوە تا بگەن پێ یان بۆ ئەمەی هەموو پێكەوە بژین و شاد ببن بە هاورێ یەتی یەكتر، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ كەسانێك كە ئیمانیان هێناوە و رۆڵە و نەوەكانیان شوێنیان كەوتوون لە ئیمان و باوەڕدا ئەو رۆڵە و نەوەیانەیان ئەگەیەنین پێ یان و ئەیكەین و ئەیانكەین بە هاورێ و دراوسێ یان لە بەھەشتدا، هیچ شتێ كەم ناكەینەوە لە كردەوە چاكەكانی باوك و دایكە ئیماندارەكان. واتە بۆ ئەم هاورێ یی و گەیاندن بەیەك رادەو پلەی ئەوان نزم ناكەینەوە، بەڵكو رۆڵە و نەوەكان بەرز ئەكەینەوە بۆلای ئەوان.

﴿كُلُّ ٱمْرِيٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾[1] هەموو كەسانێك بەستراوەو بەند كراوە بە كردەوەی خۆیەوە، لە لوتف و بەزەیی یەكەی بە زیاد بێت لەم بارەوە ئەو زیادە چاكە و میهرەبانی یە ئەكات لەگەڵ بەندەكانی بەم رەنگە بەهۆی چاكە كەسێكەوە رادەی كەسێ تر بەرز ئەكاتەوە، بەڵام لەو بارەكەی ترەوە عەدل و داد بەكارئەهێنێ، چاكەی هیچ كەس نادا بە كەسێ تر لە خۆڕایی، پاداشتی هەموو چاكەیەك ئەداتەوە، گوناهو تاوانی هیچ كەسێ ناخاتە ئەستۆی یەكێكی تر، بەهۆی خراپی یەكێ تۆڵە لە یەكێكی تر ناسێنێ، بەڵكو لەم بارەوە ئەمە بڕیارە كە وترا: ﴿كُلُّ ٱمْرِيٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ هەموو كەسێ بە كردەوەی خۆیەوە بەستراوەو بەند كراوە لای خوا، واتە گوناهی یەكتری نادرێ بەسەردا با باوكی بێ، یان كوڕی، پاداشتی هەموو چاكەی ئەدرێتەوە، ئینجا چەند جۆرێ تر لە نازو نیعمەتی بەھەشتی ئەو خوا پێداوانە باس ئەكات ئەفەرموێ: ﴿وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ واتە هەمیشە دەستگیرۆیی یان ئەكەین بە میوەو گۆشت لەوەی ئارەزووی بكەن.

---

[1] لەم رستەیە عیلەتە بۆ رستەی پێشوو.

يَتَنَـٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾

---

**﴿يَتَنَـٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾ لە بەهەشت دا لە کاتی کۆڕ گرتن دا بە کۆمەڵ دائەنیشن بە خۆشی یەوە وەك پچڕ پچڕی لێ دێت، هەرکەسێ دەست ئەبات بۆ پیاڵەی شەراب و بۆ خۆی رایئەکێشێ و لە یەکتری ئەسێنن بۆ خۆشی بەڵام ئەو شەرابە وەکو هی ئەم جیهانە نییە بەڵکو شەرابێکە نە قسەی ناڕەواو لەق و لۆقی تێدا هەیە لەکاتی خواردنەوەیدا، نە یەکتر تاوانبار ئەکەن و نە کردەوەیە هەیە کە هۆی گوناهو تاوان بێت، وەکوباوەڵەناو شەراب خۆرەکانی ئەم جیهانەدا. ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾ ئەگەڕێ بەسەریان دا بەو شەرابەوە چەند بەندەو خزمەتکارێ کە تایبەتین بە خۆیانەوەو هەموو ئەڵێی دوڕێکی شاراوەن لەناو سەدەفدا.**

**ئینجالەو کاتە خۆشەدا بیر ئەکەنەوە لەو هەموو خۆشی و ڕێزو لەزەتەو لەگەڵ رابواردنی ئەم جیهانەیان، بیر ئەکەنەوە لەو هەموو خۆشی و ڕێزو لەزەتەو لەگەڵ رابواردنی ئەم جیهانەیان، بیر ئەکەنەوە کە لە چی یەوە گەیشتنە چی؟ پرسیار ئەکەن لە هۆی گەیشتنیان بەو پلەو پایە بەرزە، لەناو خۆیان دا وەڵامی ئەو پرسیارە ئەدەنەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ * قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ * فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ * إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ﴾ هەندێکیان ڕوو ئەکاتە هەندێکی تریان پرسیار ئەکەن لە کردەوەو وەزعی لەوەو پێشی ئەم جیهانەیان و هۆی گەیشتنیان بەو هەموو خۆشی یە، لە وەڵام دا ئەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەوەوپێش لە دنیادا لەناو ماڵ و منداڵی خۆمان دا ئەترساین لە خواو لە پرسیارو سزای خوا لە ڕۆژی دوایی دا، لەبەر ئەوە گوێڕایەڵی خوامان ئەکردو خۆمان ئەپاراست لە گوناه، بەهۆی ئەوەوە خوا منەتی نا بەسەرماندا بەم جۆرە پاراستینی لە سزای ئاگرێ کە ئەڕوا بەناو هەموو کون و قوژبنی لەشدا، بێگومان ئێمە لەوەوپێش لە دنیادا نزاو لاڵەمان ئەکردە لای خوای خۆمان و ئەمانپەرست، ئەویش ئەو لاڵە و پەرستنەی لێ وەرگرتین و ئەوەی داوامان لێ کرد پێی داین، چونکە تەنها ئەوە چاکەی ڕاستەقینە ئەکات و بە ڕەحم و میهرەبانە.**

﴿فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾﴾

---

لەپاش ئەم هەموو سام و ترسەی کە خستیە بەر بێ بڕواکان، ئەو هەموو مژدەو بەڵێنە گەورەو گرنگانە کە دای بە ئیمانداره لە خواترسەکان. ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە لەسەر وەزیفە و فەرمانی خۆی بەردەوام بێت و کوڵ نەدا بەهۆی لاری و بێ شەرمی بێ باوەڕەکانەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾ ئینجا بەردەوام بە لەسەر تەمێ و ئامۆژگاری کردن، گوێت نەبێ و هیچ نرخێ مەدە بە بێ شەرمی و ئەو قسە ناڕەوایانەی کە بێ باوەڕەکان دەربارەی تۆ ئەیکەن، چونکە سوپاس بۆ خوا بەهۆی چاکەی خوای خۆت بەسەرتەوە. تۆ نە کاهینی و نە شێتی، وەکو ئەوانە دەربارەت ئەیڵێن.

ئەو بێ باوەڕانە هەر دەمێ بە نازناوێکی ناشیرین ئەیانویست پێغەمبەر (ﷺ) لەکەدار بکەن، جارێ ئەیانوت: ئەمە کاهینە، واتە لە جن و شەیتانەوە هەواڵ و قسە وەرئەگرێ. جارێکی تر ئەیانوت: شێتە، کاتێ تر ئەیانوت: جادووگەرە و سیحربازە، زۆرجار ئەیانوت: شاعیرە، ئەوەی پاڵی پێوە ئەنان بۆ ئەم قسە ناڕەوایانە ئەمە بوو کە هەموو دەستەپاچەو پەك کەوتوو بوون بەرامبەر قورئان، هەموو سەرسام و سەرگەردان بوون لەو وتارە کەس نەدیوەدا، لەبەر دڵ نەخۆشی یان نەیان ئەویست دان بنێن بەمەدا کە لەلایەن خواوە هاتووە، کەواتەئەبێ هۆی دەسەڵاتی قورئان ودەستەپاچەیی یەکەی خۆیان باس بکەن، ئەوەیش ئەوە بووکەهەرجارێ بە جۆرێك پیشانیان ئەدا کە بەهۆی جن و شەیاتینەوە ئەم وتارەی داهێناوە.

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەرەکەی ئەداتەوە (ﷺ) و شایەتی ئەدات لەسەر ئەوەی کە نە کاهینەو نە شێتە، ئینجا بە شێوەی بێزاری پرسیار ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ﴾ ئەی ئایا بێ باوەڕەکان ئەڵێن: محمد شاعیرێکە و چاوەڕوانی بەسەرهاتی سەختی چەرخ و ڕۆژگاری بۆ ئەکەین، ببێتە هۆی مردن و لەناوچوونی؟ ئەوانە ئەو قسە ناڕەوایەیان ئەکرد، هەندێکیان ئەیان وت بە هەندێکی تریان: خۆگرو بە ئارام بن لەسەر بارو ئایینی خۆتان، چاوەڕوانی بکەن تا شتێکی بەسەر دێت، ئەو کاتە ڕزگار ئەبین لە دەستی. ئەوا خوای گەورەیش ناڕەوایی قسەکەیانی دەربڕی، تەمێی پێغەمبەری (ﷺ) کرد بەرپەرچیان بداتەوە، بە جۆرێ کە هەڕەشەی لێ وەرئەگیرێ،

﴿قُلۡ تَرَبَّصُواْ فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُتَرَبِّصِينَ ٣١ أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَٰمُهُم بِهَٰذَآۚ أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ٣٢ أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ ٣٣﴾

ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ تَرَبَّصُواْ فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُتَرَبِّصِينَ﴾ ئەی پێغەمبەربڵێ پێیان ئێوە چاوەڕوانی بکەن، ئینجا منیش بەڕاستی لەگەڵ ئێوەدا لەوانەم کە چاوەڕوانن. واتە ئێوە چاوەڕوانی نەمانی من بکەن و منیش چاوەڕوانی نەمانی ئێوە ئەکەم، بەڵام راوەستن لەمەوپاش بۆتان دەرئەکەوێ کە پاشەڕۆژی سەرکەوتن بۆکام لا ئەبێ؟ بێگومان ئەو هەڕەشەیە بەدی هات، ئەو کۆمەڵە هەموو بەرباد بوون بە سەر شۆڕی، پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە تا ئایینەکەی تێرو تەواو بوو، سەرکەوت بەسەر باوەڕی ئەوان دا. گەورەو سەرۆکەکانی قورەیش پێ یان ئەوتن: ﴿ذوي الأحلام﴾ واتە خاوەن ژیریی و لێزانەکان، جا لێرەدا قورئان بە لاقرتی یەوە پرسیار ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَٰمُهُم بِهَٰذَآۚ﴾ ئەی ئایا فام و ژیریی یەکانیان فەرمانیان پێ ئەدەن بەم ناو ناتۆرە بێ جێ یانەی کە دەم درێژیی پێ ئەکەن دەربارەی پێغەمبەر، ئەم هەڵوێستە ناڕەوایانەی کەهەیانەبەرامبەرخۆی و ئایینەکەی؟ ﴿أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ﴾[1] نەخێر، بەڵکوئەوانە گەل و کۆمەڵێکن زۆر زیادەڕەوی کەرن لە عەقیدەدا، لە سنووری فام و ژیریی دەرچوون و یاخین.

یەکێکی تر لە دەم درێژیی ئەو بێ باوەڕانە ئەمە بوو ئەیان وت: ئەم قورئانە دەست هەڵبەستی خۆیەتی بەناوی خواوە، ئینجا خوایش بە بێزاری یەوە پرسیار ئەکات لەو وتە ناڕەوای ئەوانە، هۆکەیشی روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئایا ئەوانە ئەڵێن: محمد ئەم قورئانەی هەڵبەستووە بە دەم خواوە؟ واتە ئەوە قسەیەکی زۆر بێ جێ و بێزراوە. نەخێر محمد هەڵی نەبەستووە، بەڵکو ئەوان ئیمان و باوەڕیان نی یە، کەواتە بەهۆی بێ باوەڕی و سەرکەشی یەکەیانەوە دەم درێژیی ئەکەن بەو تانەو تەشەرە ناڕەوایانە، واتە بێبەشن لە رووناکی ئیمان و سەرگەردانن لە رەشی و تاریکی کوفردا بەهۆی ئەوەوە هەست ناکەن بەوە کە هێنانی ئەم قورئانە لە توانای ئادەمی و هیچ کەسی تردا نی یە جگە لە خوا. کەواتە ئەوانە ئەگەر هەر ئەڵێن محمد هەڵیبەستووە.

---

[1] تەفسیرەکە بە گوێرەی ئەوەیە کە ﴿أم﴾ ی دووەم بە مەعنا ﴿بل﴾ بێت. بەڵام هەندێ ئەفەرمون: ئەمیش هەر مونقەتیعەیە، پرسیاری یەکەم بۆ گاڵتە و لاقرتی یە، دووەم بۆ تەشەر لێدانەو لەکەدار کردنیان و بێ ئابڕوو کردنیانە، بێگومان یەکێ لەم دوو بارە لە رێگایان دایە و خۆ لادانیان نی یە لێ ی. بەم جۆرەیش زۆر جوانە.

فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾

---

**﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴾[1] دەی ئەوانیش خۆیان وتارێکی تر بێنن بە وێنەی ئەم قورئانە کە محمد (ﷺ) هێناویەتی ئەگەر راست ئەکەن لەو قسەدا کە ئەیکەن. واتە ئەوانە ئادەمین وەکو محمد، دەی ئەگەر ئەو کە ئادەمی یە بتوانێ ئەم قورئانە لەلایەن خۆیەوە بهێنێ ئەبێ ئەوانیش بتوانن. بەڵام چەند جار ئەوان بەریان لێ بڕرایەوە و هان دران و بە هیچ جۆر نەیان توانی وێنەی بچووکترین سورەتیش بێنن چ جای وێنەی هەمووی.**

**ئەم قورئانە ئاشکرایە سرێکی تایبەتی تیایە هەر لە یەکەم جارەوە کە بیسترا هەستی پێ ئەکرێ، هەست ئەکرێ بەمەی کە شتێکی جیاوازەو زۆر هێزێکی تایبەتی هەیە بەسەر دڵ و دەروون و هەست دا، هەست ئەکرێ بەمە کە بێجگە لە مەعناو مەبەستەکانی شتێکی تری جیاوازە لە هەموو وتارو هۆنراوەیەکی تر، هەست داگیر ئەکات و سەرنج رائەکێشێ بۆلای خۆی. ئیتر بە تەواوی نازانرێ ئەوە لە چی یەوە فەراهەم دێت؟ ئایا هۆی ئەوە نەفسی وتارەکە خۆیەتی؟ یان ئەو مەبەستە گرنگانەیە کە داڕێژراون لە نێوانی دا؟ یان ئەو هۆنینەوە تایبەتی یە کە بە وێنەی هیچ هۆنینەوەی تر نی یە؟ یان هەر شتێ ترە، هەر جۆر ببێ لە یەکەم جارەوە هەست بەوە ئەکرێ، هەر ئەمەش بوو بەهۆی سەرسام کردنی یەکەم چینێ کە ئەم قورئانەیان بیست، ئەو چینەی کە کانگای ئەو زمانە بوون کە قورئانی پێ هات، بەناوبانگ بوون لە دوان و وتاردان دا، ئەو گەل و چینە سەرسامی یان گەیشتە رادەیەك هیچیان بە دەستەوە نەما ئەوە نەبێ ئەیان وت ئەمە سیحرو جادووە، وەکو لە سورەتی ﴿ص﴾ دا بە درێژیی باسمان کرد. ئەم قورئانە پێش هەموو شتێ هەستی ئەوەی لێ ئەکرێ کە باس کرا، ئینجا بەهۆی روانین و بیر لێ کردنەوە تیای دا بە وردی چەندەها شتی نایابی سەرسوڕهێنەری لێ هەست کراوەو ئەکرێ، کە ئەوانە هەموو بوونەتە هۆی ئەوە کە قورئان لە هەموو چەرخ و کاتێك دا موعجیزە بێت، واتە هەموو کەس لە ئاستی دەستە پاچە و پەك کەوتوو بێت لە لاسایی کردنەوەی.**

---

[1] ئەم ئەمرە بۆ تەعجیزە، واتە بۆ روون کردنەوەی پەك کەوتوویی و دەستە پاچەیی یانە بەرامبەر قورئان و لە چەند جێگایەکدائەوەبەکارهێنراوە تەنانەت دەربارەی تەنها سورەتێکی قورئان با کەمترین سورەت بێت، هیچ کەس نەیتوانی.

هەرکەس ڕێزی هەستی خۆی بەلاوە بێت، ئینکاری ئەوەی پێ ناکرێ کە قورئان موعجیزەیە لە هەموو کات و چەرخێك دا، ئەم قورئانە زانین و ناسین و تێگەیشتنی تێرو تەواو و ڕێك و ڕاست فەراهەم ئەهێنێ لە دڵ و دەروون دا بەرامبەر بوون و بوونەوەرو ژیان و خوای پەروەردگاری هەمووان، ئەدوێ لەگەڵ سروشت دا بە دوانێکی تایبەتی کە وێنەی نەناسراوە لە هیچ وتارو لە هیچ لایەکی تر، دڵ ئەم دیو ئەو دیو ئەکات لە هەموو بارو رووبەکەوە چارەسەری هەموو شتێ باس ئەکات، لە تەمێ و ئامۆژگاری یەکانی دا هەموو بارو روویەکی گرتووەتە ژێر دەست بێ ئەمەی زیادە رەوی یان کەم و کوڕی تێدا بێت، هاوتایی و هاوکێشی خستۆتە نێوان هەموو هێزو وزەو ئارەزوو و هەموو بارو روویەکی ژیان، وەکو پەیوەندی یەکێتی و کۆمەکی و هاوکاری فەراهەم هێناوە لە نێوان ژیان و هەموو کاروباری ژیاندا.

ئینجا پرسیار ئەکات لەهۆی پەیدا بوون و فەراهەم هاتنی بێ باوەڕەکان خۆیان، بە هیچ جۆر ماوەیان بۆ ناهێڵێتەوە ناچاریان ئەکات ئەبێ بڵێن: ئەو کەسەی کە ئەوانی دروست کردووە خوایە، دەی کەواتە ئەبێ هەر ئەو بپەرستن، باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەرەکەیشی (ص) ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ﴾ ئایا ئەوانە دروست کراون لە خۆیانەوە بێ هیچ کەس؟ بەڵکو ئایا خۆیان دروست کەری خۆیانن؟! واتە ئەوانە نەبوون و ئێستە هەن، دەی ئەبێ یان لەخۆوە پەیدا بوون! یان خۆیان خۆیانیان دروست کردبێ! یان کەسێکی تر دروستی کردبن، بێگومان جگە لەم سێ بارە بارێکی تر دەست ناکەوێ کە بگوترێ: یەکەم بار واتە پەیدا بوونیان لە خۆوە بە ڕێکەوت، ئەوەش شتێکە دژو پێچەوانەی سروشت و هەموو فام و ژیریی یەکە، هەرکەس شتی وا بڵێ ئەو کەسە خۆی بێ ڕێز ئەکات لای هەموو خاوەن ژیریی یەك، چونکە زۆر روون و ئاشکرایە کە شتی ڕێکەوت ڕژێمی نی یە، دەربارەی دووەمین هیچ کەسێ نی یە شتی وا بڵێ، کەواتە ناچار هیچ بارێ تر نەماوە جگە لەوەی کە هەموودروست کراوی خوایەکی تاك وتەنیایەبێ هاوبەش و یارمەتی دەرێ لەو دروست کردن و فەراهەم هێنانەدا، کەواتە ئەبێ لە پەرستنیش دا هیچ هاوبەش و هاوڕێی بۆ ڕەوانەدرێ.

ئینجا بەرەنگاری یان ئەکات بە پرسیارێکی تر لە هۆی دروست کردن و فەراهەم هێنانی ئاسمانەکان و زەوی، لەم پرسیارەدا تیرو بارێکی تر هەیە جگە لە سیانەکەی تر کە باس کران. ئەوا پرسیارەکە لێرەدا ئەبڕێ تەنها بەسەر ئەم تیرو بارەدا ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ ئەی ئایائەمان ئاسمانەکان و زەوی یان دروست کردووە؟ کەواتە ئاشکرایە

ئەمانیش خۆیان خۆیانیان دروست نەکردووە، بە ڕێکەوتیش پەیدا نەبوون، ئەی ئایا ئەو بێ باوەڕانە دروستیان کردوون؟ نەخێر هەرچۆنێ ڕێگای ئەو دوو تیرو بارە پێشووە نی یە، هەروەها ئەم تیرو بارەیش هیچ کەسێ ناتوانێ بیڵێ. کەواتە هیچ چارە نی یە ئەبێ باوەڕ بهێنرێ بە تیرەی چوارەم لێرەدا کە سێ یەم بوو لە پرسیاری یەکەم دا: باوەڕ بهێنرێ کە کەسێکی تر دروستی کردوون بێ هاوبەشی و بێ وێنەیە، ئەوەیش کە خوای هەموانە، کەواتە ئەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ.

ئەو بێ باوەڕانەی ئەو چەرخە ئەگەر پرسیاریان لێ بکرایە لەو کەسەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، بێ گیروگرفت لە وەڵام دا ئەیان وت: خوایەکە ناوی ﴿الله﴾ یە دروستی کردوون، بەڵام ئەو وتن و دان پیانانە بەجۆرێکی راستەقینە نەبوو کە هەڵقوڵا بێت لە زانین و باوەڕێکی رێك و رەوانی دامەزراو وەکو ئەفەرموێ: ﴿بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴾ ئەوانە باوەڕێکی روون و رەوانیان نی یە، بەهۆی ئەوەوە لایان دا لە پەرستنی خوا بە تاك و تەنیایی، لە باوەڕ هێنان بەوەی کە پێغەمبەر بۆی هێنان لە لایەن خواوە.

لێرەدا با هەندێ بوەستین لە بەردەمی قورئانەکەمان دا، بیر بکەینەوە لەوەی کە چەندە بە سووك و ئاسان ئاگادارمان ئەکات و زانامان ئەکات بەو شتانەی کە زۆر قورس و بە ئەرکن لە دڵ و دەروونی خەڵك دا، بۆ وێنە: روون کردنەوەی بوونی خواو ناچارکردن بە باوەڕ پێ ی شتێکە لە کۆن و تازەوە خراوەتە کار بە ئەرك و زەحمەتێکی زۆرەوە بۆ پێك هێنانی بەڵگەی ژیریی لە چەند رێگا و روویەکەوە، وەکو بڵاو بووەتەوە لەو هەموو کتێبانەدا. بەڵام هێشتا بەو هەموو ئەرك و زەحمەتە بە هەموویانەوە ئەو ئارامی و دڵنیایی یە نادات کە ئەم دوو ئایەتە بچکۆلانە فەراهەمی ئەهێنن بەو هەموو سووکی و روونی و ئاسانی یەوە کە بۆ هەموو جۆرە کەسێ دەست ئەدات با رادەی خوێندەواریشی نەبێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴾ ئینجا پلەیە دێتە خوارەوە لە رادەی دروست کردن، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴾ ئایا غەزنەکانی خوای تۆ لای ئەوانەو ئەوان خاوەنینی هەتا بە ئارەزووی خۆیان بەش و چارەو رۆزی بگرنەوە و فراوانی بکەن، بەرزو نزمی و سوود و زیان بۆ هەرکەسێ ویستیان رەوای بدەن؟

ئایا ئەوانە دەسەڵات دارن و زاڵن بەسەر هەموو کاروباردا تا هەموو شت بە ئارەزووی ئەوان بڕوا؟ دەی خۆ ئەبێ یەکێ ببێ ئەو شتانەی بە دەست بێت، بێگومان ئەو کەسەیش ئەوەیە کە قورئان بۆمان باس ئەکات: کە خوایەکە و ناوی ﴿الله﴾یە.

**ئینجا پلەیەکی تر دێتە خوارەوە پرسیار ئەکات ئەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾[1] ئەی محمد تۆ پێ یان ئەڵێت کە تۆ پێغەمبەری و سروشت بۆ هاتووەتە خوارەوە لە کۆمەڵی هەرە بەرزەوە و ئەوانیش باوەڕت پێ ناکەن و بە راستت نازانن، دەی ئایا ئەوانە پەیژەو پلیکانێکیان هەیە کە بەسەریەوە سەرکەون بۆلای سەرووی ئاسمانەکان و لەوێ گوێ بگرن، تا بۆیان دەرکەوێ کە تۆ سروشت بۆ نەکراوەو تۆ راست ناکەیت؟ دەی ئەگەر ئەوان راست ئەکەن و شتی وایان هەیە، با گوێگرەکەیان بێت بە بەڵگەیەکی روونی ئاشکراوەکە دڵ و دەروون داگیر بکات و ناچاری بکات بە باوەڕ پێ کردنی ئەو گوێگرە، دەی بابێ راستی خۆی دەرخات، ئینجا قسەیەکی زۆر پووچی نارەوایان هەبوو دەربارەی خوا کە گوایە مەلائیکە کچی خوایە، ئەو باوەڕە نارەوایە ئەهێنێ بۆ لێکۆڵینەوە، بە شێوەی بێزاری دەربڕین پرسیاریان لێ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ﴾ ئایا ئێوە نەفامی و نەزانینتان لەو رادەدایە کە منداڵ بۆ خوا رەوا ئەدەن بە وێنەی خۆتان، لە منداڵیش دا تەنها کچ بۆ ئەو بڕیار ئەدەن، بۆ خۆتان تەنها کوڕ رەوا ئەدەن و لاتان وایە کچ شایانی ئێوە نییە؟**

**ئەو نەفامانە رادەی مێینەیان زۆر بەلاوە پەست بوو تا رادەیەك ئەگەر هەواڵ بدرایە بە یەکێ لەوانە بە پەیدا بوونی کچێ بۆی، دەست بەجێ رووی رەش دائەگیرسا لە تەریقی دا. داخ و مەراق ئەکەوتە دڵی لەگەڵ ئەوەدا ئەو شتەیان بۆ خوا رەوا ئەدا، کە بە گوێرەی باوو باوەڕی خۆیان خراپ بوو، هۆی سەرشۆڕی بوو، جا لێرەدا قورئان بە پێی باو و باوەڕی خۆیان لەگەڵیان ئەکۆڵێتەوە، رەزیل و سووك و روو رەشیان ئەکات.**

**ئەو بێ باوەڕانە زۆر تەنگەتاوو دڵگران ئەبوون بەو بانگ و بانگەوازەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوەدا ئەو هیچ زۆرێکی هیچ نەئەهێنان، هیچ ئەرکێکی نەبوو بەسەریانەوە، داوای هیچ کرێ و پارەیەکی لێ نەئەکردن. کەواتە ئەگەر پیاوەتی و ئادەمێتی یان تیا بووایە ئەوانیش کە بە گوێ یان نەئەکرد هیچ نەبێ بە شیرینی بەرپەرچیان بدایەتەوە.**

---

[1] ئەم جۆرە پرسیارانە ئێجگار سەخت و بەتینن لەسەر دڵ و دەروونی ئەو بێ باوەڕانە، چونکە مەبەست بەمان لاقرتی و تانەو تەشەر دانە لێ یان، نارەوایی دەمبازی یەکانیان روون ئەکاتەوە.

أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾

---

**جا قورئان ئەو ناپیاویەیشیان ئەخاتە پێش چاو بەم فەرمودەیە: ﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر ئایا تۆ داوای هیچ کرێ و پارەیەکیان لێ ئەکەیت لەسەر گەیاندنی پەیامەکەت و بانگ کردنیان بۆ سەر ئایینەکەت، تا ماندوو بکرێن و باریان قورس بکرێت لەو کرێ دانە، بەهۆی ئەوەوە بێزار ببن لە گوێ رایەڵی و شوێن کەوتنی تۆ؟ واتە نەخێر تۆ داوای هیچ شتێکیان لێ ناکەت، کەواتە خراپی و بەدکرداری ئەوان ئاشکرایە، ئەوان – وەکو باس کران لەمەوپێش – ئەیان وت: محمد شاعیرێکە چاوەڕوانی مردن و لەناوچوونی ئەکەین، ئەوا قورئان وەڵامیان ئەداتەوە بە جۆرێ لاقرتی یان پێ ئەکات و تانەیان لێ ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾ ئەی ئایا ئەوانە عیلمی غەیبیان لایەو ئەزانن کە پێغەمبەر پێش ئەوان ئەمرێ تا ئەوە بڕیار بدەن و بینووسن؟ ﴿أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ﴾ ئەی ئایا ئەیانەوێ پیلانت بۆ بنێنەوە بۆ لەناوبردنت؟ واتە شتی وا سەرناگرێ، چونکە ئەوانەی کە کافرن هەر ئەوان لەو پیلان گێڕی یەدا ژێر کەوتوون و ژێر ئەکەون، تۆڵەی پیلانەکەیان بۆ سەر خۆیان ئەگەڕێتەوە: ﴿أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ﴾ ئەی ئایا خوایەکی تر هەیە بۆ ئەوانە جگە لە خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە تا بیانپارێزێ و خاوەنداری یان بکات و بەرگری تۆڵە وسزای خوایان لێ بکات؟ نەخێر هیچ خوایەکی تر نییە، چونکە: ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خوا پاك و بێ لەکەیە لەو هاوبەشی یەی کە ئەوانە بۆی بڕیار ئەدەن و ڕەوای ئەبینن بۆی،**

خوا پاکە لەو جۆرە تێگەیشتنەی کە ئەوانە هەیانە بەرامبەر بە خوا، خوا تاك و تەنیایە و هیچ هاوبەشی نییە.

لەپاش ئەوەی بەو هەموو مێرشە بەهێزانە بەروودوای لێ گرتن، هیچ بەڵگە و بەهانەیەکی بۆ نەهێشتنەوە، ئینجا روونی ئەکاتەوە کە ئەوانە عیناد و سەرکەشیان داوەتە بەر، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴾ ئەگەر پارچەیەك لە ئاسمان ببینن بکەوێتە خوارەوە بەسەریان دا بۆ سزادانیان، ئەوانە لە عینادا باوەڕ ناهێنن و دان نانێن بەو شتە ئاشکراداو ئەڵێن ئەمە هەڵم و هەورە تەپەی داوەو چین چین کەوتووە بە مل یەك دا، واتە سەرپێچی یان لە رادەیەك دایە لە کاتی وا تەنگاوەدا و بۆ شتی وا ئاشکرا هێشتا باوەڕ ناهێنن. ﴿ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴾ کەواتە ئەی پێغەمبەر لێ یان گەڕێ هەتا دووچاری رۆژی سەختی خۆیان ئەکرێن، رۆژێکی وا کە هەموو تیای دا گیانیان دەرئەکرێ و ئەمرێنرێن، کە ئەویش رۆژی وێران کردنی ئەم جیهانەیە. ﴿ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ لێ یان گەڕێ بۆ رۆژێ کە پیلان و فێڵ و تەڵەکەی خۆیان سوودی هیچ شتێکیان پێ ناگەیەنێ و ئەوانە یارمەتی نادرێن. کەواتە ئەمڕۆ ئەگەر هەر جۆرە پیلان و تەگبیرێ بکەن لەو رۆژەدا هیچ شتێکیان سوودی نابێ. ﴿ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ بە راستی پاش ئەو رۆژە سزای تر هەیە بۆ ئەوانەی کە جەورو ستەم کاریان کردو باوەڕیان نەهێنا، بەڵام زۆربەی ئەوانە نەزانن و ئاگایان لەوە نییە.

لەپاش ئەمەی بێ باوەڕەکانی بە دوورو درێژیی راونا لە هەموو لایەکەوە، لە کۆتایی دا ئەوهەڕەشەسەختەی لێکردن و راگیری کردن لەپێش دەمی سزای گەورەدا، کە چاوەڕوانییان ئەکات لە دوور و نزیکەوە.

**پاش ئەمانە قورئان لا ئەکاتەوە بەلای پێغەمبەری بەرێزدا (ﷺ) بە تەمێ کردنی بە ئارام گرتن و سەبر کردنی لەسەر ئەرك و زەحمەتی ئەو هەموو سەرپێچی و بێ باوەڕیی و دەم درێژیی بێ باوەڕانە، وەستانی بە دەم کاری خوای خۆیەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ﴾ خۆت بگرە بە ئارام بە بۆ بڕیاری خوای خۆت، واتە لەسەر فەرمانی خۆت بەردەوام بەو ئیتر هەموو کارێکی خۆت و ئەوان بدەرە دەست خواو راوەستە بۆ بڕیاری خوا، دڵنیابە و هیچ دڵتەنگ مەبە. ﴿فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ لە ژێر چاودێریی و پاراستنی ئێمەدای لە هەموو بارو روویەکەوە، بە هەموو هۆیەك. بەه بەه لەم رێزو نرخ پێدانە، بەه بەه لەم رادەو پایە بەرزە کە ئەم رستە بەفەڕە پیشانی ئەدات، بەڵام لە توانای هیچ کەس دا نی یە بە هیچ زمانێ شتێ تر بڵێ کە پڕ بە پڕی ئەو دەرچێ، ئەو مەبەستی ئەوە پیشان بدات و بیگەیەنێ، بەڵێ فەرمویەتی بە حەزرەتی موسا ﴿وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ﴾ ﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي﴾ ﴿وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ﴾.**

**ئەمانەهەموو پایەو پلەی بەرزی ئەوپێغەمبەرەبەرزە روون ئەکەنەوە، بەڵام ئەوەی رستەی ﴿فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا﴾ ئەیگەیەنێ و پیشانی ئەدات شتێ ترەو جیاوازەو تام و بۆنی تری هەیە و بەرزترین رادەو پلە پیشان ئەدات.**

**ئینجا رێنموونی ئەکات بۆ رێگای پەیوەندی هەمیشەیی بەخوای خۆیەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ * وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ﴾ کاتێ لە خەو هەڵئەستی خوای خۆت بە پاکی رابگرە بە سوپاس کردنەوە، هەروەها لە هەندێ شەوداو لەکاتی بەیانیدا.**

**مەبەست یادو پەرستنی خوایە لەو کاتانەدا ئیتر بە نوێژو قورئان خوێندن بێت، یان بەو جۆرە ویردو زیکرانە بێت کە لە کتێبی حەدیس دا باس کراون. بە هەر جۆر ببێ یادو پەرستن و پەیوەندی دڵ لەگەڵ خوادا توێشووی رێگایە و هۆی ئارامی دڵە و زاڵ بوون بەسەر هەموو کۆسپ وپلەیەکدا، وەکو هەر ئەوە مەبەستی راستەقینە و خۆشی راستەقینەی رۆح و دڵ و دەروونە. خوا لە بەزەیی خۆی بێ بەشمان نەکات، آمین.**

**و صلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله و صحبه أجمعين**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ



## سورەتی (النجم)
## مەککەیی یەو ٦٢ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

مەبەستە گرنگەکانی ئەم سورەتە بریتین لە:

١- سروشی (وحی) خوا بۆ پێغەمبەر (ﷺ).

٢- تاك و تەنهایی خوا.

٣- راستیی رۆژی دوایی.

ئەم سورەتە چوار بەشە:

بەشی یەکەمی باسی حەقیقەتی سروش ئەکات و راستی و بەدی هاتنی روون ئەکاتەوە.

بەشی دووەمی: باسی بتەکانی بت پەرستەکان ئەکات لەگەڵ وتەو بریاری پڕوپووچیان دەربارەی مەلائیکە.

بەشی سێ یەم: تەمێی پێغەمبەر ئەکات (ﷺ) بە روو وەرگێرانی لەو کەسەی کە پشت ئەکاتە یادی خوا.

بەشی چوارەم: بنەڕەتی ئایین باس ئەکات لە بابەت گەڕانەوەی هەمووانەوە بۆ لای خواو پرسیارو و دادپەروەریی خوا لە تۆڵە سەندن و پاداشت دانەوەدا.

ئینجا با بە جوانی گوێ بگرین لە سورەتەکە ئەو هەموو مەبەست و شتە گرنگانەمان بدا بە گوێدا، لەسەرەتای سورەتەکەوەخوای گەورە سوێندئەخوا لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) رێگای ون نەکردووە و ئەوەی کە رای ئەگەیەنێ سروشی خوایە، ئەفەرموێ:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ سوێند بە ئەستێرە کاتێ کە ئاوا ئەبێ.

دەربارەی ئەم سوێند پێ خوراوە چەند رایەك هەیە: هەندێ ئەفەرمون مەبەست ئەستێرەیەکی دیاریی کراو نییە، بەڵکو هەرکام مەبەستە. کۆمەڵێکی تر ئەفەرمون: مەبەست

ئەستێرەیەکی تایبەتی یە، لەسەر ئەم رایە بە سێ ئەستێرە راڤە کراوە: زوهەرە، ئەستێرەکانی کۆ، شیعرا. کە لەمەوپاش لە سورەتەکەدا باسی ئەفەرموێ. لەسەر هەموو رایە دڵ بێدار ئەبێتەوە بە رێزو گرنگی سوێند پێ خوراوو سوێند لەسەر خوراوەکە کە ئەوەیش مەبەستێکی زۆر گرنگە لەم جۆرە شوێنانەدا. هەروەها لەسەر هەموو رایەك پەیوەندی و رێك و پێکی سوێند پێ خوراو هەیە لەگەڵ سوێند لەسەر خوراودا، ئای چەند شیرین و رێکە شێوەی ئەستێرە کە لە ناوەراستی ئاسمانەوە بەرە بەرە باڵ دائەکێشێ بۆ نیشتن لەگەڵ شێوەی جوبرەئیل دا کە لە کەنارەی هەرە بەرزی ئاسمانەوە باڵی داهێشت بەرەو زەوی بۆلای پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)!!

خوای گەورە سوێندی خوارد، سوێند لەسەر خوراوەکەیش ئەمەیە: ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ * وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ هاورێکەی ئێوە، واتە محمد رێگای ون نەکردووەو لە رێگای راست لای نەداوە، بیرو باوەری ناراستی نەبووە، ئەو قورئانەی کە ئەیلێ و پێتان رائەگەیەنێ لە خۆیەوە نی یە و بە ئارەزووی خۆی نایەت، ئەوەی کە پێتان ئەڵێت هیچ شتێ نی یە جگە لە سروش کراوێ کە سروش کراوە لەلایەن خواوە.

ئەمەشایەتی یەلەلایەن خواوەلەسەرراستیی رێگا ورێکی بیروباوەری پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لەسەر ئەوەی کە قورئانی لەلایەن خواوە بۆ هاتووە، بێ باوەرەکانی قورەیش و جێنشینەکانیان لە هەموو چەرخ چینێك دا ئەخاتەوە بە درۆوە لەو هەموو تانە و رەخنە و لەکەیە کە دەمبازی پێ ئەکردو ئەیکەن دەربارەی قورئان و پێغەمبەر (ﷺ) بە هاورێی ناوبرد لەبەر دەم کوت کردنیان بەمەی کە بە باشی ئەیانناسی و بەناوبانگ بوو لە ناویان دا بە پاکی و راستی و خووڕەوشت بەرزی، کەواتە هەر دەم درێژیی یەك کە ئەیان کرد دەربارەی ئێجگار نارەوا بوو. بێگومان خوا پێغەمبەری (ﷺ) فێری قورئان کرد بەم جۆرە سروشی کردە لای بەڵام ئەو سروشی خوا بە چەند جۆرێ فەراهەم هاتووە، وەکو بە درێژیی باس کرا لە دوا دوایی سورەتی شورادا یەکێ لەو جۆرانەی بەمە بووە کە سروشەکەی لە جوبرەئیلەوە وەرگرتووە ئیتر لە شێوە راستەقینەکەی خۆی دا، یان لە شێوەی ئادەمی دا، بێجگە لەوەش جوبرەئیل دەوری هەموو قورئانی کردووەتەوە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بە تایبەتی لە دوا دوایی ژیانیدا لە مانگی رەمەزان دا هەموو شەوو رۆژێ ئەمات دەوری لەگەڵ ئەکردەوەو لەگەڵی پیا ئەچووەوە،

عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾

---

جا لەبەر ئەوە خوا لێرەدا فێر کردنەکەی ئەبڕێ بەسەر جوبرەئیل داو ئەفەرموێ: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴾[1] هاوڕێکەی ئێوە فێری ئەو سروش کراوەی کرد، واتە قورئان، فریشتەیەکە هێزو تواناکانی زۆر بەتینە، ئەوەیش جوبرەئیلە کە هۆی فەراهەم هاتنی زۆر لە موعجیزەکانە، زۆر لەسزاوتۆڵەی گەلە پێشووەکان لەسەر دەستی ئەودا بەدی هاتووە، ﴿ذُو مِرَّةٍ﴾[2] ئەو فریشتەیە خاوەنی شێوەو سورەتێکی شیرینە، یان زۆر لێزانە و ژیریی یەکی بەهێزی هەیە.

ئینجا روونی ئەکاتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوپەڕی باوەڕی بەهێزی دڵنیایی هەبووە لە وەرگرتنی ئەو سروشەداو هیچ کلۆجێ ڕێگا نەبووە بۆ گومان و دوو دڵی رووی تێ بکات لەو کارەدا چونکە بە چاوی خۆی ئەو فریشتەی دیوە لە شێوە راستەقینەکەی خۆی لە دورەوە تا وردە وردە نزیک کەوتووەتەوە لێ یەوە بە ئەوپەڕی نزیکی ئەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَوَىٰ * وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ * ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ * فَكَانَ قَابَ[3] قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ[4] * فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ﴾ ئەو فریشتەیە لەسەر شێوە راستەقینەکەی خۆی راوەستا لە کاتێک دا کە لە کەنارەی هەرە بەرزی ئاسمانەوە بوو، ئەوەیش لە سەرەتای پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەوە بوو کە بەو شێوە گرنگە بینی کەنارەی

---

[1] ئەمەی تەفسیرەکە رای کۆمەڵ و زۆربەی زانایانە، هەندێ ئەڵێن مەبەست بە ﴿شدید القوی﴾ خوایە لەسەر ئەم رایە ئەم ئایەتانە ﴿متشابة﴾ ن ئەو کاتە یان حەواڵەی خوا ئەکرێن وەکو سەلەف ئەفەرمون یان راڤە ئەکرێن و تەئویل ئەکرێن بە جۆرێ شایانی خوا بن.

[2] بە چەند شتی تر تەفسیر کراوەتەوە.

[3] ئەم رستەیە بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی ئەوپەڕی نزیکی نێوانی دوو کەس لە یەکترەوە.

[4] وشەی ﴿أو﴾ لێرەو لە چەند شوێنی تردا تەفسیر کراوەتەوە بە مەعنا ﴿بل﴾ بۆ گومان و دوو دڵیش بەکار هێنراوە بەڵام ئەم کاتە گومان و دوو دڵی یەکە بە گوێرەی بڕیاری ئێمەیە کاتێ کە سەرنجی بدەین، واتە ئەو کەسەی کە سەرنج ئەدات ئەڵێ: ئەوەندە نزیکە ئەندازەی دوو کەوان یان نزیک تر. لەسەر هەموو بارێک مەبەست بەم رستەیە ئەمەیە کە هەواڵ پێدراوەکە راستە و هیچ کەم و کوڕی تێدا نی یە.

ئاسمانی داگیر کردبوو، ئینجا نزیک کەوتەوە لە پێغەمبەرەوە بەم جۆرە لەسەردا هاتە خوارەوە بۆلای ئینجا هەمیتر نزیک کەوتەوە تا وای لێ هات ئەندازەی نزیکی لە پێغەمبەرەوە وێنەی ئەندازەی دوو کەوان بەڵکو نزیک تر، واتە لەوە دوورتر نەبووە، ئینجا ئەو فریشتەیە سروشی کردە لای بەندەکەی خوا ئەو شتەی زۆر گرنگە کە سروشی کرد، واتە ئەوەندە گەورەو گرنگە زمان توانای باس کردنی نی یە. ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ﴾ دڵی پێغەمبەر دژو پێچەوانەی ئەو شێوەی فریشتە نەبوو کە چاوی خۆی بینی، واتە هەرچۆنێ بە چاوی سەر بینی هەروەها پێشی ناسی کە ئەوە جوبرەئیلە، کەواتە بینینەکەی زۆر رێك و راست بووەو هیچ گومان و دوو دڵی نەبوو، ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ﴾ کەواتە ئایا بێ باوەڕەکان ئێوە دەمە دەمێ ئەکەن لەگەڵ پێغەمبەردا لەسەر شتێ کە بە چاوی خۆی دیویەتی، ئەتانەوێ بە دەمبازی قسەی خۆتان سەرخەن وئەوبەدرۆ بخەنەوە؟ واتەمەولْ وتەقەلاکەتان زۆر بێ جێ و بێ نرخە.

بینینی ئەو فریشتە لە شێوە راستەقینەکەی خۆی دا تەنها ئەم جارە نەبووە، بەڵکو جاری تریش رووی داوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەکو ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ * عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ * عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ﴾ سوێند بەخوا جارێ ترمحمد ئەوفریشتەیەی بینی لای﴿سدرة المنتهى﴾ کە ﴿جنة المأوى﴾ یە، واتە ئەو بەهەشتەی کە جێگای لەخوا ترسە خۆپارێزەرەکانە، یان جێگای رۆحی شەهیدەکانە.

بینینی ئەم جارە لە شەوی میعراج دا بوو بە پێی ریوایەتێکی بەهێز لە پەڕاوەکانی حەدیس دا لەو شەوەدا ئەو فریشتەیە لە شێوە راستەقینەکەی خۆی دا نزیک کەوتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) وێنەی جارەکەی ترتابەباشی ئەم جارەیش بینی لەوشوێنەدا کەباس کرا.

﴿سدرة﴾ درەختێکە و مەبەست بە ﴿المنتهى﴾ شوێنی دواهاتن و بڕانەوەی پێگەیشتن و بەرز بوونەوەی کردەوەو زانینی خەڵکی یە، یان شوێنی دواهاتنی شەوی میعراجە، یان شوێنی دواهاتنی هاوڕێ یەتی جوبرەئیل بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەو شوێنەدا ئەو وەستاو پێغەمبەر (ﷺ) بەرز بووەوە بۆ ئەو شوێنەی خوا ویستی بە هەر جۆرێ لەمانە و هەر جۆرێکی تر تەفسیر کرابێتەوە هەموو شتێکی نهێنی و غەیبی خوا پێغەمبەری ئاگادار کردەوە بەسەری دا و لە توانای ئێمەدا نی یە و هیچی لێ نازانین جگە لەم ئەندازە کە لێرەدا باس کرا، کەواتە زیاد لەمە دەست و پەل ناکوتین بۆ ئەمەی لە سنووری خۆمان دەرنەچین.

ئینجا باسی هەندێ لە بەسەرهاتی ئەو درەختی ﴿سدرة﴾ ئەکات کە لە لای ئەوا ئەو بینینە فەراهەم هات ئەمەیش لەبەر زیادە باوەڕو دڵنیا کردن لەسەر ئەو بینینە، ئەفەرموێ:

﴿إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ﴾[1] جوبرەئیلی بینی، ئینجا لای ﴿سدرة المنتهى﴾ دا لەو کاتەدا کە ئەو ﴿سدرة﴾ ی دائەپۆشی ئەوەی کە دای ئەپۆشێ لە مەلائیکەو چەندەها رووناکی و چەندەها رەنگی شیرین و ئەو هەموو شتە نایابانەی کە زمان ناگات بە باس و سەنایان دا، ﴿مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾[2] چاوی پێغەمبەر کلا نەبوو لەوەی کە بینی، تێنەپەڕی لێ ی، کەواتە بینینەکەی ڕێك و روون و ئاشکراو بێگەرد بووە. ﴿لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ﴾[3] سوێند بەخوا لەو شوێنەدا گەورەترین نیشانە و بەڵگەی ئاشکرای بینی لە بەڵگەو نیشانە روونەکانی خوای خۆی کە نموونەی دەسەڵات و توانینی بێ سنووری خوان.

ئەو ئایینەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هێنای و لە یەکەم جارەوە بانگی ئەو بت پەرستانەی بۆ ئەکرد، ئەو ئایینەی شتێکی روون و رەوان و ئاشکراو ناسراو بوو لای پێغەمبەر (ص) بە هەموو ئارام و دڵنیایی یەکەوە بەو شێوە کە باس کرا، ئەی ئەو بت پەرستانە، کە بیرو باوەڕی ئەفسانەیان گرتبووە گەردن، ئایا بە چ بەڵگە و نیشانەیە ئەو ڕێگایەیان دابووە بەر؟ ئایا لەسەر چ بنەڕەتێ لات و عوزایان ئەکرد بە وێنەو هەیکەل بۆ مەلائیکە؟ ئایا چۆن لەخۆیانەوە ئەو بڕیارە ناڕەوایان دا: کە مەلائیکە کچی خوان؟ ئایا چۆن باوەڕیان وابوو کە ئەو بتانە تکاکاریان ئەبن لای خواو تکاکەیشیان وەرئەگیرێ؟ بێگومان هەرچۆنێ باوەڕەکەیان ئەفسانە و پڕوپووچ بوو هەروەها خۆیشیان هیچ شتێکیان بە دەستەوە نەبوو، بەڵکو هەروا کوێرانە نیشتبوونە سەر ئەو ڕێگا چەوتە، جا ئەوا قورئان سەرنجیان رائەکێشێ بۆ ناڕەوایی بیروباوەڕەکەیان و بەرودوایان لێ ئەگرێ بە جۆرێك هیچ ماوە ناهێڵێتەوە بۆ هیچ بەربەرەکانی و دەمبازی یەك،

---

[1] بە کرداری رانەبردوو فەرموی لەبەر حازر کردنی شێوەی ئەو شتانەی کە ﴿سدرة﴾ یان داپۆشیوە.

[2] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست باسی شەرم و ئەدەبی پێغەمبەرە (ﷺ) واتە ئیزنی بۆ هەرچی درابوو هەر سەرنجی ئەوەی ئەدا بێ زیادو کەم.

[3] بە گوێرەی تەفسیرەکە ﴿الكبرى﴾ مفعولە بۆ ﴿رأى﴾ هەندێ ئەفەرمون سیفەتە: واتە هەندێ لە بەڵگە گەورەکانی خوای خۆی بینی، کەواتە لەسەر ئەم رایە مفعولەکە لابراوە یا وشەی ﴿من﴾ کە بە مەعنا ﴿بعض﴾ە.

ئەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ * وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ﴾ دەی هەواڵم بدەنێ و پێم بڵێن: ئایا ئەم بتانە: لات و عوزاو مەنات کە سێ یەمی ئەو دووانەکەی ترەو رادە و پلەی نزم ترە لەوان، ئایا ئەمانە هیچ توانا و دەسەڵاتێکیان هەیە بەسەر هیچ شتێك دا تا ئێوە واز بێنن لە پەرستنی خواو ئەمانە بپەرستن؟ بێگومان مەبەست بەم شێوە پرسیارە بێزاری دەربڕینە دەربارەی ئەو باوەڕو کردەوە ناڕەوای ئەوانە، چاوەڕوانی وەڵام ناکرێ و وەڵام پێویست نی یە و هیچ کەسیش رێگای نی یە بڕیاری ئەوەیان بۆ بدات، کەواتە پەرستنەکەیان زۆر جێی سەرسوڕمانە.

لات، بەردێکی سپی بوو نەقش و نیگاری پێوە بوو خانوویەکیان بەسەرەوە دروست کردبوو لە تائیف داو خزمەت چی و قاپی یەوانی هەبوو بەرگی کرابوو بەبەردا، بەچوار دەوری دا ساحەیەکی بۆ کرا بوو بە وێنەی کەعبە.

هۆزی سەقیف و ئەوانەی شوێن کەوتوویان بوون ئەو بتانەیان ئەپەرست و شانازی یان ئەکرد بەسەر تیرەکانی تردا جگە لە قورەیش، چونکە ئەوان کەعبەیان هەبوو کەماڵێکە ئیبراهیمی باوکی هەمووان (علیه السلام) دروستی کردووە. عوززا، درەختێك بوو لە نەخلەدا لە نێوان مەککەو تائیف ئەویش وەکو لات خانووی بەسەرەوە کرابوو، پەردەو شتی هەبوو، ئەمەیان بەنرخ بوو بەلای قورەیشەوە.

مەنات، بتێ بوولە قەدید لە نێوان مەککە و مەدینەدا تایفەی خوزاعە و ئەوس و خەزرەج ئەیانپەرست، کاتێ بچوونایە بۆ حەج لەوێدا ئیحرامیان ئەپۆشا و ئەچوون بۆ مەککە.

چەند بتی تر هەبوو لە نیوە دورگەی عەرەب دا هۆزو تیرەکانی تر ئەیان پەرستن بەڵام ئەم سیانە گەورەترینی هەموو بتەکانی تر بوون. وا گومان ئەکرێ کە ئەم بتانە دروشم و رەمزی مەلائیکە بووبن کە بە مێینەیان دائەنان و ئەیان وت کچی خوان، بەهۆی ئەوەوە ئەیانپەرستن، ئینجا ئەو ئەفسانەیە لەناو کۆڕ و جەماوەردا فەرامۆش کراو یەکسەر ئەو بتانە ئەپەرستران بێ نیازی مەلائیکە مەگەر چەند کەس تاکە تاکەیەك ئەو ئەفسانەی لە بیر مابوو پەرستنەکەی بەو نیازەوە بوو.

أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾

---

**جا كاتىٰ ئەو پرسيارەی كرد لیٰ يان بە شێوەی سەرسام كردن و تەشەر لێدان و ئابڕوو بردن، ئينجا پاش ئەوە ئەم پرسيارەی تريشی هێنا بە دوای دا بە شێوەی لاقرتی پیٰ كردن و بێزاری دەربڕين: ﴿أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ * تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ﴾ ئايا بە گوێرەی ويست و بڕياری ئێوە هەر ئەبیٰ خۆتان هەر كوڕتان هەبیٰ و خوا بەس كچی هەبیٰ؟ ئەو دابەش كردنی ئێوە دابەش كردنێكی ناڕەوا و پێچەوانەی ڕاست و دادە.**

**ئەو بیٰ باوەڕانە – وەكو چەند جاری تر وترا – پەيدا بوونی كچيان بە لەكەو سەرشۆڕی سەير ئەكرد لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە بیٰ شەرم و بیٰ ئابڕوو بوون كچيان بۆ خوا ڕەوا ئەدا، جا لێرەدا خوای گەورە ڕێگەيان لیٰ ئەگریٰ و هەر بە پێی فام و تێگەيشتنی خۆيان ئەيانباتەوە بە خۆيان دا و بەو جۆرە بە شێوەی لاقرتی و ئابڕوو بردن ئەو پرسيارو وتەيەی ڕوو تیٰ كردن ئەگەر نا ئەو باوەڕەی ئەوانەو ئەو شتانەی كە باوەڕيان پێی هەبوو هيچيان هيچ نەبوون بەڵكوقسەوناوی ڕووتی بیٰ ناوكن، وەكوئەفەرمویٰ: ﴿إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾ ئەو لات و عوزاو بتانە لە بابەت پەرستنەوە، هەروەها ناونانيان بە پەرستراوو ناونانيان بە مەلائيكە و ناوبردنی مەلائيكە بە مێينەو ناوبردنيان بە كچانی خوا ئەمانە هيچيان هيچ شتیٰ نين جگە لە ناوێكی ڕووت كە خۆتان و باوك و باپيرتان لێتان ناون بیٰ ئەمەی خوا بەڵگەو نيشانەيەكی هێنابێتە خوارەوە لەسەريان و هەر شتێكيش خوا بڕياری نەدا نييە و نرخی نييە.**

**تا ئێرە ڕووی فەرمودەی تیٰ كردن بە تەشەرو لاقرتی و ئابڕوو بردنەوە، ئينجا ڕووی فەرمودەيان لیٰ وەرئەگێڕیٰ و بە شێوەی غائيب لیٰ يان ئەدویٰ، بەم جۆرە بیٰ نرخييان ڕوون ئەبێتەوە، ئەفەرمویٰ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾ ئەوانە لە بابەت عەقيدەو ئايينەوە**

شوێنی هیچ شتێ نەکەوتوون جگە لە گومانی خۆیان و ئەوەی نەفسیان ئارەزووی ئەکات، واتە ئەو ئایینەی کە وان لەسەری لە رووی زانینەوە نی یە و هیچ بەڵگە و نیشانەیەکیان بەدەستەوە نی یە و دڵنیا نین پێی، بەڵکو بە گومان و دوو دڵی یەوە شوێنی نەفسی خۆیان کەوتوون، خۆ ئایین و عەقیدەش ئەبێ لە رووی زانین و دڵنیایی تەواو بێت و بەڵگە و نیشانەی بەهێزیش هەبێ لەسەری، ئەمانە هیچ عوزرو بەهانەیەکیشیان بەدەستەوە نی یە، چونکە خوای گەورە رێگای راستی پیشان داون وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ بێگومان لەلایەن خوای خۆیانەوە رێنموونی یان بۆ هاتووە، ئینجا بە بێزاری یەوە ئەم پرسیارە ئەکات، ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ﴾[1] واتە وازبێنە لەو بارو حاڵەیان کە باس کرا.

ئایا ئادەمی واتە ئەوەی کافرە – هەر ئاواتێکی خواستبێ بۆی فەراهەم دێت؟ واتە ئەو بێ باوەڕانە بە تەمای تکاو لاڵەی ئەم بتانەن یان بە تەمای ئەوەن ئەڵێن: ئەگەر زیندوو بکرێینەوە پاشەڕۆژی باشمان هەیە لای خوا، بەڵام ئەوەی ئەوانە بە تەماینی بۆیان نابێ، ﴿فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ﴾ چونکە رۆژی دوایی و ئەم جیهانە تەنها هی خوایە و هەموو کاروباریان وا لە ژێر چنگی توانا و دەسەڵاتی خوادا، کەواتە هەموو شتێ بە دەستی خۆیەتی هەرچی بدا بە هەرکەس ئەیداتێ و هەرکەسیش بێبەش بکات ئەیکات، بێگومان ئەو کەسەی لەم جیهانەدا گوێڕایەڵی نەکات و دژو پێچەوانەی ئایینی و فەرمانی بجوڵێتەوە لەو جیهان بێبەشی ئەکات بە پێی هەڕەشە و بڕیاری خۆی، کەواتە ئاوات و ئومێدەکەیان هیچی تێدا بەسەر نی یە و زۆر بێ جێ یە، چونکە ئەوانەی ئەوان ئەیانپەرستن هەندێکیان تکاو لاڵەیان لێ ناگونجێ وەکوداروبەردومانگ وڕۆژوئەستێرە، هەندێ تریان لاڵەناکەن ئەگەرلاڵەش بکەن وەرناگیرێ وەکو جن و شەیتان، هەندێ تریان کە ئەگونجێ لاڵە بکەن و لاڵەیان وەرگیرێ وەکومەلائیکەئەوانە لاڵە بۆ ئەو کافرانە ناکەن، بیانەوێ هەر لاڵەیەکیش بکەن بێ ئیزنی خوا ناتوانن بیکەن و خواش ئیزنی لاڵە نادات بۆ دوژمنانی خۆی. بێجگە لەوەش تکای مەلائیکە بۆ هیچ کەسی ترو بۆ هیچ شتێ تریش سوودی نی یە کاتێ نەبێ کە خوا ئیزن بدات،

---

[1] وشەی ﴿أم﴾ مونقەتیعەیە بە مەعنا ﴿بل﴾ و ﴿أ﴾ ی پرسیارە، ﴿بل﴾ بۆ وازهێنانە لە وتەی پێشوو گواستنەوە بۆ مەبەستی ترو پرسیارەکەیش لێرەدا ئینکارو بێزاری یە لەوەی پرسیاری لێ کراوە.

۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٢٩﴾

---

وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾ زۆر مەلائیکە هەن لە ئاسمانەکان دا کە تکاو لاڵەیان سوودی هیچ شتێکی نی یە مەگەر پاش ئەوە خوا ئیزن بدات بۆ هەرکەسێ خۆی بیەوێ و رازی بێت بەو تکاو لاڵەیە کە بیکات، یان بۆی بکرێ، ئەو باوەڕەی ئەوانەو ئەو ئاواتەیان هیچ بنەڕەتێکی نی یە و وەکو خەیاڵ پڵاوی رووت وایە، ئینجا هەمیتر ئەکۆڵێتەوە لە باوەڕی پڕووپووچی ئەو بت پەرستانە دەربارەی مەلائیکە، بنەڕەتی بێ هێزی و لاوازی ئەو باوەڕە پووچەیان روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ *وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـًٔا﴾ بێگومان ئەو بت پەرستانە کە باوەڕیان بە رۆژی دوایی نی یە بە ناوی مێینەوە مەلائیکە ناوئەنێن، واتە بە کچیان ناو ئەبەن و ئەوانە هیچ جۆرە زانین و ئاگاداری یان نی یە بەو وتەی خۆیانەوە، لەو وتەیانەدا شوێنی هیچ نەکەوتوون جگە لە گومان و خەیاڵی خۆیان، واتە لە رووی زانین و دڵنیایی یەوە ناڵێن، هیچ بنەڕەتێکی راستەقینەیان نی یە، گومانیش هیچ جۆرە نرخ و سوودێکی نی یە لە بابەت ئەو حەق و راستی یەی ئەم قورئانە بۆی هێناون و ئەوان ئەکەوتنە سەری و شوێنی خەیاڵ و گومانی پڕووپووچی خۆیان کەوتن.

پاش ئەوەی پڕووپووچی بیروباوەڕی ئەو بت پەرستانەی روون کردەوە، ئینجا رووی فەرموده ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) بەمەی گوێ نەدا بەو گومڕایانە و پشتیان تێ بکات و لێ یان

گەڕێ بۆ ئەو خوایەی کە بە دەستی ئەوە هەموو کاروباری هەردوو جیهان، ئەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَوٰةَ الدُّنْيَا ﴾ ئینجا تۆیش ئەی پێغەمبەر واز بێنە لە بانگ کردنی ئەوکەسەی کە پشتی کردووەتە قورئانی ئێمە و هیچی تری ناوێ جگە لە ژیانی دنیا، هیچ گوێت نەبێ لەو کەسە و نرخی مەدەرێ.

ئەم فەرمانەی خوا لە یەکەم جارەوە روو ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا لە پاش ئەو روو ئەکاتە هەموو موسڵمانێ کە تووشیان ببێ بە تووشی ئەو جۆرە گومڕایانەوە کە پشت ئەکەنە ئایینی خواو ئیمان هێنان، هەموو ئامانج و مەبەستێکیان تەنها ژیانی ئەم جیهانەیە و هیچ باوەڕیان نی یە بە زیندوو بوونەوەو رۆژی دوایی، لایان وایە مەبەست لە بوونیان لەم جیهانەدا تەنها ئەو ژیانەیە و ئیتر پاش ئەوە ژیانی تر نابێ.

یەکەمین کەسێ کە هەڵگری ئەم باوەڕە ناڕەوایە بێ لەم چەرخی ئێمەدا خاوەنی مەزهەبە مادیەکانن، بەڵام ئەو کەسەی کە ئیمانی رێك و پێکی هەیە بەخواو بە رۆژی دوایی ناتوانێ دڵی خەریك بکات بەو جۆرە بێ باوەڕانەوە چ جای لەگەڵیان بژی و رەفتاریان لەگەڵ بکات، چونکە ئەم دوو تاقمە هەریەکە بەرنامەیەکی جیاوازیان هەیە لە ژیان دا، هەرگیز یەك ناگرن و یەك هەنگاو پێکەوە ناڕۆن و لە تەنها نوختەیەك دا یەك ناکەون، کەواتە ناگونجێ ئەم دوو تاقمە هیچ جۆرە کۆمەکی و یارمەتی یەك ببێ لە نێوانیان دا و هیچ بەشداری یەك لە هیچ کارو فرمانێکی ئەم جیهانەیان دا، دەی کاتێ کۆمەکی و هاوکاری ئەگونجێ لە نێوانیان دا ئیتر هیچ هۆو پاڵ پێوەنەرێك نی یە بۆ گوێ پێدانی ئیماندار بەوانەوەو خەریك بوونی دڵیان پێ یەوە. هەر خەریك بوونێ بەکاربهێنرێ پێ یانەوە شتێکی خۆڕایی یەو بەخت کردنی توانایە لە شتێك دا کە جێگای خۆی نی یە. بێجگە لەوەش خەریك نەبوون بەوانە و گوێ پێ نەدانیان بێ نرخی و ریسوایی یان پیشان ئەدات کە ئەوەش شتێکی زۆر راست و بەجێ یە، چونکە ئەوانە بێبەشن و پچڕاون لە حەق و راستی.

نەگەیشتوون لە ناوەڕۆك و حەقیقەتی شت، ئەوەی ئەوان پەییان پێ بردبێ بریتی یە تەنها لە ژیانی ئەم جیهانە، وەكو ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ﴾ ئەوەی فام و زانینی ئەوانی پێگەیشتبێ تەنها ژیانی دنیایە و لەوە تێپەڕی نەكردووە، ئەوەش شتێكی بێ نرخە هەرچەند بە گەورەو نرخدار تەماشا بكرێت، كەم و كورە هەرچەند بە تێرو تەواو دابنرێ، سەر تێك دەرو گومڕا كەرە هەرچەند بە ڕێنموونی كەرو هۆی بەرزی و پێشكەوتن سەیر بكرێ. هەركەسێ دڵ و هەست و ژیریی خۆی ببەستێ تەنها بە ژیانی ئەم جیهان و زەوی یەوە ئەو كەسە زانینێكی نی یە كە نرخی هەبێ، چونكە ئاشكرایە، بێجگە لەم جیهان و زەوی یە ئەو كەسە زانینێكی نی یە كە نرخی هەبێ، چونكە ئاشكرایە، بێجگە لەم جیهان و زەوی ئێمە ئەم بوونەوەرە گرنگە هەیە كە ئەندازێكی تری بەچاو ئەبینرێ دەی ئەم بوونەوەرە گەورە زۆر گرنگە خاوەن یاسا و رژێمە تێرو تەواوە، بێگومان خۆی خۆی دروست نەكردووە، پەیدا بوونیش بە ڕێكەوت هیچ ژیریی یەك وەری ناگرێ، كەواتە ئەبێ باوەڕی بەهێز ببێ بەمەی كە ئەم بوونەوەرە تەنها لەبەر ئەم ژیانی جیهانە دروست نەكراوە، چونكە ئەم ژیانە كەم و كورتە شایانی ئەوە نی یە بكرێ بە مەبەست و دواترین ئامانج لە دروست كردنی ئەم بوونەوەرە گرنگە، كەواتە پەی پێ بردن و گەیشتن لەم بوونەوەرە بە ڕێكی ئیمانی بەهێز فەراهەم ئەهێنێ بە داهێنەرەكەی، هەروەها بە ڕۆژی دوایی و جیهانێكی تر كە نەبڕاوە بێت ئەگەر نا ئەبێ لە خۆڕایی و بێ سوودێكی بە نرخ ئەم بوونەوەرە دروست كرابێ و ئەو كاتە ئەبێ ئەم چاكە و خراپە و تاوان و دەست درێژیی و بەش خوراوی یە، ئەمانە هەموو بێ لێپرسینەوە و پاداشت و تۆڵە بڕوا، دیارە ئەوەیش بە هیچ كلۆجێ ناگونجێ، چونكە پێچەوانەی لێزانی و كاردروستی و دادی خوایە. كەواتە پێویستە خۆ خەریك نەكردن و گوێ پێ نەدان بەو كەسانەی كە ڕوو وەرئەگێڕن و گوێ نادەن بە زیكرو یادی خواو ئەوەستن تەنها لە سنوورو چوارچێوەی ئەم جیهانەو ژیانی ئەم جیهانەدا لەبەر ئەوەی خەریك بوونەكە و بە گرنگ گرتنەكە بێ جێ نەبێ، لەلایەكی تریشەوە با سووك و ڕیسوایی و بێ نرخی ئەو گومڕایانە ڕوون بكرێتەوە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾

بێگومان خوای تۆ زاناترە لە هەموو کەس بەو کەسەی کە گومڕایە و لای داوە لە ڕێگای خوا، وە زاناترە بەو کەسەی کە ڕێنموونی وەرگرتووەو کەوتووەتە سەر ڕێگای ڕاست لەبەر ئەوە فەرمانی دا کە خۆت بەوانەوە خەریك نەکەیت، گوێ یان پێ نەدەیت، نرخ نەدەی بەو زانینە کەم و کورەیان کە وەستاوە لە سنووری ئەم جیهانەدا، بووە بە بەرهەڵست لە نێوان ئەوان و ئیمانیان بە خواو ڕۆژی دواییدا.

ئەو زانین و زانیاری یەی کە ئەو کۆمەڵە هەیانە لە پێش چاوی ئەمان زۆر شتێکی گرنگ و گەورەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەوانە گومڕاو نەزان و ناتەواون، چونکە هەموو زانین و زانیاری یە پێویستی هەیە بە دوو شت بێ ئەو دووانە زانینی ڕاستەقینە نی یە و کارناکات لە ژیانی ئادەمی، ژیانی پێ بەرزو خاوێن نابێ، هەر زانینێ ئەو بەرهەمەی نەبێ بێ نرخە، چونکە زانین و زانیاری وا ئەبێتە هۆی پێشکەوتنی کەرەسەو ئامێرەکان و هەر زانینێکیش بەو جۆرە بێت نەبوونی زۆر چاکترە لە بوونی، ئەو دوو شتەی کە وتمان پێویستە بۆ هەموو زانینێ بریتی یەلە:

١- پەیوەندی نێوانی ئەم بوون و بوونەوەرە لەگەڵ ئەو خوایە کە فەراهەمی هێناون.

٢- پەیوەندی نێوانی کردەوەی ئادەمی و پاداشت و تۆڵەی کردەوەکەیان.

هەرکات ئادەمی هەست بکات بەمەی خوایەکی هەیە کە خۆیشی و ئەم بوونەوەرەیشی دروست کردووەبەپێی یاساو ڕژێمێکی ڕێك وپێکی دامەزراو، هەرکات هەست بکات بێگومان هەستێکی جیاوازی بۆ پەیدا ئەبێ بەرامبەر ژیانی خۆی و ئەو جیهان و بوونەوەرەی کە تیایدائەژی، نرخ ومەبەست وئامانجێ بۆبوون و ژیانی خۆی دائەنێ. ئامانجێکی زۆر گەورەو فراوان وبەرز، چونکە ئەزانێ کە بوون و ژیانی خۆی بەستراوە بەو بوونەوەرەوە کە گەورەترو گرنگ ترە لە خۆی و هەموو گەل و تیرەو چین و نیشتمان و هەموو کاروباری ئەم جیهانەی.

هەرکات ئادەمی هەست بکات بەمەی کە ئەو خوایە لێپرسینەوە و تۆڵە و پاداشتی هەیە لە ڕۆژی دواییدا. هەرکات ئەو هەستە جێگیر و دامەزراو بوو لە دەروونی دا بێگومان ئەو کاتە تێگەیشتن و زانینی تری بۆ فەراهەم دێت زۆر جیاوازە لەو کەسەی کە بێ بەشە لەو هەستە، بە تەرازوویەکی تر شت بەراورد ئەکات، مەبەست و ئامانجێکی زۆر بەرزی ئەبێ، لە

دەروونیدا پاسەوانێکی وریای بەهێز پەیدا ئەبێ بەرگری ئەکات لە خراپەو تاوان، پاڵی پێوە ئەبێ بۆ خووڕەوشتی پاك و خاوێن و کردەوەی شیرین کە هۆی رزگارین لە سزاو مایەی سەربەرزی و نازو رێزی رۆژی دوایین: ئەو رۆژەی کە نیشتەجێ یە و پاشەرۆژی ئێجگاری هەمووانە، لە لایەکی ترەوە زۆر دڵ ئارامە و پشت پڕە بەو رێگە راستە و بەو بارە رێکەی کە داویەتە بەرو لەسەریەتی، ئەزانێ زاڵ بوون و سەرکەوتن مسۆگەرە بۆ چاکان و پاکان لەو جیهان و ئیتر با لەم جیهانەدا بە لێقەوماو و پەك کەوتوو تەماشا بکرێ، هەروەها خاوەنی ئەم هەستە پاکە ئەزانێ کە پێویستی سەرشانی یەتی هەوڵ دان بۆ چاکە و تێکۆشان لە پێناوی چاکەدا ئیتر هەرچی بێتە رێگا و هەرچی بەسەر بێت لەم جیهانەدا، چونکە پاداشتی تێرو تەواو و راستەقینە لەو جیهانە، ئەبێ هەر ئەوەش بە ئامانج دابنرێ، بێگومان باوەڕ بە خواو رۆژی دوایی زۆر گرنگە، بنەڕەتە بۆ ژیانی پاك و خاوێنی ئادەمی، پێویستی یەکە گرنگ ترو گەورەترە لە پێویستی خۆراك و پۆشاك، چونکە بە بێ ئەو باوەڕە ئادەمێتی نابێ و ناگونجێ، واتە ئەگەر ئەو باوەڕە هەبوو ئادەمێتی هەیە ئەگەر نەبوو ئەو بێ باوەڕە گیانلەبەری ترە پەست تر لە گیانلەبەرەکانی تر، کەواتە ئەم دوو کۆمەڵە: کۆمەڵی خاوەن ئیمان و باوەڕ بە خواو رۆژی دوایی و کۆمەڵی بێ باوەڕ بەو دووانە. ئەم دوو کۆمەڵە هەرگیز لە هیچ شتێکدا کۆنابنەوەو یەك ناگرن، بەهۆی ئەوەوە هاوڕێ یەتی و هاوبەشی و کۆمەکی ناگونجێ لە نێوان ئەم دوو کۆمەڵەدا، کەواتە بە گرنگ گرتن و خەریك بوونی ئیمانداران بەو کۆمەڵەوە زۆر بێ جێ و ناڕێکە، تەنها فەرمودەی خوا بە جێ یە کە فەرموی: ﴿ فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴾. ئینجا باوەڕ بە رۆژی دوایی بەهێز ئەکات لە دڵ و دەروونندا بەم فەرمودە: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەمووی دروست کراوی خوایە و موڵکی خوایە، کەواتە دەسەڵاتی هەیە بەسەر تۆڵە سەندن و پاداشت دانەوەدا، ئەم جیهان و ئاسمان و زەوی یەی دروست و رێك و پێك کردووە بۆ ئەمەی ئەوانەی تاوان و خراپەیان کردووە لەم جیهانەدا تۆڵەیان لێ بسێنێ بە وێنەی کردەوەکانیان، ئەوانەی چاکەیان کردووە پاداشتیان بداتەوە بە شیرین ترو چاکتر لەوەی کردوویانە.

وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِي تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾

---

**ئینجاکۆمەڵی چاکان دیاریی ئەکات لێرەدابەم فەرموەیە:﴿ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾[1] ئەوانە کەسانێکن کە خۆیان دوور ئەگرن لە هەموو گوناهە گەورەکان بە تایبەتی ئەو گوناهە گەورانەی کە زۆر ناشیرین و خراپن وەکو قەتڵ و زینا، واتە بە مەرجێ ئەو پاداشتە ئەدرێنەوە کە دوورکەونەوە لەو گوناهە گەورانە بەڵام دوور کەوتنەوە لە گوناهە بچووکەکان مەرج نی یە﴿إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾ چونکە بێگومان خوای تۆ لێبوردنی فراوانە ئەبووری لەو گوناهە بچووکانە بەهۆی دوورکەوتنەوە لە گوناهە گەورەکانەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾[2] چەند رایەك هەیە لە دیاریی کردنی مەبەست بە گوناهە گەورەکان: هەندێ ئەفەرمون: ئەو حەوت گوناهەن کە لە حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیم دا هەیە، هاوبەشی بۆ خوا رەوا دان، سیحر بازی، قەتڵی ناحەق، خواردنی ماڵی هەتیو، سوو خواردن، راکردن لە رۆژی غەزادا. بوختان کردن بۆ ئافرەتی ئیمانداری داوێن پاك. هەندێ تر ئەفەرمون هەر گوناهێ بە تایبەتی هەرەشەی لێ کرابێ لە قورئان دا یان لە حەدیسدا.**

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ﴿لم﴾ گوناهە بچووکەکانە و رای زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەیە ئەو کاتە ئیستیسناکە مونقەتیعەیە، رایەکی تر هەیە کە مەبەست ئەو گوناهە گەورانەیە کە یەکێ کردبێتی و زوو پەشیمان ببێتەوە لێ ی و نەگەڕابێتەوە سەری ئەو کاتە ئیستیسناکە موتەسیلە، ئەمەیش هەر ئەگونجێ.

[2] واتە ئەگەر ئێوە دووركەونەوە لە گوناهە گەورەکان ئێمە گوناهە بچووکەکانتان دائەپۆشین و ئەیانسرینەوە.

هەندێ تر ئەفەرمون: هەر گوناهێ حەدو تۆڵەی ئەم جیهانەی لەسەر دانرابێ، رای بەهێز تر لەهەمووان ئەمەیە: هەر گوناهێ وا پیشان بدات کە خاوەنەکەی باوەڕی بێ هێزو لاوازەو گوێ نادا بە ئاینی ئەو گوناهە گەورەیە.

لەسەر ئەم رایە ٣٩ جۆر گوناهیان بە گەورە داناوە وەکو دیاریی کراون و ناوبراون لە کتێبەکانی ئوسولی فیقهدا، ئینجا کۆتایی ئایەتەکە ئەمێنێ بە باسی ئاگاداری و زانینی فراوانی خۆی بۆ ئەمەی بزانرێ کە ئەو تۆڵە و پاداشتە بە پێی زانین و ئاگاداری خوایە و خۆی باش ئەزانێ کێ شایانی چی یە؟ ئەفەرموێ: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾ خوا زاناترە بە ئێوە لە خۆتان و هەموو کەس زانین و ئاگاداری یەکەی بە هەموو کاروبارو کردارتان هەر لە پێشەوە بووە کاتێ کە لە یەکەم جارەوە دەستی کرد بە دروست کردنی ئێوە بەمەی ئادەمی باوکتانی دروست کرد لە خاك و هەم کاتێ کە ئێوە هێشتا بێچوو بوون لە سکی دایکتان داو رووناکی ئەم جیهانەتان نەدیبوو، ﴿فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾ کەواتە خۆتان بە پاك و خاوێن دامەنێن، وەسف و سەنای خۆتان مەکەن و بە بێ گوناهو تاوان خۆتان پیشان مەدەن، خوا خۆی ئەزانێ و ئاگادارە بەو کەسەی کە لە خوا ترسە و کردەوەی پاك و خاوێنە، واتە ماتوڵ خوا خۆی هەموو شت ئەزانێ و ئاگادار ترە لە هەموو کەس ئیتر هیچ پێویست نی یە بە قسەی کەس، بەڵکو زۆر بێ ئەدەبی و بێ شەرمی یە ئەو وەسف و سەناو خۆ پیشاندانە. لێرە بە دوای سورەتەکە هەمووی بریتی یە لە پێناسینی خواو پیشاندانی گەلێ لە نیشانە و بەرهەمی دەسەڵات و خواهیشی خوا بە شێوەیەك دەروون و ویژدان وریا ئەکاتەوە و داینەچڵەکێنێ بۆ مل کەچی و گوێڕایەڵی بۆ خوا. ئەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ * وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ﴾[1] ئینجا پێم بڵێ و هەواڵی کەسێکم

---

[1] لە یەکەم جارەوە باسی کەسێ ئەکات کە لە پاش باوەڕ هێنان هەڵگەڕاوەتەوە زۆربە ئەفەرمون: ئەو کەسە وەلیدی کوڕی موغیرەیە باوەڕی هێنا لە پاشان تانە و تەشەریان لێدا ئەویش وتی من ئەترسم لە سزای خوا، ئینجا یەکێ لە بت

بدەرێ کە هەڵگەڕایەوە پاش ئەوەی کە باوەڕی هێنا و کەمێ لەو سامانەی دا کە بڕیاری دابوو بۆ زامنەکەی ئیتر بڕی و کۆتایی لێ هێنا.

هەندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون مەبەست بەم کەسە یەکێکی تایبەتی یە کە هەندێ لە سامانی دا لە ڕێگای خوادا لەپاشان لەبەر مەترسی هەژاری کۆتایی هێنا. زەمەخشەری لە کشاف دا ئەیبڕێ بەسەر حەزرەتی عوسمان دا لەم ڕووەوە بەسەرهاتێ ئەگێڕێتەوە بێ ئەمەی لە سەرچاوەیەکەوە بیهێنێ، بێگومان هەرکەسێ عوسمان بناسێ و ئاگای لە دەست و دەهەنەی زۆرو فراوانی عوسمان هەبێ لە ڕێگای خوادا، شارەزا بێت لە باوەڕی بەهێزو تێگەیشتنی تێرو تەواوی عوسمان لە ئایینی پاکی ئیسلام.

هەرکەس بە باشی تێگەیشتبێ لە عوسمان و بە ڕاستی بیناسێ هەرگیز باوەڕ بەو بەسەرهاتە ناکات و ئەزانێ ئەوەی کە خاوەنی کشاف وتویەتی شتێکی پڕو پووچ و درۆیە و ماڵ گێڕانەوەو نووسینی نی یە. بێجگە لەوەش وشەی ﴿تَوَلَّىٰ﴾ وا پیشان ئەدات کە ئەو کەسە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە ئیتر چۆن ئەیبڕێت بەسەر کەسێکی وادا کە پایەیەکە لە پایە بەتینە بەهێزەکانی ئیسلام؟!!

هەرچۆنێ ئەگونجێ کە مەبەست بەم ئایەتە کەسێکی تایبەتی بێت هەروەها ڕەنگە مەبەست نموونەیەك بێت لە ئادەمی بە هەر جۆر بگیرێ زۆر جێگای سەرسوڕمانە، قورئان بە بۆنەی ئەم کەسە یان ئەم نموونەوە چەند شتێکی گرنگ لە بیروباوەڕەکانی ئیسلام پیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿أَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡغَيۡبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ﴾ ئایا ئەو کەسە غەیب زانە تا بەهۆی ئەوەوە بزانێ کە زامنەکەی سزای خوای لە کۆڵ ئەخات؟ واتە پشت بەستنی بە قسەی ئەو کابرا زۆر بێ جێ و ناڕەوایە،

---

پەرستەکان وتی: من زامنی ئەو عەزابەم بە مەرجێ تۆ بگەڕێیتەوە بۆ ئایینی باو باپیرت و هەندێ لە سامانم پێ بدەی، ئەویش بڕیاری داو هەڵگەڕایەوە لە پاشان ئەو ماڵەی بڕیاری دابوو هەمووی نەدا.

أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾

**﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ * وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ﴾ بەڵكو ئایا هەواڵی نەدراوەتێ بەوەی کە لە تەوراتی موسادا هەیە و هەروەها لە کتێبی ئیبراهیم دا هەیە ئەو ئیبراهیمەی کە هەرچی گرتبووە گەردن بەرامبەر بە خوای خۆی هەموو بەڕێکی و فراوانی بەجێ هێنا.**

**لێرەدا مەبەست بەوەی لەو دوو کتێبەدا بوو ئەمەیە: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ * وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾ هیچ نەفسێکی گوناهبار گوناهی هیچ نەفسێکی تر هەڵناگرێ و لە کوڵی ناخات، کەواتە هیچ کەس ناتوانێ گوناهی یەکێتر هەڵگرێ و بیخاتە سەرشانی خۆی، ئادەمی جگە لە کردەوەی چاکی خۆی هیچی تری بۆ نی یە، واتە هەرچۆنێ تۆڵەی تاوانی یەکێ لە یەکێکی تر ناسێنرێ هەروەها هیچ کەس پاداشتی کردەوەی چاکی یەکێکی تری پێ نادرێ. کەواتە نابێ هیچ کەس بخەڵەتێ و پشت ببەسترێ بە قسەی ئەو جۆرە کەسانە کە لە هەموو چەرخ و زەمانێك دا هەن و ئەیانەوێ خەڵکی هەڵخەڵەتێنن و لە ڕێگای ڕاست لایاندەن بەمەی ئەبن بە زامنیان لە ڕۆژی دوایی دا.**

**ئەم ماوەی ژیانی دنیا هەلێکە خوا داوێتی بۆ کۆشش و کردەوەی چاك. ئیتر کە مەردوم مرد هەلەکەی لە دەست ئەچێ و دواچۆڕی کردەوەی چاکی دێت جگە لەوەی لەم حەدیسەدا هەیە: ﴿إذا مات ابن آدم انقطع عمله إلا من ثلاث: من ولد صالح يدعو له أو صدقة جارية من بعده، أو علم ينتفع به﴾[1] ئەم سێ شتەیش لە ڕاستی دا هەر لە کردەوەی خۆی ئەژمێررێ، ئیمامی شافیعی و چەند کەسێکی تر لەم ئایەتەوە وەریان گرتووە کە خێرو سەوابی فاتیحە و قورئان خوێندن ناگات بە مردووان. چونکە لە کردەوەی خۆیان نی یە، لەبەر ئەوەیشە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی نەداوە بەوەو ڕێنموونی کەسی نەکردووە بۆی بە هیچ جۆرێك.**

---

[1] موسلیم لە سەحیحەکەی دا لە ئەبوهورەیرەوە.

نەبیستراوە کە هیچ کەس لە یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شتی وایان کردبێ، ئەگەر ئەوە سوودی ببوایە و چاکە بوایە ئەوان لە پێش ئێمەوە ئەیان کرد، ئەو کردەوەیانەی کە مەبەست پێیان پەیوەندی و نزیك بوونەوەیە لە خواوە بە عەقڵ بازی نابێ، بەڵکو ئەبێ بە رێگەی فەرمانی خوا یان پێغەمبەری لەسەر بێ، بەڵێ دوعاو خێرو سەدەقە ئەگات بەو کەسەی کە بۆی رەوانە ئەکرێ ئەمیش بە پێی بڕیاری هەموو پێشەوایان و حەدیسیشی لەسەرە بێگومان کردەوەی خراپ و تاوانیش لە پاش مردووەکە ئەمێنێتەوە لە سێ رێگاوە:

١- کردەوەیەکی خراپی داهێنابێ و لەپاش خۆی خەڵکی چاوی لێ بکەن و بەو وێنە رەفتار بکەن.

٢- بیروباوەڕێکی خراپی بەجێ هێشتبێ و خەڵکی گرتبێتی یە گەردن.

٣- شوێنی گوناهو تاوان وەکو مەلها و وێنەی و هەروەها هەر شتێ هۆی گوناهو بێ شەرعی بێت لە پاش خۆی بەجێ مابێ و ببێتە هۆی گوناهی خەڵکی.

ئەم دوو رستەیە بیرو باوەڕێکی زۆر گرنگ پیشان ئەدەن کە پێی ئەوترێ ﴿فردیة التبعة﴾ واتە هەموو کەس تۆڵە و پاداشتی تەنها بە گوێرەی کردەوەی خۆیەتی، لەبەر زۆر گرنگی هەر لە کۆنەوە ئایین و شەریعەتەکانی خوا هێناویانە و ئەوانەی کە بە ڕاستی پەیڕەوی ئایینی خوایان کردووە بە رێگەی باوەڕیان پێ هێناوەو رەفتاریان پێ کردووە، نەك وەکو کاربەدەست و میریی یەکانی ئەمڕۆ کە بە ناچاری دانیان پێدانا، کرا بە بەندێ لە بەندەکانی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڵام بە داخەوە بە دەم و نووسینی رووت بێ کردەوە، وەکو هەموو بڕیارەکانی تریان، ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوە کە هیچ کۆشش و کردەوەیەکی چاك بێ هودە ناڕواو هیچی ون نابێ و پاداشتی تێرو تەواوی وەرئەگرێ، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ * ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ﴾ بێگومان کردەوەی چاکی ئادەمی – واتە ئادەمی خاوەن ئیمان و باوەڕ – لەمەو پاش لە رۆژی دوایی دا ئەبینرێ و تەماشا ئەکرێ، ئینجا پاداشت ئەدرێتەوە بە پاداشتێکی زۆرو تێرو تەواوتر.

وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾

---

**ئا ئەمەیە نرخ دان بە ئادەمێتی!! ئا ئەمەیە عەدالەت و راستی، ئا ئەمەیە ئارام دان بە دڵ و دەروون لە بابەت دان نان بە هەموو کردەوەیەکی چاك و ون نەبوونی هیچ کردەوەیەکی چاك و پاداشت دانەوە بە زیادو بێ کەم و کورتی ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾ بەڕاستی دوا ڕۆژو گەڕانەوەی هەمووان لۆلای خوای تۆیە. کەواتە هیچ ڕێگایەك سوودی نی یە جگە لە ڕێگایەك کە بۆلای خوا ئەڕوات، هیچ پەنایەك نی یە جگە لەوەی ئەو ئامادەی کردووە لە بەهەشت دا، یان لە دۆزەخ دا، بێگومان جێگیر بوونی ئەم باوەڕە ئێجگار بەکارە لە گۆڕینی دڵ و دەروون و هەستی ئادەمی دا، چونکە کاتێ هەستی کرد کە کۆتایی و بڕانەوەی هەموو کارێ و هەموو کەس بۆلای خوایە ئەو کاتە ئەزانێ کە هیچ پەناو ڕاکردن و خۆشاردنەوە نی یە، کەواتە بیری خۆی پێوە ئەبێ و ئەکەوێتە هەوڵ و تێکۆشان بۆ ئەو پاشەڕۆژەی و چاوی دڵی ئەبڕێتە نیشتمانە ئێجگاری یە ئەبڕاوەکەی.**

**پاش ئەمەی دڵی ئادەمی ڕاکێشا تا گەیاندی یە ئەوپەڕی پلە و جێگای بڕانەوەی هەموو کاروباری ئەم جیهانەی، گەیاندی یە شوێنی گەیشتنی بە بەرهەمی کردەوەی ئەم ژیانەی، پاش ئەوە ئینجا ئەیگێڕێتەوە بۆ ئەم جیهانە و بۆ ئەم ژیانە هەندێ بەرهەمی خواهیشی خوای پیشان ئەدات لە هەموو قۆناغی داو لە هەموو بارو حاڵێکی دا ئەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴾ بەڕاستی خوا خۆی خەڵکی پێ ئەکەنێنێ و ئەیگریەنێ، لە ژێر ئەم فەرموودەدا چەند شتی گرنگ هەیە:**

**١- خوای گەورە لە ئادەمی دا ئەم دوو شتە تایبەتی یەی دروست کردووە: پێکەنین و گریان، کە دوو شتی نهێنین هیچ کەس نازانێ ئەم دووانە چۆنن و چۆن پەیدا ئەبن؟ چۆن ئەو حاڵەتە دەروونی یانە لەگەڵ ئەو کەرەسە و جیهازی لەشەدا یەك ئەگرن و پێکەوە ئەو گریان و پێکەنینە فەراهەم ئەهێنن؟**

٢- هۆی پێکەنین و گریانی فەراهەم هێناوە بە گوێرەی چەند شتێکی نهێنی یەوە بە شتێ پێکەنین دێت بە شتێ تر گریان دێت، هەندێ جار ئەمڕۆ پێکەنین دێت بە شتێ کە سبەی گریانی بۆئەکرێ، ئەمڕۆ گریان دێت بەشتێ کەسبەینێ پێکەنین پێ ی دێت هەر یەك شتەویەك ئادەمی یەولەبیریەتی وشێت نەبووەوبەڵکوبارو حاڵی دەروونی ئەگۆڕێ.

٣- لە یەك کات دا کۆمەڵێ ئەگریەنێ و کۆمەڵێ پێ ئەکەنێنێ، هەندێ جار کۆمەڵێ پێ ئەکەنێنێ بە شتێ کە کۆمەڵێ تر پێ ی ئەگریە.

شتەکە یەك شتە بەڵام بارو حاڵی کۆمەڵەکان جیاوازن ئەمانە هەمووی هۆی بیر لێ کردنەوەو سەرسوڕمانن لە کاری خوا، قورئان بە کورتی و سووك و ئاسان و ئەیخاتە دڵ و دەروونمانەوە، ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا﴾ بەڕاستی خوا خۆی خەڵکی ئەمرێنێ و زیندوو ئەکات بە زیندوو، واتە گیان ئەسێنێ و گیان ئەدات.

خوای گەورە مردن و ژیانی داهێناوە، ئەم دوو شتە هەرچەند بوونیان زانراو و ئاشکرایە، بەڵام هیچ کەس نازانێ ئەم دووانە چین؟ هیچ کەس نازانێ گیان چی یە؟ چۆن پەیدا ئەبێت بۆ زیندووەکە؟ لە کوێوە هات؟ چۆن هات؟ چۆن کاروباری گیانلەبەرەکان ئەبات بەڕێوە؟ هەروەها کەس نازانێ مردن چۆنە؟ پێش پەیدا بوونی چی یە و چۆنە؟ لە پاش نەمانی گیان چۆنە؟ ئەمانە هەموو شتێکی نهێنی نەناسراون تەنها بەدەست خوایە و خۆی ئەزانێ.

بە ملیۆنەها شێوەو جۆری مردن و ژیان پەیدا ئەبێ لە تاکە چرکەیەك دا لەناو گیانلەبەراندا جگە لە خوا کەس نازانێ چۆن دێت و چۆن ئەڕوات؟ ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ۝ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ﴾ خوا دوو جۆر و جووتی دروست کردووە: نێرو مێ لە دڵۆپە ئاوێك کاتێك ئەڕژێنرێ و تۆو ئەدرێتە ناو منداڵدان و جێگای تایبەتی خۆی.

بەڕاستی پەیدا بوونی ئەم نێرو مێ یە لەو ئاوە لە هەموو شت نایاب ترو زۆر تر جێگای سەرسوڕمانە. ئەو ئاوە لە لەش دەرئەچێ وەکو عەرەق و فرمێسك و چڵم و ئەو هەموو شتی ترە، بەڵام پاش ماوەیەك تەماشا ئەکەیت ئەو ئاوە بوو بە گیانلەبەرێکی ئادەمی، ئەو گیانلەبەرە دوو جۆرە بەشێکی نێرو بەشێکی مێ یە. ئایا ئەم شتە سەرسوڕهێنەرە چۆن پێك هات؟ ئەمە شتێکە – ئەگەر نەبینرایە – هەر بە خەیاڵیش دا نەئەهات، تا بیری لێ بکرێتەوە جێگەی خۆیەتی، ئایا ئەم ئادەمی یە بەم هەموو ئەندام و پارچە و کەرەسەوە چۆن جێگەی بووەوەو شارابووەوە لەناو ئەم دڵۆپە ئاوەدا؟ ئەم ئادەمی یە بە ئێسك و دەمارو گۆشت و پێست و موو نینۆك و شێوەو نیشانەکانی و ئەم هەموو هێزو وزە، ئایا ئەم هەمووە لە کوێ

و چۆن شارابووەوە لەناو ئەو سێڵەدا کە بە میکرۆسکۆب هەستی پێ ئەکرێ؟ بە تایبەتی ئەو شتانەی کە هۆو تایبەتین بە نێرو مێوە، ئەوانە لە کوێوە هاتن و چۆن فەراهەم هاتن؟ چۆن هەریەکە بە رێگای خۆیان دا هاتن و نەگۆڕان و تێك نەچوون؟

ئایا چ دڵێك خۆی پێ ئەگیرێ بەڕاستی بەرامبەر ئەم شتە نایابەو مل کەچی ناکات بۆ ئەو پەروەردگارەی کە ئەم ئادەمی یە نایابەی فەراهەم هێنا لەو نوختە ئاوە. بێگومان هەر دڵێ هۆش و گۆشی بە خۆی بێ خۆی پێ ناگیرێ چ جای سەرکەشی بکات و دان نەنێ بەو شتە راستەدا.

ئینجا لە دروست کردن و فەراهەم هێنانی یەکەم جارەوە ئەڕوا بۆ دووبارە کردنەوەی خەڵکی لە رۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ بەڕاستی لەسەر خوایە فەراهەم هێنان و دروست کردنەکەی تر، واتە خۆی بڕیاری داوە لەسەر خۆی کە پاش مردن خەڵکی هەمیتر زیندوو بکاتەوە.

ئەو فەراهەم هێنان و زیندوو کردنەوەی دووەمە هەرچەندە هەر نی یە بە پێش چاوەوەو شتێکی نهێنی و غەیبی یە ئێستا، بەڵام لە دروست کردنی یەکەم جارەوە بەڵگەی بەهێز هەیە لەسەر ئەمەی کە شتێکی گونجاوەو شایانی سەر لێ کردنەوە نی یە، چونکە ئەو کەسەی کە لەو نوختە ئاوە نێرو مێ دروست ئەکات، توانای هەیە – بێگومان – بەسەر دووبارە کردنەوەدا لەو ئێسکە رزیوانە. بێگومان ئەو ئاوە هیچ ئاساتر نی یە لەو ئێسکە رزیوانە. هەروەها بەڵگەی بەهێز هەیە لەسەر بەجێ یی ئەو دروست کردنەوەی دووەمە، چونکە ئەو سەرپەرشتی و چاودێریی یە گرنگە کە ئەو تەنها سێڵە ئەهێنێ بەو رێگا دوورو درێژەداو ئەو هەموو قۆناغەی پێ ئەبڕێ هەتا ئەیکات بەم ئادەمی یە سەرسوڕهێنەرە، ئەیکات بەم دوو جۆرە، نێرو مێ بۆ زۆر کردن و پەرە پێدان.

ئەم کارە گرنگە نابێ تەنها بۆ ژیانی ئەم ماوە کورتە بێت لەم جیهانەدا کە هیچ شتێکی تێدا تێرو تەواو نابێ، هیچ چاکەکارێ پاداشتی تەواوی چاکەکەی لەم جیهان و ماوە کورتەدا دەست کەوت نابێ، هەروەها خراپەکارو تاوانباریش تۆڵەی خراپە و تاوانەکەی لێ ناسێنرێ بە تەواوی، کەواتە پێویستە دروست کردنەوەو زیندوو کردنەوەیەکی تر کە هەموو کەس و هەموو شتێك بگات بە پلە و رادەی تێرو تەواوی خۆی. کەواتە فەراهەم هێنانی

یەکەم جار لە دوو رووەوە بەڵگە و نیشانەیە. ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ وَأَقۡنَىٰ﴾[1] بەڕاستی خوا خۆی مەیلی هەرکەسی ببێ دەوڵەمەندی ئەکات و پێویستی بەچی ببێ پێی ئەدات لە هەردوو جیهان دا، ئەو ماڵ و سامانەی کە راگیر ئەکرێن لەبەر گرنگی یان، ئەوانە هەموو خوا ئەیدات بە هەرکەسێك کە خوا خۆی مەیلی هەبێ.

خەڵکی بە سروشت چاوو دڵ ئەبڕێتە ماڵ و سامان ئەوا خوای گەورە چاوەڕوانی یەکەیان ئەگێڕێتەوە بۆ تاکە سەرچاوە راستەقینەکە کە خوایە بۆ ئەمەی بەندە لە هەموو کاروباری دا هەر خاوەنە راستەقینەکەی خۆی بناسێ.

دەوڵەمەندی چەند جۆرێکە بە هەر جۆر بگیرێ هەمووی لە خواوەیە و هەمووی بە مەیل و خواهیشی خوایە: دەوڵەمەندی و سامان، ساغی و تەندروستی، رۆڵە و نەوە، دڵ و دەروون، بیرو هۆش و زانین. ئازایی و چالاکی، پیشەسازی و زانیاری. گەورەترین و بە نرخترینی هەموو جۆرەکان بریتییە لە دەوڵەمەندی پەیوەندی بە یادی خواوە، خوا بە بەزەیی خۆی بەشدارمان بکات تیایدا، ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ﴾ بێگومان خوا خۆی شیعرایە. شیعرا ئەستێرەیەکە ئەڵێن قەبارەی بیست ئەوەندەی قەبارەی خۆر ئەبێ، رادەی رووناکی یەکەی پەنجا قاتە بە ملی خۆردا، دووری لە خۆرەوە ملیۆن ئەوەندەی دووری خۆرە لە ئێمەوە. ئەم شیعرایە لە چەرخی نەزانی و بت پەرستی عەرەب دا زۆر بە نرخ سەیر ئەکا: هەندێ ئەیانپەرست و هەندێ چاوەڕوانی هەڵاتنیان ئەکرد بە چاوی رێزو نرخەوە.

جا لێرەدا باسی خوایەتی خوا بۆ ئەو شیعرایە هەرچۆنێ ئەو باوەڕە پڕو پووچە بە درۆ ئەخاتەوەو باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا جێگیر ئەکات، هەروەها باسەکە زۆر بەجێ یە لەم سورەتەدا کە لە یەکەم جاری یەوە سوێند بە ئەستێرە خوراوە، باسی رۆیشتن و گەردش کراوە بۆلای کۆمەڵ و شوێنی هەرە بەرز. کەواتە زیادە پەیوەندی ئەخاتە نێوان دوا دوایی و سەرەتای سورەتەکەوە. لێرەدا دوایی هات ئەو گەردشە دوورو درێژەی کە کرا بە دڵ و دەروون بە ناوچەکانی زەوی و ئاسماندا.

---

[1] بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: ١- رازی ئەکات بەو بەشەی ئەیداتێ. ٢- بێ نەواو هەژاری ئەکات.

وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ۩ ﴿٦٢﴾

**ئینجا ئەوا سەرنج رائەکێشیٚ و گەردشێك ئەکات بە دڵ و دەروون بەناو چەند چینیٚ لە گەلە پێشووەکان کە لە ریشە هێنران بەهۆی بیٚ باوەڕی یان بەو ترسێنەرانەی کە هاتنە سەریان لەلایەن خواوە، بەڵکو بیٚ باوەڕەکانی ئەم میللەتە تەمیٚ وەرگرن لەوانەی رابردوو، ئەفـــەرمویٚ:** ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ * وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ * وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ * وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ * فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ﴾ **بێگومان خوا هۆزی عادی پێشووی بەرباد کرد کە یەکەم گەلیٚ بوون لە ریشە هێنران پاش گەلی نوح [1] هەروەها هۆزی سەموودیشی بەرباد کرد بە جۆرێك هیچ تاوانبارێکی نەهێشتەوە لەم دوو تاقمە، گەلی نوحی لە پێش ئەمانەوە بەرباد کرد، بێگومان گەلی نوح ستەمکار تر بوون و سەرکەش تر بوون لە گەلی عاد و سەمود، شارو دێهاتەکانی گەلی لوط کە ژێراوژوور کران بە دانیشتوانە بیٚ باوەڕەکانی یەوە، ئەو شارو دێهاتانەی داخستە خوارەوە بە ناو ناخی زەوی دا لە پاش بەرزکردنەوەیان لە زەوی و جێگاکانیان، ئینجا دایپۆشین و کردی بەسەریان دا ئەوەی کە دای بەسەریان دا و کردی بە بەریان دا خۆڵ و بەردەباران، واتە ئەوەندە ناهەموارە باس ناکریٚ. بێگومان بەرباد کردنی شەڕو هێزی شەڕ، جێگیر کردنی خێرو هێزی خێر، لەناوبردنی تاوانباران و خراپەکاران و بەهێز کردن و یارمەتی دانی پیاوچاکان و چاکە کرداران.**

**ئەمانە لە نیعمەت و چاکە گەورەکانی خوان لەم جیهانەدا، لەبەر ئەوە لێرەدا ئەفەرمویٚ بە پێغەمبەر (ﷺ) یان بە هەریەکیٚ کە شایانی ئەوە بێت رووی قسەی تیٚ بکریٚ: ئەفەرمویٚ:** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ﴾ **ئینجا ئایا گومان و دوو دڵیت لە چ چاکەیەك دا هەیە لە چاکەکانی خوای خۆت؟ واتە نابیٚ و رەوا نی یە ئەو گومان و دوو دڵی یە، چونکە چاکەکانی خوا زۆرو**

---

[1] هەندیٚ ئەڵێن: دوو تائیفەعاد ناوبوون: ئەمەیەکەمیانە، دووەم ﴿إرم﴾ە کەلەسورەتەی ﴿الفجر﴾دا باسی ئەفەرمویٚ.

فراوان و ئاشكران. ئینجا دوا بەدوای لەناوبردنی ئەو هەموو تاقم و چینە لە گەل و میللەتە رابردووەكان، لەپاش نیشاندانی هەندێ لەبەرهەمی خوامیشی خوا، پاش ئەمانە ئینجا ئینزار و ترساندنێكی بەتین ئەدابە گوێچكەی خەڵكدا ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ * أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ﴾ ئەم پێغەمبەرە ترسێنەرێكە لە جۆری ترسێنەر و پێغەمبەرەكانی پێشوو كە بیستتان بەسەرهاتی سەخت و رۆژی رەشی ئەوانەی باوەڕیان پێ نەهێنان، ئەو شتە سامناكە كە ئەتان ترسێنێ پێی نزیك كەوتووەتەوە.

ئەو شتەی كە رۆژی دوایی یە بە نزیك دانراوە، چونكە زۆر نزیكە هاتنی كاتێ بەراورد بكرێ لەگەڵ ئەوەی تێپەڕی و رابردووە لە تەمەنی دنیا، یان نزیكە چونكە بێگومان دێت، هەر شتێ كە گومان نەبێ لە هاتنی دا بە نزیك دائەنرێ. ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾ ئەم رووداوە نزیكە بە جۆرێكە كە جگە لە خوا بەدەر هیچ كەسێ نازانێ كاتی هاتنی یان هیچ كەسێ دەسەڵاتی نی یە بەرگری بكات مەگەر خوا خۆی ئەویش بەرگری ناكات، بەڵكو بڕیاری هاتنی داوە، ﴿أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ * وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ؟ * وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ﴾ ئینجا ئایا ئێوە سەرتان سوڕ ئەمێنێ لەم قورئانە لەبەر ئەوە بە راستی نازانن؟ پێ ئەكەنن پێی بە جۆرێ لاقرتی یان پێ ئەكەن، ناگرین لە ترسی هەڕەشەكانی، لەبەر غەمی ئەو كەم و كورتی یە زۆرو فراوانەی كە هەتانە بەرامبەر ئەم قورئانە؟ واتە ئەو شتە سامناكە ئەو خەتەرو مەترسی یە گەورەیە لە رێگاتان دایە و لەگەڵ ئەوەدا ئێوە بەو شێوەن بەرامبەر بەم قورئانە كە رێنموونیتان ئەكات؟ ئێوە بێ ئاگا و بێ هۆشن ئەگەر نا لە چی سەرئەكەنەوە و سەرتان سوڕ ئەمێنێ؟ بەچی پێكەنینتان دێت؟ ئەبوایە ترس و سام داگیری كردنایە و بگریانایە، ﴿فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟﴾ كەواتە سوجدە بەرن بۆ خواو بیپەرستن و گوێڕایەڵی بكەن بۆی. كۆتایی سورەتەكەی هێنا بەم دوو فەرمانە كە گوێڕایەڵی بۆیان گرنگ ترین مەبەستی سورەتەكەیە، گەورەترین ئامانج و بەرزترین رادەو پلەیەكە كە بەندەكانی خوا پێی بگەن، تاقانە مەبەستە لە دروست كردنی ئادەمی و جن دا وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[1].

ئاسمانەكان و زەوی و هەموو ئەو شتانەی لە نێوانیاندایە سەرجەم كارو پیشەیان بەجێ هێنانی ئەم مەبەستەیە جگە لەوانەی كە لە رۆژی دوایی دا ئەبن بە سووتەمەنی دۆزەخ.

---

[1] واتە: من ئادەمی و جنم دروست نەكردووە بۆ ئەوە نەبێ كە بم پەرستن و گوێڕایەڵیم بكەن. الذاريات.

بێگومـان شـێوەی فەرماندانەکـە لێـرەدا بـە جۆرێکـە ئێجگـار کاریگـەرە و دڵ داچڵەکێنەرە، لەکاتی خۆی دا ئیشی خۆی کرد ئەوە بوو کاتێ پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەم سـورەتەی خوێنـدەوە بەسەر گەلی قورەیش داو گەیشتە ئەم کۆتایی یە هیچ کەس لە گوێ گران خۆی پێ نەگیراو هەموو بە یەکجار بە کافرو موسڵمانەوە سوژدەیان برد، تەنانەت وەلیدی کوڕی موغیرە کە لەبەر قەڵەوی نەیتوانی سوژدە بباو سەر بنێتە سەر زەوی چنگێ خۆڵی هەڵگرت و دای بە تەوێڵی دا، ئەم ڕووداوە شتێکە زۆر بەناوبانگە و بلاو بووەتەوە لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکان دا هەیە، بێگومان ڕاستە، هۆی سوژدە بردنی بت پەرستەکانیش ئەوە بوو کە ئەم قورئانە هێزو دەسەڵاتێکی زۆر گرنگ و بەتینی هەیە بەسەر دڵ و دەروون دا، گەلێ جار بە جۆرێك کاری کردووە لە هەندێ دڵ و دەروون سەر سوڕ ئەمێنێ و جگە لە سەرسامی هیچی تر نامێنێتەوە بۆ مەردوم، لە بابەت کارکردنی لە دڵی ئەو ستەمکارە سەرکەشانەدا چوار ڕووداوی ترمان باس کرد لە سورەتی ﴿السجدة﴾ دا با تەماشایان بکرێ و ئیتر پێویست ناکا بە دووبارە کردنەوەیان لێرەدا.

ئەوانە مەترسی یان لە ڕادەیەك دا بوو لە کاتی قورئان خوێندنی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەیانکرد بە هۆسە و چەپڵە لێدان و حیکایەت گێڕانەوەو شیعر وتن، بۆ ئەوەی گوێی لێ نەگیرێ تا کاریان لێ نەکات و باوەڕ بێنن[1] کەواتە ئەو سوژدە بردنە کە باسمان کرد ماق سەرسوڕمان وسەرلێ کردنەوەی نییە بەتایبەتی لە کاتێك دا قورئان خوێنەکە پێغەمبەر(ﷺ) بێت، بتوانێ بیخوێنێتەوە بەسەریان دا بەو ڕۆح و هەستەی کە پێی وەرگرتووە لە جوبرەئیلەوە، هەروەها ویستبێتی کە بە شێوەیەکی تایبەتی بیخوێنێتەوە بەسەریان دا بۆ کار لێ کردنیان، بێگومان زۆر جێگای خۆیەتی کە بەو جۆرە بیان گرێ و هەست و دڵ و دەروونیان داگیر بکات تا ئەو ڕادەیە خۆیان پێ نەگیرێ و بکەون بە ڕوودا بە سوژدە بردن بۆ ئەو خوایەی کە باوەڕیان هەبوو کە هەیە و ئەو دروست کەری ئەو ئاسمان و زەوی یەیە.

ئیبن و سەعدو ئیبن جەریر و هەندێ لە خاوەن تەفسیرەکان شتی تریان کردووە بە هۆی سوژدە بردنی بت پەرستەکان، ئەوەیش بە پێی چەند ڕیوایەتێك کە پێ یان گەیشتووەو لەناو ئەو ڕیوایەتانەدا ئەوەی کە ئیبن و ئەبی حاتەم ئەیلێ لە هەموویان درێژترو شتی پڕوپووچی کەمترە لەبەر ئەوە ئەم ڕیوایەتە ئەهێنین: ئیبن و ئەبی حاتەم ئەڵێ: لە موسای

---

[1] بانەماشای تەفسیری ئەم ئایەتەبکرێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ﴾ ﴿فصلت / ٢٦﴾.

کوڕی ئەبو موسای کوفەیی یەوە ئەویش لە محمدی کوڕی ئیسحاقی شەیبی یەوە ئەویش لە محمدی کوڕی فلیحەوە ئەویش لە ئەبو موسای کوڕی عوقبەوە، ئەویش لە ئیبن شیهابەوە کە ئەڵێ: بت پەرستەکان ئەیانوت ئەگەر ئەم پیاوە هەر ئەوەندە بە چاکە باسی ئەم بتانەی ئێمەی بکردایە ئێمە دانمان ئەنا بە خۆیشی و بە یارەکانیشی دا، بەڵام ئەو باسی ئەوانە ناڵێ کە دژو پێچەوانەی ئایینەکەیینی لە جوولەکە و نەسرانی بە وێنەی ئەو هەموو جوێن و قسە ناشیرینانەی کە باسی بتەکانی ئێمەی پێ ئەکات.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە سزاو ئەزیەتی بت پەرستەکان دەربارەی پێغەمبەرو یارەکانی – درودی خوا لەسەر ئەوو هەموو پێغەمبەران – باوەڕ نەهێنانیان ئێجگار بەتین بوو لەسەر شانی پێغەمبەر (ﷺ) بە گومڕایی یان زۆر دڵ غەمگین بوو بە هۆی ئەوانەوە ئاواتی بوو کە بێنە سەر ڕێگای راست، ئینجا کاتێ سورەتی ﴿النجم﴾ هاتە خوارەوە پێغەمبەر (ﷺ) خوێندی بەسەریان دا، کاتێ گەیشتە ئەو ئایەتانە کە باسی بتەکانیان ئەکات: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ...﴾ هتد لەو کاتەدا شەیتان چەند وشەیەکی وت لەناو بەناوی خوێندنەوەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەو وشەیانە چوون بە گوێی هەموو بت پەرستێك دا و بەس هەموو بە باشی رەوانیان کرد، وشەکان ئەمانە بوون: ﴿وانهن لمن الغرانيق العلى، و إن شفاعتهن لترتجى﴾ [1] ئینجا خۆشی کەوتە ناو بت پەرستەکان و وتیان: محمد گەڕاوەتەوە بۆ ئایینی پێشووی خۆی و ئاییینی قەومەکەی، ئینجا کاتێ گەیشتە دوایی سورەتەکە و خۆی سوژدەی برد بە جارێ هەموو سوژدەیان برد بە موسڵمان و کافرەوە، جگە لە وەلیدی کوڕی موغیرە ئەو لەبەر قەڵەوی و پیری نەیتوانی سوژدە ببات لەبەر ئەوە پڕی مشتی خۆڵی بەرز کردەوە سوژدەی لەسەر برد بە دانیشتنەوە.

موسڵمانەکان سەریان سوڕما لە سوژدە بردنی کافرەکان، چونکە ئەمانە ئەو وتارەی شەیتانیان نەبیستبوو کە بت پەرستەکان بیستبوویان، بت پەرستەکانیش لایان وابوو کە ئەو وتارە هینی پێغەمبەرە (ﷺ) لەبەر ئەوە بە دڵشادی یەوە سوژدەیان برد لەبەر ڕێزی بتەکانیان، ئینجا ئەم هەواڵە دەنگی دایەوە و بڵاو بووەوە تا گەیشتە حەبەشە، هەواڵ درا کە مەککەیی یەکان هەموو موسڵمان بوون و لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژیان کردووە، موسڵمانەکان هیچ مەترسی یەکیان نی یە لە مەککەدا، بەهۆی ئەوەوە ئەو موسڵمانانەی کە کۆچیان

---

[1] واتە: ئەو بتانە غەرانیقە بڵندەکانن، بەڕاستی تکاو نزایان جێگای ئومێد و چاوەڕوانی گیرابوونی ئەکرێ.

کردبوو بۆ حەبەشە بە چەسپانی بەرەو مەککە گەڕانەوە، پێش ئەوەی بگەنە بەرەوە خوای گەورە شتەکەی روون کردەوەو ئەوەی شەیتانی سڕی یەوە و قورئانەکەی خۆی روون کردەوەو جوێی کردەوە لەدەست هەڵبەستی شەیتان، لەو رووەوە بۆدڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئایەتی سورەتی ﴿الحج / ٥٢﴾ ی هێنایە خوارەوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾.

ئینجا بت پەرستەکان لەو ئارامی و ئاشتی یە هەڵگەڕانەوەو دەستیان کردەوە بە دوژمنایەتی و ئەزیەت دانی موسڵمانەکان و ئیشە ناڕەواکانی خۆیان، توندو تیژیی یان بەهێزتربوو لەسەر موسڵمانەکان، بەهۆی ئەوەوە ئەوانەی حەبەشە گەڕانەوە بۆ حەبەشە و نەیانتوانی بمێننەوە لە مەککەدا. دوایی هات ریوایەتی ئیبن و ئەبی حاتەم.

لەم بابەتەوە چەند ریوایەتێکی تر هەیە پڕووپووچی و دەلەسە و دەست هەڵبەستی یەکەیان ئاشکرا ترە، ئەو کەسەی هەڵیبەستووە زۆر نەزان و نەفام بووە، چونکە هەموو خاوەن ژیریی یەك ئەزانێ کە شتەکە درۆیە و دەست هەڵبەستە، پێویست ناکات لێرەدا ئەوەندە درێژە پێدان، جێگای ئەو درێژە پێدانە سورەتی ﴿الحج﴾ ە لە کاتی تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە کەمێ لەمەوپێش باسمان کرد. بە یارمەتی خوا لەو شوێنەدا درێژەی تەواو ئەدەین بەم مەسەلە. بەڵکو لێرەدا ئەمە ئەڵێین:

١- سەرجەمی ئەو ریوایەتانە باوەڕ پێکراو نین لای زانایانی حەدیس، لە هەر رێگایەکەوە هێنرابن ناچێتەوە سەر هیچ کەس لە یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوانەوە ئەم دەنگ و باسە وەرنەگیراوە، ئەم جۆرە ریوایەتانە پێ یان ئەوترێ (مرسل)، مورسەلیش ناکرێت بە بەڵگە مەگەر قوڵ گیرو یارمەتی دەری ببێ لەلایەن قورئان، یان حەدیسی سەحیح، یان بریاری پێشەواکانی موسڵمانان، ئاشکرایشە کە ئەم ریوایەتانە بێبەشن لە یارمەتی بەڵکو بێزراون لەلایەن کۆڕی پێشەواو زانایانەوە.

٢- ئەم وتارە دەست هەڵبەستە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ و جێگای نابێتەوە لەو شوێنەدا کە هەڵبەستراوە بۆی، چونکە سورەتەکە بە تێکڕایی، بە تایبەتی ئەو چەند ئایەتە، کە ئەو وتارەی تێکەڵ کراوە بە پێی ئەو ریوایەتانە. ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ... وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـٔٗا﴾ ئەمانە هەمووی باسی بێ نرخی و ناڕەوایی ئەو بتانە ئەکەن، پڕوپووچی بت پەرستی روون ئەکەنەوە کەواتە چۆن لە عەینی کات دا نرخیان پێ ئەدەن و رەوای بت پەرستی ئەدری؟!!

ئەو وتارە ناڕەوا بە هیچ رەنگ جێگای نابێتەوە لەم سورەتە و لەو شوێنەدا تەنانەت لەسەر ئەم ریوایەتەیش کە ئەڵێ: ئەم وتارە هینی شەیتانە و دای بە گوێی تەنها بت پەرستەکان دا، چونکە شەیتان شەیتانە و فرەزان ئەیزانێ کە ئەوە ئیشێکی بێ سوودو بێ هودەیە و کەس بە شتی وا ناخەڵەتێ، هەروەها بت پەرستەکان عەرەب بوون و چاك تێ ئەگەیشتن و حاڵی ئەبوون و هەرگیز شادمان و دڵخۆش نەئەبوون بەو وتارە، چونکە ئەمان وەکو ئەم ئیفتراچی یانە کەودەن و نازیرەك نەبوون، ئیتر چۆن دڵخۆش ئەبوون بەوە لەلایەکەوە سەنای بتەکانیان بکرێ و نرخ و رێزیان پێ بدرێ و لەلایەکی ترەوە بە پڕوپووچ دەرکرێن و بێ نرخی و ناڕەوایی یان روون بکرێتەوە؟!! خوا پەنامان بدات لە تێنەگەیشتن و نەفامی و نەزانی.

وصلى الله و سلم على سيدنا محمد و على آله و صحبه أجمعين.

تەواوبوو تەفسیری ئەم سورەتە بەیانی رۆژی جومعە ٢٧ ی شەوال ١٣٩٨ هـ – ١٩٧٨/٩/٢٩ م. داواکارین خوای گەورە وەری گرێ و یارمەتی بدات آمین، هەر لەم رۆژەدا دەستم کرد بە سورەتی ﴿القمر﴾.

# سورەتی «القمر»
# مەککەیی یەو ٥٥ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئـەم سـورەتە سـەرەتا بـە خـواری هێرشـێکی سـامناکی بەتینـە بـۆ سـەر دڵـی ئەوانـەی باوەڕیان بە ترسێنەران نییە، هەروەها ئارام دان و دڵنیا کردنێکی ئێجگار بەتام و بە نرخە بۆ دڵی ئیمانداروو باوەڕ هێنەرەکان، ئەم سورەتە بەش بەشە بە چەند زنجیرەیـەکی یـەك لـە دوای یەك، هەموو زنجیرەیەك شێوەیە لە سزای تاقمێ لە بێ باوەڕەکانی پێشوو پیشان ئەدات.

ئەو مەبەسـتانەی لـەم سورەتەدا هـەن لـە زۆر سورەتی تـری مەککەیی دا هـەن، بەڵام لـەم سورەتەدا بە شێوەو رەوشتێ تر باس کراون، پۆشاکێ تریان بە بەردا کراوە بە جۆرێك تـەڕو تازە کراونەتەوە، وەکو ئەمە یەکەم جاری بیستن و بینینیان بێ.

شتێ کەوا زیاتر تایبەتی یە و شێوەی مەبەستەکانی ئەم سورەتەی جیاواز کردووەتەوە ئەمەیە: حەوت زنجیرە لە بەسەرهاتی بێ باوەڕانی گەلە پێشووەکان باس ئەکات لە هەموو زنجیرەیەك دا دیمەن و شێوەیەکی ئێجگار سامناك لە سزای بەتینیان ئەهێنێتەوە پێش چاو بە چەسپانی و بە جۆرێ وەکو ئێستا کاتی ئەو رووداوو سزا سەختانە بێت، بێ باوەڕەکان وەکـو بـە چـاوی خۆیـان ببیـنن لـەو رۆژە تەنگـەدا بـە هەناسـەی سـارد و بـەو هـەموو داخ و مەراقـەی کـە دڵ و دەروون بـێ هـۆش و سـەرگەردان ئـەکات و گـەروو ئەهێنێتـە یـەك. لەگـەڵ شـێوەیەك لـەو شـێوە سـامناکانە دوایـی هـات مـاوە نـادات هەناسـەیەك دەرکـەن کـوت و پـڕ شێوەیەکی ناهەمواری تـر پیشان ئـەدات و لـە پێش چاویان حازرو بزری ئـەکات بـەم جۆرە هەتا هەر حەوت زنجیرەکە دوایی ئەهێنێ، ئینجا شێوەیەکی تری زۆر جیاواز پیشان ئەدات: شێوەی ئارامی و کامەرانی و خۆش بەختی لەخواترسەکان لـە رۆژی دوایـی دا، لـە کاتێك دا کـە تاوانبارەکـان بەسـەر روودا رائەکێـشرێن لـەناو ئـاگری دۆزەخ دا بـە ریـسوایی و تانـە و تەشەرو نائومێد کردنەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴿١﴾

قاپی سورەتەکە ئەکاتەوە بە باسی رووداوێکی زۆر گرنگی کەس نەدیو کە بە چاوی سەر بینرا، هەواڵ دان بە روودانی گەورەترین رووداوێك کە دێ بەسەر ئەم بوونەوەرەدا، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ هاتنی رۆژی دوایی نزیك بووە، مانگ لەت بوو، بوو بە دوو کەرتەوە، واتە نیشانەیەك لە نیشانەکانی نزیکی هاتنی ئەو رۆژە ئەمەیە کە مانگ بوو بە دوو کەرتەوە کە بە چاو بینرا، کەواتە چاوەڕوان بن بۆ هاتنی ئەو رۆژە کە ئەم نیشانە گرنگەی رووی داو بینرا.

لەبابەت ئەم رووداوی لەت بوونی مانگەوە لە چەرخی پێغەمبەردا (ﷺ) لە مەککە چەند حەدیسێکی باوەڕ پێکراو هەن لە چەند رێگایەکەوە هێنراون لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکان دا بڵاو بوونەتەوە: ئیمامی ئەحمەد و بوخاری هەریەکە لە رێگای خۆیانەوە ئەو هەواڵە ئەهێنن لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، هەروەها موسلیم و بوخاری لە رێگایەکی ترەوە ئەیهێنن لە ئەنەسەوە. ئیمامی ئەحمەد و بەیهەقی ئەیهێنن لە (حصین کوڕی عبدالرحمن) ەوە، ئیبن جەریر و بەیهەقی لە چەند رێگایەکی ترەوە لە جوبەیری کوڕی مونعیمەوە. ئیمامی بوخاری لە ئیبن عەباسەوە، بوخاری و موسلیم لە رێگایەکی ترەوە ئەیهێنەوە سەر ئیبن عەباس، هەروەها ئیبن جەریر لە رێگایەکی ترەوە لە ئیبن عەباسەوە. هەروەها عەوفی و تەبەرانی هەریەکە لە رێگای خۆیانەوە لە ئیبن عەباسەوە. بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە، هەروەها موسلیم و ترمزی لە موجاهیدەوە. ئیمامی ئەحمەد لە ئیبن مەسعودەوە، هەروەها بوخاری و بەیهەقی هەریەکە لە رێگایەکی ترەوە لە مەسروقەوە ئەیهێنن لە ئیبن و مەسعودەوە.

ئەم هەموو ریوایەتانە سەرجەم ئەو رووداوە بە رێکی باس ئەکەن و هەموو یەك قسەن لە باسی بەدی هاتنی ئەم رووداوەدا، کۆڕو جەماوەری زانایانیشی لەسەرە، کەواتە هەموو دڵنیاین لەمە ئەم رووداوە شتێکی راستە و بووە نەك لەمەوپاش روو ئەدات لەکاتی هاتنی رۆژی دوایی دا وەکو هەندێ وا ئەڵێن، قورئان لە کاتی خۆی دا بەم ئایەتە جاڕی دا لەناو ئەو بت پەرستە بێ باوەڕانەدا کە هەموو کات ئەگەڕان بە دوای شتێك دا بیکەن بە رەخنە، دەی لەگەڵ ئەوەدا نەبیستراوە لە هیچ کەسێکیانەوە ئەم رووداوە بخاتەوە بە درۆوە، کەواتە ئەبێ ئەو رووداوە بە جۆرێکی وا ئاشکرا بووبێ هیچ رێگای تەك و جمیان نەمابێ بەڵکو ئەوەی کە

وتبێتیان ئەمە بوو: کە محمد جادو سیحری لێ کردوین، بەڵام کە بەراوردیان کرد بۆیان دەرکەوت کە جادوو نی یە، چونکە ئەگەر جادوو بوایە، تەنها لەبەر چاوی ئەوان ئەبوو لە مەککەدا، دەی کەپرسیاریان کرد لە کەسانی تر لە دەرەوەی مەککە هەموو وتیان راستە و بە چاوی خۆمان دیومانە. بەس شتێ ماوەتەوە کەگرێ بێ: بەپێی هەندێ ریوایەت ئەو رووداوە لەسەر داواو پەڵپی بت پەرستەکان بووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) موعجیزەیەکیان پیشان بدات ئەویش ئەوەی پیشان دان، دەی ئەم ریوایەتە ناگونجێ لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە ئەفەرمون: پێغەمبەرمان (ﷺ) بەو جۆرە موعجیزانە رەوانە نەکراوە، واتە ئەو جۆرانە نەکراون بە نیشانەی پێغەمبەرێتی یەکەی، بۆ وێنە: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَ﴾[1].

هەروەها لە هەرکاتێك دا بت پەرستەکان پەڵپی هەر جۆرە موعجیزەیەکیان بگرتایە جگە لە قورئان بەرپەرچ ئەدرانەوە کە ئەو جۆرە شتانە لە سنووری فەرمانی پێغەمبەر بەدەرن، ئەگێرێنرانەوە بۆلای قورئان کە تاقانە موعجیزەی روون کەرەوەی پێغەمبەرێتی ئەم پێغەمبەرەیە(ﷺ) هەتادنیادنیایە. بەڵێ خوای گەورە شتی زۆر و زەبەندەی سەرسوڕهێنەری داوە بە پێغەمبەرمان (ﷺ) لە وێنەی موعجیزەی پێغەمبەرانی تر – سەلامی خوایان لێ بێت –، بەڵام ئەمانە هەموو زیادە رێزێك بووە لەلایەن خواوە بۆی و ئەوانە لەسەر پەڵپ و بەهانەی بێ باوەران نەبوون و نەکراون بە موعجیزە و نیشانەی پێغەمبەرێتی یەکەی، چونکە پێغەمبەرێتی ئەم بۆ کات و چەرخ و وڵاتێك نەبووە، بەڵکو بۆ گشتی و هەموو کاتێك بووە، کەواتە ئەبێ موعجیزەکەیشی بۆ هەموو کات و چەرخ و چینێك بێت. کەواتە ئەوەی کە وتراوە ئەم رووداوە – واتە لەت بوونی مانگ – لەسەر داواو پەڵپی بت پەرستەکان بەدی هاتووە، ئەو قسەیە ناگونجێ لەگەڵ دیمەنی وێنەی ئەو ئایەتەی کە کەمێ لەمەوپێش باسمان کرد.

بەکورتی ئێمە ئەبێ باوەرمان ببێ بەم رووداوە: واتە لەت بوونی مانگ لە چەرخی پێغەمبەردا (ﷺ) لە مەککە، بەڵام نالێین: هۆی ئەو رووداوە پەڵپی بت پەرستەکان بووە بۆ ئیمان هێنانیان. بەڵێ ئەتوانین مەبەست بەو ریوایەتانە بە جۆرێ بڵێین یەك کەوێ لەگەڵ ئەو

---

[1] واتە: هیچ شتێ بەرگری ئێمەی نەکردووە لە فەراهەم هێنانی ئەو جۆرە موعجیزانەی کە ئەو بێ باوەرانە داوای ئەکەن، هیچ بەرگری کەرێکمان نی یە جگە لەوەی بێ باوەرانی گەلە پێشووەکان باوەریان نەهێنا بەهۆی ئەو جۆرە موعجیزانەوە واتە ئەگەر ئەوانە فەراهەم بێنین ئەمانیش باوەر ناهێنن ئەو کاتە ئەبێ ئەمانیش وەکو ئەوان بەریاد بکەین و بریاری ئێمەیش لەسەر ئەوەیە کە ئەمانە وەکو ئەوان لێ نەکەین، کەواتە نابێ ئەم پەڵپ و بەهانەیان بەجێ بێنین.

ئایەتانەدا، بەم جۆرە بڵێین: کافرەکان داوای نیشانە و بەڵگەیان نەکردووە بۆ ئەمەی ئەگەر پەڵپەکەیان بەدی هات ئیمان بێنن، چونکە ئەگەر بەم جۆرە بڵێین یەك ناکەویٚ لەگەڵ وێنەی ئایەتی باس کراودا. وەکو روون کرایەوە لە تەفسیرەکەی دا لە داوێنەوە، بەڵکو ئەڵێین: ئەو بت پەرستانە هاتنی رۆژی دوایی یان زۆر بە دوورو نەگونجاو دائەنا لەبەر ئەوەی داوای نیشانەیەکیان کرد کە ببێتە بەڵگەیەکی روون لەسەر گونجاوی ئەو رۆژە ئەویش بە ئیزنی خوا ئەو نیشانە گەورەی پیشان دان کە زۆر بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە، چونکە هاتنی رۆژی دوایی بەوە ئەبیٚ کە ئەم مانگ و خۆر و ئەستێرە نەمێنیٚ و ئەم دنیایە تێك بچیٚ، ئەی ئەو لەت بوونی مانگە نموونەیەکی رێك و پێکە لەسەری[1]. بێگومان لەت بوونی مانگ، هەروەها هەر شتێکی تر دژو پێچەوانەی باوو عادەت کە پێ یان ئەوتریٚ ﴿الخوارق الحسية﴾ وەکو ئەو هەموو موعجیزانەی کە دراون بە پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێت – بۆ روون کردنەوەی پێغەمبەرێتی یەکەیان.

ئەمانە هەموو شتێکی سەرسوڕهێنەرن، دڵ و دەروون داگیر ئەکەن، بەڵام ئەگەر ژیریی تێرو تەواو بێت، دڵ کراوە بێت و چاوی بینا بێت، پێویست بەو جۆرە شتانە ناکات، چونکە هەموو شتیٚ لەم بوونەوەرەدا لە هەر بارو روویەکەوە بیری لیٚ بکرێتەوە چەندەها نیشانە و بەڵگەی بەهێزی سەرسوڕهێنەری تێدایە. بۆ وێنە با هەر مانگ بگرین بە دەستەوە: بێگومان لەت بوونی مانگ بە پێش چاوەوە ئێجگار شتێکی نایابی سەرسوڕهێنەرە، بەڵام مانگ خۆی لە خۆی دا شتێکی نایاب تر و سەرسوڕهێنەرترە!! ئەم ئەستێرەیە قەبارەکەی، شێوەو شکڵە شیرینەکەی، گۆڕانی رووی بە گوێرەی دوورو نزیکی لە خۆرەوە، گەردش و چەرخەی بە دەوری زەوی دا لەم بۆشایی یەدا بیٚ پایە و پاڵپشت و ستونیٚ، بڕینی ئەو مەنزڵانەی بۆی دیاریی کراوە بەو رژێم و یاسا نەگۆڕاوە، بەرهەمی لە ژیان دا بەسەر ئەم زەوی یە ئەمانە و وێنەی ئەمانە هەرکامیان بەڵگەیەکی تێرو تەواوو روون و رەوانە لەسەر کاردروستی و زانین و دەسەڵاتی بیٚ سنووری خوا، بەڵام ئەوانەی کە لەبەر عیناد و سەرکەشی لە سنووری ژیریی دەرئەچن، نایانەویٚ بە رێگای راست دا بڕۆن و سەر داخەن بۆ راستی، ئەوانە هەرگیز بیر ناکەنەوە لەم هەموو بەڵگە و نیشانە روونانە، دان نانێن بەو شتانەیش دا کە دژو پێچەوانەی باوو عادەتن، پێیان ئەوتریٚ خەواریق و موعجیزە وەکو لەت بوونی مانگ،

---

[1] ئەمە تەئویلێك بوو کەوتە دڵمەوەو لام وایە کە شتێکی جوانە و هۆی یەك کەوتنی هەموو ریوایەتەکانە لەنێوان خۆیان و لەگەڵ وێنەی ئەو ئایەتانەدا کە باس کران و زانینی لای خوایە.

﴿ وَإِن يَرَوْا ءَايَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ ﴾

---

بەڵکو بەم جۆرە کە لەم ئایەتەدا باس ئەکرێن: ﴿ وَإِن يَرَوْا ءَايَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴾ ئەگەر ئەوانە نیشانەیەکی روون ببینن کە رێنموونی یان بکات و بەڵگە بێت لەسەر راستی و حەقێتی ئەو ئایینەی کە پێغەمبەر هێناویەتی لەلایەن خواوە. ئەگەر شتێکی وا ببینن پشتی تێ ئەکەن و رووی لێ وەرئەگێڕن و ئەڵێن: ئەمە جادوو سیحرێکە هەمیشە محمد ئەیکات لێمان[1]. ئەو سەرکێشانە مانگیان بینی دوولەت بوو وتیان محمد جادوی لێ کردین، دەربارەی ئایەتەکانی قورئانیش هەروایان وت و هیچ تێفکرانیان نەبوو، ﴿ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ ﴾ داب و باویان هەروا بووەو هەروایە باوەڕ ناهێنن و شوێنی هەواو ئارەزووی نارەوای خۆیان ئەکەون و ئاوڕێ نادەنەوە بۆلای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە روونانە کە بە دوای یەکدا دێن وئەیان بینن. ئەوان ئەوەپیشەیان بوو، خوایش دڵنەوایی پێغەمبەری(ﷺ) کرد و هەڕەشەیشی لەوان کرد بەم فەرمودەیە: ﴿وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ﴾ هەموو شتێك و هەموو کارو فرمانی ئەگات بە شوێن و جێگای خۆی، دامەزراوو نیشتەجێ ئەبێ لە کات و شوێنی خۆیدا، واتە ئەی پێغەمبەر کاروباری تۆ ئەگاتە شوێنی خۆی و لەوێدا روون ئەبێتەوە کە تۆ لەسەرحەقی و جگە لەوەی تۆ گەیاندت نارەواو بەتاڵە، کەواتە موژدەکانی خوا بە پێغەمبەرو شوێن کەوتووەکانی، هەروەها هەموو پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان – سەلامی خوایان لێ بێت – ئەو بەڵێن و مژدەیانە هەموو بەدی دێن و جێگاو شوێنی خۆیان ئەگرن بەم رەنگە خوا یارمەتی یان ئەدات و ئایینەکەیان سەرئەخات لەم جیهانەدا، ئەیانخاتە ناو نازو نیعمەت و رێزی نەبڕاوە لە رۆژی دوایی دا، هەروەها هەڕەشەکانیشی دەربارەی یاخی و سەرکێشەکان و دوژمنەکانی ئایینەکەی پاشەڕۆژیان لەم جیهانەدا سەرشۆڕ کردن و بەرباد کردنە، لەرۆژی دواییدا دووچارکردنی سزای ئاگری دۆزەخە بێ بڕانەوە، خوا پەنامان بدات.

---

[1] وشەی ﴿مستمر﴾ بە چەند جۆرێکی تر تەفسیر کراوەتەوە: ١.بەهێزە.٢.نەڕواو نامێنێ. ٣.تاڵ و ناخۆشە. ٤.بەتاڵە. ٥.لە زەوی یەوە چوو بۆ ئاسمان. ٦.جۆرەکانی وەك یەك وایە.

وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ۘ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾ خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾ مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ ۖ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾ ۞ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾

---

ئینجا گومڕایی و کەلە ڕەقی یان ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ﴾ بەڕاستی هاتووە بۆ ئەو کۆمەڵە گومڕایە لەم قورئانەدا لەو هەواڵ و دەنگ و باسانەی کە هۆی تەمێ خواری و وازهێنانن لە تاوان و گومڕایی هەواڵی بەسەرهاتی وێنەی خۆیان لە بێ باوەڕەکانی گەلە پێشووەکان کە دووچاری ڕۆژی ڕەشی خۆیان بوون، هەروەها هەواڵی ڕۆژی دوایی و نازو نیعمەتی چاکان لەو ڕۆژەدا و سزاو بێ بەشی نەبڕاوەی بێ باوەڕەکان، هەواڵی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە بوونەوەری یانە کە چەند جارو بە چەند جۆر خوای گەورە ئەیانفەرموێتەوە، بێگومان ئەو هەواڵانە ئەوەندە گرنگن کار ئەکەن لەهەر دڵێ کە بینا بێت و دەست بدات بۆ چارەسەر کردن، ﴿حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ﴾ ئەوەی بۆیان هاتووە لەم قورئانەدا زۆر بەجێ یە و گەیشتووەتە ئەوپەڕی ڕادە لە ڕێك و ڕاستی و بەجێیدا، لە ڕێنموونی کردن دا بۆ ڕێگای ڕاست و ڕزگاری کەچی هەر باوەڕ ناهێنن، ﴿فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾ کەواتە ترساندن و ترسێنەران هیچ سوودێ ناگەیەنن و کار ناکەن لەو بێ باوەڕانە و هەرگیز باوەڕ ناهێنن، ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ﴾ ئینجا ئەی پێغەمبەر تۆیش وازیان لێ بێنە، واتە مادام ئەزانی کە هەوڵدان لەگەڵ ئەوانەدا سوودی نی یە تۆش خۆت خەریك مەکە بەوانەوە، گوێ یان مەدەرێ، چونکە تۆ هەر ئەو هەوڵ و ڕاگەیاندنەت لەسەرە.

ئینجا شێوەیەکی زۆر سامناك و ناهەمواری ڕۆژی دوایی ئەخاتە پێش چاو: شێوەی سام و ترس و سەرشۆڕی ئەو سەرکێشە بێ باوەڕانە ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ

نُّكُرٍ * خُشَّعًا أَبْصَـٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ * مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَـٰفِرُونَ هَـٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾[1] لە ڕۆژێك دا کە جارچی جاڕ ئەداو بانگی هەموو مردووان ئەکات بۆلای شتێکی زۆر ناخۆشی بێزراو کە قورس و گران و بەتینە لەسەر دڵ و دەروون، بانگیان ئەکات بۆ پرسیارو حیساب لەو هەموو کردەوەی ئەم جیهانە، لەو ڕۆژەدا بە چاو شۆڕی یەوە هەموو لە گۆڕەکانیان، بە چەسپانی دێن بەدەم بانگەوازی ئەو بانگ کەرەوە – کە ئیسرافیلە یان جوبرەئیلە – لە زۆری و کۆمەڵ کردن و چەسپانیان دا وەکو – کوللە – وان کە دێت و بە زۆری بڵاو ئەبێتەوە و وڵات داگیر ئەکات. لەو کاتەدا بەدڵی پڕ لە سام و غەم و بە هەناسەی ساردەوە کافرەکان ئەڵێن: ئەمە ڕۆژێکی سەخت و گرانە.

لەم کاتەدا کە ئەم شێوە ناهەموارەی ڕۆژی دوایی یەی هێنایە پێش چاو، ئینجا شێوەی چەند جۆرێ لە سزای ئەم جیهانەی بێ باوەڕەکانی گەلە پێشووەکان پیشان ئەدات بۆ ئەمەی بێ باوەڕەکانی ئەم میللەتە ترس و سام بیان گرێ و تەمێ خوار بن لە وێنەی خۆیانەوە.

لە گەلە سەرکێشە بێ باوەڕەکەی نوح پێغەمبەرەوە دەست پێ ئەکات (ﷻ) ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ﴾ لەپێش ئەمانەوە قەومی نوح باوەڕی نەهێنا بە پێغەمبەرێتی و ئایینی خوا، ﴿فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا﴾ بەهۆی ئەوەوە باوەڕیان نەهێنا بە بەندەی ئێمە کە (نوح)ە، بە درۆزنیان دانا، ﴿وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ﴾ وتیان شێتە. وەکو قورەیش ئەو وشە ناڕەوایانەیان بەکار ئەهێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَٱزْدُجِرَ﴾ ئەو بەندەی ئێمە بەرگری کرا لە گەیاندنی پەیامەکەی، هەڕەشەی لێکراو سزاو ئەزیەت درا بە چەند جۆرو شێواز.

ئەگێڕنەوە کە دەستیان ئەکرد بە لێدان و تاساندنی هەتا بێ خوو ئەکەوت، ئینجا وازیان لێ ئەهێنا. کاتێ کە هۆشی ئەهاتەوە ئەیوت: خوایە ڕێنموونی گەلەکەم بکەو بیانخەرە سەر ڕێگەی ڕاست، چونکە نەفام و نەزانن.

[1] بە گوێرەی تەفسیرەکە وشەی ﴿یوم﴾ زەرفە بۆ ﴿یخرجون﴾ تەفسیر کراوەتەوە بە چەند بارێکی تر هەموو هەر باشە و ئەگونجێ، بەڵام تەفسیرەکە بە گوێرەی زۆربەیە.

﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ (١٠) فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ (١١) وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ (١٢) وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ (١٣)﴾

---

ئینجا لەپاش ئەوە ناچار کرا گەڕاوە بۆلای خوا بە پاڕانەوەو لاڵەوە، داوای کرد کە تۆڵەیان لێ بسێنێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾ ئینجا نوح هاواری کردە لای پەروەردگاری خۆی بەمەی کە زۆر پێ هێنراوە، واتە: خوایە گەلەکەم زۆریان پێ هێناوم و بەرگریم ئەکەن لە راگەیاندنی ئەو فەرمانەی کە تۆ پێت سپاردوم، هیچ توانا و دەسەڵات نەماوە، کەواتە تۆڵەیان لێ بسێنە، تۆڵەیان لێ بسێنە لەبەر ئایینەکەت، تۆ خۆت تۆڵەیان لێ بسێنە، چونکە کارو فرمانەکە هینی خۆتە، ئایینەکە ئایینی خۆتە، من هیچم پێ ناکرێ و ئیشی من دوایی هات. ئینجا خوای گەورە نزاکەی وەرگرت و تۆڵەی سەند لەو گەلە ستەمکارە بەم جۆرە لافاو تۆفانی هێنا و هەمووی خنکاندن و بەربادی کردن لەم جیهانەدا، تا سەری کردن بە ئاگری نەبڕاوەی رۆژی دوایی دا، زەوی پاك کردەوە لەو تۆمە پیسە و نوح و شوێن کەوتووەکانی رزگار کرد لە سزاو عەزابی ئەو گەلە پیسە، وەکو لەم چەند ئایەتەدا باسیان ئەفەرموێ: ﴿فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ﴾ نوح نزاو هاواری لێ کردین، ئینجا ئێمەیش قاپی یەکانی لای ژووروی ئاسمانمان کردەوە بە ئاوێکی زۆری بەهێز کە بە تەوژم بڕژێ و بێتە خوارەوە بەسەریان دا، ﴿وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا﴾ زەویمان هەڵقوڵاند، بە چەندەها کانیاو و چەشمە، واتە لەسەرداو لە ژێردا ئاومان بەرەڵا کرد بۆیان. ﴿فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ﴾ ئینجا ئاو لەسەرو لە خوارەوە یەکی گرت لەسەر ئەندازەیە کە دیاری کرابوو بڕیار درابوو لە پێشەوەدا ئەوە کرا لەسەر ئەو بڕیارو فرمانەی کە درا بوو بە خنکاندنیان. ئەو دوو ئاوە بەو جۆرە هات هەتا بوو بە لافاو تۆفانێ رووی زەوی داگیر کرد و داپۆشی، هەموو ئەو بێ باوەڕانەی داپێچاو داپۆشی کە بوو بوون بە چڵك و چەپەڵی یەکی وا رووی زەوی یان پیس و ناشیرین کردبوو، دەستی قودەرت دای لەوان و سەر نقومی کردن، بە رێزەوە نوحی رزگار کرد وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ﴾ نوحمان هەڵگرت بەسەر شتێکی گرنگەوە کە خاوەنی چەند لەوح و بزمارێك بوو، واتە لە پێشەوە فەرمانمان پێدا بە دروست کردنی کەشتی، لە کاتی تۆفانەکەدا بچێتە ناو ئەو کەشتی یە. ناوی نەبرد، بەڵکو بەو جۆرە ناونیشانی کرد لەبەر گرنگی کردن و بایەخ پێدان،

تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكۡنَٰهَآ ءَايَةٗ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿١٥﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾

---

﴿تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا﴾[1] هەڵمان گرت بەسەر کەشتی یەکەوە کە ئەگەڕا بە پێش چاوی ئێمەوە واتە بە چاودێریی و پارێزگاری ئێمە ئەگەڕا بە پێش چاوی ئێمەوە، واتە بە چاودێری و پارێزگاری ئێمە ئەگەڕا بەسەر ئاودا ﴿جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ ئەمانەمان فەراهەم هێنا لەبەر پاداشت دانەوەی نوح کە کەسێ بوو باوەڕی پێ نەهێنرا، بەرهەڵست و بەرگری کرا لە گەیاندنی پەیام و ئایینی خوا، سزاو ئەزیەتی زۆر درا لەو ڕێگایەدا. لەم کاتەدا کە جێگای ئەوەیە دڵ و دەروون تەمێ خوار ببێ و گوێڕایەڵی بکات بۆ فەرمان و ئایینی خوا، لەم کاتەدا ئەم فەرموده ئەهێنێ بە دوای دا ﴿وَلَقَد تَّرَكۡنَٰهَآ ءَايَةٗ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ ئەم ڕووداوەمان هێشتەوە بە دەنگ و باس بکرێ و بگێڕرێتەوە، هێشتمانەوە بە بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون بۆ گەل و چینەکانی پاش نوح، تا بیر بکەنەوە و تەمێ خوار بن، نەچن بە ڕێبازی گەلە بێ باوەڕەکەی نوح دا، خۆیان بپارێزن لە سەرکەشی لە خوا یا وەك گەلەکەی نوح دووچاری تۆڵە و سزای خوا نەبن. دەی ئایا کەسێ هەیە کە تەمێ و عیبرەت وەرگرێ؟[2] واتە با تەمێ خوار ببێ و خەڵکی عیبرەت وەرگرێ لەو بێ باوەڕانەوە.

ئینجالەبەربێدارکردنەوەی دڵ ودەروون ئەم پرسیارە ئەکات ﴿فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەی ئایاچۆن بووسزای من وترساندنی من؟ بێگومان–وەکو قورئان بۆی باسکردین–سزاکەی ئێجگارسەخت وسامناك وبەربادکەرولەریشەدەرهێنەربوو، ترساندنەکەی ڕاست وبەجێ بوو.

---

[1] ئەم ڕستەیە بە گوێرەی تەفسیرەکە بۆ کەشتی یەکەو ئەگونجێ ڕستەیەکی سەربەخۆ بێت بۆ باسی نرخی کەشتی و خاوەن کەشتی، لەسەر هەردوو بار بە ڕانەبردوو ڕستەکەی فەرموو لەبەر حازر کردنی شێوەکەی.

[2] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست هێشتنەوەی ئەو کەشتی یەیە چەند چەرخێ مایەوە تا یەکەم چەرخی ئەم ئوممەتە و چەند کەسێ لەم ئوممەتە بینی بەسەر چیای (جودی) یەوە.

**ئینجا دڵ وریا ئەکاتەوە بەوەی کە ئەم سەرگوزەشتانەی قورئان باسی ئەفەرموێ: مەبەست ئامۆژگاری و تەمێ دادانە، بە جۆرێکی روون و رەوان ئەو سەرگوزەشتانە باس کراوە، هەرکەس فام و تێگەیشتنی هەبێ باش تێی ئەگات و وەری ئەگرێ. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ بەڕاستی ئێمە قورئانمان سووك و ئاسان و ئامادە کردووە بۆ وەرگرتن و لەبەر کردن و بیر لێ کردنەوەو تەمێ وەرگرتن، دەی ئایا بیر کەرەوەو تەمێ وەرگر هەیە؟ واتە با ببێ.**

**لەدوای هەموو دەنگ و باسەکانی ئەم سورەتە و لە کۆتایی پیشاندانی شێوەی سزاکانی یەوە ئەم رستەیە ئەهێنێ و ئەیفەرموێتەوە بۆ ئەمەی بە ئارامی و لەسەرخۆ بانگی دەروون بکات بۆ بیر کردنەوەو تەمێ و ئامۆژگاری وەگرتن لە پاش ترساندن بە زنجیرەیەك لە سزا سامناکەکانی گەلە بێ باوەڕەکانی رابردوو.**

**ئینجادێتە سەر باسی بەسەرهاتی تائیفەی عاد، ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتۡ عَادٞ﴾ ئیمان و باوەڕی نەهێنا تائیفەی عاد بە پێغەمبەرەکەیان. پێش تەواو کردنی ئایەتەکە پرسیار ئەکات بۆ ترساندن و سەرسام کردن و گەیاندنی گرنگی ئەو سزایەی داگیری کردن، ﴿فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەی ئایا چۆن بوو سزای من دەربارەی ئەو بێ باوەڕانەو تۆڵەیان لەسەر ئەو باوەڕ نەهێنانەیان؟ ئایا چۆن بوو ترساندنی من بۆیان پێش هاتنی سزاکەیان؟ ئایا چۆنە ترساندنی من بۆ ئەوانەی لە پاش ئەوان لەسەر رێبازی ئەوان ئەڕۆن.**

إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾

---

ئینجا وەڵام ئەداتەوەو باسی ئەو سزا سامناکە ئەکات بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴾ بەڕاستی ئێمە بایەکی زۆر ساردی بەهێزمان ڕەوانە کردە سەریان لە ڕۆژێکی ساردی شوم دا کە شومی یەکەی بەردەوام بوو تا بەربادی کردن و سەری لە سزای ڕۆژی دوایی یەوە دەرکردن، ﴿تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ﴾ بایەکی وابوو کە ئەو خەڵکەی هەڵکەند و لە ڕیشەی هێنان هەتا وایان لیٚ ئەهات شێوەیان وەکو بێخی دار خورمایە وابوو کە سەری نەمابێ و لە جێگاکەی خۆی هەڵکەنرابێ و کەوتبێ بەلادا.

بەم جۆرە شێوەیان نیشان ئەدات، چونکە – وەکو ئەگێڕنەوە – ئەو گەلە درێژو لەش قەڵەووگەورەبوون، پێیان توند ئەکرد لە زەوی بەڵکو ئەڵێن چاڵیان ئەکەندو دەستیان ئەگرت بە یەکەوەو خۆیان بەتین دامەزراو ئەکرد. ئینجائەو بایە بە فەرمانی خوا لێی ئەدان سەری ئەپەڕاندن و لەشەکانی توڕ ئەدان و ئەیخستن بەسەر زەوی دا ئەو با ساردەش لەشی وشك ئەکردن و ئەکەوتن وەکو کۆتەرەی دار خورمای وشکی هەڵکەنراوی کەوتوو بەسەر زەویدا، بەڕاستی شێوەیەکی سامناکی دڵ داچڵەکێنەرە، خواپەنامان بدات لەسزاوقاری خۆی.

ئەوبایەهێزێکە لە هێزەکانی ئەم بوونەوەرەو دروست کراوی خوایە و لەشکرێکە لە لەشکرەکانی خوائەگەڕێ وئیش ئەکات لەم بوونەوەرەدا بە پێی ئەو یاسا و ڕژێمەی کە خوا بۆی داناوە، هەربەوجۆرەخوازاڵی ئەکات بەسەرهەموو کەس وهەرشتدا کەخوا خۆی بیەوێ و مەیلی لێی ببێ،ئەوەهیچ جێگای سەرلێکردنەوە نییەبۆهیچ خاوەن ژیریی یەکی ڕاستەقینە.

لە پاش پیشاندانی شێوەی سزاکەیان پرسیارە پێشووەکە دووبارە ئەکاتەوە بۆ زیادە ترساندن و تەمێ دادان ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ ئینجا ئەو ڕستەیە ئەهێنێ بە دوای باسەکەدا وەکو لە پێشەوە باس کرا﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾.

﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾﴾

**ئینجا دێتە سەر بەسەرهاتی سێ یەم: بەسەرهاتی تائیفەی سەمود، ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ﴾ تائیفەی سەمود باوەڕیان نەهێنا بە ترسێنەرەکان واتە پێغەمبەران.**

**ئەوانە هەرچەند بێ باوەڕی یان تەنها دەربارەی سالح پێغەمبەر بوو، بەڵام باوەڕ نەهێنان بە هەرکام لە پێغەمبەران باوەڕ نەهێنانە بە هەموویان، چونکە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – هەموو یەکن لە باوەڕو بنەڕەتی ئایین دا، هەموو بۆ تەنها مەبەستی هاتوون کە بریتی یە لە بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای خواو گوێڕایەڵی تەنها بۆ فەرمانی خوا.**

**سەمود تائیفەیە بوون لە دانیشتوانی لای ژووروی نیوەدورگەی عەرەب، وەکو عاد کە لای خوارویەوە بوون، جێگای ئەوانیان گرتبوو لە هێزو دەسەلآت دا، ئەمانە تەمێ خوار نەبوون بە بەسەرهاتی تایفەی عاد کە زانراوو بەناوبانگ بوو لە ناوچەکانی نیوەدورگەدا، بەڵکو باوەڕیان نەهێناو دەستیان کرد بە دەم درێژیی و رەخنە گرتن لە خۆی و لە پێغەمبەرێتی یەکەی ﴿فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ﴾ بەم جۆرە ئەیان وت: ئایا ئێمە شوێنی تەنیا کەسێ ئەکەوین کە لە خۆمانەو وەکو خۆمان وایە و هیچ زیادەیەکی نی یە بەسەر ئێمەدا؟ واتە کاری وا بێ جێ ناکەین. ﴿إِنَّآ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٍ﴾[1] چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێمە بەو جۆرە بکەین، واتە شوێنی ئەم تەنیا کەسە بکەوین کە وەکو خۆمان وایە، ئەو کاتە ئێمە لە گومڕایی و شێتی دا ئەبین.**

**بەڕاستی زۆر سەیرە گومڕایی و سەر لێ شێوان تا ئەو رادەیە شوێن کەوتنی حەق و ئایینی روون و رووناکی خوا بە گومڕایی و شێتی دابنرێ، ئەو نەفامی و نەزانی یە ئێستا زۆر بەتین تر و بەهێزترە لە دەماغ و کەللەی بۆشی بێ باوەڕانی ئەمڕۆدا، ئەوەتا شوێن کەوتنی ئەم ئایین و شەریعەتی ئیسلامە رووناکی خستە جیهان و مامۆستایی ئادەمی کرد بۆ پێشکەوتن و بەختیاری، بەڵام بێ باوەڕەکانی چەرخی صالح پێغەمبەر (ﷺ) مێژووی ئایینی خواو ئیسلامیان لا نەبوو، کەواتە بێ باوەڕانی ئەمڕۆ زۆر نەزان و نەفام ترن لەوانەی کۆن، ئەمان زۆرتر جێگای سەرسوڕمانن.**

---

[1] ئەم وشەیەبەچەندشتی تر راڤەکراوە: ١– عەزاب. ٢– دووری لەحەق. ٣– بڵێسەی ئاگر. بەهەرکام باشەو ئەگونجێ.

أَءُلْقِيَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ۖ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً

---

ئینجا زیاده رەوی یان کرد لە سەرکێشی دا ئەیان وت: ﴿أَءُلْقِيَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا﴾ ئایا لە نێوان ئێمەدا سالح جویێ کراوەتەوەو سروش و پەیامی خوا هێنراوەتە خوار بۆ سەری؟ واتە شتی نارەواو ناڕاستە، ﴿بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾ نەخێر بەڵکو سالح زۆر درۆزنە و خودپەسەندە و خۆی بە گەورە ئەزانێ ئەیەوێ زۆرو دەسەلآت پەیدا بکات بەسەرمان دا بەناوی ئایینی خواوە، تەماع بازەو ئەیەوێ داگیرمان بکات.

ئەو کۆمەڵە بێ باوەڕە هەر بە قسەکانی خۆیان روونی ئەکەنەوە کە خۆیان دەردەدار و نەخۆش بوون بە نەخۆشی کەللە رەقی و تەکەبورو حەسادەت بەهۆی ئەو نەخۆشی یەوە دانیان نەئەنا بەو شتە راستە روونەداو رەخنەی بێ جێ یان ئەگرت و ئەیانویست بە دەمبازی پێغەمبەرەکەیان لەکەدار بکەن لە پێش چاوی نەفامەکان، ئەو پێغەمبەرە کە خوای خاوەن بەزەیی لە خۆیان بۆی ناردن، بۆ ئەوەی رێنموونی یان بکات و دەستیان بگرێ و بیانبات بە رێگای راست دا، ئەو پێغەمبەرەیان لەکەدار ئەکرد بە درۆزنی و تەماع بازی تا خۆیان خستە بەر قارو خەشمی خوا لە هەردوو جیهان دا، خوا هەر لە دنیا بێ ئابڕوو شەرمەزاری کردن و جاڕی خراپی و سزای هەردوو جیهانی لێدان لە قورئان دا و هەمووانی ئاگادار کردەوە بە بەسەرهاتی سەخت و رۆژی رەشیان لە هەردوو جیهاندا، ئەو تانە و لەکەی کە دەمبازی یان پێ ئەکرد دەربارەی – پێغەمبەرەکەیان –خوا بە هەرەشەوە بە درۆی خستنەوە و خۆیانی پێ تاوانبار و لەکەدار کرد فەرموی: ﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ﴾ سبەینێ[1]، واتە لە رۆژی دواییدا ئەزانن ئەو زۆر درۆزنی کەشخە بازە کێیە؟ بێگومان خاوەنی

---

[1] زۆر لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست بە سبەینێ کاتی هاتنی سزای ئەم جیهانەیانە کە بەرپادی کردن و لەسەر ئەم رایە مەبەست لەم رستەیە لێرەدا ئەو هەڕەشەو هەواڵەیە کە لەو کاتەدا خوا رایگەیاند بە سالح پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام شێوەی گێڕانەوە نی یە، بەڵکو بە جۆرێکە ئەو بارو حاڵەتە ئەهێنێتە پێش چاو وەکو ئێستا ئەو کاتە بێت کە ئەوەیش هەر لە دەست قورئان دێت.

ئەو خووە پیسانە ئەو کۆمەڵە بێ باوەڕەن، لە ڕۆژی دوایی دا کە سزا ئەدرێن بە ئاگر باش ئەوەیان بۆ روون ئەبێتەوە.

ئەگێڕنەوە کە ئەو کۆمەڵە بێ باوەڕە پەلپ و بەهانەیان گرت لە سالح پێغەمبەر وتیان: لەو بەردە حوشترێکمان بۆ دەربێنە، ئەویش فەرمووی باشە بە مەرجێ ئێوەیش ئیمان بێنن، ئەوانیش بەڵێنیان پێدا ئەویش داوای کرد لە خوای گەورە کە ئەوەی بۆ بکات، خوایش نزاکەی وەرگرت و سروشی کردە لای کە لێرەدا بۆمان ئەگێڕێتەوە لە قورئان دا: ﴿ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ﴾ ئەو حوشترەی کە داوایان کرد ئێمە ئەیهێنینە دەرەوە لەو بەردە و ئەینێرین بۆ تاقی کردنەوەی ئەوان تا دەرکەوێ ئایا ئیمان ئەهێنن یان نا؟ ﴿ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ﴾ کەواتە ئەی سالح تۆیش چاوەڕوانی یان بکە ئایا چی ئەکەن و چی یان بەسەر دێت؟ خۆت بگرەو سەبر بکە لەسەر سزاو ناڕەوایی یان دەربارەت، واتە پەلە مەکە هەتا کاتی بەدی هاتنی بڕیاری خوا. ﴿ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ۖ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ﴾ هەواڵیان بدەرێ کە ئەو ئاوەی لەوێدایە بەش کراوە لە نێوان ئەوان و ئەو حوشترەدا، ڕۆژێ بۆ ئەوان و ڕۆژێ بۆ حوشترەکە، هەموو بەشە ئاوێ خاوەنەکەی خۆی حازری ئەبێ لە نۆبەکەی خۆی دا، ئینجا خوای گەورە ئەو حوشترەی بەو جۆرە فەراهەم هێنا و مایەوە بەو جۆرە بەردەوام بوون لەسەر بەش کردنی ئاوەکە لە پاشان بێزار بوون لەوەو بڕیاری کوشتنی حوشترەکەیاندا، ﴿ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ﴾ ئینجا هاواریان کرد لە گەورەکەیان بە هاندانی لەسەر کوشتنی ئەو حوشترە ﴿ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾ ئینجا ئەویش بەگوێی کردن وئەوتاوانەگەورەی کردوتیغی گرت بەدەستەوەو حوشترەکەی کوشت.

ئینجا وەکو باسەکانی رابردوو پێش باسی سزاو تۆڵەی بێ باوەڕەکان ئەم پرسیارە ئەکات: ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ﴾ راڤە و تەفسیری ئەم رستەیە لەمەو پێش کرا، کەواتە پێویست نی یە بە وتنەوەی، ئینجا باسی سزاو تۆڵەی ئەم جیهانەیان ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً﴾ بێگومان ئێمە تەنها سەیحە و دەنگێکی گەورەو پیاهەڵشاخانێکمان رەوانە کردە سەریان. زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: ئەو سەیحە و پیا هەڵشاخانە لەلایەن جوبرەئیلەوە بووە، بەڵام قورئان لە هیچ شوێنێك دا دیاریی نەکردووە کە چۆن بووەو لە کێ و لە کوێوە بووە؟ هەرچۆن بووبێ خوای گەورە ئەو گەلە یاخی یە سەرکێشە لوت بەرزەی لە ریشە هێنا بەو شتە بەسیتە،

فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ۖ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾

---

بەو جۆرەی لیٚ کردن کە قورئان وێنەکەیمان ئەخاتە پێش چاو ئەفەرمویٚ: ﴿فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ﴾ هەموو بە جاریٚ مردن و وشك و قرچ هەڵهاتن، داڕزان وەکو ئەو توڵە وشك و پەل و پۆیانەی درەخت کە خاوەن گەلە ئەیکات بە تروت و پەرژین بۆ پەچە و جێگای گەلەکەی، یان وەکو ئەو پووش و پەل و پۆ وشکەی کە کۆی ئەکاتەوە بۆ خواردنی گەلەکەی.

بە کورتی بەو تەنیاو هەڵشاخانە هەموو مردن و داڕزان و وەکو ماوەیەکی دوور بیٚ مردبن، بەڕاستی شێوەو وێنەکەیان سامناك و دڵ داچڵەکێنەرە، لەکاتی پیشاندانی ئەم وێنەدا ئەم رستەیەئەهێنیٚ وباسەکەی پیٚ دوایی ئەهێنیٚ وەکو باسەکانی تر: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾. ئینجا دێتە سەر زنجیرەیەکی تر لە بەسەرهاتی یەکێکی تر لە پێغەمبەران و بیٚ باوەڕان، دێتە سەر باسی لوط پێغەمبەر کە چەرخیٚ لەپاش چەرخی صالح پێغەمبەر بووە ئەوانیش لە دەوروبەری نیوە دورگەی عەرەب دا بوون بەناوبانگ بوون لەناو قورەیش و عەرەبەکان دا ئەفەرمویٚ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍۭ بِٱلنُّذُرِ﴾ گەلەکەی لوط باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرو ترسێنەرەکان بە درۆزنیان دائەنان.

سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی لوط پێغەمبەر لە چەند شوێنی تردا بە درێژیی هاتووە، لێرەدا مەبەست عیبرەت و تەمیٚ وەرگرتنە لەبەر ئەوە بە کورتی باسەکە ئەفەرمویٚ و سزای بیٚ باوەڕەکان و رزگاری ئیمانداران ئەخاتە پێش چاو ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ۖ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ * نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى مَن شَكَرَ﴾ بێگومان بایەکی بەهێزی بەردەباران کەرمان ناردە سەریان جگە لە ئال و بەیتی لوط، واتە ئەوانەیان کە شوێنی ئایینەکەی کەوتن، ئەوانە رزگارمان کردن لە بەرەو بەیانێك دا لە دوا دوایی شەوداو ئەوەیشمان کرد لەبەر ئەوە لە لایەن خۆمانەوە چاکە بکەین دەربارەی ئەو ئیماندارانە.

وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ جَآءَ ءَالَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ ﴿٤١﴾

---

هەرچۆنێ ئەوانەمان رزگار کرد و پاداشتمان دانەوە هەر بەو جۆرە پاداشتی هەرکەسێ ئەدەینەوە کە سوپاسی نیعمەتی ئێمە بکات بە ئیمان هێنان و گوێڕایەڵی. هەردوو تەرەفی سەرگوزەشتەکەی باس فەرمووە: باوەڕ نەهێنانی گەلەکەی و پاشەڕۆژی سەختیان، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ باسی چەند شتێ کە لە نێوانی ئەو دوو تەرەفەدا رووی داو کرا ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ﴾ بێگومان لە پێشەوە لوط ئەو گەلەی ترساند لە تۆڵەی سەخت و دەست وەشاندنی بەهێز و سزای ئێمە دەربارەیان کەچی ئەوان دەمە دەمێ و بەربەرەکانی یان ئەکردو باوەڕیان نەهێناو گومانیان بوو لەو ترسێنەرانەدا.

لە بابەت بێ ئیمانی و بێ باوەڕی یەوە بەو جۆرە بوون، لە بابەت کردەوەی خراپەوە لەو رادە کەس نەدیوەدا بوون کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ﴾ بەڕاستی کەوتبوونە هەوڵ و تێکۆشان و خوارو ژووری لوط لە بابەت میوانەکانی یەوە کە لێ ی بسێنن بە نیازی ئەوە ئیشی بێ ناموسی یان لەگەڵ بکەن بە گوێرەی باوی پیسی خۆیان کە نێرباز بوون، ئەو میوانانەیش مەلائیکە بوون، بەڵام لە شێوەی ئادەمی جوان و شیرین دا کە چاویان پێ یان کەوت ئێجگاری شەرمیان لا نەماو کەوتنە خوارو ژوور لەگەڵ لوط پێغەمبەر ئەو پیسانە نەیانئەزانی کە ئەوانە مەلائیکەن، ئینجا ویستیان دەست درێژیی تەواو بکەن و بە زۆر میوانەکانی ژێر دەست بکەن، لەو کاتەدا دەستی قودرەت هاتە پێشەوە بەم جۆرەی لێ کردن کەئەفەرموێ: ﴿فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ﴾ ئینجائێمەیش چاوەکانمان کوێرکردن بەجۆرێ جێگاکەیشمان نەهێشتەوەو سافمان کرد، ئینجا ئەهاتن بە یەك دا و هیچیان نەئەبینی، ئەم بەسەرهاتە بە درێژترتێپەڕی لە چەند سورەتێکی تردا بە تایبەتی لە سورەتی ﴿هود﴾دا، ﴿فَذُوقُوا عَذَابِى وَنُذُرِ﴾

ئینجا پێمان وتن لەسەر زمانی مەلائیکەکان، بچەژن سزای من و بەرهەمی ترساندنی من.
خوای گەورەهەربەوەوازی لێ نەهێنان بەڵکو لە بەیانی یەك دا سزای سەختی باراند بەسەریاندا، سزایەکی واکەلەریشەی هێنان، دواچۆڕی هێنان لەم جیهانەداو سەری کردن بەناو سزای هەمیشەیی ڕۆژی دوایی دا وەکو ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴾ بێگومان لە بەیانی یەك دا زوو سزایەکی وا هاتە سەریان لانەچوو تا بەربادی کردن و کردنی بەناو سزای ئاگردا، چونکە لەگەڵ مردن ئیتر وان لە سزاداو لە کۆڵیان نابێتەوە هەتا هەتایە بێ برانەوە، خوا پەنامان بدات، آمین.

ئەم سزایە بەم جۆرە بوو: وڵاتەکەیان ژێراو ژوور کراو بای سەخت هاتە سەریان بەردەبارانیشی کردن. ئینجا لەلایەن خواوە ئەمەیان پێ وترا: ﴿فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ﴾ دەی بخۆن وبچەژن لەتۆڵەوسزای من و بەرهەمی ترساندنی من کە گوێتان لێی نەبوو﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ ئەم رستەیەی هێنایەوەلەپاش ئەم باسی چوارەمیشە.

هێنانی ئەم رستەیە لەپاش ئەم چوار سەرگوزەشتەوە دڵ بێدار ئەکاتەوە کە هەریەکێ لەم بەسەرهاتانە بە تەنیا بەسە بۆ بیر کردنەوەو کۆتایی هێنان لە بێ باوەڕیی و تاوان کردن لەلایەن ئەو کەسانە کە دڵیان زیندووە. هەروەها لە پاش پیشاندانی شێوەی سزاو ترساندن بەو جۆرە نەرمی و ناسکی یە ڕێنموونی ئەکات و بانگ ئەکات بۆ گوێڕایەڵی و ئیمان کە ئەوەیش شیرین ترین رەوشتە لە تەمێ دادان دا، کەواتە هەرکەس بەم فەرمودانە مل کەچی نەکات و ڕێگای ڕاست نەداتە بەر ئەو کەسە جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچ دەرمانی تری نی یە، وەکو لە پێشەوە لە سەرەتای سورەتەکەوە ئەوەی دا بە گوێدا.

ئەم چوار سەرگوزەشتە و بەسەرهاتانەی کە تێپەڕین لەم سورەتەدا هەموویان لە بەسەرهاتەکانی نیوە دورگەی عەرەب بوون، ئینجا لە پاش ئەمانە بەسەرهاتێکمان بە کورتی پیشان ئەدات لەبەسەرهاتی ناوچەو وڵاتی تر. بە کورتی چاوی دڵ ئەخشێنێ بە بەسەرهاتی فیرعەون و کۆمەڵەکەی. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ﴾ سوێند بەخوا ترسێنەرەکان هاتنە سەر کۆمەڵ و شوێن کەوتووەکانی فیرعەون،

كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُو۟لَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾

---

ئینجا ئەوانیش بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا﴾ باوەڕیان نەهێنا بەو هەموو موعجیزەو بەڵگە روونانەی کە ئێمە پیشانمان دان لەلایەن موساو هارونەوە.ئەو موعجیزانە نۆ بوون هەموویان روون و ئاشکرا و بەڵگەی بەهێز بوون لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکانیان کەچی چار نەکران و نەهاتنە سەر رێگای راست، خوایش ئەوەی بەسەر هێنان کە بەسەری هێنان کە بە درێژیی لە چەند سورەتێك دا باسی فەرمووە، لێرەدا بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿فَأَخَذْنَٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ ئینجا ئێمەیش تۆڵەمان لێ سەندن بە تۆڵە سەندنی کەسێ کە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و چار کراو نی یە و دەسەلآت و توانای بەسەر هەموو شتێك دا هەیە، کەواتە تۆڵەیەکی زۆر بەتین بوو رێك و شایانی سەرکەشی و ئالەباری فیرعەون و گەلەکەی بوو.

پاش ئەوەی ئەم هەواڵ و بەسەرهاتە گرنگانەی دا بە گوێچکەی بێ باوەڕەکان دا، شێوەی سەخت و بەتینی سزای ئەو بێ باوەڕانەی هێنایە پێش چاو. پاش ئەمانە ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە بێ باوەڕەکانی قورەیش، هەروەها هەموو گەل و کۆمەڵی بێ باوەڕانی ئەم ئوممەتە هەموو ئاگادار ئەکاتەوە بۆ ئەمەی خۆیان بپارێزن لە دووچار بوونی پاشەڕۆژی بەدبەختی بە وێنەی بێ باوەڕەکانی رابردوو، ئەیانترسێنێ بە سزای سەخت تر ئەفەرموێ: ﴿أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُو۟لَٰٓئِكُمْ﴾ ئایا کافرەکانی ئێوە چاکترن لەو کافرانەی کە باسمان کردن؟ ئایا چاکترن لەوان لە هێزو دەسەلآت و رێزو شان و ئاییندا؟ واتە نەخێر هیچ ئەمان چاکتر نین لەوان، کەواتە ئایا بە تەمای چین؟ با تەمێ خوار بن بە هاوسەرو هاورێکانیان، ﴿أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ﴾ ئەی ئایا هیچ چەکێکی رزگاریتان هەیە لە کتێبە پێشووەکان دا هاتبێتە خوارەوە کە ئێوە تۆڵە و سزا نادرێن لەسەر بێ باوەڕیی و تاوان، واتە نەخێر دیارە شتی وایان نی یە و شتی وا ناگونجێ، ئینجا رووی وتارەکە لائەدا لەوان و پرسیارێك ئەکات بۆ سەر سوڕهێنان، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ﴾ ئەی ئایا ئەوانە ئەڵێن: ئێمە گەلێکین کۆمەڵ و کۆین و کاروبارمان کۆیە و زاڵ و چار نەکراوین؟ یان سەرکەوتووین بەسەر دوژمندا.

سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴿٤٩﴾

---

ئەمانە لە پەنای ماڵی خوادا بۆیان ڕێك کەوتبوو، کاروباریان دامەزراو بوو کۆمەڵێکی تەقیٔ لیٔ کرابوون بەهۆی ئەمەوە لە خۆیان گۆڕا بوون ئەم قسەیان ئەکرد لەبەر ئەوە قورئان دای لە دەماغیان و ئەم هەواڵەی پێدان: ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾ بێگومان ئەو کۆمەڵە لەمەولا ئەشکێنرێن لە جەنگ دا و لە ترس دا پشتی تیٔ ئەکەن و فیرار ئەکەن.

ئەم هەواڵە لە مەککەدا دراو لەپاش چەند ساڵێك بەدی هات لە ڕۆژی بەدردا، ئەمە یەکێکە لەمەواڵە غەیبی یەکانی قورئان کەبەڵگە و موعجیزەیەکی ئاشکران بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

ئیمامی بوخاری حەدیسیٔ ئەهێنیٔ لە ئیبن عەباسەوە – خوا لیٔ یان ڕازی بێت – کە پێغەمبەر لە ڕۆژی بەدردا نزاو لاڵەی کردە لای خواو فەرموی: خوایە داوای بەڵێنەکەت لیٔ ئەکەم، لە پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر – خوای لیٔ ڕازی بێت – عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا نزاو لاڵەکە لای خوا بەسەو چارەسەرت ئەکات، ئەویش تەشریفی هاتە دەرەوە لە شوێنەکەی خۆی و ئەم ئایەتەی ئەفەرمو: ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾.

ئیمامی عومەر ئەفەرمویٔ لەوەو پێش نەم ئەزانی مەبەست بەم ئایەتە چی یە هەتا ڕۆژی بەدر هات و پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند، ئەو کاتە مەبەستەکەم زانی. ئەوە شکان و سزای ئەم جیهانەیان بوو، خوا بەوە وازی لیٔ نەهێنان: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ واز لەوەی دنیا بێنە ڕۆژی دوایی کاتی تۆڵەی ئەوانەیە، سزای ڕۆژی دوایی ناهەموار ترەو تاڵی و سەختی بەتین ترە لەسزای ئەم جیهانە، لە هەموو ئەم سزایانە کە باس کران دەربارەی بیٔ باوەڕانی گەلە ڕابردووەکان، واتە کاتی سزای ڕاستەقینەیان ئەو ڕۆژەیە و هەرچی سزای ئەم ڕۆژەیان هەیە هەمووی پێشڕەوو سەرەتایە.

ئینجا سەختی و بەتین تری سزای ئەو جیهانە ڕوون ئەکاتەوە بە پیشاندانی شێوەیەکی سامناك لە شێوەی سزاکانی ئەفەرمویٔ: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ * يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ﴾ بێگومان بیٔ باوەڕە تاوانبارەکان لەناو چاڵی گومڕایی و سەر لیٔ شێواندان لەم جیهانەدا و لەناو ئاگرە تاودراوەکانی ڕۆژی دوایی دا لە کاتێك دا بە ڕیسوایی بەسەر ڕوویان دا ڕائەکێشرێن لەناو ئەو ئاگرەدا لەو کاتە سەختەدا پیٔ یان ئەوتریٔ بچەژن سزاو ئێش و

ئازاری دۆزەخ، ئەمەیش بۆ سزادانی دڵ و دەروونیان بەو تیری تانە و تەشەرانە. خوا پەنامان بدات بە رەحم و بەزەیی خۆی.

لەم کاتەدا کە ئەم شێوە دڵ داچڵەکێنەرەی رۆژی دوایی خستە پێش چاو لەم کاتەدا ئەم باسە گرنگە و ئەم بەیانە گەورەی دواوە دەرئەکات بۆ ئەمەی جێگیرو دامەزراو ببێ لە دڵ و دەروون‌دا زانین و بەجێی هەموو کارو فرمانی خوای گەورە. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان دروست کردووە بە ئەندازەو بارو روویەك کە لە پێشەوە زانیومانە و ویستوومانەو بڕیارمان داوە، واتە هیچ شتێك بە رێکەوت نی یە، بەڵکو هەرچی لەم ژیان و بوونەوەرەدایە، ئەمانە هەموو لە پێشەوە زانراوو ویستراون، دیاریی کراون خۆیان و بارو سیفەتیان و رادەو ئەندازەیان و شوێن و کاتیان و پەیوەندی نێوانیان و کارو بەرهەمیان لەم ژیان و بوونەوەرەدا، ئەمان هەموو بە جۆرێکن دەست نادەن بۆ کەم و کوڕی و زیادو کەم و دواوبەرو هیچ جۆرە گۆڕاندن و دەست تێخستنێ.

لەم بابەتەوە پێشەوای مەزن غەزالی – خوای لێ رازی بێت – فەرمودەیەکی ئێجگار بەرزو بەتامی هەیە ئەفەرموێ: ئەگەر هەموو ئادەمی یەکسەر کۆ بکرێتەوە، هەموو یەکێکی رادەی زانین و ژیریی بگاتە پلەی هەرە بەرزی، هەموو زانا بکرێن بە هەموو نهێنی یەکانی بوونەوەر و پاشەڕۆژی هەموو شتێ، هەموو ماوە بدرێن تەمەنێکی درێژیان پێ بدرێ و هەموو پێکەوە بیر بکەنەوەو بکۆڵنەوە لە دروست کراوەکانی خوا بۆ گۆڕینی بە بارێکی تردا، بە هیچ کلۆجێ باری تری گونجاویان بۆ نادۆزرێتەوە، زەڕەیەکیان پێ زیاد و کەم ناکرێتەوە لەوەی خوای گەورە کردوویەتی، ئەگەر بێت و بگۆڕێ بە هەر بارێ تردا رژێمەکەی تێك ئەچێ و ناتەواو ئەبێ و پەکی ئەکەوێ.

راست و بەجێ یی ئەم فەرمودەیە لەم چەرخی تازەی زانیاری یەدا روون بووەتەوە، چونکە گەلێ شتی نهێنی ئەم بوونەوەرە دەرکەوت و پەی پێ برا ئەوانە هەموو بەڵگەیەکی زۆر روون و رەوانن لەسەر راستی و بەجێ یی ئەو فەرمودەیە، هۆی ئیمانی بەهێزن بەو ئایەتە و ئەو کەسەی ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە، هەتا زانیاری بەرزو پێشکەوتوو تر بێت بەڵگەکان روون ترو بەهێزترو زۆرتر ئەبن.

بۆ روون کردنەوەی چەند نموونەیەك باس ئەکەین لەو شتە سەرسوڕهێنەرانە کە لەم چەرخە تازەدا ناسران و پەییان پێ برا!! ئەم زەوی یە کە ئێمەی بەسەرەوە ئەژین بەم ژیانە تایبەتی یە، خوای گەورە چەند شتێکی تێدا فەراهەم هێناوە و چەند شتێکی کردووە بەهۆی

ئەم ژیانە بەسەریەوە ئەگەر بێت و لەم باری ئێستا بگۆڕێ، یان ناڕێکی و ناتەواوی پەیدا ببێ و روو بکاتە هەر یەکێ لەو هۆیانە، ئەو کاتە ژیان تێك ئەچێ، یان هەر ناگونجێ: قەبارەی ئەم زەوی یە لە رادەی ئێستەدا دابەش کردنی ئاوو وشکی بەم جۆرەی ئێستا، بوونی هەواو بە چواردەوری دا بەم رادەو قەبارەی ئێستا ماوەو رادەی دووری لە مانگ و خۆرەوە، ئەم قەبارە تایبەتی یەی خۆرو مانگ ئەم رادە تایبەتی یەی گەرما و سەرما لە زەوی دا، رادەی گەردش و خولانەوەی بە دەوری خۆی و خۆردا، ئەمانە و هەزاران شتی تر کە هەندێکیان ناسراون و زۆر زۆریشیان هێشتا ماوەو پەیی پێ نەبراوە، ئەمانە هەموو پێکەوە و بە یارمەتی هەموو، ژیان بەسەر ئەبرێ ئەگەر هەر جۆرە گۆڕان و ناڕێکی یە رووبدات تیایان دا ژیان بەسەر نابرێ[1].

بۆ زانایانی زانیاری تازە روون بووەتەوە کە ئەستێرەکان هەریەکە جێگا و شوێنێکی تایبەتی یان هەیە بۆ گەردش و خولانەوەیان، هەریەکە قەبارەو شێوەو بارێکی تایبەتی یان هەیە، رادەی دووریان لە یەکەوە، لەگەڵ کۆمەڵەی خۆری خۆیان و کۆمەڵە و مەجەرەکانی تردا لە سنوورێکی تایبەتی دایە. ئەمانە هەموو بە هەزارەها شتی تر کە ئەم ئاسمانانەی لەسەر دارێژراوە، ئەگەر بگۆڕێ بە هەرجۆرێکی تر کاری ئەم بوونەوەرە ناڕوات.

ئەو شتانەی کە هۆی ژیان و مانەوەن بۆ زیندووەکان لە رادەو ئەندازەیەك دان رێك و پێکن و هاوتایی ئەو شتانە ئەکەن کە هۆی مردن و نەمانن، بە شێوەیەك کە هەموو جۆرو تیرەیەك لە گیانلەبەرو زیندووەکان بمێننەوەو بنەبڕ نەبن، ئەوەندەیش زۆر نەبن و پەرە نەسێنن کە زیانیان ببێ و ژیان لە خۆشیان و لە زیندوو گیانلەبەرەکانی تریش تاڵ بکەن، بۆ وێنە: پەلەوەرە دڕندەکان – کە پەلەوەرە بێ دەسەلاتەکان ئەخۆن – ژمارەیان کەمە، چونکە هێلکە و بێچوویان کەمەو لە هەموو شوێنێك دا ناژین، بەلام تەمەن و عومریان درێژە. ئەگەر وەکو تەمەنیان درێژە ژمارەشیان زۆر بووایە و لە هەموو شوێنێك دا ژیانیان بکردایە، ئەو کاتە پەلەوەرە بێ دەسەلاتەکانیان بنەبڕ ئەکرد، یان ژمارەیەك کە پێویستە نەئەمایەوە. مێش – کە بە ملیۆنەها هێلکەو بێچووی هەیە – زیاتر لە دوو هەفتە ناژی، دەی ئەگەر وەکو بێچووی بەو زۆرە هەیە تەمەنی درێژ بوایە سەری زەوی دائەپۆشت، ئەو کاتە ژیان نەئەگونجا بۆ زۆر لە گیانلەبەران، بە تایبەتی بۆ ئادەمی، بەلام دەستی قودرەت و حیکمەت

---

[1] با تەماشای تەفسیری سورەتی ﴿الذاريات﴾ بکرێ ئایەتی ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾.

لەو سنوورەدا وەستاندوونی، زۆریی بێچووی هاوتا کردووە لەگەڵ تەمەن کورتی دا. میکرۆب – کە لە هەموو گیانلەبەرێك ژمارەی زۆرترە – زۆرتر زۆر ئەبن، زیانیان زۆرترە، بەرگری کراون بەمەی کە لە هەموو گیانلەبەرێك لاوازو بەرگە نەگرو تەمەن کورت ترە، بە هەزارەها ملیۆن بەسەرمان یان بە گەرمان یان بە رووناکی یان بە چەند هۆی تر ئەمرن. دەی ئەگەر بەم جۆرە بەرگری نەکرایە ژیانی نەدەهێشت و گیانلەبەرانی بەرباد ئەکرد.

هەموو گیانلەبەرێك شتێکی تایبەتی پێ دراوە کە بیکات بە چەکێك بۆ خۆی بۆ بەرگری دژو دوژمنی، بۆ پارێزگاری گیانی خۆی لە زیان و نەمان، ئیتر ئەو چەکەی هێزو توانین بێت یان چەسپانی بێت لە راکردن دا یان ژارو ژەهر بێت یان هەر شتێکی تر. هەروەها هەموو گیانلەبەرێك جۆرە خۆراکێکی بۆ فەراهەم هێنراوە کە سوودی هەیە بۆی و پێی ئەژی، هۆی دەستکەوتی ئەو خۆراکەیشی هەیە، ئادەمی و ئاژەڵ و پەلەوەرو هەموو گیانلەبەری تر یەکسانە لەوەدا، تەنانەت گەرا پاش یەککگرتن و پێوەن بوونی بە خەلیەوە ئەنووسێ بە دیواری منداڵدانەوە وزامداری ئەکات و چواردەوری خۆی ئەدڕێ و حەوزێك لە خوێن بۆخۆی فەراهەم ئەهێنێ، خوێنێ کەدەست بدات بۆ هەڵمژین و پێی زیاد بکات و پەرەی پێ بسێنێ!

ئەو پەتەی کە بێچووی پێ بەستراوە بە دایکی یەوە لە منداڵدان دا بۆ وەرگرتنی خوێنی خۆراك، ئەو پەتەیش بە پێی پێویست درێژترە، نە زۆر درێژە تا خوێنە خۆراکەکەی تیا بترشێ و نە ئەوەندە کورتە کە بە زۆری و لێشاو خۆراکەکە بێنێ و ببێتە هۆی زیان بۆ ئەو منداڵە، پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە.

ئەو پەتەی کە بێچووی پێ بەستراوە بە دایکی یەوە لە منداڵدان دا بۆ وەرگرتنی خوێنی خۆراك، ئەو پەتەیش بە پێی پێویست درێژە، نە زۆر درێژە تا خوێنە خۆراکەکەی تیا بترشێ و نە ئەوەندە کورتە کە بە زۆری و لێشاو خۆراکەکە بێنێ و ببێتە هۆی زیان بۆ ئەو منداڵە، پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە.

مەمکی دایك لە یەکەم جارو سەرەتای منداڵ بوونەوە شتێکی زەردی لێ دێ کە پێی دەوترێ ژەك، ئەو ژەکەیش چەند شتێکی کیمیاوی تواوە پارێزگاری منداڵەکە ئەکات لەوەی دووچاری نەخۆشی ببێت لە خەڵکی یەوە لە رۆژێك دوای پەیدا بوونی منداڵەکە ئیتر ئەبێ بە شیرێك کە منداڵەکە پێی ئەژی و لەشی پێی پەرە ئەسێنێ و گەورە ئەبێت، شتی سەیرو سەرسوڕهێنەر ئەمەیە کە ئەو شیرە بەرە بەرە زیادە ئەکات بە پێی گەورە بوون و پێویستی منداڵەکە تا وای لێ دێ لە پاش ساڵێك رۆژی لیترو نیوێك ئەبێ، شتی سەیر تر ئەمەیە ئەو

شیره لە یەکەم جارەوە وەکو ئاوێکی پەتی وایە، بەس کەمێك لەو شتانەی تێدا هەیە کە لەش پێی زیاد ئەکات و پەرەی پێ ئەسێنێ، لە یەکەم جارەوە وایە، چونکە لەش و گەدەی بێ هێزو لاوازە توانای خۆراکی قورسی نی یە کە پاشان بەرە بەرەو رۆژ بە رۆژ بە پێی زیاد بوون و بەهێز بوونی منداڵەکە چەوری و شیرینی و ئەو شتە بەهێزانە کە لەشی پێ گەورە و بەهێز ئەبێ ئەو شتانە لە شیرەکەدا زۆر ئەبن[1].

بیر کردنەوە لەو هەموو جیهازە جیاوازانەی کە لە ئادەمی دا دروست کراون، بیر کردنەوە لە ئیش و فرمانیان و سوود و نرخ و بەکارییان لە پاراستنی ژیان و تەندروستی ئادەمی دا. بیر کردنەوە لەم شتە نایابانە بەو هەموو وردی و رێك و پێکی یە سەر سوڕ ئەهێنێ و دڵ و ژیریی سەرسام ئەکات، ئەو دەستە قودرەتە پیشان ئەدات کە ئەو کاروبارە ئەبات بەڕێوە، لێرەدا ناگونجێ بە درێژیی باسی ئەو هەموو جیهازانە بکەین، بەڵکو بۆ وێنە بە کورتی تەنها باسی جیهازێك ئەکەین کە جیهازی (غدە) لوە بچکۆلەکان، باسی ئەو کارگە بچووکە کیمیاوییانە ئەکەین کە یارمەتی هەموو لەش ئەدەن بەو هەموو شتە کیمیاوییانە کە بێ ئەوانە لەش گوزەران ناکات، هێزیان لە رادەیەك دایە کە بەشێ لە هەزار بلیۆن بەش لەوانە بەرهەمێکی زۆر گرنگی هەیە لە لەشی ئادەمیدا، ئەو کارگەیانە هەموو بە رێزو یەك لە دوای یەکن هەرکام لەوانە ئەوی تر تەواو ئەکات، ئەو شتە کیمیاوییانە کە ئەیدەن بە لەش پێکهاتوون لە چەند شتێکی جیاوازو جۆری تێکەڵ کردن و فەراهەم هێنانیان ئەوەندە بە وردی و گرنگی کراوە بیرو ژیریی سەرگەردان ئەکات، هەر خەلەل و ناتەواوی یەك رووی دا لە هەر کامیان دا ئەبێتە هۆی تێك چوون و ناتەواوی یەکی گشتی لە هەموو لەش دا، تا رادەی نەمان و مردنی لەش، ئەگەر ماوەیەکی کەم ئەو خەلەل و ناتەواوی یە بەردەوام بێت.

لە بابەت جیهازەکانی ئادەمی یەوە ئەم ئەندازە بەسە بۆ هەرکەس بیرو ژیریی لە جێگای خۆی دا بێت و سەری لێ نەشێوا بێت، ئینجا با هەندێ گیانلەبەرەکانی تر لە هەر تاقمێ جۆرێکی تایبەتی هۆی ژیان و مانەوەو گوزەرانی پێ دراوە: شێرو پڵنگ و دڕندەکانی تر کە لە چۆڵێ دا ئەژین خۆراکیان بریتی یە لە گیانلەبەرە بێ دەسەڵاتەکان، ئەو دڕندانە کەڵبەی شکێنەرو ددانی تیژی بڕندەو پووکی رق و دەم و لچ و لێوی بەتینیان پێ دراوە، لەگەڵ دەست و قاچی بەهێزو چنگڵ و ناخونی تیژدا. گەدەیان هێزێکی تایبەتی پێ دراوە بۆ هەرس کردنی ئەو هەموو خوێن و گۆشتی کاڵ و ئێسکە بەتینانە کە ئەیخۆن و ئەیهاڕن.

---

[1] کتێبی – الله و العلم الحدیث – دانراوی عبدالرزاق نوفل.

درندەکان بەو جۆرە خوای گەورە هۆی خۆراك و ژیانی پێداون، بەڵام ئاژەڵە ماڵی یەکان کە زۆربەی خۆراکیان پووش و گژو گیایە ئەمانە پێویستیان بە ددانی وردی تیژی بە بڕشت هەیە بۆ ئەمەی زوو زوو بە چەسپانی دەمی پڕ کات لە خۆراك و بە یەك جار قوتی بدات. تا بتوانێت ئەو هەموو خێرو بێرە فەراهەم بێنێ بۆ ئادەمی. سەیر تر لەمانە هەموو کۆ ئەندامی هەرسی ئەو ئاژەڵانە کە کاوێژ ئەکەن ئەو لەوەڕو خۆراکەی کە ئەیخوات لە سکیان دا ئەمێنێتەوە تا کاتی ئیسراحەت لە پەچەدا لەو کاتەدا ئەو خۆراکە ئەڕواتە بۆشایی یەك کە پێی ئەوترێ: (القلنسوة) ئینجا لەوێوە ئەگەڕێتەوە بۆ دەمی و دووبارە دەست ئەکاتەوە بە جوینێکی زۆر چاك، ئینجا لەوێوە ئەڕوات بۆ بۆشایی یەکی تر کە ناوبراوە بە (أم التلافيف) ئینجا لەوێشەوە ئەڕوات بۆ بۆشایی چوارەم کە پێی ئەوترێت (الأنفحة) ئەمەیش هەموو بەرژەوەندی ئاژەڵەکەی تێدایە، چونکە زۆربەی گژو گیا بە زەحمەت هەرس ئەکرێ و ماوەیەکی درێژیی ئەوێ هەرس کردنی، ئەوا خوای گەورە چارەسەری کردووە لە کاتی لەوەڕان دا بە پەلە عەمارەکەی پڕ ئەکات لە پاش ئەوە بە ئیسراحەت دائەنیشێ و بەو جۆرە هەرسی ئەکات، ئەگەر وا نەبوایە پیادا نەئەگەیشت، بە ڕۆژدا و لەکاتی لەوەڕان دا ئەندازەیەکی تر خواردن و پێویستی دەست کەوت نەئەبوو، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەم هەموو کاروبارە فەراهەم ئەمێنێ و هەموو شتی لە جێگای خۆیدایە.

ئینجا با هەندێ باسی پەلەوەرەکانیش بکەین، ئەوانەیان کە گیانلەبەر ئەخۆن و گۆشت خۆرن وەکو داڵ و کۆلارە خوای گەورە دەنووکی لاری تیژیی پێداون بۆ بڕین و پارە پارەی گۆشت، ئەوانەی کە لەناو ئاو و قوڕدا خۆراك پەیدا ئەکەن وەکو قازرو مراوی دەنووکی پانی درێژیی پێداون وەکو کەوچك، لەم لاو لای دەنووکەکەیانەوە چەند پەرەیەك هەن وەکو ددان بۆ ئەمەی یارمەتی بدەن بۆ بڕینی گژو گیا، ئەم جۆرە پەلەوەرە بەو جۆرەن، بەڵام پەلەوەرەکانی تر کە دانەوێڵە ئەخۆن و چینە ئەکەن لە زەوی دا وەکو مریشك و کەوو کۆتر ئەمان دەنووکەکانیان کورتن زوو بە زوو بە چەسپانی و ئاسانی چینەیان پێ ئەکەن، ئەو پەلەوەرانەی کە زۆربەی خۆراکیان ماسی یە وەك سەقا کوڕۆ ماسی گرە لەم جۆرانە دەنووکیان ئەندازەیە درێژە لەلای خوارەوەیانەوە کیسەیەك وەکو تۆڕی تۆڕەوان هەیە، بۆ ئەمەی ئەو ماسی و شتانەی ناو ئاوەکەی تێ هەڵچنێ، دەنووکی ئەو پەلەوەرانەی کە زۆربەی خواردنیان کرم و شتە، درێژو تیژن بۆ ئەمەی بە ئاسانی بکرێن بەناو زەوی دا بۆ دۆزینەوەو دەرهێنانی ئەو خۆراکەیان.

پەلەوەر هۆی هەرس و هەزم کردنی خۆراکی ئێجگار نایابە، ئەوەتا ددانی نی یە، لە باتی ئەوە چیلآنی پێداوە بۆ هەرس و هەزم کردنی خۆراك، پەلەوەر بەردو شتی رەق ئەخوات بۆ یارمەتی دانی لە هەزم کردنی خۆراکدا. ئەگەر بمانەوێ بدوێین لە عەجایەبی هەموو ئەو جۆرە گیانلەبەرانە با بە شێوەی کورتیش بدوێین بۆمان ناکرێ و پێدا ناگەین، کەواتە با ئەمەی کە باس کرا بکەین بە نموونە و باش چاوی دڵیان بۆ بخەین و بیریان لێ بکەینەوە، بۆ ئەمەی لە هەموو کاتێك دا خوای خۆمانمان لە بیر بێت و باوەڕ بە زانین و توانا و حیکمەتی لە دڵ دا جێگیر تر ببێت. بەڵێ ئیتر بەس بێت باسی گیانلەبەرە ناسراوەکان ناکەین، بەڵام لە نێوان گیانلەبەرە نەناسراوەکان دا بۆ نموونە باسی گیانلەبەرێك ئەکەین کە لەم دوایی یەدا ناسرا دوای داهاتنی وردبین، ئەو گیانلەبەرە ناو ئەبرێت بە (ئەمیبا) گیانلەبەرێکە لەناو زەلکاو و حەوزدا ئەژی، لەسەر بەردی گەورە گەورە لە دەشت و دەردا ئەم گیانلەبەرە بە چاوی رووت نابینرێ لەبەر زۆر بچووکی، بەڵکو بە وردبین ئەبینرێ لەگەڵ ئەوەدا خوای گەورە هۆی ژیان و گەڕان و هەموو پێویستی یەکی بۆ فەراهەم هێناوە.

کاتێ بیەوێ بگەڕێ چەند پارچە لەو لەشە بچووکە فڕێ ئەدات و بەکاری ئەهێنێ بۆ جوڵان و گواستنەوەی خۆی وەکو دەست و پێ‌ی گیانلەبەرانی تر، ئەو پارچانە پێ یان دەوترێ گەندە پێ (الأقدام الكاذبة)، هەرکاتێ خۆراکی بینی بۆ خۆی بە پارچەیەك یان دوو پارچەئەوخۆراکەئەگرێ و ئینجاشتێکی تەڕ لەو لەشە بچووکەی ئەڕژێنێ بەسەر خۆراکەکەدا بۆ ئەمەی بەوە هەزمی بکات ئینجا هەرچی سوودی ببێ بۆی و بەکار بێت ئەیکات بە خۆراك، ئەوی تری توڕ ئەدات لە خۆی جوێ ئەکاتەوە، بە هەموو لەشی هەناسە وەرئەگرێت.

جا با بیر بکرێتەوە لەم گیانلەبەرە بە چاوی رووت نابینرێ چۆن خوای گەورە ئەو شتانەی بۆ فەراهەم هێناوە و رێنموونی کردووە بۆ پێویستی و بەرژەوەندی خۆی، ئەم گیانلەبەرە کاتێ گەشە بکات و گەورە ببێت ئەبێ بە دوو پارچەوە، هەر پارچەیەك ئەبێ بە گیانلەبەرێکی تازە، وەکو لە پێشەوە وتمان ئەوەی وتمان نموونەیەك بوو لە عەجایەبی حەیوانات و گیانلەبەران، بێگومان ژیان و گیانی گیا و درەخت و سەوزەوات هیچ لە حەیوانات کەمتر نی یە لە نایابی و سەرسوڕهێنەری دا، هەرکەس ئەیەوێ ئەندازەیەك تێ بگات لە ئەوپەڕی بەجێ یی کرداری خوا با بە دڵێکی بە هۆش و وریاوە تەماشای کتێبەکانی عیلمی نەبات بکات، ئەو کاتە سەری لە کرداری خوا سوڕ ئەمێنێ، تا رادەیەك تێ ئەگات و تام و لەزەتی ئەم ئایەتە ئەچێژێ کە ئێستا ئەژین لەگەڵی.

وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۢ بِٱلۡبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾

---

هەر وەهایە هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرەو هەموو رووداوێك لەم بوونەوەرەدا هەمووی کات و جێ و شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، دەست نادات بۆ هیچ دەست تێخستنێك و گۆڕاندنێك، بەڵام بەهۆی نەزانی و بێ ئاگایی یەوە زۆربەی خەڵکی پەلە پەل ئەنێنەوە لە کارو فرمان دا، کاوێژ ئەکات لەبەر خۆیەوە، زۆرجار بێزاری دەرئەبڕێ و دەم درێژیی ئەکاو رەخنە لە کاری خوا ئەگرێ و بیر ناکاتەوە لە وێنەی ئەم ئایەتە تا بە دڵێکی پڕ ئارامەوە بۆ خۆی داکەوێ و چاوەڕوانی بڕیارو خواهیشی خوا بکات و هەموو کاروفرمانی بسپێرێ بە خاوەنی هەموو کاروبار.

لە ئایەتی پێشوودا ئاگاداری کردین کە هەموو شتێك لە پێشەوە زانراوەو هەموو بارو رووبەکی دیاریی کراوەو بە پێی ئەوە دروست کراوە، ئینجا ئاگادارمان ئەکات کە دروست کردنی ئەم هەمووە هیچ ئەرك و خەریك بوونێکی ناوێ و هیچ پێویستی بە هیچ شتێك نی یە جگە لەوەی خواهیشی خواو فرمانی روو بکاتە ئەو شتە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۢ بِٱلۡبَصَرِ﴾ بۆ هەر شتێك بمانەوێ بیکەین و ببێ، کارو فرمانی ئێمە هیچ نی یە جگە لە یەك شت: ئەڵێین ببەو دەست بەجێ شتەکە ئەبێت، وەکو چاو هەڵخستنێ بێ دواکەوتن و دووبارە پێ وتنەوەو بە ئاسانی[1]. بەو تەنها شتە ئەم بوون و بوونەوەرە گرنگە فەراهەم هاتووە بەو تەنها شتە گیان ئەدرێ و گیان ئەسەنرێتەوە، بەو تەنها شتە هەموو گیانلەبەرێك ئەمرێ، هەر بەوە هەموو زیندوو ئەکرێنەوە بۆ حیساب و پرسیارو تۆڵە و پاداشت، ئەو تەنها شتە نە هەوڵ و تەقەلای ئەوێ نە خەریك بوون، بێ ماندوویی و پێویستی بە کات و ماوە، هەرچی سەرکەش و بێ باوەڕەکانی گەلە پێشووەکانە بەو تەنها شتە لە ریشە هێنران، کەواتەبا ئەمانەی ئەم ئوممەتەیش بیرێك بکەنەوە: ﴿وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە هەموو بۆ یەك مەبەستەو هەریەك شت ئەگرێتەوە: هەرچی خوا بیەوێ هەر ئەوە ئەبێ بێ ئەرك و دواکەوتن.

سوێند بەخوا چەند وێنەی ئێوەمان بە هیلاك دا بردو بەربادمان كردن لەگەڵ پێشووەكان، ئەوانەی وەكو ئێوە بوون لە كوفرو بێ باوەڕیی دا، كەواتە بیر بكەنەوە و تەمێ خوار بن بە وێنەكانی خۆتان لە گەلە رابردووەكان كە باس كران و خرانە پێش چاو لە چەند زنجیرەیەك لەم سورەتەدا، ئەوانەی كە لەم دنیادا بەو جۆرە ریسوا كران و ئەو سزا سامناكەیان دەرخوارد درا هەر بەوە كۆتایی یان لێ نەمێنرا، بەڵكو هەموو كردەوەكانیان نووسراوە و لە دادگای رۆژی دوایی دا پرسیاریان لێ ئەكرێ. وەكو روون ئەبێتەوە لەم فەرمودانەوە: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ * وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ﴾[1] هەر شتێكیان كردبێ هەمووی لە دەفتەری كردەوەكانیان دایە لای مەلائیكەی دەفتەرەكان، هەموو گوناهێ یان كردەوەیەكی بچووك و گەورەیان سەرپاك نووسراوە لەسەریان. دیارە ئەمانەیان لەسەر نووسراوە بۆ لێپرسینەوە لە دادگای گەورەی رۆژی دواییداوئینجاسزای نەبڕاوەی ئاگری دۆزەخ خوا پەنامان بدات لێی.

ئینجابەرامبەرباسی سزاوجێ وشوێنی سامناكی تاوانبارەكان،دەربارەی لەخواترسەكان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ * فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾ بەڕاستی لە خواترسەكان وان لەناو رووبارو باخات و كانیاودا، وان لە جێگای دانیشتنی راستەقینەدا، و نە هیچ جۆرە ناخۆشی یەكی تێدا نی یە و دڵ و دەروون تیای دا گەرد ناگرێ و پڕ لە ئارامی و كامەرانییە. لای خوایەكن كە خاوەنی موڵك و سەڵتەنەتێكی بەهێزو فراوانە و توانا و دەسەڵات دارە بە جۆرێك هیچ شتێك لە دەستی دەرناچێ و یاخی نابێت، واتە ئەو لە خواترسانە هەرچۆنێ شوێن و جێگاو نازو نیعمەتی بەرزو فراوانیان هەیە، هەروەها خاوەن رێزو نرخن لای خوای گەورە، كەواتە ئەو لە خواترسانە لە دوو بارەوە نازو نیعمەت و خۆشی یان هەیە، نازو نیعمەتی لەش و نازو نیعمەتی دڵ و دەروون (روح).

خوا بە بەزەیی خۆی لە ریزی ئەوانەدا حەشرمان بكات و بەشدارمان بكات لەو نازو نیعمەت و رێزەدا. آمین. بۆ رەحم و بەزەیی یە بێ سنوورەكەی ئەو هیچی تێ ناچێ چاكەی وامان لەگەڵ بكات.

**وصلی الله و سلم علی حبیبنا محمد و علی آله و أصحابه أجمعین**

**تەواو بوو رۆژی دووشەممە ١٣٩٩/٢/١٧ كۆچی**

---

[1] بەچەندجۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، بەڵام ئەمەی تەفسیرەكەبەباشتر ئەزانرێ و زانینی راستەقینە لای خوایە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾

## سورەتی (الرحمن)
## مەککەیی یەو ٧٨ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە سەر تا بەخواری بریتی یە لە هەلّژماردنی چاکەو نیعمەتەکانی خوا بەسەر ئادەمی و (جن) هوە، چاکە و نیعمەتە گرنگەکانی لە هەردوو جیهان دا لەبەر ئەوە قاپی سورەتەکە ئەکاتەوە بە ناویّ لە ناوە شیرینەکانی خوا کە سیفەتێکی پیشان ئەدات سەرچاوەو هۆی هەموو نیعمەتەکانی خوایە، ئەفەرمویّ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ واتە خوایە کە رەحم و بەزەیی زۆر فراوانە، ئینجا دەست ئەکات بە باسی چاکە و نیعمەتەکان کە بەرهەمی ئەو رەحم و بەزەیی یەیە.

لە یەکەم جارەوە باسی نیعمەتێك ئەکات کە گەورەترین و بە نرخ ترینی هەموو نیعمەتەکانی خوایە لەم بوونەوەرەدا، هۆی دەستکەوتی خۆش بەختی و کامەرانی هەردوو جیهانە، ئەفەرمویّ: ﴿عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ ئەو خوایەی کە خاوەنی رەحم و بەزەیی زۆرە خەلّکی فێری قورئان کرد، بەم جۆرە لە یەکەم جارەوە پێغەمبەری فێر کرد(ﷺ)، ئینجا بەهۆی ئەوەوە خەلّکیشی فێر کردو قورئانی پیّ ناسین و ئاگاداری کردن پیّ ی. ئەو قورئانەی کە گەورەترو تێرو تەواوترین بەرنامەی ئاسمانی هێنا بۆ سەر ئەم زەوی یە و پەیوەندی خستە نێوان زەوی و دانیشتوانی زەوی لەگەلّ ئاسمان دا، ئەو قورئانەی کە قاپی هەست و فام و ژیریی ئادەمی کردەوە، زانای کرد بە خۆی و پەروەردگاری ئەو بوونەوەرەی تیای دا ئەژی، هەروەها زانای کرد بە ژیان و مەبەست لە ژیان، ئەو قورئانەی کە نرخ و رێزی دا بە ئادەمی تا رادەیەك نیشانی دا بە خەلیفەی خوا لەسەر زەوی دا، بە هەلّگری سپاردەیەك کە هەموو

ئاسمانەکان و زەوی مەترسی یان لیٚ کرد و نەیانتوانی هەڵیگرن[1]. بەڵام ئەو ڕێزو نرخە بۆ ئادەمی یەکە کە لە سروشتی خۆی لانەدا و شوێنی فەرمانی خوا بکەویٚ، ئەوەی گوێڕایەڵی خوا نەبیٚ و شوێنی فەرمانی خوا نەکەویٚ لای خوا لە هەموو گیانلەبەرێك بیٚ نرخ ترە، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾[2] کەواتە هەر ئەمە بەجیٚ یە کە لە پێشەوە باسی نیعمەتی فێر کردنی قورئان ئەکات، ئینجا باسی دروست کردنی ئادەمی ئەکات و ئەفەرمویٚ: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ * عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ﴾ خوای خاوەن ڕەحم و بەزەیی ئادەمی دروست کردو فێری گفتوگۆی کرد، چونکە بیٚ پەیڕەوی قورئان ئادەمێتی ناگونجیٚ و بەدی نایەت. لێکۆڵینەوە و بیر کردنەوە لە دروست کردنی ئادەمی دوا ئەخەین بۆ شوێنێکی تر لەم سورەتەدا لە پاش چەند ئایەتێکی تر، ئێستا لێرەدا هەندیٚ ئەکۆڵینەوە و بیر ئەکەینەوە لە نایابی نیعمەتی فێر کردنی گفتوگۆ، ئەم نیعمەتە گەورەیە، ئەم بەخششە گرنگە، ئەم شتە نایابە سەرسوڕهێنەرە بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە گرنگی و نایابی یەکەی فەرامۆش ئەکریٚ، ئەوا قورئان بێدارمان ئەکاتەوە لیٚ ی بۆ ئەمەی بیری لیٚ بکرێتەوە تا نرخ و ڕێزی بزانریٚ و چاولەبەری بۆ خوا لە دەروون دا جێگیر ببێت لەسەر ئەم نیعمەتە گەورەیە کە پێویستی و ناچاری هەیە بۆی، خوای گەورە بە سووك و ئاسان و بە لێشاو داویەتی بە ئادەمی، بێگومان پێکهێنانی کۆئەندامی گفتوگۆ هەر خۆی بە تەنیا شتێکی زۆر نایابی سەرسوڕهێنەرە، زمان و هەردوو لێوو ملاژوو ناو دەم و ددان و گەروو بۆری هەناسە و سی یەکان، ئەمانە و ئەندامەکانی تر چۆن هەموو پێك هێنراون لە تەنها (خلیە) یەك، ئەم کۆ ئەندامە چەند کەرەسەیەکی میکانیکین بە تەنیا ئیش ناکەن، بەڵکو ئیش کردنیان لە پێشەوە بەستراوە بە گورچیلە و مێشکی سەرو دەمارەکانەوە، ئینجا بەستراوە بە عەقڵەوە کە ئێمە هیچی لیٚ نازانین و ئاگادار نین لە چۆنیەتی خۆی و کردەوەکانی، ئینجا با بزانین مرۆۆ چۆن وتەی ئەڵیٚ؟

---

[1] هێما بۆ ئایەتی: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ ﴾ لە دوا دوایی سورەتی ﴿الأحزاب﴾ دا ئەکات.

[2] واتە خراپترینی هەموو گیانلەبەرێك بەلای خواوە کەسانێکن کە کافرن. سورەتی ﴿الأنفال /٥٥﴾.

بێگومان وتنی هەموو وشەیەك، بەڵكو هەموو پیتێك بە چەند كۆئەندامیێ، بە بڕینی چەند قۆناغێك فەراهەم دێت، هەتا ئێستاش هەندێ لەوانە نەناسراون و ڕێ یان پێ نەبراوە. بۆ هەموو وتەو وشەیەك پێویستە لە یەكەم جارەوە هەست بكرێت بە پێویستی بە وتنی، ئینجا ئەو هەستە لە عەقڵەوە یان لە هێزی زانینەوە یان لە ڕۆحەوە دەرئەچێت بۆلای مۆخ ئیتر نازانین ئەو هەستە چۆن ئەڕوات؟ ئینجا مۆخیش لە ڕێگەی دەمارەوە فەرمان ئەدات بە وتنی ئەو وتەیە، ئینجا سی یەكان هەندێ هەوا دەرئەكەن بۆ بۆری هەناسە، لەو بۆری یەوە بۆ گەروو بۆ دەمارە ئاوازی یەكان، ئیتر ئەو هەوا دەنگ ئەداتەوە لە گەروو قوڕگ دا، ئەبێ بەو دەنگە تایبەتی یانە بە گوێرەی خواهیش و ویستی عەقڵ، دەنگی بەرز یان نزم چەسپان یان سست، نەرم و ناسك یان زوڵاڵ و گەورە، بەهەر جۆر و شێوەیەكی تر، ئەو دەنگە لە گەرووەوە دێت بۆ ناو دەم و دان و زمان، ئەو دەنگە دابەش ئەبێت لە گەرووەوە تا لێو لە جێگای وتنی هەموو پیتێك دا جۆرو شێوەی ئەو پیتەو ئاوازەی تایبەتی ئەو پیتە نیشان ئەدات و ئەیدات بە گوێچكەی گوێ گراندا. وتنی هەموو وشە و پیتێك بەم هەموو كردەوە گرنگانە فەراهەم دێت جا وەرە با خەیاڵ بهاوێژین و بیر بكەینەوە لەم هەموو وتارە دوورو درێژانە كە بە چەسپانی بێ گیرو گرفت خوای گەورە فەراهەمی ئەهێنێ لە ئادەمی دا بێ ئەمەی ئادەمی هیچ ئەركێك بكەوێتە سەر شانی یان هۆشی بەلای ئەم هەموو كردەوە گرنگانەوە هەبێ. هەزاران جار تاكی و بێگەردی بۆ خوای بێ وێنە و تاك و تەنیا.

ئینجا دەست ئەكات بە باسی هەندێ لە نیعمەتەكانی خوای گەورە لەناو ئەم پێشانگای گشتی بوونەوەرەدا، لە یەكەم جارەوە باسی خۆرو مانگ ئەكات، كە هۆی ژیان و گوزەرانن لەم جیهانەدا، بە بێ ئەمان ژیان ناگونجێ، ئەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ﴾ خۆرو مانگ ئەگەڕێن لە خولگەی خۆیان دا و قۆناغ و مەنزڵەكانیان ئەبڕن بە حیسابێكی زۆر وردی زانراوی دیاریی كراو، بە ڕژێمێكی زۆر تێرو تەواو و بێ كەم و كوڕی و بەرو دواو زیادە

زەوی، بە گوێرەی بەرژەوەندی ئەم ژیانەی ئێمەیە. خۆر گرنگترین ئەستێرەیە بۆ ئێمەی دانیشتووی ئەم زەوی یەی خۆمان و زەوی یەکەمان و ژیانمان لەسەر رووناکی و گەرمی و راکێشەری خۆرە، هەروەها مانگیش هۆیەکی بەهێزە بۆ ژیانمان، بەرهەمێکی گرنگی هەیە، ئیش کەرێکی بەکارە لە پێکهێنانی (مد و جزر) ی ئاوی دەریاکان، خۆرو مانگ هەرچۆنێ گەڕان و خولانەوەیان بە حسابە و دیاریی کراوە لە رادەیەك دایە رێك و گونجاوە لەگەڵ ژیانی ئێمەدا، هەرچۆنێ لەم بارەوە بەو جۆرەن، هەروەها لە هەموو باری ترەوە شیاو و گونجاوو مل کەچ کراون بۆ ئەوەی ئەم ژیانی ئێمە بەسەر ببرێ.

خۆر بە پێی زانیاری تازە (٩٢,٥) ملیۆن میل دورە لە ئێمەوە ئەگەر لەوە نزیك تر بوایە زەوی ئەسوتا، یان ئەتوایەوە، یان ئەبوو بە دەریا و بەرز ئەبووەوە لە بۆشایی ئاسمان دا، ئەگەر دوورتر بوایە لە رادەی ئێستا هەموو لە سەرمان دا ئەمردین و ژیان نەئەما لەسەر زەوی دا، بڕی ئەو گەرمی یە ئەیدات بەم جیهانی ئێمە بریتی یە لە تەنها بەشێ لە ملیۆن بەشی گەرمی خۆی (٠,٠٠٠٠٠١) ئەم ئەندازە شیاوو گونجاوە بۆ ئێمە، ئیتر نە زیادو نە کەمتر ناگونجێ.

هەروەها مانگ ئەگەر قەبارەی گەورەتر بوایە یان رادەی دووری یەکەی زیاتر بوایە لەم بارەی ئێستا لە سەریەتی ئەو کاتە لافاو هەڵئەستا و هەموو زەوی ئەبوو بە ژێر ئاوی دەریاکانەوە، بەهۆی هێزی (مد)ەوە، ئەگەر هێزی راکێشەر بۆ ئەم زەوی یە لەم رادەی ئێستا بەهێزتر بوایە یان بێ هێز تر بوایە، ئەو کاتە گوزەران نەئەکرا، بەڵکو هەموو شتێ ئەشێوا، چونکە ئەو کاتە ئەم بارو جێگا و شوێنەی ئێستای ئەگۆڕا لە نێوان ئەم کۆمەڵەی خۆری ئێمەدا کە رژێمێکی تایبەتی هەیە، لە سەعاتێك دا بە کۆمەڵی پێکەوە (٢٠٠٠٠) میل ئەبڕن بەرەو (برج الجبار) بە هەزارەها با بڵێین سبحان الله، بە سەرسامی یەوە بیرێك بکەینەوە لەم هەموو ئەستێرانە کە بە ملیۆنەها ژمارە ئەکرێن، هیچ کامیان بە موو لانادەن لە خولگەی خۆیان، ئەو هاوسەنگی و هاوتایی یەی کە هەیە لە نێوان ئەندازەی قەبارەو رادەی گەڕان و خولانەوەیان بە هیچ رەنگ هیچ گۆڕان و زیاد و کەمی روویان تێ ناکات!!

وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٩﴾

---

**له ئایەتی پێشوودا باسی گوێڕایەڵی و مل کەچی خۆرو مانگی کرد کە دوو نموونەن بۆ جیهانی بەرزی ئاسمانی، ئینجا دێتە خوارەوە بۆ زەوی بۆ ئەم جیهانەیش دوو نموونە ئەهێنێ و ئەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ﴾[1] درەختی بێ ساق و درەختی ساق دار کڕنۆش ئەبەن و مل کەچن بۆ خوای خۆیان، واتە هەموو سەوزەو کشتوکاڵ و دارو درەخت گوێڕایەڵ و مل کەچن بۆ خواهیشی خوا، ئەو جیاوازی خۆیان و بەرووبوومەیان کە هەیانە لە تام و بۆن و رەنگ و رادەو ئەندازەیان ئەمانە لەبەر هەموو مل کەچی یانە بۆ خواهیشی خوای خۆیان. ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ﴾ خوا ئاسمانی دروست کردووە بە بەرزی، بەرزی کردووەتەوە لە پێش چاودا، هەروەها بەرزی کردووە لە رێزو شان و شەرەف دا، ئەوەتا کردوویەتی بە سەرچاوەی هەموو ئایین و بەرنامەکانی کە لە ئاسمانەوە هاتوونەتە خوارەوە بۆ بەندەکانی لەم جیهانەدا، کردوویەتی بە جێ و شوێنی ئەو هەموو فریشتە بەرێزانە، ئاسمان – بە هەر مانا و مەبەستێ بگیرێ – بیر لێ کردنەوەی دڵی بێ ئاگا وریا ئەکاتەوە و ئەو دەستە قودرەتەی پیشان ئەدات کە ئەو ئاسمانە گەورە فراوانەی دروست کردووە بەو هەموو جوانی و شیرینی و رژێمی رێك و راست و نەگۆڕاوەیەوە، لەبەر ئەوە قورئان هەموو جارێ سەرنج رائەکێشێ بۆ لای ئاسمان، خوای گەورە هەرچۆنێ ئەو ئاسمانە گرنگەی دروست کردووە، هەروەها تەرازووی راستی و عەدالەتی داناوە بۆ دیاریی کردنی نرخی هەموو خاوەن نرخێ، بۆ روون کردنەوەی رادەی هەموو شتێ و دانانی هەموو شتێ لە شوێن و پلەی تایبەتی خۆیدا. ئەو تەرازووە راستەی داهێناوە لە سروشت دا، لە هەموو بەرنامەکانی خۆی دا کە لە ئاسمانەوە ناردی یە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – ئەو بەرنامانەی کە قورئانی کرد بە دواترینی هەموو و نوێنەری هەموویان هەتا هەتایە، ئەو بەرنامەی کە ئەم قورئانە هێنای عەدلی رووتەو لە هەموو کارو فرمانێك دا ناوەڕاستی گرتووە بێ ئەم لاو ئەولا، بە بێ کەم و کوڕی و زیادە رەوی.**

---

[1] هەندێ فەرمویانەمەبەست بە﴿النجم﴾ئەستێرەیە، بەم جۆرەیش ئەبێ، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکەبەهێزترەلای زانایان.

بۆ وێنە لە بابەت عەقیدە و باوەڕی تاك و تەنیایی خوا هەیە کە ناوەڕاستە لە نێوان بێ باوەڕی و ئیلحاد و شەریك و هاوبەش بڕیاردان کە دوو باری ناڕەوان بەلای هەموو ژیریی یەکی راستەوە، لەبابەت کردەوەدا فرمان ئەدات بە عیبادەت کردن کە ناوەڕاستە بۆ دوو باری ناڕەوا: بەتالی و رەهبانێتی – گۆشە نشینی – کە بریتی یە لە تەنیا عیبادەت کردن و واز هێنان لە هەموو شتێك، لە بابەت پێویستی لەش و رۆحەوە هەر ناوەڕاستی گرتووە: نە بەرگری ئەکات لە هەموو ئارەزووی خۆشی یەك، نە جڵەوی نەفسیش بەرەڵا ئەکات بە ئارەزووی خۆی بجووڵێتەوە، بەڵکو هەموو خۆشی و رابواردنێکی پاك و خاوێن و بێ زیانی رەوا داوە، ئارەزوویەکی قەدەغە کردووە کە چەپەڵ و زیان دارە، هەروەها لە بابەت خووڕەوشت و هەموو کاروبارێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هەموو شتێکی ترەوە، بەڵکو خوای گەورە ئەو عەدلەی بەکارهێناوە لە هەموو بوونەوەردا وەکو لە حەدیس دا هاتووە: ﴿بالعدل قامت السموات و الأرض﴾. بەڵێ بەڕاستی ئەم بوونەوەرە بە هەموو پارچە و کەرەسەکانی یەوە لە رادەیەك دایە دەست نادات بۆ زیادو کەم وەکو لە چەند شوێنێك دا چەند نموونەیەکمان باس کرد لە زانیاری تازەدا رێ یان پێ براوە، ئەو نموونانە بەسن بۆ ئەمەی بکرێن بە هۆی روون بوونەوەی ئەم مەبەستە.

خوای گەورە عەدلی داهێناو فەرمانی پێداو هۆکەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ﴾ بۆ ئەمەی ئێوە سەرکەشی و زیادە رەوی نەکەن و لە سنووری عەدل و حەقیانەت دەرنەچن لە هیچ رەفتارو کردارو بڕیارێکتان دا، هەموو شتێ بە پێی ئەو تەرازووە راستە بێت کە خوا دایناوە، بێگومان ئەو کاتە ئادەمی ئەگاتە رادەو پلەی هەرە بەرزی خۆی، ژیانی کامەرانی تەنها ئەو کاتە دەست کەوت ئەبێ و بەسەر ئەبرێ.

ئینجا ئەو مەبەستە دووبارە ئەکاتەوە و فەرمانی پێ ئەداتەوە لەبەر زیادە هاندان لەسەر بەکارهێنان و دەست پێوە گرتنی، ﴿ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾[1] کێشان و پێوانە بە رێکی بکەن بە پێی عەدل و حەقیانەت و کەم و کوڕی یەك نەکەن لە کێشراودا، ترازووی عەدالەت لارو خوار نەکەن.

---

[1] ئەم ئایەتانە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی لەم تەفسیرەدا وتراوە بەهێزترەو رای زۆرتری لەسەرە، خوا خۆی زانایە.

﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ١٠ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ١١ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ١٢ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾

---

ئینجا له بەرامبەر ئاسمانەوە باسی نیعمەتی زەوی ئەکات ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ﴾ زەوی دروست کردووە بە نزمی و رای خستووە بۆ ئەمەی بژین بەسەریەوە، رابوێرن و سوود و خۆشی وەرگرن لە خێرو بێری.

ژیانی خەڵکی لەسەر ئەم زەوی یە و ئارام گرتنیان بەسەریەوە بە خۆشی و کامەرانی ئێجگار نیعمەتێکی بەنرخە، بەلاّم بەهۆی ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە رێزو نرخی لە پێش چاو وون بووەو هەست ناکرێ بە گرنگی ئەم نیعمەتە گەورەیە مەگەر کاتی بومەلەرزە، یان بورکانێك کە روو بدات لە ولاّتێك دا ئەو کاتە دانیشتوانی ئەو شوێنە نرخی ئەم نیعمەتەیان بیر ئەکەوێتەوە. بەڵێ بەڕاستی زۆر پێویستە لەسەر خەڵکی بیر بکەنەوە و چاو لەبەریی خۆیان دەربڕن بەرامبەر ئەم نیعمەتە گرنگە، بیر بکەنەوە کە خوای خاوەن بەزەیی ئەم زەوی یەی ژێر بار کردووە بۆ خەڵکی لە هەموو بارو روویەکەوە، کە پێویستی ژیان هەبێ پێ ی، پێویستە بیر بکەنەوە لەم نیعمەتە گرنگە و هەموو نیعمەتەکانی تری بۆ ئەمەی شەرم داگیریان بکات و خۆیان بگێرنەوە لە تاوان و خراپەکاری، ئینجا بە تایبەتی هەندێ لە نیعمەتە ئاشکراکانی باس ئەکات کە لەم زەوی یەدا فەراهەمی هێناوەو ژیان پێویستی و ناچاری هەیە پێیان.

ئەفەرموێ: ﴿فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ * وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ﴾ لەو زەوی یەدا هەیە میوەی خۆش و بە لەزەت، دار خورما کە خاوەنی کیس و قەباغە بۆ گوڵ و خونچەکانی کە بەرەکەی لێ پەیدا ئەبێ، دانەوێڵەیەك کە ساق و پەل و پۆ دارە، تا ببێ بە (کا) بۆ خۆراکی مەڕو ماڵات و چوارپێ، گیاو سەوزەیە کە بۆنی خۆشە، هەندێکی خۆراکی ئامادەیە و هەندێ تر بۆ ماڵاتە و هەندێ تری بۆ بۆن و هەناسە خۆشی یە، ئەمانە هەموو خوای گەورە فەراهەمی هێناون لەو زەوی یەدا کە دروستی کردووە بۆ خەڵکی، لە یەکەم جارەوە میوەی باس کرد کە تەنها بۆ خۆشی و لەزەتە، ئینجا خورما کە میوەو خۆراکە، ئینجا دانەوێڵە کە خۆراکە و ژیان لەسەر ئەوە وەستاوە لە هەموو ولاّت دا، خورمای بە تایبەتی باس کرد، چونکە هەردوو بارەکەی هەیە، میوەیشە و خۆراکیشە، کەواتە وەکو شتێکی جیاواز وایە، لە

وڵاتی عەرەب دا زۆرو ناسراوە، کەواتە یەکەم چینێ – کە عەرەب بوون ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا – باشتر نرخی خورمایان ئەزانی، هەروەها خورما سوودی زیاترە، چونکە سەبەتە و زەمیلە و کورسی و حەسیری لێ دروست ئەکرێ بە پەل و پۆو دارەکەیشی سەری خانوو ئەگیرێ. کەواتە شایانی ئەوەیە بە تایبەتی باس بکرێ.

پاش هەڵژماردنی ئەم چەند نیعمەتە گرنگانە: فێر کردنی قورئان، دروست کردنی ئادەمی، فێرکردنی قسە و گفتوگۆ، دروست کردنی خۆرو مانگ و خستنە کار و ئیشیان بە رێکی، بەرزکردنەوەی ئاسمان و دانانی ترازوو عەدل و حەقیانەت، دروست کردن و راخستنی زەوی بۆ خەڵکی لەگەڵ فەراهەم هێنانی ئەو هەموو میوەو خورما و دانەوێڵە و گیاو گوڵی بۆن خۆشەدا، پاش باسی ئەمانە ئینجا ئەفەرموێ بە تیرەی جن و ئادەمی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾[1] ئینجا ئەی کۆمەڵی جن و ئادەمی ئایا ئێوە بە کام نیعمەت لەو کۆمەڵە نیعمەتانەی پەروەردگاری خۆتان باوەڕتان نی یە و دانی پێدا نانێن؟ واتە ئەم هەموو نیعمەتە گەورە گەورانە لە دەستی دەسەڵات و بەزەیی خواوە دەرچوون و هیچ کەس ڕێگای نی یە لە کەسی تریانەوە بناسێ، کەواتە ئەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێك بۆ خوا ڕەوا نەدرێ و سوپاسی تەنها ئەو بکرێ و تەنها ئەو بپەرسترێ، ئەم ڕستەیە ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ (٣١) جار، لەم سورەتەدا هەیە، هەشت جار لە پاش هەڵژماردنی هەندێ لە نیعمەتەکانی خوای گەورە، ئینجا حەوت جار لە کاتی باسی ئاگری دۆزەخ دا بە ئەندازەی قاپی یەکانی دۆزەخ، بەم بۆنەوە کە ڕزگار بووین لێ یان نیعمەتێکی گرنگە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە، ئینجا هەشت جاری تر لە کاتی باسی ئەو بەهەشتەی کە لە پێشەوە باسی ئەکات ئەمەیش بە ئەندازەی هەشت قاپی یەکەی بەهەشت، هەروەها هەشت جاری تر لەکاتی باسی ئەو دوو بەهەشتەکەی تر کە ڕادەیان ناگاتە دوو بەهەشتە پێشووەکە، هێنان و وتنەوەی ئەم ڕستەیە زۆر گرنگ و پێویستە بۆ ئامۆژگاری و بیر خستنەوەی ئەو هەموو نیعمەتە گەورە گەورانە، بەڵکو سەری بەندەیی شۆڕ بکرێ بۆ ئەو کەسەی ئەو نیعمەتانەی فەراهەم هێناوە بۆ بەندەکانی، ئەوەش ڕەوشتێکە باوەو زۆر بەکار ئەهێنرێ لە هەموو زمانێك دا بە تایبەتی لە زمانی عەرەب دا لە شیعرو لە غەیری شیعرداو پێویست نییە بەهێنانی هیچ وێنەو نموونەیەك، چونکە ناسراوو بەناوبانگە.

---

[1] ئەم پرسیارە بۆتەقریرە، واتەهاندانی بەندەلەسەردان نان بەنیعمەتەکانی خواداو ئینجا پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا.

هەرکەس ئەم رستەیەی خوێند، یان گوێی لە خوێندنی بێت سوننەتە ﴿ولا بشيء من نعمك ربنا نكذب فلك الحمد﴾[1] هەندێ لەو نیعمەتانەی کە لەمەو پێش باسی فەرمو پێویستی هەیە بە زیادە روون کردنەوە ئەوا بەڕێز بە کورت و چەسپانی باسیان ئەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴾ ئادەمی دروست کردووە لە قوڕێکی وشك بووەوە تا رادەیەك ئەگەر تەقەی لێ درێ دەنگ بداتەوە وەکو سواڵەت، واتە ئەو قوڕەی کە سور بکرێتەوە بە ئاگر وەکو گوزەو دیزە. لە قورئاندا بە چەند جۆرێك باسی دروست کردنی ئادەمی فەرمووە: خۆڵ، قوڕ، قوڕی ترشاو، قوڕی مچ، ئەوانە هەموو راستە و چەند قۆناغێك بوون رابوردن بەسەر دروست بوونی باوکی هەموو ئادەمیدا[2]. زانیاری تازە تا ئێستا بیست کەرەسەی لە لەشی ئادەمی دا دۆزیوەتەوە کە بریتین لە: کاربۆن، ئۆکسجین، هایدرۆجین، فۆسفۆر، گۆگرد، ئازۆت، کالیسیۆم، پۆتاسیۆم، کلۆر، مەغنیسیۆم، ئاسن، مەنگەنیز، مس، یۆد، فلۆرین، کۆباڵت، زەنگ، سەلەکسۆن، ئەلەمنیۆم. ئەڵێن خاکیش لەم کەرەسانە پێك هاتووە.

جا وەرە با هەر سەرسام بین و سەرمان سوڕ بمێنێ لە کرداری خوای گەورە کە ئەم کەرەسانە خۆیان چین؟ چۆن فەراهەم هێنران؟ چۆن کۆکرانەوە و یەکگر کران بە رادەو نیسبەتێکی تایبەتی، یارمەتی و کۆمەکی فەراهەم هێنرا لە نێوان ئەو کەرەسەیانەدا؟!

لەپاش باسی دروست کردنی ئادەمی ئەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴾ خوا جنی دروست کرد لە بڵێسەی ئاگرێ کە خاوێن بێ لە دوکەڵ، یان تێکەڵ لە سەوزو سورو زەرد، لە بابەت چۆنێتی دروست کردنی (جن) لە ئاگر ئێمە هیچی لێ نازانین، چونکە ئەوە شتێکە لە سنووری زانینی ئێمە بە دەرە، کەواتە قورئان چۆنی فەرمووە هەر بەو جۆرە بەسەری دا تێ ئەپەڕین و هیچ ناڵێین. بەڵام ئەزانین کە ئەو تیرەیە توانای ژیانی هەیە بەسەر ئەم زەوی یەوە بەس، ئیتر چۆنێتی ژیانەکەیان نازانین، هەروەها ئەزانین و باوەڕمان هەیە کە ئەم قورئانە بۆ ئەوانیش هاتووە، قسە لەگەڵ ئەوانیش ئەکات وەکو بە درێژیی باسمان کرد لە دوادوایی سورەتی ﴿الأحقاف﴾دا.

---

[1] واتە خوایە بێ باوەڕ نین بە هیچ نیعمەتێ لە نیعمەتەکانت، سوپاس تەنها بۆ تۆیە.

[2] با تەماشای تەفسیری ﴿إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴾ بکرێ لە سورەتەی ﴿الصافات﴾.

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾

---

**هەروەها ئەوەتا لەم سورەتەیشدا هەموو جارێ بێ جیاوازی بە تێکڕایی لەگەڵ ئادەمیدا پێیان ئەفەرموێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴾ خوا پەروەردگاری هەردوو رۆژهەڵات و پەروەردگاری هەردوو رۆژئاوایە. مەبەست بەم دووانە رۆژهەڵات و رۆژئاوای مانگ و خۆرە بە بۆنەی ئەوەوە کە لە پێشەوە باسی مانگ و خۆری کرد، یان مەبەست هەر خۆرە بە گوێرەی جیاوازی شوێنەکانیان لە هاوین و زستان دا کە گۆڕانی چوار وەرزەیان لەسەرە کە زۆر نیعمەتێکی گرنگن لە ژیان دا، بە هەرکام و بە هەر بار ئەوەی کە زۆر تر گرنگ و مەبەستی سەرنج راکێشانە و هەست بێدار کردنەوەیە بۆ بیر کردنەوە و تەماشا کردنی ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەو هەموو ئاوا بوون و هەڵاتنە فەراهەم ئەهێنێ، بەو رژێمە دامەزراوە نەگۆڕاوە، بێگومان پەروەردگاری خوا بۆ ئەو رۆژهەڵات و رۆژئاوایانە، هەندێکە لە نیعمەتە گەورەکانی خوا لەم بوونەوەرەدا، چونکە ژیان بەسەر ئەم زەویەوە ناگونجێ بە بێ ئەو هەڵاتن و ئاوا بوونە، کەواتە زۆر جێگای خۆیەتی کە بێدارمان ئەکاتەوە بەو هەموو نیعمەت و بەرهەمە گرنگانە کە دەست کەوتمان ئەبن لە پەروەردگارێتی خوای گەورە بۆ ئەو رۆژهەڵات و رۆژ ئاوایانە، هەروەها زۆر جێگای خۆیەتی کە لێرەش دا ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ ئینجا دێتەوە بۆ زەوی بۆ باسی ئەو ئاوەی کە فەراهەمی هێناوە لە زەوی دا بە ئەندازێکی دیاریی کراوی نەگۆڕاو، ئەفەرموێ: ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ * بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴾ دوو جۆر ئاوو دەریای بەرەڵا کردووە: سوێرو شیرین وان لە پاڵی یەك دا و ئەگەن بە یەك، بەڵام هیچیان زاڵ نابن بەسەر ئەوی تریان دا، لە سنووری دیاریی کراوو فرمانی تایبەتی خۆیان**

تێناپەڕن، بە کرداری خوا لە نێوانیان دا بەرگرێ هەیە بەربەستیان ئەکات لە زاڵ بوون بەسەر یەك دا و یەك خستنی یەکتر[1]. دابەش کردنی ئاو بەم شێوەی کە هەیە شتێك نی یە هەروا بە رێکەوت بەڵکو وەکو هەموو شتی تر دیاریی کراوە بە دیاریی کردنێکی وا دەست نادات بۆ گۆڕان و زیاد و کەم. ئەم زەوی یەی کە بەسەریەوە ئەژین لە چوار بەش پێك هاتووە، سێ بەشی ئاوی سوێر دایپۆشیوە، ئەم ئەندازە زۆر و فراوانە پێویستی هەیە پێ‌ی بۆ بەردەوام بوونی ژیان لەم زەوی یەدا.

خاوەنی پەڕاوی ﴿العلم يدعو للإيمان﴾ ئەڵێ: هەموو کات بە درێژیی هەموو چەرخێ هەڵم و غاز لە زەوی یەوە دێتە دەر و بەرز ئەبێتەوە، زۆربەی ئەو هەڵم و غازە ژاراوی یە، کەواتە ئەبوایە هەوای پیس و ژاراوی بکردایە، کەچی هەروا بە پاکی هەر ئەمێنێتەوە و ئەو هەموو ژارە کاری لێ ناکات، هۆی ئەوەیش ئەو هەموو دەریا لوشە سوێر و تاڵەیە. لە بارێ ترەوە لەو دەریا و دەریا لوشانەوە بەهۆی گەرمی خۆرەوە تەم و هەڵم بەرز ئەبێتەوەو ئەبێ بە باران و دەشت و دەرو چیاکان زیندوو ئەکاتەوە و درەخت و دانەوێڵە سەوز ئەبن و ئەروێن، لەوئاوە سوێروتاڵەدەستی قودرەت ئەم ئاوە پاك و خاوێن و شیرینە فەراهەم ئەهێنێ کە ژیان بەوە راوەستاوە، لە کانیاو و چەشمەکان دا هەڵ ئەقوڵێنێ و ئەو هەموو رووبارەی لێ پەیدائەبێ و ئینجابەوهەموو سوێری و تاڵی یەوە کە لەسەر زەوی وەری ئەگرن ئەڕۆن ئەڕژێنە ناودەریاکانەوە، ئینجائەرووبارەکان دەریاکان ئەگۆڕن، ئەدەریاکان ئەمان ئەگۆڕن.

ئا بەم جۆرە خوای گەورە ئەم ئاوەی کردووە بە هۆی ژیان و گوزەرانی ئێمە و هەموو گیانلەبەران، کەواتە زۆر راست و بەجێ یە کە لێرەیش دا ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾.

ئەگەر ئاوی سوێر نەبوایە ژارو میکرۆبەکان ژیانیان نەئەهێشت، ئەگەر ئاوی شیرین نەبوایە لە تینوان ئەخنکاین، خۆراکیشمان نەئەبوو، ئینجا بە تایبەتی باسی هەندێ لە

---

[1] بە چەند جۆرێ تر تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەمەیان تەواوو بەهێزترە. زانین لای خوایە.

دەست کەوتی ئادەمی ئەکات لەو دەریایانەوە ئەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾ [1] لەو دوو جۆرە دەریا لۆلۆ و مەرجان دەرئەچێ کە ئێمە سوودو خۆشی لێ وەرئەگرین. (لۆلۆ) کە لە دوڕو گەوهەرە، لە بنەڕەت دا لە گیانلەبەرە لە بنج و ناو قوڵایی ئاوەکەدا ئەژی، لەناو قەباخێك دایە سەخت و بەتین، بۆ ئەمەی بیپارێزێ لە هەموو شتێکی خەتەر کە رووی تێ بکات، ئەم گیانلەبەرە جیاوازە لە گیانلەبەرەکانی تر لە پێك هاتنی لەش و رێگای ژیانی دا تۆڕو داوێکی ورد و بارێکی هەیە وەکو تۆڕو داوی ماسی گر، بەلاّم زۆر نایاب تەنراوە ئاوو هەواو خۆراك ئەدا بەو گیانلەبەرە و بەرگری زیخ و لم و شتی تری لێ ئەکات، لە ژێر ئەو تۆڕەو داوەدا ئەو گیانلەبەرە چەند دەمێکی هەیە و هەموو دەمێکی چوار لێوی هەیە، ئینجا کاتێ پارچە بەردێ، یان هەر شتێ تر بکەوێتە ناو سەدەفەکەیەوە، واتە – قەباخەکەی – کوت و پڕ ئەو گیانلەبەرە شتێ لە لەشی دەرئەکا وەکو لیك و رینگ ئەو شتەی پێ دائەپۆشێ کە کەوتۆتە ناو قەباخەکەیەوە لە پاشان ئەیبەستێ و ئەبێ بەو گەوهەرەی کە پێی ئەوترێ (لۆلۆ). ئەندازەی بە گوێرەی گەورەو بچووکی ئەو شتەیە کە ئەکەوێتە ناو قەباخەکەیەوە، هەروەها (مرجانیش) گیانلەبەرێکی نایابە لە دەریای قوڵ دا ئەژی لە ٥ مەترەوە تا ٦٠٠ مەتر. ژێری خۆی ئەنووسێنێ بە بەردێکەوە، یان شتێ تر، کونی دەمی کە لای سەروویەتی لە هەموو لایەکی یەوە چەند پەل و پۆپەکی هەیە، ئەو پەل و پۆپە بەکار ئەهێنێ بۆ دەست کەوتنی خۆراکێ، بەم جۆرە هەر شتێ گیانلەبەر بێ، یان هەرشتێ تر بکەوێ لەو پەل و پۆپە دەست بەجێ ئەنووسێن پێ یەوەو پەکی ئەخەن و گرژ ئەبن و لار ئەبنەوە بۆ ناو دەمی و ئینجا شتەکە ئەچێتە ناو سکی.

---

[1] لەمەوپێش وا گومان ئەبرا کە ئەم دووانە هەر لە ئاوی سوێر پەیدا ئەبن، لەبەر ئەوە تەئویلێکیان ئەکرد بۆ دیمەنی ئایەتەکە، بەلاّم لەم دوایی یەدا دەرکەوت و دۆزرایەوە کە لە ئاوی شیرینیش پەیدا ئەبن، کەواتە هیچ تەئویلی ناوێ، زانینی راستەقینە لای خوایە.

﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾

---

ئەم مەرجانە شێوەی وەکو درەخت وایە درێژیی ئەگاتە ٣٠ سانتی مەتر، رەنگی لە هەمە بابەتە: زەردو سورو مێخەکی و پرتەقاڵی و شین و هەروەها. لەم لۆلۆ و مەرجانە خشڵی نایابی بەنرخ دروست ئەکرێ، کەواتە خوای گەورە منەت ئەنێ بەسەر بەندەکانی دا، بۆیە بە دوا بە دوای باسی ئەمانیش دا ئەفەرموێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾. ئینجا باسی ئەو هەموو کەشتی و پاپۆڕە ئەکات کە فەراهەمی هێناوە بۆ سوودو بەرژەوەندی بەندەکانی ئەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ﴾ ئەو هەموو کەشتی یە گەورە گەورانە لەناو دەریادا کە لە بەرزی و گەورەیی دا لە دوورەوە وەکو شاخ و چیاکانی سەر زەوی وان ئەوانە هەموو هینی خوان (دروست کراوی خوان). ئەفەرموێ هینی خوان، چونکە بە دەسەڵاتی ئەو ئەگەڕێن، ئەو پارێزگاری یان ئەکات لەناو ئەو هەموو شەپۆلی ئاوەدا و ئەگەر ئەو هەموو هۆی گەڕان و نوقوم نەبوونەی فەراهەم نەهێنایە ئەو کارە گرنگە جێ بەجێ نەئەبوو، ئەو شتە گەورەیە بەسەر ئاوەوە نەئەگەڕا، بێگومان هەر لە کۆنەوە تا ئێستا و لەمەو پاشیش کەشتی لە بەهرە گرنگەکانی خوایە، هۆیەکی بەهێزی گرنگە بۆ ژیان لە چەند روویەکەوە، زۆر شایانی ئەوەیە بە تایبەتی باس بکرێ و بخرێتە پێش چاو، مافی خۆیەتی بە وێنەی بەهرە گرنگەکانی تر ئەم رستەیەی بە دوای دا هێنا ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾.

لەم کاتەدا کە ئەم هەموو بەهرە گەورە و گرنگانەی خستە بەرچاو لەم پێشانگا فراوانەی بوونەوەردا، لەم کاتەدا کە شایانە قاپی دڵ بکرێتەوە و هەست و هۆش بەتین و بەهێز بن، لەم کاتەدا بەم دوو شتە گرنگە راستە بێدارمان ئەکاتەوە نەمانی هەمووان و مانەوەی خوای گەورە بە تاک و تەنها ئەفەرموێ: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ * وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾[1] هەموو ئەوانەی وان بەسەر زەوی یەوە نامێنن، خوای تۆ ئەمێنێتەوە کە خاوەنی گەورەیی یە و

---

[1] لەم فەرمودەیەدا هەڕەشە و بەڵێن ئەیە. بە سیفەتی یەکەم هەڕەشە ئەکات لە تاوانباران و سەرکەشان، بە سیفەتی دووەم بەڵێن ئەدات بە چاکە کاران و پاکان.

پێویستی بە هیچ شتێك نی یە، فەیزو چاکەی گشتی هەیە، شایانی ئەوەیە بە پاکی راگیریّ لە هەموو لەکەیە، شایانی ئەوەیە گوێڕایەڵی بکریّ و سەرکەشی لیّ نەکریّ، بێگومان نەمانی ئێمەو وێران بوونی ئەم جیهانە قاپی کردنەوەیە لە جیهان و ژیانی تری نەبڕاوە، لەو هەموو نازو نیعمەتە بیّ وێنەیە کە ئامادە کراوە لەو جیهانەدا بۆ لە خواترسەکان، ئەو ژیانە کامەرانی یە دەست کەوت نابیّ تا ئەم جیهان و ژیانەی ئێستا تەواو نەبیّ، کەواتە نەمانی ئەم جیهان – کە هۆی گەیشتنە بەو جیهان و ژیانە بەرزە – بە نیعمەتێکی گەورە ئەژمێرریّ، کەواتە بۆیە لێرەیش دا ئەفەرمویّ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بێگومان هەموو دروست کراوەکانی خوا لە هەموو کات دا، لە هەموو بارو رووبەکەوە پێویستی یان هەیە بە خوا کەواتە بە زمان و بە وتن، یان بە زمانی حالّ، ﴿يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو کەسەی لە ئاسمانەکان دایە ئەوەی لە زەوی دایە داوا لە خوا ئەکات، واتە هەموو ئەوانە هیچ شتێك و هیچ کاروباری نە خۆیان و نە کەسی تریان بە دەستە، بەڵکو هەموو شت بە دەست خوایە و ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، کەواتە هەموو پێویستی خۆیان دەرئەبڕن بۆلای خوا بە زمان، یان حاڵیان شایەتە لەسەر ئەوەی کە مل کەچ و داماون بۆلای خواو هەموو شتیان بە دەست خوایە ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ﴾ هەموو کاتیّ خوا وا لە کارو ئیشێکدا.

ئەم بوون و بوونەوەرە کە سنووری تەنها خوا ئەیزانیّ و بەس، هەموو پارچە و بەشێکی لە هەموو رووبەکەوە بەستراوە بە بڕیاری خواوە. هەمووی پەیوەندی هەیە بە خواهیشی خواو تەنیا خوا چاودێری و سەرپەرشتی ئەکات، تەنیا خوا هەموو شتیّ ئەبات بەڕێوە و فەراهەمی ئەهێنیّ، جا وەرە بیر بکەرەوە تا ئەتوانی با خەیاڵت بڕوا، بەڵکو ئەندازیّ تیّ بگەیت لە بیّ سنووری ئەو هەموو کاروبارەی کە خوای گەورە پێکی ئەهێنیّ، لەگەڵ ئەوەدا هیچ کاریّ و هیچ شتیّ خوا خەریك ناکات لە هیچ کارو شتیّ تر، بەڵکو هەموو شتێك لە هەردوو جیهان دا یەکسان و مل کەچە لە بەردەم زانین و توانا و دەسەلآت و خواهیشی خوادا، هەر شتیّ پەیدا بووەو رووی داوەو هەروەها ئەوەی پەیدا ئەبیّ و روو ئەدات، ئەمانە هەموو لە پێشەوە زانراون و بڕیار دراون، لەگەڵ کات و جیّ و شوێنیان دا دیاریی کراون و ئێستا بەریز یەك بە یەك فەراهەمیان ئەهێنیّ دەریان ئەخات بەو جۆرەی زانراوەو بڕیاری دراوە، کەواتە تا هەموو بەندەکانی خوا لە ئادەمی و مەلائیکە و (جن) بیر بکەنەوە لەو هەموو کاروبارەیان کە خوای گەورە فەراهەمیان ئەهێنیّ، سەری بەندەیی دابخەن بۆ پەروەردگاری خۆیان و چاولەبەری ئەو هەموو نازو نیعمەتە بن،

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾

---

**بە دڵ گوێ بگرن لەم فەرمودەیە: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ بەڵکو ڕێزو نرخی هەموو نیعمەت و چاکەیە لە دڵیان دا جێگیر ببێ و لە ناخی دڵیانەوە سوپاسی خوای خۆیان بکەن، لەپاش ئەمەی لەم پێشانگا فراوانەی بوونەوەردا ئەو هەموو شتە نایابەی خستە ڕوو سەرنجی ڕاکێشا بۆ ئەو هەموو نیعمەتە گرنگانە، ئینجا ڕوونی کردەوە نەمانی هەمووان و مانەوەی تەنیا خوای تاك و تەنیا، هەروەها پێویستی و ناچاری هەمووان بۆلای خوا، ئاشکرایە لەم کاتەدا هەر دڵێ مردوو نەبێ ڕوو ئەکاتە خواو ئامادە ئەبێ بۆ تەمێ وەرگرتن جا لەم کاتەدا خەڵکی ئەترسێنێ بە پرسیارو تۆڵەی سەختی ڕۆژی دوایی ئەفەرموێ: ﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾[1] لەمەو پاش لە ڕۆژی دوایی دەست ئەکەین بە پرسیارو حیساب و تۆڵە لێ سەندنتان ئەی تیرەی ئادەمی و جنۆکە، هەروەها پاداشت دانەوەی چاکان، یان لەو ڕۆژەدا نیازمان ڕوو ئەکەینە ئەوەو ئیشمان هەر ئەوە ئەبێ. پەنا بە خوا هەڕەشەکە ئێجگار سامناکە، ئاسمان و زەوی و هەموو بوونەوەر خۆی بۆ ناگیرێ لە ئاستی ئەم هەڕەشەیە، زۆر شایانی بیر لێ کردنەوەیە، خوا بەزەیی خۆی بکات بە بەرهەڵست بۆمان، آمین.**

---

[1] وشەی ﴿فراغ﴾ لە زمانی عەرەبی دا دوو مانای هەیە: ١- دەست نەگیران و دەست خاڵی بوون، دیارە بەم مانا بۆ خوا نابێ بەکار بهێنرێ، چونکە هیچ کارو هیچ شتێ خوا خەریك ناکات. ٢- نیاز کردنی شت و ڕوو تێکردنی بۆ بەجێ هێنان، زۆربەی زانایان لێرەدا بەم دووەمە تەفسیریان کردووەتەوە، لەبەر ئەوەی بە گوێرەی مانای دووەم تەفسیرم کردووە، بەلآم ئەوەی چووەتە دڵمەوە مانایەکی ترە لەبەر ئەوەی لە هیچ تەفسیرێك دا ئەم دیوە ئەم وێرا بیکەم بە تەفسیری ئایەتەکە، ئەوەی لە دڵم دایە ئەمەیە: وشەی ﴿نفرغ﴾ بەمانای یەکەم بێ، واتە لەمەو پاش دەستمان خاڵی ئەبێ بۆتان، بەلآم مەبەست بە دەست گیرانی خوا لە ئێستەدا نەهاتنی ئەو کات و ڕۆژی دوایی یەیە کە خوا بڕیاری داوە بۆ بەجێ هێنانی ئەو هەڕەشەی کە کردوویە لێ یان وەکو فەرمووبێتی: ئێستا ڕاوەستن تا کاتی خۆی دێت، بەم جۆرە وشەی ﴿سنفرغ﴾ ئەبێتە کینایە، زانینی تەواو تەنیا لای خوایە.

بێگومان ئەم ترساندن و هەڕەشەیە لەم جیهانەدا ئەبێتە هۆی ئیمان و گەڕانەوە لە تاوان بۆ هەرکەسێ خاوەنی ژیریی بێت،هەروەها پاداشت دانەوەی چاکان و تۆڵە سەندن لە تاوان بارانیش لە نیعمەتە گرنگەکانن، کەواتە چەند بەجێ یەو شیرینە کە لە پاش ئەم هەڕەشەیە ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾.

ئینجا هەمیتر ئەیانترسێنێ بەمەی کە ڕاکردن لە سزای خوا بە هیچ جۆر ناگونجێ، چونکە هەموو کەس داماوو بێ دەسەلات و دەستە پاچەیە لە ئاستی دەسەلات و توانای بێ سنووری خوا، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟﴾ ئەی کۆمەڵی جن و ئادەمی ئەگەر ئەتوانن دەرچن لە ناوچەکانی ئاسمانەکان و زەوی و ڕاکەن لە دەست پرسیارو سزاو تۆڵەی خوا دەی دەرچن و ڕاکەن واتە ناتوانن شتی وا بکەن، چونکە ﴿لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ﴾ دەرناچن مەگەر بە زۆر و دەسەلاتێ کە بتانبێ، خۆ دیارە ئەوەیشتان نی یە، کەواتە ڕاکردن و ڕزگار بوونتان نی یە لە سزاو تۆڵەی خوا، خوای گەورە لەگەڵ ئەو هەموو دەسەلات و توانا بێ بڕانەوە بێ سنوورەدا مۆڵەتی بەندە بێ دەسەلاتەکانی ئەدات هەرچەند و هەر ئەندازە تاوانبار بن، لە زۆر خراپە و تاوانیشیان ئەبوورێ، دیارە ئەو مۆڵەت دان و لێ بوردنە لە نیعمەتە گەورەو گرنگەکانی خوایە و شایانی ئەوەیە ئەم فەرمودەیە لێرەیش دا ئاراستە بکاتەوە. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾ [1] ئەگەر بتانەوێ دەرچن و ڕاکەن لە سزاو عەزابی ڕۆژی دوایی فریشتە کاربەدەستەکان ئەتانگێڕنەوە، بڵێسەی ئاگر و مسی تواوە ئەکرێ بە سەرتان دا بە لێشاو بۆ گێڕانەوەتان، کەواتە سەرپێچی و سەرکەشی ناکەن و یارمەتی یەکتریان پێ نادرێ.

---

[1] ئەم ئایەتانە بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە، بەلام ئەمەی کە لە تەفسیرەکەدا وتمان لە دڵ دا جێگیر ترە، هەموو جۆرەکان هەر باشن و ئەگونجێن، بەلام ئەوەی هەندێ لە نووسەرانی تازە ئەیڵێن، کە ئەیانەوێ تەفسیری بکەنەوە بەم گەشتی ئاسمانی یە کە چەند ساڵێکە دەستی پێ کردووە، بەڕاستی ئەو جۆرە شتانە کە لێرەو لە چەند شوێنی تردا وترلون لەگەڵ مەبەستی ئەو شوێن و سورەتە یەك ناکەون، پەیوەندی نێوانی ئایەتەکان تێك ئەدەن، کەواتە ڕاست نی یە ئەو جۆرە شتانە بکرێ بە تەفسیر، بەڵێ بە شێوەی تەئویل بگوترێن بەم ڕەنگە بڵێن هەڵئەگرێ ئەم ئایەتە هێما بێت بۆ فلان مەبەست ئەوە ڕەنگە زیانی نەبێت.

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾

---

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ ئینجا بە بۆنەی ئەم هەڕەشە و ترساندنەوە لێرە بە دوای سورەتەکە باسی چەند شێوەو بەسەرهاتی ڕۆژی دوایی ئەکات کە ئەو گۆڕانە گەورەی پێ فەراهەم دێت لەم بوونەوەرەدا لەگەڵ باس و پیشاندانی چەند شێوەیەك لە پرسیارو تۆڵە و پاداشت دانەوە، لەو ڕۆژەدا، وەکو ئەچێت بە گوێچکەمان دا لەمەوپاش، لە چەند ئایەتێکی ترو لە چەند سورەتێکی ترا وا پیشان ئەدەن کە گۆڕانێکی ئێجگار گرنگ و سامناك دێت بەسەر ئەم بوونەوەرەدا، ڕووداوێکی وا ڕوو ئەدات جگە لە خوا هیچ کەس بە تەواوی نازانێ چۆنێتی، ئێمە ئێستا هەر ئەوەندە ئەزانین کە ئەم بوونەوەرە تێك ئەچێ و ئەم هەموو ئەستێرانە پارە پارە ئەبن و ئەم ڕژێمەیان نامێنێ، جا لە هەر شوێن و سورەتێك دا باسی ئەو گۆڕانە ئەکات بە جۆرێکی جیاواز و بە شێوەیەکی تایبەتی پیشانی ئەدات، لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴾ کاتێ کە ئاسمان لەت و پارە پارە ئەبێت، ئینجا ڕەنگی سوور ئەبێت وەکو گوڵێکی سوور، ئەتوێتەوە وەکو ڕۆنە تواوەکان، واتە کاتێ کە ئەوە ڕوو ئەدات، ئای چ ترس و سام و ناڕەحەتی یەك پەیدا ئەبێت!! ناڕەحەتی یەك پەیدا ئەبێت باس ناکرێ، بێگومان هەواڵدان و ترساندن بە شتی وا ئەبێتە بەرگری لە تاوان و خراپە، کەواتە نیعمەتێکی گەورەیە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ ئاشکرایە ئەو ڕۆژە وەکو ئەمڕۆ نی یە کە کەس بتوانێ سەرپێچی بکات، یاخود ددان نەنێ بە نیعمەتەکانی خوادا، بەڵکو مل کەچن و ددان ئەنێن بە هەموو شتێکی حەق و ڕاست دا، ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴾ ئینجا لەو ڕۆژەدا کە ئاسمان وای بەسەر دێت هیچ ئادەمی و جنۆکەیە پرسیاری لێ ناکرێ لەبارەی گوناهو تاوانی یەوە، ئەو ڕۆژە سەختە زۆر زۆر درێژە و چەند بەسەرهات و هەڵوێستی جیاوازی تێدا هەیە، بێگومان هەموو کەس لەو ڕۆژەدا حیساب و پرسیاری لێ ئەکرێت دەربارەی هەموو کردەوەیەکی وەکو خوا ئەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾

عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ [1] كەواتە مەبەست بەو پرسیار نەکردنەی کە ئایەتی ئەم سورەتە ئەیفەرموێ بۆ کات و شوێنێکی تایبەتی یە، وەکو کاتێ زیندوو ئەکرێنەوەو لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، لەو کاتەدا پێویست بە پرسیار نی یە، چونکە هەموو ئەناسرێن بە شێوەکانیان، یا وەکو پاش جێگیر بوونیان لە دۆزەخ دا کە پاش پرسیارو حیسابیانە، یان مەبەست ئەوەیە پرسیاریان لێ ناکرێ بۆ وەڵام دانەوە، بەڵکو پرسیاریان لێ ئەکرێ بۆ تانە و تەشەر لێدان و پێ یان ئەوترێ بۆچی ئەوەتان کرد؟ یان پرسیاریان لێ ئەکرێ بۆ ئەمەی دەرکەوێ کە تاوانبارن، چونکە نیشانە و شێوەی تاوانباری یان هەیە و بەهۆی ئەوەوە ئەناسرێن و پێویست بە پرسیار ناکات و بێ پرسیار زنجیر ئەکرێن و تووڕ ئەدرێنە دۆزەخەوە، وەکو ئایەتی پاشەوە ئەفەرموێ، کەواتە ئەو ئایەتانەی کە پرسیار ئەگەیەنن رێکن لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە پرسیار نەکردن پیشان ئەدەن و هیچ دژی یەکتر نین. دیارە لەو رۆژەدا خوای گەورە نیعمەتی بێ وێنە و بێ سنووری خۆی ئەڕێژێ بەسەر چاکان و لە خوا ترسەکاندا، چاك و خراپ لەو رۆژەدا بە تێکڕایی باوەڕی هەیە بەو نازو نیعمەتە، هیچ کەس نی یە دان نەنێ بەوەدا وەکو بەم فەرمودەیش بێدارمان ئەکاتەوە: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴾ لەو رۆژەدا تاوانبارەکان دروشم و نیشانە و شێوەی تایبەتی خۆیان هەیە و جیاوازن لە شێوەو نیشانەی چاکان و پاکان، تاوانبارەکان – خوا پەنامان بدات – روو رەش و چاو شین و داماوو سەرشۆڕن، داخ و غەم دابارێوە بەسەریان دا، هەموویان بەو نیشانە و شێوە تایبەتی یەوە ئەناسرێن و هیچ پرسیاری ناوێ، ئینجا سەرو قاچیان ئەبەسترێن پێکەوە بەو شێوە ناهەموارە تووڕ ئەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە – واتە مەلائیکە – ئەو تاوانبارانە ئەگرن لە پشتەوەو سەریان زنجیر ئەکەن لەگەڵ قاچیان دا تا ئێسکی پشت و سینەیان ئەشکێ و ئینجا بەو بارە ریسوایی یەوە تووڕیان ئەدەن، یان هەندێکیان بە سەرو قژیان رائەکێشرێن و تووڕ ئەدرێن، هەندێکیان لە لاقیان ئەنەون و تووڕیان ئەدەن خوا بە بەزەیی خۆی بمانپارێزێ لەوسزاوبەدبەختی یە، آمین.

---

[1] واتە: سوێند بە خوای تۆ بێگومان پرسیار ئەکەین لە هەموویان دەربارەی هەر کردەوەیەك کردوویانە. دوا دوایی سورەتی ﴿الحجر / ٩٢-٩٣﴾.

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾

---

**ئەم ترساندنە لەم وێنەدا بە راستی زۆر زۆر بەهێزە بۆ بەرگری، هۆی گەڕانەوەیە لە تاوان، کەواتە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ لەو کاتە سەختەو لەو رۆژە رەشەدا کە بەو جۆرە بە ریسوایی تووڕ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە، لەو کاتە ناهەموارەدا ئێجگاری ئێش و سزایان بەتین تر ئەکرێ بە سزادانی دەروونی یان بەمەی کە بە تەشەرەوە ئەدرێ بە گوێچکەیان دا ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ * يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾ ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە تاوانبارەکان باوەڕیان پێی نەبوو، بە درۆیان ئەزانی، ئەمە دۆزەخەکەیە حازرو بزر ئەبێ ئەوەتە تێی تووڕ ئەدرێن، ئەو تاوانبارانە ئەسوڕێنەوە و هات و چۆ ئەکەن لە نێوان ئەو دۆزەخە و لە نێوان ئاوێکی زۆر گەرم کە گەیشتبێتە ئەوپەڕی رادەو پلەی گەرمی، واتە بەو ئاگرە ئەسووتێنرێن و لەو ئاوەیش ئەکرێ بەسەریان دا و دەرخواردیان ئەدرێ، خوا پەنامان بدات آمین. یان کاتێ کە سووتێنران بەو ئاگرە هاواری ئاو ئەکەن، ئینجا ئەخرێنە ناو ئەو ئاوە، هەر بە قورئان ئەکەوێ بدوێ لە هەر مەبەستێ، چونکە بە رەوشتێ ئەدوێ کە زۆر بەهێز کار ئەکات لە دڵ و دەروون، دیارە ئەوەی کە قورئان ئەیکات بە دڵ دا نایەو دەست نادا لاسایش بکرێتەوە. بۆ نموونە لێرەدا بیر بکەینەوە لەمەی کە لەم کاتەدا باسی ناونیشانی تاوانباران ئەکات و شێوەی تووڕدانیان ئەناو دۆزەخ، لەم کاتەدا کوت و پڕ دۆزەخ ئەهێنێتە پێش چاوو حازرو بزری ئەکات، لە کاتی خوێندنی ئەم ئایەتانەدا ئەفەرموێ: ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ ئەوەتا هەرچۆنێ سەرنجی چاوی دڵی بۆ رائەکێشێ هەروەها سەرنجی چاوی سەریشی بۆ رائەکێشێ لەوانەیە لەم کاتەدا چاو هەڵبڕێ بۆ تەماشا کردنی، خوای گەورە ئا بەم جۆرە بەندەکانی ئەترسێنێ، بۆ ئەمەی دوور کەونەوە لەو کردارانەی کە هۆی سزا دانن بەو ئاگرە سەختە لە لوتف و بەزەیی بە زیاد بێ، بەڕاستی ماڤ خۆیەتی و هەر بە خۆی ئەکەوێ کە ناو بەناو سەرنجمان رائەکێشێ و**

ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئەمەی پێشوو هەندێ بوو لە باسی سزای بەتینی دۆزەخ و تاوانباران، ئینجا دێتە سەر باسی هەندێ لە خۆشی و رێز و نازی چاکان و لەخواترسەکان ئەفەرموێ: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ﴾ دوو باغ و دوو بەهەشت هەیە بۆ هەرکەسێ کە لەم جیهانەدا ترسابێت لە خوای خۆی، یان ترسابێت لە وەستانی رۆژی دوایی لەبەردەم دادگای خوای خۆی دا و لەو شوێنەی کە خوا دایناوە بۆ وەستاندنی بەندەکانی بۆ حیساب و پرسیار، ئینجا بەهۆی ئەو ترسانەوە بەرگریی خۆی کردووە لە گوناه. ئەم سورەتە یەکەم شوێنە لە قورئان دا کە باسی ئەم دوو بەهەشتە ئەکات، وا دەرئەکەوێ کە لەناو بەهەشتی گەورەی بەناوبانگ دا ئەم دوو بەهەشتە زیادە پایە و پلەی بەرزیان هەبێ بۆیە بە تایبەتی باسی ئەفەرموێ، ئینجا ئەم دووانە بە گوێرەی لە خواترسەکانی ئادەمی و جنۆکە کە دوو تاقم و دوو تیرەن، یان هەموو لە خوا ترسێك دوو بەهەشتی تایبەتی وای هەیە، یەکێ لەناو کۆشك و ماڵەکەیان دا و ئەوی تر لە دەرەوە، یان یەکێ لە باتی عەقیدە و باوەڕەکەیان، ئەوی تر لە باتی کردەوە چاکەکان. یان یەکێ لە باتی گوێڕایەڵی و کردەوەی چاك و ئەویتر لە باتی خۆگرتنەوە لە گوناهو تاوان، یان یەکێ بۆ خۆشی و رابواردنی گیان و رۆح، ئەویتر بۆ رابواردنی لەش، بەم هەموو جۆرە زانایانی تەفسیر فەرموویانە. هەمووی هەر رێکە و بەزەیی و لوتف و بەخششەکانی خوا بێ سنوورە هەموو ئەمانە ئەگونجێ، خوا بە رەحمی خۆی بەشدارمان بکات و بێبەشمان نەکات، آمین.

ئای چەندە شیرین و بەتامە کە لێرەیش دا ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئینجابابەدڵ گوێ بگرین لە باسی خۆشی ئەو دوو بەهەشتە لەم چەند ئایەتەی کە دێت، ئەفەرموێ: ﴿ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ﴾ ئەو دوو بەهەشتە خاوەنی پەل و پۆی ناسك و شیرین و جوانن، یان خاوەنی چەند جۆرو بەرو میوەهاتن ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ لەو بەهەشتانەدا هەیە دوو کانی و چەشمە کە دێن و ئەچن، کەواتە ئاویان فراوان و ئاسان و بێ کەم و کوڕی یە، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾ لەو بەهەشتانەدا هەیە لە هەموو میوەیەك دوو جۆر، ناسراوو نەناسراو، واتە جۆرێکیان وێنەیان لەم جیهانەدا دیوە، جۆرەکەی تریان خوا وێنەی لەم جیهانەدا دروست نەکردووە، یان دوو جۆرەکە بریتین لە تەڕو وشك کە یەك لە یەك خۆشتروبەلەزەت ترن،

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾

---

﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍۚ﴾ ئەو لەخواترسانە لەو بەهەشتانەدا راتەبوێرن بە جۆرێ پاڵیان داوەتەوە، یان چوار مەشقی یان داوە لەسەر چەند فەرشێك كە دیوی ناویان لە ئاوریشمی ئەستوورە، واتە دیوی ناوو ئەوەی كە پێش چاوەوە نی یە لەو ئاوریشمەیە، دەی ئەبێ دیوی دەریان لە چی بێ و چۆن بێ؟ دیوی دەریان ئەبێ لە شتێ بێ كە وێنەمان لەم جیهانەدا نەدیوە. ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾ بەرو میوەی ئەو دوو بەهەشتە نزیكە لە بەهەشتی یەكانەوە، بە پێوەو بە دانیشتنەوە و بە پاڵەوە دەستیان ئەیگاتێ بە ئاسانی بێ ئـەرك و زەحمـەت ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾ لـەو بەهەشتانەدا هەیە چەند ئافرەتێ حەڵاڵ و هاوسەر كە چاویان بڕیوەتە مێردەكانیان و جگە لەوان كەسی تریان ناوێ، هەموویان كچن و هیچ كەسی تر نە ئادەمی و نە جن لە پێش مێردەكانی خۆیان لێ یان نەكەوتوون و نەچوونەتە لایان ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئەو حەڵاڵ و هاوسەرانە هەرچۆن هەست پاك وداوێن پاك و مێرد خۆشەویستن زۆر جوان و شیرینیشن ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾ هەموو لە ساف و لوسی و بێگەردی دا ئەڵێ ی یاقوتن، لە سپێتی پێستدا ئەڵێی مەرجانن، یان ساف ولوس وكوڵم سورن وەكویاقوت، پێست سپێن وەكو مەرجان، بەهەرجۆر ببێ مەبەست نزیك خستنەوەی رادەی جوانی و شیرینی یانە لە دڵ و دەروونەوە ئەگەرناوێنەی ئەوانەلەم جیهانەدا دروست نەكراوە ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئینجا بە هۆی ئەو پاداشتە گەورە بێ وێنەیە باس ئەفەرموێ: ﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ﴾ پاداشتی چاكە هیچ شتێك نییەجگە لەچاكە، كەواتە ئەو لە خوا ترسانە لە جیهاندا كردەوەی چاكیان كرد، خوای خۆیان بە جۆرێك ئەپەرست وەكو بە چاو ببینن، چونكە ئەیانزانی كە خوا ئەوان ئەبینێ، كەواتە پاداشتی چاكەی ئەوان لە كردەوەدا ئەبێ چاكە بێت لە پاداشتدا لەلایەن خوایەكەوە كە میهرەبانە و سنوور نی یە بۆ بەزەیی و بەخشینەكانی،

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٦١) وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ (٦٢) فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٦٣) مُدْهَآمَّتَانِ (٦٤) فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٦٥) فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ (٦٦) فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٦٧) فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ (٦٨)

---

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ **بەهەشتی یەکان هەرچەندە بە تێکڕایی هیچ جۆرە کەم و کوڕی یەك نی یە لە نازو ڕێزیان دا، بەڵام هەموو لە یەك رادەو پلەدا نین، بەڵکو بە گوێرەی رادەو پلەی کردەوەی چاکیان لە بەهەشت دا جیاواز ئەبن، جا وا دەرئەکەوێ ئەم دوو بەهەشتە تایبەتی یە کە باس کران گرنگ ترن، بۆ کۆمەڵێکن کە رادەو پلەی کردەوەیان بەرزترە، ئەوانە کە لە کردەوەی چاك دا ناگەنە ئەو کۆمەڵە بەرزە بۆ ئەمانە دوو بەهەشتی تایبەتی ترەیەکە ناگاتە رادەی ئەو دوو بەهەشتەکەی تر کە باس کران، ئەم دوو بەهەشتەی ترە ئەمەیکە لەم چەند ئایەتەدا باسی ئەفەرموێ:** ﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ[1] فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ **بێجگە لە دوو بەهەشتە پێشووەکە دوو بەهەشتی تر هەیە بۆ تاقمێ تر بەڵام رادەو پلەی ئەم دووانە کەمتر و نزم ترە لە رادەو پلەی دوو پێشووەکە وەکو روون ئەبێتەوە لە وەسف و سەنایان بەم ئایەتانەی کە دێن:** ﴿ مُدْهَآمَّتَانِ﴾ **واتە ئەم دوو بەهەشتە – بەهۆی گوڵ و گیا و شینایی زۆرەوە کە بە رووی زەوی دا ئەکێشن و داگیری ئەکەن – بەهۆی ئەوەوە شین و سەوزێکی وان لە دوورەوە رەش ئەنوێنن، کەواتە ئەمان جیاوازن، ئەوان دارو درەخت و میوەهاتیان هەبوو، ئەمان بە زۆری گول و گولزارو شینایی و شتی تریان هەیە، هەرچەند ئەوانەی پێشوو بەنرخ ترن، بەڵام بێگومان ئەمانیش هەرلە بەهرە گرنگەکانی خوای گەورەن،** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴾ **لەم دووبەهەشتەدا دوو کانی و چەشمە هەیە کە فوارەئەکەن و ئاوئەپرژێنن، دواییيان نایەت،** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ﴾ **لەم دوو بەهەشتەدا هەیە میوەو دار خورما و هەنار، بەلای کۆڕی زانایانەوە خورما و هەنار ئەگەر چی لە میوەن، بەڵام بەنرخ ترن لە میوەکانی تر لەبەر ئەوە بە تایبەتی باسی فەرمون،**

---

[1] بە چەند جۆرێکی تر تەفسیر کراوەتەوە: یەکێ لەوانە ئەمەیە کە ئەم چوارە بێ جیاوازی بۆ کۆمەڵی لە خواترسەکانە دووانە پێشووەکە دارو درەخت و میوەهاتە و ئەم دووانە شینایی و سەوزەواتە، ئەم جلرەو جۆرەکانی تریش هەر ئەگونجێن، زانین لای خوایە.

فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقۡصُورَٰتٌ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٍ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾

---

**﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٌ﴾[1] لەو بەهەشتانەدا هەیە ئافرەتانی حەلاڵ و هاوسەر کە خووڕەوشت چاك و شیرین و جوانن، ئایا ئەبێ پلەو پایەی ئەو بەختیارانە چۆن بێت کە خوای گەورە وەسف و سەنایان بکات بەم دوو سیفەتە نایابە؟! بێگومان بیرو زانینی ئێمە ناگاتە سنووری ئەو رادەو پایە و پلەی بەرزە. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * حُورٌ مَّقۡصُورَٰتٌ فِي ٱلۡخِيَامِ﴾ ئەو ئافرەتە رەوشت چاك و شیرین و جوان خاسانە چاو قەوی و چاو رەشێکی وان کە رەشێنەکەی زۆر رەشە و سپێنەکەی سپی یەکی بێگەردە کە ئەوە ئەوپەڕی جوانی چاوە، راگیر کراون بە رێزو حورمەت لە خێوەتەکان دا، کەواتە پاك و خاوێن و داوێن پاکن، نەك بەرەڵا و کۆڵان کوت کە هەرچەندە جوان و شیرین بێت قیزەونە لای هەموو پیاوێکی بە ناموس و بە شەرەف، لە ئاستیان بێگەردو بێ لەکەیە، ئەمانیش وەکو پێشووەکان وان ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ﴾ لە پێش مێردەکانیان دا، هیچ کەسیان لێ نەکەوتووە، نە ئادەمی و نە جن، واتە هەموویان کچن و داوێن پاکن. ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ خوای گەورە لە هەموو بارو روویەکەوە خۆشی و نازو بەخشایشی خۆی ئەڕێژێ بەسەر ئەو بەهەشتی یانەداو ئەوانیش بە ئارامەوە رائەبوێرن و کەشخە ئەکەن بە جۆرێك ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٍ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾[2] پاڵ ئەرەوەن بەسەر سەرین و پاڵپشتێ کە لە ئاوریشمی سەوزن، بەسەر فەرشێکەوە کە نەقش و نیگار کراوە و زۆر جوان و پەسەندە، شتێ خوا سەنای بکات**

---

[1] لێرەداولەئایەتی پێشوودا فەرموی ﴿فیهن﴾بەرلناوی کۆنەك بە دوانە کە بە دیمەن ئەبولیە وا بولیە، لەم رووەوە چەند تەئویلێ کراوە یەکێکیان ئەڵێن کە ئەوە بە گوێرەی ئەو هەموو شوێن و کۆشك و خێوەتەیە کە ئەو ئافرەتانەیان تێدایە.

[2] وشەی ﴿رفرف و عبقری﴾ بە چەند جۆرو شتی تر تەفسیر کراونەتەوە، هەموو نزیکن لە یەکەوەو هەموو بۆ نزیك خستنەوەیە لە تێگەیشتنی ئێمە ئەگەر نا شتەکانی بەهەشت وێنەیان لەم جیهانەدا نییە.

و پــێی بفــەرموێ جوانــە ئــەبێ ئــەو شــتە چــۆن بێــت؟!! ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ لــەپاش نیشاندانی ئەو هەموو نیعمەت و چاکە گرنگانەی خوای گەورە لە هەردوو جیهاندا، ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بەم رستە بەفەڕە کە راست ترو رێك و پێك ترین رستەیە بۆ دوایی هێنانی ئەم سورەتە، ئەفەرموێ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾ بەرزو بڵندە، یان پیت و فەڕو خێری زۆرو فراوانە ناوی خوای تۆ کە خاوەنی گەورەیی یە و هیچ جۆرە پێویستی بە هیچ کەس و هیچ شت نی یە، خاوەنی رێزو چاکەیە دەربارەی ئیمانداران. لە جێ یە ناوەکەی بەرزو بڵند و بێ لەکە بێت، یان خاوەنی پیت و فەڕ و چاکە بێت ئەبێ زاتی پاکی خۆی چۆن بێت؟!!

هەموو سوپاس و سەنا و گەورەیی هەر شایانی ئەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾

## سورەتی (الواقعه)
## مەککەیی یە و ٩٦ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

﴿واقعة﴾ ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی و ئەم سورەتەیشی پێ ناو براوە، ناوبردنی بەو ناوە زۆر بەجێ یە و ماڵی خۆیەتی، چونکە سەر تا بە خواری ئەم سورەتە هەموو دواندنە لە هەواڵی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، لە یەکەم جارەوە باسی بەدی هاتن و چۆنێتی ئەو ڕۆژە ئەکات بەناوی ﴿الواقعة﴾ەوە. بەجۆرێ دڵی بێدار دائەچڵەکێنێ و ئەیهێنێتە لەرزە. ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ﴾[1] کاتێ ڕۆژی دوایی دێت و ڕوو ئەدات ئەو ڕۆژەی کە ئەوەندە بەدی هاتنی ڕاستە وەکو ئێستا هاتبێ و ڕووی دابێ وایە، کاتێ ئەو ڕۆژە دێت شتی زۆر گرنگ و ناهەموار ڕوو ئەدات کە باس ناکرێ و بە وتن ڕوون ناکرێتەوە تا بە چاو نەبینرێ، هەرچەند ئەمڕۆ بێ بڕوا بەو ڕۆژە زۆرەو ئەڵێن ئەو ڕۆژە نابێ و ئەو درۆ گەورەیە ئەکەن، بەڵام ﴿لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾[2] لە کاتی ڕوودانی ئەو ڕۆژەدا هیچ نەفسێکی درۆزن نی یە کە ئەو درۆیە بکات، بەڵکو هەموو کەسێ لەو ڕۆژەدا باوەڕ ئەهێنێ، چونکە شتەکە بە چاو ئەبینرێ و شوێنی هیچ گومان و دوو دڵی یە نامێنێ، ئەگەرچی هەر باوەڕی ئەمڕۆ ئەبێ تازە باوەڕی ئەوێ هیچ سوودی نی یە، ئەو ڕۆژە

---

[1] بە چەند جۆرێ تر تەفسیر کراوەتەوە: ١- إذا بۆ کاتی ڕووت بێت و ئاوەڵکار (ظرف) بێت بۆ ﴿اذکر﴾ ی لابراو. ٢- ئاوەڵکار (ظرف) بێت بۆ ڕستەی ﴿ليس﴾. ٣- زیاد بێت. ٤- بۆ شەرت بێت و وەڵامەکەی ڕستەی ﴿فأصحاب الميمنة﴾ بێت، بە پێی تەفسیرەکە وەڵام نەوتراوە.

[2] بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە هەموو هەر باشە و ئەگونجێ. هەرکەس ئارەزووی هەیە با تەماشای تەفسیرە باوەڕ پێکراوەکان بکات.

ڕووداوێکی زۆر گەورەیە ﴿خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ﴾ نزم کەرەوەو بەرز کەرەوەیە، واتە هەندێ شت کە لەم جیهانەدا بەرز بووە ئەو نزم و ژێری ئەخات، هەندێ کە نزم بووە ئەو بەرزی ئەکاتەوەو سەری ئەخات، وەکو هەموو ڕووداوێکی گەورە کە لەم جیهانەدا بەچاو ئەیبینین، بۆ وێنە شۆڕشتێ ئەکرێ بەسەر میری یەك دا ئەبینین ئەوەی لە میری یە پێشووەکەدا بەرزو بە نرخ بوو شۆڕشەکە بێ نرخ و پێشێلی ئەکات، زۆر لە بێ نرخ و پێشێل کراوەکانی پێشوو بەرزو نرخ دار ئەکات، بەڵام ژێر خستن و سەرخستنەکانی ڕۆژی دوایی هەمووی ڕاست و بەجێ یە و هەموو ناڕەوایی و ناڕێکی و لاری پێ ڕەواو ڕێك و ڕاست ئەبێتەوە.

وێنەیەك لەو بەرزو نزم کردنەوە ئەمەیە: دوژمنەکانی خوا هەرچەند لەم جیهانەدا بەرزو بە نرخ بووبن لەو ڕۆژەدا هیچ جۆرە نرخێکیان نابێ و نزم ئەکرێنەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، دۆستەکانی خوا هەر ئەندازە لێرە بێ نرخ و پەست تەماشا کرابن، لەوێ نرخی تەواویان پێ ئەدرێ و بەرز ئەکرێنەوە بۆ ناو بەهەشت. خوا بە بەزەیی خۆی بەشدارمان بکات لەم بەشە گەورەدا. بمانپارێزێ لە بێبەشی و بەد بەختی کۆمەڵی بێ بەشان.

لە پێشەوە بە کورتی گەورەیی و گرنگی ئەو ڕۆژەی دەربڕی، ئینجا ئەوا زیاتر ڕوونی ئەکاتەوە بە باس کردنی هەندێ لە گۆڕان و ڕووداوی ئەو ڕۆژە سەختە ئەفەرموێ: ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا * وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا *فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾[1] کاتێ کە زۆر بە توندی زەوی ئەهێنرێتە جوڵان و بومەلەرزە بە جۆرێ هەرچی وا بەسەریەوە ئەڕوخێ وەکو بێشکەیەك کە بەهێز ڕاژەنرێ کاتێ شاخ و چیاکان ڕێزاڵ ئەکرێن تا ئەبن بە تۆزو غوبارێکی پرژو بڵاو کراوە، کاتێ ئەو بەسەرهات و گۆڕانە گەورە بەتینانە ئەوەیان بەسەر بێت ئایا ئەبێ سامناکی و ناهەمواریی ئەو ڕۆژە لە چ ڕادەیەك دا بێت؟!! ئەبێ بە چ وتارێ و بە چ زمانێ ڕادەی سامناکی و ترس و لەرزی ئەو ڕۆژە ڕوون بکرێتەوە؟! لە شوێنەکانی تردا قورئان خەڵکی بە دوو تاقم نیشان ئەدات لەو ڕۆژە سەختەدا بێگومان بە کورتی وتی لەم بارەوە کە خەڵکی یان بەهەشتین یان دۆزەخین. ئیتر بارێ تر نییە،

---

[1] وشەی ﴿إذا﴾ ئەگونجێ (ظرف) بێت بۆ ﴿خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ﴾ یان بریتی بێت (بدل) بۆ ﴿إذا﴾ ی پێشوو، یان سەربەخۆ بێت. بە هەموو بارێ هەر ڕێکە و پەیوەستەکە هەریەکە، بە گوێرەی تەفسیرەکە بۆ باری دووەم و سێ یەم ئەگونجێ.

وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَـٰثَةً ﴿٧﴾ فَأَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلسَّـٰبِقُونَ ﴿١٠﴾

**بەڵام لێرەدا ئەیانکات بە سێ تاقم ئەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَـٰثَةً﴾ لەو رۆژەدا ئێوە ئەبن بە سێ تاقم، بەهەشتی ئەکات بە دوو کۆمەڵ، لەبەر زۆر جیاوازی رادەو پلە و ریزیان، چونکە رادەی بەهەشتی یەکان بە پێی رادەی خواناسی و لە خواترسی و کردەوەی چاکی ئەم جیهانەیان، بەڵێ رادەی سزای دۆزەخیش جیاوازە بە گوێرەی جیاوازی تاوان و خراپەکاری ئەم جیهانە، بەڵام خوای گەورە رەحم و مژدەی زیاد تر پیشان ئەدات. ئەم سێ تاقمە بە کورتی باسیان ئەکات و ناونیشانیان هەڵ ئەدات، ئینجا جێ و شوێن و بەسەرهات و پاشەرۆژیان ئەندازەیە درێژە پێ ئەدات، لە یەکەم جارەوە بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿فَأَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ * وَأَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ * وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلسَّـٰبِقُونَ﴾ ئەو سێ تاقمە یەکەم: ﴿فَأَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾ خاوەنانی پایە و پلە بەرزە پیرۆزەکان، یان ئەوانەی کە نامەی کردەوەکانیان ئەدرێ بە دەستی راستیانەوە، یان ئەوانی بەلای راست ئەبرێن بۆ بەهەشت ﴿مَآ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾ ئایا ئەوانە چ شتێکن لەبارەی ماڵ و وەزع و خۆش بەختیانەوە؟! واتە باس ناکرێن و گەیشتوونەتە ئەوپەڕی خۆشی و کامەرانی، دووەم: ﴿وَأَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾ خاوەنانی جێ و شوێن و رادە پەستەکان، یان ئەوانەی نامەی کردەوەیان ئەدرێ بە دەستی چەپیانەوە، یان ئەوانەی ئەگیرێن و بەلای چەپ دا ئەبرێن بۆ دۆزەخ، ﴿مَآ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ﴾[1] ئایا ئەوانە چین و چ شتێکن لە بابەت بارو وەزعی خراپ و شوومی و بەد بەختی یانەوە؟!! واتە گەیشتوونەتە ئەوپەڕی پلەی بەد بەختی، سێ یەم: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلسَّـٰبِقُونَ﴾ پێش کەوتووەکان ئەو پێش کەوتووانەن، واتە ئەوانەن کە دیاریی و ناسراون. ئەم تاقمە بریتین لە پێغەمبەران - سەلامی خوایان لێ بێت - یان هەموو ئەوانەن کە بێ گیرو گرفت پێشکەوتن بۆلای ئیمان و گوێڕایەڵی، یان هەموو ئەوانەن کە پێش کەوتوون لە خوو رەوشت و سیفەتە بەرزەکان دا بە هەر جۆر ئەم تاقمە بەرزو بەرێزترن بەلای خواوە،**

---

[1] ئەم رستەوەهەموووێنەکانی: ﴿ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ، ٱلْحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْحَآقَّةُ﴾ بەکار ئەهێنرێن لە دەربڕینی گەورەیی و گرنگی شتدا، یان سامناکی وناهەمواری وخراپی ئەوەیش بە پێی باوی زمانی عەرەب، ئەوپرسیارە بۆ سەرسام کردنە.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٞ ﴿٢٢﴾ كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِٕ ٱلۡمَكۡنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾

---

**پاشەڕۆژو پاداشتی تایبەتی یان هەیە وەکو روونیش ئەبێتەوە لەم چەند ئایەتەی کە دێت لە باسی نازو رێزو پاشەڕۆژی بەرزیان دا: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ * فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ تەنیا ئەو پێشکەوتووانە نزیک خراوەکانن لە خواوە، بەرێزو نرخ پێدانی تایبەتی، پلەیان بەرز کراوەتەوە، ئەوانە وان لە بەهەشتانی نازو نیعمەت دا، ﴿ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ * وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾ کۆمەڵێکی زۆرن لە پێشووەکان و کەمێکن لە دوایی یەکان، دوو را هەیە لە مەبەست بە پێشووەکان و دوایی یەکاندا:**

**١- مەبەست پێشکەوتووەکان لە هەموو گەل و ئومەتە ئیماندارەکانی پێش ئەم ئومەتە هەربە ئادەمەوە، مەبەست بە دوایی یەکان پێش کەوتووەکانی ئەم ئومەتەیە، بێگومان هەرچەند ئەم ئومەتە زۆرترە لە ئومەتەکانی پێشوو، بەڵام پێش کەوتووەکانی ئەم ئومەتە کەمترە و کەمە لەچاو هەموو پێش کەوتووەکانی هەموو ئومەتەکانی تردا.**

**٢- مەبەست بە پێشوو دوایی یەکانی ئەم ئومەتە، دیارە ئەوانەی سەرەتا و پێشووی ئەم ئومەتە زۆربەیان لەو پێش کەوتووانەن، بەڵام لەناو دوایی یەکانی ئەم ئومەتەدا ئەو پێش کەوتووانە ژمارەیان کەمەو لە هەموو چەرخەکانی ئەم دوایی یەدا تاک و تەرایە هەیە بە رێبازی پێشووەکان دا بڕوا، کەواتە لەسەر ئەم رایەش هەر پێشووەکان زۆرن ﴿عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ﴾ ئەوپێشکەوتووانە لەدانیشتن دا وان بەسەر تەخت و کورسییانێکەوە کە تەنراون بە تۆڵی ئاڵتوون و گەوهەر و شتی بەنرخ، ئەو تەختانە ریز کراون و سەفتە**

دراون ئەوانیش بە هەموو کەشخە و کامەرانی و دڵخۆشی و ئارام و بێ باکی یەوە دانیشتوون بە جۆرێ ﴿مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا﴾ پاڵیان داوەتەوە بەسەریاندا ﴿مُتَقَـٰبِلِينَ﴾ هەموو لەکاتی کۆڕ گرتن دا روویان لە یەکترە، کە ئەو جۆرە کۆڕ گرتنە خۆشترین شتە و شیرین ترین شێوەی کۆڕە. بێگومان دانیشتنی وا بێ خواردن و خواردنەوەو خزمەتکار نابێ و بێ ئەوە خۆشی یەکەی ناتەواوە، ئەوا ئەوەیشیان بۆ فەراهەم ئەهێنێ ئەفەرموێ: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ * بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ چەندەها خزمەتکاری گەنج لە شێوەی رۆڵەی تازە پێگەیشتوودا کە ئەمێننەوە هەتا هەتایە بێ مردن و پیر بوون، ئەو گەنجە شیرینە ناسکانە خزمەتکارن و چەرخە ئەکەن و ئەگەڕێن بەسەریاندا، بەچەندەهاپەرداخ وسوراحێ و پیاڵەی پڕلە شەراب، ئەوانیش ئەیخۆنەوە، بەڵام ئەوشەرابەوەکو ئەمەی ئێرە نییە بیان شێوێنێ و دووچاری سەرئێشەیان بکات، ئەوە شەرابێکە ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾ نە دووچاری سەر ئێشە ئەبن لێ یەوە و نە بێ هۆش و سەرخۆش ئەبن، ﴿وَفَـٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ * وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ ئەو رۆڵە ناسکانە میوەشیان بۆ ئەگێڕن لەوەی ئەو بەهەشتی یانە هەڵیبژێرن، هەروەها گۆشتی پەلەوەر لەوەی خۆیان ئارەزووی بکەن، ﴿وَحُورٌ عِينٌ﴾ چەندەها ئافرەتی چاوڕەشی چاو قەوی هەیە کە حەڵاڵ و هاوسەر ئەبن بۆ ئەو تاقمە خوا پێداوە، ئەو ئافرەتانە لە جوانی و بێ لەکەیی دا ﴿كَأَمْثَـٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ﴾ وەکو ئەو دوڕانەن ﴿ٱلْمَكْنُونِ﴾ کە شاراونەتەوە لەناو سەدەفەکانیان دا پارێزراون لەوەی دەستیان لێ کەوتبێ، یان تۆزو چڵکیان پێوە نووسابێ یان بینرابن، کەواتە لە هەموو بارێکەوە بێگەردو بێ لەکەن، ﴿جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئەو هەموو چاکەیان لەگەڵ ئەکرێ لەبەر پاداشت دانەوەیان لەسەر ئەو کردەوە چاکانەی کە کردوویانە لەم جیهانەدا، واتە ئەو هەموو چاکەیە مافی خۆیانەو بە شێوەی منەت بەسەردا کردن نی یە بۆ ئەمەی دڵیان بە هیچ جۆر گەرد نەگرێ.

لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾

---

ئەو خوا پێداوانە وەکو ئەو هەموو چاکە و نیعمەت و بەخششەیان بەسەردا ڕێژراوە، هەروەها هەموو ژیانیان ئارام و ئاشتی یە، بە هیچ جۆر ناخۆشی نابینن و نابیستن تەنانەت ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا﴾ نابیستن لە بەهەشت دا هیچ وتە و وتارێ کە بێ نرخ و بەتاڵ بێت، نابیستن هیچ تاوانبار کردنێ، واتە هەرگیز پێ یان ناوترێ: خراپتان کرد، هیچی لەم شتانە نابیستن ﴿إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا﴾ بەڵام ئەوەی کە ئەبیستن هەر وتنی سەلام سەلامە، مەلائیکە سەلامیان لێ ئەکات، خۆیان سەلام ئەکەن لە یەکتر، سەلامی خوای خاوەن بەزەیی یان پێ ئەگات، خوای گەورە بێ بەشمان نەکات لەوە، آمین. لێرەدا دوایی هێنا بە باسی نازو ڕێزی تاقمی نزیك خراوەکان.

ئینجا دێتە سەر باسی تاقمی دووەمی بەهەشتی ئەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ﴾ مەبەست بەم تاقمە ﴿اصحاب اليمنة﴾ بوو کە باس کرا، کەواتە وتنەوەی ناوێ، بەڵام با بزانین دووبارە کردنەوەی ئەم تاقمە بەم شێوە رستەیە زۆر گرنگی و ڕێز و رادەی بەرزیان پیشان ئەدات، وەکو دووبارە کردنەوەی تاقمی سێ یەمیش هەر بەو رستەیە کە لە پێشەوە فەرموی: خراپی و بەدبەختی و سزای سەختیان پیشان ئەدات، ئەوەیش بە گوێرەی باوی عەرەب کە ئەو شێوە رستەیە بەکار ئەهێنن بۆ گەیاندنی ئەو دوو جۆرە مەبەستە، ئینجا هەندێ لەو نازو ڕێزەیان دیاریی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ﴾ ئەم تاقمە وان لەناو باغێك دا کە (عەنابی) تێدایە، بەڵام وەکو هینی ئەم جیهانە نی یە کە درکی هەبێ بەڵکو ئەو ﴿مَّخْضُودٍ﴾ە درکەکەی بڕاوەو بێ درکە، ﴿وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ﴾ وان لەناو باغە مۆزێك دا کە بەرەکەی هۆنراوە، لەبێخەوەتاسەر، ساقەکەی بەدەرەوە نییە ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ * وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ﴾ وان لە سێبەر سەهەندی هەمیشەیی دوورو درێژو ئاوێ کە هەمیشە دێت و ئەڕوا بە رووی زەوی دا و وا بە دەرەوە، یان بۆیان ئەڕژێنرێ چۆن ئارەزوو بکەن و لە کوێ بیانەوێ بێ ئەرك و ماندوێتی.

وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾

نازو نیعمەتی تاقمی یەکەمی بە جۆریٚ باس کرد کە ئەوپەڕی پلەیە کە بە دلٚ دا بیٚت بۆ ئەوانەی کە شارستانین، تاقمی دووەمی بە جۆریٚ باس کرد کە ئەوپەڕی ئاوات و ئامانجی کۆچەری و لادیٚ یی یەکانە، بیٚگومان لەو دوو باسەوە جیاوازی رادەی رابواردنی ئەو دوو تاقمە روون ئەبیٚتەوە و دەرئەکەویٚ کە رادەو پلەی خۆشی و کامەرانی یەکەم زۆر بەرزترە، لە باریٚ تـرەوە بـەم باسـە خـوای گـەورە سـەرنج و دلٚـی هـەموو جـۆرە تـاقم و هـەموو کەسـیٚ رائەکیٚشیٚ بۆ لای ئیمان و گویٚ رایەلٚی بە بەلٚیٚن دان بە هەر شتیٚ کە لەم جیهانەدا ئارەزووی ئەکات و خووی پیٚوە گرتووە، چونکە هەرکەسیٚ بە شتیٚ رائەکیٚشریٚ کە دلٚی بەستراوە پیٚ یەوە، بە تایبەتی یەکەم چینیٚ کە ئەم قورئانەی چوو بە گویٚدا ئەو عەرەبانە بوون کە لەو ولاٚتە گەرمە بیٚ ئاوەدا بوون، کەواتە شتیٚ کە دلٚی ئەوان راکیٚشیٚ درەخت و سیٚبەرو سەهەند و ئاوی زۆری فراوان و هەمیشەیی یە، ﴿وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ * لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ﴾ ئەم تاقمە وان لەناو باغاتیٚك دا کە میوەی زۆرو زەبەندی تیٚدایە لە هەموو جۆر، نە دوایی دیٚت و نە کۆتایی پیٚ ئەهیٚنریٚ، نە بەرگری و قەدەغە ئەکریٚت لیٚ یان، بەلٚکو ئەو هەموو میوەهاتە هەمیشە هەن و بەهەشتی یـەکان هـەرکات ئارەزوو بکـەن بـیٚ ئـەرك دەستیان ئەکـەویٚ، لـەپاش ئـەو هـەموو نیعمەتە گرنگانە، ئینجا باسی جیٚگاو بانیان ئەکات، ئەفەرمویٚ: ﴿وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ﴾ ئەم تاقمە لەناو جیٚگاو باناندا دانیشتوون بەسەر ژیٚرە خەریٚکەوە کە رادەو نرخیان بەرز کراوەتەوە، بەرزکراونەتەوەلەزەوی وداخراون بەسەر تەخت و کورسی و جیٚگای بەرزەوە، کەواتە دەروون لە هەمووڵەکەوچلٚك وچەپەلٚی لەهەمووبارێکەوە، ئینجابەبۆنەی ئەوجیٚگاوبانەبەنرخ وبلٚندەوە دیٚتە سەر باسی ئەو ئافرەتە حەلاٚلٚ و هاوسەرانەی کە هاوڕیٚی بەهەشتی یەکانن لەناو ئەوجیٚگا و بانەدا[1]. ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ﴾ بەراستی ئیٚمە ئەو ئافرەتانەمان دروست کردووەبەدروست کردن و فەراهەم هیٚنان لەریٚوە بیٚ باوك ودایك نەك لەریٚگای زاوزیٚوە.

---

[1] هەندیٚ ئەفەرمون مەبەست بە وشەی ﴿فرش﴾ ئەو ئافرەتانەیە، لە زمانی عەرەب دا ئەو وشەیە بەکار ئەهیٚنریٚ بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە، ئەمەیش ئەگونجیٚ.

واتە ئەو حۆری یانەی کە ئافرەتی ئەم جیهانە نین بەو جۆرە دروستمان کردوون و ئامادەمان کردوون، هەروەها ئافرەتە موسڵمانەکانی ئەم جیهانەیش هەر بەو جۆرە دروست ئەکەین و دووبارەیان ئەکەینەوە، ﴿فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا * عُرُبًا أَتْرَابًا﴾ ئینجا ئەو ئافرەتانەمان کردووەو ئەیانکەین بە ئافرەتانێ کە هەمیشە کچ و مێرد خۆشەویست و هاو تەمەن و یەکسانن لەگەڵ مێردەکانیان دا لە تەمەن و گەنجی دا کە تەمەنی ٣٠ – ٣٢ساڵی یە وەکو لە حەدیس دا ئەفەرموێ. کە ئەوەیش ئەوپەڕی رادەو پلەی بەرزی حەلاڵ و هاوسەری یە ﴿لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ﴾ ئەو ئافرەتانەمان بەو جۆرە فەراهەم هێناوە و فەراهەمی ئەهێنین لەبەر خاتری ئەو تاقمە کە پێیان ئەوترێ: ﴿اصحاب اليمين﴾ ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ * وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ﴾ ئەم تاقمەکۆمەڵێکی زۆرن لەپێشووەکان، هەروەها کۆمەڵێکی زۆرن لە دوایی یەکان[2]. خوای خاوەن بەزەیی ئەو هەموو نازو نیعمەتە کە نەدیوە ئەخاتە پێش چاوو بەو جۆرە سەرنجی بەندەکانی رائەکێشێ و بانگیان ئەکات بۆ گوێڕایەڵی بێ ئەمەی هیچ جۆرە پێویستی یەکی هەبێ بە بەندەکانی و نە بە گوێڕایەڵی ئەوان، بەڵکو تەنها لەبەر بەزەیی بێ سنووری خۆی، کەواتە حەق وایە شەرم بمانگرێ و روومان نەبێ سەر بەرز بکەینەوە لە ئاستی ئەم هەموو لوتف و بەزەیی یە، تەنها ئەم بیر کردنەوەمان بەس بێ بۆ ئەمەی سەری بەندەیی داخەین و گوێڕایەڵ بین و خۆمان بێبەش نەکەین لەو بەزەیی یە فراوانە، خوای گەورە بەو جۆرە ئەو چەند نموونەی باس فەرموو لە پاداشتی ئەو دوو تاقمە بەهەشتی یە، ئینجا باسی چەند نموونەیەك ئەکات لە سزاو تۆڵەی سەختی تاقمی سێ یەم کە دۆزەخین ئەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ﴾ مەبەست بەم تاقمە ئەوەیە کە لە سەرەتای سورەتەکەوە ناوی بردن بە ﴿اصحاب المشئمة﴾ لەوێ راڤەمان کردو ئەم تاقمەمان روون کردەوە، کەواتە دووبارە کردنەوەی ناوێ، بەڵکو با خەریك بین بە باسی سزاو پاشەڕۆژی سەخت و بەد بەختی یانەوە.

---

[1] مەبەست بە وشەی ﴿من﴾ یان تەنها ئەو ئافرەتانەیە کە خوا لە بەهەشت دا دروستی کردوون و ئامادەی کردوون بۆ خاوەنەکانیان، یان مەبەست ئافرەتەکانی ئەم جیهانەیە کە موسڵمان و بەهەشتین، یان مەبەست هەردوو تاقمە بە تێکڕایی بە هەر سێ بار تەفسیر کراوەتەوە، زۆر لە زانایان بە سێ یەم تەفسیریان کردووەتەوە، دڵیش بەمەیان زیاتر بە ئارامە لەبەر ئەوە تەفسیرەکە لەسەر ئەم بارە کرا، بێگومان بە گوێرەی باری یەکەم هەردوو کردارەکە: ﴿أنشأنا، فجعلنا﴾ هەرچۆنێ دیمەنیان رابردووە هەروەها بە رابردوویش تەفسیر ئەکرێن، بەڵام بە گوێرەی رای دووەم تەفسیر بە لەمەوپاش ئەکرێنەوە، واتە بە رانەبردوو نەك بە رابردوو، زانینی راستەقینە لای خوایە.

[2] مەبەست لە پێشوو دوایی یەکانمان باس کرد لەکاتی تەفسیری تاقمی نزیك خراوەکان دا با تەماشای ئەوێ بکرێ.

فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ * وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ * لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ ئەم تاقمە وان لەناو گڕەو گەرمای ئاگرێ کە ئەچێ بەناو هەموو لەش دا، لەناو ئاوێك دان کە گەیشتووەتە ئەوپەڕی پلەی گەرمی، وان لەناو سێبەرێك دا کە سێبەری دووکەڵێکی ئێجگار ڕەشە کە لەو دۆزەخەوە دێت، ئەو سێبەرە نە سادرو فێنکە و نە خۆشە و نە شێوەیەکی جوانی هەیە. خوا پەنامان بدات، بەرامبەر بەو هەموو نازو ڕێزو جێ و شوێنی نایاب و ئەو هەموو سێبەر و سەمەند و میوەهاتی کەس نەدیوو ئەو هەموو خواردن و خواردنەوە، بەرامبەر بەو هەموو خۆشی و کامەرانی یەی تاقمە خوا پێداوەکان، بەرامبەر بەوانە ئەم تاقمە بەد بەختە چارە ڕەشانە ژیانیان ئەوەیە گڕەو گەرمای بڵێسەی ئاگرێ کە ئەچێ بە هەموو لەشیان دا و ئەیان کولێنێ، ئاوێ کە ئەیخۆنەوە هەموو ناو سکیان دائەفرەقێنێ و پارە پارەی ئەکات، سێبەرەکەیشیان ئەو سێبەری دوکەڵە ڕەشەیە کە ئەیانخنکێنێ، میوەو خواردەمەنی یان لە درەختی زەقومە و جێ و شوێنیشیان ئەو ئاگرەیە کە ئەم ئاگری ئێستا هیچ نانوێنێ لە ئاستیدا، خوا پەنامان بدات رادەی ئەو سزا سەختە شتێ نییە بەم جۆرە باسانە ڕوون بکرێتەوە بەڵکو بەم ئەندازەیە نزیك ئەخرێتەوە لە تێگەیشتنەوە، ئەو سزا سەختەیش زۆر بەجێ یە و مافی خۆیانە لەبەر چەند هۆیەك:

١- ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ﴾ چونکە ئەوانە پێش ئەوە لە دنیادا سەریان کردووە رابواردن و بەجێ هێنانی ئارەزووی ناڕەوای خۆیان و لایان نەئەکردەوە بەلای خواو گوێڕایەڵی بۆ خوا.

٢- ﴿وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ﴾ ئەوانە سوورو نەگۆڕاو بوون لەسەر گوناهی زۆر گەورە کە بریتییە لەهاوبەش ڕەوادان بۆ خوا، واتە لە دنیادا لەسەر ئەو گوناهە گەورەیە مانەوەو کۆتایی یان نەهێنا لێی، ئەو پەیمانەیان شکاندو سەریان کردە پەرستنی جگە لە خوا.

٣- ﴿وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ * أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾[1] ئەیان وت ئایاکاتێ ئێمەبمرین و ببین بەخۆڵ و ئێسکە رزیو، ئایاتازە زیندوو ئەکرێینەوە؟ ئایا باوك و باپیرە پێشووەکانیشمان زیندوو ئەکرێنەوە؟ واتە باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە نەبوو، زۆر بە دووریان ئەزانی کە لە پاش مردن گیان بگەڕێتەوەو ژیان پەیدا ببێتەوە نەخوازەلاً ماوەیەکیش تێپەڕی تا لەش بڕزێ و ببێ بە خۆڵ و ئێسك، بە تایبەتی سەرسام ئەبوون و سەریان سوڕ ئەما لە زیندوو کردنەوەی ئەوانەی کە لە کۆنەوە مردوون و چەند چەرخ تێپەڕیوە بەسەر مردنیان داو بە هیچ جۆر هیچ شوێنەوار و دروشمیشیان نەماوە[2].

خوای گەورە بەرپەرچیان ئەداتەوەو دڵنیایان ئەکات لەسەر راستی زیندوو بوونەوەو هەڕەشەی زۆر بەتین و بەهێز ئەکات لە بێ باوەڕان ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ * لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾ بڵێ بەو بێ باوەڕانە بە راستی هەموو پێشووەکانتان و دوایی یەکانتان بێگومان کۆ ئەکرێنەوە و ئەدرێنە بەر بۆ مەیدانی دادگای خوا لە کات و رۆژێك دا کە زانراوە و دیاریی کراوە، کە ئەوەیش کاتی کۆتایی هاتنی تەمەنی ئەم جیهانەیە و بەدی هاتنی رۆژی دوایی یە، ئینجا باسی هەندێ لە بەسەرهات و سزای سامناکی ئەو بێ باوەڕانە ئەکات لەو رۆژە سەختەدا بە جۆرێ حەق وایە هەر بە بیر لێ کردنەوەی دڵ و دەروون بێتە لەرزە، تیکە لە گەردوودا بگیرێ،

---

[1] رەوشتی قورئان لێرەدا – وەکو لە چەند شوێنی تردا – زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەرە: ئەبینین لەم کاتەدا کە باسی هۆی تۆڵەی ئەو تاقمە ئەکات بە جۆرێ باسی ئەکات وەکو ئێستا رۆژی دوایی هاتبێت و ئەو تاقمە لەناو سزادا بن و هۆی سزاکەیان شتێکە تێپەڕیوەو ئەگێڕرێتەوە بۆ ئابڕوو بردن و لەکەدار کردنیان سەرەڕای عەزاب و سزاکەیان، ئەوەتە ئەفەرموێ: ﴿إنهم كانوا.. و كانوا... و كانوا﴾.

[2] تێبینی: قورئان هۆی پاداشتی باس نەکرد، بەڵام هۆی تۆڵە و عیقاب باس ئەکا، چونکە ئەجرو پاداشت بە گوێرەی کەرەم و چاکە و لوتفی خوایە، کەواتە هەر بە باش سەیر ئەکرێ و گومانی ناڕەوایی تێدا نی یە، بەڵام تۆڵە بە گوێرەی دادو عەدلە کەواتە ئەگەر هۆکەی باس نەکرێ لەوانەیە گومانی ناڕەوایی ببرێ، هەم خوای گەورە رەحمی فراوان ترەو بێشکەوتوو ترە لە غەزەبی لەبەر ئەوە هەموو چاکە و پاداشت جێگای خۆیەتی و هەر ئەوە چاوەڕوان ئەکرێ، دیمەنی تۆڵە و عەزاب ناگونجێ لەگەڵ بەزەیی یەکەی دا، کەواتە پێویستە باس کردنی هۆی عەزاب و تۆڵە.

﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ﴿٥٦﴾﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ * لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾ پاش زیندوو کردنەوە بەڕاستی ئەی کۆمەڵی گومڕاکان کە باوەڕتان نی یە و زیندوو بوونەوە بە درۆ ئەزانن، بێگومان لەبەری درەختی (زەقوم) ئەخۆن، لە دنیادا پیس ترین درەختە لە خاکی (توهامە) ئەڕوێ، ئەوەی ڕۆژی دوایی کە ناوی ئەبات بە درەختی زەقوم کەس نازانێ چۆنە و چی یە؟ بەڵام خوا لە شوێنی تردا باسی فەرمووە کە درەختێکە لە بێخی دۆزەخەوە ئەڕوێ و دەردێت، بەرەکەی دڕکاوی و چڵ چڵاوی یە و دیارە لە ئاگرە، لەگەڵ ئەوەدا ئەوا خوا ئەفەرموێ: لەوە ئەخۆن ﴿فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ﴾ ئینجا سکی خۆتانی لێ پڕ ئەکەن، ئەوەیش لە ناچاری و لەتاو برسێتی، چونکە سزاو عەزابی دۆزەخ لە هەموو بارو ڕوویەکەوە هەیە، هەرچۆنێ ئاگر ئەیانسووتێنێ دەردی برسێتی و تینوێتی ڕوویان تێ ئەکات لە ناچاریدا ئەو خۆراکە دڕکین و ئاگرینە ئەخۆن، ئینجا لەگەڕوویان دا ئەگیرێ بەهۆی ئەوەو تینوێتی بەهێزەوە پێویستی یان بە ئاو ئەبێ ئاوەکەیش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ﴾ پاش خواردنی ئەو ژەقنە بوتە کە سکی خۆتانی لێ پڕ ئەکەن ئینجا ئەخۆنەوە بەسەر ئەو زەقومەدا لە ئاوێ کە زۆر گەرمە، گەرمی یەکەی تا ئەو ڕادەیە کە قورئان ئەفەرموێ: ﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾[1] دیارە ئاوی وەها تینوێتی ناشکێنێ، تا بێت ئارەزووی ئاو خواردنەوەیان بەهۆی ئەوەوە زیاد ئەکات لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ﴾ ئینجا ئەخۆنەوە بە وێنەی خواردنەوەی ئەو

---

[1] واتە: ئاوێکی زۆر گەرمیان دەرخوارد ئەدرێ کە هەموو ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە ئەکات، خوا پەنامان بدات. سورەتی ﴿محمد / ١٥﴾.

حوشترانەی کە دووچاری نەخۆشی (ئیسقا) دێن و هەرگیز تێر ناخۆنەوەو تێر ئاو نابن.

ئینجا بە شێوەی لاقرتی ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ﴾[1] ئەم ژەقنەبوت و ئاوە گەرمە زیافەتی میوانداری یانە لە رۆژی دوایی دا، کەواتە پەنا بە خوا ئەبێ لە پاش جێگیر بوون و نیشتەجێ بیان لە دۆزەخ دا چۆن بن و چی یان پێ بدرێ؟ چۆن سزای تر بدرێن؟

ئینجا دەست ئەکات بە بەڵگە هێنانەوە بۆ دامەزراندن و جێگیر کردنی عەقیدەو بیروباوەڕ لە دڵ و دەروون دا بە شێوەی گشتی، بە تایبەتی باوەڕ بە رۆژی دوایی، بۆ ئەم مەبەستە گرنگە زۆر بە سووك و ئاسان چەند شتێك ئەخاتە پێش چاو لە بەرهەم و شوێنەواری دەسەڵاتی بێ سنووری خوا کە ئەو شتانە شتێکن هەمیشە ئادەمی لەگەڵیان دا ئەژی و پێ یانەوە خەریکە و زۆر بەڵگە و نیشانەیەکی روونیشن، بۆ هەموو کەس و هەموو چین و هەموو چەرخێ ئەگونجێن بێ قۆرت و بێ گرێ، ئەوەیش باوی قورئانە و هەر لە دەست ئەو دێت بەو جۆرە ئەدوێ لەگەڵ بەندەکانی خوادا. ئەو شتانەی کە لێرەدا ئەیانخاتە پێش چاو بریتین لە:

١- پەیدا بوون و دروست بوونی ئادەمی.

٢- مردنی خۆیان.

٣- پەیدا بوونی ئەو کشتوکاڵەی کە خەریکن پێ یەوە.

٤- ئەو ئاوەی ئەیخۆنەوە.

٥- ئەو ئاگرەی کە ژیانی لەسەرە.

---

[1] وشەی ﴿نزل﴾ بە خۆراکێ ئەوترێ کە ئامادە ئەکرێ بۆ میوان کە رێز ئەگیرێ و لە رێوە هات پێی ئەدرێ جا لێرەدا مەبەست لاقرتی یە پێ یان کە سزادانێکی ترە.

ئینجا با گویٚ بگرین بۆ قورئانی پیرۆزی بەفەڕ ئەو باسە گرنگەمان بۆ بکات ئەفەرمویٚ:

﴿نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ﴾[1] ئێمە لە یەکەم جارەوە ئێوەمان دروست کردووە، دەی کەواتە باوەڕ بێنن بەو دروست کردنە. واتە باوەڕێکی وەها کە لە کردەوەدا دەرکەویٚ و کردەوەتان دژو پێچەوانەی ئەو باوەڕە نەبیٚ ، یان کەواتە باوەڕ بێنن بە زیندوو بوونەوە، چونکە کەسیٚ لە یەکەم جارەوە ئێوەی دروست کرد ئەبیٚ باشتر باوەڕتان هەبیٚ بە توانا و دەسەلاٚتی بەسەر زیندوو کردنەوەو دووبارە کردنەوەتاندا، بێگومان دروست کردنی یەکەم کە خوا ئەیکات شتێکی ئەوەندە راستە خۆی ئەچەسپێنیٚ لە هەموو دڵ و دەروونێك دا کە فامدار و خاوەن هۆش بیٚ، هەرکەسیٚ بێبەش نەبیٚ لە ژیریی ناتوانیٚ باوەڕی رێك و پێکی نەبیٚ بەو شتە راستە، چونکە هەرکەس هەرکات بە تەرازووی ژیریی بەراورد و لێکدانەوەیەك بکات ناچارە ئەبیٚ هەر بڵیٚ: خوا ئەم ئادەمی یە نایابە سەرسوڕهێنەرەی دروست کردو دایهێنا، ئەی ئەگەر وا نەڵیٚ ئەبیٚ چی بڵیٚ؟ ئایا بە رێکەوت پەیدا بوو؟!! ئایا ئادەمی خۆی خۆی دروست کرد؟!! بێگومان هیچ خاوەن ژیریی یەك خۆی ناکات بە پەند و باوەڕ بێنیٚ بە هیچ کام لەو دوو تیرو بارە، کەواتە ئەبیٚ هەر بڵیٚ خوایە دروستی کردووە کە خاوەنی دەسەلاٚت و زانین و حیکمەتی بیٚ سنوورە ئەمە لە بابەت داهێنان و دروست کردنی یەکەم جارەوە، هەروەها لە پاش یەکەم جار بۆ دروست بوون و پەیدا بوونی ئادەمی لە رێگای زاوزێوە ئەبیٚ هەر بڵێین خوا دروستی ئەکات و فەراهەمی ئەهێنیٚ، ئەگەر نا ئەبیٚ باوك چ دەورێکی هەبیٚ لە دروست کردنی رۆڵەی دا؟ ئاشکرایە هیچ دەسەلاٚتێکی نی یە و ئاگای لە هیچ شتێك ن ییە، هیچ هۆی دروست بوونیٚ نی یە لەلایەن باوکەوە جگە لەو ئاوەی کە فڕیٚ ی ئەداتە ناو منداڵدانەوە، وەکو لەم ئایەتەدا ئەکۆڵێتەوە لەوەو ئەفەرمویٚ: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ * ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ﴾ دەی هەواڵم بدەنیٚ لەو ئاوەی کە ئەیڕێژنە ناو منداڵدانی ژنەکانتانەوە، ئایا ئێوە دروستیان ئەکەن و ئەیانکەن بەو ئادەمی یە رێك و پێکە، یان ئێمە دروستی ئەکەین و ئەیکەین بەو

---

[1] وشەی ﴿لولا﴾ لێرەدا بۆ هاندانە لەبەر ئەوە کردارە رانەبردووەکە بە داخوازی (أمر) تەفسیر کراوە. هەروەها ئەو وشەیە هەر بۆ هاندانە لە رستەی ﴿فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ، فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾ کە لەمەو پاش دێت.

ئادەمی یە؟! بێگومان لێرەدا تەنها وەلأمێك هەیە كە راست بێت: ئەبێ هەموو كەس بڵێت نەخێر ئێمە دروستی ناكەین بەڵكو تۆ ئەیكەیت ئەی خوایە.

ئەم ئەندازەیە لێكدانەوەو تێفكرانە، كە بە شێوەیەكی سادەیشە بۆ هەموو كەس لە هەموو چەرخ و چینێك دا ئەگونجێ، ئەم ئەندازە تێفكرانە بەسە بۆ هەموو خاوەن ژیریی یە بۆ ئەمەی بوەستێ بە گەردن كەچی یەوە سەری بەندەیی داخات بۆ ئەو خوایەی كە لەو ئاوە قێزەونە ئەم ئادەمی یە نایابە دروست ئەكات، بەلأم با ئەندازەیەك قوڵتر بۆی رۆچینە خوارەوە بیر بكەینەوە كە چۆن ئەم شتە بچووكە ئەبێ بەم ئادەمی یە؟ ئایا چۆن ئەو پارچە بچووكە پەرە ئەسێنێ و دابەش ئەبێ بە هەزارەها ملیۆن پارچە، هەموو كۆمەڵەیەكی تازە كە پەیدا ئەبێ شتێكی تایبەتی یە بۆ پێك هێنانی گۆشە و ئەندامێك لە لەشی ئادەمی دا، هەر كۆمەڵەیەك كۆئەندامێ فەراهەم ئەهێنێ: ئەوەتا كۆمەڵەیەك هی ئێسكە، یەكێ ئەبێتە دەمار، یەكێكی تر ئەبێ بە پێست، یەكێ بە ماسولكە، ئینجا ئەمانە هەموو بۆ شوێنی خۆیان ئەڕۆن، ئەوەتا تاقمێ ئەڕوالە جێگاو شوێنی چاودا چاو فەراهەم ئەهێنێ بەهەموو كۆئەندامەكانی یەوە، تاقمێ تر لە شوێنی تایبەتی خۆی دا گوێچكە فەراهەم ئەهێنێ، هەروەها بڕۆ بۆ دەم و دان و زمان و لێوو پووك و لەوێوە بڕۆ بۆ گەروو ناوسك و دڵ و گورچیلە و جگەرو سی و زارو و ریخۆڵە و هەموو شتەكانی تر، ئایا ئەم هەموو كەرەسە چۆن جێگای بووەتەوە لەو تەنها سێڵەدا؟ چۆن جوێ بووەوە لێ ی؟ كە جوێ بوەوە چۆن تێكەڵی یەكتر نەبوون؟ چۆن هەركام شوێنی تایبەتی خۆی لێ نەگۆڕا؟

ئیتر با بوەستێ ئەو هەموو هێزو وزە سەرسوڕهێنەرە كە پەیدا ئەبێ لە لەش و ئەندامەكانی لەش دا، با بوەستێ ئەو هەموو شێوەو وێنە جیاوازە بۆ ئەم هەموو ئادەمی یە، بەڕاستی بێ باوەڕی زۆر زۆر جێگای سەرسوڕمانە، ئایا ئەبێ ئادەمی چۆن نەفامی بگاتە ئەو رادەیە باوەڕی نەبێ بە داهێنەرو پێكەیەنەرو پەروەردگاری ئەم هەموو شتە نایابە؟ بەڕاستی هەرچۆنێ داهێنان و دروست كردنی ئادەمی شتێكی سەرسوڕهێنەرە، هەروەها مراندنی ئەو ئادەمی یە نایابە و كوژاندنەوەی ئەو هەموو هێزو وزەو هەست و فام و هۆشە، ئەمانەیش هەر جێگای سەرسوڕمانەوەكودروست كردنەكەی، بەلأم ئەم هەموو شتە نایابە بەهۆی ئەو ئولفەت و دەق پێوە گرتنەوە گرنگی و نایابی یەكەی فەرامۆش ئەكرێ، لەبەر ئەوە قورئان ناو بەناو بێدارمان ئەكاتەوەو سەرنجمان رائەكێشێتەوە بۆیان وەكو لێرەدا گرنگی مراندنمان بیر ئەخاتەوە،

**ئەفـەرموێ: ﴿نَحۡنُ قَدَّرۡنَا بَيۡنَكُمُ ٱلۡمَوۡتَ﴾ ئێمـە مردنمـان بڕیـار داوەو دابـەشمان کـردووە لـە نێوانتـان دا هـەموو کـەس لـە کـات و شـوێنی تایبـەتی و دیـاریی کـراوی خـۆی دا. ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ﴾ ئێمە نین بە پێش لێ کەوتوو لە دەست دەرچوو، هیچ کەسمان لە دەست دەرناچێ ئەبێ هەموو بمرێنین لە کاتی خۆی دا. بەڕاستی زۆر سەیرە ئەم مردنە کە دووچاری هەموو زیندوویەك ئەبێ ئایا ئەو مردنە چی یە؟ چۆن روو ئەدات؟ ئایا بۆ بە هیچ جۆر بەرگری ناکرێ؟ بێگومان ئەوە بڕیاری خوایە بۆیە چار ناکرێ و بەرگری ناکرێ، ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمۡثَٰلَكُمۡ﴾[1] مردنمـان بڕیـار داوە لـە نێوانتـان دا لەبەر ئەوە لـە جێگـای چین و تـاقمێ کـە ئەمرێ چین و تاقمێ تر لە وێنـەی خۆتـان بێـنن و چین لـە دوای چین بۆ ئاوەدان کردنـەوەی زەوی، تـا ئـەو کاتـە دێـت کـە ئـەم جیهانـە کۆتـایی پـێ ئـەهێنین، ئینجـا دوای مردنـی هـەمووان یەکـسەر هـەموویان دروسـت ئەکەینـەوە بـە جـۆرێکی تـر، وەکـو ئەفـەرموێ: ﴿وَنُنشِئَكُمۡ فِي مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ مردنمان بڕیار داوە تا ژیان لەم جیهانەدا دوایی بێت و هەمووتان بمرێنین چین لە دوای ئەوە دروستتان بکەینەوە لە شێوەو سورەتێ تردا کە ئێوە نایزانن چی یە و چۆنە؟ بێگومان ئەو دروست کردنە زۆر جیاوازە لەمەی ئەم جیهانە لە گەلێ بارەوە، بۆ وێنە: دروست کردنـەوەی ئەوێ بە جۆرێکە دەست نادات بۆ مردن و گۆڕان، شێوەی تایبەتی هەیە بۆ موسڵمان و کافر، ئەم دروست کردنەوەی رۆژی دوایی یە هیچ هەق نییە سەری لێ بکرێتەوە، چونکەدروست کردنی یەکەم جارلەم جیهانەدا بەڵگەونموونەیەکی زۆر روون وئاشکرایە لەسەری،**

---

[1] ئەم تەفسیرە بەم گوێرەیە کە وشەی ﴿علی﴾ بەسترابێ بە ﴿قدرنا﴾ وە، ئیتر بە مەعنا ﴿ل﴾ عیلـەت بـێ، یـان هـەر ﴿علی﴾ لەسەر مەعنای خۆی بێ بەلاّم ئەو رستەی کە بەسەریەوە (حال) بێ لە ﴿نا﴾ کـە فـاعیلی ﴿قدر﴾ ەیـەوە بـە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتـەوە و زۆر جوانیشە ﴿علی﴾ بەسترابێ بـە وشـەی ﴿مسبوقین﴾ ەوە، ئـەو کاتـە واتـای ﴿مسبوقین﴾ جیاوازە لەوەی تەفسیرەکە، واتە ئێمە نین بە زۆر پـێ هێنـراوو بـێ دەسـەلاّت لـەوەی کە لـە باتی ئێـوە وێنەی ئێوە بێنین و دروستی بکەینەوە بە تەرزێ تر، لە شێوەو شوێن و سـورەتێکی تـرا، ئـیتر لـەم جیهانـەدا یـان لـەو جیهان، بە گوێرەی تەفسیرەکە رستەی ﴿و ما نحن بمسبوقین﴾ (معترضة) یە تێهەڵکێشە.

وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾

وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾ بێگومان زانیوتانەو ئاگادارن بە پەیدا بوونی یەكەم جارتان و دروست كردنتان لە خاك، ئینجا لەو ئاوە و بەو شێوە كە هەموو كەس ئەزانێ، ﴿فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی كەواتە بیر بكەنەوە و تێفكرێن لەو كەسەی كە دەسەڵاتی هەیە بەسەر دروست كردنی یەكەم جاردا دەسەڵات و توانای هەیە بەسەر دوبارە كردنەوەداو دووەم جاردا، بەڵكو ئەبێ دووەم جار بە ئاسانترو گونجاو تر سەیر بكرێ، چونكە كەرەسەی حازرو و ئامادەیە و وێنەی لە پێشەوە بەدی هاتووە، بەڵێ بۆ خوا هیچ جیاوازی نی یە هەردوو وەك یەك ئاسانەو هیچ ئەركی نییەوهیچی ناوێ جگە لەوەی بیەوێ و بفەرموێ: ببە.

ئا بەم تەرزە سووك و روون و ئاسانە قورئان پەیدا بوون و دروست كردنی یەكەم جارو دووەم جار پیشان ئەدات، سروشت و ژیریی ئەخاتە كارو ئەیانوەستێنێ بەرامبەری یەك، بە جۆرێك جێگای گومان و دوو دڵی ناهێڵێتەوە، باوەڕی پتەوو بەتین بە زیندوو بوونەوەر فەراهەم ئەهێنێ بێ ئەمەی گرێ و گۆتاڵ بهێنێتە رێگاو دڵ و دەروون ماندوو بكات و بە بێ ئارامی بیهێڵێتەوە. ئینجا هەر بەو تەرزە روون و ئاسانە بەڵگە و نیشانەیەكی تر پیشان ئەدات، دڵ بێدار ئەكاتەوە بە موعجیزەیەكی تر كە لەسەر دەستی ئادەمی دا و بە پێش چاوی یەوە روو ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ * ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ﴾[1] ئینجا هەواڵی ئەو تۆمەو دانەوێڵەیەم بدەنێ كە ئەیچێنن لەناو زەوی دا، ئایا ئێوە سەوزی ئەكەن و ئەیروێنن، یان ئێمە سەوزی ئەكەین و ئەیروێنین؟! بێگومان ئەبێ بڵێن ئەی خوایە تۆ سەوزی ئەكەیت، لە توانای ئێمەدا نی یە رواندن و سەوز كردنی، چونكە ئاشكرایە ئێمە

---

[1] وشەی ﴿أم﴾ لەم چوار شوێنەدا بە شێوەی (متصل) تەفسیرم كردەوە، چونكە بەم جۆرە ئاسانترە، ئەگونجێ (منقطع) یش بێت بەڵكو بە گوێرەی رێزمانی عەرەب ئەبێ (منقطع) بێت، چونكە لە پاشی یەوە رستە هەیە، جا لەم كاتەدا بە مانا ﴿بل﴾ و ﴿أ﴾ ی پرسیارە.

هیچمان به دەست نی یە، جگە لە کێڵانی زەوی و چاندنی ئەو دانەوێڵە و تۆمە کە خوا دروستی کردووە، ئیتر زیاد لەوە ئاگامان لە هیچ بەسەرهات و کاروبارێکی نی یە. ئەو دانەوێڵە، یان ئەو تۆمە و ناوکەیە پاش چاندنی رێگای خۆی ئەداتە بەرو بە موو لیْ ی لانادات و ئەو هەموو قۆناغە ئەبڕێ بە وێنەی کەسێکی زۆر ژیری ئاگاداری لێزان هیچ کلە و هیچ جارێ هەڵەیە ناکات و شتێکی لیْ ناگۆڕێ تا ئەگاتە جیْ و شوێنی خۆی و ئامانجی خۆی بەجیْ ئەهێنێ، کە بریتی یە لە دووبارە کردنەوەی ئەو جۆرو نەوعی خۆیە، بۆ وێنە: دەنکە گەنمەکە دوای چاندن و پێگەیشتنی لە قۆناغی دانەوێڵەیی دا ئەمێنێتەوە تا دەئاوسیْ و کاتی تەقینی دێت، ئینجا چەکەرە ئەکات و ئەگوێزێتەوە ئەو قۆناغە، لەوێش ماوەیەك ئەمێنێتەوە تا ئەندازەیە خۆی ئەگرێت و ئینجا سەوز ئەبیْ و دەست ئەکات بە وەرگرتنی رەنگ و شێوەی تایبەتی خۆی، لەم قۆناغەیش دا ئەمێنێتەوە تا کاتی قەف و گوڵ، هەروەها قۆناغ بە قۆناغ تا بە تەواوی پیْ ئەکات و دووبارە ئەبێتەوە.

هەموو جۆرە نەوعیْ ئەم هەموو قۆناغ و بارە ئەبڕێ و ئەگۆڕێ بیْ ئەمەی هیچ جۆرو هیچ نەوعیْ تێکەڵی جۆرو نەوعێکی تر ببیْ، لەگەڵ ئەمەدا لە یەك زەوی دا ئەچێنرێ و بە یەك ئاو ئاو ئەدرێن، ئەوەتا لەوەتەی خوا دروستی کردوون گەنم هەر گەنمە و جۆ هەر جۆیە و هەروەها هەموو دانەوێڵەکانی ترو هەموو دارو درەختەکانی تر میوەدارو بیْ میوە، لەو پارچە بچووکەدا کە ئەبیْ بە چەکەرە هەموو کەرەسەی ئەو شینایی یە، یان ئەو درەختەی تێدا شارراوەتەوە: بە ساق و گەڵا و ریشە و پەل و پۆو توێکڵ و بەرو بوومێکەوە، کەرەسەی هەموو شتیْ جویْ ئەبێتەوە و بۆ شوێن و جێگای تایبەتی خۆی ئەڕوات، کەرەسەی توێکڵ بۆ شوێنی توێکڵ ئەبیْ، وەکو کەرەسەی گەڵا لە دانە و تۆمەکە جویْ ئەبێتەوە و بە ناو ساقی کشوکاڵەکەدا ئەڕوات یان بەناو ئەو دارە رەقەدا ئەڕوا تا ئەگاتە شوێنی گەڵا و ئەبیْ بە گەڵا، هەروەها شتەکانی تر. ئەم هەموو شتە نایابە سەرسوڕهێنەرانە ئەگەر ئاوا لە پێش چاو ناسراو نەبوونایە بۆمان هەرگیز بڕوامان نەئەکرد کە شتی وا ئەبیْ ئەگەر ئاوا ئاشکرا و ناسراو نەبوایە ئایا ئەبیْ کیْ باوەڕی بکردایە و خەیاڵی بڕۆیشتایە کە تەنها دەنکیْ لە هەر

دانەوێڵەیە ئەو هەموو پەل و ساق و گەڵا و گوڵ و بڕژانگ و شت و مەکەی تێدا شاراوەتەوە، لەو تەنها دەنکە بە سەدەها دەنکی تری لێ پەیدا ئەبێ هیچ دەنکێك کەم و کوڕ نی یە لەو تەنها دەنکەی کە ئەمی لێ فەراهەم هات؟!! ئایا کێ باوەڕی ئەبوو بەمەی کە تەنیا تۆمەیە لە بەری درەختێ وەکو دارتوو کە بە قەدەر زەنگیانەیەکی بچووکە، ئایا کێ باوەڕی ئەکرد کە ئەو شتە بچووکە لەوانەیە بڕوێ و ببێ بەو درەختە زۆر گەورەیە؟ چۆن کەرەسەی ئەو هەمووە جێگا کراوەتەوە لەو شتە بچکۆلەیەدا؟ بێگومان ئەگەر ئاوا بە چاو نەبینرایە هەرگیز و هەرگیز هیچ کەس باوەڕی نەئەکرد، بە شتێکی نەگونجاوی دائەنا، دەی ئایا هیچ کەس هەیە لە ئێمە کە بتوانێ بڵێ هیچ دەخلێکی هەیە لەو هەموو بەسەرهات و کاروبارە گرنگەدا جگە لە ناشتن و چاندن و ئاودانەکەدا؟ بێگومان هیچ کەس نی یە خۆی نەناسێ و ئەو داوا بەجێ یە بکات، بەڵکو هەرکەس فام و تێگەیشتنی ببێ ئەبێ بڵێ جگە لە خوا هیچ کەس ئەو کاروبارەی بە دەست نی یە. بە خواهیش و دەسەڵاتی ئەو ئەوانە فەراهەم دێت، ئەگەر خوا مەیلی نەبێ نابێ، ئەگەر خوا مەیلی مەیلی نەبێ هەر ناڕوێ، ئەگەر بیڕوێنێ ئینجا مەیلی نەبێ وشکی ئەکات و پێی ناگەیەنێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا﴾ ئەوەی ئێوە ئەیچێنن ئێمە بە رەحم و بەزەیی خۆمان بۆتان ئەڕوێنین و پێی ئەگەیەنین تا بەرهەمەکەی وەرئەگرن، ئەگەر بمانەوێ پاش روان و سەوزبوونیش وشکی ئەکەین و ئەیکەین بە پووش و پەڵاشێکی داڕزاو پێش ئەمەی پێ بگات ودروێنەی بکەن﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾ ئینجائەوکاتەلەبەر رەنجەڕۆیی و دڵ غەمگینی سەرسام ئەبن لەو بەسەرهاتە، گلەیی لە بەدبەختی خۆتان ئەکەن و بەداخەوە ئەڵێن: ﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە زەرەرمەند کراین و تێشکاین و ئەرکی چاندن و بەخێو کردنیشمان خرایە گەردن و سەرشان، ﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ بەڵکو بێبەش و نان بڕاوو نائومێد کراین، بەڕاستی هەرکەس دڵ مردوو نەبێ تەنیا نیشانە و بەڵگەیەکی وەکو ئەم بەڵگە و نیشانانە ئەبێ دڵ و دەروونی پڕ بکات لە باوەڕ بە دەسەڵات و زانین و حیکمەتی ئەو خوایە کەئەم هەمووشتەسەرسوڕهێنەرەی فەراهەم هێناوەو باوەڕ بەڕاستی هاتنی رۆژی دوایی.

أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾

**ئینجا ئەوا نیشانە و بەڵگەیەکی روونی تر ئەخاتە پێش چاو ئەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ﴾ هەواڵم بدەنێ لە بابەت فەراهەم هاتنی ئەو ئاوەی کە ئەیخۆنەوە، ﴿ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ﴾ ئایا ئێوە هێناوتانەتە خوارەوە لە هەور؟ یان ئێمە هێناومانەتە خوارەوە؟ بێگومان هەرکەس رێزی ژیری خۆی بەلاوە بێت ئەبێ بڵێ: خوایە تۆ هێناوتەتە خوارەوە نەك ئێمە، چونکە ئاشکرایە کە ئێمە هیچ دەخلێکمان نی یە بە فەراهەم هێنان و هێنانە خوارەوەی، ئیش و فرمانی ئێمە تەنها ئەوەیە کە ئەیخۆینەوە، ئەم ئاوە شیرینە خۆش و سازگارە کە ژیانی ئەم جیهانەی لەسەر راوەستاوە خوای خاوەن بەزەیی بۆی دروست کردوین لەم زەوی یەدا ئەم هەموو دەریا و دەریا لوشەی لێ پێك هێناوە کە بە بێ ئەوە ژیان ناڕوات بەڕێوە، هەندێ لەو دەریا سوێرە تاڵانە ئەکات بە هەڵم و تەم و بە هۆی باوە بەرزی ئەکاتەوە بەسەر خۆمان و وڵاتەکەمان دا و ئەیبارێنێ و ئەیکات بەو ئاوە سافە شیرینە، ئەو سوێری و تاڵی یەی ناهێڵێ، ئەگەر بە بەزەیی خۆی شیرینی نەکردایە و هەر سوێر و تاڵ بوایە چیمان ئەکرد و چۆن ئەژیاین؟**

**وەکو سەرنجمان رائەکێشێ بۆ ئەو نیعمەتە گەورەیە و ئەفەرموێ: ﴿لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا﴾ ئەگەر بمانویستایە ئەمانگێڕا بە ئاوێکی سوێر، واتە بە سوێر و تاڵی ئەمان باراند ئەو کاتە دەستی نەئەدا نە بۆ خواردنەوە نە بۆ کشتوکاڵ و نە درەختیشی پێ ئەڕوا، ﴿فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾ کەواتە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە گەورەیە، دەی با هیچ نەبێ هەرکات تینوومان بوو ئاومان خواردەوە لەبیرمان بێت، بە دڵ سوپاسی خوای خاوەن بەزەیی بکەین، سوپاسی بکەین کە پێغەمبەری ئازیزمان ئەیکرد: کوڕی ئەبو حاتەم لە ئەبو جەعفەرەوە ئەم فەرموده ئەگێڕێتەوە: ﴿کان النبي (ﷺ) إذا شرب الماء قال الحمد لله الذي سقانا عذبا فراتا**

ولم يجعله ملحا اجاجا بذنوبنا﴾[1]. ئینجابەڵگە ونیشانەی پێنجەم باس ئەفەرمویٚ: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ﴾ دەی هەواڵم بدەنیٚ لە بابەت ئاگرێکی ئەوتۆ کە هەڵی ئەگیرسێنن و دەری ئەهێنن لە درەختی تەڕ ﴿ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ﴾ ئایا ئێوە درەختەکەیتان دروست کردووە و فەراهەمتان هێناوە؟ یان ئێمە دروست کەرو داهێنەرین بۆی؟ بێگومان ئەبیٚ بڵێن: ئەی خوایە هەر تۆ فەراهەم هێنەری، چونکە ئاشکرایە کە ئێمە نازانین ئاگر چی یە و لە چی و چۆن فەراهەم هاتووە؟ بێگومان دۆزینەوەی ئاگر لە یەکەم جارەوە ڕووداوێکی زۆر گرنگ بوو لە ژیانی ئادەمیدا، ئاوەدانی و شارستانێتی بیٚ ئاگر نەئەگونجا و ناگونجیٚ، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو گرنگی یەدا – وەکو شتە گرنگەکانی تر – بەهۆی دەق پێوە گرتن و ئولفەت گرتن لە دڵی دا بیٚ ئاگا ئەبین لە گرنگی و نایابی، ئەوا قورئان بێدارمان ئەکاتەوە بە تایبەتی یەکەم چین کە ئاگریان دەست کەوت ئەبوو بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر: درەختی مەرخ و عفار ئەیانسویی و ئەیان خشان لە یەك تا لەو دوو درەختە تەڕە سەوزەدا ئاگر پەیدا ئەبوو، لەبەر ئەوە سەرنجیان ڕائەکێشیٚ تا بیر بکەنەوەو بزانن کەسیٚ کە ئەو ئاوو ئاگرەی کۆکردووەتەوە ئاسانە بۆی زیندوو کردنەوەی مردووان.

ئینجا باسی هەندیٚ کەڵك و سوود لیٚ وەرگرتنی ئاگر ئەفەرمویٚ: ﴿نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ﴾ ئێمە ئاگرمان گێڕاوە بە بیرخەرەوەی ئاگری دۆزەخ، کردوومانە بە نموونەیەك لەو ئاگرە تا خەڵکی ترس و بیم بیانگریٚ و خۆیان بگێڕنەوە لە گوناهو تاوان، هەروەها کردوومانە بە هۆی گوزەران و سوود و مەنفەعەت بۆ ئەو ڕێبوارو کاروانی و سەفەری یانەی کە لە شوێنی چۆڵ و بیابان دا لائەدەن و ئەمێننەوە و دەستیان ناگاتە ئاوەدانی، بەو جۆرە ئاگر فەراهەم ئەهێنن بۆ چارەسەری هەموو پێویستی یەکیان بێگومان ئاگر شتێکی زۆر گرنگە لە ژیاندا، بە تایبەتی ژیانی ئادەمی بە بیٚ ئاگر بەسەر نابریٚ، هەرچۆن هۆی گوزەرانە بۆ تاقمی ڕێبوارو کاروانی، هەروەها هەموو نیشتەجیٚ و خەڵکی تریش بەو شێوە گشتی

---

[1] واتە: سوپاس بۆ خوا کە ئاوێکی شیرینی خۆش گەواری دەرخوارد داین، بەهۆی گوناهەکانمان نەیکرد بە ئاوێکی سوێری تفت و تاڵ.

یەش وشەی - مقوین - تەفسیر کراوەتەوە لەلایەن هەندێ لە زانایانی تەفسیرەوە، بەڵام زۆربەیان بەو شێوە تایبەتی یە تەفسیریان کردووەتەوە واتە تاقمی ڕێبوارو سەفەری و هۆی تایبەتی کردنەکەش دوو شتە:

یەکەم: نرخ و گرنگی لای ڕێبوار و سەفەری ئاشکرا ترە، ئەوان باشتر قەدری ئەزانن، چونکە داماویی لە سەفەر و شوێنی چۆڵ دا زۆرترە.

دووەم: یەکەم تاقم کە ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا لە سەفەردا ئاگریان بەو شێوە دەست کەوت ئەبوو کە باس کرا، بە چاوی خۆیان ئەو موعجیزە گەورەیان ئەبینی لەو درەختە تەڕانە ئاگریان دەرئەهێنا دەی با سەرنجیان ڕاکێشرێ بۆ بیر کردنەوە لەو شتە سەرسوڕهێنەرە.

لە پاش ئەمەی ئەم هەموو بەڵگە و نیشانە روونانەی خستە پێش چاو هەر یەکێکیان بە تەنیا هەموو دڵ و دەروونێکی زیندوو پڕ ئەکات لە باوەڕ، پاش ئەوە ئینجا دڵ وریا ئەکاتەوەبەهەست کردن بەگەورەیی و پەروەردگاری خوا، بەمەی فەرمان ئەدابەپێغەمبەر(ﷺ) کە یادو زیکری خوا بکات بەو گەورەیی و پەروەردگاری یە، ئەفەرموێ: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴾[1] کەواتە ناوی پەروەردگاری گەورەی خۆت بە پاك و خاوێن بگرە لەو شتانەی کە کافرو بت پەرست و بێ باوەڕان ئەیڵێن، لە هەموو شتێ کە شایانی ئەو نی یە، بەم جۆرە ئەو ناوانەی بۆ بەکار بێنە کە خوا خۆی رای هەیە، هەموویان مانا و مەبەستێ ئەگەیەنن کە خوایە، لە پاش ئەمەی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە روونانەی هێناویەتەوە لەسەر خوایەتی خواو راستی هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە، ئینجا خوای گەورە سوێند ئەخوا لەسەر راستی ئەم قورئانە و لەسەر چەند سیفەتێکی گرنگی ئەم قورئانە، سوێند ئەخوا بە شتێکی زۆر گرنگ لە دروست کراوەکانی خۆی کە هەتا هەتایە جێگای بیر لێ کردنەوەیە و هۆی سەرسامی و سەرسوڕمانە لە نایابی کرداری خوا،

---

[1] هەندێ ئەفەرمون وشەی ﴿اسم﴾ زیادە و مەبەست بە ناوەکەی زاتی خۆیەتی، بەڵام تەفسیرەکە لەسەر ئەو رایە کرا کەئەو وشەزیادنییە و ئەم رایەبەهێزترە، چونکەلەجێیە ناوەکەی پاك و بێ لەکە بێت ئەبێ زاتەکەی باشتر بێ لەکە بێت.

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾

**ئەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾[1] سوێند بە جێ و شوێنی ئەستێرەکان ﴿وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ﴾ بەڕاستی سوێند بەمانە سوێندێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر ئێوە زانا و تێگەیشتوو بن ئەزانن کە سوێندێکی گەورەیە، چونکە سوێند پێ خوراو بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر روون و ئاشکرایە لەسەر دەسەڵات و توانای بێ سنووری خوا، لەسەر لێزانی و رێك و پێکی و بەجێی هەموو کارو کرداری. بەڵێ بەڕاستی هەتا بیر بکرێتەوە لەم سوێند پێ خوراوە، هەتا زانین و زانیاری پێش کەوێ زیاتر گرنگی و نایابی ئەو سوێند پێ خوراوە روون ئەبێتەوە، زیاتر سەرسامی و سەرگەردانی پەیدا ئەبێ لە ئاستی زانین و دەسەڵات و حیکمەتی خوای گەورە، یەکەم تاقم کە ئەم سوێندەی بیست - لەبەر ئەوەی بە چاوی رووت لە دوورەوە تەماشای کرد - کەم تر تێ ئەگەیشتن لە گرنگی ئەم سوێند پێ خوراوە، بەڵام ئێمەی ئەمڕۆ باشتر تێ ئەگەین، بەشێکی گەورەترمان بۆ دەرکەوتووە لە گەورەیی یەکەی ئەگەر چی ئێمەیش هێشتا واین لە یەکەم پلەی رێگای ئەو زانینەوە.**

**جا بە پێی ئەو زانینە کەمەی کە ئەمڕۆ ئادەمی پێی گەیشتووە ئەڵێن: تەنیا کۆمەڵەیە لە هەموو کۆمەڵە ئەستێرانەی کە نایەنە ژمارە، جگە لە خوا هیچ کەس سنوورو ئەوپەڕیان نازانێ، تەنیا کۆمەڵەیەکیان - کە ئەم کۆمەڵەی خۆری ئێمە بەشێکیەتی - ژمارەی ئەستێرەکانی ئەگاتە هەزار میلۆن ئەستێرە!!! زانایانی ئاسمانی ئەڵێن: ئەو ئەستێرانەی کە ژمارەیان زیاترە لە چەند هەزارەها ملیۆن ئەستێرە چەند بەشێکن: هەندێکیان بە چاوی رووت ئەبینرێن، هەندێ تریان چاو تێ یان بڕ ناکات، بەڵکو ئەبێ بە تەلسکۆب و دووربین ببینرێن، ئەوی تر تەلسکۆپ و دووربینیش نایبینێ، بەڵام هەستی پێ ئەکرێ کە هەیە، ئەو هەموو ئەستێرە - بێ وچان و وەستان - وان لە گەردش و خولانەوەدا هەریەکە لە شوێن و**

---

[1] کۆری زانایان لەسەر ئەوەن کە وشەی ﴿لا﴾ لێرەو لە هەموو شوێنەکانی تردا زیاترە، ئەوەیش بە گوێرەی باوی عەرەب، رایەکی تر ئەڵێ: زیاد نی یە و بۆ نەفیە و روو ئەکاتە باوەڕو بڕیاری کافرو بێ باوەڕان لەسەر ئەم دوو رایە بە سوێند خواردن تەفسیر ئەکرێتەوە ، رایەکی تر ئەڵێ: نەفیەکە روو ئەکاتە رستەی ﴿أقسم﴾ واتە سوێند ناخۆم، چونکە شتەکە روونە و سوێندی ناوێ. والله أعلم.

خولگەی تایبەتی خۆی دا، جێگاو شوێنی خولگەیان پانی و فراوانی لە رادەیەك دایە هیچ ئەستێرەیە ناکەوێ لە یەکێکی تر، بەڵکو هێزی موگناتیسی هیچ کام نزیك ناکەوێتەوە لە هێزی یەکێکی تر، کەواتە بە هیچ رەنگ ماوە نی یە بۆ ئەمەی لە یەکتر هەڵکەون[1]. هەرگیز شتێ وا ناگونجێ، ئەو هەموو ئەستێرانە لەگەڵ ئەو هەموو دووری لە یەکترەوە ئەوەندە بە رێك و پێکی دارێژراون و جێگا و شوێنیان دیاریی کراوە بە هیچ کلۆج دەست نادەن بۆ دەست تێ خستن و گۆڕاندنی هیچ بارو رووبەکیان، بە جۆرێ پەیوەندی یان هەیە پێکەوە هەموو بەشدارن لە بەڕێوە بردنی کاروباری ئەم بوونەوەرەدا، ئەم ئەندازە کە وترا بەشێکی کەمە لە گەورەیی ئەم سوێند پێ خوراوە، ئەگەر زۆر زۆرترە لەوەی کە یەکەم چین زانیویانە و ناسیویانە، خوای گەورە سوێندی خوارد بەو شتە گرنگە لە دروست کراوەکانی خۆی و سوێند لەسەر خوراوەکەش ئەمەیە: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ﴾ بەڕاستی ئەوەی کە محمد ئەیخوێنێ بەسەرتان دا قورئانێکی زۆر خاوەن رێزو پیت و سوودە، بەڵێ بە راستی خاوەن پیت و پڕ سوودە، چونکە فەرو پیتی هەردوو جیهانی پێ یە، هۆی رزگار کردنی هەموو وێڵ و گومڕایەکە، هۆی بەختەوەری و کامەرانی هەردوو جیهان تەنیا لای ئەم قورئانە دەست کەوت ئەبێ. ﴿فِى كِتَـٰبٍ مَّكْنُونٍ﴾[2] نووسراوەتەوە لە کتێبێکی پارێزراودا (لوح المحفوظ) کە ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾[3] هیچ کەس ئاگادار نی یە بەسەری دا جگە لە فریشتەکان کە پاك و خاوێن کراوەن لە گوناهو تاوان ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ئەم قورئانە نێرراوەتە خوارەوە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە.

بەم چەند وشەیە خوای گەورە هەندێ لە رادەو پلەی بەرزی قورئانی بۆ روون کردینەوە، وەکو دەم کوتی کافرەکانیشی دایەوە لەو هەموو لەکە و تەشەرەی کە ئاراستەی قورئانیان ئەکردو چەنەبازی یان پێ ئەکرد هەر دەمێ بە جۆرێ: وتاری شێتە، وتاری کاهینە، دەست هەڵبەستە بە دەم خواوە، جادووە، شەیاتین ئەیهێنن، هەروەها ئەو شتە ناڕەوایانەی تر کە کافری تازە ئەیهێنن دەربارەی قورئان بە نەفامێتی و نەزانی.

---

[1] کتێبی ﴿الله و العلم الحدیث﴾ ل: ٣٣.

[2] بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە زیاتر جێگای باوەڕە.

[3] ئەم رستەیەیش بە چەند جۆرێ تر تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدا هەیە بەهێزترە بەلای زۆر لە زانا بەرزەکانەوە.

أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾

---

لەپاش ئەمەی رادەی بەرزی قورئانی روون کردەوە ئینجا ئەفەرموێ: ﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بێ باوەڕن بەم قورئانە و سستی تێدا ئەکەن و گوێتان لێ ی نی یە؟ واتە ئەمە شتێکی زۆر ناڕەوایە کە دەربارەی قورئان بەو جۆرەن، ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ بێ باوەڕیی ئەکەن بە بەش و رۆزیی خۆتان؟ بێ باوەڕیی بەم قورئانە و ئەو هەواڵانەی ئەم قورئانە پێتان رائەگەیەنێ لە بابەت بیرو باوەڕو بەسەرهاتی رۆژی یەکەتان لەوەوە ناناسن، بە هەرکام لەم دووبارە ئەوپەڕی شوومی و بەدبەختی یە کە لەم جیهانەدا بێ باوەڕیی بکرێ بە بەش و دەست کەوت، ئەوە ببێ بە زەخیرەو توێشوو، بێگومان ئەوانەی باوەڕیان نی یە بە ئایەتەکانی خوا بێبەشن لە بەزەیی خواو سزا ئەدرێن لە رۆژی دوایی دا، هەرکەس لەم جیهانەدا رێگای بێ باوەڕی بداتە بەر ئەو کەسە هیچ مەترسی نی یە و بێ باکە لە سزاو تۆڵەی خوا، چونکە باوەڕی نی یە بە زیندوو بوونەوە، جا لێرەدا قورئان بەرودوا ئەگرێ لە بێ باوەڕەکان و بە درۆیان ئەخاتەوە بەمەی ئەگەر راست ئەکەن کە ئەڵێن: زیندوو بوونەوە و پرسیارو سزاو تۆڵە نی یە، دەی ئازاین بەرگری مردن بکەن تا زیندوو بوونەوە روو نەدات، چونکە زیندوو بوونەوە و پرسیار و تۆڵە پاش مردن روو ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ﴾ دەی کاتێ کە گیان ئەگاتە گەروو ﴿وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ﴾ ئێوە لەو کاتەدا وان بە دەوری ئەو گیان دەرچووەدا تەماشای ئەکەن، ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ﴾ ئێمە بە زانین و دەسەڵات، هەروەها بە فریشتەکانمان کە گیان کێشن نزیک ترین بەو مردووە لە ئێوە، ﴿وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ﴾ بەڵام ئێوە نامان بینن , نازانن بەوەی بەسەر ئەو مردووە دێت،

فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

---

﴿فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ * تَرْجِعُونَهَآ﴾ ئەگەر ئێوە زیندوو کراوو تۆڵە لێ سەنراو نەبن دەی ئەو گیانە بگێڕنەوە بۆ شوێنی خۆی و مەیەڵن دەرچێ، ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ دەی ئەوە بکەن ئەگەر راست ئەکەن، بە کورتی: ئەگەر ئێوە راست ئەکەن ئەڵێن: تۆڵە و لێ پرسینەوە نی یە کەواتە ئەبێ ئێوە بەرەڵا بن و کەس هەقی نەبێ بەسەرتانەوە، دەی ئەگەر راست ئەکەن ئێوە سەربەستن و شتتان بە دەستە مەیەڵن گیانتان دەرچێ.

لە سەرەتای سورەتەکەوە فەرموی: کە خەڵکی لە رۆژی دوایی دا سێ تاقمی جیاوازن، ئەندازەیە بە درێژیی دوا لە بەسەرهات و باروحاڵی ئەو سێ تاقمە، ئەوا لێرەش دا هەواڵمان ئەداتێ کە لە کاتی گیان دەرچوونیش دا ئەو سێ تاقمە جیاوازن، هەر تاقمێ بە پێی رادە و پلەی خۆی رەفتاری لەگەڵ ئەکرێ، لەو کاتە تەنگەدا کەباس کرا لەم چەند ئایەتە دوایی یەدا، ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ ئینجا ئەگەر ئەو کەسەی کە گیان ئەکاتە گەرووی، لە گیان کەنشتایە، ئەو کەسە ئەگەر لەو کۆمەڵەیە کە نزیك خراوەن لە خواوە بە رێزو پلەو رادەی بەرێز، ﴿فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ﴾ ئەوە رەحمەتیی و ئارام و خۆشی و رەحم و بەزەیی خوایان بۆ هەیە، هەروەها رۆزی پاك و خاوێن و بەهەشتی رابواردن و نازو رێزیان هەیە، فریشتە لەو کاتەدا مژدەی ئەداتێ بەمانە وەکو لە حەدیس دا ئەفەرموێ کە (بەرائی کوڕی عازب) ریوایەتی ئەکات، ئەفەرموێ: فریشتە پێی ئەڵێ: ئەی گیانی پاك کە لە لەشی پاکایت، تۆ ئەو لەشەت ئاوەدان کردەوە، وەرە دەرەوە بۆلای رەحمەت و رەحەتی و رۆزی و خۆراکی پاك و خاوێن و بەهەشتی نازو نیعمەت، بۆلای خوایە کە هیچ خەشم و ناڕەزایی نی یە لێت. دیارە کاتێ مژدەی وا خۆشی پێ درا ئیتر هیچ باك و غەمی نامێنێ، مردنەکەی پێ خۆشە لەو کاتەدا هەرچەند لەم دنیادا مردن شتێکی بێزراوە، ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ﴾

ئەگەر ئەو مردووە لە کۆمەڵیٚ بێت کە پیٚ یان ئەوتریٚ ﴿أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ وەکو لە سەرەتای سورەتەکەوە باس کرا، ﴿فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾[1] ئەگەر ئەوە پێی ئەوتریٚ: سەلام بۆتۆ، واتەسەلامت لیٚ بیٚ لەلایەن براکانتەوە کە ناو ئەبرێن بە ﴿أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ﴾ ئای چەندە خۆشە ئەم سەلامە لەو کاتە تەنگەدا!! بێگومان سەلام لیٚ کراو دڵ ئارام ئەبیٚ بەو سەلامەو دڵخۆش ئەبیٚ بەهاوڕیٚ یەتی ئەو برایانەی کە ئەچیٚ بۆلایان، ﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئەگەر ئەوەی کە ئەمریٚ لە تاقمی بیٚ باوەڕە گومڕاکانە ﴿فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ﴾ بۆ ئەوە هەیە میوانداری و زیافەت لە ئاوێکی ئێجگار گەرم کە هەموو ناوسکی ئەتوێنێتەوەو ئەیکات بەسەر ئەو زەقومەی کە باس کرا لەم سورتەدا، خوا پەنامان بدات ﴿وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ خستنە ناو ئاگری دۆزەخ و سوتاندن بەو ئاگرە بەش و پاشەڕۆژی ئەو کەسەیە کە بیٚ باوەڕو گومڕایە.

ئەوبەدبەختە چارەڕەشە لەو کاتە تەنگە پڕ لە ئێش و ئازارەدا ئەم هەڕەشە سامناکەی لیٚ ئەکریٚ. ئاگادارئەکریٚ بەسەر جێگاوشوێنی سەختی خۆیدا، خوا پەنامان بدات، ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ﴾ بەڕاستی ئەمەی باسمانکردلەم سورەتەدایان ئەم هەواڵەی کەدامان لەبابەت ئەم سیٚ تاقمەوەشتێکی زۆرحەق و راستە وجێگای گومان ودوودڵی نییە، ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ کەواتە ناوی گەورەی پەروەردگاری خۆت بە پاك و خاوێن بگرە لە هەموو شتیٚ کە شایانی ئەو نییە.

دوایی هات ئەم سورەتە لە بەیانی دوو شەممە رێکەوتی ٢٤ جمادی الآخرە ١٣٩٩ خوا یارمەتی بدات بۆ لەمەوپاش، آمین.

هەر لەم بەیانی یەدا دەستم کرد بە سورەتی ﴿الحدید﴾.

---

[1] بە چەند جۆریٚ تر تەفسیر کراوەتەوە، هەمووی هەر باشە و هەر ئەگونجیٚ، زانین لای خوایە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ

## سورەتی (الحدید)

## مەدینەیی یەو ٢٩ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە بە تێکڕایی بریتی یە لە بانگ کردنی کۆمەڵی ئیمانداران بۆ ئەمەی باوەڕی ڕاستەقینە لە خۆیان دا بەدی بهێنن، ئەو باوەڕە ڕاستەقینەی کە خۆیان و دڵ و دەروونی خۆیان پێ پاڵفتە ببێ لە هەموو لەکەیە، یەک بارو یەک لا ببنەوە بۆ ئاییینی خواو بانگ کردنی خەڵکی بۆ ئاییینی خوا، بگەنە ڕادەیە ئامادە ببن بۆ خۆ بەخت کردن و فیداکاری لە ڕێگا و پێناوی بەرزکردنەوەی ئالأی خواو بلأو کردنەوەی بانگەوازەکەی و چەسپاندنی ئاییینەکەی لە زەوی دا. هەرکات ئیمانداران گەیشتنە ئەو پلە بەرزە ئەو کاتە ئەبن بە لەشکرو کۆمەڵی خوا.

قاپی سورەتەکە ئەکاتەوە بە ئایەتێ کە زۆر بەکارە بۆ ئامادە کردنی دڵ و دەروون بۆ وەرگرتنی ئەو باوەڕە ڕاستەقینەی کە ئەم سورەتە بانگی ئیماندارانی بۆ ئەکا، بەڕاستی دڵ و دەروون ئەهێنێتە پەرۆش و سۆزو دایچەڵەکێنێ و وریای ئەکاتەوە بۆ بەدی هێنان و پێک هێنانی ئەوەی ئەم سورەتە داوای ئەکات. ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا لە بێ گیان و گیانلەبەر، ژیریی دارو بێ ژیریی، ئەمانە هەموو یەکسەر خوایەکە کە ناوی ﴿الله﴾ یە بە پاک و خاوێنیان ڕاگرتووە لە هەموو لەکەو خراپە و ڕەخنەیەک، هەموو باوەڕی بەوە هەیە و ئەوە ئەڵێ. مەبەست لە ئاسمانەکان و زەوی خۆیشیانە لەگەڵ هەموو ئەوانەی وان لە ناویان دا، جگە لە کۆمەڵێ ئادەمی و جن، ئیتر بێجگە لەوان هەموو بە یەکجار هەموو کات خوای خۆیان ئەناسن و

زیکرو یادی ئەکەن و باوەڕیان هەیە و ئەڵێن: خوا پاك و بێگەردە و لە هەموو لەکەو عەیبیٚ، لە هەموو شتیٚ کە شایانی ئەو نی یە و بیٚ باوەڕە سەر لیٚ تێك چووەکان بۆی بڕیار ئەدەن، وەکو هاوبەش و رۆڵە و هەموو شتە ناڕەواکانی تر، کەواتە لەناو هەموو بوونەوەردا تەنها ئەم کۆمەڵە شوومە بەدبەختە لە ئادەمی و جن خۆیان جویٚ کردووەتەوە و سەرپێچی ئەکەن لە پەرستنی خوای خۆیان، خۆیان ئەکەن بە سووتەمەنی دۆزەخ بیٚ بڕانەوە، خوا پەنامان بدات. بێگومان ئەم بوونەوەرە گرنگە بە هەموو پارچە و بەشێکی یەوە گیاندارو بیٚ گیان هەموو نیشانەیە لەسەر ئەم پاکی و بێگەردی خوایە، هەموو ئەوە پیشان ئەدەن و ئەوەیان لیٚ وەرئەگیریٚ، بەلاَم ئایا هەرچۆن زمان دارە ئیماندارەکان بە وتن و زمانیش ئەو پاکی یە ئەڵێن و زیکرو سەنای خوا ئەکەن، هەروەها هەموو دروست کراوەکانی تریش بە وتن ئەوە ئەڵێن و ئەو سەنا ئەکەن یان نا؟ واتە هەموو ئەوانەی ئێمە بە بیٚ زمانیان ئەزانین ئایا ئەوانە هەریەکە وتنی تایبەتی خۆیانیان هەیە و بە وتن و زمانی تایبەتی خۆیان زیکرو سەناو پاکی خوا ئەڵێن. یان ئەو بیٚ زمانانە وتنیان نی یە و بەس گەیاندن و ڕێنموونی ئەکەن؟ هەندیٚ لە زانایان لە سەر باری دووەمن، چونکە بە پیٚی زانین و باوی ئێمە ئەوانە بیٚ زمانن، کەواتە وتنیان نی یە، ئەم رایە وا ئەڵیٚ. بەلاَم هەندیٚ تر لەسەر ئەوەن کە هەموو ئەوانەی رۆح و گیانێکی تایبەتی خۆیانیان هەیە و خوای خۆیان ئەناسن و ئەیپەرستن و بە وتنی تایبەتی خۆیان زیکرو باسی پاکیی پەروەردگاری خۆیان ئەکەن.

بەڕاستی ئەم رای دووەمە زۆر پەسەندەو شایانی هەڵبژاردنە چونکە:

١- ئەم رایە ڕێك و پێکە لەگەڵ رواڵەت و دیمەنی ئەم ئایەتەی خەریکین پیٚ یەوە، هەروەها چەند ئایەتی تر لەم بابەتەوە کە زۆرو ناسراون و پێویست ناکات بە هێنانیان لێرەدا، بڕیاری کۆڕی پێشەواو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەیە کە هیچ ئایەت و حەدیسیٚ لە دیمەنەکەی لا نادریٚ بە بیٚ بەڵگەیەکی بەهێزی باوەڕ پێکراو، ئاشکرایشە هیچ بەڵگەیەکی وا نی یە بەدەست ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە لە دیمەنی خۆیان لائەدەن و

تەئویلیان ئەکەن و مەبەستیشیان لەم تەئویل و لادانە ئەوەیە رێك و گونجاویان بکەن لەگەڵ فام و تێگەیشتنی ئادەمیدا، چونکە ئادەمی شتی وای نەبیستووەو نەدیوە کە بێ زمان قسە و وتاری ببێ، خۆ ئاشکرایشە ئەبێ بڕیارو تێگەیشتنی ئێمە مل کەچ و شوێن کەوتووی بڕیاری خواو پێغەمبەر بێت (ﷺ).

٢- چەند حەدیسێکی سەحیح هەیە یارمەتی دەرو قوڵ گیری ئەم رای دووەمەیە: ئیمامی موسلیم لە جابری کوڕی سەمورەوە ئەفەرموێ: ﴿قال رسول الله (ﷺ): إن بمكة حجرا كان يسلم على ليالي بعثت و إني لأعرفه الآن﴾ ترمزی لە حەزرەتی عەلی یەوە حەدیسێ ئەهێنێ: ﴿قال كنت مع رسول الله (ﷺ) بمكة فخرجنا في بعض نواحيها، فما استقبله شجر و لا جبل إلا وهو يقول السلام عليك يا رسول الله﴾ ئیمامی بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: ﴿قال خطب رسول الله (ﷺ) إلى لزق جذع، فلما صنعوا المنبر فخطب عليه حن الجذع حنين الناقة، فنزل الرسول فمسحه، فسكن﴾. حەدیسی سەحیحی بەناوبانگ ئەفەرموێ: ﴿قال رسول الله (ﷺ) في شأن احد: هذا جبل او جبيل يحبنا و نحبه﴾ ئەمانەو چەند حەدیسی تر بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر ئەمە کە ئەم شتانەی ئێمە بە بێ گیان و بێ زمانیان دائەنێین هەموویان دەست و گیانێکی تایبەتی خۆیان هەیە.

٣- خوا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾[1].

٤- خوا لە سورەتی ﴿الحج / ١٨﴾ دا ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ﴾ واتە: ئایانەتانزانیوە کە هەموو ئەوانەی وان لە ئاسمانەکان و ئەوانەی وان لە زەویدا، خۆرو مانگ و

---

[1] ولتە هیچ شتێك نییەکەزیکروتەسبیح و سوپاس و سەنای خوا نەکات، بەڵام ئێوە تێ ناگەن و نازانن بە تەسبیح و سەناکەیان، دەی ئەگەر تەسبیح و سەنا بە جۆری دووەم بێت ئێمە لێ ی تێ ناگەین، نەك بە جۆری یەکەم. سورەتی ﴿الإسراء / ٤٤﴾.

ئەستێرەکان و چیاکان و درەخت و ئەو گیانلەبەرانەی کە بەسەر زەوی دا ئەگەڕێن و زۆر لە ئادەمی، ئەمانە هەموو سوژدە ئەبەن بۆ خوا. دەی ئەگەر مەبەست بەم سوژدە بردنە سوژدەی گوێڕایەڵی و پەرستن نەبوایە نەیئەفەرمو: زۆر لە ئادەمی، بەڵکو ئەیفەرمو هەموو ئادەمی. چونکە ئادەمی کافریش وەکو ئیماندار و هەموو شتەکانی تر هەموو بە تێکڕایی سوژدەی مل کەچی و ژێر باری یان هەیە بۆ خوامیش و دەسەڵات و توانای خوا، کەواتە مەبەست سوژدەی پەرستن و گوێڕایەڵی یە.

جا لەبەر ئەم هەموو بەڵگەیە ئێمە بە گوێرەی دیمەن و رواڵەتی ئایەتەکە تەفسیرمان کردەوە، ئینجا چەند سیفەتێك لە سیفەتەکانی خوایەتی خوا باس ئەکات، لە یەکەم جارەوە دوو سیفەت ئەمێنێ کە بنەڕەت و هۆی ئەو تەسبیح و سەنای بوونەوەرەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە تەسبیح و سەنای خوایە ئەکات کە ناوی ﴿الله﴾ یە لە کاتێکدا کەئەوخوایەزاڵە بەسەرهەمووشتێکدا و هەموو کاروبڕیارو فرمانی لە زانینەوەیە و بەجێ یە و رێك و راستە و لە شوێنی خۆیایەتی. ﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ تەنیا بۆ ئەوە پادشایەتی و خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و تەنیا دەسەڵات و خواهیشی ئەو نیش ئەکات لە ئاسمانەکان و لە زەوی دا و بڕیارو فرمانی ئەو کارئەکات تیایان دا، ﴿يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ تەنیا ئەو گیان ئەدات و گیان ئەسێنێتەوە و ئەو بڕیاری ژیان و مردن ئەدات، گیان شتێکی ئێجگار سەرسوڕهێنەرە، شتێکی نهێنی و نەناسراوە، تا ئێستا نەزانراوە چی یە و چۆنە؟ لە کوێوە دێت و لە چی پەیدا ئەبێ؟ دیارە لەبەر زۆر گرنگی یەتی کە خوای گەورە لە چەندەها شوێن و لە قورئان دا سەرنجمان رائەکێشێ بۆی، ئەفەرموێ: خوا گیان ئەدات بە گیانداران، بێگومان هیچ کەس رێگای نی یە جگە لەوە هیچی تر بڵێ. هەروەها مردن و گیان لێ سەندن شتێکی نهێنی سەرسوڕهێنەرە هیچ کەسێ نازانێ ئەوە چی یە و چۆن فەراهەم دێت؟ هەموو کەس ناچارە ئەبێ باوەڕی وابێ و هەر ئەمە بڵێ: ئەو کەسەی گیان ئەدا تەنیا ئەو کەسە ئەیسێنێتەوە.

وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾

**﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەو خوايەی كە ئەو سيفەتانەی هەيە ئەو خوايە بە دەسەڵات و توانايە بەسەر هەموو شتێك دا، ئینجا چەند سيفەتێكی تر ئەمێنێ ئەوە پیشان ئەدات كە هیچ كەس و هیچ شتێ تر جگە لە خوا (كیان) و بوونی راستەقینەی نی یە، كیان و بوونی راستەقینە تەنها بۆ خوا هەیە و بەس، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ﴾ تەنها خوا لە پێش هەموو شتێكەوەیە، بەڵام بێ ئەمەی سنووری یەكەم جارو سەرەتا ببێ بۆ بوونی خوا، ﴿وَٱلْءَاخِرُ﴾ تەنها ئەو لە دوای هەموو شتێكەوەیە بێ ئەمەی كۆتایی و برانەوە ببێ بۆ بوونی خۆی[1].**

**﴿وَٱلظَّٰهِرُ﴾ تەنها بوونی ئەو ئاشكرایە بەم رەنگە هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا شایەت و بەڵگەیە لەسەر بوون و توانا و زانین و دەسەڵاتی ﴿وَٱلْبَاطِنُ﴾ تەنها ئەو پۆشیدە و شاراوەیە بەم جۆرە ژیریی و چاو لە ئاستی ئەو كوڵ و كوێرەو پەی پێ نابەن، ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ بە هەموو شت زانا و ئاگادارە، هەموو شت یەكسانە لە بەردەم زانینی ئەودا، كەواتە حەقیقەتی هەموو شتێ و بوونی هەموو شتێ لە بوونی خواوە پەیدایە و هەمووی بەرهەمی بوونی ئەو و لە سایەی بوونی ئەودا هەیە، هەموو شتێ بە زانین و ئاگای بێ وێنەی خوا چوار دەور دراوە لە هەموو كات و لە هەموو بارو لە هەموو شوێنێك دا.**

**هەركاتێ ئەو باوەڕە رێك و راستە جێگیر ببێ لە هەر دڵێك دا ئەو دڵە گوێی لە هیچ كەس نابێ و باكی لە هیچ كەس نابێ جگە لە خوا، چونكە هیچ شتێكی تر جگە لە خوا هیچ گیانێكی نی یە و هیچ شتێكی لە خۆیەوە نی یەو هیچ كارێكی بە دەست نی یە، بەڕاستی زۆر پێویستە بیر كردنەوە لەم جۆرە ئایەتانەو ژیان لەگەڵیان دا بۆ ئەمەی ئەو باوەڕە پیرۆزە جێگیر ببێ لەدڵ و دەروونندا تائازادی راستەقینە و سەربەستی راستەقینەدەست كەوت ببێ.**

---

[1] ئەو شتانەی كە پاش دروست كردن ئیتر هەر ئەمێننەوە بێ برانەوە، وەكو بەهەشت و دۆزەخ ئەوانە چونكە بوون و مانەوەكەیان لە خواوەیە و لە خۆیانەوە نی یە هەروەكو كۆتایی هاتوو وان و خوا لە پاش ئەوانەوە هەیە، ئەو وشەیانە بە چەند جۆرێ تر تەفسیر كراونەتەوە، بەڵام دڵم بەوەی تەفسیرەكە باوەڕی بەهێزترەو ئارام ترە لەبەر ئەوە لە نێوان هەموو جۆرەكان دا ئەوەم هەڵبژارد.

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾

**پاش ئەمەی باسی کرد کە کیان و بوونی راستەقینە تەنها بۆ خوا هەیە، ئینجا باسی بەرهەم و نیشانە و سیفەتێ ئەکات کە لەو بوونە راستەقینە پەیدا بووەو هەڵقوڵاوە، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ﴿فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لە شەش رۆژدا ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ ئینجا خوا بڵندو بە دەسەڵات و زاڵە بەسەر هەموو بوونەوەرو هەموو شتێك کە لە بوونەوەردایە، هەموو شتی بە جۆرێ کردووە کە بە پێی خوایشی خۆی بێت، هەموو ژێر بارو مل کەچە بۆ توانێ و دەسەڵاتی بێ سنووری، ئەم شەش رۆژە – کە لە چەند شوێنێك دا باسی ئەفەرموێ – دیارە نابێ مەبەست رۆژانی ئەم جیهانی ئێمە بێت، چونکە ئەم رۆژانە دوای دروست کردنی ئاسمان و زەوی پەیدا بوون، کەواتە چاك وایە زانینەکەیان حەواڵەی خوا بکەین، ئیتر ئایا مەبەست شەش بارو گۆڕانە کە بەسەریان هاتبێ؟ یان هەر جۆرێ تر، هیچ پێویست نی یە خۆمان ماندوو بکەین بە شتێکەوە کە لە سنووری زانینی ئێمە بەدەرە، ئەگەر خوا مەیلی ببێ ئاگادارمان ئەکات، ئەگەر نا هیچ وەکو ئەو هەموو شتە نهێنی یانەی تر کە نایەنە ژمارەی کەس جگە لە خوا. هەروەها وشەی ﴿ٱلْعَرْشِ﴾ زانینی واز لێ ئەهێنین بۆ پەروەردگارمان، بەڵام لە بابەت مەبەست بە رستەی ﴿ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ ەوە کە چەند رایەکی تێدا هەیە لای زانایان، لەو بابەتەوە ئەتوانین وەکو چینی یەکەمی ئەم ئوممەتەکە کە پێی وتراوە (سلف) زانینەکەی بگێڕینەوە بۆلای خوا، بڵێین باوەڕمان هەیە بە جۆرێ کە مەبەستی خوایە و شایانە بۆ خوا، ئێمە چۆنیەتی یەکەی نازانین، ئەتوانین مەبەستێکی گونجاویشی بۆ باس بکەین بە جۆرێ کۆمەڵی دوایی فەرمویانە کە پێ یان ئەوترێ (خلف) وەکو لەکاتی ئەو رستەدا وتمان. ئینجا شێوەی فراوانی ی زانینی خوا ئەخاتە پێش چاو بە جۆرێکی ئێجگار نایاب و سەرسوڕهێنەر، بە چوار رستەی کورت ئەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەزانێ و ئاگادارە بە هەر شتێ کە ئەچێتە ناو زەوی، ﴿وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ هەر شتێك کە لە زەوی دەرئەچێ ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ هەر شتێك لە ئاسمان دێتە خوارەوە،**

﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا﴾ هەر شتێ بەرز ئەبێت و ئەڕوا بەناو ئاسمان دا، بەڕاستی هەتا بیر بکرێتەوە لەم چوار رستە کورتە گرنگی یان روون تر ئەبێتەوە، زیاتر سەر سوڕ ئەهێنێ، باوەڕ بەهێزتر ئەبێ کە وتاری وا لە توانای ئادەمیدا نی یە، شتی وا بە خەیاڵیش دا نایەت، ئەگەر هەموو دانیشتوانی زەوی پێکەوە خەریك بن و تێکۆشن بۆ ئەمەی ژمارەی ئەو شتانە بکەن کە ئەم چوار رستەیە پیشانی ئەدات هەموو پەکیان ئەکەوێ و ژمارەیان پێ ناکرێ، ژمارەی ئەو شتانەی کە لە تەنها کاتێك دا روو ئەدەن، چ جای ئەوانەی روو ئەدەن لە چەند کاتێك دا با هەندێ بە کورتی بیر بکەینەوە لەو رووداوانەی کە ئەم چوار رستەیە رێنموونی بۆ ئەکات: هەرکاتێ بگرین بە دەستەوە ئاخۆ لەو کاتەدا لە هەموو ئەم زەوی یە پان و فراوانەدا چەند تۆمە و دانەوێڵە ئەچێنرێ، یان ئەخرێتە ناو زەوی یەوە؟ چەند کرم و مارو جانەوەرو گیانلەبەری تر ئەچێ بەناو درزو کونی زەوی دا؟ چەند دڵۆپ ئاو، یان زەڕەی هەڵم و گاز، یان رووناکی کارەبا ئەچێ بەناو زەوی دا لە هەموو پارچە و بەشێکی دا؟ هەروەها چەندەها شتی تر کە چاوی قودرەتی خوا بەسەریەوەیەتی؟!

ئینجا ئاخۆ چەند شتی لێ دەرئەچێ و لێ ی دێتە دەرەوە، ئاخۆ چەند چڵە گیاو سەوزەی لێ دێتە دەرەوە؟ چەند کانیاو هەڵئەقوڵێ و لێ ی دێتە دەرەوە؟ چەند بورکان هەڵئەقوڵێ؟ چەند هەڵم و گاز بەرز ئەبێتەوە لێ یەوە؟ چەند شاراوە تیای دا دەرئەکەوێ؟ چەند گیانلەبەرو جرو جانەوەر لێ یەوە دەرئەچێ چەند... لەوانەی ئەبینرێن و نابینرێن، ئادەمی ئەیانزانێ و ئەیان ناسێ، یان هێشتا نایانزانێ و نایان ناسێ کە چەندە زۆرن و خوا ئەیانزانێ؟! ئاخۆ چەند شت لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە؟ چەند دڵۆپە باران؟ چەند ئاگرو چەخماخە؟ چەند رووناکی سووتێنەر؟ چەند رووناکی تر؟ چەند بڕیارو قەزاو قەدەری خوا؟ چەند رەحمەت و بەزەیی گشتی، یان تایبەتی بە هەندێ لە بەندەکانەوە؟ چەند رزق و رۆزی کە بە لێشاو بۆ هەندێ دێت و بۆ هەندێ تر بە کەم و کوڕی؟ هەروەها چەند و چەند کە جگە

له خوا ژمارەی نازانیٚ و ئاگای لێی نییە؟ئاخۆ چەند شت بەرز ئەبێتەوە بۆ ئاسمان و ئەچیٚ بەناوی دا؟ ئاخۆ چەند هەناسەی سەوزەوات و ئادەمی و گیانلەبەرانی تر لەوانەی کە ناسراون یان لەوانەی جگە لە خوا نایان ناسیٚ؟ چەند نزاو تکا بە ئاشکرا یان بە نهێنی کە جگە لە خوا ئاگای لیٚ ی نی یە و نایبیستیٚ؟ چەند رۆح و گیانیٚ کەلەگیانداران دێتەدەرەوە و بەرز ئەبێتەوە بۆ ئاسمان؟ چەند فریشتە بەکارو فرمان بەرز ئەبێتەوە چەند ئەتۆم گاز لە لەش بەرز ئەبێتەوە؟ چەند و چەند. چەند لەو شتانەی کە جگە لە خوا کەس ئاگای لیٚ ی نی یە. بێگومان هەموو دڵێکی بێدار سەرسام ئەبیٚ لە ئاستی ئەم ئاگاداری و زانینە فراوانە بیٚ سنوورەی کە ئەم چوار رستە کورتە روونی ئەکاتەوە.

جا لەم کاتەدا سەرنجی ئەو دڵانە رائەکێشێتەوە بۆ ئاگاداری خوا بەسەر ئەو دڵ و خاوەن دڵانەدا، سەرنجیان رائەکێشیٚ و وریایان ئەکاتەوە بەمەی کە خوا لە هەموو کات و شوێنێك دا لەگەڵ هەموو کەس دایەو چاوی لە هەموو کردەوەیەکیانە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ خوا لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن، ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خوا بینایە بە هەر کردەوەیەك کە ئەیکەن، خۆتان و هەموو کردەوەتان ئەبینیٚ. بەڵیٚ بێگومان خوا لەگەڵ هەموو کەس و هەموو شتێکە لە هەموو کات و لە هەموو شوێنیٚ، بە زانین و دەسەڵات و توانا، خوا لەگەڵ هەمووە لە هەموو کات و شوێنێك دا بەو جۆرەی کە شایانە بە زاتی پاکی. کەواتە پێویستە هەموو ئیماندارێك باوەری دامەزراوی ببیٚ کە هیچ کات خەڵوەت و تەنیایی و چۆڵی بۆ هیچ کەس و هیچ شت نی یە، ئای چ شیرینی فەرمووە ئیمامی ئەحمەد کە زۆر جار ئەم شیعرەی ئەفەرمو:

| | |
|---|---|
| إذا ما خلوت الدهر فلا تقل | خلوت ولكن قل علي رقيب |
| ولا تحسبن الله يغفل ساعة | ولا إن ماتخفي عليه بغيب[1] |

---

[1] واتە: هەرکات لەچۆڵیدا بوویت وخەڵکت لانەبوونەلێیت: تەنیا کەوتم بەڵکو بڵیٚ چاودێر (رقیب) م بەسەرەوەیە، گومان نەبەیت کەخوا هیچ کات بیٚ ئاگائەبیٚ، هەروەها گومان نەبەیت کەئەوەی بتەویٚ دایشاری لەخوا لێی پەنهان ئەبیٚ.

لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ

---

بەڕاستی ئەم باوەڕە ئێجگار گرنگە لە هەر دڵێك دا جێگیر ببێ بەسە بۆ ئەمەی پاك و بەرز و خاوێنی بكاتەوە، وریایی و ترس و سامێكی هەمیشەیی بۆ فەراهەم بێنێ لەگەڵ شەرم و دوور كەوتنەوە لە هەموو چڵك و چەپەڵی و هەموو شتێكی بێ سوودی بێ نرخ، هەر دڵێ ئەو باوەڕەی تێدا جێگیر ببێ لە دوو بارەوە كاری لێ ئەكات: یەكەم بیم و ترس و سام فەراهەم ئەهێنێ لەو دڵەدا، دووەم ئارام و خۆشی و نزیكی لە سایەی پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و ئینجا جارێكی تر باسی موڵكایەتی ئاسمانەكان و زەوی ئەكاتەوە ئەفەرموێ: ﴿لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ پادشایەتی و موڵكایەتی ئاسمانەكان و زەوی تەنها بۆ خوایە و خوا خاوەن و كاربەدەستیانەو تەنها بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە هەموو كاروبارێ، باس كردنی جاری یەكەم لە بارێكەوە بوو كە تەنها خوا گیان ئەدات و گیان ئەسێنێتەوە و توانای بێ سنوورو بێ بەرگریی هەیە، باس كردنی ئەم جاری دووەمە لەم بارەیەوە كە گەڕانەوەی هەموو كاروبارێ بۆلای خوایە.

جێگیر بوون و دامەزراندنی ئەم باوەڕە دڵ و دەروون ئەبەستێتەوە تەنها بە خواوە لە هەموو شتێك دا، دڵ و دەروون وا لێ ئەكات چاوەڕوانیی تەنها لە خواوە بێ، تەنها ڕێگا بۆلای خوا ئەداتە بەر لە ئاشكراو پەنهانی دا، لە هەموو جوڵانەوەو كردەوەیەك دا، بەڵكو لە هەموو نیازو ویست و خواهیشێك دا، چونكە ئەزانێ كە ڕاكردن نی یە لە خوا، هیچ قەڵا و پەنایەك نی یە جگە لە پەناو گەڕانەوە بۆلای خوا.

ئینجا كۆتایی باسەكە ئەهێنێ بە هەندێ تر لە بەرهەمی توانا و زانینی خۆی ئەفەرموێ: ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ شەو ئەبا بەناو ڕۆژدا و ڕۆژ ئەبات بەناو شەودا، زانا و ئاگادارە بە هەموو نیازو شتێكی نهێنی كە بە دڵەكان دا گوزەر ئەكەن، چوونی شەوو ڕۆژ بەناویەك دا بەم جۆرە كورت و درێژ ئەبن و لە ساڵ دا هەركام لەوی تر

بەشێ داگیر ئەکات بە رژێمێکی راستی نەگۆڕاو، یان هەر مەبەست بە دواهاتنیان بێت، یان مەبەست هەردوو بارەکە بێت. بەهەر جۆر تەماشا بکرێن و بیریان لێ بکرێتەوە ئێجگار شتێکی نایابی سەرسوڕهێنەرن، هەموو دڵێکی زیندوو سەرسام ئەکەن و سەرنجی رائەکێشن بۆ بینینی ئەو دەستە قودرەتەی کە هەمیشە ئەم دوو شتە نایابە پیشان ئەدات.

لە سەرەتای سورەتەوە تا ئێرە چەند شتێکی زۆر گرنگی باس فەرموو، بیر کردنەوە لێ یان بەسە بۆ کردنەوەی قاپی دڵ و بێدارکردنەوەی هەست و ژیریی، جا لەم کاتەدا زۆر جێگای خۆیەتی کە بانگی ئیمانداران ئەکات بۆ دامەزراوی هەمیشەیی یان لەسەر ئیمان و باوەڕەکەیان، بۆ بەدی هێنانی ئیمانەکەیان بە کردەوەو پێك هێنانی بەرهەمەکانی ئەفەرموێ: ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ هەمیشەیی و بەردەوام بن لەسەر ئیمانی راستەقینە بە خواوە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ﴾ لەو ماڵ و دارایی و سامانەی – کە هینی خوایە و خستویەتیە ژێر دەستی ئێوەو ئێوەی کردووە بە جێنشین تیای دا بۆ ئەمەی بەکاری بێنن لە مەبەست و خزمەتی خۆتاندا – لەو ماڵ و سامانە بەشێکی بدەن لە رێگا و رەزامەندی خوادا، خوای گەورە رووی فەرمودەی ئەکاتە ئەو دڵانەی کە خۆی دروستی کردوون و خۆی ئەیان ناسێ، ئەزانێ کەخاوێن کردنی دڵ و دەروون و باوەڕ، جێگیر بوون و دامەزراندنی ئیمانی راستەقینە شتێکی سووك و ئاسان نی یە، بەڵکو ئەرکێکی گرانی هەیە لەسەر شانی بەندەیانی خواو پێویستی بە تێکۆشان و بەربەرەکانێی دوورو درێژ هەیە، لەبەر ئەوە کاتێ فرمان ئەدات بە ئیمان و کردەوەی چاك زۆر بە گرنگ ئەیگرێ. بە جارو دووجار کۆتایی ناهێنێ، بەڵکو چەند جار لە چەندەها شوێن دا ئەو فرمانانە ئەفەرموێتەوە، لە هەموو شوێنێك دا بە جۆرو رەوشتێکی جیاواز فەرمەکانەکان ئەدات کە زۆر بەکارن و پاڵ پێوەنەرێکی بەهێزن، بۆ گوێڕایەڵی کردنی بەندەیانی خوا، بۆ وێنە لێرەدا لە سەرەتای سورەتەکەوە تا گەیشتە ئەم فرمانە چەند شتێکی گرنگی پیشان دا لە بەرهەمەکانی زانینی دەسەڵاتی خوا لە بوونەوەردا، بە جۆرێ دڵ و دەروونی ئامادەکرد بۆ گوێڕایەڵی.

فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٩﴾

**ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە موسڵمانان و داوای ئیمانیان لێ ئەکات کە بێگومان موسڵمان ئەبێ لە پێش هەموو شتێکەوە ئیمانی هەبێ، کەواتە بەوە سەرنجیان رائەکێشێ کە مەبەست لە ئیمان، ئیمانێکە کە کار بکات لە خاوەنەکەی، نیشانە و بەرهەم و جێگە دەستی دەرکەوێ و دیاری بێ، کەواتە بەوە ئیماندار ئامادە ئەبێ بۆ گوێڕایەڵی لە بەخت کردنی ماڵ و سامان لە رێگای خوادا، چونکە ئەو ئیمانەی ئەگەر راستەقینە بێت ئەبێ دەرکەوێ و ئەو بەرهەمەی هەبێ، ئینجا فەرمانی بەخت کردنی ماڵ و سامانەکە بە جۆرێ ئەدات کە خاوەن ئیمان شەرمەزار ئەکات، ئەفەرموێ: هەندێ لەو ماڵە بدەن نەك هەمووی، ئەو ماڵە هینی خۆتان نی یە، بەڵکو گرنگەشیان پێ ئەدا لەسەر ئەو ئیمان و بەخت کردنی هەندێ لەو ماڵە زۆرەی کە خوا پێ‌ی داون ئەفەرموێ: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ ئینجا کەسانێکتان کە ئیمانی راستەقینەی هێناوەو ماڵ و سامانی داوە لە رێگای خوادا بێگومان بۆ ئەوانە هەیە لەلایەن خواوە پاداشتێکی زۆر گەورە.**

**جا وەرە تەماشای ئەم هەموو لوتف و بەزەیی یە بکە، ئینجا هەمیتر هانیان ئەدات لەسەر ئەو ئیمانە راستەقینە بەمەی هیچ هۆو بەهانەی ئیمان نەهێنانیان بە دەستەوە نی یە، بەڵکو هۆی ئیمان و پاڵ پێوەنەری ئیمانیان لایە، بەمەی پێغەمبەریان لەناودایە (ﷺ). بانگیان ئەکات بۆ ئیمان، پەیمانیشیان بە ئیمان هێنان داوە، خوایش چەند ئایەتی روون و بەڵگەی ئاشکرای بۆ ناردوون کە ببێتە هۆی ئیمان و دەرچوونیان لە تاریکی کوفرو بێ باوەڕیی، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾[1] ئایا چ شتێ بەرگریتان ئەکات، چ عوزرو بەهانەیەکتان هەیە لە ئیمان هێنان دا؟ ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ﴾ لە کاتێك دا کە پێغەمبەرتان لەناودایە و**

---

[1] ئایەتی پێشوو دەربارەی موسڵمانان بوو، هەروەها ئەگونجێ ئەم ئایەتە بۆ ئەوان بێت، تەفسیرەکە لەسەر ئەم بارە کرایەوە، بەڵام هەندێ ئەفەرمون: ئەم ئایەتە بۆ بێ ئیمانەکانە، ئەم رایەش ئەگونجێ، ئەو کاتە شێوەی تەفسیرەکە ئەبێ بە جۆرێ تر بێت.

بانگتان ئەکات بۆئەمەی ئیمانی راستەقینە بێنن بەپەروەردگارتان، ﴿وَقَدْ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ﴾ لەکاتێك دا لەوەوپێش خوا پەیمانی ئیمان هێنانی لێ وەرگرتوون بەمەی بەڵگە و نیشانەی بۆ داناون و هۆش و هەست و ژیریی پێداون و دەسەلاتی بیر کردنەوەو تێڕوانینی پێداون، ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە لەبەر هەر هۆیەك ئیمان بێنن هۆی ئیمان لەوە گرنگ تر نی یە، ئینجا بە تەواوی هۆو بەهانەی ئیمان نەهێنان ئەبڕێت، ئەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ خوا کەسێکە کە چەند ئایەتێکی روون و رەوان ئەهێنێتە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆی، واتەمحمد(ﷺ) ﴿لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ بۆئەمەی ئێوەدەربێنێ لەتاریکی یەکان، تاریکی هەموو جۆرە کوفرو بەد باوەڕی و بەد کرداری و بەد خویی ﴿إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لەو هەموو تاریکی یە دەرتان بێنێ بۆ رووناکی ئیمان و باوەڕی راست و رێگای خوا کە تاقە رێگایەکە، جا لێرەدا وەك بۆمان دەرکەوت خوای گەورە بە کۆ ناوی تاریکی بردووە، کەواتە تاریکی و رێگاکانی چەوت زۆر و زەبەندەن، بەلام رووناکی بە تاك ناو بردووە، کەواتە تەنیا یەك رووناکی هەیە ئەویش بەرنامە و ئایینە پیرۆزەکەی خوایە.

﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زۆر بە رەحم و بەزەیی یە بە ئێوە. ئەوەتا هەر شتێ هۆی رێنموونی و رزگاریتانە بۆی فەراهەم هێناون. بەلێ بەڕاستی خوای خاوەن بەزەیی هەموو بەهانەیەکی بڕیوە، چاکەو نیعمەتی خۆی رشتووە بەسەر ئادەمیدا! بە تێکڕایی بە ناردنی ئەم ئایینە، بە تایبەتی یەکەم چین کە شادی کردن بە بینینی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە (ﷺ) بەلێ بەڕاستی ئەو ماوەی ژیانی ئەو کۆمەلە بەختیارە لەگەلْ ئەو پێغەمبەرە گەورەدا (ﷺ) ئێجگار ماوەیەکی نایاب بووە، ئەم جیهانە لە هەموو تەمەنی دا کاتی وا بەرزو پیرۆزو بەڕێزی بەخۆیەوە نەدیوەو شتی وا هەرگیز نابێ، وەرە بیری لێ بکەرەوە لەو پەیوەندی یەی زەوی بە ئاسمانەوە، بیر بکەرەوە لەوەی خوای گەورە دواوە لەگەلْ بەندەکانی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەچەندەها رووداو و بەسەرهاتی تایبەت دا ئایەت ئەهاتە خوارەوە و وت و وێژی لەگەلْ ئەو بەندەیانە ئەکرد: ئەیفەرمو: ئەوە بکەن و ئەوە مەکەن!! ها ئەوە رێگای منە پیای دا بڕۆن و مەچن بە هیچ رێگایەکی تردا! تاوان و ناڕەواییتان کردووەو بگەڕێنەوە بۆلام. هەموو کات قاپیم کراوەیە لێتان و لەسەر پشتە! وەرنەوە بۆلام و نائومێد مەبن لە رەحم و بەزەیی من، فلانە پرسیارتان ئەوە وەلامەکەیەتی، فلانە گرێ و گیروگرفتتان ئەوە چارەسەریەتی... هەروەها.

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ

---

بیر بکەینەوە کێ ئەم قسە و باس و وتو وێژە ئەکات لەگەڵ ئەم بەندەیانەدا؟ خوا ئەوانەی ئەفەرموا کەواتە ئەوانە هەموو کات لەگەڵ ئەو خوایەدا ئەژیان و بە یادی ئەو ژیانیان بەسەر ئەبرد، بێگومان ئەوە لوتف و بەزەیی و چاکەیەکی تایبەتی یە خوا رشتی بەسەر ئەو گەلە بەختیارەدا، کەواتە مافی خۆیانە هەرچەندە رێك و راست و پاك و خاوێن بووبن، بەڵام پاش ئەو یەکەم کۆمەڵە بەختیارە هەر تاقم و چینێ تر هاتبێ و یان لەمەوپاش بێت و ئیمان و باوەڕی رێك و راستی بووبێ یان هەیبێ، ئەم تاقم و چینانە زۆرتر جێگای شانازی و ئافەرینی پێغەمبەرن (ﷺ). ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەی دا ئەم حەدیسە ئەهێنێ: رۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بە یارەکانی: کام کۆمەڵی ئیماندارانتان بەلاوە نایابترە؟ ئەوانیش وتیان: کۆمەڵی مەلائیکە. ئەویش فەرموی: ئەوانە هیچ بەهانە و هۆی ئیمان نەهێنانیان نی یە لە کاتێکدا کە نزیکن لە خواوە، واتە هونەر ناکەن لە ئیمان هێنان دا، ئینجا وتیان: دەی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – لە هەموو کۆمەڵێ نایابترن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: پێغەمبەران چۆن ئیمان ناهێنن کاتێ کە وەحی خوا دێتە خوارەوە بۆ سەریان، ئینجا وتیان: دەی ئێمە، فەرموی: ئێوە چۆن ئیمان ناهێنن لە کاتێك دا کە من وام لەناوتان دا؟ واتە: ماتوڵ من لەناوتاندام ئیمان هێنانی ئێوە هونەر نی یە، بەڵام لە هەموو کۆمەڵێ نایاب تر ئەوانەن کە لە پاش ئێوە دێن کتێبێکیان دەست ئەکەوێ باوەڕو ئیمان ئەهێنن بەوەی تیایەتی.

هەروەها ئەرکی سەرشانی یەکەم تاقم قورس ترو بەتین تر بووە لە ئەرکی تاقمەکانی دوایی وەکو لە حەدیسێ تردا ئەفەرموێ بە یارەکانی: (ئێوە لە چەرخێکان ئەگەر ئەوەی پێتان سپێرراوە دەیەکی بەجێ نەهێنن بە هیلاك دا ئەچن و لەمەوپاش کات و چەرخێ دێت ئەگەر ئیمانداران دەیەکی ئەو فرمانانە بەجێ بێنن رزگار ئەبن). بەڵکو مژدەی زۆر گەورەتر هەیە بۆ تاقمە دوایی یەکان ئەگەر دامەزراو بن لەسەر رێگای راست، لە حەدیسێکی تردا ئەفەرموێ: لە پاش ئێوە چەند رۆژو چەرخێ پەیدا ئەبێ لەو رۆژەدا خۆ گرتنەوە لە تاوان و دامەزراویی لەسەر رێگای راست ئەوەندە گرانە وەکو دەست گرتن بەسەر پشکۆدا وایە،

هەرکەس لەو رۆژە سەختانەدا کردەوەی باش بێت لای خوا پاداشتی بە ئەندازەی پەنجا کەس لە ئێوە هەیە[1]. پاش هاندان لەسەر ئیمان هێنان ئینجا هەمیتر هان ئەدات لەسەر بەخت کردنی ماڵ و سامان لە رێگای خوادا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئایا چ شتێ بەرگریتان ئەکات لە بەخت کردنی ماڵ، چ عوزرو بەهانەیەکتان هەیە لە بەخت نەکردنی ماڵ و سامان لە رێگای خوادا؟ ﴿وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە کاتێك دا کە هەموو میراتی و کەلەپووری ئاسمانەکان و زەوی تەنیا بۆ خوایە، واتە هیچ کەس نامێنێ و هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، وەکو میراتێ ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنی، کەواتە بەخت کردنی ماڵ لە رێگای خوادا چاکە، چونکە ئەو کاتە ئەو ماڵ و سامانە هەروا بە خۆڕایی و بە فیڕۆ ناڕوا، بەڵکو پاداشتەکەی لای خوا ئەمێنێتەوە بۆ خاوەن ماڵەکە، بەڵام ئەگەر وا نەکرێ ماڵەکەیشی ئەڕواو پاداشتیش نابێ بەڵکو تۆڵەی لێ ئەسێنرێ.

بەڕاستی یەکەم تاقم لە یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) چ مەککەیی یەکان و چ مەدینەیی یەکان ئەوەی توانیان لەماڵ و لە گیان بەختیان کرد لە پێناوی ئایینی پاکی ئیسلام دا لەکاتی تەنگ گوزەرانی و تەنگانەدا، لە کاتێك دا کە ئیسلام و موسڵمانان غەریب و بێ کەس بوون لە هەموو لایەکەوە، لەلایەن زۆری بەهێزی داخ لە دڵەوە تار ئەنران. کەواتە فیداکاری یەکەیان ئێجگار پاك و خاوێن بوو، تەنها لەبەر خوا بوو، تەنها لەبەر بەرزکردنەوەی ئاڵای ئەو ئایینە بوو لەسەرو ماڵیان خۆشەویست تر بوو بەلایانەوە، بەڵام لەبەر نەبوونی و کەم دەستی ئەو ماڵ و سامانەی کە ئەیاندا لە رێگای خوادا کەمتر بوو لەوەی کە تاقم و چینی دووەم ئەیانتوانی بیدەن لەپاش رزگار کردن (فتح) ی مەککە. ئینجا هەندێ لە تاقمی دووەم کە سامان دارو بە دەسەڵاتیش بوون، ئەیانویست بە ئەندازەی تاقمی یەکەمی بێ سامان و دەسەڵات ماڵ بدەن لە رێگای خوادا، جا لەبەر ئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە زیادە نرخی دا بەو ماڵە کەمەی کە یەکەم چین ئەیاندا، چونکە بەخشینەکەی ئەوان پاك و بێگەرد بۆ خوا بوو، لەو کاتە هونەر بوو، ئەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ﴾ هەرکەسێ لە ئێوە ماڵ و سامانی بەخت کردبێ و جەنگی کردبێ لە رێگەی خوادا لە پێش رزگار کردن (فتح) ی مەککەدا، ئەوە ئەو کەسە یەکسان نی یە و وەکو ئەو کەسانەتان نی یە کە لەپاش فەتح ماڵ و سامانیان دابێ و جەنگیان کردبێ.

---

[1] ئەم حەدیسە تاج الأصول هێناویەتی لە ج / ٥ دا.

أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ﴾ ئەوانەی پێش فەتح رادەو پلەیان گەورەترە ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ﴾ لەوانەکەلەپاشدا ماڵ و سامانیان داوە لە ڕێگای خوادا و جەنگیان کردووە، چونکە هینەکەی ئەمان هونەرێکی وای تێدا نەبوو، بەڵکو لە کاتێك دا بوو کە بێ باوەڕانیش خوا خوایان بوو کە بە موسڵمان سەیر بکرێن، هەموو مەرایی یان ئەکرد بۆ موسڵمانان. پاش ئەمەی زیادە نرخی دا بە تاقمی پێشوو ئینجا بەڵێن ئەدا بە تاقمی دووەمیش کە ئەمانیش پاداشت ئەدرێنەوە و بێبەش نابن ئەفەرموێ: ﴿وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە بە هەردوو تاقم، بەڵام دیارە رادەو پلەی تاقمی یەکەم بەرزترە، وەکو لە پێشەوە باس کرا. بێگومان ئەو جیاوازی رادەو پلەی کە لە نێوان ئەو دوو تاقمەدا بووە لە سەرەتای ئەم ئوممەتەوە هەروەها لە نێوان هەموو تاقمێکی وێنەی ئەوان دا هەیە تا ڕۆژی دوایی، واتە ئەو کەسانەی کە لە کاتی تەنگانە و چەوسانەیی ئیسلام و موسڵمانان دا کۆشش و فیداکاری ئەکەن، ئەوانە رادەو پلەیان لای خوا بەرزترە لەو کەسانەی کە تێکۆشان ئەکەن لەکاتی هێزو دەسەڵاتی ئیسلام و موسڵمانان دا، شتێکی ئاشکرایە کە ئەم جیاوازی یە لە بنەڕەت دا ئەگەڕێتەوە بۆ ئاگاداری خوا بەسەر جیاوازی ئیماندارەکان دا، لە ئەندازەی راستی و پاك و خاوێنی نیازو کردەوەکەیان دا وەکو لەم ئایەتەوە روون ئەبێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ خوا ئاگادارە بەسەر هەموو کردەوەکانتاندا، ئینجا پلە و قۆناغێ تر ئەهێنێتە پێشەوە بۆ ئەمەی دڵ و دەروون بهێنێتە سۆزو پەرۆش بۆ ئیمان و بەخت کردنی ماڵ و سامان لە ڕێگەی خوادا ئەفەرموێ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ ئایا کێ یە ئەو کەسەی کە قەرز ئەدات بە خوا، قەرزێکی جوان و شیرین؟ واتە کێ یە ئەو کەسەی کە ماڵ و سامان ئەدات لە ڕێگای رەزامەندی خوادا بە جۆرێکی رێك و راست و پاڵفتە (خالص) تەنها لەبەر

خوا؟ بەڵام بەو شێوە فەرمووی کە دڵی ئیمانداری ڕاستەقینە ئەخاتە سۆزو پەرۆش و مافی ئەوەی هەیە بەم فەرموودە باسی لێ پەیدا ببێ لە خۆشیداو بە هەموو شانازی یەکەوە پەلامار بدات، کام ماڵی بەنرخ و خۆشەویستە بیدات لە ڕێگای خوادا شێوەی فەرموودەکە زۆر نایاب و سەرنج ڕاکێشە، خوا کە خوایە و خاوەنی بەندە و هەموو سامانەکەیەتی و هیچ پێویستی بە هیچ کەس و بە هیچ شتێ نی یە خۆی وا پیشان ئەدات لەم فەرموودەدا کە پێویستی بە قەرز کردن هەیە لە بەندەکانی، بەندەکانیش خاوەن شتن!! ئەوە ئەوپەڕی ڕێزگرتن و نرخ پێدانە لە لوتف و بەزەیی بە زیاد بێ، خەڵکی باوی وایە بێ گێروگرفت چەسپانی ئەکات لە قەرز دان بە دەوڵەمەندان، چونکە دڵنیایە کە قەرزەکەی دەست ئەکەوێتەوە، شانازیش ئەکات و کەشخە ئەکات کە قەرز ئەدا بە دەست ڕۆیشتوو دەوڵەمەندان، کەواتە ئەگەر خوا داوای قەرزی لێ بکات و قەرز بە خوا بدات ئەبێ چەندە خۆی بە خۆش بەخت و کامەران بزانێ؟ ئیمانداره ڕاستەقینەکانی ئەم ئوممەتە، بە تایبەتی یەکەم چین و تاقم ئەم جۆرە فەرموودانە ئێجگار کاری لێ ئەکردن و ئەیهێنانە سۆز لە گوێڕایەڵیدا بۆ وێنە: ئیبن و مەسعود حەدیسێ ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ[1]: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە – ئەبولدەحداح ناوی ئەنساری – وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خوا قەرزی ئەوێ لە ئێمە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ ئەبولدەحداح. ئەمیش عەرزی کرد: دەستتم بدەرێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەویش دەستی بەفەڕی خۆی دایە، ئەمیش وتی: ئەوا من باغەکەی خۆمم بە قەرز دا بە خوا کە باغەکەی ٦٠٠ بن دار خورمای تێدا بوو، خێزان و منداڵەکانی بەماڵەوە لەناو ئەو باغەدا بوون، ئینجا گەڕایەوە بۆ ناو منداڵەکانی هەر لە دەرەوە بانگی کردە خێزانی کە (أم الدحداح) بوو، فەرمووی: وەرنە دەرەوە، چونکە من ئەو باغەم بە قەرز داوە بە خوا، خێزانیشی مەردانە فەرمووی: سەودایەکەت قازانجی کرد. ئینجا بە گورجی منداڵ و شت و مەکەکانی هێنایە دەرەوە، چونکە زانی تازە هینی ئەوان نی یە و دروست نی یە دانیشتنیان لەو باغەدا.

---

[1] تەفسیری ئیبن کەسیر ج / ٤.

خوای گەورە لوتف و بەزەیی یەکەی ئەوەندە فراوانە هیچ کات قەرزەکانی سەربەسەر ناداتەوە، بەڵکو چەند چەندانەی ئەکاتەوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ﴾ کێ یە ئەو کەسەی کە قەرزێکی جوان و شیرین ئەدا بە خوا، ئینجا خوایش بۆی چەند چەندانە ئەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەدا پاداشتێکی بەڕێزی هەیە لە بەهەشت دا کە تەنها خوا ئەزانێ چۆنە. ئەو زیاد کردن و چەند چەندانە وەکو لە چەند حەدیسی سەحیح دا هەیە لای خواروی یەك بە دەیە تا هەزار و چوار سەد قات و زیاتر. ئەوەی بە گوێرەی رادەی راستی بەندەکەیە لەگەڵ پاك و خاوێنی نیازو ماڵەکەی و ئەو مەبەستەی ماڵەکەی تێدا بەخت ئەکات.

هەندێ لە زانایان فەرمویانە: ئەو ماڵەی کە بەندە ئەیدا لە رێگای خوادا ناونابرێ بە قەرزی چاك (حسن) بەم دە مەرجە نەبێ:

١- ماڵەکە حەڵاڵ بێت.

٢- باش ترو بەنرخ ترینی ماڵەکەی بێت.

٣- لەکاتێك دا بدرێ کە خاوەنەکەی پێویستی پێ ی هەبێ.

٤- بە کەسێك بدرێت کە لە هەمووان پێوستی ی زۆرتر بێت بەو ماڵە.

٥- ئەوەی کە ئەیدات تا بۆ ئەکرێ دەری نەخات.

٦- منەت نەکات بەسەر هیچ کەسدا.

٧- نیازو مەبەستی تەنها خوا بێت.

٨- ئەوەی کە ئەیدات هەرچەندە زۆر بێت بە کەمی سەیر بکات.

٩- ئەو ماڵە خۆشەویست ترین ماڵی بێت.

١٠- خۆی بە زل سەیر نەکات و ئەوەی ماڵەکەی پێ ئەدات بە زەلیل و سەرشۆڕ.

يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ

**ئینجا هەندێ لەو پاداشتە بەرێزە پیشان ئەدات لە شێوەیەك لە شێوە نایابەكانی رۆژی دوایی دا، بەلأم ئەم شێوە یەكەم جارە پیشانی ئەدات ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ ئەو پاداشتە بەرێزەیان هەیە لە رۆژێك دا كە ئیمانداران ئەبینی تیای دا چ پیاو و چ ئافرەت بە جۆرێك ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم﴾ كە رووناكی خۆیان بە چەسپانی ئەڕوات لە پێش دەمیانەوە و بەلای راستیاندا[1]. بەڵێ ئەم شێوە نایابە یەكەم جارە قورئان پیشانی ئەدات، بەڕاستی زۆر سەیرە كە ئیمانداران بهێنینە پێش چاو لەو كاتەدا كە ئەو رووناكی یە شیرینە لە خۆیانەوە دەرچیێ و لەبەردەم و لەلای راستیان دا بڕواو جیێ و شوێنیان بۆ رووناك بكاتەوە، بەە بەە لەو شێوە نایابە كەس نەدیوە، ئەو وەكو گلۆپ رووناكی لیێ دەرئەچیێ و دەوربەر رووناك بكاتەوە بۆ رێنموونی كردنیان تا ئەچنە بەهەشت!! ئەوەیش ئەو نوورو رووناكی یەیە كە بەهۆی شوێن كەوتنی قورئانەوە خوا بۆیان فەراهەم ئەهێنیێ.[2] واتە لەم جیهانەدا بەهۆی پەیڕەوی قورئانەوە نورو رووناكی یەكی نهێنی روو ئەكاتە رۆح و دەرونیان و ئەبێتە هۆی ناسینی رێگای راست و رۆیشتن بە رێگای راست دا. جا ئەو نوورو رووناكی یە خوا لەو جیهان ئەیكات بە شتێكی ئاشكراو رێگای بەهەشت روون ئەكاتەوە، دیارە ئەو رووناكی یانە یەكسان نین، بەڵكو رادەیان جیاوازە بەگوێرەی جیاوازیی كردەوەی چاكی ئەم جیهانەیە، قتادە ئەفەرموێ حەدیسێكمان بۆ باس كراوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: هەندێ لە ئیمانداران رووناكی یەكەیان لێرەوە تا سەنعاء (عەدەن) رووناك ئەكاتەوە، لەوە**

[1] بە گوێرەی تەفسیرەكە وشەی ﴿یوم﴾ زەرفە بۆ ﴿لە﴾، دوویاری تریش هەڵئەگرێ: ١- زەرف بێت بۆ ﴿یضاعفه﴾. ٢- زەرف بێت بۆ ﴿اذكر﴾ ی بڕیار دراو. هەردوو باشە و هەر یەك مەبەستە.

[2] تیرو باری تریش ئەگونجیێ، ئەو نورو رووناكی یە ئەوەبیێ كە ئەم بوونەوەرەی لیێ دروست كراوە لەو جیهان خوای گەورە دەری ئەخات بە جۆریێ هەموو لەشیان رووناكی لیێ دەرئەچیێ، ئەوەش بەشێكە لە پاداشتیان.

کەمتر هەیە تا رادەیەك کە شوێنی پێی رووناك ناکاتەوە، ئەو ئیماندارە بەختیارانە لەو کاتە خۆشەدا دڵخۆش ئەکرێن بەمەی پێ یان ئەوترێ: ﴿بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّـٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ﴾ ئەوەی ئەمڕۆ مژدەتان پێ ئەدرێ بەهەشتانێکە کە رووبارەکان دێن و ئەچن لە ژێر کۆشکەکانیان دا، ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ ئەچنە ناو ئەو بەهەشتانەوە بە جۆرێ کە ئەمێننەوە تیایان دا بە ئێجگاری و بێ برانەوە، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ ئەو نوورو رووناکی و بەهەشت و نازو نیعمەتە نەبڕاوە کە باس کران هەر ئەوانەیە گەیشتن بە ئامانجی هەرە گەورە کە خوا ئەیدات بەو بەندە ئیماندارانە: ﴿يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَـٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَـٰفِقَـٰتُ﴾[1] ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی هەرە گەورە لە رۆژێك دا کە پیاوە دوو رووەکان و ئافرەتە دوو رووەکان ئەڵێن: ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەوانەی کە لەم جیهانەدا ئیماندار بوون و ئیمانیان هێنابوو، نوورو رووناکی لە ناوچاویان دا ئەدرەوشێتەوە دەوروبەر رووناك ئەکاتەوە، ئەڵێن بەو ئیماندارانە: ﴿ٱنظُرُونَا﴾ تەماشامان بکەن یان هەندێ لێمان بوەستن و پەلە مەکەن ﴿نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ﴾ با لە نوورو رووناکی یەکەی ئێوە هەندێ وەرگرین تا رێگای پێ دەرکەین. ئیبن عەباس و ئەبو ئومامە ئەفەرمون: لە رۆژی دوایی دا تاریکی خەڵکی دائەگرێ – ماوەردی ئەفەرموێ: لام وایە پاش بڕیار دانی بەهەشتی و دۆزەخی هەرکەس بۆ جێگای خۆیان، ئینجا ئیمانداران نوورو رووناکی یان پێ ئەدرێ بۆ ئەمەی رێگا دەرکەن و گوزەری پێ بکەن بەسەر پردی صراط دا، بۆ لاقرتی و هەڵخەڵەتاندن لە یەکەم جارەوە رووناکی بە دوو رووەکانیش ئەدرێ و ئینجا ئەکوژێنرێتەوە جا لەو کاتەدا بەو جۆرە کە وترا داوا ئەکەن لە ئیماندارەکان. بەڵام ئەو دوو رووانە تازە چۆن سوود لەو نوورو رووناکی یە وەرئەگرن ئەوان لەماوەی ژیانی ئەم جیهانەدا دوور کەوتنەوە لە هۆی ئەو نوورو رووناکی یە و خۆیان خستە ناو تاریکی و هۆی تاریکی یان بۆ خۆیان هەڵبژارد، هەر چارەسەری یەك لەم جیهانەدا نەکرێ ئیتر لەپاش دا هیچ ناکرێ.

---

[1] بە گوێرەی تەفسیرەکە ﴿یوم﴾. زەرفە بۆ ﴿الفوز العظیم﴾ بارو تیری تریش هەیە کە زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەیفەرمون: کە (بەدەل) بێت لە ﴿یوم﴾ ەی پێشوو، ئەمیش هەر جوانە و مەبەستەکە یەکە کە پیشاندانی شێوەی بەسەرهاتی ئیماندار و دووڕووە.

﴿قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ١٣ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾

---

لەبەر ئەوە بە شێوەی لاقرتی: ﴿قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ﴾ پێیان ئەوترێ: بگەڕێنەوە بۆ دواتانەوە بۆ دنیا ﴿فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا﴾ ئینجا لەوێ داوای نوورو رووناکی بکەن بۆ خۆتان بە پەیڕەوی کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەر(ﷺ) یان بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئێمە نوورو رووناکیمان لێ وەرگرت لەوێ وەری گرن. ئەوانیش ئەگەڕێنەوە ﴿فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ﴾ ئینجا دیوارو شوورەو بەرهەڵستێ ئەهێنرێ بە نێوانی ئیماندار و دوو رووەکان دا، کە قاپی یەکی هەیە ﴿بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ﴾ رووی ناوی – کەلای ئیماندارەکانەوەیە – رەحمەتی تێدایە، چونکە بەرەو بەهەشتە، ﴿وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ﴾ رووی دەرەوەی کە لای دوو رووەکانەوەیە، لەلایەن ئەو دیوی دەرەوەی سزاو عەزاب هەیە و دەست پێ ئەکات، چونکە بەرەو دۆزەخە، وا دیار ئەکەوێ ئەو شوورەو بەرهەڵستە بەرگری بینین ئەکات بەلام بەرگری دەنگ ناکات، وەکو دەرئەکەوێ لەم وتو وێژەی کە لە نێوان ئەو دوو تاقمەدا ئەکرێ، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿يُنَادُونَهُمۡ﴾ دوو رووەکان بانگ ئەکەنە ئیماندارەکان ئەڵێن: ﴿أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ﴾ ئایا ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ واتە ئێمە لەگەڵ ئێوە نەژیاوین لە دنیاداو تێکەڵتان نەبووین؟ لە یەك ساحەدا زیندوو کراینەوە کەواتە بۆچی لێرەدا جوێ کراینەوە لە ئێوە؟

ئیماندارەکان لەوەلامیاندا ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ ئەڵێن بەڵێ ئێمەوئێوەبەوجۆرەبووین کە ئێوە ئەڵێن. ﴿وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ﴾ بەلام ئێوە خۆتان دووچار کردو خۆتانتان کوشت، بە لادانتان لە رێنموونی خواو رێگا راستەکەی. ﴿وَتَرَبَّصۡتُمۡ﴾ چاوەڕوانی نەمانی پێغەمبەرو بەرباد بوون و سەرکزی ئیمانداران و سەرکەوتنی خۆتانتان ئەکرد. ﴿وَٱرۡتَبۡتُمۡ﴾ گومانتان بوو لە راستی ئایینی خواو پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا(ﷺ) ﴿وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ﴾ ئومێد و ئاواتە درۆینەکانتان هەڵیخەڵەتاندن. دڵتان بەوەبەستبوو﴿حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ هەتاکاری خواهات ومردن هاتە سەرتان،

وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ۞ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ

---

﴿وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ خەڵەتێنەری بەهێز کە شەیتانە ئێوەی خەڵەتاند بەمەی کە خوا خاوەن بەزەیی و لێ بوردووە، گوناهو تاوانی لە پێش چاوتان جوان و شیرین و خۆشەویست کرد تا ئەو جۆرە بەدبەختی هەتا هەتایی کردن، ئینجا بە تەواوی سیخی سارد ئەکەن بە جگەریان داو نائومێدیان ئەکەن، پێ یان ئەڵێن: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ژیانی دنیا هەل و هەڵکەوت بوو بۆ چارەسەر کردنی سزای ئەم رۆژە ئێوە ئەو هەلەتان لە دەست خۆتان دەرکرد، کەواتە ئەمرۆ هیچ چارە نی یە، هیچ بریتی و بەدەلێکی لێ وەرناگیرێ نە لە ئێوە – کە کافرێکی ئاشکرا نەبوون لە دنیادا – نە لەوانەی کە کافر بوون بە ئاشکراو کافری خۆیان دەرئەبڕی ﴿مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾ جێ و شوێنی ئێوە تەنها ئاگرە، ﴿هِىَ مَوْلَىٰكُمْ﴾[1] ئاگر شایانترە بە ئێوە لە هەموو شتێ تر ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئاگر پاشەڕۆژێکی زۆر خراپە، خراپترین شوێنە کە ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆی. خوا پەنامان بدات.

ئا بەم جۆرە نایابە خوای خاوەن بەزەیی هانی بەندەکانی ئەدات و بانگیان ئەکات بۆ ئیمانی راستەقینە و ماڵ و سامان دان لە رێگای رەزامەندی ئەودا، بێگومان هەر دڵێ بە تەواوی مردوو نەبێ ئەبێ ئەم فەرمودەیانە کاری لێ بکەن. پاش ئەم هەموو بەڵگە و نیشانە و سەرنج راکێشان و هاندان بۆ ئیمانی راستەقینە و ماڵ و سامان دان لە رێگای خوادا. پاش ئەمانە هەموو ئینجا بە گلەیی و بناشتێکی زۆر کاریگەر روو ئەکاتە ئیماندارەکان ئەو ئیماندارانەی کە هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو رادەو پلەی کە خوا ئەیەوێ لێ یان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئیماندارەکان ﴿أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ کە دڵەکانیان سام و ترس پەیدا بکەن و نەرم ببن بۆ تەمێ و ئامۆژگاری خواو ئەو

---

[1] بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە هەموو ئەگونجێ و رێکە.

قورئانە راستەی کە هاتووەتە خوارەوە؟ واتە بلّیٚ کاتی ئەوە هاتووەو بە بەرەوە نەماوەو هیچ بەهانەیەکیان نی یە و هۆی گوێڕایەڵی و دڵ نەرمی یان بۆ فەراهەم هاتووە، کەواتە با سستی نەکەن و بە چەسپانی گوێڕایەڵی بکەن بۆ ئەوەی خوا داوایان لێ ئەکات، ئەمە عیتاب و گلەیی یەکە هەرچۆنێ هاندانی تێدایە بۆ گوێڕایەڵی هەروەها ترساندنیشی تێدایە لە پاشەڕۆژی خراپی و سستی کردن. هەروەها روونی ئەکاتەوە کە پێویستە پاك کردنەوەی دڵ و دەروون لە چڵك و چەپەڵی و دووری لە یادی خوا، ئەگەر پاش ماوەیەك دڵ رەق ئەبێت و ئەو کاتە لەوانەیە دڵ مۆر بکرێت و ببێتە جێگای قارو خەشمی خوا هەتا هەتایە، خوا پەنامان بدات. ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ﴾ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئیماندارەکان دڵیان نەرم ببێ بۆ تەمێی خواو ئەو قورئانە راستەی کە هاتووەتە خوارەوە، بەوێنەی ئەوانەنەبن کە لە پێش ئەمان دا کتێبیان پێدراو ﴿فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ﴾ ئینجا ماوە و چەرخی دوورو درێژ بەسەریاندا رابورد، دورکەوتنەوە لە پێغەمبەرەکانیان، ﴿فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە دڵەکانیان رەق بوون و نەرم نەبوون بۆ ئامۆژگاری خوا، پەندو تەمێ یان وەرنەگرت ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ﴾ زۆر لەوان دەرچوون لە ئایینی خوا بەهۆی دڵ رەقی یانەوە، بێگومان دڵی ئادەمی زۆر ئەم دیوو ئەو دیو ئەکات و ئەگۆڕێ، زۆر زوو شتی لە بیر ئەچێ، بە تایبەتی هەرکات ماوەیەك ماوەیە بێ تەمێ و ئامۆژگاری و بیر کردنەوە ئەو رەق و کەودەن ئەبێ، رووناکی یەکی هەبێ ئەکوژێتەوەو تەم و تاریکی دای ئەگرێ. کەواتە پێویستە مۆچیاری و تەمێ کردنی بۆ ئەمەی بیر بکاتەوەو مل کەچ و گوێڕایەڵ ببێ بۆ فەرمانی خوا، پێویستە بێدار کرێتەوەو تەقە بدرێ لەو دڵانە تا نەرم بن و چڵك و چەپەڵیی بێ ئاگایی یان نەمێنێ، پێویستە بە وریا کردنەوەیەکی هەمیشەیی تا کەودەن و رەق نەبنەوە، بەڵام ئەگەر رەق بوون و تەم و تاریکی داگیری کردن نابێ نائومێدی یان لێ پەیدا بکرێ، چونکە ئەگونجێ زیندوو بکرێنەوەو رووناکی یان بۆ پەیدا ببێ و رەقیان نەمێنێ نەرم و گوێڕایەڵ بن بۆ یادو ئایینی خوا، بە وێنەی زەوی، ئەوەتا وشك و برینگ ئەبێ و ئەمرێ و گیان و تەڕیی تێدا نامێنێ. لەپاش ئەوە خوا زیندووی ئەکاتەوەو خێرو بێرێکی تێدا فەراهەم ئەهێنێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ بزانن کە خوا زەوی زیندوو ئەکاتەوە لە پاش مردنی، واتە لەم قورئانەدا خوا شتی وای داناوە بۆ بەندەکانی کە زۆر لە دڵە مردووەکان زیندوو ئەکاتەوە بە وێنەی زیندوو بوونەوەی زەوی وشك و مردوو بە باران،

قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ

﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بەڕاستی ئایەت و بەڵگەکانمان بۆ باس کردوون بە روون و رەوانی، پەندو ئامۆژگاری دڵ نەرم کەرمان بۆ باس کردوون، بەڵکو بیر بکەنەوەو ژیر ببن، لە پاش ئەو هەموو هاندان و سەرنج راکێشان و عیتاب و گلەیی و ئامۆژگاری و بیر خستنەوەو ترساندنە کە لەم ئایەتە پێشووانەدا رابوردن پاش ئەوانە هەموو ئینجا هەمیتر بە جۆرو شێوەیەکی تر هانی بەندەکانی ئەدات لەسەر بەخت کردنی ماڵ و سامان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ[1] وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ بەڕاستی ئەو پیاوو ئافرەتانەی کە ماڵ و سامان بەخێرو چاکە (صدقة) ئەدەن لە رێگای خواداو قەرزیان داوە بە خوا، قەرزێکی جوان و شیرین، واتە خالص (دوور لە هەموو شتێك) و تەنها لەبەر خوا ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمْ﴾ ئەوەی کە ئەیدەن چەند چەندانە ئەکرێتەوە بۆیان ﴿وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە پاداشتێکی بەنرخی بەرێز کە بەهەشتە، هەرکەس بیر لەم فەرمودەیە بکاتەوە حەق وایە دڵ و دەروون و هەموو هەستی پڕ ببێت لە سۆزو پەرۆش لە بەخت کردنی ماڵ و سامان دا و بە چەسپانی پەلاماری خۆشەویست ترین ماڵ و سامانی بدات بۆ بەخت کردنی لە رێگای رەزامەندی خوادا، چونکە دیمەنی ئایەتەکە وا پیشان ئەدات کە ئەو خێر کەرانە چاکەو پیاوەتی لەگەڵ خوادا ئەکەن، لە رێوە یەکسەر قەرزو مامەڵە لەگەڵ خوادا ئەکەن، جا چ پاڵ پێوەنەرێك لەمە بەهێزترە کە کابرای خێرکەر وا هەست بکات کە قەرز بە خوا ئەدات و مامەڵە لەگەڵ کەسێك دا ئەکات کە خاوەنی بوون و بوونەوەرە، ئەوەی کە ئەیدات بە چەندانە ئەیدرێتەوە، سەرباقی هێشتا پاداشتی بەرێزی هەیە؟!!

ئینجا باسی پلەی بەرزو پاداشتی ئیمان و ئیمانداران ئەکات ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ﴾ کەسانێ کە ئیمان و باوەڕی راستەقینەیان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی – سەلامیان لەسەر بێت –

---

[1] تەفسیرەکە بەگوێرەی خوێندنەوەیە بە شەدەی صاد و دال بە مانای ئیمان و باوەڕە. واتە ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هەیە... هتد.

أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ[1] وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەوانــەی لای خــواو لــە بڕیــاری خــوادا وەکــو صدیقەکان و شەهیدەکان وان، بەو چاوە سەیر ئەکرێن: ﴿لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ﴾ پاداشت و نورو رووناکی ئەوانیان بۆ هەیە، بەڵام دیارە پلە و پایەی صدیق و شەهیدەکان بەرزو بەڕێزترە، پاداشــت و نــوری ئــەوان چەند چەندانە ئەکرێنـەوە، واتـە ئەوانـەی ئیمـان و بـاوەڕی ڕێـك و راستیان هێناوە، ئەو ئیمان و باوەڕەیان بە کردەوە بەدی ئەهێنن، ئەوانە خوا – بە لوتـف و بــەزەیی خــۆی – رادەو پلــەیان بــەرز ئەکاتــەوە تــا ئــەو رادەو پلــەی کــە مــافی صــدیق و شەهیدەکانە، هەرچۆنێ ئـەجرو پاداشـتی ئـەمانیش چەند چەندانەی ئەکاتـەوەو بـەرزتری ئەکاتەوە لەوەی مافی خۆیانە. رادەو پلەی صدیقەکان و شەهیدەکان هەرچەند زۆر زۆر بەرزو بەڕێزە، بەڵام لوتف و بەزەیی خوا ئەوەندە بە لێشاو و فراوانە هیچ جێگای سەر لێ کردنـەوە نی یە کە ئەو رادەو پلە بەرزە بدا بەو کەسانەی کە ئیمانی راستەقینەیان هـەبێ و بە کردەوە بەدی بێنن، لەپاش باسی رێزو پاداشتی چاکان و پاکان، ئینجابەکورتی باسی سزای کافران و تاوانبـاران ئـەکات، ئەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەوانـەی کافر بوون و باوەڕیان نەبوو بە ئایەتەکانی ئێمەو بە درۆیان دائەنان، ئەوانە وان لەناو ئاگرو هاوڕێ یەکی هەمیشەیین بۆ ئاگرو هەرگیز لێ ی جوێ نابنەوە، خوا پەنامان بدات.

---

[1] بە گوێرەی تەفسیرەکە مەبەست لە ﴿صدیق﴾ ەکان کۆمەڵێکن پاش پێغەمبەران و شەهیدەکان ئـەمانن کـە ئەوانـەن لە ڕێگای خوادا کوژراون. بـە چـەند جۆرێکی تـریش تەفـسیر کراوەتـەوە هـەموو هـەر جوانـەو ئـەگونجێ. هـەروەها بـە گوێرەی تەفسیرەکە لەسـەر وشـەی ﴿شـهداء﴾ یـان ﴿ربهـم﴾ وەسـتان ئـەکرێ. هەنـدێ لەسـەر وشـەی ﴿الـصديقون﴾ وەستان ئەکەن. ئەو کاتە ئەوەی پاش سەربەخۆیە.

لەپاش ئەو هەموو بانگ کردن و هان دانە بۆ ئیمان و بەخت کردنی ماڵ و سامان و فیداکاری لە ڕێگای خوادا، ئینجا دنیا و ژیانی ئەم دنیا پیشان ئەدات بە شێوەیەکی لاوازی بێ نرخ، بە جۆرێ لە پێش چاوی ئەخات و دڵ و دەروونی هەموو خاوەن ژیریی یەکی لێ ئەپچڕێ و ئەیبەستێتەوە بە ڕۆژی دوایی یەوەو ئەفەرموێ: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ﴾ بزانن کە ژیانی دنیا و خۆشی و ڕابواردنی دنیا – واتە ئەو ژیانەی کە بە گوێرەی بەرنامەی خوا نەبێ – تەنها بریتی یە لە شتێکی خەیاڵی کەم نرخ و سوود نەماوی زوو تێپەڕیو، چونکە هەموو ژیان و ڕابواردنی دنیا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم پێنج شتە:

١- ﴿لَعِبٌ﴾ خەریك بوون بە شتێکەوە کە بەرهەمی نی یە وەکو گاڵتەو ماقلەی منداڵان.

٢- ﴿وَلَهْوٌ﴾ خەریك بوونە بە شتێ کە بەرگری مەردوم ئەکات و وەری ئەگێڕێ لەوەی کە گرنگە و مەبەستی ڕاستەقینەیە.

٣- ﴿وَزِينَةٌ﴾ ئەو شتانەی هۆی ئارایش و جوانی و خۆ ڕازاندنەوەن وەکو پۆشاکی چاك و کۆشك و جێگا و شوێنی نایاب و هەروەها هەموو ئەو شتانەی تر کە هۆی جوانی و ڕازاندنەوەی ئادەمین.

٤- ﴿وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ﴾ فەخروشانازی نێوانی خۆتانەبەسەریەکتردا بەنەژادو تیرەو هۆزو بەرە.

٥- ﴿وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ﴾ تێکۆشان و بەربەرەکانێتانە لە زۆر کردنی سامان و ڕۆڵە و نەوەو کەشخە کردنتان بەوانە. ژیانی ئەم جیهانە کە بە کورتی بریتی یە لەمەی کە باس کرا – ئەگەر بەراورد بکرێ و نرخی بۆ دابنرێ بە پێی باوی ئەم دنیایە ئەوا شتێکی زۆر گرنگ و گەورەو بەنرخە، بەڵام ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ڕۆژی دوایی دا، بە تەرازووی ئەو نرخی دیاریی بکرێ ئەو کاتە دەرئەکەوێ بەشێکی بێ نرخی توڕدراوە، بە شێوەی گاڵتە و ماقلەی منداڵان، سەیر ئەکرێ وەکو لێرەدا پیشانی داو بە کورتی کردی بەو پێنج شتە کە سەری هەمووی لە بۆشی یەوە دەرئەچێ، ئینجا بەوەوە نەوەستا،

﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾

---

بەڵكو وێنەیەكی زۆر نایابی بۆ ئەهێنێتەوە كە بە تەواوی باقری دەرئەخات و روونی ئەكاتەوە كە هیچ خاوەن ژیریی یەك نابێ پشتی پێ ببەستێ ئەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ﴾[1] وێنەی ژیانی دنیا لە جوانی و دڵگیری دا، ئینجا لە نەمان و تێپەڕین دا بە زوویی و چەسپانی وەكو گژو گیا و كشتوكاڵێ وایە كە بە باران ئەڕوێ و ئینجا پەرە ئەسێنێ و گەورە ئەبێ تەڕو رەنگا و رەنگ و ناسك بە جۆرێك كشتوكاڵ كەران سەرسام ئەكات، ﴿ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا﴾ لە پاش ئەوە وشك دەبێ، ئینجا بە زەردی دەیبینی لەپاش تەڕی و سەوزیو ناسكی، ﴿ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا﴾ لەپاشان ئەبێ بە كاو ئەشكێتە یەك و پارچە پارچە ئەبێت، ژیانی دنیا بەو وێنە بە زوویی بە داخەوە تێ ئەپەڕێ ﴿وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ﴾ لە رۆژی دوایی دا سزای بەتین و بەسۆ هەیە بۆ ئەوانەی كە سەر ئەكەنە ژیانی ئەم جیهانەو هەر ئەوەیان ئەوێ، سڕینەوەو لێ بوردنی گوناهو تاوان هەیە لەلایەن خواوە و رەزامەندی خوا هەیە دەربارەی ئەوانەی كە لەم جیهانەدا مەبەستی راستەقینەیان رۆژی دوایی یە و شوێنی بەرنامەی خوا ئەكەون ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾ خۆشی و رابواردنی ئەم جیهانە هیچ نی یە جگە لە خۆشی و رابواردنێكی نەماوەی تێپەڕیو كە خەڵكی پێ ئەخەڵەتێ تا وای لێ دێ باوەڕی نامێنێ، بە زیندوو بوونەوەو ژیانی نەبڕاوەی

---

[1] وشەی ﴿كفار﴾ كۆی كافرەو لە بنەڕەت دا بە مانای داپۆشەرە، چونكە تۆمە و دانەوێڵە دائەپۆشرێ و ئەكرێ بە ژێر گڵەوە، بێ باوەڕ كە ناو ئەبرێ بە كافر، چونكە شتی حەق و راست دائەپۆشێ، بێگومان ئەم وشەیە لێرەدا هێما ئەكات كە كشتوكاڵ كەری كافر سەرسام ئەبێ بە ژیانی دنیاو پێی ئەخەڵەتێ.

ڕۆژی دوایی، باوەڕی تەنها بەم ژیانە کەم و کورتە پڕ لە داخ و دووە ئەبێ و بەس. دیارە ئەو باوەڕەیش ئەبێتە هۆی هەموو ئاژاوەو بێ ئارامی و ناڕەوایی لەم جیهانەدا و دووچاری بوونی سزاو بەدبەختی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی. کەواتە مەبەستی قورئان ئەوە نی یە کە خەڵکی دوورکەونەوە لە ژیانی ئەم جیهانە و واز بێنن و کەنارگیر بن لە کاروباری ئەم جیهانە و ئاوەدان کردنەوەی ئەم زەوی یە کە هەموو شتێکی لەبەر خاتری ئادەمی و بۆ ئادەمی دروست کراوە، ئادەمی کراوە بە خەلیفەی خوا تیایدا بۆ ئەمەی جڵەوی هەموو شتێکی بگرێتە دەست بە گوێرەی فەرمان و بەرنامەی خوا، بەڵکو مەبەستی قورئان ئەمەیە کە ئادەمی وریا بێت و ئاگای لە خۆی بێت و هەڵنەخەڵەتێ بەم ژیانە کورتە و بەهۆی خەریك بوون بەمەوە ژیانی ڕاستەقینەی نەبڕاوەی لە بیر نەچێ، ئەو ژیانە ڕاستەقینەی کە هانی خەڵکی بۆ ئەدات و داوای مسابەقە ئەکات تیایدا بەم فەرموودە ئایابە ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ موسابەقە و چەسپانی بکەن بۆلای لێبووردنی خوا لە گوناهەکانتان و سڕینەوەیان، بۆ بەهەشتێك کە گەورەیی و فراوانی یەکەی وێنەی گەورەیی و فراوانی ئاسمان و زەوی وایە، واتە ئەم ماوەی ژیانی دنیا هەلێکە خوا پێی داون، کەواتە بە زوویی فریای خۆتان بکەون بە گەڕانەوە بۆلای خواو گوێڕایەڵی بۆی، کارێکی وا بکەن کە گوناهەکانتان بسڕێتەوەو بتانخاتە ئەو بەهەشتە پان و فراوانە کە ﴿أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ ئامادە کراوە بۆ ئەوانەی ئیمانی ڕاستەقینەیان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی – درودی خوایان لەسەر بێت – بێگومان هەرکەسێك فام و ژیریی نەخۆش نەبێت موسابەقە و بەربەرەکانی بۆ شتی وا گرنگ ئەکات، نەك بۆ شتێك کە کەم سوودو کۆتایی هاتوو کەم نرخە، خۆی خەریك ناکات بە هەر شتێك کە خەڵەتێنەرە وەکو ماقڵەی منداڵان، بەڵکو خۆی خەریك ئەکات بە شتێکەوە کە هۆی دەست کەوتی ئەو موڵك و سەڵتەنەتە گەورەو فراوانە نەبڕاوەیە. ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ﴾ بەه بەه لەو فەزڵ و بەخششە بێ وێنە. لە چەرخەکانی ڕابردوودا ئەم ئایەتەووێنەی ئەمە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر جار هۆی

سەرسوڕمان بوو!! کە چۆن بەهەشت ئەوەندە فراوان و گەورەیە؟ لەبەر ئەوە ئەم جۆرە فەرمودەیان لائەدا لە دیمەنەکەی، چەند جۆرێ تەئویل ئەکران و مەبەستی تریان بۆ ئەدۆزینەوە، بەڵام ئەمڕۆ بە جێگای سەرسوڕمان و سەر لێ کردنەوە نەماون، هەر بە گوێرەی دیمەنە ئاشکراکانی خۆیان تەفسیر و راڤە ئەکرێن، چونکە لەم چەرخەدا بەهۆی دوربین و رەسەدە تازەکانەوە روون بووەتەوە کە گەورەیی و فراوانیی بوونەوەر لە سنووری زانین و ژیریی ئێمە دەرچووە، بە هەزارەها ملیۆن و ملیار ساڵانی رووناکی فراوانی بوونەوەر بەراورد و بەرەو روو ئەکرێ. کەواتە ئەم جۆرە ئایەتانە هەروەها هەر حەدیسێ لەم بابەتانەوە هاتبێ بە هیچ جۆر لە دیمەنەکەی خۆی لای نادەین، ئەزانین دەسەڵات و بەزەیی و چاکەی خوا بێ سنوورە، کەواتە هیچ جێگای سەر لێ کردنەوە نی یە کە بەهەشتی بەوجۆرە فراوان کردبێ، بەو لێشاوی یە بیدا بە بەندەکانی، چونکە ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾ ئەو بەڵێنانە زیادە چاکە و فەزڵی خوایە بەخششی ئەکات و ئەیدات بە هەرکەس خۆی بیەوێ. ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ خوا خاوەنی فەزڵێکی گەورەیە. هەندێ لەو فەزڵ و چاکە گەورەی ئەو موڵکە گەورەو فراوانەیە کە ئەیدات بە بەندەکانی بە بەزەیی خۆی لە لوتف و بەزەیی بەزیاد بێت، کەواتە با هەوڵ و تێکۆشان و بەربەرەکانێ و موسابەقە بۆ ئەو فەزڵە گەورە بکرێ. لە رێگای گەیشتن بەو ئامانجە گەورەیە خۆ ماندوو بکرێ. نەك لە پێناوی بەشێکی کەم لەم زەوی یە بچکۆلە و خۆشی و ژیانی ئەم جیهانە تەمەن کورتە کە کرو فرێکە و بە زوویی دێت و تێ ئەپەڕێ، لە پێشەوە فەرمانی دا بە تێکۆشان و فیداکاری بە ماڵ و بە گیان، هەروەها فەرموی کە ژیانی ئەم جیهانە شتێکە دێت و ئەڕواو نامێنێتەوە، هەموو خۆشی و کاروباری بە زویی تێ ئەپەڕێت، ئینجا لێرەدا ئارامی ئەدات بە دڵ و هەموو بەسەرهاتێکی ناخۆش ئەهوەن ئەکاتەوە لە دەروون دا بەمەی کە هەموو کاروبارێك و هەموو بەسەرهاتێك شتێکە لە پێشەوە بڕیار دراوە. بێگومان هەرچی بڕیار درابێ لەلایەن خواوە ئەبێ ببێ و بەدی بێت،

مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ

---

**ئەفــەرموێ: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ﴾ هــیچ بەسـەرهاتێكی نـاخۆش لـە زەوی دا رووی نـەداوە و هـەروەها لـە لـەش و گیـانی خۆتـان دا ئەوەیش وەكو قاتی و گرانـی و لاتـی و نـەبوونی و نەخۆشـی و هـەموو ناكۆكی و ناخۆشـی یەكی تـر، هـەروەها هـەموو بەسـەرهاتێكی نـاخۆش، ئەمانـە هـەموو رووی نـەداوەو روونـادات مەگـەر ئەوانـە هـەموو بـە زانـینی خـوا بڕیـار دراون و نووسـراون لـە پەڕاوێكدا، واتـە (لـوح المحفوظ) یان عیلمی خوا پێش ئەمەی كە زەوی و ئێوە و بەسەرهاتەكەدروست بكـەین، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاسـتی ئـەوەی كـەوترا شـتێكی ئاسـانە لەسـەر خـوا، هـیچ ئـەرك و ماندوێتی تێدا نییە، چونكە خوا هەرچی بوێ ئەبێ ببێ بۆ بوون و نەبوونی هیچ شتێ و هیچی ناوێ جگە لەوەی كە ئیرادەو خواهیشی رووی تێ بكات.**

**ئـەم بوونـەوەرو هەرچـی كاروبـارو گـۆڕان و رووداوەكـانی هەیـە لەمـەوپێش و ئێستا و لەمەوپاش هـەمووی لـە پێشەوە زانـراوەو بڕیـار دراوە، هـەموو شتێك بـەڕێز كات و جێ و شـوێنی تایبـەتی خـۆی هەیـە بـە هـیچ كلـۆجێ دەسـت نـادات بـۆ هـیچ گـۆڕانـدن و دەسـت تێخستنی، هیچ شتێ بە گزاف و رێكەوت نی یە، بەڵكو هەموو شتێ بە زانین و حیكمـەتێكی تێرو تـەواو كراوەو ئەكرێ. ئەمـە شتێكە پێویستە لەسـەر هـەموو ئیمانـدارێك كە دڵنیا بێ پێی و باوەڕی رێك و پێكی پێی هەبێ، ئەم باوەڕەیش هەرچۆنێ پێویستە لـە بابـەت تـەواو بـوونی ئیمانــەوە، هــەروەها زۆر زۆر پێویــستە لــە ژیــان دا بــۆ فەراهــەم هــاتنی ئــارامی و دامەزراوی لەكاتی هەموو خۆشی و ناخۆشی یەك دا، چونكە كە ئەو بـاوەڕە جێگیر بوو لە دەروون دا، ئەو كاتە مەردوم نە بە خۆشی باڵی لێ پەیدا ئەبێ و لـە پـەت بـەرەڵا ئـەبێ، نە لە**

کاتی ناخۆشیدا دنیای لێ دێتەوە یەك و داخ و مەراق سەری لێ ئەشێوێنێ. وەکو لەم فەرمودەیشەوە روون ئەبێتەوە: ﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾ خوا هەواڵی پێدان کە هەموو شتێ و هەموو بەسەرهات و ڕووداوێك لە پێشەوە زانراوە و بڕیار دراوە بۆ ئەمەی دڵ غەمگین نەبن و داخ و مەراق نەخۆن لەسەر ئەوەی لە دەستتان چووە لە نازو نیعمەتی دنیا ﴿وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾ دڵخۆش نەبن و کەشخە نەکەن بەوەی پێ ی داون، چونکە بێگومان هەرکەس بزانێ و باوەڕی ڕێك و ڕاستی ببێ بەوە کە هەموو شت بڕیار دراوە لەلایەن خواوە، هەرچیش خوا بڕیاری دابێ هیچ چارە نی یە ئەبێ هەر ببێ، دیارە هەموو بڕیارەکانیش پڕ لە حیکمەت و بەرژەوەندی یە، بێگومان هەرکەس باوەڕی وا جێگیر ببێ لە دڵی دا، هەموو بەسەرهاتێکی ناخۆش لە پێش چاوی ئەموەن ئەبێتەوە، هەروەها لە کاتی خۆشی و نازو نیعمەتیش دا بیری خوای پێوە ئەبێ و شەرم ئەیگرێ و سەرکێشی ناکات، بەڵکو پیاوە هەڵکەوتووەکانی ئەم ئوممەتە گەیشتوونەتە رادەو پلەیەك بە خۆشی و ڕەزامەندی دڵەوە پێشوازی ناخۆشی یان کردووە زانیویانە ئەوەی کە روو ئەدات زۆر بەجێ یە و هەر ئەوە شایانە ببێ، بەڵام ئەم پلەو رادەیە کەم کەس پێ ی گەیشتووە، خوا خاوەنی بەزەیی یە داوای ئەمە ناکات بەڵکو ئەوەی داوای ئەکرێ لە ئیمانداران ئەمەیە کە ئێش و داخی موسیبەت و بەسەرهاتی ناخۆش لە ڕێگای ئیمان نەیترازێنێ و دووچاری ناڕەزایی و پەلەو زەلەی بکات لە یادی خواو روو کردنە خوا دووچاری تەکەبوور و فەخرو شانازی بکات، وەکو بەم فەرمودەیەش ڕێنموونی ئەکات ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ خوا هیچ کەسێکی خۆش ناوێ کە خۆی بە زل بزانێ و بە چاوی سووکی تەماشای خەڵکی بکات و کەشخە بکات بە ملی خەڵکیدا، خوا خەشم و غەزەبی هەیە دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە باسی ئەکات و ئینجا سیفەت و ناونیشانی ئەو جۆرە کەسانە باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾ ئەوانە کەسانێکن خۆیان چاو برسی و چنگ قوچاون دەست ئەگرن بەسەر ماڵ و ساماندا و نایدەن لە ڕێگای خوادا،

وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ

---

﴿وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِۗ﴾ فەرمان ئەدەن بە خەڵكی و داوایان لیٚ ئەکەن کە ئەوانیش رەزیل و چنگ قوچاو بن و هیچ نەدەن بە کەس و ماڵ و سامان نەدەن لە ریٚگای خوادا، ئەوانەی کە هەموو شتیٚکیان لە خواوە ئەناسن بە ماڵ و سامان باشتر مل کەچی خوا ئەبن، کەواتە دەست گوشاد ئەبن لە ئاستی خەڵکی بە نزم و بچووك خوٚیان سەیر ئەکەن، بەڵام ئەوانەی کە هەموو دەست کەوت و ماڵ و سامانیان لە خوٚیانەوە ئەناسن، لایان وایە بە ئازایی و دەست و بازووی خوٚیان دەست کەوتیان بووە، ئەوانە بیٚگومان خوٚیان لیٚ ئەگوٚڕیٚ لەبەر ئەوە تەکەبور ئەکەن بەسەر خەڵکی دا و چاوبرسی و چنگ قوچاو ئەبن و ئەیانەویٚ خەڵکیش وابن ویٚنەی خوٚیان لەبەر پیٚك هیٚنان و بڵاوە پیٚدانی بەرنامەی بیرو باوەڕەکەی خوٚیان، ئەوانە خوٚیان زیاندار ئەبن، خوا هیچ پیٚویستی بە هیچی ئەوان نی یە وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ هەرکەس مل پیٚچی ئەکات و ماڵ و سامان بەخت ناکات لە ریٚگای خوادا ئەوە خوٚی زیاندار ئەبیٚت و خوا هیچ زیانیٚك ناکات، چونکە تەنها خوا بیٚ پیٚویستە و سوپاس کراوە، ئینجا لیٚرە بە دواوە تا دوایی سورەتەکە بە کورتی باسی پیٚغەمبەریٚتی ئەکات، لە نوح و ئیبراهیمەوە و ئەیهیٚنیٚ و زیاتر باسی ئەهلی کیتاب ئەکات، بە تایبەتی ئوممەتی عیسا – سەلامی خوا لە هەموویان بیٚت – لە یەکەم جارەوە بە شیٚوەیەکی گشتی دڵنیایی ئەکات لەسەر رەوانە کردنی پیٚغەمبەران و مەبەست لە رەوانە کردنیان دیاریی ئەکات، ئەفەرمویٚ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ سویٚند بەخوا ئیٚمە پیٚغەمبەرەکانی خوٚمان رەوانە کردووە بە بەڵگە و نیشانە روونەکانەوە، کە راستییان روون بکاتەوە، زوٚربەیان موعجیزەیان بووە کە هەموو خەڵکی دەستە پاچە و پەك کەوتوو بوون لە ئاستی ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ٱلْإِنجِيلَ﴾ کتیٚبمان هیٚنایە خوارەوە لەگەڵ ئەو پیٚغەمبەرانە بیٚت[1].

---

[1] کۆرو جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست بە ﴿رسلنا﴾ پیٚغەمبەرانە نەك مەلائیکە ئەو کاتە وشەی ﴿معهم﴾ حاڵە وەکو بەو شیٚوەیە تەفسیری کرایەوە، یان وشەی ﴿مع﴾ بە مانا ﴿إلى﴾ یە هەندیٚ لەسەر ئەوەن کە مەبەست

﴿وَٱلْمِيزَانَ﴾ عەدل و حەقیانەتمان هێناوەتە خوارەوە بێ زیادە رەوی و کەم و کوڕی، بە بێ لایەنگیری، واتە بەرنامە و یاسا و شەریعەتێکمان هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر ئەو پێغەمبەرانە کە هەمووی عەدل و راستە بۆ ئەمەی خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای لە هەموو کاروبارێکیان دا، دیاریی کردنی هەموو شتێ لە رادەو شوێنی خۆی دا بۆ راست کردنەوەی هەموو کردەوەو رووداوو هەموو شتێ لە رادە و شوێنی خۆی دا، بۆ راست کردنەوەی هەموو کردەوەو رووداو و هەموو شتێ کەواتە ناردنی پێغەمبەران و هێنانە خوارەوەی کتێب و میزانەکە بۆ ئەمەیە ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾ تا خەڵکی هەڵسن بە عەدل و حەقیانەت، چونکە بە بێ ئەوەی خوا هێناویەتی یە خوارەوە خەڵکی رێگا نابەن بە عەدل و حەقیانەت، ئەگەر لە شتێك دا رێگایشی پێ ببەن دامەزراوو نەگۆڕاو نابن، بەڵکو بە گوێرەی ئارەزووی نەفسی خۆیان ئەجوڵێنەوە. بێگومان زۆربەی ئادەمی مل کەچی ناکات بۆ عەدل و حەق و راستی بە پیاوەتی خۆی بەڵکو ئەبێ زۆر و دەسەڵاتی ببێ مل کەچیان بکات و سەر داخات بە سەرکەشان و ناڕەوا کەران، بەرگری یان بکات لە خراپەکاری لەبەر ئەوە خوای خاوەن بەزەیی هەرچۆنێ عەدل و حەقی هێناوەتە خوارەوە هەروەها هۆی چەسپاندن و بلاوە پێکردنی عەدل و حەقەکەیشی داناوە وەکو بەم فەرمودەیش دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ﴾ بڕیاری دروست کردنی ئاسن و هۆی فەراهەم هاتنیمان هێناوەتە خوارەوە ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ کە هێزێکی بەتینی تێدایە، جەنگ و کوشتاری پێ ئەکرێ لەگەڵ دوژمن دا. واتە پێغەمبەرانمان رەوانە کردووە بە چەند بەڵگە و دەلیلی روونەوە، بە کتێب و شەریعەتەوە بۆ ئەمەی خەڵکی بە گوێرەی عەدل و حەقیانەتی خوا بجوڵێنەوە، بەو هەڵسن لە هەموو کاروفرمانیان، جا کاتێ گوێ نەگیرا بۆ ئەو هەموو بەڵگە و موعجیزە، بەرگری ئەو عەدلی خوا کرا ئەوە ئاسنمان دروست کردووە کە چەکی لێ دروست ئەکرێ و هێزێکی بەتینی تێدایە بەو چەکە دوژمنە بەرگری کەرەکانی خوا بشکێنرێن و ژێر دەست و مل کەچ بکرێن بۆ ئایین و دادپەروەری خوا، ئاسن ئەو کارە گرنگەی پێ ئەکرێ و ئەو سوودە بە نرخەی تێدایە

---

مەلائیکەیە ئەمەش لەبەر ئەوەی رەوانە کراو بێ بۆ سەر پێغەمبەران، کەواتە وشەی ﴿معهم﴾ تەنها جوبرەئیلە وەکو لە حەدیسەوە وەرئەگیرێ.

وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢٥﴾

﴿وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ چەند سوودی تری تێدایە بۆ ئادەمیزاد، ئەوەتا ئەبینی هەر لە کۆنەوە هیچ پیشەسازی یە نی یە کە ئاسن کەرەسە نەبێ تێیدا بێجگە لەو هەموو شتە نایابانەی کە لەم چەرخی تازەدا داهاتوون لە ئاسن فەراهەم دێن و هۆی ژیانی کامەرانیان تیایە و بە جۆرێ کە شارستانیی و ئاوەدانی جیهانی ئەمڕۆ لەسەر ئاسن راگیرە.

خوای گەورە ئاسنی دروست کرد، چونکە هێزێکی بەتینە بۆ جەنگ و ئاشتی، چەندەها سوودی ئادەمی تێدایە، ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ لەبەر ئەمەی خوا بزانێ کێ یارمەتی خواو پێغەمبەرەکانی ئەدات بە هەڵگرتنی چەك و جەنگ و کوشتار کردن لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئایینی خوادا، لە کاتێك دا کە یارمەتی دەر کە خوایش نابینێ بەچاوو هێشتا نەیدیوە لەگەڵ ئەوەدا ئەوەندە ئیمانەکەی بەهێزە ئەو فیداکاری یە ئەکات!

خوای گەورە دوو جۆر زانینی هەیە دەربارەی دروست کراوەکانی خۆی. جۆرێکیان پێش دروست کردنیانە، دروست کردنەکەیان شوێنی ئەو زانینەی ئەکەوێ و بە گوێرەی ئەوە ئەبێ، ئەو جۆرەکەی تر پاش دروست کردنە، تەکلیفاتی شەرعی و پاداشت و تۆڵە شوێن ئەم جۆری دووەمە ئەکەوێ. واتە کابرای مکلف تا پەیدا نەبێ خوا داوای هیچی لێ ناکات و تا تاوان و خراپە نەکات تۆڵە و سزای نادات، بەم پێ یە لە زۆر شوێنی وێنەی ئەم شوێنەدا ئەو جۆرە زانینە بۆ خۆی بەکار ئەهێنێ، مەبەستەکەش ئەوەیە کە باس کرا نەك وا بزانرێ لە پێشەوە نەزانراوە، خوا پەنامان بدات لەو جۆرە باوەڕە. خوای گەورە کاتێ فەرمان ئەدات بە تێکۆشان و فیداکاری ئیمانداران لە پێناوی ئاییندا ئەیەوێ ئیمانداران سوود وەرگرن و شایانی پاداشتی گوێڕایەڵی بن ئەگینا ئاشکرایە خوا پێویستی بە یارمەتی دانی هیچ کەس نییە. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ﴾ چونکە بەڕاستی خوا توانا و بەهێزەو دەسەڵات دارە بەسەرلەناوبردن و بەربادکردنی دوژمنەکانی ئایینەکەی، زاڵەبەسەرهەمووشتێکداوهیچ کەس و هیچ شتێ ناتوانێ سەرپێچی لێ بکات، بێ ئەمەی پێویستی ببێ بە هیچ یارمەتی دەرێ.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَٰهِيمَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ ۖ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ

**له پێشەوە بە شێوەیەكی گشتی باسی رەوانە كردنی پێغەمبەرانی كرد، ئینجا لێرەدا بە تایبەتی باسی رەوانە كردنی دوو پێغەمبەر ئەكات كە لە پاش خۆیان هەر پێغەمبەرێ رەوانە كرابێ لە نەوەی ئەمانە: یەكەم نوح (علیه السلام) كە پێی وتراوە ئادەمی دووەم و باوكی هەموو ئادەمی پاش خۆیەتی، دووەم ئیبراهیم (علیه السلام) كە باوكی هەموو پێغەمبەرانی پاش خۆیەتی. هیچ پێغەمبەرێ لە پاش ئەو رەوانە نەكراوەو هیچ كتێبێ لە ئاسمانەوە نەهاتووەتە خوارەوە بۆ سەر هیچ كەس كە لە نەوەی ئیبراهیم نەبێت، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَٰهِيمَ﴾ سوێند بەخوا ئێمە نوح و ئیبراهیممان رەوانە كردووە بە پێغەمبەری ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾ پێغەمبەرێتی و كتێبمان بۆ سەر نەوەی ئەوان هێناوەتە خوارەوە، بەڵام هەموو نەوەكانیان یەك جۆر نەبوون، بەڵكو بەم شێوە بوون ﴿فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ هەندێ لە نەوەكانیان رێنموونیان وەرگرت و رێگای راستی خوایان دایەبەر، زۆر لەوان لە رێگای راست لایان داو دەرچوون لە ئایین و كافر بوون، ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا﴾ ئینجا دوا بە دوای نوح و ئیبراهیم و پێغەمبەرە پێشووەكاندا چەند پێغەمبەرانی تری خۆمانمان هێنا یەك لە دوای یەك تا گەیشتە عیسا ﴿وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ عیسای كوڕی مەریەمیشمان هێنا لەپاش ئەوانە هەموو بە پێغەمبەری ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ﴾ ئینجیلمان پێدا. باسی عیسا بە تایبەتی بەرپەرچ دانەوەی جوولەكەی تێدایە كە باوەڕیان بە پێغەمبەرێتی یەكەی نەبوو، هەروەها زۆر بەجێ یە باسی عیسا لێرەدا كە دواترین پێغەمبەری گەورەی بەنی ئیسرائیلی یە مژدەی داوە بە هاتنی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)،**

وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

---

ئینجا باسی سیفەتێکی ئاشکرا ئەکات لە سیفەتەکانی شوێن کەوتووەکانی عیسا ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً﴾ دڵ نەرمی بەتین و بە سۆزو بەزەییمان خستە دڵ و دەروونی ئەوانەی شوێن عیسا کەوتن، ئەو کۆمەڵە کە بەرهەمی بانگەوازەکەی عیسا پێغەمبەر بوون، پێگەیشتووی قوتابخانە بەرزەکەی بوون ئەو کۆمەڵە ئەبێ بەشدار بن لە وێنەی ئەو سیفەتە بەرزانەدا کە بە تێرو تەواوی لە پێشەواکەیان دا هەبوو، ئەبێ دڵ و دەرونیان پاراو بووبێتەوە بەو ئاوی رەحمەتەی کە هەڵقولاً لە دڵی بەرزی پاك و بێگەردی ئەو پێغەمبەرە گەورەیەدا، ئەبێ تەم و تاریکی دڵیان نەما بێت بەو نوورو رووناکی یەی کە دڵی عیسا کان و سەرچاوە بوو بۆی. بێگومان ئەو خوو سیفەتە شیرینانە بە ئاشکرا ناسراون لە ناو ئەوانەی کە بەڕێکی شوێن کەوتووی عیسا بوون، قورئان لە چەند ئایەتی تردا دەست نیشانیان بۆ ئەکات، هەروەها مێژوویش چەند شێوەیەك ئەگێڕێتەوە لە نەجاشی و وەفدەکەی نەجران و چەند کەسی تر لەوانەی ئەهاتن بۆ وڵاتی ئیسلام لە پاش سەرکەوتنی، مەیل و ئارەزووی ئیسلامەتی یان پەیدا ئەبوو بە هۆی ئەوەوە حەق و راستی لە دڵیاندا جێگیر بوو، چونکە بەڕاستی شوێن کەوتووی عیسا بوون.

ئینجا باسی سیفەتێ تریان ئەکات کە ئەمیش ناسراوە و زانراوە لە مێژووی ئەو شوێن کەوتووانەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا﴾ شوێن کەوتووەکانی عیسا رەهبانی یەتیان داهێنا لە ناو خۆیان دا، واتە وازهێنان لە هەموو خۆشی یەکی دنیایی، خەریك بوون بە خواپەرستی و ئیتر کەنار گیریی لە هەموو شتی تر، ئەوە شتێ بوو لە لایەن خۆیانەوە گرتیانە گەردن و پێویستیان کرد لەسەر خۆیان، خوا ئەفەرموێ: ﴿مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ﴾ ئێمە

ئەوەمان بڕیار نەدابوو لەسەریان، فەرمانمان پێ نەدابوون بەوە ﴿إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ﴾ بەڵام خۆیان بڕیاریان داو دایان هێنا لەبەر ویستی ڕەزامەندی خوا، بەهۆی ئەوەوە بڕیاریان داو پێویستیان کرد لەسەر خۆیان لەلایەن خوایشەوە پێویست بوو لەسەریان کە هەڵسن، بەڵام ﴿فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾ لە پاشان هەموو پارێزگاریان نەکردوو هەڵنەسان پێی بە حەقیانەت بەم جۆرە بە ڕێك و ڕاستی شان بکەن بە خواپەرستی داو خۆیان ڕووت بکەن لە هەموو شتێ تر لەبەر خوا وەکو بڕیار درا، بەڵکو زۆربەی بوو بە دیمەن و نیشانە و دروشم و شێوەیەکی ڕووتی بێ ڕۆح، کەمێکیان بە تەواوی هەڵسان بەو ڕەهبانی یەتی یە و ئەو ئەرکەیان برد بەڕێوە ﴿فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ﴾ ئێمەش ئەوانەیان کە ئیمانی ڕێك و ڕاستیان هەبوو پاداشتی خۆیانیان ئەدەینەوە ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ﴾ زۆر لەو شوێن کەوتووانەی عیسا لەپاش خۆی دەرچوون لە پەیڕەوی کردنی عیسا لەو ئایینە پاك و خاوێنەی کە هێنای.

لەپاش ئەوە بە چەسپانی سەرنجی ڕاکێشاو چاو پیاخشانێکی کرد بە زنجیرەی پێغەمبەرەکاندا - سەلامی خوایان لێ بێت - لەپاش ئەوە دواترین بانگ ئاراستە ئەکات لەم سورەتەدا بۆ ئیمانداران لەم ئوممەتەدا کە دواترین هەڵقەن لە زنجیرەی کۆمەڵی ئیمانداران بە پێغەمبەرێتی و پێغەمبەران لە مێژووی دوورو درێژیی دا، جێنشین و میرات بەری هەمووانن، جێگریانن تا ڕۆژی دوایی، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بانگ کردنیان بەم شێوەیە دەست کاری تایبەتی تیایە بۆ دڵ و دەروونیان، زیندوو کردنەوەو هەڵگیرساندنی سیفەتی ئیمانە تیایان دا، بیر خستنەوەیە بۆ سەرپەرشتی و چاودێریی ئەو ئیمانە، هێنانە سۆزو پەرۆشە بۆ ئەو سیفەتەی کە هۆی پەیوەندی و پەیوەستیانە بۆ ئەو پەروەردگارەی کە بانگیان لێ ئەکات بەو شێوە شیرین و خۆشەویستە، بە ناوی ئەو هۆی پەیوەستی و پەیوەندی یەوە پاڵیان پێوە ئەنێ بۆ لە خوا ترسان و بڕوا هێنان بە پێغەمبەرەکەی، کەواتە مەبەست بەو ئیمانە داوا کراوە شتێکی تایبەتی یە، کە بریتی یە لەو ئیمانە ڕاستەقینەی کە بەروبەرهەمی هەیە،

ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەهۆی خەشم و ناڕەزایی خوا، ﴿وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ﴾ بروا بێنن بە پێغەمبەرەکەی – واتە محمد (ﷺ) – ﴿يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ﴾[1] دوو بەشتان لە رەحمەتی خۆی پێ ئەدات و ئەبەخشێ، شێوەی فەرمودەکە زۆر سەیرو سەرنج راکێشە، چونکە رەحمەتی خوا بەش بەش نابێ، تەنیا تیشکێ بدات لە هەرکەسێك ئەو کەسە بەری رەحمەت کەوتووە. بەڵام ئەو عیبارەت و فەرمودەیە زیادە درێژە پێدانی رەحمەتەکەو زیادە پیت و فەڕی نیشان ئەدات، هەر لە دەست قورئان دێت ئەو جۆرە شتانە ئەگینا بە خەیاڵی هیچ کەس دا نایەت، ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ﴾ نوورو رووناکی یەکتان بۆ فەراهەم ئەهێنێ کە بە پێی ئەوە بگەڕێن و بڕۆن بەڕێوە، ئەو نوورو رووناکی یە بەهرەو بەخششێکە لەلایەن خواوە ئەیخاتە ئەو دڵانەی کە لە خواترس و هەست ئەکەن بە سام و هەیبەتی خوا، بڕوای راستەقینە ئەهێنن بە پێغەمبەرەکەی. بەهرەو بەخششێکە ئەو دڵانە رووناك ئەکاتەوە، بەهۆی ئەوە لە هەموو شتێك دا باری حەقیقەت و راستی هەست پێ ئەکەن و ون نابن و هەڵناخلیسکێن و لانادەن لە رێگا راستەکەی خۆیان، ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾ ئەبووری لێتان و گوناهو خراپەتان ئەسڕێتەوە.**

**ئادەمی هەرچەندو هەر ئەندازە نوورو رووناکی پێ بدرێ هەر ئادەمی یە و کەم و کوڕی و ناتەواوی هەیە. کەواتە پێویستی هەیە بە لێ بوردن و سڕینەوەی هەڵە و کەم و کوڕی یەکەی، ئینجا رەحمەتی خوا فریای ئەکەوێ و پێی ئەگات، ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوا زۆر لێ**

---

[1] ئەگونجێ مەبەست لەو دوو بەشە دووجار پاداشت بێت: کە یەکەم لەسەر باوەڕ هێنانیان بەم پێغەمبەرە (ﷺ)، دووەم لەسەر بڕوایان بە موساو عیسا و هەموو پێغەمبەرانی تر.

بوردەو داشاردەرە بۆ تاوان و گوناهو زۆر بەزەیی دراه، ئەهلی کیتاب لایان دا لە ئاین و ڕێگای خودا، لە خۆیان گۆڕا بوون، لایان وابوو کە ئەوان گەلی هەڵبژێرراوی خوان، ئەوان کوڕو خۆشەویستەکانی خوان، بێجگە لەوان کەسی تر ناچێتە بەهەشت، پێغەمبەریەتی ئەبێ هەر بەوان بدرێ. ئینجا خوای گەورە بانگی ئیماندارانی کردوو بەڵێنی پێدان هەتا ئەهلی کیتاب بزانن کە ئەوان توانا نین بەسەر دەست بەسەردا گرتنی هیچ شتێ لە بەهرەو بەخششی خوا وەکو ئەفەرموێ: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ﴾[1] تا بزانن ئەهلی کیتاب دەسەڵاتیان نییە بەسەر هیچ شتێ لە بەهرەو فەزڵی خوا، ﴿وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ﴾ بەهرەو فەزڵی خوا کە پێغەمبەریەتی سەر دەستەو پۆپەیەتی، بە دەستی خوایە ﴿يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ﴾ ئەیبەخشێ بە هەرکەسێ خوا خۆی بیەوێ و مەیلی ببێ، تایبەتی نەکراوە بە گەل و نەتەوەیەك، داگیر نەکراوە بۆ تیرەو بەرەیە، نە سنووری هەیە و نە کەم و کوڕیشە ﴿وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ خوا خاوەنی بەهرەو فەزڵی زۆر گەورەیە، ئەم بانگ کردنە دوایی یە لەم سورەتەداهاندان و پاڵ پێوەنانی تیایەو دڵ و دەروون ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش و هەڵگیرسان بۆ چەسپانی و موسابەقە بۆ دەست کەوتنی ڕەحمەت و بەهەشتی خوا، سورەتەکەی پێ دوایی هێنرا و بە جۆرێکی وایە ڕێك و پێك لەگەڵ مەبەست و ئامانجی سورەتەکە، کە چەند بارەی کردەوە بۆ دڵ و دەروونەکان بۆ ئەمەی ئیمانەکەیان بەدی بێنن و مل کەچ بن بۆ پەروەردگاریان و هەڵسن بە ئەرکێ کە ئیمانەکەیان داوایان لێ ئەکات لە سامان و دارایی و گیانیان، بە خۆ ڕووت کردن لە هەموو نیازێ جگە لە خواو ئیخلاس و ڕاستی لەگەڵ خودا.

ئینجا ئەم سورەتە نموونەیەکە لە نموونە ڕوونەکانی قورئان لە گفتوگۆکردن و دووان لەگەڵ دڵ و دەروونی ئادەمی دا، پاڵ پێوەنان و هێنانی ئەو سۆزو پەرۆشی بە شێوەیەکی

---

[1] ئەم دوو ئایەتە بە دوو سێ جۆری تریش تەفسیر کراون وەکو لە کتێبەکانی تەفسیردا نووسراوە، یەکێ لەو جۆرانەش وەکو ئەم جۆرەی کە لە تەفسیرەکەدایە ئەوەیە کە وشەی ﴿لا﴾ لە ﴿لئلا﴾ دا زیادە ئەوەش وێنەی زۆرە لە قورئان و زمانی عەرەب دا هەموو جۆرەکانی تریش ئەگونجێ و دەست ئەدەن، بەڵام بەڕاستی ئەمەی لە تەفسیرەکەدایە باش ئەچێتە دڵەوە بێ قۆرت و گرێ و ڕێك تریشە لەگەڵ باس و شوێنەکەدا.

زۆر كاریگەر، ئەم سورەتە لە هەموو بارو روویەكی یەوە تەمێ و دەرسێكی نایابی كەس نەدیوە بۆ بانگ كەرانی رێگای خواو هەڵگرانی ئالآی بانگ و بانگەوازەكەی پێغەمبەر (ﷺ) فێری ئەوەیان ئەكات چۆن بدوێن و گفت و گۆ بكەن لەگەڵ خەڵك دا، چۆن سروشتیان بێدار بكەنەوە و لە خەوی بێ ئاگایی خەبەریان بكەنەوە، چۆن دڵەكان زیندوو بكەنەوە! ئەم سورەتە پەند و دەرس دادانێكی خوایی یە هاتووە لە لایەن كەسێكەوە كە داهێنەری دڵەكانە، نێرەری قورئانە، داهێنەرو فەراهەم هێنەری هەموو شتێكە لە سنوورو ئەندازەی رێك و شایان دا، لەم خوێندنگای خوایی یە پێگەیین و پەروەردە كران و دەرچوون ئەو هەموو بانگ كەرانە كە هەڵكەوتوو گوێڕایەڵی كراوو بەرهەم دار بوون.

و صلی الله و سلم علی محمد و آله و كل عبد مصطفی